ژیانی پێغەمبەری مەزن

عبدالعزیز بارەزانی

ئینتشاراتی سەقز - محەمەدی

ی : سەعدی - تەوریز

چاپکردنەوەی پارێزراوە بۆ ئینتشاراتی سەقز - محەمەدی

# دیـاری بێ :

بۆ : گیانە خـــاوێنە زیندووە هۆشیارەکەی پێغەمبەری خواو ڕزگارکەری بوونەوەر کە تـاقانە موۆقێ بوو هەڵسابە تاڵو کۆڕی ڕاستیو تەواو لە جیهانا .

بۆ : گیـانی شیرینی یـارو یـاوەرو یاریدە دەرەکانی لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا .

بۆ : ئەو باوکو دایکە خۆشەویستەم کە ئاواتیان ئەوەبوو بم بە شاگردی پێغەمبەر .

بۆ : ئەو خوێنەرە بەڕێزەی ئەیەوێ لەبەر ڕۆشنایی بیرو باوەڕەکەی محمددا بڕواوو تەنیا هەر ئەو مامۆستاو پێشەوای بێ .

بۆ : ئەمانەو بۆ هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینە ئەم چەند لاپەڕەیەم کرد بە دیاری دەستی خۆمو پێشکەشم کردن .

- نووسەر -

پێشکەش کردنی پەڕاوی :

# « ژیانی پێغەمەری مەزن محمد »

دروودی لەسەربێ

« بە پێنوسی مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز لە هەلەبجە »

بسم الله‌الرحمن الرحیم

« قُلْ یاأَیُّهَاالنَّاسُ إِنِّی رَسُولُ اللهِ إِلَیْکُمْ جَمِیعاً ، الَّذی لَهُ مُلْكُ السَّمٰواتِ وَالْأَرْض لاإِلٰهَ إِلاَّهُوَیُحْیِ وَیُمِیتُ فَـآمِنُوا بـاللهِ وَرَسُولِهِ النَّبِیِّ الْأُمِّیِّ الَّذی یُؤْمِنُ بِاللهِ وَکَلِمٰاتِهِ ، وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّکُمْ تَهْتَدُونَ » صَدَقَ اللهُ الْعَظِیم .(١)

لام وایە زیادەڕەوی ناکەم کە ئەڵێم : پێویستی سەرشـانی هەموو ئادەمیزادێکە شارەزا بوون و زانینی هەمو کردەوەو خوو ڕەووشتی حەزرەتی پێغەمەرمان ( محمد ) هەڵبژێراوی هەموان ـ درودی خوای لەسەربێ ـ بەبێ شارەزایی لەژیانی پـــاکی ئەم پێشەوا خۆشەویستە هیچ کەسێ لە پلەی هەرەبەرزی ئادەمیزاد تێناگا ، وەهەرکەس بە ڕێبازەکانی ئەوا نەڕوا وێڵو سەرگەردانە با بە دیمەن هەرپلەو پایەیەکی هەبێ .

بە هەندێ لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنی ژیانی ئەو پێغەمەرە گەورەیە هەموو خاوەن بیرێکی ڕاستەو تێگەیشتوو بەدڵنیایی‌یەوە ئەبێتە هاوبەشی منو هەمو موسلمانێکی ڕاستەقینە لەم باوەڕەدا .

جا لەبەرئەمـــانە ئەڵێم : گەورەترین خزمەتێ کە پێش کەش بە گرۆهی ئـــادەمیزاد بکرێ بریتی‌یە لە بڵاوکردنەوەو ڕوون کردنەوەو پێناسین و دەربڕینی خوو و ڕەووشتو ژیانی پـــاکی حەزرەتی پێغەمەر



(١) الأعراف : ١٥٨

( د خ ) ڕەهەر لەبەرئەوەیە کەوا زۆر لە زاناو دڵسۆزەکان ئەمەیان بەگرنگ گرتووە و زۆر هەوڵیان تیاداوە و پەڕاوی زۆریان تیادا ناوە کە بە ئاسانی لە ژمارە نایەن

بەڵام ـ بەداخەوە ـ تا ئێستا بەزمانی کوردی نووسین لەم بابەتەوە زۆر کەمە ، لە گەڵ ئەوەدا کە ئەبوایە زۆر زۆر بوایە ، ـ چونکە ـ وابزانم ـ کوردیەکەم نەتەوەیە کە هەمووی بەتەواوی ئایینی پاکی ئیسلامی گرتبێتە گەردن و بەڕاستی بزانێ

بەڵام بەراستی هەر کەتەماشای پەڕاوی « ژیانی پێغەمبەر لەنوسینی زانای بەڕێز شێخ عزیز پارەزانی بکرێ هیچ داخێ لەم رووەوە نامێنێ . چونکە ـ بەراستی ـ هەروەك یەکەم پەڕاێکە کە بە کوردی لـە هەموو ڕووەکانی ژیانی پێغەمبەر دووابێ ئێجگار ڕێك وپێك و ڕاست و ڕەوانە . وە نووسەر ـ خوا یارمەتی بدا وەك زانایەکی بەرزە ـ سوپاس بۆ خوا ـ لازوچەوت و ڕاست و چـاك جیـا ئەکانەوە بەتایبەتی زۆر بە وردی و گرنگی ئەم پەڕاوەی داناوە وە سەرچاوەکانی بەهێزو جێی بـاوەڕن وە پەڕاوەکەی شێوەیەکی ئەوتۆی هەیە کە هەموو کەسێ بێ سەرلێ کردنەوە ئەتوانێ پشتی پێ ببەستێ وە هەقی هەموو زانـــایەکی باوەڕدارە کە بیخوێنێتەوە و شانازی پێوەبکا ، بۆیە داوائەکەم لە ڕۆڵەکانی گەلی کورد زۆر بەچەسپانی پەلاماری ئەم پەڕاوە بەرێزو بە پیتە بدەن و دڵ و گیانی خۆیانی لێ پاراو بکەن و بیکەیەنن بە نەخوێندەوارەکانیش تـا هەموو لایە تێ بکەین لە خووو ڕەوشتی پێغەمبەرمان شارەزابین

وە لەخوای بێ هەمتا ئەپاڕێمەوە کە وێنەی ئەم نووسەرە زۆربکا ،

وە ئەم خزمەتە گەورەیەی لــێوەرگریّو ییکا بە هۆی ســەربەرزی و ڕووسووری لای خاوەنی ژیان ، وە سوودی پێبگەیەنێ بەڕۆڵە کوردەکان.

بە جوانی ئەزانم لێرەدا بە چەند دێڕێك نووســەر بخەمە پێش چـاوی خوێندەوارن : نووسەر نـــاوی ( عبدالعزیز ) ە و بەشێخ عزیز بەناوبانگە کوڕی شێخ أمینی پــارەزانی یەو لە ( ساداتی پیر خضرین ) ، هەرچەند سـاڵی لە دایك بوونی نەنووسراوە ، بەڵام وا دیارە لە سـاڵی ( ١٣٤٩ ـ ١٣٥٠ ) ی کۆچی دا لە دیك بوە کە ڕێ کەوتی (١٩٢٨ ـ ١٩٢٩ ) زایینی ئەکات . لە دێی پارەزان(١) باوکی ـ خوالێیی خۆشبێ ئەی نێرێتە قوتابخانەکەی خوالێخۆشبوو ( مـــامۆستا شێخ عزیز ) ی دۆڵپەمووییو ، لەوێدا ئەمێنێتەوە تا سەرەتای ( نحوو صرف ) تەواوئەکات ئەمجار وەکو هـــامسەرانی ئەکەوێ بەشوێن خوێندنا وە لە قوتابخانەی بەرزنجەو سلێمانیو هەڵەبجەو پریسدا لای مـامۆستا باوەڕ پێ کراوەکان هەمو زانیاری یەکانی تەواو کردوە .

لە سالی ( ١٩٥٣ ) ز دا لە تاقی کردنەوەی پۆلی ( ١٢ ) ی (أوقاف) دەرچوو بروا نـامەی وەرکرت ، وەهەر لەوساڵەدا لای مامۆستا ( مەلا صالح ) لە هەڵەبجە ( إجازەی عیلمی ) وەرگرتو ، بوو بە ( مدرس ) لەدێی تەپی سەفای شارەزوور لە مدرسەکەی حاجی مصطفی ی پاروەیسی دا هەتا لە ســـاڵی ( ١٩٥٩ ) ز دا لە بەر چەند ئاڵو گۆڕێکی نـالەبار لە باری گشتی عێراقا ناچاربوو ئەو قوتابخـانەیەی بەجێ هێشتو بوو بە مامۆستـای سەرەتایی لە قوتابخـانەکانی سەربە ( پارێزکەی ) سلێمانی ، وە ئێستە مامۆستایە لە قوتابخانەی ( سالم )ی کوڕان لە هەڵەبجە

---

(١) پارەزن دێیەکە سەربە ناحیەی بەرزنجەو قضای شارباژێرە

# سەرەتا

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

« كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ ، وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْياً بَيْنَهُمْ ـ فَهَدَى اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ ، وَاللهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (١) « صَدَقَ اللهُ الْعَظِيمُ » .

خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ : لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لمن كان يرجو الله واليوم الآخر » ـ الأحزاب ـ

واتە : بەڕاستی ـ ئێوە ئەی موسلمانەکان ـ لەپێغەمبەری خواوە پێشەوایی‌و مامۆستایی‌و سەرمەشقی ژیانتان دەستئەکەوێ ، هەرکامتان بەهیوای گەیشتن بەخواو بەرەزامەندی خواو بەڕۆژی دوایی بێ .

ئەم ئایەتە پیرۆزە تێمان ئەگەیەنێ کە ـ ئێمەی موسلمان ـ بەهەموو کەس‌و بەرەو نەتەوەیەکمانەوە ئەبێ هەر شوێنی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە بکەوین وبەس ، هەر ئەو مامۆستامان بێ‌و هەرچاو لەو بکەین‌وتەنیا هەر بەڕچەو ڕێبازە ڕۆشنەکەی ئەوا بڕۆین ، ئیتر بەهیچ لایەکا لانەدەین ولەکەسی ترەوە دەرس وسەرمەشق وەرنەگرین ، ئەگەر باوەڕمان بە خواو بەڕۆژی دوایی هەبێ .

خۆ ڕەوشت‌و ڕێگەی پێغەمبەریش بریتی‌یە لەقورئان وفەرمانی

---

(١) لەسوورەتی ( البقرة ) ٢١٣

خوا ، نایینی قورئان ئەفەرموێ : « وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ! (١) واتە : پێغەمبەر لەهەواو هەوەسی خۆیەوە نادوێ‌و هەرچی ئەڵێ نیگایە بۆی هاتووە . پرسیاری ڕەوشتی پێغەمبەری خوا کرا لە خاتو عایشەی خێزانی لەوەڵاما ووتی : « كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنُ » واتە : ڕەوشتی بریتی بوو لەقورئان . وقورئانیش ئەفەرموێ : « وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ » . (٢)

واتە : هەرکەسێ بێجگە لەئیسلام هەر ئایین‌و بەرنامەیەك بۆخۆی هەڵبژێرێ لێی وەرناگیرێ ولەپاشە ڕۆژا لەگرۆی زەرەرۆ مەندان ئەبێ . وەلەئایەتێکی ترا ئەفەرموێ : « وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ » . (٣)

واتە : ئەم ئایینی ئیسلام‌و قورئانە بەرنامەو ڕێی ڕاستی منە ، دە ئێوە بکەونە سەری‌و پەیڕەوی بکەن ، نەکەن لێی لابدەن وبچنە سەر کوێرە ڕێگاکانی تر ؛ چونکە ئەوانە پەرتەوازەتان ئەکەن وڕێی خواتان لێ وون ئەکەن .

لەمانەوە دەرئەکەوێ کەپێویستی سەرشانی هەموو مرۆیەکی موسڵمانە کەپێغەمبەرمان « محمد » بکا بەپێشەواو سەرمەشق بەمامۆستا بۆخۆی‌و لەهەموو ئیش‌و کارەکانیا شوێن ئەو بکەوێ وبەس . وە ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێ شوێن‌یەکێکی تر بکەوێ کەبەڕاستە ڕێگاکەی ئەوا نەیبات بەڕێوە ، یا هەرناو ونیشان ، یا هەرکاڵاو بەرگ ، یا هەر پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی یا ڕامیاری یا زانیاری هەبێ .؟

---

(١) لەسورەی « النجم » (٢) لەسورەی « آل عمران » (٣) لەسورەی « الانعام »

وەئەم پێویستییە گەورەیە پێك نایـەت هەتا ئێمە بەتەواوی وبـە وردی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە نەناسین‌و شارەزای ژیانی نەبین‌و لەهەموو دەمێکی تەمەنیاو لەهەموو کات‌و لەهەموو هەنگاوێکی ئیش‌و کارەکانیا بەتایبەتی لەهەنگاوەکانی بانگەکەیا . وەئەم زانین‌و شارەزایییەمان بەم ڕێیانەی خوارەوە دەس ئەکەوێ :

١ ـ شارەزایی لەقورئان‌و تەفسیری قورئانا ، بـەتایبـەتی ئەو تەفسیرانەی دەرسی رەوشت‌و سیرەتی پێغەمبەریان بەگـرنگ گرتووەو فەلسەفەی هەنگاوەکانی بانگەکەیمان بۆدەرئەخەن .

٢ ـ بەخوێندنەوەو ا ێکۆلینەوەی فەرمـوودەکانی ـ کەچەندەها پەڕاوی گەورە گەورەیان تیا نووسراوەتەوەو ڕاڤە کراون ، وەجوانتر وایە هەوڵ بدەین بۆزانینی کات‌و شوێن‌و ڕێکەوتی فەرموودەکانی .

٣ ـ زانینی ژیانی پێغەمبەر لەمناڵییەوە تا گەنجی وتا کۆچیدوایی .

بەم سێ ڕێگایە ئەتوانین ئەوەندە لە پێغەمبەری گەورە تێ بگەین کەبیکەین بەپێشەواو مامۆستا ، وەپەیرەوی کـردەوەو فەرمان و فەرموودەکانی بکەین وهەنگاوو قۆناغەکانی خـۆمان لەبەر ئەوانەدا دیاری بکەین . (١)

---

مامۆستای بەرزی هیندی « سلیمـان الندوی » پەڕاوێکی زۆر بە نرخی بە زبانی عەرەبی بەناوی :«الرسالة المحمدیە» وە داناوەو ، تیایا لە هەموو ڕووی سیرەتی پێغەمبەرەوە ، وە لە پەیامەکەی دواوە کە هەتاهەتـایییەو تەواوەو هەموو بەشەکانی ژیانی مرۆڤ ئەگرێتەوە ، وەسیرەت‌و ژیانی هەر لەپێش مناڵی‌و پێش لە دایك بوونییەوە هەتـا کۆچیدوایی هەمووی بەوردی هەڵگیراوەو پارێزراوەو دیارییە هیچی لێوون نەکراوە .

پێغەمبەری گەورە (د ، خ) بە هەموو دەورێـکا ڕۆیشتوەو هەمووبشی لە مێژوودا تۆمار کراوە بۆمان : منالی ، گەنجی ، پیاوەتی پیری ، لادێیی ، شاری ، هەژاری ، دەولەمەندی ، ژێردەستەیی ، کاربەدەستی زانیاری ، جەنگ ، ئاشتی ، بێژنی ، ژنداری ، مال ، سەفەر ، سەرکەوتن ... هتد . وە لە هەموویانا نموونەی رەوشتو بلیمەتیو مامۆستایەتی بووە . وە لە هەموو پێغەمبەرەکانو پیـاوە هەلکەوتوەکانا تەنیـا ئەم ئاوەها حالەتەکانی ڕوون و دیارین ، کەوابوو هەربە تەنیا ئەوە دەس ئەدا بۆ ئەوەی نموونەو سـەرمەشق بێ بۆ هەموو کەسێ ، لە هەموو چەرخێکا .

بەداخەوە تائێستا کەسێك هەلنەساوە ـ بە زمانی کوردی ـ کە بە درێژیو بە ڕۆشنی لەو ژیـــانە پڕ سـوودە بدوێ ، وە منیش هەرچەند خۆم بەکوری ئەو مەیدانە نازانم و ئەوکارە گەورەیە لە توانای پیاوی وەکو منانیە . . چونکە وەکو مامۆستـا شێخ محمدی خالی لە نامەیەکا لەو ڕووەوە بۆی نووسیومو ئەلێ :

« ژیانی پێغەمبەر وەك بوونەوەر وایە ، هەر ڕۆژەی گۆشەیەکی تازەی ئەدۆزێتەوە ، ئەگەر ڕاستت ئەوێ هەق وایە ژیانی پێغەمبەر بە سەد لیژنە بنووسرێ ، هەر لیژنەیەك لـە شتێکا پسپۆڕبێ ، بەکێ لە « تشریع » دا ، یەکێك لـە « پیلانی جەنگی »دا یەکێك لە « ڕامیاری » دا یەکێك لە « پزیشکی » دا . . » . ڕەحمەت لە وێژەوانو هەلکەوتووی گەلی کورد مەولەوی کە ئەلێ :

گەر مەدحی بکەم مەدحی خۆمە فاش     نووری ئەو لە کوێو بینایی خفاش(۱)

بەڵام لەگەڵ ئەوانەیشا نەبوونی ژیانەکە بە زمـــانی کوردی لە لایەکەوە و گرانی بارەکەیش لە لایەکی ترەوە پـاڵیان پێوە نام کە بکەڕێم بە کتێبە عەرەبییەکانا و چەند لاپەڕەیەك لەم لاولاوە بێنم و بە کوردی بیخەمە بەردەستی خوێندەوارانی کـورد وە بە بیری خۆم شێوەی باسەکەم بە جۆرێکە کە لە گەڵ کیانی زانیاری و ڕاستی و لەگەڵ کیانی خاوێنی ئیسلامدا ڕێكبێ . ئەمە بەلای خۆمەوە ، وە ئەگەر کەم و کووڕی یا نارێکییەکی تیابوو تکام لە خوێنەران ئەوەیە کە بە چاوێکی لێبوردن سەیری بکەن ، وە ئەگەر حەزیان کرد ئاگادارم بکەن ، چونکە توانای من هەر ئەوەندەیە « لَا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا » . (۲) لەگەڵ ئەوەیشا بەگوێرەی توانای خۆم هەوڵم داوە کە لەو ژیانە گەورەیە ئەوەندەی دەربخەم کە دەسبدا بۆ پەیڕەوی کردنو شوێن کەوتن لە زۆر کاتو هەنگاو و قۆناخیا ، وە هەر لە خوایش چـــاوە ڕوان و داوای پاداش ئەکەم .

وە ئەوەی بەکرنگی ئەزانم لەم پەڕاوەدا ئەوەیە چەند هەڵەیەکم ڕوون کردۆتەوە : ئەوانەیش گەلێ کەس ئەیـانەوێ بەشێوەیەك لەو پێغەمبەرە گەورەیە بدوێن کە لەڕێزی مرۆڤ دەری بکەن و بی بەنە ڕیزی فریشتەوە ، وەهەر بەوچاوەزە ئەیانەوی سەیری یارەکانیو بەتایبەتی خێزانە خاوێنەکانی بکەن ، وە ئەیانەوێ ئیسلام بەچاوێ سەیربکەن کە هەر لە خۆیەوە بە « معجزة » سەر بکەوێ و زاڵ بێ بەسەر بیرو باوەڕەکانی ترا . .

---

(۱) « العقيدة المرضية »     (۲) لە سوورەتی ـ البقرة ـ ۲۸۶

وەلەم هەڵانەوە کۆمەڵی ئیسلام تووشی زیانی گەورە گەورە هاتوون و تووش دێن .. وەکو ئەوە ئەگەر پێغەمبەر ئادەمیزادێکی وەك ئێمە نەبێ ، ئێمە چۆن ئەتوانین چاوی لێبکەین‌و بەرێگاکەیا بڕۆین ؟ ئایا کەس لێی‌یەت فریشتەبێ ؟ بێ‌گومان نەء ، وە هەروەها بۆ یارە بەرێزەکانی ، یا چۆن ئەبێ ئەوەی کردبێ یا ئەوەی وتبێ ، یا ئەوەی نەزانی‌بێ ؟ کەوابێ پێشەوایی‌و مامۆستایی و شوێن کەوتنی ئەو بۆ ئێمە دەس‌نادا ، خۆئەمەیش پێچەوانەی فەرمان‌و خۆاهیشی خوایە وەك لە ئایەتەکەی پێشەوە زانیمان .

بۆیە قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێنا ئەمەی ڕۆشن کردۆتەوە و مرۆڤێتی پێغەمبەری دەرخستوە ، بۆ نموونە لەسورەی « الکهف » دا ئەفەرموێ :

« قل إنما أنا بشر مثلكم يوحى إلى أنما إلهكم إله واحد » .

واتە : ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ : « من ئادەمیزادێکم وەك ئێوە ، نیگام بۆ دێت لە خواوە کە بێجگە لە خوا پەرستراوێکی ترنیە .
سەیری کەنافەرموێ : بڵێ : من ئادەمیزادێکم و بەس ، بەڵکو ئەڵێ بڵێ : من ئادەمیزادێکم وەك ئێوە .

وەهەر لەم ژیانەدا دەرئەکەوێ کە ئیسلام هیچ کاتێ بە معجزە و لەخۆیەوە سەرئەکەوتووەو هەمیشە بەپێی یاسای بوونەوەرو گێتی ڕۆیوە لە پێشکەوتن‌و پاش کەوتنا .

جا هیواو ئاواتی من ئەوەیەکە خوێنەری بەڕێز و براو خوشکە موسڵمانە کوردەکانم بە گرنگ ئەم پەڕاوە بگرن و بە ووردی بی‌خوێننەوە و هەوڵ بدەن لەڕێی ئەم ژیانەوە مامۆستاو سەرمەشق لە پێغەمبەری

مەزنا بۆ خۆیـــان دەس بخەن ، وە بە چـــاوی ئادەمی یەکی گەورەی فروستادەی راستو ئەمین و پاك سەیری بکەن و ، بە ڕێ و ڕێبازەکەی ئەوا برۆن .

وە دووبارەی ئەکەمەوە کە توانـای من لەم سنوورەدایەو هەرکەسێ هەڵە ، یا نارێکی ، یاکەم و کووڕی یەکی بینی ڕاستی بکاتەوە و لێم ببووری وە ئەگەر بە جوانی زانی ئاگادارم بکا ، بە سوپاسەوە وەری ئەگرم و ، لە چاپی دووەمدا . . ڕاستیـــان ئەکەمەوە والله من وراء القصد ، وَهُوَ حَسْبی وَنِعْمَ الْوَكيلُ ،

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه واتباعه إلى يوم الدين

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

ربنا اتنا من لدنك رحمة

وهيیء لنا من امرنا

رشيدا

عبدالعزيز شێخ أمين پارەزانی

دانیشتووی هەڵەبجە ، ماموستا

لە قوتابخانەی « سالم »

بەناوی خوای یاریدەدەرو میهرەبان

# بەشـــی یەکەم نـــەژادی محمد

پێغەمەری مەزنمان بەهەزاران درودی لەسەربێ ـ ناوی ( محمد ) ە کوڕی ( عَبْدُالله ) یە ، دایکی ئامینەی کچی ( وَهَب ) ە لە هـۆزی بـەنی زوهرەی کوڕی کیلابی قورەیشی‌یە ، « عبدالله » کوڕی « عبدالمطلب » ە ، ( لەفاتیمەی کچی عەمری مخزومی ) قورەیشی‌یە ، کـوڕی « هاشمە » لە سەلمای کچی عومەر لەبەنی نەجاری خەزرەجـی مەدینەیی‌یە ، کـــوڕی «عبدالمناف» ە لەعاتیکەی کچی ( مُرّە ) ی سەلەمی ( مضری ) یـە ، کوڕی « قصی » یە لەحیبی کچی حەلیلی « خزاعە » ی (مضری) یە ، کوڕی « کیلاب » ە لەفاتیمەی کچی سەعدی یەمانی‌یە ، کـــوڕی « مرە » یە لەهیندی کچی سەریرە ، لەبەنی فەهرەی کوڕی مالیکە ، کوڕي « کعب » ە لەوەحشی‌یەی کچی شەیبانە لەبەنی فەهرەی کوڕي مالك ، کوڕی « لؤی » ە لەماری‌یەی کچی کەعبە لەبەنی خوزاعەیە ، کوری « غالب » ە لەسەلمای کچی‌عەمری خوزاعەیە ، کوڕی « فهر » ە لەلەیلای کچی سەعدە لەهوزەیل ـ ئەم‌فەهرە بەلای زۆر لەمێژوو نووسەکانـەوە ئەوەیە کە ناوی دەرکـــردووە بەناوي قورەیشەوە ـ ، کوڕی « مالك » ە لەجەندەلەی کچی حەربی جور هومی‌یە کوڕی « نضر » ە لەعاتیکەی کچی عەدوانە لەقەیسی عیلانی ، کـــوڕی « کنان » یە لەبورەی کچی ( مره ) ی کوڕي ئید دە ، کوڕي « خزیمه » یە لەعە ، کچی سەعدە لەقەیسی عێلانی ، کوڕي « هدرك ) ە لە سەلمای

کچی ئەسلەمە لەقوزاعە ، کوڕي « ایلیاس » ە لەخوندوفەیە ، وەئەمخوندوفە یە بەناوبانگ بووە لەشەرەف و جوامێریا ، کوڕي « مضر » ە لە ڕەبابـەی کچی جوندەي ، کوڕي (معد) ە ، کوڕي «نزار» ە لەسۆدەي کچی عەکەیە، کوڕي « معد » ە لەموعانەي کچي جەوشەمی جورهومي‌یە ، ئەمیش کوڕي « عدنـان » ە .

باوو باپیرەکاني پێغەمەري خوا محمد ـ دروودي لەسەربێ ـ هەتائەگاتە سەر ئەم ( عدنان ) ە بەم شێوەیە زانایان تیا یەك ڕازو ناڕێکی‌یان لەناوا نیە ، بەڵام لەعەدنان بەرەو ژوور جیاوازي زۆریان هەیە تیایانا ، ئەوەندە هەیە هەموویان بەبێ جیاوازي لەسەر ئەوەن کەمحمد نەژادي ئەچێتەوەسەر ئیسماعیل پێغەمەري کوڕي ئیبراهیم پێغەمەر ـ درووديان لەسەربێ ـ . بەم پێیەي پێشەوە ـ وەکو ئەبینی ـ نەژادێکي شیرین وباوك‌و دایك یەك لەیەك ڕەسەنترو پاكو بەڕێزتر بون ، هەتا خواي پەروەردگار لەگەوهەري هەموویان پێغەمەري ئیسلام وڕزگارکەري مرۆڤایەتي وکێتی هێنایە جیهانەوە لەنێواني عەبدوللهو ئامینەدا .

## پـاکێتی نەژادی :

ئەوەي کەشایاني باس‌بێ لێرەدا زنجیرەي باوكو دایکەکان ـ هەموویان بەتێکڕایي ـ بەیەك گەیشتن‌و ژن‌و مێردایەتی‌یان بەشێوەیەکی شـەرعی و لەسەر بناغەی نیکاح‌و مارە بڕین بووە ، وەبەهیچ جۆرێ بەیەك گەیشتنی هیچ جووتێکیان لەڕێگەي بێ‌ئابڕوییو ناڕەواوە نەبووە ، وەبێ ئابڕویی لە هیچ پلەیەکا ڕێی لەم زنجیرە خاوێنە نەکەوتووە . بێ‌گومان ئەبێ وابێ ،

ئەگینا چۆن ئەبێ ڕشتەیەك لە سەرەتاوە لەئیبراهیمەوەبێ و لەدوایی‌دا بگاتەسەر پێغەمبەری خوا محمد دوا کەس لەزنجیرەی پێغەمبەرانا؟ چۆن ئەبێ ئەورشتەیە پیسی‌و چەپەڵی تێ‌کەوتبێ ؟! شتێکی سروشتی‌یە ئەبێ بە پاکی وخاوێنی‌و بێ‌گەردی‌هاتبێ‌ولەهەموونەنگی‌و ناشیرینی‌یەك‌دوورخرابێتەوە .

پێغەمبەر ( د ، خ ) لە زۆر فەرموودە یا لە باسی ئەم پاکی‌و خاوێنی‌یەی نەژادەی دواوە .. لەفەرموودەیەکیا ئەفەرموێ : « خوای گەورە لە ناو نەوەکانی ئیسماعیلا کینانەی هەڵبژارد ، وەلە ناو کینانەیی‌یەکانا قورەیشی هەڵبژارد ، وە لە قورەیشا بەنی هاشمی هەڵبژارد وە منی لەناو بەنی هاشما هەڵبژارد » موسلیم لە صحیحی خۆیا ڕیوایەتی کردووە . وە لە فەرموودەیەکی ترا ئەفەرموێ :

« . . . وە لە پشتی پیاوە پاکەکانەوە هاتوومە ناوسکی ژنە پاکەکانەوە » وە فەرموویە : « خوا وازی لێ‌نەهێناوم و سەرپەرشتی کردووم .. لە پشتی پیاوانی پاك‌داوێنەوە بۆسکی ژنە بەڕێزو پاك داوێنەکان ، هەتا لە نێوانی باوکم‌و دایکما هاتمە جیهانەوە ، وە هیچ باوك و دایکێکم لەسەر شێوەی ناڕەوا بەیەك نەگەیشتوون » وە فەرموویە « من لە مارەکردنی ڕاستەوە پەیابووم ولە هیچ پشتێکما شێوەی ناڕەواو بێ‌ئابڕوویی نەبووە » وە فەرموویە : « لە مارەکردنی ڕاستی‌یەوە باو باپیرانم هاتوون هەر لە ئادەمەوە هەتا سەر باوکم‌و دایکم ، وە لە هیچ پشتێکما بێ‌مارەیی و نەفامێتی تووش نەهاتووم ، وە هەر لە مارە کردنی ئیسلامەوە هاتووم » ئەبوو هورەیرە — خوالێی ڕازی بێ — ئەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا درودی لەسەربێ ـ فەرموویە : « لە هیچ پشتێکا لەخراپکاری‌یەوە نەهاتووم ئەوەتەی لە پشتی ئادەم کناوم ، وە هەمیشە لە هۆزو تیرەی گەورە و

پاکەوە هاتووم ، هەتا لە ناوەندی دوو تیرەی عەرەبی بەڕێزەوە : هاشمی و زوهرە هاتمە دەرەوە »

وە زۆری تریش فەرموودە هەیە لەم بابەتەوە کە بە ڕۆشنی پاکی پاکی نژادو خاوێنی زنجیرەی بەرەبابەکانی پێغەمبەری خوامان ئەخـاتە بەردەم ، چ لە ڕووی بـاوك و چ لە ڕووی دایکیەوە ، وە زانایانیش لە کۆن و تازەدا زۆر لەسەر ئەم بـاسە ڕۆیشتوون و ئەم ڕاستیەیـان دەرخستووە . ( کەلەبی ) ئەفەرموێ : لە نەژادی پێغەمبەرا پێنچ سەد دایکی پێغەمبەرم - لە لایەنی بـاوکیو دایکیەوە - ناو نووس کردوە ، نەمبینی لە ناویانا ( سیفاح ) واتە : بێمارەیی بووبێ ، وە هەموویان بەمارەی وەکو مارەکردنی ئیسلام مارە کراون .

وە باوەڕی زۆر لە زانایان لەسەر ئەوەیە کە کافرێتی و هـاوەڵ ( شەریك ) بۆ خوا دانان نەکەوتۆتە نـاو ئەو زنجیرەیەوە و هەموویـان هەر خوای تاكو تەنیایان پەرستووە ، ( وە بۆ ئەم مەبەسەیان دەسیان بـە فەرمودەکانی سـەرەوە و وێنـەی ئەوانە گـرتورە ، ئەڵێن کافرو بت پەرست پیس و خراپە ، ئەگـەر ئەوانـە کافـرو بت پەرستیان تیابوایە چۆن پێغەمبەر ئەیفەرموو : پاكو چاكو هەڵبژێرراوان . ؟ هەتا ئازەر بەمامی ئیبراهیم دائەنێن نەك باوکی ، وە لە ناو قوریشەکانـا زنجیرەی بـاوکانی پێغەمبەر بت پەرست نەبوون ولەسەرئاینی ئیبراهیم پێغەمبەری باپـیریان بوون . وەهەندێ تریان ڕایان وایـە ئەو ماوەیە بـۆ نیودورگەی عەرەب بەکاتی نەبـوونی پێغەمبەرێـتی ( کاتێ فەترەت ) دائەنرێ ، وە لەبەرئەوە ئەو زنجیرەیە بەکافرو بت پەرست دانانرێن . وە بـەتایبەتی بـۆ عەبدوالله و ئـامینە هەندێ لە زانایان ئەڵێـن : لەدوای

پێغەمبەرێتی محمد خوای گەورە زیندووی کردنەوەو دوسامان بوون و پاشان مردنەوە .

لەم ڕووەوە زانایان زۆر مشتومڕو ڕای جیاوازیان هەیە ، وەهەریەکە شتێکی کردووە بەبەڵگە بۆ خۆی وبەجۆرێ ڕاکەی خۆی پاســاوداوە . وەبەلای منەوە دانانی ئازەر بەمامی ئیبراهیمو لادانی لە بــاوکی لەگەڵ ڕواڵەتی قورئانا ناکونجێ ، بەڵام لـە ئیبراهیم بەرەو خوار هەتایەتە سەر محمد ـ ئەگەرچی بەڵگەیەکی دڵنیــاکەرم نیە بەدەستەوە ـ ئەگەر خوا پاراستبێ‌و کردبێ بەجێگای نزاو پاڕانەوەکەی ئیبراهیم (١) و لەســەر ئاینە خاوێنەکەی ئیبراهم (الأحناف) مابنەوە ـ ئەمە بەلای منەوە دوورنیە ئەتوانم بڵێم : دڵم باوەڕی پێ‌ی هەیە وتۆیش ڕات هەرچۆنە کەیفی‌خۆتە.

وە ئەوە کە مارەکردنی زنجیرەی دایك‌و باوکەکان وەکو مارەکردنی دەوری ئیسلامی‌بێ ـ ئەوە شتکی ڕاســت‌و ڕەوانەو جێگەی ملەجەڕە یـا مشتەو مڕنیەو فەرمودەکانی پێشەوە بەبێ پێـچ‌و پەنا دانیان پیاناوە . وە ئەم جۆرە مارەکردنە باوبووە لە ناو عەرەبەکاناو یەکێك بوە لە جۆرە کانی ژن بە شوودان . . بوخاری لە خاتو عایشەوە ـ خوا لێی ڕازی‌بێ ـ ڕیوایەتی کردوە ئەڵێ :

« ژن بەشوودان لەســەردەمی نەفــامێتی‌دا چوار جۆری هەبوو : یەکێکیان وەکو مــارەکردنی ئیسلام پیاوەکە ناردویێتی‌یە لای‌بــاوك برای ژن و خوازبێنی کردووە و دوای ڕێ کەوتنیان مارەیی‌یان داوە و بۆیان مارەبڕیوە . . . »

---

(١) قورئان لەسوورەتی ( إبراهيم ) دا ئەفەرموێ : (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ : اَللَّهُمَّ اجْعَلْ هٰذَا الْبَلَدَ آمِناً وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنَامَ ) ئایەت ٣٥

ئەجارە با بەیەکەوە بچین بۆلای زانای بەتام و مەزن مامۆستا ( سید عەبدول ڕەحیمی مەولەوی ) لە پەڕاوی ( العقیدة المرضیة ) دا کە لەم بابەتەوە ئەڵێ :

« مەکە مەشریق و مەدینە مەغریب  ‌  باوك عبدوللەی عەبدولموتەلیب
دایك ئامینە کەنیشکی وەهەب  ‌  لە کیلاب دا مولاقی النسب
نەسەبی هەتا عەدنان مەشهورە  ‌  تەعدادی لەکرە غەیرە زەروورە
زەروور ئەمەنە دەس لەمە بدەین  ‌  ئیزهاری پاکی سیلسیلەی بکەین
بینا لە تەحریر تەحریری ڕازی  ‌  خواو پێغەمبەرلێی بوون ڕازی
وقد وافق ذلك الامام  ‌  جماعة من کرام الأعلام
ئاباو ئوممەهات سەییدی عالەم  ‌  هەرلە والیدین هەرتا بەئادەم
بأدلة کا لقصر المشید  ‌  بێ شیرکو ضلال کل علی التوحید
( خصوص والدین ماجدین ) ئەو  ‌  ( أصلین نجیب ناجیین ) ی ئەو
عەقیدەت بۆی ( علی التحقیق ) ە  ‌  ئەهلی نەجاتن بەم سێ تەریقە :
ئەوەڵ نەکەیشت ئەلایان دەعوەت  ‌  لەبەر بوونیان لە وەختی فەترەت
لەگەڵ ئەمیشە جوان‌بوون مردن  ‌  ئیمکانیان نەبوو پۆسەفەر کردن
حوکمی کەسێکیش پێی نەکات دەعوەت  ‌  نەجاتەو داخڵ بوونە بە جەننەت
دووەم بوون لەسەر دینی ئیبراهیم  ‌  بوون لەسەر تەوحید بێ تەردیدموقیم
(ثالث إحیا)ی حەق مەرحەمەتی کرد  ‌  زیندوو بوونەوە و ئیمانیان ئاوورد
ئەم کوزارشە مانعی چی‌یە ؟  ‌  عەقلەن و شەرعەن مومتەنیع نیە
لە دەستی ( محل إیمان بعدالموت )  ‌  هیچ نەفعی نیە ناوێ بۆی فەوت
مەحەلی غەیری خصوصی‌یەتە  ‌  سیوای کەرامەت وای مەنقەبەتە
زیندوبوونەوە لە دوای مردن  ‌  مایەی ئیمانی پێ عەتاکردن

به ڕوتبه بوڵند تا بوون ( متحف ) بۆ زیادەی ( فضل و کمال شرف )

بۆی بۆ ئەوان ( فرق و تفـاوت ) لەگەڵ ( سائرین ) لە ( أهل فترت )

هەر موخالیفێ کە پێی هـاتەبەین ئەگەر زەعیفە قسەی لێ نەکەین

وەرنە ( إن أمکن فقد بۆول ) یا ( منسوخە ) یا ( متروك العمل )

کمـا یفعل فی بعض المســألة إذا تعــارض فیهــا الأدلة )

( حدیث )ی (ضعیف) ئەرێی لەناوە بەم ( حدیث ) ە کار مونکیر تەواوە

( فیە یقول جل وعــلا : إنی حـرمت النـار علی

( صلب أنزلك بطن حملك حجر کفلك ، فما بقی لك )

( والحاصل ) ئەو (بدر) زوڵمەت زەدای لەیل

ئەو میهری (أیام) لە ( ضیا ) ی ئەوکەیل

وە (برج) ی ( أصلاب طیبات ) دا وەدارەی ( أرحام طاهرات ) دا

هەمووی ( أوج برج سعادت شرف ) (حضیض) بەرکەنار وەبال بەرتەرەف

( رأس و ذنب ) ی ( ضلال ) ی تەکدا

ســەرو دۆچکەی ڕۆیی بەیەکدا

لە نیشانەو جێ ئەو زاتی پڕنوور ڕاستی لە تیری نوقسانی ( مهجور )

لە (خسوف عیبب دناأت) بەری لە ( کسوف ریب خنـاأت عری )

( طلوع ) ی سەرداو ( غروب ) ی ئاورد

( حرکـەو سەیرو دەوری ) ی تەواو کرد

تــابشنوێ بۆی نەســیمی ئەزەل لە وەختی ( ربیع ربیع الأول )

بەسـەد نەزاکەت لە تۆی پەردەوە خونچەی وجووی خەندەی کردەوە

عەجەب خەندەیە حیکمەت چەند تەرزکرد

غەلغەلەی کریەی بولبولان بەرز کرد »

## بەشی دووەم : مەکەو قورەیش

### نیوە دوورگەی عەرەبی

نیوەدوورگەی عەرەبی کەوتۆتە خوارووی ڕۆژ ئاوای کەرتەی ئاسیا وە. سنوورەکانی : لە سەرەوە دەشتی شام و لە خوارووەیەوە دەریای عەرەب‌و کەنداوی عەدەن ، لە ڕۆژ هەڵاتی‌یەوە کەنداوی بەسرەو کەنداوی عومان و لە ڕۆژئاوایەوە دەریای ســـوورە . وە لە زۆرترین لایەوە بە دەریا تەنراوە . . . لە ڕۆژ ئاوایەوە دەریای سوورو لە ڕۆژ هەڵاتی‌یەوە کەنداوی عەرەبی و لە خوارووەیەوە دەریای عەرەبی‌یە .

ڕووەکەی : زەوی ئەم نیوە دورگەیە لـە ڕۆژ ئاوادا بەرزە ، وە هەتـــا بەرەو ڕۆژ هەڵات ئەڕوات هەر نزم ئەبێتەوە ، وە لە لای ڕۆژ ئاوایەوە کەژی بەرز بەرزی هەیە لە نزیك دەریای سووردوە لە سەرەوە وە بۆ خوارەوە ، وە هەروەها لە خوارووی ڕۆژ ئاوایی‌و کەنداوی عومانەوە وە لە ناوەڕاستیا چەند بیابانێکی گەورەی وشکی بە لم دا پۆشراوی تیایە .

ئاوو هەوای : ئاوو هەوای ئەم نیوە دورگەیە بـە شێوەیەکی گشتی گەرم و بە تینە ، بەڵام لە شـــوێنە بەرزەکانیا پلەی گەرما کەمێ دێتە خوارەوە .

بەشە گرنگەکانی ئەم نیوە دورگەیە :

١ ـ حجاز : لەڕۆژ ئاوای نیوەدورگەکەوە درێژئەبێتەوە بۆ خوارووی ٢ ـ یەمەن : ئەکەوێتە خوارووی حیجـازەوە . ٣ ـ نەجد : ئەکـەوێتە ناوەڕاستەوە . ٤ ـ یەمامە : لەخوارووی حیجازەوەیە . ٥ ـ بەحرین :

لەسەر کەنداوی بەسرەیە . ٦ ـ عومان : لەسەر کەنداوی عومانە .

ئەم نیوە دوورگەیە نیشتمـانی کۆنی عەرەبەکانە ، وە هەرچی عەرەبە لێرەوە کۆچیان کردووەو ڕوویان کردۆتە وولاتانەی ئێستە تیایا ئەژین و کردویانن بە نیشتمانی خۆیان .

شـاری مەکـە : لە بەشی حیجازا لە دۆلێکا کە چەند ڕیزە شاخێك دەوریان داوە و تەنیا سێ ڕێگەی لێ ئەبێتەوە : ١ ـ بۆلای یەمەن ، ٢ ـ ڕووبەدەریای سوور ، ٣ ـ ڕووبەلای فەلەسـتین ، ئالەم دۆڵەشدا شاری مەکە بنیات نراوە .

ئەوەی جێگای باوەڕە بەلای مێژوو نووسەکانەوە یەکەم کەسێ مەکەی کرد بە ئاوەدانی وتیایا دانیشت ئیسـماعیلی کوڕی ئیبراهیم بووە ( درووبان لەسەربێ ) ـ . وەدروستکردنی مەکە لەلایەن ئیسـماعیلەوە سەر ئەکێشی بۆ باسی داستانی خۆی و ئیبراهیمی باوکی

داستانی ئیبراهیم :

ئیبراهیم لە دایك بووە لە ناوچەی کوردستـانی عیراقا لە دەوروبەری موسڵ و هەولێر ، باوکی ئیبراهیم ناوی ئازەر بوو ، دارتاش بوو ، وەبتی ئەتاشی و ئەیفرۆشت بە خزم و دراوسـێکانی ، وە کەلەکەیان بت پەرست بوونو کڕنوشیان بۆ ئەو دارو بەردە بێ گیانانە ئەبرد ،

کاتێ ئیبراهیم پێ گەیی و هۆش و گۆشی پەیاکرد بینی وا باوکی دار و بەرد ئەتـاشێ و خزمو دراوسێکانی ئەیـان بەنو دەس ئەکەن بە پەرستنیانو کڕنوشیان بۆ ئەبەن و داوای خێرو بێرو شتیان لێ ئەکەن ، بینی ئەو خەڵکە مرۆڤایەتی یەکەیان لە جێگای خۆیا نەماوە ، بەندایەتی و گەردن کەچی ئەکەن بۆ ئەو دارو بەردە بێ گیانو بێ دەستەلاتە ا ا ،

وە بەتەمای خێرو چاکەن لێیانەوەلەوە ، ئەترسان کەلێیانەوە تووشی زیان بین !! لێرەدا بۆی دەرکەوت ئەمە شتێکی هەڵەو ناڕاستەو شایانیشانی مرۆڤت نیە ، وە بۆیە کەمجارلەم ڕووەوە لەگەڵ باوکیا دواو کەوتە وتوێژکردن‌و وتی : تۆ چۆن بۆ خۆت دروستی ئەکەیت‌و ئەیدەیتە بەر تیغ و کەچی دوایی ئەی پەرستی ! باوکی وەڵامێکی وای بەلاوە نەبوو دەمکوتی ئیبراهیمی پێبکا ، وەئەیش ترســا کە ئەم باوەڕەی لە دلی خەڵکا جێگیر ببێ و ببێتە هۆی کزبوونی بازاڕەکەی ، بۆیە زۆر لەگەڵیا خەریك‌بوو کەوازی پێ بهێنێ‌و لەو باوەڕە لای بدا ، بەڵام دەستێکی پەنهــانی ئیبراهیمی پەروەردە کردووەو پێی‌کەیانوەو تێی‌کەیاندووە ، هەویری ئیبراهیم بەتایبەتی شێلراوەو لەش و لارەکەی پێڕێکخراوە ، ئیبراهیم بارمەتی‌یەکی تایبەتی لەگەڵایەو بۆ ئیشێکی گەورە نێراوە . . ئەبێ شێوەو باوی سەرزەوی بگۆڕێ‌و بەرنـامەی خوایی بێنێ بۆ مرۆڤەکان و ئەو بەرنامە پیسەی بەردەستیان لابەرێ‌و ئەبێ پێشەواو مامۆستای مرۆڤەکان بێ ، ئیتر چۆن ئەبێ ترسی نابووری یا ترسی ژیان تینی تێبکاو لە باوەڕەکەی خۆی وازی پێبێنێ ؟

ئیبراهیم کەوتە ئامۆژکاری کردنی باوکی و مرۆڤەکانی دەوروبەری بەتێکڕایی ، وە هەولی ئەدا عەقڵیان بجوڵێنێ‌و لەو هەڵە گەورەیەی بت پەرستی‌یە لایان بدا و بیانکا بە خوا پەرست ، بەڵام ئەوان بەرچاویان گیرابوو وە بە سەر زەویداو نەیان ئەتوانی ســەر هەڵ بڕن هەتا حەق و ڕاستی بدۆزنەوە و ببنە خواپەرست . ئیبراهیم بە هەموو شــێوەیەك کەوتە پەشیمان کـردنەوەیان ، یەکێ لەو شێوانە ئەوەی خواردوەیە کە قورئان پیشانمان ئەدا : [ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَباً قَالَ : هٰذا رَبِّي ، فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ : لا أُحِبُّ الآفِلِين ، فَلَمَّا رَأَى القَمَرَ بَازِغـاً قَالَ : هٰذا

رَبِّيْ ، فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ : لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ ، فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ : هَٰذَا رَبِّي هَٰذَا أَكْبَرُ ، فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ ، إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ] اَلْأَنعام «٧٧ - ٧٨ - ٧٩ - ٨٠ »

یانی : کاتێ ئیبراهیم شەوی بەسەرداهات و ئەستێرەی بەئاسمانەوەبینی وتی : ئەمە خوای منە ، بەڵام کە ئەستێرەکە ڕۆیی و ئاوا بوو و لە چاو گوم بوو وتی : من شتی ئاوابووم خۆش ناوێ و بۆ خوایەتی ناشێ ، وەکە مانگی بینی لە کەلەوە هەڵهات بەورشەو پرشەوە گزشەی کێشا ووتی : ئەمەیە خوای من ، وە کە ئاوا بوو خۆی شاردەوە ، وتی : ئەگەر خوای خۆم ڕێنمایی و ڕابەریم نەکا لە گروهی گومڕاهان و سەرلێ شێواوان ئەبم ـ واتە ئەوانەی شوێن شتی بێ بایەخ ئەکەون گومڕا و سەرلێشێواون ـ وەکە بینی ڕۆژ هەڵهات و جیهانی ڕۆشن کردەوە و گەرمایی‌دا بە گیتی و بە هەزاران نازو نەزاکەتی نوان ، وتی : ئەمەیە خوای من ، ئەمە لە هەموان گەورەتر و بەدەسەڵاتترو بە سوودترە کە لە پاشان ئەویش ئاوابوو خۆی گوم‌کرد ، وتی : خزمینە هەموو بزانن : من دوورم لە باوەڕی ئێوە و لەو پرستنانەی ئێوە و لەوانەی ئەیانکەن بە هاوەڵی خوای مەزن ، چونکە نەدەستکردەکانی سەرزەوی و نەئەستێرەو مانگ و ڕۆژی ئاسمانەکان هیچیان خواو پەروەردگار نین و شایانی بەندایەتی بۆ کردن و پەرستن نین ، وە خوای پەروەردگار ئەبێ بەندەکانی خۆی یەك توز لێیان گوم و بێ ئاگانەبێ . من ئەمانەی ئێوە و وینەیان و لەوان بەرزتریش بە خوا نازانم ، ڕووی دڵ و دەروونی خۆم ئەکەمە ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بە هەموو شتەکانیانەوە ، وە من پاکم و هیچ ناکەم بە هاوەڵی و بە تەنیا

هەر بەندایەتی ئەو ئەکەم و گەردن هەر بۆ ئەو کەچ ئەکەم و بەس

بڕوانە لێرەدا ئیبراهیم ( د ، خ ) بەشێوەیەك لەگەڵ خـزمو گەلەکەیا دواو ویستی لەبت پەرستی لایان بداو بیانکا بەخوا پەرست ، وەکوخۆیشی هاو باوەڕیان بێ بەڵام بەژیری ولێکدانەوە بۆی دەرکەوتووە کەئەوبتانەیان بێگیانو بێسوودن وبۆخوایەتی دەس نادەن وەکـو هەر لەو سوورەتەدا نەختێ لەپێش ئەوئـایەتانەوە ئەفەرموێ ( وإذ قَال إبْراهِيـمُ لِأَبِيهِ آزرَ أَتَتَّخِذُ أَصْناماً آلِهَةً ؟ إنيّ أراك وقَومك فيضلالٍ مُبِينٍ ) الأنعـام[1] یـانی ئیبراهیم بەئازەری باوکی ووت بابە ئایا تۆ ئەوبتانە بەخوا دائەنێیت ؟! بەڕاستی من تۆو خزمەکانیشت لە گومڕاهی وسەر لێشێواوییەکی ئاشکرادا ئەبینم

جا لەم پلەیەدا ویستی دوای باس کردنو ڕۆشن کردنەوەی ئەوە کەئەو بتانە بەکاری خوایەتی نایـەن ـ ویستی لەگەڵیانا بڕوا لەباسەکەدا ، و بـە شێوەیەکی ژیرانە بەهەموویانەوە بۆخوای هەقو ڕاستەقینە بگـەڕێن ، وە پلە پلە لەگەڵیانا سەرکەوت لە ئەستێرەوە بۆ مـانگ و بۆ ڕۆژ ، وە بۆ هەموویان بەڵگەی هێنایەوە کە ئەمانە خوانین چونکە ئەمانە گەڕۆکن و ئەڕۆن و گوم ئەبن ، وە خوا ئەبێ دروستکەری ئێمەو ئەمانەیشو تەواوی ئاسمانەکانو زەوی بێو یەك تۆز لێیان بێ ئاگانەبێو بەجێیان نەیەڵێ و هەموو کاتێ پەروەردە و پارێزگاری یان بکات ، وە ڕێكوپێکی و تێكنەچوونی ئیشوکارەکانی ئەم گەردون و گێتییە گەورەیە گەواهە ( شاهیدە ) لەسەر ئەوەی تاكو تەنیایە و هاوەڵی نیە

ئەمەیە باوەڕی من لێرەدا دەربارەی پێغەمبەرێکی گەورەی وەکو ئیبراهیم ( د خ ) نەك بیخەمە گێژاوی دەریای سەرکەردانییەوە و لە

دارپەررستی بۆ ئەستێرەو مانگ و ڕۆژ پەرستی‌یەوە بیبەم و بەدەستکردەکان بڵێن : خوای منە ، پاشان بە هەزارحاڵ خوا بدۆزێتەوە ! ! .

کە خزمەکانی ئەم هەموو بەڵگەو بورهانانە تێی تێ نەکردن و وازیان لە بت پەرستی نەهێناو لە سەرباری خۆیان بە نەگریسی مانەوە ، ئیبراهیم بیری کردەوە لەوەی بـــاری خۆی بگۆڕێ لە گەڵیاناو بە شێوەیەکی تر بێیـان بگەیەنێ کە ئەو بتانە شایانی پەرستن نین هات لە هەڵێکا خۆی گەیانە بتخانەکەیان و هەموو بتەکانی ـ بێجگە لە بتە گەورەکەیان ـ شکان ، ئنجا تەورەکەی نا بەسەر شانی بتە گەورەکەیانەوە و بەجێی هێشتن ، کە خزمەکانی بەم کارەساتەیان زانی وتیان : ئەبێ کێ وای کردبێ لەخواکانمان و ئەوەندە ستەمکاربێ ؟ وتیان : بێت و نەبێت ئەمە ئیشی کوڕێکە ناوی ئیبراهیمە ، هەرئەوە لە دژیان ئەدوێ و بەهیچ و پوچیان دائەنێ ، وتیـان بڕۆن بەدیار چاوی خەڵکەوە بیهێنن با شایەتی لێبدەن که هاتەلایان وتیان : ئەوە ئیبراهیم تۆ وات کردوە لە خواکانمـان ؟ وتی : ئەوە گەورەکەیان لێیان تووڕەبووەو وای لێ کردون ، لێیان پرسن ئەگەرقسە ئەکەن و توانای دواندنیان هەیە .

ئیبراهیم بەم ڕێگەیە تێی گەیاندن کە لەسەر خەرافات وشتێکی پڕوپوچن ، وە وتەکانی ئیبراهیم تەواوو ڕاستن و ئەمـــان وان لە ناو هەڵەو سەرگەردانی‌یاو ناڕاستن ، لێرەدا بیریان کردوە و بە خۆیان وت : بەڕاستی ئێوە زاڵم و گومڕاهن ، بەڵام لەجیاتی ئەوە بچنە سەر باوەڕەکەی و لەبەر ڕۆشنایی عەقڵا بڕۆن و بڵێن : بەخوا ڕاست ئەکەیت و باوەڕی پێ ئەهێنین . لەجیاتی ئەمە سەریان داخست و وتیان : خۆتۆ ئەزانی ئەوانـە قسەو دوواندنیان‌نیە لێرەدا ئیبراهیم باوی بۆ خۆش بوو و بەشێوەیەکی ورد و

حەکیمانە فەرمووی : ئەی ئێوە چۆن بەندایەتی بۆ شتی‌وا ئەکەن کە هیچ دەستەلاّتی نەبێ و نەسودتان پێ‌بگەیەنێ و نەزیان و کە هیچ نەبێ نەیش توانێ قسەبکا ؟ ! ! هاوار بۆ خۆتان و بۆ ئەو خواو پەرستراوانەتـان کە ئەیان‌پەرستن ! ! ، تاکەی ژیرنابن‌و تاکەی بیرناکەنەوە و تاکەی لەکەڵی شەیتان‌و لە نە فامیتی‌نایەنە خوارەوە ؟ ! .

لێرەدا لە جیـــاتی ئەوەی باوەڕی پێ‌بکەن و ببنە بەندەی خوای پەروەردگارو دەس بەرداری ئەو دارو بەردو بتە تێك شکاوانە ببن ، لە جیاتی ئەوە کەوتنە قڕە و هەراو و لەسەر نەفـامیتی‌یەکەیان سووربوون و وتیان بەیەکتر : لەسەر خواکانتان بکەنەوەو بە ئاگر بی‌سووتێنن ، هاتن ، ئاگرێکی ئێجگار گەورەو لە ئەندازە بەدەریان کردەوە و ئیبراهیمیان تێ‌فرێ‌دا ، هەتا بسووتێ بۆ ئەوەی خۆیان‌و خواکانیان ڕزگاریان ببێ ، وە ئیبراهیم ببێتە ئامۆژکاری بۆ هەرکەســێکی تر کە بەو دواندنانەی ئیبراهیم باوەڕی بەرامبەری بتەکانیان ژلوق بووە ، ئەمە خەیاڵی ئەوان بوو !! بەلاّم ئیبراهیم دەستێکی پەنهانی یارمەتی ئەداو خوای پەروەردگار لە پشتێتی و ئیشی پێ‌یەتی و ئەی‌پـارێزێ و نـایەڵێ لەناو بچێ ، خوا فەرمووی بەو ئاگرە بڵێـسەدارە : ئەی ئاگر ساردبە بەسەر ئیبراهیمەوە ، ساردێکی بێ زیان . ئیتر ئاگرەکە ســارد بۆوە ، بەلاّم ساردێکی وانە کە ئیبراهیم سەرمای ببێ ، لە پاش کوژانەوەو دامردنەوەی ئاگرەکە . ئیبراهیم بە هێواشی هاتەدەرەوەر و نەختێ خۆی تەکان ، ئیتر بەبێ ئەوەی گەرما یـا سەرمای بووبێ .

قورئانی گەورە ئەم بەسەرهاتەی ئیبراهیم مان لەسوورەتی( الأنبیاء )دا بە درێژی بۆ ئەگێڕێتەوە ، ( بچۆ سەیری بکە ) .

## کۆچ کردنی ئیبراهیم :

ئیبراهیم پێغەمبەر ( د ، خ ) ـ هەرچی هەوڵی‌داو خۆی تووشی ئازارو چەرمەسەرێ کرد بێ سوودبوو ، چونکە کەلەکەی نەیانەویست تێ‌بگەن‌و هەموو بەڵگەیەکیان هەربرپتی‌بوو لە شوێن کەوتنیان بۆ پێشینانیان ، وە بەهیچ جۆرێ بۆی لانەدران لە بت پەرستی و وازیان لە باری نارەوای خۆیان نەهێناو نەبوون بەخواپەرست ، سەرەرای ئەویش ئەیان‌ویست لەناوی‌بەرن ، لەبەرئەوە خۆی بە ناچارزانی کە لەو وڵاتە باربکا و بروا بۆ شوێنێ کە باوەر بە ئاینەکەی بکەن و خواپەرست‌بن لەگەڵ خاتوو ( سارە ) ی خێزانی و ( لوط ) ی برازایا رۆیشتن بۆ فەلەستین ، وە لەوێوە ـ ئەڵبەتە کوێرایەڵی‌یان نەکردوە ـ لەگەڵ خاتوسارەدا چون بۆ میسر ، لەوکاتەدا ( هکسوس ) ـ کە یەکێکە لە پاشاکانی عەمالیقە ـ پاشای میسر بوو ، ئەم پاشایە خووی وابوو : هەرکەسێکی بدیایە ژنی جوانی ببوایە لێی داگیرئەکرد ، وەبێجگە لە ژن کچو خوشك و دایك و دەس‌وپێوەندی تربوایە دەستی بۆ نەئەبرد ، خاتوسارە ژنێکی جوان‌و شۆخ و شەنگ‌بوو ، ئیبراهیم کەبەو خووە نارەولیەی زانی وای‌پیشان‌دا کە سارە خوشکیەتی(۱) بۆ ئەوەی لەو چنگە پیسە رزگاری بێ ، بەڵام کە پاشاسارەی بینی حەزی لێ‌کرد و ویستی کە لە ئیبراهیمی بخوازێ ، بەڵام پێش ئەوەی لە ئیبراهیمی بسێنێ و دەسی بۆ ببا لە خەوا هەرەشەی

---

(۱) مەبەستی خوشکی ئاینی بوو

توندیان لێ کرد و تێیان گەیان کە ئەو ئافرەتە مێردی هەیەو ئەو ناتوانێ بـە هیچ جۆرێ نزیکی بێتەوە ، کەلـە خەو هەڵسا بە خێرایی نـاردی بەشوێنی ئیبراهیما و کەلێ هات بەسەریا کەنەیوتووە سارە ژنیەتی خەڵاتی زۆری کرد ، لە ناو خەڵاتەکانیا کەنیزەکێکی شیرینو ڕەسەنی تیابوو ناوی ( هاجەر ) بوو .

## لەدایك بونی ئیسماعیل :

وادیارە ئیبراهیم ـ لەبەر هەرهۆیە بوە ـ لە میسرا نەماوەو هاتۆتەوە بۆ فەلەستین ، وە لەبەرئەوەی ســارە ئامۆزاو دلسۆزی ئیبراهیمبوو ، وە ئەشیزانی نەزۆکەو منالی نابێ وە پێی نـاخۆش بوو ئەو ئامۆزا بەڕێزەی بێمنالو وەجاخ کوێربێ ، لەبەر ئەمە داوای کرد لە ئیبراهیم کەبچێتەلای هــاجەر بەڵکو خوای گەورە منالیــان بداتێ . وادیــارە ئیبراهیم خۆیشي ئــاواتە خوازبووە کەخوا کوڕێکی وەجــاخ زادەی خواپەرستی موسڵماني بداتێ ، بۆیە لەخوا پاڕایەوە کەخوا کوڕێکي ئەخوا ترسو چاکي بداتێ وخواش نزاکەی گیرا کرد ، وەکو قورئان ئەفەرموێ ئیبراهیم وتي : (رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ) ( الصافات )[1]
وەبەفرمانیخوا زۆری پێنەچوو خوای پەروەردگار ئیسماعیلی پێبەخشین لەخاتو هاجەر . شتێکي سروشتییە کە ئیبراهیم و هاجەرو سارەیش زۆر دڵخۆش ن بەبوونی ئەم کوڕە ، پیاوێکی وەکو ئیبراهیمی پیری ڕیش سپی ئاوارەی دوور لە کەس و کارونیشتمانی ئەڵبەتە بەم کوڕە تاقانەیە دڵشادو ڕەنگە بەهیوای پاشە ڕۆژی خۆی و خێزانەکەی دانابێ و کەلێ دڵی پێوەی بەند و وابەستەی بووبێ .

(١) ... آیە : ١٠١ ...

## هاجەرو ئیسماعیل ئەڕۆن بۆ مەکە :

خوای گەورە خواهیشی وابوو کە ئەو خێزانە بەوپێیە پێکەوە نەژین ، خوا ئیشی گرنگی هەیە بە ئیسماعیل ، بەو منالە شیرە خۆرەیە ، ئەبێ لە پاشەڕۆژ شاری مەکە دروست بکاو ببێتە باوکی عەرەبی موستەعرەبە (مستعربە) و لەو شارەدا بژی و لەگەڵ ئیبراهیمی باوکیا مزگەوتی کەعبە دروست بکەن کە ببێتە قیبلەی موسولمانان حەجی لە دەورابکەن و جێگـای پەرستنی تایبەتی خوابێ ،

بوخاری - لە کتابی بدأ الخلق‌دا - ڕیوایەتی کردوە لەعەبدوڵلەی کوڕی عەباسەوە ئەفەرموێ : « یەکەم ژنێ کەپشتێنی بەستە پشت هاجەری‌دایکی ئیسماعیل بوو ، پشتێنی بەست بۆنیشانەی خزمەتچێتی لەبەردڵی سارە خاتون ، پاشان ئیبراهیم بەفەرمانی خوا هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی - کەلە تەمەنێ دووساڵیدابوو شیری ئەخوارد - هەڵگرت وبردنی لەلای جێـگەی کەعبە لەبن دارێکدای نان لەپشتی زەمزەم وسەراوردی کەعبەی ئێستەوە ، وەلەبەر بێ‌ئاوی مەکە ئاوەدان نەکرابووەوە وکەسی تیا نەئەژیـا ، تۆێشە بەرەیەکی لادانان خورمای تیابوو جەوەندەیەکیش ئاوی تیـابوو ، دوایی ئیبراهیم گەڕایەوە بۆولاتەکەی خۆی لەفەلەستین . هاجەر شوێنی کەوت وبانگی کرد : ئەوە ئیبراهیم بۆکوێ ئەڕۆیت وئێمە بەجێ یەڵی لەم‌شیوە چۆڵە ؟، وەچەند جار ئەم بانگ‌و هاوارەی کردو ئیبراهیم لای لێ‌نەکردەوە پاشان ووتی : ئایا خوای گەورە فەرمانی پێداوی بەم کردەوەیە ؟ ، فەرمووی بەڵێ ، وتی : دەی کەوابێ خوا یارمەتیمان ئەداو تووشی خراپە نابین ، ئیتر گەڕایەوە بۆلای ئیسماعیلی کوڕی ، ئیبراهیم ڕۆیی بەبێ لا کـردنەوە

هەتا گەییشتە سەنی یە ( شوێنێکە لەسەرووی مەکەوە لەڕێگای عەرەفاتو مینادا ) کەئەوان نەیان ئەبینی ڕووی کردە جێگاکەی کەعبەو ، دەسەکانی بەرز کردەوە بۆئاسمانو لەخوا پاڕایەوەو ، وتی : ( ربنا إنی أسکنت من ذریتی بواد غیر ذی زرع عند بیتك المحرم ، ربنا لیقیموا الصلاة فاجعل أفئدة من الناس تهوی إلیهم وارزقهم من الثمرات لعلهم یشکرون ) « سوورەتی الابراهیم» یانی : ئەی خوای ئێمە من هەندێکم لەمناڵەکانی خۆم نیشتەجێ کرد لەدۆڵێکی وشکی بێ کشتو کاڵا ، لەلای ماڵە ڕێز لێ گیراوو قەدەغە کراوەکەی تۆدا ، ئەی خوای ئێمە .. ، بۆئەوە نوێژ بکەنو بەندایەتی تۆ بکەن وهەر بەتەنیا تۆ بپەرستن ، تۆیش بەگەورەیی خـــۆت ڕووی دڵی مرۆڤیان تێ بکەو ، لەمیوەو بەرو بووم ڕزقو ڕۆزی‌یان بدە ، هیواموایە سوپـاسـت بکەن .

دایکی ئیسماعیل دەستی کرد بەمەمکە دان بە کوڕە بچکۆلەکەی ولە ئاوەکەی ئەخواردەوە هەتا چەوەندەکە ئاوی تیا نەماو تینویەتی زۆری بـۆ هێنان ، سەیری کرد لەبەر بێ‌شیری‌و بێ‌ئاوی ولەتینوانا تەپاوتلی ئەکرد ، دایکی لەتاوی کوڕەکەی کەوتە هەڵپەو پەلەقاژە ، تەپی سەفای بینی کە نزیکترین تەپ بوو لێ‌یانەوە ، ڕای کـــرد بۆسەری‌و ، ڕوانی بەم لاولادا بەڵکو هاوارێ ، کەسێ ، ئاوێ ، فەریاد ڕەسێ ببینێ ، هیچـــی دەس نەکەوت،شۆڕ بوەوە بۆڕێکەو دۆڵەکەو خۆی‌هەڵکردوڕای کرد بۆ سەرتەپی‌مەروە بەڵکو شتێکی دەسگیر بێ ، بەڵام بێ‌سوود بوو ، بەم پێ‌یە حەوت کەڕەت بەگورگە لۆقەو نیوە ڕاکـــردن بەرز بوەوە بـۆسەر تەپی سەفاو لەوێوە ئەهاتەوە خوارەوەو ، ئەچوە سەر تەپی مەروە ( سەفاو مەروە دووتەپن لە نزیکی کەعبەوە) ، عبداللەی عەباس ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ـ درووودی لە

سەربێ ـ فەرمووی : لەوساوەوە بێیاد کردنەوەی ئەوکاتەی دایکی ئیسماعیل هات‌و چۆی نێوانی سەفاو مەروە بۆتە پێویستی‌یەکی حەج کردن .

کەئەجاری حەوتەما کەگەیشتە سەر مەروە گوێی لەدەنگێ بوو، بە خۆی ووت : بێدەنگ . کەهەم بیستی‌یەوە وتی : گوێم لێت بوو بەڵکو بە هاوارم بگەیت ، کە هاتەوە بۆلای کوڕەکەی بینی فریشتەیەك لەشێوەی پیاوێکایەو بە پاژنە ( یا بە باڵ ) داویتی لەزەوی‌یەکە لەشوێنی زەمزەما و ئاو هەڵقوڵی و هاتەسەرەوە ، هاجەریش لەترسی ئەوە کە نەوەك بیرێتەوە گۆمی بو کردو بەدەس هەڵی ئەکۆستەناو جەوەندەکەو ئـــاوەکەش هەرهەڵئەقوڵی . پێغەمبەری خوا ـ درودی لەســـەربێ ـ ئەیفەرموو : ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ دایکی ئیسماعیل ئەگەر وازی لێ بهێنایە کانی‌یەکی لەبەر ڕۆیشتوو ( جاری ) ئەبوو هەتاهەتایە .

خاتو هاجەر دەسی کرد بە ئاو خواردنەوە دەرخواردی کوڕەکەی‌دا تا تێر ئاوبوون ، فریشتەکە پێ‌ی‌وت : مەترسن لە توشی خراپە هـاتن ، ئالێرەدا ماڵێکی خوایە ئەم کوڕەی تۆ و باوکی دروستی ئەکەن ، وەخوای گەورە بەندە ڕاستەکانی خۆی توشی خراپەناکات . وە شـوێنەکەی کەعبە بەرزایی‌یەك بوو لە زەوی‌یەکەدا لافاو لەم‌لاو لایەوە ئەڕۆیی .

بەوپێ‌یە مانەوە ( لە ئاوەکەیان ئەخواردەوە لە جیـــاتی خواردن و خواردنەوە ) هەتا کاروانێ لەجورهوم‌یان بنەماڵەیەك لە جورهوم (جورهوم = جرهم ، تیرەیەك بوون لە یەمەن لەنەوەی ســـامی کوڕی نوح درودی لەسەربێ ) بەوێداتێ‌پەڕین لە ڕێگەکەدا کە ئەوەتە لە سەرووی مەکەوە و بون لە پی‌یێی مەکەوە بەزین ، باڵندەیان بینی ئەسوڕایەوە ، وتیـان : ئەمە باڵندەیە لەسەر ئاو ئەسوڕێتەوە ئەوەتەی ئێمە لێرەوە هات‌و چۆئەکەین

ئاومان لەم دۆڵەدا نەدیوە ، پیاوێ یـا دوانیان ناردو گەڕانەوە و هەواڵی ئاوەکەیـان دانێ و ئەوانیش هاتن بۆ سەر ئاوەکەو دیتیان وادایکی ئیسماعیل لەسەر ئاوەکەیە ، پێیان ۆت : ئایا ڕێگەمـــان ئەدەیت بێین لێرە دابەزینو ئاوەدانی بکەینەوە ؟ وتی : بەڵێ ، بەڵام ئەبێ ئـاوەکە بەدەستی خۆیەوەبێ و ئەوان بەشیان نەبێ تیایا ، وتیان : باشە و دایکی ئیسماعیل پێی خۆشبوو هاومالّ و هاودەمی بۆ پەیابێ . ناردیان مـاڵ و خێزانیان هێناو لەوێدا نیشتەجێ بوون لەگەڵیاناو بوون بە چەند مـاڵێ ، ئیسماعیل لە ناویانا گەورەبوو و فێری زمانی عەرەبی بوو لێیانەوە ، وە لەناویانا هەڵکەوتوو و پێ کەوتوو بوو ، هەموویان ڕێزیان لێ ئەگرت و خۆشیان ئەویست ، کە گەورە بوو ، ژنێکیادایە ناوی ( عەمـارەی کچی سەعد ) بوو ، دایکی ئیسماعیل کۆچی دوایی کرد ( لە تەمەنی نەوەد ساڵیداو لە حیجرا کە بەشێکە لەلای ژوورووی کەعبە ئەسپەردەکرا ) . ئیبراهیم هات بۆ سەردان لە منداڵەکانی لە مەکە هەمومانگێ ئەهـــات سەری لێ ئەدان و هەر ئەو ڕۆژە ئەگەڕایەوە بۆ مـــاڵەکـەی فەلەستین ئیسمـاعلی نەبینی لە ژنەکەی پرسی : ئیسمـاعیل لەکوێیە ؟ وتی : چوە ڕۆژیمان بۆ هەوڵ بدا ، پاشان لێیی پرسی : ژیانو گوزەرانتان چۆنە ؟ وتی : زۆر خـراپ و نـاڕەحەتین و زۆر کوڕوزایەوە ، فەرمووی : کە ئیسماعیل هاتەوە سەلامی منی پێبگەیەنە و پێی بڵێ : لاشیپانی دەرگاکەی بگۆڕێ . کە ئیسمـاعیل هاتەوە وەکو هەستی بەشتێ کردبێ و ، ووتی : کەس هاتەلاتان ؟ وتی : بەڵێ پیاوێکی ڕیش سپی وەهاو وەهایی هات و هەواڵی تۆی پرسی هەواڵم دایەو پرسی لە ژیانمان و منیش وتم هەژارو نەبووین و نـاڕەحەتین . فەرمووی : ئەی ڕاسـپێردەیی هیچی نەکردی ؟

وتی : با ، فەرمانی پیادام کەسەلامت پێبکەیەنم و ئەی وت : لاشیپانی دەرکاکەی بگۆڕێ . فەرمووی : ئەوە باوکم بووە و فەرمانی پیاداوم کەدەس لە تۆ هەڵبکرم و بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوك و کەسەکانت ( ئەم سەردانەی ئیبراهیم دوای جاری سەربڕینەکەی ئیماعیل بوو ، باس نەکردنی لێرەدا مانای نەبوو نی‌نیە) .

ئیسماعیل ئەو ژنەی تەڵاقداو ژنێکێ تری لێمارەکردن ( نـــاوی عاتیکە یا بەشامە یا سەلەمەی کچی موهەلهەل بوو ) ئیبراهیم مـــایەوە ئەوەندەی خواویستی ، پاشان هاتەوە بۆسەر دانیان و ئیسماعیلی نەدی ، چوەلای ژنەکەی‌و لێی‌ی پرسی : ئیسماعیل لەکوێ‌یە وتی : چوە هەولی شتێکمـان بۆ بدا ، پرسی : چۆنن و ژیانتـان چۆنە ؟ وتی : سوپاس بۆ خوای گەورە زۆر باشین و لەخۆشیداین ، فەرمووی : خۆراکتان چی‌یە ؟ وتی : گۆشتە ، فەرمووی : ئەی خواردنەوەتان ؟ وتی : ئاو ، فەرمووی : خوایە بەرەکەت بخەرەناو گۆشت و ئاوەوە بۆیان . پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ فەرموی ئەگەر لەوکاتەدا دانەوێڵەیان ببوایە دوعای بۆ ئەکردن تیایـا ، وە لەو خاکەدا نەبێ کەس بەتەنیـا بە گۆشت و ئاو ناژی . ئیبراهیم فەرمووی : کەمێردەکەت هاتەوە سەلامی منی پێبکەیەنەو پێی‌ی بڵێ : لاشیپانی دەرکاکەی دابمەزرێنێ . کە ئیسماعیل هـاتەوە پرسی : کەس هاتەلاتان ، ژنەکەی وتی : بەڵێ ، پیاوێکی ریش سپی‌ی شیرین‌و دیمەن جوان هـــات‌و زۆر سەنای کـرد ، بەشێنەیی لەگوزەرانمـانی پرسي ووتم : زۆر باشین ، وتي ڕاسپاردەیی هیچي نەکردی ؟ وتی : بەڵێ سەلامی لێ ئەکردی و فەرمانی پیادایت کە لاشیپـــانی دەرکاکەت قایم بکەیت ، فەرمووی : ئەوە بـاوکم بووە و داوای لێ کردووم کە دەس لە

تۆ هەڵ نەگرم ،

پاشان مەیلی خوا چەند بوو ئیبراهیم مایەوە ، پاش ماوەیەکی زۆر هاتەوە بۆلای‌یان ودی ئیسماعیل خەریکی تیر چاك کردن بوو بۆراوکردن لەبن دارێکا لەنزیکی زەمزەمەوە ، کەچاوی پێی کەوت دەستیان کـردە ملی یەك وتەوقە ویەکتر ماچ کردن . پاشان فەرمووی بەئیسماعیل : خوا فەرمانێکی پیا داووم ، فەرمووی : بابەگیـان فەرمانی خوا بەجـێ بێنە ، فەرمووی : تۆیش یارمەتیم ئەدەی ؟ فەرمووی : منیش یارمەتیت ئەدەم ، وتی : خوا فەرمانی پیا داوم ئا لێرەدا ماڵێ ـ واتە مزگەوتێ ـ دروست بکەم وپەنجەی ڕاکێشا بۆتەپێك کەبەرز بووبوودوە بەسەر چواردەورەکەیا ئەڵێ : لەوێدا پایەکانیان بەرز کردەوە ،. ئیسماعیل بەردی ئەهێنـا لە کەژەکەو ڕێکی ئەخست وئیبراهیم دیوارەکەی دروست ئەکـرد ، هەتـا دیوارەکە بەرز بووەوە ، ئیسماعیل بەردێکی گەورەی هێناو بـۆی دانـاو ئیبراهیم چوە سەریو دیوارەکەی بەرزئەکـردەوە ( ئەوبەردەیە کەئێستـا پێی ئەڵێن شوێنی ئیبراهیم) وەئیسماعیل بەردی ئەدایە دەس ، وەهەردووکیان ئەیان وت : خوایە لێمان وەربگرە بەڕاستی تۆ ئاگات لەهەموو شتێ هەیە وهەموو شتێ ئەبیستی وهەمووشتێ ئەزانی ( درێژی کەعبە لەو دەسکردەی ئیبراهیمەدا نۆگەز ودەوران دەوریشی سی‌گەز بوو بەگەزی ئەوان )

وەقورئانی پیرۆز لەباسی دروست کردنێ کەعبەدا ئەفەرموێ : [ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكاً وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ ، فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ ، وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِناً ] آل‌عمران(١) ( وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ القَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ ، رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) البقرة(٢)

باسی هێنانی هـــاجەر و ئیسماعیل لەلایەن ئیبراهیمەوە و ، شێوەی



(١) آیە : ٩٦ « (٢) آیە ' ١٢٧

ژیانو ڕابواردنیان و هۆی هێنانەکەیان و چۆنیێتی‌یە کەیان ، مێژوو نووسەکان ڕەنگە هەریکە بەجۆرێ لێکیان دابێتەوە ، بەڵام من ئەم سەر چـــاوە ڕاستە شیرینەم هێنا چونکە دوورە لە درۆو ناڕاستی‌یەوە ، ئەوی کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە جێگەی باوەڕە بەتەواوی .

ئیسماعیل لەو ژنەی دزایی دوانزە کوڕی بوو ، ئەمانە بوون بەباوکی تیرەکانی عەرەبی موستەعرەبە ( مستعربە ) کە دایکیان لە عەرەبی عـاریبە بوو لە هۆزی جورهومی یەمەنی قەحتانی سامی بوو ، وەباوکیان لە دانیشتوانی سەرووی عیراق بووە کە ئێستە نیشتمانی کوردەکانی عێراقەو تەنیا کوردی تیا ئەژی ، ئیتر ئایا نیشتەجێکانی ئەوسایشی کورد بوون یا لەنەتەوەیەکی تربون و کێن و کامانەن ؟ ناتوانم دانی پیابنێم چونکە ســـەرچاوەیەکی باوەڕ پێ‌کراوم بەدەستەوە نی‌یە ، وەئەی دەمە دەستی شارەزایانی نەژاد شوناس .

## سەربڕینی ئیسماعیل لەلایەن ئیبراهیمەوە :

ئەو ئیبراهیمە پیرە ئاوارەیە لەکەس و کارو نیشتمانی ، بە دوومال و دووخێزان لە پیری‌یـا بە هەزار نزاو پاڕانەوە خوا کوڕێکی دایە خوا شایەتی ژیری و لەسەرخۆیی وچاکی بۆ ئەدا ، وە ئەوەبوو ئیبراهیم هەربە فەرمانی خوا ئەو کوڕە و دایکی برد بۆ دۆڵێکی چۆلی بێ ئاو و ئاوەدانی وەکو مەکە و ئاوەدانی تیا دروست کرد ، ئەوکوڕە تاقە دلخۆش کەرەی هاجەری دایکی بوو ، ئیبراهیم جاربەجار و ناوبەناو ئەچوو سەری لێ‌ئەدان

و بەدیمەنەکەی دڵی ئاوی ئەخواردەوەو سـارێژ ئەبوو بێ ئەوەی ئاسەی لێی بشکێ و تێربێ لەسـەیری دیمەنە شیرینەکەی هەر کە کەیشتە ئەمەنێکی وا لەگەڵ باوکیا بگەڕێو کەمێ گەورەبوو ، لە خەوا فەرمانی درا بە ئیبراهیم : ئەبێ ئەو کوڕە تاقانەو هیوایەی خۆتو خێزانەکەت سـەر بیڕی ، ئەو چلۆسکە ئاگرەو ئەوتروسکایی‌یە ڕۆشنایی‌یەت بکوژێنیتەوە کـە ئیبراهیم زانی ئەم فەرمانە لەلایەن خوای گەورەوەیە ئیتر بەبێ هیچ جۆرە دوودڵیو خۆگرتن کەردنی ڕەزامەندیو گوێ ڕایەڵی بۆ کەچ کرد و کەوتە بەجێ‌هێنانی فەرمانە کرنگ و گرانەکەی خوای پەروەردگار . .
وتی بەکوڕە تاقانە نازدارە شیرینەکەی : کوڕی خۆشەویستو جگەر گۆشەم ئەو پەتو تیغە هەڵبگرە بابچین بۆ ئەو سـەرەوە ، بەڵێ ئەو باوکو کوڕە بەیەکەوە ڕۆیشتن ، کوڕ بە خەیاڵی گەڕانو سەیران و دلشـادبوون بە دیمەنی جوانی سروشت و دارو چیلکە هێنان ، باوکی پیری ڕیش سپیشی دلـی قرچەی لێوەیەت ، چونکە ئەڕوا بۆ بەجێ‌هێنانی گرانترین ئیش و کاری خوا بۆ سـەربڕینی کوڕە تاقانە ئاواتەخوازەکەی ، ئەبێ خۆی بە دەستی خۆی سەری ببڕێ و بیکا بەقوربانی ، وە دایکی هەژاریش ڕەنگە بەتەمای ئەوەبێ دارو چیلکەی بۆ بێننەوە و خۆراکی پێ‌ساز بکا بۆیان . .
وە هەریەکە خەیاڵێکی هەیە .
مێژوو نووسەکان ئەڵێن : « لەم کاتەدا شەیتان ئاگری تێ‌بەربوو بۆئەم گوێ ڕایەڵیو گەردن کەچی‌یە کە ئادەمیزاد پێی هەڵسێ ، وەبە سروشتی دوژمنایەتی بۆ ئادەمیزاد کەوتە پەلەقاژە هەتا ئەم قەڵای خواپەرسـتی ڕاستەقینەیە بڕوخێنێ و نەیەڵێ ئیبراهیم و ئیسماعیل بگەن‌بەو پلەو پایە گەورەیە . بۆ ئەم سەرشێواندنە چوە بەرگی پیاوێکی شێوە شیرینەوە وخۆی

گەیاندە هاجەری دایکی ئیسماعیل ووتی : ئەزانی ئیبراهیم ئیسماعلی بردوە بۆ ئەوەی سەری ببڕێ ، وتی درۆئەکەیت ، چونکە باوك نەبوە وەکو ئیبراهیم کوڕی خۆی خۆش بوێ چۆن سەری ئەبڕی ؟ وتی : ئاخر وائەزانێ خوا فەرمانی پیاداوە ، وتی ، جا ئەگەر فەرمانی خوایە با بەجێی بێنێ . کە لێرەدا بێهیوابوو بەپەلە گەیشتەلای ئیسماعیل کە لەدوای باوکیەوە ئەڕۆیی ، هەروەکو لەگەڵ دایکیا دوا لەگەڵ ئەمیشا هەوڵیدا ، دیسان ئەمیش چووبە گژیاو دەری کرد ، پاشان رووی کردە ئیبراهیم و ووتی : بۆ بە تەمای چیت ؟ نەکەی پشتی خۆت بشکێنی و کوڕەکەت سەربڕیت ا دوایی پەشیمان ئەبیتەوە ، ئەوخەوە لەشەیتانەوەیەو بە گوێی نەکەی ، من بۆتۆمە ، پەشیمانی دوایی سوودی نابێ ، هەرچی کردوو هەرچی وت بێسوود بوو ، چونکە ئیبراهیم زانی شەیتانە تف و نەفرەتی لێ کردو دەری کرد ، کەگەیشتنە ئەو جێگایەی ئیبراهیم ئەیویست قوربانیەکەی تیابکا ، روی کردە کوڕە لاوە شیرینەکەی و پەردەی لەسەرنهێنی‌یەکە لادا و فەرمووی : کوڕی ئازیزم لەخەوا فەرمانم پیادراوە : کەمن تۆسەربڕم جاتۆیش تێفکرە و بزانە رات چیە ؟ .

بەڵێ ئیبراهیم ئەی ویست بەزۆر سواری ملی کوڕەکەی بێ وتیغی لێ هەڵ کێشێ ، بەڵکو ویستی داوای ڕاوو ڕەزامەندی لێبکا ، بۆئەوەی ئیسماعیل پاداشی کوێ ڕایەڵی وپایەی بەندایەتی گەورەی دەس کەوێ ، ئایا وەڵامی ئیسماعیل چی‌بوو ، ئیسماعیلی ئەوکوڕە نەوجوانە تازە پێ گەیشتووەی کەهەوڵی دەمیەتی بێ خۆگرتن وبەبێ سێو دووکردن رووی ڕەزامەندیو گەردن کەچی پیشان داو وتی : باوکی بەڕێزم داوای چیت لێ کراوە بیکەو چ فەرمانێکت پیادراوە بەجێی بێنە ، پشت بەخوا من

ئەبێی سەبرو ئارامم ئەبێ‌و مل کەچ ئەکەم .

مێژوو نووسەکان ئەڵێن : ئیسماعیل ووتی : بابەگیان لەپێشەوە هەر چوارپەلم ببەستەو چەقۆکەت تیژبکە وخێرا بیهێنە بەقورگماو بیقرتێنە ، نەوەك تەپاو تل ونارەحەتی بکەم وئازارت بدەم ، کەرات کێشام بۆ سەر برین بەڕوودا بمخە . نەك بەپشتا یا بەلادا ، چونکە ئەترسم کەچاوت بەڕووم بکەوێ‌و دڵت نەرم بێ‌و نەتوانی سەرم بڕی‌و فەرمانەکەی خوا بشکێنی‌و خوا لێمان بڕەنجێ ، وەپاشان ئەگەر رات لەسەری بوو حەز ئەکەم کراسەکەم بەریتەوە بۆدایکم بەڵکوو دڵی پێی ئارام بگرێ .

باوکیشی سوپاسی زۆری کرد .

کاتێ کوڕو باوك خۆیان ئامادە کرد بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکە . . باوك کوڕی بەڕوودا خست‌و تیغی لێ‌هەڵکێشاو کوڕیش ملی ڕاکێشاو گەردنی کەچ کرد ، ئا لەم کاتە ناسکەدا باوکێکی پیری ریش سپی ئاوارەی تاقە هیواو تاقە کوڕێکی‌هەیە ئەیەوێ سەری بڕێ . فریشتەکان هەموویان هاتنە جۆش‌و خرۆش وکەوتنە هاوارو گریان‌و پاڕانەوە ، قرچەی جەرگ‌و دڵی ئیبراهیم گەییشتە ئاسمانەکان . خوای گەورە دەریای بەزەیی ورەحمی هاتە جۆش ، لەم کاتەدا کەهەموو شت تەواو بوو ئیبراهیم و ئیسماعیل فەرمانەکەیان بەجێ هێناو هیچ نەمایەوە بێجگە لەپیاهێنانی چەقۆ کەو ڕژاندنی خوێن ، بەڵێ باوك‌و کوڕ بەڕاستی گوێ ڕایەڵی‌و فەرمان بەرێتی‌یان تەواو بوو ، بۆهەموو کەس دەرکەوت ڕاستی ئەو باوك‌و کوڕەو دەرچوونیان بەبەرزترین پلە لەتاقی کردنەوەکەدا ، ئیتر کەهیچ نەمایەوە لەنیشانەی گوێ ڕایەڵی‌و ڕشتنی خوێنەکە . لێرەدا لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بانگ کرا : ئیبراهیم خەوەکەت هێنایە دی‌و فەرمانەکەت بەجێ

هێناو ڕاستی‌و بەندایەتیت بۆخوا دەرکەوت ، ئەوا بۆخوێن‌و گۆشتەکە لە لەجیاتی ئیسماعیل ئەوبەرانەمان نارد سەری بڕەو بیکە بە قوربانی وئێمە بەوجۆرە پاداشی چاکەکەران وپیاو باشان ئەدەینەوە .

ئیبراهیم بەدلشادی‌و خۆشی‌و بەسوپاسی بێ‌پایانی خوای گەورەوە لەسەر سەری ئیسماعیل هەڵساو چوو بەرانەکەی هێناو لەشوێنەکەی ئیسماعیلا سەری بڕی‌و ، بەم جۆرە کارەکە کۆتایی پێ‌هات ، ئیبراهیم و ئیسماعیل بوونە نموونەی قوربانی و فیداکاری و خۆبەخت کردن لەپێناوی باوەڕ او پیشانیان‌دا کە پلەی گوێڕایەڵی و بەندایەتی بریتی‌یە لە پەیڕەوی کردن و چۆن بەدەمی فەرمانەوە .

## لەدایك بوونی ئیسحاق :

خوای گەورە پاداشی گەورەی ئیبراهیمی دایەوە لەسەر ئەم گوێڕایەڵی‌یە مێژوویی‌یە نموونەیی‌یەی بە گەورەترین پاداش . فەرمانی داپیایا کەفەرما ـ نەکەت بەجێ هێناو ئیتر پێویستمان بەخوێن ڕشتنی کوڕەکەت نیە ، وە بەرانێکی بۆ نارد لەجیاتی ئیسماعیل سەری بڕی‌و دڵی خێزانەکەی پێ‌خۆش کرد ، وەسەلامی خۆی بۆ ئیبراهیم تۆمار کرد لە کۆمەڵی فریشتەو موسڵمانەکانوکتێبە گەورەکانی خۆیا ، وەپاداشی پاشە ڕۆژو جیهانەکەی‌تر ، مەگەر هەرخۆی بزانی چی‌و چۆنە ؟ لەگەڵ ئەمانەیشا کوڕێکی تری لە خاتوسارەوە پێ‌بەخشی ، خاتوسارە پیر بووبوو لەو تەمەنەدا نەمابوو کە منالی ببی ، خوای گەورە فریشتەی ناردەلایان و سەلامی بۆ ناردن و مژدەی پێ‌بەخشینی کوڕێکی پیاوچاکی دانێ ، وە خاتوسارە

سکی پڕبوو خوا کوڕێکی نەوجوانی وەجاخ زادەی پێبەخشی و ناویان نا ئیسحاق . وە بەمجۆرە خوای گەورە لە هەموو لایەکەوە ئەو خێزانەی ژیانەوە و شادمانی کردن ، وە ئەم دوو کوڕە هەردوکیان بوون بە پێغەمبەر و بوون بە باوکی زنجیرەی پێغەمبەران .

قورئانی مەزن ئەم ڕوداوانەمان بەم پێیە بۆئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ :

( رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ، فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ، فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ : يَابُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانْظُرْ مَاذَا تَرَى ؟ قَالَ : يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللهُ مِنَ الصَّابِرِينَ ، فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ وَنَادَيْنَاهُ : أَنْ يَا إِبْرَاهِيمُ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ، إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ، وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ، وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ، سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ، كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ، إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ، وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ ، وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ إِسْحَاقَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ ) ( الصافات ) : ٩٩ الى ١١٣

## ( قورەیش زاڵبوون لە مەکەدا )

چەند دەمێ تێپەڕیو شاری ( مەکە ) بوبووبە نیشتمانی ( جورهەمي ) و ( عەمالیقە ) .

نەتەوەکانی ئیسماعیل لەپاشا ناوی ( قورەیش ) یان بەسەرا برا ، وە کەعبە بووبە ڕووگەو قیبلەی هەموو عەرەبەکان و لە هەموو لایەکی وڵاتەوە هەموو نەتەوە و تیرەکانی عەرەب ( هەرجۆر باوەڕو ئاینیان بوو ) لەکاتی حەجا ئەچوون بۆ مەکەو لەوێ حەجیان ئەکردو بەدەوری ( کەعبە ) دا ئەسوورانەوە .

وەهەروەها ( مەککە ) بەپێی هەڵکەوتی جوگرافیایی ڕێبازگەی کاروان بوو ، لە هەموو لایەکەوە لە خۆرهەڵات و خۆرئاواوە کاروان کە ئەڕۆیی بە مەکەدا تێئەپەڕی ، وە بووبوو بە بازاڕێکی گشتی ، بەتایبەتی لەکاتی حەج کردنا لە هەمولایەکەوە هەموو جۆرە کەلو پەلوشتی هەمەڕنگی بۆ ئەهات وتیایا ئەکڕاو ئەفرۆشرا .

وەلە تاقێکی تایبەتی‌یا (جورهومی) یەکان زاڵ بوون بەسەر (عەمالیقە) داو لەمەکە دەریان کردنو ئیشو کارەکانی مەکە و حەجیان کرتە ژێر دەستی خۆیان . ئەمە درێژەی کێشاتاتاقی موزازی کوڕی عەمری کوڕی حاریس (١) وە لەم تاقەدا پلەی ژیان وبازرگانی بەڕادەیەك بەرز بوەوە لەبیریان چوبوەوە کەوا لەدۆڵێکی وشکی بێ‌کشت‌وکاڵا ئەژین ، کەوتنە ڕابواردنو گەڕان بەشوێنی داخوازی‌یەکانی هەواو هەوەس و ئارەزوویانا .

موزاز بەزانایی‌و بلیمەتی خۆی بیری کردەوە لەپاشەڕۆژی نەتەوەکەو کەسو کارەکانی ، زانی بەم شێوەیە ئیشو کارەکانیان لەدەس ئەچێ ، لەبەرئەوە زۆر ئامۆژکاری کردنو ترسـاندنی لە پاشەڕۆژی ژیانیان و پێی‌وتن : چاوبکەنەوە و بیربکەنەوە و ئەوەندە بەشوێنی ڕابواردنو هەواو هەوەسا مەگەڕێن ، بەڵام هیچ سوودی نەبەخشی ، وەتیرە و هۆزەعەرەبەکانی ئەو ناوچەیە بەتایبەتی بەرەی خوزاعە ئەم کاتی بێ‌هۆشی‌و سەرخۆنەپەژاندنەی مەکەیی‌یەکانیان بەهەل زانی بۆ پەلاماردانی مەکەو داگیر کردنی ، بۆ ئەوەی ئیش‌وکارو پایەو مەنسەبەکانی کەعبەو مەکە بخەنە ژێر دەستی خۆیان .

موزاز لەلایەکەوە لەو بیم‌و ترسەتێ‌گەیی بوو ، لەلایەکی‌تریشەوە هەرچی ئامۆژکاری ئەمانی کرد بێ‌هوودەبوو ، لێرەدا هات بۆلای ئاوی زەمزەم و

(١) کەلە بەنی جورهومی‌یەکان بوو

لەویندا بیرێکی گەورەی هەڵکەندو ئەنجارهات ئەو دوو ئـاسکە ئاڵتوونەی
لەگەڵ شتە بەنرخەکانی‌ترا کە کاتی خۆی بەدیاری هێنرابوون بۆ کەعبە ،
هێنانی و لەگەڵ ئاوەکەدا دای‌پۆشین و گومی کردن ، بەتەمای ئەوە دوای
بەسەرچونی مەترسی‌یەکە بگەڕێتەوە بۆ مەکە و دەریان‌بێنێتەوە ، وەلەگەڵ
نەوەکانی ئیسماعیلا ڕۆیشتن و مەکەیان بەجێ هێشت ، وە هۆزی خوزاعە
مەکەیان داگیرکردو دەستیان گرت بەسەرخەزێروبیرەکەیا . ئەمەش درێژەی
کێشا هەتا قوسەی کوڕی کیلاب باپیری پێنجەمی پێغەمبەر هاتەوە و داگیری
کردەوەو خستیەوە ژێر دەستی‌خۆی .

## قوسەی :

دایکی قوسەی کەناوی فاتمەی کچی سەعدی یەمانی بوو لەکیـلابی
کوڕی مورە دووکوڕی بوو یەکەمیان ( زوهرە ) ـ باپیری بەنی زوهرەی
خاڵوانی پێغەمبەربوو ، دووەمیان قوسەی . کاتێ کیلاب مرد قوسەی‌منالی
مەمکەخۆر بوو ، دایکی شووی کردەوە بەڕەبیعەی کوڕی حەرام وقوسەی
لەگەڵ خۆیا برد بۆشام . وەلەڕەبیعەش کوڕێکی بوو ناویان نا (دەڕاجە)
قوسەی وای ئەزانی کوڕی ڕەبیعەیە هەتا جارێ هەرای بوو لەگەڵ خێڵی
ڕەبیعەدا ، ئەوانیش پێیان وت : تۆهەتیوێـك بوویت وئێمە بەخێومـان
کردیت کەچی ئاوا یەیت بەگژمانا . قوسەی هـــاتەوە لای دایکی وئەم
گلەیی‌یەی بۆگێڕایەوەو زۆر زویربوو . دایکی دلخۆشی دایەوەو پێی وت :
کوڕی شیرینم زیزو زویر مەبە ، بەخوا باوکی تۆ لەباوکی ئەمان پیاوترو
گەورەتر بوو ، تۆ کوڕی کیلابی کوڕی مورەی قورەیشیت ، خزم وکەسە
کانت وان لەمەکەو لەدەوری کەعبە .

لەدوای ئەمە قوسەی هاتەوە بۆمەکەو لەوێ خزم و کەسەکانی خـۆی ناسی‌یەوە وبەیەك شـادبوونەوە وهەموویان لەمەکەدا یەك گـیربوون ، وە بە بۆنەی ئەوپیاوەتی‌و ژیری‌و بلیمەتی‌و دلێری‌یەی خوا دابووی بەقوسەی لە ناو خزمەکانیا وهەموو دانیشتوەکانی مـەکەو ناوچەکەدا جێـگای ڕێز بوو پایەو پلەی بەرزر دیاری وەرکرت .

لەو دەمەدا دەرگاوانی وکلیل داری ( سیدانە ) ی کەعبە لەناو هۆزی خوزاعەدا بوو بەدەستی حولەیلی کوڕی حوبشی‌یە ( حليل بن الحبشية) وەبوو. پیاوێکی زۆر ژیرو زاناو بەفام بوو ، بۆیـە هەرکە قوسەی داوای حوبـا (حبى ) ی کچی کرد ئەویش بێ‌خۆکرتن پێش کەشی کـردو لێی مارە کرد . قوسەی بەپێی هەوەسی خۆی خەریکی کاروانی‌و بازرگانێتی بوو ، وەسامانێکی زۆری دەست خۆی خست ، وەمنالی زۆریشی بوو ، حولەیل کەمێ لەپێشی مردنیا کلیلی کەعبەی دا بە حوبیای ژنی قوسەی وئەویش دای بەئەبی غیبشانی خوزاعی ، ئەبو غیبشان پیاوێکی مەی خۆری هەمیشە مەست بوو ، ڕۆژێ لەڕۆژان مەی لێ براببوو کلیلەکانی فرۆشت بەقوسەی بەکووپەیەك (مەی) . هۆزی خوزاعە بەمەیان زانی وتێ‌کەیشتن ئەگـەر قوسەی کاربەدەستی کەعبەبێ ئیتر ئەمان جێیان پێ‌لـێژ ئەبێ ، بەتایبەتی قوسەی دەوڵەمەندو خاوەن دەرامەتەو قورەیشەکانی لە دەور کۆبوونەتەوە ، لەترسی ئەمە ویستی‌یان کلیلەکان لەقـوسەی بستێننەوە قوسەی بـە دەوری خۆی کە ئەمە تێ‌گەیی قورەیشەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە وەزۆر لـە هۆزو خێلەکانی ناوچەکە لەبەرئەو ژیری‌و لێ‌هاتویی‌و دەستەلاتەی لەقوسەیا ئەیان بینی چوونە پالی قوسەی وبوون بەهـــاوکاری ئەو ، ئیتر بەئاسانی توانی‌یان هۆزی خوزاعە لەمەکە دەربکەن . وە هـەموویان بە یەك دەنـگ

قوسەیان کرد بەگەورەو کاربەدەستی خۆیان ، وەهەموو مەنسەبەکانی کەعبە کەوتنە ژێردەستی قوسەی سەرۆکی تازەیان . ئەومەنسەبانە بریتی بوون لە ( سیدانە ) دەرگاوانی کەعبە : ( سیقـایە ) واتە ئاوی پاکو خۆش دان بەحاجی‌یەکان ، کەلەمەکەدا بەنارەحەت دەس ئەکەوت ( نەدوە ) یـانی سەرۆکایەتی کردنی کۆبوونەوەکان لەهەموو ئەورۆژانەی کۆبوونەوەیان تیا ئەکرا ( لیوا ) ئەمیش ئالآیەك بوو ئەکرا بەنووکی رمێکەوە و ئەچەقێنرا هەرکاتێ بچوونایە بۆسەر دوژمن ، ( قیادە ) یانی فەرماندەیی وسەرۆکایەتی سوپا لەکاتی جەنـــگو هەرادا ، ( ریفـا ) یانی نانو خۆراك دان بە حاجی‌یەکانو بەمیوانو رێ بوارەکان ومیوان داریتی کردن ،

قوسەی یەکەم کەســێ بوو ئەم میوان داری کـردنەی داهێنا .. کاتێ خوزاعەیان دەرکرد قوسەی هەموو دانیشتوەکانی ناوچەکەی کـۆکردەوەو پێی وتن : ( ئەی بەرەی قورەیش ئێوە سەرپەرشتی کەرو دراوســـێی ماڵەکەی خوان وخەڵکی دەوری کەعبەو مەکەی یاساخ ورێزگیراوی خوان حاجی کەیەن بۆحەج میوانی ئێوەن ومیوانی خوان ویـــەن بۆگەران بە دەوری کەعبەدا ، ئێوەیش پێویستە لەسەرتان رێزیان بگرنو لەکاتی حەجا خواردن وخواردنەوەیان بۆئامادەبکەن ) وەخەڵکەکەیش ئەمەیان بـەلارە جوان بوو هەموو بریاریان لەسەردا . ئیتر بەم پێیە هەموو ساڵێ ـ وەکو باج ـ لەهەریەکەیان ئەندازێ ماڵی ئەسەندو دەرخواردی حاجی‌یەکانی ئەدا.

هەندێ لەمێژوو نووسەکان رایان وایە : کە شـاری مەکە تا سەردەمی قوسەی خانووی تیا دروست نەکرابوو دانیشتوانی دەوار نشین بوون و بـە رۆژا لەمەکە ئەژیانو بەشەوا ئەچوونە دەورو بەری مەکە ، وەئەیان ئەویـست لەنزیکی ماڵی خواوە ماڵی تربێ ، وەئەڵێن : کاتێ ئیش وکارەکان

ساغ بوونەوە بۆقوسەی هات قورەیشیەکانی کۆکردەوەو فەرمانی پیادان کە خـــانوو بەرە دروست بکەن ، خۆی لەپێشەوە دەسی پێ کـردو کۆشکی ئەنجومەنی ( دارالندوە ) ی دروست کرد ، هەموو جارێ بەسەرۆکایەتی قوسەی پیاوە گەورەکانی تیا کۆئەبوونەوەو ڕاوێژی ئیش‌و کارەکانی شـارو تیرەکەیان ئەکرد ، وەبەبێ ڕاو بڕیاری گشتی‌یان هیچ جۆرە ئیش‌و کارێکیان نەئەکرد ، هەتا ژن هێنان بۆهەرکەسێ‌و بەشوو دانی هەرکەسێ لەوخانوەداو بەپێی ڕاوێژی گشتی‌یان ئەکرا .

قورەیشەکان دەسیان کرد بەدروست‌کردنی خانوو بەرەو لەدەوروبەری کەعبەدا گەرەکە خانوویان دروست کردو چواردەوری کەعبە ـ بێجگە لە جێگای طواف کردن‌ی گەڕان بەدەوری کەعبەدا ـ بەخانوو گیراو لەنێوانی هەمو‌و دووخانویەکا ڕێگایان بۆسەر کەعبە هێشتەوە .

## کوڕو نەوەی قوسەی

هەرچەندە ( عبدالدار ) کوڕە گەورەی قوسەی بوو بەلاّم ( عبدالمناف ) لەناو خەلّکا گەورەترو بەڕێزتر سەیرئەکرا . قوسەی لەکاتی پیربوونیا ئیش‌و کارەکانی مەکەو کەعبەی بەرەو ڕووی ( عبدالدار ) کردەوە ، وەعبدالدار دوای مردنی باوکی ئیش‌و کارەکانی گرتە دەست ، وەلەدوای خۆی ـ ئەویش ـ کوڕەکانی خۆی کرد بەجێ نشین ، کوڕانی عبدالمناف : ( عبدالشمس و مطلب ونوفل ) لەناو خزم‌و کەسەکانیاناو لەدەورو بەری مەکەدا بەڕێزترو گەورەتر سەیر ئەکران لەکوڕانی عبدالدار ئەمانیش ئەمەیان بەهەل زانی بۆئەوەی ئیش‌و کارەکان لەئامۆزاکانیان ( کـوڕانی عبدالدار ) بسێننەوە . قورەیشەکان بۆئەم کارە بوون بەدوو بڕەوە بـە جۆرێکی وا کە نزیـك بوو

جەنگێکی گەورە ڕوویدا کەزوربەی قورەیشی تیا لەناو بچێ ئەگەر تێ گەیشتوان نەکەوتنایە ناوەندیانەوەو ڕێکیان نەخستنایە بەم شێوەیە : ـ ( سقایەو ڕفادە ) بدرێ بەکوڕانی ( عبدالمناف ) و ( حجابەو لواوندوە) بمێنێتەوە بەدەستی کوڕانی ( عبدالدار ) ەوە ، ولەسەر ئەم بارە مانەوە هەتا ئایینی ئیسلام هات .

## دەوری هاشم

لەناو کوڕانی عبدالمناف‌دا هاشم بوو بەسەرۆك ، هاشم پیاوێکی دەوڵەمەندوو لێهاتوو بوو ، سیقایەو ڕیفادەی کرتە ژێر دەستی خۆی ، وەکوو قوسەی کەوتە بانگ ئاوازی قورەیشەکان بۆکۆکردنەوەی هەندێ لەسامانیان بۆمیوانداری حاجی‌یەکان ، وەلەماوەی مانەوەی حاجی‌یەکان دا هەڵئەسا بە خزمەت کردنو خواردنو خواردنەوە بۆئامادە کردنیان ، وەبێجگە لەمەیش یارمەتی مەکەیی‌یەکانی لەکاتی ئاتاجی‌دا ئەدا .

ساڵێکیان گرانیو نەهاتی ڕووی داو مەکەیی‌یەکان کەوتنە مەترسی برسێتی‌یەوە ، هاشم دەسەڵاتو سامانی باشی هەبوو ، بەجوامێریو مەردایەتی سامانەکەی بەخت کرد لەڕێ‌یان‌داو دەری کردن لەوقاتو قڕیو نەهاتی‌یەو نەی هێشت لەناو بچن .

هاشم یەکەم کەس بوو کەکاروانی هاوینە بۆ ( شام ) وکاروانی زستانەی بۆ ( یەمەن ) داهێنا ، وەئەمە بووبەهۆی دەرکەوتنو بەرز بوونەوەی پلەی ( مەکە ) لەناو هەموو نیوە دورگەی عەرەبی‌دا ، وەهەربەم بۆنەیەوە کوڕانی عبدالمناف توانی‌یان پەیمانی دۆستایەتی‌و ئاشتی ببەستن لەگەڵ دراوسێکانیانا.

هاشم هەڵساو پەیمانی ئاشتیو دۆستایەتی لەگەڵ ئیمپەراتۆری ڕۆمانی ولەگەڵ سەرۆکی ( غسان ) دا بەست . قورەیشەکان لەسەر ئەو پەیمانە

بتوانن بەئارەزووی خۆیان بەهەموو ناوچەکانی شاما بسوورێنەوە .

وە ( عبدالشمس ) ی برای هاشم پەیمانی بازرگانی لەگەل نەجاشی پاشای حەبەشەدا بەست ، وە ( نوفل وەطلب ) برای پەیمانیان لەگەل فارس وحیمیەری‌یەکانا بەست ، بەم پێیە ( مەکە ) بووبەمەلبەندی بازکانیو سامانی پەرەی سەند ، وەدانیشتوەکانی شارەزاییەکی وایان لەبازرگانێدا پەیا کرد کەهەموو لایەکەوە لەهاوینو زستانا کاروان ڕووی تێ ئەکردن وبازرگانی گەرم بوو .

## دوورخستنەوەی ( امیە )

هاشم بەوپێیە سەرپەرشتی کاروباری مەکەی ئەکرد وکەس بیری لەوە نەئەکردەوە کەشانە خرەی لەگەلا بکاو سەرۆکایەتی‌یەکەی لێزەوت بکا ، هەتا هاشم تەمەنی بەرز بووەوە لەم کاتەدا ( أمیە ) ی کوڕی (عبدالشمس)ی برازای وای زانی کەئەتوانێ بەربەرەکانی لەگەلا بکا ، بەلام بێسوود بوو ، ژێرکەوتو هاشم ویستی سزای بدا ، پاشان لەسەر ئەوە پێك هاتن کە ( أمیە ) بۆماوەی دەسال مەکە بەجێ بێلێ ، ( أمیە ) چووبۆشام ، وەهاشم لەسەر ئیشی خۆی مایەوە .

هاشم جارێ لەشامەوە گەڕایەوە وبەشاری ( یثرب ) دا تێ پەڕیو چاوی بەئافرەتێکی شۆخی خانەداندا هەل تەقی ، ناوی ( سەلمای کچی عەمری خەزرەجی ) بوو ، زۆر بەدلی بوو حەزی لێ کرد ، لەپاش پرسیار بۆی دەرکەوت ( تەلاق ) دراوەو ئەیەوێ شووبکا ، بەلام بەمەرجێ کە جلەوی ئیشو کاری خۆی بەدەستی خۆیەوە بێ ، هاشم کەوتە خوازبێنی کردنی وژنەیش کە پلەو پایەو دەسەلاتی هاشمی زانی ڕازی بوو شووی پێ

کرد ، وەهاشم کوێزایەوە ولەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆمەکە ، ماوەیەك سەلما لای مایەوە لەمەکەدا ، وەلەوماوەیەدا سکی پڕبوو ، وەلەپاشا چووەوە بۆ یەسریب ، زۆری پێنەچوو خوا کوڕێکی دایەو ناوی‌نا ( شیبة ) وەدەستی کرد بەبەخێوکردنی کوڕەکەی ونەهاتەوە بۆمەکە .

## دەوری ( مطلب ) و ( عبدالمطلب )

ماوەیەکی بەسەرا تێپەڕی هاشم لەکاروانێکی هاوینەدا لە ( غزە ) مرد ( مطلب ) ی برای بوو بەجێ نشینی ، هەرچەند مطلب لەعبدالشمس منال تربوو بەڵام لەناو خەڵکا بەڕێزو باوەڕ پێکراوتربوو .وەتوانی دوای هاشم بەبێ کەمو کوڕی مەکەو قوڕەیش بەڕێوە بەرێ . ڕۆژێ مطلب بیری کردەوە لەشەیبەی کوڕی هاشمی برای وبەلایەوە ناخۆش بوو ، پترلەووڵاتان بهێنێتەوە ، وەبەوبۆنەیەوە چوو بۆ یەسریبو داوای کرد لەسەلمای براژنی کەشەیبەی بداتەوە بەوبەڵگەیە کەورە بووەو لەخـــەم ڕەخسیوە وەمطلب شەیبەی هێنایەوە بۆمەکە ، قورەیشەکان وایانزانی ئەمە بەندەیەتی بۆیە پێیان ووت : ( عبدالمطلب ) واتە بەندەی موتەلیب . هەرچەند مطلب وتی : ( بەندەم نیەو شەیبەی کوڕی هاشمی برامەو لەیەسریب بووەو هێناومەتەوە) بێسوودبوو ئەوناوەی هەربەسەرا بڕاو ، خەڵکی شەیبەیان لەبیر چووەوەو ( عبدالمطلب ) بوو بەناوی .

موتەلیب ویستی سامانەکەی هاشمی برای بداتەوە بەعەبدولموتەلیبی کوڕی بەڵام نەوفەلی برای نەی هشتو دەستی بەسەرا کێشا ، کەعەبدولموتەلیب دەورە بوو پەنای برد بۆخالوانی لەیەسریب کەبێنو کەلەپوورەکەی باوکی لەنەوفەلی مامی بۆبسێننەوە ، وەبۆئەمە هەشتا سواری خەزرەجی لە

یەسریبەوە هـــاتن بۆیارمەتی عەبدولموتەلیب ، ئەوئەل کەبەمەی زانی کەلەپووورو سامانەکەی دایەوە بە عەبدولموتەلیب ، لەدوای مردنی موتەلیب عەبدولموتەلیب لەجێگایا دانراو ( سیقایەو ڕیفادە ) ی گرتە دەست ، وەلەم کاتەدا عەبدولموتەلیب تەنیا یەك کوڕی بوو ( حارث ) ناو ، وەسیقایەیش لەوکاتەدا پێویستی بەمناڵو دەسو پێوەندی زۆر بوو ، چونکە لەبەر کوم بوونی ئاوی ( زەمزەم ) ئەبوایە لەبیرەکانی ئەم لاولاوە ئاویان هەڵبگۆزایە وبیان کردایەتە حەوزو گۆمەکانی دەوری کەعبەوە ، وەهەروەها (ڕیفادە)یش پێویـستی بەمناڵو وەڕوێرکەی زۆربوو بۆئامادە کردنو پێش کەش کـردنی خواردەمەنی بۆحاجییەکان ، وەبەم بۆنەیـــەوە عەبدولموتەلیب زۆر ماندووو نارەحەت ئەبوو ، وەزۆر جار بیری لەچارەیـــەکی ئەم کارە ئەکـرد . قورەیشەکان لەزوەوە هەرلەبیری ئەوەدا بوون کە بـیری زەمزەم ـ ئەوەی ( مضاض کوڕی عەمری جورهومی ) دای پۆشیبوو ـ هەڵبدەنەوە ، سروشتییە بۆعەبدولموتەلیب لەم کاتەیا زۆر لەغایلەو بیریا بێ ، هەتا وای لێ هـاتبوو خەوی پێوە ئەبینی ولەخەوا پێیان ئەوت : وەرە بیرەکە هـەڵ بدەرەوە . بەڵێ ، لەئەنجاما عەبدولموتەلیب لەگەڵ ( حارث ) ی کوڕیا کەوتنە هەڵ کەندنی زەوییەکەو بیرلێدان لێراو لەوێدا ، هەتا لە ناوەندی دوولەبتەکانیان ( نائله ) و ( إسافه ) دا ڕێیان لێی کەوت و دۆزییانـەوە . . بەجووتە دوستیان کرد بەهەڵکەندنی هەتا ئاوهەڵ قوڵی وجووتە ئاسکە زێـڕەکەو شمشێرەکانی ( مضاض ) دەرکەوتن ، قورەیشەکان داوایان کرد لەعەبدلموتەلیب کەبیانکا بەهاوبەش لەزەمزەم وهەرچیی تێدایە وتی: وەرن باڵەژووری کەعبەدا ( قداح ) «١» هەڵدەین ، دوو ( قداح ) بۆکەعبەو دوو ( قـداح ) بۆ من و

---

(١) قداح چەند دارێك وەیا چەند بەردێك بووە هەڵیان داوە بۆ ←

دوو (قداح) بۆئێوە، (قداح) ی هەرچ کەس کەوتە سەر هەرچی بۆئەو بێت، وە (قداح) ی هەرکەس بۆش دەرچوو، بێبەش بێ. لەسەرئەمە پێکهـاتن و لای (هبیل) کە بتی گەورەیـان بوو، (قداح) ە کەی عبدالمطلب کەتە سەر شمشیرەکان، وە (قداح) ە کەی کەعبەش کەوتە سەر ئاسکەکان، (قداح) ی قورەیشییەکان بەبۆشی مایەوە. (عبدالمطلب) شمشێرەکانی کرد بە دەرگای کەعبەداو ئاسکەکانی لەلای دەرگاکەدا داناو کردنی بەخشلی کەعبە.

ئنجا بەبۆنەی بیری زەمزەمەوە نەختێ شانی سووك بوو سیقـــایەکەی بۆ ئاسان بوو لەگەڵ ئەمەیشا لەبەر ئەوەی کوڕی کەم بوو لەناو خزمەکانیا خۆی بەکەم دەسەڵات ئەزانی، لەبەر ئەمە نەزری کرد لـە سەرخۆی: ئەگەر دە کوڕی بۆ گەورەبوو کە پشتگیری لێ بکەن یەکێکیان سەرببڕێ بۆ خوا لەلای کەعبەدا.

خوای پەروەردگار بەرودوا دە کوڕی دایە هەموویان گەورەبوون و بوونە پشتیوانی و یاریدەیان ئەدا، ئەمجار هات نەزرەکەی بەجێ بێنێ.. بۆئەمە داوای کرد لە کوڕەکانی: یارمەتیبدەن بۆ پێك هێنانی ئەم کارە کرنگە، هەموویان پێکەوە چوون بۆلای خاوەن (قداح) بەفەرمانی خوا (قداحی) عبدالله دەرچوو بۆسەربڕین.

عبدالله کوڕە بچکولەی بوو لە هەموویـــانی زیاتر خۆش ئەویست. کاتێ قداحی عبدالله دەرچوو بۆ قوربانی قرچە کەوتە نـاودڵی باوکیەوە،

---

← پێـك هێنانی نیازێك وەیا بەش کردنی شتێك وەکوو تەڕو وشك و پشك خستن، کەلەکوردەواریدا بەکار ئەهێنرێـن، وەئەمەش لەئیسلام دا ناڕەوایە، وەکوو تاس گرتنەوەو کتێب گرتنەوەی ئێستا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا خۆی بە ناچارزانی و پەلی گرت بۆئەوەی سەری‌ببڕێ و بیکا بەقوربانی لەلای زەمزەم و لە نێوانی ئیساف و نائیلەدا، قورەیشەکان لە نادی‌یەکەیانـابوون کە ئەم دیمەنەیان بینی و بەم کارەساتەیان زانی یەکسەر ڕاپەڕین و هاواریان لێ‌کرد : نەکەیت ئەو کوڕە شیرینەت سەر بڕیت، بچۆرەوە بۆلای هوبەل، بەڵکو بەبیانوویەك لەسەربڕینی ڕزگارت‌بێ عبدالمطلب بە دوودڵێکەوە وتی : ئەبێ چی‌بکەم تابتەکان ڕازی‌بن لێم ؟ موغیرەی کوڕی عبدوڵلای مەخزومی وتی : ئەگەر بەماڵو سامـــان تۆڵەی بدرێ هەموو ماڵو سامانمان لەتۆڵەیا دائەنێین . قورەیشەکان کەوتنەڕاوێژ کردن و لە ئاکامارایان هاتەسەر ئەوە یەکێ بنێرن بۆلای ئەوئەستێرەناسەی کەلە یەسریبدا بوو لەم، شتانەدا ڕێو شوێنی جوانی دائەنا ـ ئەوهەرچی بۆدانان ئەوەبکەن .

ناردیان بۆلای نوجوم گەروئیشەکەیان تێگەیـــان و ئەویش وتی : هەتاسبەینێ لێم بخایەنن ، پاشان وتی : خوێنی پیاوێك لای ئێوەچەندە ؟ وتیان : دەوشترە، وتی : کەواتە بچنەوە بۆلای خۆتان و دەوشتر بکەن بە قوربانی و (قداحی) بۆلێ‌بدەن ئەگەر لەسەر کوڕەکەوە دەرچوو دیسانەوە لێی‌بدەنەوەو دە دە بۆی زیـادبکەن ، هەتا قیداحەکە ئەکەوێتە ســـەر وشترەکان ، ئەوکاتە مانای وایە خوالێتـان ڕازی بوەو ئەو ئەندازەیە تۆڵەکەیەتی و لەباتی‌یا سەریان ببڕن ، لەسەر ئەم بڕیـارە هـاتنەوە وە قیداح ، لەسەر عەبدواللە دەرئەچوو ، هەتـــا ژمارەی وشتر گەیشتە سەد سەر ، ئەمجار قیداح لەسەر وشترەکان دەرچو . عبدالمطلب لەم کاتانەدا بە دڵە تەپەوە لایان ڕاوەستابوو هەرلە خوا ئەپاڕایەوە ، تا قیداحەکە لەسەر وشترەکان دەرچوو ، مژدەیان دایە ووتیان : خوالێت ڕازی بوو ، وتی :

بەخوا دڵم ناو ناخواتەوە هەتا سێ جار لێی نەدەنەوە ، لە هەرسێ جارەکەدا لەسەر وشترەکان دەرچوو ، ئەمجار دڵنیا بوو و فەرمانیدا سەد وشترەکەیان سەربڕی و لاکەکانیان بەجێ هێشتن بۆ ئەوەی سەرگیریو بەرگیری لە کەس بکرێ تیایانا . وەبەم جۆرە عەبدواللە لەسەر برین و باوکی لەجەرگ برین ڕزگاریان بوو

## ڕەوشتی ( عبدالمطلب ) : (١)

عەبدولموتەلیب لەوکاتی نەفامێتی یەدا مەی لەسەر خۆی یاساخ کردبوو ، وەنزای بۆ هەرچی بکردایە گیرانەبوو ، وە زۆر سەخیو دڵ کوشاد بوو ، بەڕادەیەك ناویان نابوو ( فیاض ) واتە زۆر خاوەن بەخشین ، هەتا خۆراکی ئەبردەسەر کەژەکان بۆ پەلەوەرو بـاڵندەو مارو مێروو گیاندارەکان ، وەلە گەورەکانو لەزانا و فامیدەکانی قورەیش بوو ، لەگەڵ حەربی کوڕی عبدالشمش باوکی ئەبو سوفیاندا هاودەم بوون ، جوولەکەیەك لەژێر سایەی (عبدالمطلب) دا ئەبێ جارێ لە بـازاڕا لەگەڵ حەربـــا دەمـیان تێ ئەگیریو هەرایان ئەبێ ، حەربیش ئەنێرێ جوولەکەکە ئەکوژن ، کەعبدالمطلب بەمە ئەزانێ لێی توڕە ئەبێو قسەی لەگەڵاناکاو وازی لێنایەنێ تاسەد وشتری لێ ئەسێنێو ئەیدا بەئامۆزای جوولەکەکە .

هەمیشە فەرمانی ئەدا بەکوڕەکانیا کە هەرگیز زوڵم و زۆر نەکەن ، هانی ئەدان بۆ کردەوەو ڕەوشتی جوانو لەخراپکاری لای ئەدان . بەلایەوە وابوو هەرکەس زوڵمێ بکا هەتـا نـامرێ تۆڵەی لێ ئەسێنرێتەوە و توشی

(١) بۆ ئەم بـاسە سـەر لە پەڕاوی ( محمد رسول‌الله ) بدە لە نووسینی خۆرهەڵات ناســـی فەرەنسی ( أتيين دينيه ) و ( إبراهيم الجزائري ) و ئەوانیش لە ( سبط بن الجوزی ) یەوە لاپەڕە ٥٨ و ٥٩

ناخۆشی‌یەك نەیەت هەتاپیاوێکی ستەمکاربوو لەشاما مرد ، بێ‌ئەوەی تووشی ناڕەحەتی‌یەك بێت ، کە عبدالمطلب بەمەی زانی وتی : بەخوا بێجگە لەم جیهانە ئەبێ جیهانێکی‌تر ببێو لەوێدا پاداشی چاکە بدرێتەوە و سزا لە خراپە کەر بسێنرێ وەلە بەشی دوایی تەمەنیا وازی لەبت پەرستی هێناو خوای بەتەنیاو بە بێ‌هاوەڵ دائەنا .

وە زۆر شتی‌وای لێ‌ئەگێڕنەوە کە قورئان و فەرموودەیان لەسەر هاتووە، لەوانە : بەجێ‌هێنانی نەزر ، نەهێشتنی مارەکردنی ژنی مەحرەم ، دەس بڕینی دز قەدەغەکردنی کچ زیندە بەچاڵ کردن ، بەخراپ و ناڕەوادنانی مەی و شەرواڵ پیسی ، گەڕان بەدوری کەعبەدا بەڕوتی و گەلێ‌شتی‌تر ...

## سوپای ئەبرەهەو پاراستنی کەعبە

زانیمان بەو هۆیانەی سەرەوە ( مەکە ) پلەیەکی بەرزو پایەیەکی گەورەی وەرگرت لە نیوەدورگەی عەرەبی بەڵکو لە دەرەوەیشیا ، وەبووبووە ڕووگە ( قبیلە ) ی مرۆڤایەتی ، وە ئەمەیش پلەی ئابووری و دەس‌کەوتی ساڵانەی بەرز کردبۆووە وە ، بەسە بۆمەکە کەبە بۆنەی کەعبەوە هەموو ساڵێ عەرەبەکان لەهەموو لایەکەوە بچن بۆحەج کردن تیایا و جێگای سەرلێ‌دانو بەجێ هێنانی ئیش‌وکاری ئایینی‌یان‌بێ . بێ‌گومان ئەمەگەورەترین پایەی دابوویە . وە ئەمە سەرنجی زۆرکەسی ڕاکێشاو بەغیلی‌یان پێ‌ئەبرد و بیریان لەوە ئەکردەوە هۆیەك ڕێ بخەن خەڵکی پێ‌بتە کێننەوە لەمەکە و ڕایان بکێشن بۆلای خۆیان . .

غەساسیەکان لە ( حیرە ) دا خانوویەکیان دروست کرد بۆ جێگای‌حەج و گەلێ چاووڕاویشیان بۆکرد ، بەڵام بێ‌سوود بوو کەس گوێی نەدانێ و خەڵکی لەمەکە نەتەکینەوە .

## ئەبرەهەو کەنشتەی حەج

لەم دەمەدا یەمەن لەژێر دەسی حەبەشی یەکانا بوو ، وەفەرماندەیـەکی حەبەشەیی کەناوی ئەبرەهەبوو لەلایەن نەجاشی پاشای حەبەشەوە نێررابوو کەحاکمو فەرمان ڕەوابێ لەیەمەن دا . ئەبرەهە بینی باری عەرەبەکان دەر بارەی حەجو کەعبەو مەکەو هەموو ساڵێ بەبۆنەی ئەم حەجو کۆبوونەوەی کشتی یەوە مەکە پلەیەکی بەرزی ئابووریو ئایینیو ڕامیاری وەرگـرتووە ، ویستی ئەمە بگۆڕێو ڕووی عەرەبەکان بکاتە یەمەن ، هەڵسا بـەئاکاداری نەجاشی یەوە ـ کەنشتەیەکی گەورەو چاکی لەیەمەنا دروســـت کردو بە هەمووجۆرە نەخشو نیگارێك ڕازانیەوە ، وەهەرچی شتیبەنرخ و سەرنج ڕاکێش بوبۆی هێنا ، هیوای ئەبرەهە ئەوەبووکە ڕووی عەرەبەکان لەمەکە وەربگێڕێو ڕوویان پێبکاتە یەمەن و لەلای کەنشتەکەی ئەوا حەج بکری بەڵام عەرەبەکان بەشێوەیەکی گشتی هەتا یەمەنی یەکانیش ڕوویان نەکردە کەنشتەکـەی ئەو ، چونکە بەگوێرەی باوەڕیان تەنیا ئەبێ لە مەکەو کەعبەدا حەج بکرێ ، ئەو کەعبەیەی دەسکردو دروست کراوی بـــاوو باپیرانیانەو ناتوانن دەست بەرداری بین ، وە ئایین وبیروباوەڕەکەی خۆیان بەلایـانەوە گەورەترو بەڕێزتربو لە ئـاینە شێواو بێسەروبەرەکەی ئەوان هەتا لەهەندێ داستانا ئەڵێ : پیاوێ لەعەرەبەکان بەدزیەوەچوەناو کەنشتەکەوە پیسایی تی کرد .

## چوونی ئەبرەهە بۆ سەر کەعبە :

ئەمکوێ نەدانی عەرەبانەو کۆبونەوەیان لەدەوري مەکە ئەمە تینێکی گەورەی کردەسەر دڵ و دەرونو مێشکی ، ئەبرەهە بەدەسەڵاتی خاوەن دامودەزگاو سوپای بێشمار ، بەڕەنگێ بڕیاری‌دا بچێتەسەر ( کەعبە ) وبیڕوخێنێ ،

بۆئەم بڕیارە ناڕەوایە لەشکرێکی ئێجگار زۆری کۆکردەوەو تیپێ فیلی خستە پاڵ ، خۆی سواری یەکێ لەفیلەکان بوو کەفیلێکی گەورەو بەناو بانگ بوو ، کەعەرەب بەم هەواڵەیان زانی زۆریان بەلاوە ناخۆش و گران بوو کەکەعبەیان بڕوخێت بەدەستی پیاوێکی زاڵمی حەبەشی یەوە ، خۆ ئەو خانووە خانوی باووباپیرانیانەو جێگای بتەکانیانەو هۆو مایەی سەربەرزی یانە وجێگای شانازیو حەج کردنیانە ، وە کۆنفرانسێکی ساڵانەو کۆبوونەوەی کشتی یان لەوێدا ئەبێ .

بەم بۆنەیەوە یەکێ لەپاشایانو گەورە پیاوانی عەرەب لەیەمەنا کەناوی ( ذونفر ) بوو هەڵساو هاوارو بانگی بە ناو نەتەوەکەیا بڵاوکردەوەو هانی عەرەبەکانی تریدا بۆ بەرەنگاری کردن لەسوپای ئەبرەهە ، وەبەو ئەندازە سوپایەی بۆی کۆبووە و هات و ڕێگای بە ئەبرەهەگرت ، بەڵام زۆری سوپاکەی ئەبرەهە لەوەدانەبوو کە ئەم بەو تۆزە سوپایەوە وبۆی بگێڕیتەوە ، لە ئەنجاما شکاو بەدیل گیرا . وەدیسان سەرۆکێکی تریش بەناوی(نفیل)ی کوڕی (حبیبی خثعمی) یەوە بە تیرەی (شەهران) وتیرەی (ناهس)ی کەس وکارێنەوە بەرەنگاری کرد ، ئەمیش دیسانەوە شکاو بەدیل گیرا ، لەپاشا خۆی کرد بەچاوساغی ئەبرەهەو سوپاکەی . ئەبرەهە بەم سوپا گەورەیەوە ملی ناو ڕۆیی تاگەیشتە ( طائف ) ، لەوێ کۆمەڵێ لەپیاوانی ( ثقیف ) هاتن بەدەمیەوەو پێیان وت : ئەوخانوەی تۆ بۆی ئەگەڕێیت لە (طائف) نیەو لە مەکەیە ، ئەترسان ئەو خانوە بڕوخێنێ کە ئەمان دروستیان کردبوو بۆ ( لات ) کە بتە گەورەکەیان بوو ، وەشارەزایان لەگەڵانارد تابردنیە لای مەکە .

کەگەیشتنە ( مەغمەس ) لە نزیکی مەکە فەرماندەیەکی بەسوپایەکەوە

ناردهەرچی ئاژاڵی ( تیهامە ) بوو بەقورەیش و تیرەکانی ترەوە هێنایان ، لەناویا دووسەد وشتری ( عبدالمطلب ) ی کوڕی هاشمی تیابوو کە لەوکاتەدا سەرۆکی قورەیشەکان بوو ، تیرەی قورەیش و کینانە و هوزەیل و ئەوانی تریش کە بەودەورەدا ئەژیان ، ویستیان بچن بەگژیانا ، بەڵام کە زانییان لە تواناو وزەیانانیە وازیان هێناو دانیشتن .

ئەبرەهە یەکێکی لە پیاوەکانی نارد کەناوی ( حناطەی حیمیەری ) بوو بۆ مەکە بۆ لای گەورەی مەکە تا تێیی بگەیەنێ : ئەمان بۆ جەنگ نەهاتوون ، هاتوون خانووی ( کەعبە ) بڕوخێنن و ئیتر ئەگەر ئەوان لە خۆیان تێک نەدەن ئەمان پێویستییان بەخوێن ڕێژی نیە ، وە (عبدالمطلب) کە ئەم قسانەی بیست وتی : بەخوا نامانەوێ بچین بەگژیاناو لەتوانامانیە ، وە ئەو خانوەیش ماڵی خوایە و دەسکردی ئیبراهیمی خۆشەویستیەتی ، ئەگەر خوابییەوێ بیپارێزێت لەدەستیان خۆ ماڵ و قەدەغەکراوی خۆیەتی ، وەئەگەر نەیشیپارێزێت بەخوا لەتوانای ئێمەدانیە ، وە لەگەڵ کابرادا ڕۆیی بۆلای ئەبرەهەو کۆمەڵێکی لەپیاوماقوڵانی مەکەی لەگەڵ خۆیا برد . عبدالمطلب پیاوێکی جوانی بەسام و ڕێکەوتوو و شێوەشیرین بوو کە ئەبرەهە چاوی پێکەوت زۆر ڕێزی گرت پێیی ناخۆش بوو خۆی بەسەر تەختەو ئەو لەزەویدا دابنێ ، وە نەیشیویست حەبەشەیی بیبینن لەسەر تەختەکەی داینا لەبەرئەوە خۆی دابەزی لە تەختەکەیی و لە تەنیشتی خۆیەوە داینا ئەمجار وتی بەدیلماجە ( ترجمانە ) کەی : پێیی بڵێ : چی ئەوێ لەگەڵیا بکەم ؟ ئەویش وتی : وشترەکانم ئەوێ بمدەنەوە وتی : کەچاوم پێت کەوت زۆر بەگەورەم پێش چاوهاتی کەچی بەم داوایەت لەبەرچاوم کەوتی ! ! تۆ تکای چەندوشترێکی تاڵانیم لێ ئەکەی لە کاتێکا

من هاتومو گەعبەکەتان بڕوخێنم ، کە جێگەی باوەڕو ئـاینی خۆتان و باووباپیرتـانە ؟ ! عبدالمطلب وتی : بەڵێ من خــاوەنی ئەو وشترانەم و داوایان ئەکەم ، وەئەوخانوەش تۆ ئەڵێێ‌ی خوا خاوەنێتیو بە تەمامقەدەغەی بکالێتان ، وتی : قەدەغەی ناکات ، وتي : دەی تۆو خواوئیتر کەیفی خۆتانە و فەرمانیدا وشترەکانیان دانەوە .

( عبدالمطلب ) و هاوەڵەکانی هاتنەوە بۆ مەکەو ئەم دەنگو باسەیـان گێرایەوە بۆ دانیشتوانیو داوایان لێ کردن : مەکە چۆڵ بکەن وخۆیـان بشارنەوە ، ئەمجار خۆیو چەند پیاوێ چوون بۆلای کەعبەو ئەلقەکەیـان گرت و کەوتنە پاڕانەوەو نزاکردن لە خوای پەروەردگار کەیارمەتییـان بداو کەعبە بەدەستی ئەو پیسو ناپاکانەوە زیانی پێ نەکات .

## ئەبرەهە هێرش ئەباتەسەر کەعبە :

قوڕەیشەکان بەمپێیە کەوتنە خۆئامادەکردنو لەولایشەوە ئەبرەهە رووی‌سوپای کردە کەعبەو تیپی فیلەکانیان خستە پێشەوە فیلە گەورەو پێشەنگەکەیـان کە بە ) ( مەحمود ) بەناوبانگ بوو کەتە ( کەی ) کرتن و نەڕۆیي و خۆی کوتا بەزەویدا ، بەپێچەوانی باوی تائێستای ، هەرچی‌یان کردو کۆشیان لەکەڵیاو بەقولنگ دایان بە سەریا بێ‌سوودبو هەڵ نەساو جوڵەی لێوەنەهات ، بەڵام هەرکە ڕوویان لە مەکە وەرئەگێرا بەغار ئەڕویی .

بەڵێ ئەم کاتە کاتی‌ئەوەبوو خەشمو قینی خوای پەروەردگار بکەوێتەکار بۆ پاراستنی مــاڵە بەڕێزەکەی و بۆ بەجێ‌هێنــانی نزای ئیبراهیم و بۆ لەناوبردنی سوپای ئەبرەهە .

بۆ ئەم مەبەسە کیاندارێکی بچووکو لاوازی بەکار هێنا هەتا بێ‌باوەڕو و گومڕاهان تێ بگەن هەرچەندە ئەوان دەسەڵات و توانایی لە خۆیاندا بە

دی بکەن ، هێزێکی پەنهانی هەیەو بە هەروێنەیەك بیەوێ زاڵ ئەبێ بەسەر ئەمانا . خوا پۆل پۆل باڵندەی ناردەسەریـــان و بەردی ( لەگڵ و بەرد تێکلاو ) یان بەدەنووکەوە بوو ، کەوتنە بەرد باران کردنی ئەو سوپاکەورەیەو شەلو پەتیان کردن هەتا وەکو کای خوراوو گەلاّ داریوشکی کون کونیان لێهات و هەموویان مردن و لەناوچون ، وە ئەبرەهە برینداریکی پەریشان بوو و هەلیـان گرت و هێنایانەوە بۆ یەمەن ، بەلاّم لاشە چەپەلەکەی لەبەرەوە ئەرزی و پارچەپارچە ئەبوو هەل ئەوەری و ئەکەوتە خوارەوە ، هەتاکەیانیانە سەنعا ( صنعاء ) لەوێدا لەپێش کیان دەرچوونیا سنگی لەت بوو جەرگو دلی هاتە دەرەوە . بەم پێیە خوا ئەو سوپـافراوانەی لەناو بردو ئەم جارەیش ماڵە بەرێزەکەی لە ناپاکان پاراست .

قورئانی پیرۆز ئەم داستانەمان بەم شێوەیە بۆ ئەگێرێتەوە و ئەفەرموێ :

( أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ، أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ، وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ، تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ، فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ) سورة الفيل .

ئەم شێوەی داستانەکە لەگەل رواڵەتی قورئانـا رێكوپێکەو نزیکترە لە راستییەوە و بـــاشترعەقڵ وەری ئەگریو زیاتر منەتی خوابەســـەر قورەیشەکانا دەرئەخات بۆیە بەمپێیە هێنام و دامنا . نەك بلێم :

سوپاکە تووشی ئاولەبون ، ئەمیش بەهۆی چەند باڵندەیەکەوە کەمیکرۆبی ئەودرمەیان هێنابوو ، یا بەهۆی مێشو مێشولەو میکرۆبەوەبوو ، یاخۆ بائەو میکرۆبانەی لە ناوچەی دەریـــاوە هێناو بەشێوەیەکی نەبینراوو نەبیستراو دای بەسەر سوپاکەداو لەناوی بردن ،

چونکە ئەم شێوەیەی پێشەوە رێکترە لەگەل رواڵەتی قورئاناو جوانتر

ئەو موعجیزەیە پیشان ئەدا کە خوامنەتی پێ ئەنێ بەسەر قورەیشاو ماڵەکەی خۆی پێ پاراستوە، وە بەڕوونتر گەورەیی و دەسەڵاتی خوای پەروەردگار و بێ دەســـەڵاتیو لاوازی مرۆڤ پیشان ئەدا . وەهەرکاتێ بەراوردی ئەم کاروڕوداوە بکەین لەگەڵ دەسەڵاتو خواهیشی خوای پەروەردگارا توشی هیچ جۆرە تەنگو چەڵەمەیەو نارێکییەك نایەین هەتا ناچار ببین بەو جۆرە لێکدانەوەو وتاویلەدورانە خۆمان ڕزگـاربکەین ، وەئەبێ ئێمە بە شێوەی خۆمانەی ئیسلامی و بەپێی ڕۆشنایی تایبەی ئیسلام ئیش وکارەکان لێك بدەینەوە و ڕاڤەیـــان بکەین و بەس ، ئیتر لەگەڵ عەقڵ و فامی ئەم و ئەوا ڕێك ئەکەوێیانە ؟، وەئەگەر ئێمە بمانەوێ لەترسی ئەمو ئەو خۆمان لە موعجیزە لابدەین بۆمان ناکرێ و بێ ســـوودە !! چونکە هەموو شتێ لە گیتیدا بەگوێرەی دەســـەڵاتو زانیاری ئێمەوە موعجیزەیە ، وە ئادەمیزادخۆی و هەمووشتەکانی موعجیزەن . . کــێ ئەمە بەڕاســت ئەزانێ کەمرۆڤێکی گەورەی بەهونەروبلیمەت لەتنۆکە ئاوێکی پیسی قێزەون دروست بووبێ ، ئەگەر لەبەر دەس وچاوی خۆمانا نەبوایە ، کەوابوو باشتەکە بەبێ توێکڵ و وەکو خۆی دای بنێین و لــێی وردبینەوە . وە لـەلایەکی ترەوە ئەبینین عەرەبەکانی ئەوسەردەمە بەچاوێکی دوژمنایەتی و پڕ لە ڕەخنەوە ئەیان ڕوانی بۆ پێغەمبەرو پەیامەکەی تاشتێ بدۆزنەوەو دەم کوتی پێغەمەری پێ بکەن ، و گوایە بەخەیاڵی خۆیان بەدرۆی بخەنەوە ، وەزۆر لەوانەی ئەم هەڵویستەیان هەبوو لەکاتی ڕوداوی (فیلا) گەورەبوون و ئاگایان لە ڕووداوەکە بووبوو ، دەی ئەگەر لەکاتی خۆیا پۆل پۆل باڵندەیان نەدی یایە ، یا نایان بیستایە کاتێ ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە ئاسمانو زەوی یان لە پێغەمبەر پڕ ئەکرد و ئەکەوتنە دەمەوەری لەگەڵیا کوا ؟ کەی ؟ باڵندەچی ؟ بەردی چی ؟..

خۆلەم بابەتەیشەوە نەکەمو نە زۆر هیچ شتێ ڕووی نەداوە .

بێجگەلەمانەیش ڕوداوەکە بەهەرجۆر و هەر ڕەنگێك بووبێ بۆ پێك‌هێنانی ( معجزه ) هیچ جیـاوازی نیە ، وەهەچـۆن بووبێ خۆابەشێوەی موعجیزە مەکەو کەعبەی پاراسـت و دوژمنانی لەناو بردو تەفروتونای کردن . وە ئەمەیش سروشتی یاسای خوابووە لەسەر زەویدا : هەرکاتێ کۆمەڵێ ویستبێتان خراپکاری بکەن خواتا ماوەیەك مۆڵەتیان ئەداو لێیان ئەگەڕێ تائەیانەوێ لە سنوور دەربچن ئەوکاتە بەدەستی تونایی خۆی لێیان ئەدا کەجێی‌خۆیان نەگرنەوە و لە ناویان ئەبا وەبەم پێیە ئەمجارەیش مەکەو کەعبە ڕزگاریان بوو . بێ‌گومان بەم‌کارە پایەی مەکەیی‌و قورەیشەکان بەرز بووەوە و زیاتر دەنگ‌وباسیان کەوتە ڕووی جیهان . (١)

## بەشی سێیەم :
## ژن هێنـانی عبدالله :

کاتێ ئەبرەهە بە سوپاکەیەوە هات بۆ ڕوخاندنی کەعبەو خوابەوجۆرەی لێ‌کردن کە لێی‌ی کردن عبدالمطلب لەتەمەنی حەفتا سالی تێ‌پەڕی‌بوو ، وە عبدللهی کوڕی لەتەمەنی بیست و چوار ساڵیدا بوو ، ویسـتی ژنی بۆ بێنێ عبدولله لاوێکی شیرین‌و جوان و واخزش‌پێ‌کەوتوو بوو بەڕادەیەك کە کچو ژنەمەکەیی‌یەکان شەیدای بووبوون‌و ئاواتەخوازبوون کەهاوسەرو هاودەمی ژیانیان بێ ،

بۆ ئەم باسە بابچین بۆلای پەڕاوی ( محمد رسول‌الله ) لەنوسینی خۆر هەلات ناس ( إبتین دینیە ) کەبەڕۆشنی لێرەدا خستوویە ڕوو « ڕۆژی ( عبدالمطلب ) دەستی عەبدولای کوڕی گرتبوو ئەڕۆیشتن ، ژنێك بەناوی

(١) عەرەبەکان ئەم‌ساڵەیان کرد بەسەرەتای مێژوو وە بە ساڵی فیل ئەناسرا

( فەتیلەی کچی نەوفەل ) خوشکی (وەرەقەی کوری نەوفەل ) زاناو شارەزای کەورە لە هۆزی ( بەنی ئەسەد ) لەدەرگای کەعبەدا وەستابوو ، هەرکە عەبدولآی بینی کەوتە لێوردبوونەوەو سەرنجدانی ، وەدیاربوو ئەو نورە ئاسمانییەی بەدی کرد کە لەناوچاوی عەبدولآ ئەدرەوشایەوە ، بۆیە بەرەنگاری بوو کەوتە پرسیار لێ کردنی :

ئەوە بۆکوێ ئەچی ؟ .

عەبدولآ : لەکەل باوکما ئەرۆم بۆهەرکوێیەك بیەوێ .

فەتیلە : بوەستەو کوێم لێ رابگرە !! ئەگەر رێ بکەوي لەگەلمو بم خوازی - با بۆماوەیەکی کەمیش بێ - سەد وشترت ئەدەمێ بۆخۆت .

عەبدولآ سەری سورلەبێشەرمیو بێ پەردەیی ئەو ئافرەتە ، بەتایبەتی لەلای پیاوێکي ریش سپی وەکو ( عبدالمطلب ) دا ، وە نەیزاني لەوەلآما چی بلێ ، بێجگە لەوەی کەووتی : وام لەخـــزمەتی باوکماو ناتوانم لە قسەی دەرچم .

لەپاش ماوەیەك عەبدولآ ژنی هێنابوو رۆژێك تووشی هەمان فەتیلەبووەوە، بەلآم ئەمجارە بەهیچ جۆرێ کوێی نەدایە عەبدولآ ، عەبدولآ پێی سەیر بوو ، ئەوجار چۆن بوو وئێستاش چۆنە !! بۆیە خۆی پێنەگیراو لێی چوە پێشەوەو وتی : ئەوە بۆچی ئەمرۆ وەکو ئەورۆژە نیت ولەگەلما نادوییت؟

فەتیلە : تۆ کێی ؟

عەبدولآ : من عەبدولآی کوری عەبدولموتەلیبم .

فەتیلە : تۆئەو کورەیت کەئەوسا ناوچاوت بەنوور ئەدرەوشایەوە ؟.

ئەی بۆئێستە هیچ دەرناکەوێ ؟. لەدوای ئەورۆژەوە چی رووی داوە ؟

عەبدولآ بەسەرهاتو ژن هێنانی خۆی بۆگێرایەوە.

فەتیلە وتی : بەخوا بەھەڵەدا نەچووبووم ، لەناوچاوانتا نورێکم بەدی ئەکردو پێم خۆش بوو ئەو نوورە بێتە لاشەی منەوە ، بەڵام دیارە ئێستە بوەتە بەشی ئافرەتێکی تر ، وەئەو ئافرەتە گەورە ترین پیاوی ئەبێ ، وە ئێستە بەھیچ کلۆجێ ئارەزووم لەگەڵتا نەماوە .

بێ گومان فەتیلە بەھۆی وەرەقەی برایەوە زانیویێی : بەوزووانە پێغەمبەرێك لەوخاکەدا لەدایك ئەبێ ، وەنووری ئەوپێغەمبەرە لەناوچاوی باوکیا ئەدرەشێتەوە ، وەئەویش بەزیرەکی خۆی ئەونوورەی لەناوچاوی عەبدوڵادا بینی بوو ، بۆیە ویستی بەھەر نرخێ بووە بیکا بەمێردی خۆی‌و ببێتە دایکی ئەوپێغەمبەرە مەزنەیە ، ئەگینا ئافرەتێکی بەشەرم‌و ئابروو داوێن پاك‌بوو.(١)

عبدالمطلب کەوتە پرسیار کردن‌و گەڕان بەناو تیرەکانی قورەیش دا بۆ ئەوەی ژنێکی وەچاخ زادەو جـوان‌و باش‌و ژیرو بەڕێز بدۆزێتەوە بۆ عەبدوڵای کوڕی ، وەلەئەنجاما ڕێیان کەوت لەچاکترین ژنی سەرزەوی (ئامینەی کچی وەھەبی کوڕی عەبدومەنافی کوڕی زوھرەی کوڕی کیلاب)ی قورەیش ، وەھەب لەوکاتەدا گەورەو سەرۆکی تیرەی بەرەی زوھرە بوو ، ھەرچی پرس‌و ڕایان کردو پشکنی‌یان لەھیچ ڕوویەکەوە کەم‌و کوڕی تیا نەبوو عبدالمطلب دەستی ( عبداللە ) ی کوڕی گرت‌و بردی بۆماڵی وەھەب ولەوێ خوازبێنی ئامینەی بۆکردوو ڕێـك کەوتن ، وەزۆری نەخایان کە ( عبداللە ) خاتو ئامینەی مارەکردو بەپێی یاسای ئەوکاتەی قورەیش خاتو ئامینە گوێزرایەوە بۆ ( عبداللە )، ئەو پیاوو ژنە بەڕێزە بە پێی خواھیشی خوای گەورە بەیەك گەیشتن‌و بوون بەھاوسەری یەکتر . (١)

---

(١) « محمد رسول اللە » لاپەڕە (٥٨) گۆڕینی مامۆستا ئیبراھیم جەزائیری لە فەرەنسی‌یەوە بۆعەرەبی .

# سەفەرکردنو مردنی عەبدولا

چەند مانگێ بەسەر ژنو مێردایەتی ئەوجوتە دەس بژێرکراوانەدا تێ پەڕیو دەرکەوت کەهەر لەسەرەتای بەیەك گەیشتنیانا خاتوئامینە سکی پڕبوەو ، لەناو قورەیشەکانا باوبووە هەرکام لە پیاوە دیاریەکانیان منالی ببوایە ( بەتایبەتی ئەگەر کوڕبوایە ) بۆ گوێزەبانەکەی شایی و ئاهەنگیان ئەگێڕاو نان و چێشتیان دروست ئەکرد . لەمکاتەدا کاروانی قورەیش بۆ شام لەڕێ کەوتنابوو ، بەم بۆنەیەوە ( عبدالمطلب ) وتی بەعەبدولا : کوڕی شیرینم لەگەل ئەم کاروانەدا بچۆ بۆشام بۆ هێنانو ئامادەکردنی گوێزەبانە بۆ ئەو منالەتان کەکاتێ لەدایك بوونی نزیك بۆتەوە ( وە لەخواوە بەهیوابوون کوڕبێ ) .

عبدولا خۆێ ڕێكخست و لەگەل کاروانا چوو بۆ شام و کڕین و فرۆشتنیان تەواو کرد و گەڕانەوە بۆ مەکە . بەلام خواهیشی پەروەردکار وابوو لەڕێکادا لەنزیکی شاری مەدینە عەبدولا نەخۆش کەوت و نەیتوانی لەگەل کاروانەکە بێتەوە و لە مەدینە لە مالی خالوانی باوکیا لای‌دا ، وەلەوێ دوومانگ لەپێش هاتنە ڕوی جیهانی محمدی کوڕیا کۆچی دوایی کرد .

کاروان هاتەوە مەکەو هەوالی نەخۆشینو لادانی عەبدولایان دا بە ( عبدالمطلب ) ئەویش بە کورجی ( حارث ) ی کوڕی نارد بەشوێنیا ، بەلام تا حاریس گەیشتە مەدینە عەبدولا مردبوو و ئەسپەردەی خاك کرابوو ، ئەویش بەم باری گرانی خەفەتەوە گەڕایەوە بۆ مەکەو ئەمهەوالە پڕلەناسۆرەی دابە باوك و براو بەخێزانە بەڕێزەکەی عەبدولا . بێگومان ئەمکارەساتەکرانە زۆر تیژی کردە سەر دلی هەموان و مردنی عەبدولا

کۆستێکی گەورەبوو ، بەڵام بەتایبەتی بۆ سـەر دڵی ( عبدالمطلب ) و خاتوئامینە ئەو ئامینەیەی کەخێزانێکی ئاواتەخوازو دڵخۆشبووە ، بەتەمای ژیانێکی پڕ کامەرانیبوون بە درێژی پێکەوە بەسەری بەرن‌و ببنە باوك و دیکی خێزانێکی ڕێك‌وپێك ، کەچی والەم سەرەتای بەهـاریا تاقە گوڵەکەی هیوای سیس بوو و هەڵوەری و پایزێکی وشك‌وبرنگ دای‌بەسەریاو تاقە چراکەی کوژایەوە و خستی‌یە تاریکایی ، ئاخۆ تاچ ئەندازەیەك دڵی شکابێ و چەند نارەحەتی کردبێ . بەڵام تازە چ سوود ؟ خۆ حیکمەت‌و خواهیشتی خوای پەروەردگار وایە کە : ڕابەرو ڕزگارکەری کشتی جیهان و پێغەمبەرو پێشەوای مرۆڤایەتی ئەبێ بە هەتیوی بێ‌و بژی و پێ بگـاو گەورەبێ .

عەبدوڵڵا مردو پێنج وشترو بڕ کەیەکی بچکۆلە مەڕەسپی‌و کەنیزەکێکی بەناوی ( أم أيمن )ەوە لەدوا بەجێ‌ما ، وەئەمە هەرچەند کەلەپورێکی کەم‌بوو بەڵام ئامینە لە ژێر چاودێری خەزوری بەڕێزی ( عبدالمطلب ) دا ئەژیاو جێگای ڕێزبوو .

## لەدایك بوونی ناقە پێشەوای مرۆڤایەتی محمد دروودی خوای گەورەی لەسەربێ

ئامینە کاتی منـاڵ بوونی نزیك بووەوە ، هەرچەند زانایان نـاڕێکی و جیاوازی زۆریان هەیە لەسـەر ( کات‌وساڵ‌و مانگ‌و ڕۆژو جێگا ) ی لەدایك بوونی محمد ، بەڵام ڕای زوربەیان وایە کە لە بەیانی ڕۆژی دووشەمە دوانزەهەمی مانگی ( ربيع الأول ) لە سـاڵی فیلابەزێ کەوتی بیستی مانگی ئابی ( ٥٧٠ ) ی لەدایك بوونی عیسا پێغەمبەر وە پەنجاوسێ

سالّ پێش کۆچ کردنی بۆ مەدینە لە مـــالّی ( عبدالمطلب ) داخوازی پەروەردگار محمدی بەخشی بە ئامینەو محمد بە خەتەنەکراوی لە دایك بوو ، ـ بە هەزاران درودو ستایشی خوای لەسەربێ ـ .

ئەم هەوالـە گەیشتە عبدالمطلب و زۆر پێی دلّشادبوو گەشایەوە کە خوا لەجێگای عەبدولاّ ئەم کوڕەی پێ‌بەخشین ، وەلە دلّی خۆیا داینا کە ئەم کوڕە لە جێگاکەی عەبدولاّ دابنێو کەلەبەرەکەی ئەوی پێ‌پڕبکاتەوە ، وە بێ‌ئاگابوو لەوەی کەچ پاشەڕۆژێك چاوەڕێی ئەم کوڕەئەکا ؟ وەچ پلەوپـایەکی ئەبێ ؟ وەلە ئەنجاما ڕزگارکردنی جیهان بەکســـەر بەستراوە بەو کوڕە نازدارەوە .

( عبدالمطلب ) بەکورجی چوبۆلای ئـامینەو پیرۆزیـایی لێ‌کرد و فەرمـانی دا کوڕەکەیان بۆ کـرد بەمەلۆتکەو بردی و ( طوافی پێ) پێ‌کرد حەوت جار بەدەوری کەعبەدا گێڕاي بۆ ئەوەی پیرۆزو بەفەڕبێ . وەلە ڕۆژی حەوتەمیا فەرمـــانیدا چەندوشتریان سەربڕی و کردیان بەشایی‌و ئاهەنگ و هەمو خەڵکی ئەوناوەیان بـــانگ کرد و عبدالمطلب کوڕەکەی ناوئا ( محمد ) واتە زۆر سوپـاس کراو ، بێ‌گومانّ خوا ئەم ناوەشیرینەی نایە دلّی ( عبدالمطلب ) وە کەتا ئەوساتە ناوی وا باونەبوو لە ناویانـا ، بۆیە قوڕەیشەکان ڕوویان کردە ( عبدالمطلب ) ، ووتیان : بۆچی لە ناوی باووباپیرانی خۆت لاتدا و ئەم ناوە چی‌بوو بۆت دانا ؟ ئەویش وتی : بەڕاستی دلّم وا بەهیوایە کە ئەم کوڕەم سوپاس کراوبێ لەئاســـمانو زەویدا .

## گۆش کردنی محمد :

کاتێ هەوالّی لەدایك بوونی کوڕی ئامینە گەیشتە مامەکانی ئەبوو لەهەبی

مامی کەنیزەکێکی بوبە ناوی ( سـوێبە ) وە ئازادی کرد لە خۆشی ئەم مژدەیەدا ، وەیەکەم کەسی شیری‌دا بـە محمد ( وەکو ئەڵێن کۆشی کرد ) ئەو سوێبە ئازاد کراوەبوو لـە دوای ئەو خاتونـامینەی دایکی و چەند ژنێکی تریش شیریان دایە ، وە ( ئوم و ئەیمەن ) سەرپەرشتی ئەکرد .

[ موعجیزەی بەرلەدایك‌بون و بەرلە پێغەمبەرێتی ( الارهاصات ) ] :

---

نوسەرانی رەوشت ( کتاب السیر ) زۆر رِوداوی گرنگیان نووسیوە لەبارەی محمدەوە لە کاتی سك پڕبوونی خـاتو ئامینەوە بە محمد هەتا لەدایك بوون‌و بەشەکانی ژیانی‌وە هەتا بووبە پێغەمبەر وەکو : ئەوە خاتو ئامینە هەستی بەئێش‌و ژانی سك‌پڕی‌و مناڵ بوون نەکردبێ ، وەبانگ‌کرابێ چار لەدوای چار : سکت پڕبوە بە پێغەمبەرێـك و هەموو مانگێ یەکێ لە پێغەمبەرەکان هاتبن بۆلای و پیرۆزباییان لێ‌کردبێ و مژدەی پەیدابونی پێغەمبەری دوایی‌یان دابێ و زۆرو زەبەنەی تریش کە کتێبەکانی رەوشت‌و مێژوو پڕن و زۆر لەهۆنەرەکان‌هۆنیونیانەوەو بگرە لەلای زوربەی مەردوم زانراون . . . وە ئەمانەیان هەموکردون بەنیشانە بۆ دەرکەوتنی ئیسلام و لابردن‌و لاچونی کوفرو خراپەو نەفـامێتی و بت پەرستی و هاتنەکایەی رۆشنی‌و خواپەرستی راستەقینە .

بەڵێ ئەم نیشانەو مەبەسانە راست‌و دروست‌و تەواون و هاتنی ئیسلام بریتی‌یە لە شۆرش کردن بەسەر کوفرو خراپەدا و لابردنی هەرچی زوڵم و زۆرو نارێکی‌یە . بەڵام لەلایەکەوە تێ‌ئەگەیشتن و سەرنج دان لە ژیانی محمد خۆی بەسە بۆ ئیسپات کردنی ئەو مەبەس و شۆرشە وە پێویستمان ناکەوێتە گەراندن بەشوێنی ئەو جۆرە ( إرهـاصـانە ) دا . وەلەلایەکی ترەوە رەنگەبەڵگەی دڵنیا کەروو رێك‌وپێکمان لەسەر زوربەیان دەست‌نەکەوێ

و پێویستی‌یان بەخۆ ڕەنجاندن بێ ، بۆیە نامەوێ لەسەریان بڕۆمو خامەیان تیابخەمەکار .

## دایەنی محمد :

یاساوباوی ناوپیاوە گەورەکانی قورەیش وابوو : کەمناڵیان ئەبوو ئەیاندایە دایەن لەلادێ کانا ، هەتا لەلادێدابژین و ئاوو هەوای هەڵمژنو هەوای بێ گەردی ئاسمان لێیان بداو لاشەو هەستو مێشك وژیری‌یان بەپێی سروشت گەشە بکات ، وزمان و وتەیان ڕەوان و خاوێن بێ و وشەی بێگانە ـ کەلە شارەکانا بلاون ـ تێکەڵی زمانی‌ان نەبێ ، وە فێرە وەرزشەجۆر بەجۆرەکان‌بین کەلەلادێ‌کاناباون ، وەکو زۆران بازی و ڕاکردن و سوار چاکێتی‌و یاریەکانی ناومناڵە لادێ‌یی‌یەکان . چەند تیرەیەك لە دەوروبەری مەکەدا بە ناوبانگ بوون بۆ سەرپەرشتی کردن و بەخێوکردن و لەلەیی کەیەکێ لەوانە تیرەی (بەنی‌سەعد ) بوو .

وەکو لەپێشەوەباسمان کرد سۆیبەی کەنیزەکی ئەبوولەهەب شیری‌دابە محمد هەتا ڕۆژی هەشتەمی لە دایك‌بوونی ، وەلەدوای ئەوشیری دابە حەمزەی کوڕی ( عبدالمطلب ) یش کەواتە محمدو حەمزەی مامی برای شیریش بوون

محمد ( د خ ) زۆر بەڕێزەوە سەیری سۆیبەی‌ئەکرد و سەری لێ‌ئەدا و یارمەتی ئەدا ، وە لەساڵی حەوتەمی کۆچیدا مرد

ژنانی لادێیی بەپێی یاسای خۆیان هاتن بۆشاری مەکە بۆ وەرگرتنی منداڵی ساوا و ، ژنێ بەناوی حەلیمەی کچی زوئەیب کەلە هۆزی بەنی سەعدو ژنی حاریسی کوڕی ( عبدالعزی ) بوو محمدی وەرکرت و بردی بۆ ناو خێڵەکەی خۆیان .

پەڕاوی « محمد روسول الله » بەناونیشانی « منالێتی محمد لە بیابـانی بەنی سەعدا » ئەڵی : « باکوێ لە حەلیمە ـ خۆی ـ بگرین تابە درێژی باسی شیر پێدانی و سەرپەرشتی و لەلەیی محمدمانبۆ بکات (١) :

حەلیمە ئەڵێ : سـاڵێکی گرانیو وشك وبێ باران بوو ، هیچمـان بەدەستەوەنەبووە ، زۆر هەژارو بێنەوابووین ، لەگەڵ (حارث بن عبدالعزی) مێردمـا بڕیارمان دا لەگەڵ ژنـانی تیرەی سەعدا بچین بۆمەکە بەڵکو منالێکی شیرخۆر پەیابکەین ، هەتا کەسو کارەکانی دەسکیرۆیی‌یەکمـان بکەن ، کوێ درێژێکمـــان هەبوو سواری بووم لەبەربێلەوەڕێ ئەوەندە لەڕولاوازبووبوو ئەترساین بڕنەکاو لەڕێگـــا بتۆپێ ئەوشەوە تابەیـــانی لەبەرگریـانی کوڕەشیرخۆرەکەم خەومـان لێنەکەوت (٢) چونکە دڵۆپێ شیر لەمەمکما نەبوو تـا پێیی ژیربکەم و ئـارام بگرێ ، وەکوانی وشترە لاتە بڕسی‌یەکەمان شیری تیـانەبوو تا بیدەم بەکوڕە کە ، هەتـا ئەهات بێهیوایی‌و ناهومێدی زاڵ ئەبوو بەسەرمانا و لە خۆمم ئەپرسی : چۆن من بەم بێشیری‌یەوە بتوانم بچمە ژێر باری منال بەخێوکردن ، بەڵام هەرچۆن بوو تەماع پاڵی پێوەنامو بە هەر لەقە لەقێبوو لەدوای ژنەکانەوە گەیشتمە مەکە ، ژنـان لەپێش منەوە هەرچی منـــالی دەســـەڵاتدارەکان بوو وەریان‌گرتبوون هیچ بۆمن نەمابوو تەنیا هەتیوێك نەبێ کەناوی محمد بوو لەبەرئەوەی باوکی‌نەبوو خێزانەکەیان هەرچەندە گەورەو دیاری بوو بەڵام

---

(١) ئەم باسە موو مێژوو ناسەکان بێگانەو ئیسلام باسیان کردووەولێی دواوون .

(٢) ئەمە وا ئەگەیەنێ حەلیمە خۆی منالێکی شیرە خۆری بەبەرەوە بووە جگە لەمحمد وەبووشیەتی وەکو لەمەودوا باسی ئەکا

سامان و دەسەڵاتێکی وایان نەبوو خەڵکی بخاتە تەماعەوە ، لەبەرئەمەبوو ژنەکانی پێش من کوێیان نەدابوویە .

منیش لەسەرەتاوە نەم ویست هەڵی گرم ، بەڵام لەپاشان کەکەسی ترم دەست نەکەوت ، ڕوم نەهات بەدەستی خاڵی بەتەنیا بگەڕێمەوە لەناوئەو هەموو ژنانەدا ، وەبێجگە لەوەش لەتانەو تەشەریشیان ئەترسام ، لەگەڵ ئەوەیشا ئەبینم لەخۆمەوە زۆر سۆزو خۆشەویستی ئەومنالە هەتیوە زۆر جوانو شیرینە لەدڵمایەو پێم ناخۆش بوو هەوای چەپەڵی ناوشار ئازاری پێ بگەیەنێ ، وەکەمێ وتو وێژم کرد لەگەڵ دڵی خۆماو ئەبینم تای ترازووی خۆشەویستیو سۆزم بۆی سەنگین بوو هەستم کرد مەمکەکانم پڕ بوون لەشیرو لەخویانەوە ئەبزوێن بۆدەمی محمد ، بۆیە ووتم بەمێردەکەم :

چەندم پێ خۆشە ئەوکوڕە هەتیوە هەڵ بگرم هەرچەند هیوامان کەم بێ بەدەسگیرۆیی خێزانەکەی بۆمان ، ئەویش وتی : خۆت ئەزانی وەزۆر نزیکە خوا بیکا بەهۆی خێرو بێر بۆمان ، ئیتر بەخێرایی ڕۆییم ومناڵە شیرینەکەم کردە باوەش ودەستم خستە سەر سنگە نەرم و نیانەکەی و ئەویش کەوتە بزەو زەردەخەنە بۆم وچاوە گەشو ڕەشو بریسکەدارەکانی کردەوەو دڵی مرۆڤی ئەفڕان ، منیش پڕبەدەم ماچم کردو هەڵم گرتو هاتمەوە بۆقۆناغو ، لەباوەشما دام ناو مەمکی ڕاستم نایە دەمی ، ئەبینم زیاتر لەتێرە خۆری تیا بوو ، دوایی مەمکی چەپم دایە نەی گرتو هێشتی یە وە بۆبراکەی ، وەئەمەش باوی هەمیشەیی بوو .

لەمەش سەیرتر ئەوە بوو مێردەکەم هەڵسا چوو بۆلای ووشترەوانەکە بەڵکو نەختێ شیری لێ بدۆشێ وبیخەینە بەردڵمانو نەختێ تینی برسێتیمان هێواش بکاتەوە ، کەچی ئەبینین گوانەکانی لەتاو شیر لەناوگەڵیا

جێیان نابێتەوە کەئەوسا دڵۆپیان تیا نەبوو ، دەستی کرد بە دۆشین هەتـا هەموو تێرو پڕبووینو لێشمان مایەوە ، ئەوشەوەمان بەخۆشیو بەتێرو پڕی بەسەربرد ، بەیانی پێی ووتم : بەخوا حەلیمە : تۆ منداڵـــێکی بەفەڕو پیرۆزت دەست کەوتووە ، ئنجا بەخۆشی ڕێ کەوتینو سواری گوێدرێژە کەم بوومو زۆربەپەلە منداڵەکەم گرت بەسنگەوەو هاتین ، بەجۆرێـکی وا کەهەموو کاروانەکەمان بەجێ هێشت ، وەهەموو سەریان ســـڕماو پێم نەئەگەیشتن ، ئنجا هاواریان لێهەڵساو ووتیان : حەلیمە نەختـــێ بە هێواشي ، بەزەییت بێتەوە پیامانا ، وەووتیان ئایا ئەوە گـوێ درێژەکەی ئەوسەرت نیە کەدەمێ دای ئەخستیو دەمێ بەرزی ئەکردیتەوە ؟ وتم : بەڵێ هەر ئەوەیە ، وتیان : بەخوا ئەمە بـــەخۆڕایی نیەو شتێکی سەیر ڕووی داوە ،

چووینەوە جێگای خۆمان لەهەوارەکانی بەنیسەعدا ، گومان ناکەم خاك بێ لەوە وشكو بێبەهرە تر کەچی دوای ئەوەی محمدم برد ئاژاڵەکەمان ئەڕۆیینو بەکوانی پڕلەشیر ئەهاتنەوە لەکاتێکا کە دراوسێـکانمان تینـووی دڵۆپێ شیربوون ، بەڵام ئاژاڵی تیرەکەمان وانەبوون ، بۆیـە ئەیان ووت بەشوانەکانیان : داوەشێن بۆچی لەلەوەڕگای ئاژاڵی حەلیمەدا ئاژاڵەکەتان نالەوەڕێنن ؟ بەم پێیە بەئاشکرا خێرو بێرمان ئەبینی لەهەموو شتێکا تـا دووساڵ تەواوبوو ، بەپێی دەستوورو باو محمدم لەشیر بڕییەوە وەبەفەرمانی خوا گەورە ئەبوو بەشێوەیەکی ناوازەو جیاواز لەمنـــاڵانی تر . . تەمەنی نەگەیشتە نۆمانگ کەوتە دواندنو قسە کردن بەشێوەیـەکی شیرینو دڵ فڕێن . خۆی پیسوچەپەڵ نەئەکردو نەئەگریاو بیانووی نەئەگرتوهاواری نەئەکرد ، مەگەر بەڕووتی دام بنایەو خەڵکی بیان بینیایە ، وەکە لەشەوا

بێزار ببوایەو خەوی لێ نەکەوتایە ئەم بردە دەرەوەو بەتیژی لەئەستێرەکان وورد ئەبووەوەو خۆشی پێ ئەکەوت ، وەکەلەتەماشا کردنیان تـێر ئەبوو چاوی ئەنا بەیەکاو خەوی لێ ئەکەوت .

دوای تێپەڕبوونی دووساڵو بڕینەوەی محمد لەشیر بەپێی یاسای‌دایەنی ، حەلیمە ناچار بوو بیهێنێتەوە بۆلای دایکی ، ئەودایکە بەڕێزەی کەئاواتە خوازبوو هەمیشە کوڕە شیرینەکەی لەبەرچاوبێ‌و دلی پێی بحەوێتەوە ، چونکە بێجکەلەوەی تاقانە ڕۆلەی باخەلی‌بوو یادکاری مێردی جوانەمەرگ‌و شیرین‌و ناوازەو لاوچاکەکەی بوو ، بەلام حەلیمە نەی‌ئەتوانی بەبێ محمد بژی ، بەختیـاری خۆی و خێزانەکەی لەبوونی محمدا ئەبینی ، بۆیە تکاو پاڕانەوەی زۆری کردو خۆی دابەسەر دەست و پێی‌ی خاتوئامینەداو وتی : نابینی چۆن ئاوو هەوای پاك‌و خاوێن‌و بێ‌گەردی دەشت و دەری‌پێ‌کەوتوەو دلتنایە سـەیری بکەی وە چەندە جوان پێی‌ی کرتوە ، ! ! وە ئەترسم هەوای پیس‌و تێکلاوی ناوشارتینی تێبکاو تەخۆش بکەوێ و تۆش دوایی پەشیمان ئەبیتەوە . خاتوئامینە هەرچەند زۆر بەلایەوە تاسق‌بوو ئەوکۆرپە ناوازەیە لەبەردەستیـابێ و دلی پێی‌ی فێنك ببێتەوە بەلام لەبەرخاتری کوڕەکەو لەبەردلی ئەو دایەنە دلسۆزەیەی دلی داهێناو ـ ئەلبەت بە ئاگاداری باپیری‌یەوە ـ کوڕەکەی دایەوە بە حەلیمەو بردی‌یەوە بۆلادێ .

محمد گەڕایەوە بۆ بیابانی بەنی سەعدو سێ ـ یادوو ـ ساڵێ تری‌تیادا بردەسەر لەم ماوەیەدا بەهۆی هەوای بیابـانەوەوە بەهۆی خۆراکی‌و سادەو سروشتی لادێیەوە لەش ساغ‌و ئەندامەکانی پتەوو ماســولکەکانی داڕێژراوو بەتین بوون ، بەشێوەیەکی ناوازە گەشەی ئەکردو پێئەگەیی و گەورەئەبوو ، بەبێ هیچ جۆرە دەردو نەخۆشی‌یەك ، وەبەپێی باوی لادێ

فێری جورەها کاروبارو فرمان و وەرزش و یاری بوو . . وەکو شوانی و بەخێوکردنی مەڕومالاَت و ڕاکردن و بـازبازێن و زۆران بازیو سواری وە زمانی بەتەواوی تەڕو پاراوو ڕەوان بوو .

ئەمە لەلایەکەوە وەلەلایەکی ترەوە ئەوژیانە کولـەمەرگی‌یەی لەو لادێ وشك و برنکانەدا هەیەو ئەوساردی و گەرمی و پیشەو بـاوە پڕلەچەرمە سەرێیەی لە بیابانەکانا دێنەڕێی مرۆڤ ، ئەمانە هەموو توانی‌یان محمد ـ د . خ ـ ئامادەبکەن بۆ چوونە ژێرباری گران و بۆ خۆکرتن لەژێرتێن و پالەپەستۆو ناسـۆرو هەموو جۆرە بەسەرهاتێکی گرانا ، محمد ( د . خ ) زۆر بەلایەوە خۆش بوو یادکردنەوەی ئەو ژیانەی ناوتیرەی بەنی سەعدو زۆر جار ئەی‌فەرموو : « لە نـازو نعمەتە گەورەکانی خوایە بە سەرمەوە کە لەدایك بووم لەناو تیرەی قورەیشـــا کە بەڕێز ترین تیرەکانە ، وەگەورەبووم لە بیابانی بەنی سەعدا کە باشترین جێکایە لە خاکی حیجازا »

ئامادەبوونی محمد ـ د . خ ـ بەومنالی‌یەی بۆ تێ‌بینی و وردبوونەوە و سەرنج دان وای‌لێ کردبوو لەگەل هاوەلەکانیا نەئەکونجا ، بۆیە هەمیشەوای پێ‌خۆشبوو لێ‌یـــان دوروبکەوێتەوەو تێکەلاَوی‌یان نەکات لە یـــاری و هەلسووکەوتیانا ، وە بەزۆری بەتەنیا ئەژیاو بیری ئەکردەوەوەو سەرنجی لەم گێتی‌یە گەورەیە ئەدا .

## سنگ لەت کردن :

ڕۆژێ لەڕۆژان محمدو براشیری‌یەکەی وەکو جاران ئاژالیان لێ‌خوڕی بۆ لەوەڕگاو لە دەماودەمی نیوەڕودا براکەی بەهەلەدەوان هاتەوە و هاواری کرد : بابە ، دایە . فریای برا قورەیشی‌یەکەم کەون . . دوو پیـاوی سەرتاپاسپی بردیان و خستیان بەزەویدا و سنکیان لەت کرد . حەلیمە و

مێردەکەی بێ پەروایانە ڕایان کرد ، ئەبینن محمد دانیشتووە بەهێواشی و ئەخق ڕەنگی تێك چووە ، کە گەیشتنەلای ماچیان کردو لێیان پرسی : کوڕم ئەوەچی بوو چیت بەسەرهات ؟ وتی : « ئاگاداری ئاژەڵەکەم ئەکرد دیم دووپیاو هاتن لێم نزیك بوونەوە و یەکێکیان وتی : ئەمەیە ؟ ئەوی تریان وتی : بەڵێ ، ئەمجار گرتمیان و بەپشتا خستمیان و سنگیان لەت کردم و گەڕان لەناویا شتێکی ڕەشیان لێ دەرهێناو لەبەرخۆیانەوە وتیان : ئەمەبەشی شەیتانە ، ئەمجار دایانەوە بەیەکاو چاکیان کردەوە و ئیتر لەبەر چاوم گوم بوون »

حەلیمەو مێردەکەی - بەسادەیی و بێ ئاگایی خۆیان - ترسیان لێ نیشت کە محمد تووشی خراپەیەك ببێت ، حاریسی مێردی وتی : حەلیمە ئەترسم ئەم کوڕەتووشی شتێکی ناخۆش بێ ، چاوو دەروونی پیسی دڕاوسێکانمان کاری لێ کردبێ ، لەبەر ئەوهەموو فەڕو بێرەی بەهۆی ئەمەوە ڕژاوە بەسەرمانا ، جائیتر ئەم کارەساتە لەلایەن شەیتانەوە بێ وئەم وای لێ تێ گەیی بێ یاهەر شتەکەی ڕاستەو ڕەوان بێ ، وەنیشانەی پاشەڕۆژێکی گەورەبێ ، هەرکام لەمانەبێ بۆ ئێمە ڕووزەردی تیایەو مەترسی لێ ئەکرێ ، هەڵسە بی بەرەوە بۆ ناو خزمو کەسەکانی ،

حەلیمە هەرچەندە بەلایەوە شتێکی گران بوو دوور کەوتنەوەی محمد بەو هەموو خێرو بێرەیەوە ، بەڵام وتەکەی مێردەکەی تێی تێ کردو بەلایەوە ڕاست بوو ، لەبەرئەوە محمدی هێنایەوە بۆ مەکە حەلیمەهات بەڕێوە و محمدیش کەلە تەمەنی چوارساڵانەدا - یا پێنج ساڵانەدا - بوو لەگەڵیا ئەڕۆیی ، تاریکەشەوبوو کە نزیك بونەوە لە شاری مەکەوە ، وەکەوتنە ناو قەڵەباڵغێکی گەورەوە کە ئەوانیش بۆشار ئەڕۆیشتن ، لە ناکاوێکا

حەلیمە لای کردەو بینی خۆی تەنیایەو محمدی لەگەڵانەماوە ، حەلیمە کەوتە هەڵپەو پەڵەقاژەو ڕاکردن بەملاولادا بەڵام لەبەرتاریکی شەو هەرچی کرد و کۆشای بێ سوود بوو نەیدوزیەوە ، ئیتر بە ناچاری و هەڵەدوان هات بۆلای ( عبدالمطلب ) و هاواری کرد : محمدم لێ گوم بووە ، ئەویش خێرا خەڵکێکی زۆری نارد بەشوێنیاو خۆیشی سواری ئەسپێکی چاك بوو ڕۆیی بەدوایانا ، زۆری پێ نەچوو یەکێ لەوپیاوانە منالێکی بینی لەبن دارێکا دانیشتووە دەستی گرتوە بەلقێکی دارەکەوە ، بانگی کرد : منالەکە تۆ کێی ؟ وتی : من محمدی کوڕی عەبدوڵام ، کابرایش بەشادمانی یەوە پەلی گرت و هێنایەوە بۆ لای باپیری وە ئەویش زۆر بە ئارەزووەوە گرتی و ماچی کردو لە باوەشیا لەسەر کەلپۆسی زینەکە دایناو گەڕایەوە بۆ ناوشار ، ئەمجا فەرمانی دا چەند سەرێ مەڕیان سەربڕی و کرا بەچێشت و گۆشت و دەرخواردی خەڵك دراو هەژارەکانی مەکەی بۆ کۆکرایەوە . وە محمدی کرتە باوەشی و گەڕانی بەدەوری کەعبەدا و سوپاسی خوای گەورەی کرد ، پاشان دەستی محمدی گرت و لەگەڵ حەلیمەدا بردنی بۆلای خاتو ئامینە ئامینەیش وەکو دەستوری دایك و منال دەستی کردە ملی و کەوتە ماچ کردنی و کوشی بەسنگی یەوە تادڵی حەوایەوە ، ئەمجار کەوتە دواندنی حەلیمە ووتی : چۆن بوو والەخۆتەوە محمدت هێنایەوە خۆتۆ سووربووی لەسەر ئەوەی بەلای تۆوە بمێنێتەوە ؟ حەلیمە وتی : سوپاس بۆ خوا گەورەبووەو پێویستی بەلەلەیی من نەماوە و منیش پەیمانی خۆمم لەگەڵیا بەجێ هێناوەو ئیتروام بەباش زانی بی هێنمەوە بۆلاتان . هەرچەندە حەلیمە وتەی ڕێك و پێکی ئەوت بەڵام خاتو ئامینە لەڕەنگ و ڕوویاشتی تری ئەخوێندەوە بۆیە باوەڕی پێ نەکرد و فەرمووی : تۆ ئەتەوێ ڕاستی یەکە لەمن بشاریتەوە ؟

ڕاستی یەکەم پێ بڵێ ، وازی لێ نەهێنا تا حەلیمە بەتەواوی ڕووداوەکە و وتەکانی حاریسی مێردی بۆ گێڕایەوە ، خاتو ئامینە لەبەرئەوەی خوا ئاگاداری خستبوە دڵی و شتی زۆر ناوازەی لە محمدەوە دیبوو ئەوڕایەی ئەوانی بەلاوە پەسەند نەبوو فەرمووی : ئایا لە شەیتان ئەترسان لێی ؟ حەلیمە وتی : بەڵێ . وتی : نەأ ، هەڵەبوون ، بەخوا شەیتان ڕێگای بۆ سەر محمد نیە ، ئەم کوڕەی من شان و پلەو پایەیەکی گەورەی ئەبێ . ئەمجار زۆر شتی گەورەو گرنگ و ناوازەی لەبارەی محمدەوە بۆ گێڕایەوە وەکە بینیویێتی ئەمجار بەپێی توانا پاداشتی خاتو حەلیمەی دایەوە و بەجوانی خواحافیزی لێ کرد » (۱)

## دواندن لەبارەی سنگ لەت کردنەکەوە :

گەورەترین و گرنگترین پلەو پایەی سەر زەوی و ئاسمانەکانیش وەگرانترین ئیش و کار بەڕوویەکی گشتی بریتییە لە پێغەمبەرێتی وەوەرگرتنی پەیام و نیگا ( الرسالة والوحی ) لە خوای بێوێنەو پەروەردگار ، خۆ پێغەمبەر ئەبێ هەموو ئەندام و بەش و پارچەکانی لاشەو دڵ و دەروونی بەئاشکراو نهێنییەکانیەوە هەموویان - بالفتە کراوو پاك وخاوێن بن ، وەبە هیچ جۆرکەم و کۆوڕی و نارێکی تیانەبێ ، ئەبێ شێلاندنی هەویرەکەیان و داڕێژندنی ئەندام و پارچەکانیان و سەرپەرشتی گەورەبوون و گەشە کردنیان و پێگەیشتنیان بەشێوەیەکی تایبەتی و لەژێر چاودێری دەست و چاوێکی وریاو بەئاگاو تایبەتیدابێ ، کەهیچ کاتێ و بە هیچ کلۆجێ دەستی لێ بەرنەداو لێی بێ ئاگانەبێ .

پێغەمبەران مرۆڤ بوون نەك وەکو مرۆڤەکانی تر ، پیاوو ئادەمیزادبوون

(۱) « محمد رسول‌الله » لاپەڕە ( ٦٢ — ٦٧ )

نەك وەكو پیاوانێ‌تر ، بەڵكو لەهەموو ڕوویەكەوە و لە هەموو شتێكیانـا ئەوەندەبەرزو بوڵندبوون زۆركەس تیایانا بەهەڵە چوەو لەڕیزی مرۆڤایەتی دەری كردون و بەرەو نەژادێكی‌تر بردوونی . . نـاییینی ژنانی میسر بە ( یوسف ) پێغەمبەر یان ئەوت : ( ماهذا بشرا ان هذا إلاملك كريم ) سوورەتی یوسف ، واتە ئەمە ئادەمیزاد نیە و ئەمە فریشتەیەكی بەڕێزە . یاجوولەكەو گاورەكان دەربارەی هەندێ لەپێغەمبەران ڕایەكی هەڵەیان‌بووە ، یاله كاتی خۆیا قورەیشەكان بە پێغەمبەریان ئەوت : چۆن مرۆڤ ئەبێ بە پێغەمبەر ؟ پێغەمبەر ئەبێ فریشتەبێ .

وەكردەوەو كاروبارەكانی محمد گەورەترو زیـــاترو بەرزتربوون لەتوانایی و دەسەڵاتی مرۆڤ - وەكو پشت بەخوا لەم‌پەڕاوەدا بۆت دەرئەكەوێ - خۆئاشكرایە ئیش‌و كاری گەورەیش پیاوی گەورەو تەواوی ئەوێ ، بەتایبەتی وەرگرتنی پەیام ونیگا ڕاستەو خۆ لەخوای پەروەردگـــارەوە یابەهۆی فریشفەوە لێ‌هـاتوویی و ڕزاوەیی‌و پـاڵفتەیی‌یەكی وای ئەوێ كە ئێمەی مرۆڤ لێی تێ‌ناگەین و زانیپاری تائێستەنەی توانیوە پەیي پێ‌بەرێ .

خوا محمدی دروست كردو ئامادەی كرد بۆ هەڵگرتنی ئاڵاو پەیامی پێغەمەرمبەرێتی و بۆ بڵاوكردنەوەی ئایین و بەرنامەی ئیسلام كەدوائایین و پێ‌گەییشتوترین پەیام و بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤەكان بەتێكـڕایی ، وەبۆ ئەوەی ئال‌و گۆڕێكی تەواوو كشتی بكا لەباری مرۆڤایەتی یاله هەموو ڕوو و هەموو لایەكەوە .

پیاوێك كارێكی ئاوەها گرنگ و بەوجۆرە پیرۆزی بدرێ بەســـەرا و خوا كارێـكی بەوپێ‌یەكرانی بدا بەسەرا . سروشتی‌یە خوا لـــە هەموو ناڕەواییی‌یەك دووری ئەخاتەوەو نایەڵێ شەیتان و پیسی دەروون ( النفس

الأمارة بالسوء ) ڕێگایان بێ بۆ سەری و نابێ بتوانن بەهیچ کلۆجێ تێی تێ بکەن

عەبدولای کوڕی مەســعود ئەلێ ـ : پێغەمبەری خوا فەرموویە : « هەرکەسێ لە ئێوە هاوەڵێکی فریشتە و هاوەڵێکی شەیتانی بەسەرەوەیە . وتیــان : تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : منیش . بەڵام خوا یارمەتی دام وزاڵ بووم بەسەریـاو موسڵمان بوو و هەرداوای چاکەم لێ ئەکات » (١)

پێغەمبەران نابێ بەنەفس‌و دەروونی خۆیانەوە خەریك بن ئەبێ بەچاك کردنی دڵ‌و دەروونی مرۆڤەوە خەریك بن .. ئەنەس ئەڵێ : ( پێغەمبەری خوا لەگەڵ منالانا یاری ئەکرد جوبرەئیل هات‌و گرتی‌و خستی بە زەویداو سنگی لەت کردو دڵی دەرهێناو پارچەیەکی لێ فڕێداو وتی : ئەمەبەشی شەیتانە ، ئەنجار لەتەشتێکی زێڕا بەئاوي زەمزەم شۆری‌و خستی‌یەوە جێگای خۆی‌و نایەوە بەیەکا ، منالان ڕایان کرد بۆلای دایکی ـ واتە دایەنەکەی ـ ووتیان : محمد کوژرا ، ئەوانیش هاتن بینی‌یان ڕەنگی تێك چوە «٢» . ئەنەس ـ خوا لــێ ی ڕازی بێ ـ ئەیووت : لەئەنجامی ئەو سنـگ لەت کرەنەی هێڵێ دیاربوو لەسەر سنگیاو ئەم بینی .

وە،ئەم ڕووداوە دووبارە بووەوە کاتێ محمد تەمەنی لەپەنجا تێ پەڕی بوو لەکاتی شەوڕەوی وبەرزبوونە ( الاسراء والمعراج ) وە کەیا ، بە ماوەیەك لەپێش کۆچی مەکەدا ، مالیکی کوڕی ( صعصعە ) ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەربێ ـ باسی شەوڕەوی‌یەکەی بۆ کردین‌و فەرمووی :

---

( ١ ) موسلیم‌لە ( صحیح ) ی خۆیا ڕیوایەتی کردوە .

( ٢ ) موسلیم ڕیوایەتی کردوە .

(کاتێ لەحەتیم (حطیم) یافەرمووی : لەحیجردا ـ ڕاکشابووم لەنێوانی خەوتوویی‌و بێداری‌یا بووم یەکێ هات‌و لەوێمەوە تا ئەوێمی ( دەستی‌ڕاکێشا بۆسنگی تا خواری ناوکیەوە) هەڵ دڕی‌و دڵمی دەرهێناو تەشتێکی زێڕیان هێناو پڕبوو لەباوەڕ ، دڵمی پاك شۆری‌و پاشان پڕی‌کرد لەباوەڕو دوایی خستی‌یەوە جێی خۆی ) «١»

ئەم ڕووداوی سنگ لەت‌کرن ( یا بەزمانی ئەم چەرخە ئەم عەمەلی‌یات کردنە ) . بەلای خۆرهەلاّت ناسەکانەوە وە بـــەلای هەندێ لەنووسەرە موسلمانەکانیشەوە بەجێکەی گومان دائەنرێ‌و دوودڵن تیایاو باوەڕناکەن کەموعجیزەو شتی وا کرنـگ ڕووی دابێ ، وە بەتایبەتی « سێرمۆلێم و دێر هینکام » ئەیانەوێ خۆیانی لێ‌دوور بخەنەوەو ددانی پیا نەنێن ، وەڕوویەکی تر بۆهێنانەوەی محمد ـ د . خ ـ بۆلای دایکی بدۆزنەوە ، وەهەندێ نووسەری مێژوویی موسلمانیش خۆیانی لێ‌ئەدزنەوەو ئەڵێن : مادەم خـوا محمدی بۆ وەرگرتنی پەیامی پێغەمبەرێتی دروست کردوە ئیتر چ پێویستی‌یەك هەیە بۆ ئەم سنگ لەت‌کردنەی ، وەمێژوو نووسانی ئەفرەنج وەکو ئەوانی پێشەوە ئینکاری ئەکەن . . نیکۆلسۆن لەپەڕاوی ( مێژووی ئەدەبی عەرەبی ) دا ومۆییر لەپەڕاوی ( ژیانی محمد ) ا ئەڵێن : ئەوکارەساتە فێ ( پەرکەم ) بووە . ئەم قسە پڕو پووچە کەدوورترین شتە لەژیانی محمدەوە وهیچ کاتێ فێ‌و پەرکەم لەوپیاوە نەبینراوە بێجـــکە لەناحەزی هیچی تر دروستی نەکردوە !! ئەمان‌و ئەوان‌و هـەرکەسێکی تریش کە هـــاو باوەڕیان بێ مەبەسیان ئەوەبووە کەکارە گرنگەکانی محمد ـ د . خ ـ هەموویان بگێڕنەوە بۆلای سروشتی گەردوون لەزەویدا وددان بەموعجیزەدا نەنێن ، وەئەم‌جۆرە

---

«١» بوخاری لە ( صحیح ) دا ڕیوایەتی‌کردوە .

باوەڕە هەڵقوڵاوی شارستانێتی مـــاددی خۆرئاوایە و نابێ کاروفرمانەکانی دەوری ئیسلامی بەو باوەڕە کێشانە بکرێن .

ئێمە بەدەوری خۆمانەوە بەعەقلیەتێکی خاوێنی ئیسلامی ، ڕووداوی سنگ لەت کردنەکە بەڕاستەو ڕەوان ئەزانین و بەپێی توانا هەوڵ ئەدەین بۆ ئیسپات کردنی و بەرپەرچی ڕاکانی ئەوان ئەدەینەوە : ـ

١ ـ باسی سنگ لەت کردن مێژوو نووسەکان ـ بەکۆنو تازەوە ـ هەموو نووسیویانە و باوەڕیان پێی بووەو کەسیان ملەجەڕەیان تیا نەکردوە .

٢ ـ وەکو لەسەرەوە زانرا فەرموودەی صحیحی ( ڕیوایەتی بوخـاری و موسـلیم ) ی لەسەرەو ئەنەس ئەیوت : جێگەی خێتەکەی دیاربوو .

٣ ـ لـەدرێژایی تەمەنی محمدا ـ درودی لەسـەربێ ـ فێ و پەرکەم و لە هۆش چوونی نەبووە بەهیچ کلۆجێ .

٤ ـ محمد ( د . خ ) خۆیو ژیانی لەسـەرەتاوە تـاکۆچی دوایی هەمووی هەرموعجیزە بووەو کارەکانی لەتوانایی مرۆڤ بالاتر بوون ، وەبەتێبینکی سادەو کورت لەژیانی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ـ درودی خوای لەسەربێ ـ چەندەها موعجیزەی گەورەگەورە دێتەدەستمان ، ئیتر بۆچی ئەبێ ئێمە لە مووعجیزیەکی وەها ڕابکەین و دەس بکەینە خۆشاردنەوە .

٥ ـ ئیش وکارەکانی گێتی و گەردون ـ بەوردودرشتیـــانەوە ـ ئەگەر ڕووبەڕووی توانایی و خواهیشی خواوە بی یان گرین ئەبینین هەموویان ـ بەتێکڕایی ـ بەپێی دەستوورو یاسای دامەزراو و نەگۆڕاون و ڕێکن لەگەڵ یاساکانی گەردوناو موعجیزەیان تیانیە ، بەلام هەر کەڕووبەڕووی تواناو زانایی و خواهیشی مرۆڤ گرتنمان ئەبینین بەشی زۆریان موعجیزەن و لەتوانایی مرۆڤ بالاترن . وەلەسەر ئەم بناغەیە بۆ هیچ کام لە ڕووداوە

گرنگەکانی ژیانی محمد ( یا هەر خاوەن بەهرەیەکی‌تر ) ناچارنــابین بە ملەجەڕە و پەلەقاژە و خۆشاردنەوەو ڕاکردن ، وەڕیك‌و پێك‌دای ئەنێین‌و باوەڕی پێ‌دێنین و ئەڵێن : ئەمە موعجیزەیەکی‌ترە .
٦ ـ بەچاوی خۆمان ئەبینین مرۆڤەکان بەپێی ئەو زانیاری‌یە تەنگەلآنەیان و بەو دەســەڵاتە سنوورداریـان کـە هەیانە توانیویانە شتی وابکەن کە بالآدەســتی زانیــاری و توانـایی‌یـان بێ و لـە ڕیزی جادو یـاموعجیزەدا دابنرێ . . وەکـو تەلگوراف ولاســلکی و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و کارەباو . . . هتد ، یاوەکو هۆیانی گواستنەوەی هەوایی‌و زەوي‌و دەریایی خێرا . . . یا وەکو دۆزینەوەی دەردو دەرمان ، یاوەکو عەمەلی‌یات کردن . . بەتایبەتی عەمەلی‌یاتی دڵ کە گرنگترین پارچەیە لە لاشەی ئادەمیزادا و مروڤ پێوەی بەندە ، ئێستە ـ وەکو ئەبیەین دڵ لائەبەن‌و لە جێگاکەیا دڵی تر ئەڕوێنن و ئەودڵەیش هەڵ‌ئەسێ بەئیشەکانی خۆی و سووڕی خوێن ڕێك ئەخا . ئەمانە هەموویان ـ لەبەردەست‌و چاوو گوێ‌ی خۆمانانا ئەکرێن‌بێ ئەوەی کەس گومانی ببێ تیـایانا یابە درۆیــان بزانێ یاخۆیان لێ‌بشارێتەوە .
ئەی ئەگەر خوای پەروەردگاری کەزانین‌و دەسەڵاتی . . سنووری‌نیە ، ئەگەر فریشتەیەك حاڵی‌بکاو بی‌نێرێ‌و بەســەرپەرشتی خۆی ـ لەبەرئەو حیکمەتەی هەرخۆی ئەی‌زانێ ـ عەمەلی‌یاتی دڵی محمدی پێ‌بکا ، بۆچی ئەبێ جێگای گومان‌بێ و بەڕاستی نەزانین ؟ !
ئایا هەرلەبەرئەوەی شارستانێتی تازەی خۆر ئاوادانی پیانانێ ؟!! بەڕاستی شتی وا زۆر سەیرەو جێگای سەر سڕمانەو پێ‌کەنینی ئەوێ .
بەڵێ محمد ـ درودی لەسەربێ ـ سەرەڕای ژیانی و هەموو کاروکردەو

بەسەرهاتێکی سەرمەشقیکی بەکەڵکە بۆ مرۆڤایەتی ، وە ئەم ڕووداوە ناوازەیەی دەرسێکی پڕسوودی عەمەلیات کردنی دابنێ و ڕێگای کردەوە بۆ زانایان کەلێیەوە بتوانن عەمەلیات بدۆزنەوە [ ولكم في رسول الله أسوة حسنة ]

وەفای محمد بۆ حەلیمە : وەکو زانیمان محمد ( د . خ ) چوار ـ یا پێنج ـ سال لەناو تیرەی بەنی سەعدا و لەژێر سۆزی حەلیمەدا ژیا ، وەلەو ماوەیەدا لەڕووی لاشەو زمانو دلو دەرونەوە کەلێ سوودو کەڵکی گرنگی وەرگرت ، وە محمد هەمیشە حەلیمەو خێزانەکەیانو کەسەکانیان جێگای ڕێزبوون بەلایەوە و سۆزو خۆشەویستی بۆدەرئەبڕین بەدرێژایی تەمەنی ، ساڵێکی گرانی و وشکە سال ڕوویدا لە دوای ئەوەی محمد بخاتو خەدیجەی خواستبوو ، حەلیمە هات بۆلایو ئەویش وشترێكو چل سەرمەڕی پێ بەخشی ، وە هەرگاه حەلیمە بهاتایە بۆلای عەباکەی سەرشانی بۆ دائەخست ( کە ئەمە نیشانەی ڕێزکرتن بوو لە ناو عەرەبەکانا ) ، وە لەکاتی جەنگی هەوازینا ـ لە دوای گرتنی شاری مەکە ـ شەیمای کچی حەلیمە لە ناو کومەلێکا بەدیل گیرا ، کە محمد ـ د . خ ـ پێیزانی و ناسیەوە زۆر ڕێزی لێکرت و پاشان بەپێی ئارەزووی ئافرەتەکە ئازادی کردو ناردیەوە بۆلای کەسەکانی .

## چوون بۆ مەدینە و مردنی ئامینە :

خاتو ئامیە ویستی لەبەروەفای بۆ مێردە ناوازەکەی و بۆ ئەوەی محمد ـ د . خ ـ کۆڕی باوکە چاوپێنەکەوتوەکەی ببینێ ، وەخاڵوانی باپیری بناسێو بیناسن ، وەئەو ولاتەبەڕێزە ببینێ کە خواهیشی پەروەردکار وایە لەپاشە ڕۆژا ببێتە بنکەی بانکەکەی و کاری گرنگیو هیوا و ئاوات و

ئامانجەکانی پێوەی بەندە ، بۆ ئەم مەبەسانە خاتو ئامینە ویستی محمد بباو بچن سەرێ لەشـــاری یەسروب ( یثرب ) ـ کە لەدوای کۆچ کردن بەمەدینە واتە شاری پێغەمبە ناوبانگی دەرکرد ـ بدەن ، وە بۆ ئەم سەفەرە محمدو ( أم أیمن ) لەگەڵ خۆیـابرد دەوری مانگێ لـەوێ لە میوانداری خاڵوانی ( عبدالمطلب ) دا لەتیرەی بەنی نەجاری خەزرەجی مانەوە ، لەو ماوەیەدا ســـەریان لـەگۆرە بەڕێزەکەی عەبدوڵا داو ئەڵبەتە بەدرێژایی باسی ئەوبـــاوکە بەڕێزەو ئەوماوە کورتە پڕ لە کامەرانی یەی بەیەکەوە تیاژیـان بۆ کردەوەو لەسەر کورزەشتەی ژیانی تێی گەیاندووە کە چۆن ئاووگڵ لەمەکە دووری خستۆتەوە و هێناویتی بۆ مەدینە ، ئیتر بێ ئەوەی ئاگایان لەوەبێ کە خاکی یەسروب ئەبێتە گۆڕخانە بۆ ئەمانیش و بۆ زۆری تر لەکەسە شیرینەکانیان و عەبدوڵا پێشەنگی قافڵەیەکی گەورەیەو پەنجەی قەدەر نەخشەیەکی سەرسوڕهێنەری کێشاوە . وە هەرلەم سـەفەرەدا محمد ـ د . خ ـ فێری مەلەوانی بوو لە بیری بەنی عەدی . پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە گەلێ جار بەدرێژی بـاسی ئەم سەفەرەی لەگەڵ دایکی بەڕێزی ئەکرد بۆ یارەکانی ، وەدەرئەکەوت کەدڵی وابەستەبووە بەو خاکەی لاشەپیرۆزەکەی باوکی و دایکی گرتۆتەبـاوەش و تیایانووستون .

لەدوای مانگێ دانیشتن لە یەسروبا ئامینە ویستی بگەڕێتەوە بۆمەکەو سواری وشترەکانیان بوون و دۆعاخوازیان کردو کەوتنەڕێ ڕووبەنیشتمان ، بەڵام خواهیشی خوای گەورە شێوەیەکی تری پیشان محمد دا و لاپەڕەیەکی تری بۆ هەڵ گێڕایەوە ، ئەویش ئەوەبۆو : نابێ محمد لەژێر سۆزونازی دایکێکی دڵسوزا بژی و لەپێ گەیشتن و لە ڕووداوەکانی ژیانا پاڵی پێوەبداو جێگای

ئارامی دڵی بێ ، وەئەبێ بۆدایکی ـ وەکو باوکی ـ دەوری هەتیوی ببینێ و تەنیا هەرپشت بەخۆی ببەستێ و هەربۆخۆی و بەخۆی چارەی گیروگرفتەکانی بکاو زیاتر بەهۆی چەشتنی ناسۆری جۆربەجۆرەوە پیاوەتی تیادروست ببێ و رام ببێ . لەڕێکا خاتوئامینە نەخۆش کەوت لەدێی ی ئەبواء (کەبیست و سێ میل لـەمەدینەوە دورە ) کۆچـی دوایی کردو هەرلەوێش نێژراو ئەسپەردەی خاك کرا . وەلەم کاتەدا محمد لە تەمەنی شەش ساڵیدابوو .

ئەم کارەســاتە بێ گومان ـ تینێکی گەورەی کردە سەردڵو دەروونی منداڵێکی شەش ساڵانەی وەکو محمد ، تادوێنێ بوو بەهۆی سۆزونازی دایکیەوە هەستی بەهەتیوی و بێ باوکی نەئەکرد ، ئەوەتە ئێستا بەدیارچاوی خۆیەوە دایکی شیرینو دڵسۆزیش مردو لەدەستی چووو لێی ی گوم بوو ، وە ئوم و ئەیمەن کەنیزەکە بەوەفاکەی باوکی هێنایەوە بۆ مەکە بۆلای باپیری .

( عبدالمطلب ) ئەمجار زیاتر لە جاران محمدی کردە باوەشیو کەوتە لاواندنی بۆئەوەی ئێشو ئازاری هەتیوی و بێ دایكو باوکی لەبیربەرێتەوە ، وە لە هەموو کوڕەکانی زیاتر ئەی لاواند و خۆشی ئە ویســت ودەسـتی بەسەرا ئەکرت و لـەگەڵ خۆیانەبوایە نـانی نەئەخواردو شەولەخەوتنـا دەستی ئەخستەباخەڵیو ئەمجار ئەنووست . لەسێبەری کەعبەداو لەشوێنێکی دیاری یا جێگـا بۆ عبدالمطلب دا ئەخراو کـەس نەئەچووە سەر ئەو جێگایە لەبەر ڕێزی عبدالمطلب و هەموو کوڕو نەوەکانی بەچواردەوریا ئەڵقەیان ئەداو دائەنیشتن ، کە محمد ئەهات ئەچوو لەســەر ئەوجێگـایەی دا ئەنیشت ، کوڕەکانی ئەیانویست هەڵی سێنن لەو جێگا تایبەتی یەدا ، ( عبدالمطلب ) یش ئەی وت : لێی گەڕێن ، بەخوا ئەم کـوڕەم شانو شەوکەت و پاشەڕۆژێکی گەورەی ئەبێ .

## مردنی عەبدولموتەلیب

ئەو خۆشەویستی‌و لاواندنەوەو نازەی عەبدولموتەلیب ئەی توانی ئەختێ باری دڵ‌و لاشەی محمد سووك بکاو ئەوئێش‌و ئازارانەی لەبـیر بەرێتەوە ، بەڵام خواهیشی خـوا وابوو کەلەدوای خاتوئامینـە تەنیـــا دوو ساڵ عەبدولموتەلیب بژی‌و لەتەمەنی هەشتا سـاڵیدا وەیا لەتەمەنی سەدو بیست ساڵیدا وەکوو هەندێ ئەڵێن کۆچی کرد وەئەوکاتە تەمەنی محمد لەهەشت ساڵە تێنەپەڕی بوو ، محمد ـ د.خ ـ بەمردنی باپـیری سەرلەنوێ برینی بەترۆ بەستەی دڵی کولایەوەو زۆر خەفەتبـــارو بێ ئارام بوو ، هەمیشە ئەگریاو کوڵی نەئەنیشتەوە ، وەبەگریانەوە شوێنی تەرمەکەی باپیری کەوت بۆگۆڕستان‌و جێگای دوایی لەناو دڵی خاکا ، لەپاشان هەرچەند ئەبوتالیبی مامی دڵسۆزی لەگەڵا بەکارئەهێناو دڵخۆشی ئەدایەوە و سەرپەرشتی ئەکرد بەڵام محمد هەرباپیری لەبیرنەئەچووەوەو هەمیشە باسی ئەکردو ناوی بەسەر زمانیەوە بوو .

لەلایەکی تریشەوە مردنی باپیری تیفی زۆری کردە سەر بەرەی هاشم چونکە لەناو کوڕەکانیا کەسی وایان نەبوو کەبتوانێ لەهەموو ڕوویەکەوە جێگاکەی بگرێتەوە ، کەم دەسەکانیان ئیشی وەکوو باوکیان پێ نەئەکرا لەبەر بێ‌ماڵی‌و دەوڵەمەندەکانیشیان دەستیان بەسەر ماڵەکەیانا گرتبوو بەشی کەسیان لێ نەئەدا ، بۆیە ( بەنی‌ئومەییەکان) ئەیان ویست ئەوپلەو پایەیەیان لێ وەربگرن .

## ئەبوتالیب سەرپەرشتی محمد ئەکا

عەبدولموتەلیب لەپێش مردنیا سەرپەرشتی کـردنی‌محمدی دایە دەسـی ئەبوتالیبی کوڕی چونکە برای باوك‌و دایکی عەبدوڵابوو ، ئەبوتالیب‌ـلەگەڵ

کەم دەسیدا ـ پیاوێکی دڵ گوشادو ژیرو خاوەنی ڕای جوان و بەڕێزو باوەڕ پێکراوبوو لەناوهۆزی قورەیشا ، ئەبوتالیب کەوتـە لەلەیی و سەر پەرشتی کردنی محمدی برازای ، زۆر خۆشی ئەویستو سۆزی لەگەڵا دەر ئەبڕیو لەهەموو منداڵەکانی خۆی لەبەرتربوو بەلایەوە ، وەنەجابەتیوزیرەکی وئەمینیو دەسو دەمو دڵپاکێکی فراوانی تیا بەدی ئەکـرد ، بۆیـە هەتا پێی ئەچوو زیاتر لەبەرچاوی شیرین ئەبوو زۆرتر دڵی پێوەی ئەبەسترا . وەبەڕادەیەك چووبوو بەدڵیا نەی‌ئەتوانی تاوێ بەبێ محمد بژی ، وەمحمدیش ـ د . خ ـ زۆر هۆگری مامی بووبوو جیـــابوونەوە لێی زۆر بەلایـەوە سەخت بوو .

## یەکەم ڕۆیینی بۆشام

ئەبوتالیب لەجێگەی باوکیـــا کرابووبەزیوانی کەعبە ، وە خۆیشی خاوەنی خێزانێکی گەورەبوو ، وەلەگەڵ ئەمانەدا کەم دەستو هەژاربوو ، بەم بۆنەیەوە کاتێ تەمەنی محمد ـ د . خ ـ گەیبووە دوانزە ساڵی ئەبوتالیب ویـتی لەگەڵ کاروانا بڕوا بۆشام بەڵام لەترسی گەرماو ماندوویەتیو تۆزو خۆڵی ڕێگاو ناخۆشی بیابان بەتەما نەبوو محمدێکی منداڵو ناسـك تووشی ئەوئازارەبکاو لەگەڵ خۆیا بی‌بات ، بەڵام لەولایشەوە محمد لەبەرئەوەی نەی ئەتوانی بەبێ نازی مامـی ئەومـاوەیە بژی ولێی جیـا ببێتەوە دەستی پێچا بەجلەکانی مامیاو دەستی کرد بەگریان ، وەکوو لێزمەی بارانی بەهار ئاو بەچاویا ئەهاتە خوارەوە ، ئەم دیمەنەی محمد تینی کردە سەر ئەبوتالیب و هەموو نارەحەتی ڕێگای لەبیر بردەوەو دڵی پێی سووتاو بڕیاریدا لەگەڵ خۆیا بی‌باو وتی : بەخوا ئەت بەم وهیچ کاتێ نایەڵم لێم جیا ببێتەوە ، محمد بەمە دڵی خۆش‌بوو گەش بۆوەو لەپشتی مامیەوە سواری وشترەکەی

بوو کاروان ڕووبەشام کەوتە ڕێ .

## بوحەیرای راهیب

کاروانی قورەیش کەوتە بڕینی بیابانو دەشتو یالو دۆڵەکان ، لەدوای مانگێ گەیشتنە شاری ( بصری ) «١» وەلەنزیکی ئەم شارۆلکـەیەوە لە شاخی حۆراندا ئەشکەوتێ هەبوو ، کەبحیرای راهیب بۆخواپەرستی گۆشە گیری تیا کردبوو ، ڕۆژێ لەدەرگای ئەشکەوتەکەدا سەرنجی نیودوورگەی عەرەبی ئەدا شتێکی ناوازەی بینی : پارچە هەورێکــــی درێژ کۆلە ـ بە پێچەوانەی باوی خۆی ـ بەئاسمانا ئەکشا ، دوای لێوورد بوونەوەی زۆر بۆی دەرکەوت وا بەسەر سەری کاروانێکەوە ، کاروان هاتو لەژێردارێکا دابەزینو لەوێدا هەورەکە ڕەوی‌یەوە بەڵام دارەکە لقەکانی هاتنە یەك و سێبەرێکی پڕیان بەسەر سەری یەکێ لەوکاروانی‌یانەوە دروست کرد .

بوحەیرا بەپێی شارەزایی خۆی لە ( انجیل ) دا بۆی دەرکەوت کە یەکێ لەم کاروانی‌یانە ئەوپێغەمبەرە دوایی‌نەیە کەعیسی مژدەی هاتنی داوەو ئەمیش چاوەڕێی ئەکرد . خواردنی باشی بۆئامادە کـردنو ناردی بۆ لایان کەهەموویان میوانن‌و نابێ کەسیان بەجێ بهێڵن .

کاتێ کەهاتن پێشوازی‌یـەکی گەرمی لێ کردن ، یەکـێکیان ووتی : بوحەیرا ! چەند جار بەلاتا هاتین‌و تێپەڕبووین‌و میوان داریت نەکروین بە « لات » و « عزی » قەسم ئەبێ شتێکت بەدەستەوە بێت ؟ ئەویش وتی ئەمە نیازێکی دەروونی خۆمە و ئەمەوێ بۆیەکەم جار ڕێزتان لێ بکرم و میوانداری‌یەکتان بکەم .

---

(١) شارێك بووە لەخوارووی شامەوە ، ئێستا پێی ئەڵێن ( حۆران ) . جێکایەکی بازرگانێتی بوو ، موسلمانەکان لەساڵی ٦٣٢ ز کرتیان .

بانگ‌کراوەکان کەوتنە نان خواردن ، بوحەیرایش کەوتە سەرنج‌دانیان کەئەوەهەڵبژێرراوە بناسێتەوە ، بەڵام هەرچی کرد هیچی دەس نەکەوت‌و لێی پرسین : کەستان لێ‌بەجێ نەماوە ؟ وتیان بەڵێ تەنیا کوڕێك ماوەتەوە لەبەرمناڵی نەمان هێناوە وتی: شتی‌وانابێ بڕۆن بانگی‌بکەن بابێ ئەویش نان بخوات ، یەکێ لە قورەیشەکان وتی : بەلات و عوززا زۆر شورەیی‌و ناشیرینە بۆ ئێمە کە هەموو هاتین و بەتەنیا کوڕی عەبدوڵای ( عبدالمطلب ) مان بەدەم وشکی بەجێ‌هێشت . ئەمەی وت‌و ڕۆیی محمدی هێناو لەناو پیاوەکانا داینا .

بوحەیرا هەر کوڕەی‌دی کەوتە سەرنج‌دان‌و لێوردبوونەوەی ، وە بۆی دەرکەوت کوت‌ومت ئەمە ئەو پێغەمەرەیە ئینجیلەکەی عیسا ناوو نیشانی هەڵداوە ، کاتێ مەردمەکان لەنان خواردن بوونەوە بوحەیرا هەڵێکی دۆزی‌یەوەو چووەلای محمدو وتی : سوێندت ئەدەم بەلات‌وعوززا هەرچیت لێ‌ئەپرسم بەڕاستی وەڵامم بدەرەوە - بوحەیرا باوەڕی بەلات‌و عوززانەبوو بەدرۆی ئەزانین بەڵام گوێی لێ‌بوو قورەیشەکان سوێندیان پێ‌ئەخواردن ویستی ئەمە یەکەم تاقی‌کردنەوەی‌بێ بۆ محمد . محمد - درودی لەسەربێ وتی :تۆ بەلات‌وعوززا سوێندم ئەدەی من هیچ نیە ئەوەندەی ئەوانە ڕقم‌بێ لێی ، وتی : دەی بەخوا سوێندت ئەدەم . فەرمووی : باشە ، چی‌ئەڵێی‌ی بڵێ . ئەمجار بوحەیرا کەوتە پرسیار لێ‌کردنی لەوانەی کە لە دڵیابوو : وەکو خێزان و پلەو پایەو خەوبینین‌و گەلێ شتی‌ترەوە ، هەموو وەڵامەکانی پڕبەپڕی ناونیشانەکانی لای بوحەیرا بوون ، لەپاشا هەڵساو سەیری ناوەندی هەردوو شانی‌کردو مۆری پێغەمبەرێتی تیابەدی‌کرد ، وەکولە پەڕاوی پیرۆزا باس کرابوو ، ئیتر گومانی نەما کەئەم کوڕە ئەوپێغەمبەرە

بەڕێزەیە کە پەڕاوە ئاسمانی یەکان مژدەیان پێ داوە لەگەڵ ئەوەیشا ڕووی کردە ئەبو تالیب و وتی : ئەم کـوڕە چیتە وتی : کـوڕمە . وتی : نەء کوڕی تۆنیە. وتی : ڕاست ئەکەی برازامە ، وتی : ئەی باوکی چی بەسەرهات؟ وتی : مرد لەکاتێکا ئەم کوڕە لەسکی دایکیابوو . وتی : ڕاست ئەکەی، گوێم بۆبگرە لە بابەتی ئەم کوڕەو چیت پێ ئەڵێم : ئەم کوڕە ببەرەوە بۆ شوێنی خۆی ، جوولەکەکان دوژمنی ئەم کوڕەن ئەگەر بیناسنەوە هەوڵی کوشتن و لەناوبردنی ئەدەن ، ئەم کوڕە پلەوپایەیەکی گەورەو پاشەڕۆژێکی ڕۆشنی ئەبێ و ئاگات لێی بێ .

ئەم ئامۆژگاری یانە تینی زۆریان کردە سەر ئەبوتالیب ، لەبەرئەوە زیاتر ئاگاداری محمدی ئەکرد ، وەهەرکەلە کاروباریان لێ بوونەوە بەخێرایی گەڕانەوەو زیاتر لەجاران چاودێری ئەکرد و دەستی لێ بەرنەئەدا .

ئەم ڕووداو و سەرگوزەشتەیە ( سیرة ) نووسەکان بەبێ خۆگرتن دانیان پیاناوە ، وە ( ترمذی ) یش ڕیوایەتی کردوە و ئەڵێ : فـەرموودەیەکی شیرینە ( حدیث حسن ) .

وە ( ناصرالدین ألبانی ) لە پەڕاوی ( فقه الســـیرە ) دا ئەڵێ : « إسنادی ئەم فەرموودەیە صحیحە ـ وەکـوجەزەری وتوویە ـ وەبەزاریش ڕیوایەتی کردوە » . وەئەوانەی بڕوایان پێ نیە تەنیا هەر ئەیانەوێ ددان بەموعجیزەدا نەنێن و بەس ، ئیتر بەڵگەیەکیان بەدەستەوەنیەو هەرچێو لەتاریکی ئەکوتن .

بەڵام ئەوەندە هەیە هیچ جۆرەتین و تەئسیرێکی نەبوو لەژیان و لەبانگەکەی محمدا وەکو هیچ نەبووبێ و هەرڕووی نەدابێ . چونکە نە محمد بەتەمـای پێغەمبەرێتی بووە تابیری لێ کردبێتەوە و لەدڵیابووبێ ، وە نەئەبوتالیب لە

لەدوای ئەم کاروانە شتێ هاتووە بەدڵیاو باسی کردوە ، وە نەکاروانی‌یەکایش باسیان کردوە یابیریان لێ‌کردۆتەوە یاهاتووە بەدڵیانا ، وەبەڕەنگێ پێچراوەتەوە لەگۆشەی مێژوودا وەکو هەرڕوی نەدابێ وابووە .

## محمدو شوانی :

لەوجارە بەولاوە کەس باسی ئەوەی نەکردوە ئەبوتالیب کاروانی شام یالایەکی‌تری کردبێ ، وادیارە بەوئەندازە دارایی‌یەکەمەی قەناعەتی کردبێ و منالە زۆرەکانی پێ‌بەخێوکردبێ ، وە محمد وەکو مامو ئامۆزاکانی هاوبەشی ئەکرد لە ئیش‌وکارو ڕەنج کێشانا . خۆتەمەڵی‌و بێ‌کاری پیشەی پیاوی بەڕێزوئازانیە ، وەپیاوی پیاوانە ئەوەیە دەس‌بداتە ئیشێکی ئەوتۆ کەخۆی‌و خێزانێکی پێ‌بەخێوبکات مرۆڤی تەمەڵ و بێ‌ئیش ئەبێتەبار بەسەر کۆمەڵەوە و پلەی کۆمەڵایەتی‌ی نزم ئەبێتەوە و بەخوارو ڕیسوا سەیرئەکرێ پێغەمبەرە پێشینەکان هەموویان خەریکی کاروفرمان بوون و ئەیان‌بوە بەسەر خەڵکەوە ژیابێ و هەریەکەی جۆرە ئیشێکیان بووە ، وە یەکێ لەو ئیشانەی پێغەمبەری ئێمە محمد و هەموو پێغەمبەرەکانی تریش - درودی خوا لەسەر هەموویان‌بێ - پێی‌ی هەڵساون شوانی‌و بەخێوکردن‌و سەرپەرشتی کردنی مەڕو ماڵات بووە .

ئەبو هورەیرە ئەڵێ : پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - فەرمووی : « هیچ پێغەمبەرێك نەبووە شوانی نەکردبێ و مەڕی نەلەوەڕاندبێ . یارەکانی وتیان : تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : بەڵێ منیش مەڕم ئەلەوەڕان بۆ مەکەیی‌یەکان بەمووچەیەکی دیاری » (١) بێ‌گومان سەرپەرشتی کردنی مەڕو ئاگاداری‌یان جۆرەڕام هێنانێکە بۆ مرۆڤ و فێربوونیەتی

---

(١) بوخاری ڕیوایەتی کردوە .

بەخۆڕاگرتن لەسەر نەگریسی و لارە جلەوی نەفامەکان .

## بازاڕەکانی دەوری مەکە :

هەموو جارێ محمد - د . خ - بەپێی یاسای وڵات لەگەڵ مام و کەسەکانیا ئەچوو بۆ بازاڕو خۆپیشاندانەکانی دەوروبەری مەکە ، وەکو بازاڕی ( عکاظوذی المجازو مجنە ) و گوێی ئەگرت لەوتارو هەڵبەستەکان و سەرنجی ڕەوان بێژەیی ئەدا لە هەڵبەست و دواندن و وتارو شانازی کردنیانا و لە هەڵدانیانا بەباووباپیرو نەژادو جەنگ و هەراو جوامێری و بەسەرهاتەکانیانا ، بەهەندێکیان دڵشادو هەندێ تریان دڵگران ئەبوو ، لەلایەکی ترەوە ئەیبینی خاوەن ئاینەکان هەرکەسە ئاینەکەی خۆی پیشان ئەداو چاوو ڕاوی بۆئەکاو باسی باشیو بەکەڵکی ئەکات .

محمد - د . خ - لێرەوە دەستی کردە بیر کردنەوەو سەرنجدان و وردبوونەوە ، وەکەوتە بەراورد کردن لە نێوان ئاینەکانی ئەو ناوچەیەدا و بیرو ڕاکانیان . وەهەر لەو کاتەوە بەردی بیچینەی داناو دەستێکی نهێنی کەوتە پاڵفتەکردن و زڕاننەوە و ڕازاننەوەی دڵو دەرونی ، هەتاتەواو پێگەیی ئەمجار خوا نیگای بۆ ناردو پەیامی پێغەمبەرێتی پێسپارد .

## پێغەمبەرێتی بەهرەیەکی خواییە :

هەرچەندە پێغەمبەرێتی کارێك نیە بە خەریك بوون و هەوڵدان و تێکۆشان دەستبکەوێ ، بەڵکو بەهەڵبژاردن و خواهیشی تایبەتی خوای پەروەردگارە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا پێویستی بەئامادەبوون و پێگەیاندنو ڕێکی و پێکی بەکی ئەوتۆ هەیە کەبەتەنیا هەرلەپێغەمبەرەکانا دەس ئەکەوێ ، پێغەمبەرەکان - بەتایبەتی محمد - هەرچەند نەچوبنە قوتابخانەو بەشێوەی ئێمە نەیانخوێندبێ ، بەڵام تیژی بیریانو ڕاستی سەرنجیان و سوود و

پەند وەرگرتنیان لە دەوروبەریان ، ئەمانەو وێنەیـان لەگەڵ دەستی نهێنی پەروەردکار کردونی بەماموٚستای زانایان ، بابەشێوەی ئێمەیش خوێندنەوە و نووسینیان نەبووبێ ، زانیاری‌چی‌یە و چ سوودێکی هەیەو ئەگەر دڵ و دەرون پاك نەکاتەوە و بەرزی نەکاتەوە ؟ ! !

ئایالەبەرکردنی زاراوەی زانیاری‌یەکان چ سوودێکی هەیە ئەگەر لـە کردەوەو بیرو ژیریدا نەدرەوشێتەوە ؟ خوٚزوٚر منالی‌نەفـام هەیە هەرچی ببیستێ ئەتوانێ وەکو خوٚی بیگێڕێتەوە یا ( توتی ) ئەتوانێ بیستراوەکانی دووبارە بکاتەوە ، وەشریتی توٚمارو تەلەفیزیوٚن و سینەمـاچی‌یان تیـایەکە وەکوخوٚی دەری‌نە ، خەنەوە بەلاٚم نەمنالی‌بەو گێڕاننەوە ئەبێ بەپیـاوو نەتوتی و شریتەکانیش بەو دووبـارەکردنەوە ئەبن بەمروٚڤ یـابەزانا ، وەنەزانایان بەزانایی‌یەکەیان بەتەنیا نرخ و پایەیان ئەبێ .

زوٚر کەس ئەبینین کەئەیان دوێنێ لەهەر ڕوویەکی زانیاری‌یا ، یا کە لەناو کوٚمەڵێکا دائەنیشن هەژدە هەژدە قسە ئەکەن‌و لەبابەتەکانی زانیاری‌دا مەلە ئەکەن‌و ئاگاداری‌و شارەزایی زوٚریان هەیە ، کەچـی ئەو زانیاری و کوٚیابی‌و شارەزایی‌یە بەهیچ کلوٚجێ سوودی پێ‌نەگەیاندوەو ڕەووشتی‌جوانی نەکردووەو پالی پێوە نەناوە بوٚکردنی چاکەو بوٚگەڕانەوە لەخراپە ، ئەڵێی ئەوزانیاری‌یەی کوٚلی سەرسەلوێنك وەیا ئاوی ناو بەردوو زاخرەو هیچـی بەخوٚیەوە نەلکاوە .

بەلاٚم پێغەمبەر - بەپێچەوانەی ئەوانەوە - کـێێ‌و کەردوون پەڕاوی کراوەیی‌و ماموٚستای تایبەتی بوو ، بەسروشتێکی خاوێن‌و بەمێشك‌ودڵێکی تێك نەچوو بەژیری‌یەکی سەرلێ نەشێواوەوە سەیری هەموو پارچەوبەشەکانی ئەکردو ئەی ڕوانی‌یە هەموو ڕووداوێکی بەووردو درشتی‌یەوەو لەهەریەکەیان

دەرسێکی وەرئەگرت : لەبیابانْدا ، لەشوانی‌یا ، لەکاروانا ، لەبازاڕەکانا
لەبیابانی نیودورگەی عەرەبا ، لەئاوو هەوایا ، لەشاخو چیاو چەمو دۆڵو
یاڵو لمو بەردو خاکو خۆڵداو ... هتد لەئاسمانو ئەستێرەو مانگو ڕۆژو
هەورو بارانو سایەقەو هەتاوو .. هتد لەهەر یەکە بیرێـکی ئەکـردەوەو
پەندێکی وەرئەگرتو بەشێوەیەکی نوێ میشکو دڵو دەروونی ئەکرایەوە .

## پـاراستنی خوا بۆ محمد

شتێکی ئاشکرایە یەکێ خوا هەڵی بژێرێ بۆکارێـــکی گرنگی وەک
پێغەمبەرێتی ئەبێ مرۆیەکی پاکو خاوێنو ڕێکو ڕەوان بێو دووربێ لـە
هەموو خراپەیەکی دەروونی‌و لاشەیی‌و ڕازاوەبێ بە هەمـوو ڕەوشتو خوە
جوانەکان ، ئەبێ دەستـێکی نهێنی لەگەڵیـابێو بی‌پارێزێ وئاگـاداری
پەروەرشی بکا لەدرێژایی تەمەنیا .

بەئاشکرا ئەمە بەدی ئەکەیـن لە ژیانی محمدا ـ درودی لەسەربێ ـ
لەمناڵی‌یەوە تاگەورەیی‌و لەهەموو سوێنو کاتێـکا وەکو خۆی ئەی‌فەرموو :
« پەروەردگارم لەلەیی کردمو بەشیرینی وێلی دادام » .

( ابن هشام ) ئەگێڕێتەوە : پێغەمبەری خوا فەرموویە : « بـیرم دێ
لەگەڵ مناڵانا بەردمان ئەکێشا بۆیاری کردن ، مناڵان جلەکانیان داکەندو
خستیانە سەرملیان تا بەردەکان ئازاریان نەدەن ، منیش جلـەکانی خۆمم
داکەندو خستمە سەر ملم ـ وەکو ئەوان ـ کوتوپڕ بێ‌ئەوەی کەس ببینم
یەکێ شەقازلەیەکی لێدامو وتی : جلەکانت لەبەربکەرەوە منیش بەخێرایی
لەبەرم کردنەوەو هەربەتەنیا من بەپۆشتەیی بەردم ئەکێشا » .

( ابن اسحاق ) ئەڵێ : لەکاتی دروست کردنەوەی کەعبەدا پێغەمبەر
( د . خ ) لەگەڵ خزمەکانیا بەردی بۆئەکێشا ، ئەوان هەموو جلەکانیـان

دا کەندبوو خستبوونیانە سەرشانو ملیان تا بەرد نەیان ڕوشێنێ ، تەنیا پێغەمبەر جلەکاتی لەبەرابوو ، عەباسی مامی پێی ووت : برازای خۆم تۆش جلەکانت بخەرە سەر شانت با بەرد ئازارت نەدات . ئەویش بەقسەی مامی جلەکانی دائەکەنێ ، کەچی دەس بەجێ بێهۆش ئەکەوێ و هاوار ئەکا : جلەکانم ، جلەکانم . کەجلەکانی ئەکەنەوە بەر هەڵ ئەسێو دەست ئەکاتەوە بەئیش کردن . کەعەباس لێی ئەپرسێ لەوەڵاما ئەڵێ : لە حەواوە بانگیان کردم : بەجلەکانت خۆت داپۆشە .

( ابن الأثیر ) ئەڵێ : پێغەمبەری خوا فەرموویە : « هیچ کاتێ ئەم ویستووە ئەوکردەوانە بکەم کەلەدەوری ئەفامیتیدا باوبوون تەنیا دووجار نەبێ ، ئەودووجارەیش خوای گەورە نەیهێشتو پاراستمی ، ئیتر حەزم لێنەکردوونو نەمکردوون هەتا خوا خەڵاتی پێغەمبەرێتی بۆناردم .

شەوێکیان لەسەراووردی مەکەوە لەگەڵ کوڕێکا مەڕمان ئەلەوەڕان ووتم بەوکوڕەی هاوشوانم : ئەگەرتۆ چاوەدێری مەڕەکانی منیش بکەیت من ئەچم بۆناوشارو لەگەڵ ئەو کوڕو کاڵانەدا نەختێ یاری ئەکەم ، وتی باشە بڕۆ . ڕۆییشتم ناگەییشتە قەراخی ماڵەکان لەوێ گوێم لەدەنگی دەهۆڵو شمشاڵو نایو هەرایەك بوو لەماڵێکەوە ، پرسیم : ئەمەچییە ؟ ووتیان : شاییە . منیش دانیشتم تا گوێی لێ بگرم ، کەچی خوا نەیهێشت بی بیستمو خێرا خەوم لێکەوتو گەرمای هەتاوی بەیانی بێداری کردمەوە ، ئنجا لیمداو چوومەوە لایهاوەڵەکەمو بۆم گێرایەوە . وەجارێکی تریش هەربەوپێیەم کردو بەوجۆرەم بەسەرهات . وەلەدوای ئەوانە ئیتر نزیکی ئەوشتانە نەکەوتوومەوە » .

( أم أیمن ) کچی ( عبدالمطلب ) ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ : بتێکمان هەبوو

ناوی ( بـد ) بوو ، هەموو ساڵێ ئەبوتالیب هەموو خزمو کەسەکانی خۆی ئەبرد بۆلای و قوربانی یان بۆئەکردو مەڕو ماڵاتیان بۆ سـەرئەبڕین ، بەڵام محمد ـ د.خ ـ هاوبەشی تیا نەئەکردو نەئەهاتو لەهیچ بتێکیان نزیـك نەئەبووەوە ، تا جارێکیان ئەبوتالیبی مامی و هەموو پوورەکانی لێی تووڕە بوون و وتیان : تێناگەین تۆ بۆچی نایەیت بۆلای بتەکانمان ؟ وهاوبەشـی کۆمەڵمان ناکەیت ؟ .

ئێمە زۆر ئەترسین لەم کەمتەرخەمی یەی تۆ بەرامبەری خـواکانمان . وازیان لێنەهێنام لەگەڵ خۆیانا بردمیـان ، کەچونە ئەوێ نەختێ لە کەسەکانی دوورکەوتەوەو کوتوپڕ بەشپرزەیی گەڕایەوە ، وتیان : ئەوە چیتە وبۆ وات لێهات ؟ ووتی :ئەترسم تووشی مەترسی یەك بێم لەلایەن شەیتان و جنۆکەکانەوە . ووتیـان : نەأ ، تۆ بەوڕەووشتو خـووە جوانەوە تووشـی هیچ خراپەیەك نایەیت . ووتی : بەخوا هەرکەلەبتەکە نزیـك کەوتمەوە پیاوێکی سەرتاپا سپی درێژ بانگی کردم بۆدواوەو وتی : محمد نزیکی ئەو بتە نەبیتەوە وەدوای ئەم جارە بەهیچ جۆرێ تێکڵاوی جەژنی نەکردن و لەبتەکانەوە نزیك نەبۆتەوە .

خۆلەپێشەوە وتمان کەبەبوحەیرای ڕاهیبی ووت : من زۆر ڕقم لەلات و عوززایە .

بەم پێیە دەستو دەسەڵاتی نهێنی خاوێنی خوای پەروەردگار محمدی پاراست لەهەموو خراپەیەك و پەروەرش و پەروەردەی کـردوو پێی گەیان بەشیرینترین شێوە وجوانترین نیکارەوە ، هەتا ئامادەبوو بۆوەرگرتنی پەیامی پێغەمبەرێتی .

* * *

# جەنگی فیجـار

جەنگی ( فیجار ) واتە جەنگی خەراپەو نارەوایی ، وەئەم ناوەی لێ نراوە چونکە لەمانگە یاساخو ڕێزلێ‌گیراوەکانا (الاشهر الحرم) ڕووی داوە وە بەپێی باوویاسـای عەرەبەکان هەر لـە کۆنەوە لەو مانگانەدا جەنگ و هەراکردن یاساخ بووە ، بەڕادەیەك پیاو لەو مانگانەدا دوژمنی خوێنە خۆی و براکوژی خۆی بدیایە دەنگی لەگەڵا نەئەکرد ، وەلەو مانگانەدا بازاڕیان ئەڕازانەوە لە : ( عکاظە ) کە لە ناوەندی تائیف و نەخلەدابوو وەلە ( مجنە و ذی المجاز ) کە لە نزیکی عەرەفاتەوە بوون . بـــازاڕی عوکازە گەورەترین بازاڕیـــان بوو ، لەوێدا بوێژە بەناوبانگەکان حەوت پارچە هۆنراوە هەڵواسراوەکان ( المعلقات السبع ) یان وتووە ، وەلەوێدا وتارو دواندن ئەوترا‌و بیروڕادەرئەبرا و چاووڕاو بۆ ئایین و بیروباوەڕەکان بەسەربەستی ئەکرا ، وە شانازی بەنەژادو تیرەوگەل ئەکراو بەبێ‌ترس هەرکەس چی لە دڵابوایە دەری ئەبڕی .

وەلەگەڵ ئەم یاسایەدا و لەگەڵ ئەو یاساخی و ڕێزەدا هەرلەم مانگانەدا چواوجار جەنگ ڕووی داوە ، وە پێیان وتراوە جەنگی فیجار و خراپکاری .

وە محمد ـ د . خ ـ لە جەنگی چوارەمدا هاوبەشی کردووە .

## جەنگی فیجاری یەکەم :

لەنێوانی ( کینانەو هەوازین ) دا بووە ، وە لەم کاتەدا تەمەنی محمد دە ساڵان بوو . هۆی ئەم جەنگە : بەدری کوڕی مەعشەری غیفـاری لە بازاڕی عوکازەدا شوێنێکی دیاری بوە تیا دانیشتوە و شانازی تیـاکردوە بەسەر ئەمو ئەوا ، ڕۆژێ قاچی ڕائەکێشێ‌وئەڵێ : من گەورەترین پیاوی عەرەبم ، هەرکەس خۆی لەمن بە پیاوتر دائەنێ شمشێرێ‌بدا لەقـاچم ،

پیاوێ لەولاوەهات و هەڵمەتی دایە و شمشێرێکی دالەقــاچیو قرتانی ( یابرینداری کرد ) وە لەســەر ئەمە جەنگ بەرپابوو لە نێوانی دوو تیرەکەیانا .

**جەنگی فیجاری دووەم :** لە نێوانی قورەیش‌و کینانەدابوو ، هۆی ئەم جەنگە ژنێك لـەتیرەی بەنی عـامیری‌یەکان لە بازاڕی عوکازەدا دائەنیشێ و گەنجێکی کینانەیی‌یەکان دەورەی ئەداو داوای لێ ئەکا خۆی پیشان بدات ، ژنەیش گـوێی نـاداتێ ، کوڕەکە بەدزیەوە لـە دوایەوە دائەنیشێ و داوێنەکەی ئەبەستێتەوە بە دڕکێکەوە ، کە ژنەکە هەڵ ئەسێ هەموو لاشەی لەدواوە دەرئەکەوێ و دانیشتوان بەجارێ دەست ئەکەن بەپێ کەنین ، ژنە بەمە زۆر ناڕەحەت ئەبێ و هاوارئەکا لەبەنی عامیری ، کوڕەیش بەمە ئەزانێ هاوارئەکا لەبەنی کینانەو جەنگ بەرپا ئەبێ .

**جەنگی سێیەم :** لە نێوانی کیانەو بەنی نەزری کوڕی موعاویەدابووە ، هۆی ئەم جەنگەیش : پیاوێکی بەنی نەزر ( بنی نضر )ی قەرزی بەلای پیاوێکی کینانەیی‌یەوەئەبێ‌و تەفرەی ئەداو نایداتەوە ، لەسەر ئەمە ئەودووپیاوەتێك ئەچن‌و لەوەوە جەنگ‌لەنێوانی دووتیرەکەیانا بەرپائەبێ وە ئەڵێن : جەنگەکە درێژەناکێشێ و عەبدوڵای کوڕی جودعان قەرزەکە ئەخاتە پێی خۆی‌و بەوە جەنگە کە کۆتایی پێ‌یەت .

**جەنگی فیجاری چوارەم :** ئـەوجەنگەیە پێغەمبەری خوا محمد ـ درودی لەسەربێ ـ هاوبەشي تیاکردوە ، ئەم جەنگە لـە نێوانی قورەیش‌و کینانە لەگەڵ هەوازینا ڕووی داوە . وەلەم کاتەدا محمد لەتەمەنی پانزەساڵیدا بووە ، وەلەسەر ئەوە پەیـابوو کە ( براضی کوڕی قەیسی ) کینانەیی (عروة الرحال) ی کوڕی عتبەی هەوازینی ) کوشت .

هۆی ئەمەیش : ( نعمانی کوڕی منذر ) ی پاشای حیرە هەمووساڵێ
لـە حیرەوە کاروانێکی بەباری میسك‌و شتی بۆنخۆشەوە ئەنارد بۆ بـازاڕی
عوکازە ، وە لەوێ ئەیاندا بەکەل‌و پەل‌و پێویستی ، وەئەوکاروانەی لـە
پەنای پیاوێکی بەدەسەڵاتی عەرەبـا ئەنـارد تالەدزو جەردە بیپارێزێ ،
ئەوساڵە ( براضی کوڕی قەیس ) خۆی دانا بۆ پاریزکاری کاروانەکە ،
وە (عروة الرحال)ی هەوازینیش هەرخۆی بۆ ئەوکارە هەڵبژارد ، وەنوعمان
کاروانەکەی‌دا بەدەس عورەوە وە بەڕرازیش ئەمەی کـرت بەدڵەوە ، لە
لەڕێکادا پێش ئەوەی بگاتە بازاڕ هەڵیکی دۆزی‌یەوەو بەدزی‌یەوەعورەوەی کوشت،
هەوازین کە ئەمەیان زانی هەڵسان لە کینانەیی ، وەقورەیشەکان دایـانە
پاڵ کینایی‌و جەنگ گەرم‌بوو ، ئەم جەنگە چوار ســـاڵی‌خایان ، وەلە
سەرەتای ئەم جەنگەدا تەمەنی محمد پانزە ساڵان بوو ، کە جەنگ کۆتایی
پێ‌هات تەمەنی نزیك بووبووەوە لە بیست ساڵە محمد ـ د . خ ـ هاوبەشی
کرد لەم جەنگەدا هەندێ ئەڵێن : تیری کۆئەکـردەوە بۆ مامەکانی . وە
هەندێ‌تر ئەڵێن : تیری ئەهاویشت . ڕەنگە هەردووکیانی کردبێ .

ئەم جەنگە بۆ ماوەی چوارساڵ درێژەی کێشا ، لەسەرەتاوە هەوازین
زاڵ‌بوون و ئەمانیان شکان ، بەڵام لەپاشا ئەمان زاڵ‌بوون بەسەر هەوازینا
و کوشتارێکی بێ‌شماریان لێ کردن . هەتا عوتبەی کـوڕی ڕەبیعە ـ کە
گەنجێ‌بو هێشتا تەمەنی لەسی‌ساڵ تێنەپەڕیبوو ـ سواری وشترێ بوو هاتە
ناوەڕاستی هەردوو کۆمەڵەکەوە و بانگی کرد : ئەی نەوەکانی ( مضر )
لە سەرچی خۆتان لەناو ئەبەن ؟ هەوازینی وتیان مەبەستت‌چی‌یە ؟ وتی :
ڕێ‌کەوتن ، وەلێرەدا لەسەر باسای ڕێ‌کەوتنی تیرە پەرستێ پێك‌هاتن :
بەم ڕەنگە ژمارەی کوژراوی هەردولایان‌بکەن و هەرکامیان کوژراویـان

زیاتربێ ئەولایان خوێنی زیادەکان بدەن . وەلە ئەنجامـا قورەیش خوێنی بیست پیاویان دا بەهەوازین و بەڕرازیش بوو بە نموونەی خراپە .

## پەیمان ( حلف ) ی فضول

ژیان هەرچەند لاپەڕەکانی ڕەش‌و تاریك بن ، وەئەفامینـق هەرچەندە وەکو تاریکە شەوی کاتی کیا ڕەشی بەهاربێ‌و پەل‌و پۆ بهاوێژێ بۆئاسمانەی دلی مرۆڤ ، وەخراپە هەرچەندە بەرزبێتەوەو بلاوە بکا بەناو کۆمەلدا ، لەگەل ئەمانەدا مانای خێرو چاکە لەناو دل‌و دەروونی مرۆڤەکانا هەرسەر بەرز ئەکاتەوەو ڕای ئەوەشێنێ‌و شۆڕشی تیـــا بەرپا ئەکاو بەرەو چاکەو جوامێری ئەی‌باو ڕای ئەکێشێ . ئەمە لەلایەکەوە .

وەلەلایەکی ترەوە قورەیشەکان هەستیان بەوە کرد کەئەوڕوداوە نالەبا رانەی دوای مردنی هاشم‌و (عبدالمطلب ) هاتن بەسەریانا تەنیـا بەهۆی پەرت‌و بلاویان‌و بەهۆی چاوبڕینی هەموو لایەکیـان بوو لەسەرۆکایـەتی ، لەسەر ئەم بناغەیە بۆو عەرەبەکان تەماعیان تێ کـردن‌و دەست‌درێژی‌یـان ئەسەریان‌و خراپکاری‌یان کرد لەمەکەدا .

لەبەرئەمانە بڕیاریان‌دا : کەلەناوخۆیانا کۆبوونەوەیەکی گشتی بکەن ، وەلەئەنجاما پەیمانیان بەست لەسەرئەوە : دادپەروەری بلاوبکەنەوە ونەیەلن زولم‌و ستەم لەوولاتیانا بکرێ وەیارمەتی ستەم لێ کـراو بدەن‌و هەقی بۆ بسێننەوەو دەستی زالم ببەستن . ئەم پەیمانەیان ناونا ( حلـف الفضول ) واتە پەیمانی سەندنەوەی مالی داگیرکراو ، وەمحمد لەم پەیمان بەستنـەدا حازربوو ، وەلەدوایی‌دا ئەی‌فەرموو : « لەگەل مامەکانما حازری ( حلف الفضول ) بووم لەمالی عەبدولای کوڕی جودعانا ، وەئەوپەیمانە ناگۆڕمەوە بەسامانی جیهان . وەئەگەر ئێستەیش بانگ بکرێم بۆپەیمانی وەها ئامادەم

بۆهاوبەشی تیایا » .

ئەڵێن : هۆی تایبەتی پەیمانەکە ئەوەبوو : پیاوێکی زوبەیدەیی بــۆ بازرگانێتی هاتە مەکە ، (عاص) ی کوڕی وائیلی سەهمی کەلو پەلەکەی لێ کڕی‌و پاشان هەقەکەی نەدایەو دەستی پێ نەکرد ، ئەویش هەرچەند هاواری برد بۆهەموو تیرەکانی قورەیش بەڵام بێسوود بوو گوێیان نەدایە ، ئەمجار لەبەیانی‌یەك کاتێ قورەیشەکان لەنادیەکەیانا بوون کابرا هاتە لای کەعبەو هۆنراوەیەکی داناو لەبارەی خــۆی‌و قورەیشەوە خوێندی‌یەوە ، ئەم کردەوەیە تینێکی گەورەی کـردە سەریان ، ( زبیر بن عبدالمطلب ) هەڵسایەوەو وتی : ئەمە وازی لێ ناهێنرێ ، وەبەشوێن ئەوا بەنی‌هاشم‌و بەنی‌موتەلیب‌و بەنی ئەسەدو زوهرەو تەیمی‌یەکان هەڵسان و پێکەوە چوونە ماڵی عەبدوڵای کوڕی جودعان ( کەپیاوێکی ڕیش سپی‌و بەدەسەڵات‌و بەڕێزو دڵ‌کوشاد بوو هەموو ڕۆژێ وشترێـکی سەرئەبڕی و دەرخواردی خەڵکی ئەدا ) وەلەماڵی ئەوا ئەوپەیمانەیان بەست ، ئەمجار بەکۆمەڵی چوونە سەر عاس وهەقی کابرایان لێ‌سەندو دایانەوە پێی ، وەئەم پەیمانە درێژەی کێشا هەتا سەردەمی هاتنی ئیسلامی پیرۆز ، خۆبێ‌گومان ئیسلام لەجوانترین شێوەدا پارێزکاری هەموو جۆرە هەق‌و مافێك ئەکاو بە بەشێ لەبەشەکانی باوەڕی دائەنێ .

## دووەم ڕۆیشتنی محمد بۆ شام

کاتێ جەنگی فیجار کۆتایی پێ هات‌و پەیمانی ( فضـول ) مۆر کـرا تەمەنی محمد ـ د.خ ـ لەدەی سێ‌یەما بوو ، خــۆ ئەم تەمەنەیش تەمەنی گەنجێتی‌و ڕابواردنەو تەمەنی هەوڵ دانە بۆ دەست خستنی مـاڵ‌و سامان ، محمدیش لاوێکی جوان‌و شیرین‌و خۆش بەرکەوتوو و لەش ساغ‌و بەهێز بوو

لەگەڵ ئەوەیشا بوڵند هیمەت و دەروون بەرزو شێوە شیرین بوو ، لەدرێژایی تەمەنیا لێی نەبینراوە کەبەشێوەی گەنجێتی بجوڵێتەوە وئارەزووی ڕابواردن وبەزم و ڕەزمی - وەکوو هاوسەرانی - کردبێ ، وەهەروەها گوێی لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان نەبوو ، هەوڵی نەئەدا بۆبەدەس هێنانی پلەوپایەی جیهانی ، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە ئارەزووی تەنیایی و دوورکەوتنەوەی لەکۆمەڵ ئەکرد ، وەپاکی و ئەمینی و ڕاستێتی و بێخیانەتی و دەست و دەم و دل پاکێتی کالای تایبەتی و هەمیشەیی بوو ، وەبەلایەوە وابوو کە پیاوەتی و گەورەیی و جوامێری وا لەپاکی و خاوێنی و ڕەووشتی جوانو خزمەتی مرۆڤا ، نەك لەهەڵەشەیی و هەرزەیی و خۆهەڵ برین و ئازاردانی خەڵکی دا ، وە نەك لەسامانی گەورەو ماڵی زۆرا - وەکوو پێوەری نەفامێتی وابوو - وەلەژیانیا ڕازی بوو بەبچووکترین بەش و مووچە . وەئەیفەرموو « ئێمە چینێکین تا برسیمان نەبێ ناخۆین ، وەکەخواردمان خۆمان تێرناکەین » . وەخۆشی و ڕابواردن و لەزەت چەشتن بـــەلای محمدەوە - د . خ - پەیوەندی بە دڵ و دەروونەوە بوو هەتا جەستەو لاشە . لەبەرئەمانە محمد - دروودی لەسەربێ - ڕازی بوو بەوەدەسکەوتە کەم و کورەی لەشوانی و لەئیشە سادەکانی ترا دەستی ئەکەوت ئەگەر ئەبوتالیبی مامی وازی لێبهێنایە .

بەڵام ئەبوتالیب کەپیاوێکی هەژارو خێزان داربوو ئەیویست ئیشێکی پڕلەسوودو قازانج بۆئەوبرازا بەڕێزەی بدۆزێتەوە ، هەواڵی زانی کەوا ( خەدیجە ) ی کچی خوەیلید لەتیرەی بەنی ئەسەد لەقورەیشا بەکرێ پیاو ئەنێرێ بۆبازرگانی و کرێی باشی ئەداتێ ، ئەم خاتوخەدیجەیە ژنی بازرگانێکی سەرمایەداربوو . وەئافرەتێکی ناوازەو بەشەرەف و بەڕێزو داوێن پاك بوو ، هۆی دەسکەوتنی ئەوسامانەی ئەوەبوو ، دووجار لەناو تیرەی

مەخزومی‌دا شووی کردبوو ، بەوهۆیەوە بووبوو بەخاوەنی ئەوسامانەی ، وەبە یارمەتی خزمو کەس‌و باوەڕ پێ کراوەکانیەوە پارێزکاری سامانەکەی ئەکرد .

زۆر لەپیاوە ناودارەکانی قورەیش خوازبێنی‌یان کرد ، بەڵام خەدیجە وەڵامی کەسیانی نەدایەوە ، چونکە ئەی‌زانی تەماعی ماڵەکەی کرتبوونی وەبڕیاری وادابوو کەخۆی بەبازرگانی‌یەوە خەریك بکاو ئیتر شوو نەکات .

ئەبوتالیب زانی خەدیجە بەکرێ پیاو ئەنێرێ بۆشام بۆبازرگانی ناردی بەشوێن محمدا ـ د . خ ـ کەلەتەمەنی بیست‌و پێنج ساڵیدابوو ، وەپێ‌ی ووت : برازای شیرینم من پیاوێکی هەژارو خێزاندارم ، بیستوومە خەدیجە پیاو بەکرێ ئەگرێ ولەگەڵ کاروانا ئەی نێرێ بۆشام ، ئایا تۆ ئارەزوو ئەکەیت لەم ڕووەوە لەگەڵیا بدوێم ؟ وەبیش زانە بەوکرێ‌یەی بەخەڵکی ئەدا من ڕازی نابم ، محمد ـ د . خ ـ ووتی : چیت بەلاوە باشە وابکە . ئەبوتالیب چو بۆلای خەدیجەو پێ‌ی ووت : خەدیجە ئایا ئەتەوێ محمدی ئامۆزات بەکرێ بنێري لەگەڵ کارواناو دووقاتی فلانو فیسار کرێ‌ی بۆ دابنێ‌ی ؟ خەدیجە ووتی : تۆئەگەر بۆبێگانەیەك داوات بکردایە کەڕقمان لێ‌ی بوایە بەکوێمان ئەکردی چجای بۆخزمێکی بەڕێزی وەکوو محمد . ئەبوتالیب هاتەوەو ئەم ووت‌و وێژەی بۆ محمد گێڕایەوەو وتی : ئەمە ڕۆژی‌یەکە خوا بۆی ناردویت .

( إبن الأثیر ) ئەڵێ : « خەدیجە خۆی ناردی بۆلای محمد ـ د . خ ـ وەلەبەر ئەو ئەمینی‌و دەس پاکی‌و ڕاستی‌و جوامێری‌یەی محمدی پێ‌ناسراو بوو هەواڵی بۆ نارد کە ئەگەر بچێت بۆ شام بۆ بازرگانی دووچەندانەی خەڵکی کرێ‌و مووچەی بێ ، وە محمدیش ڕازی بوو .

خەدیجە کاروانی خستەڕێ و دایە دەسی محمدو نۆکەرێکی خۆیشی

کەناوی ( مەیسەرە ) بوو لەگەڵا نارد ، هەرچەندە بەسەرزاری بەناوی یارمەتی‌دانو خزمەتی محمدو ئاگاداری کردنی کاروانەکەوە بووە ، بەڵام ـ وادیارە ـ لەڕاستی‌یەکەیا بۆ چاودێری کردنی کاروکردەوەو خووڕەوشتی محمد بوو ، چونکە خەدیجە لەهەموو ڕوویەکەوە لەمحمد ڕازی‌بوو حەزی کرد بزانێ وەکو بەڕواڵەت و دیمەن ئەوەندە پەســەندو شیرینە لە هەموو ڕوویەکی‌تری ژیانیشا هەروا ناوازەو ڕێك‌وپێکە ؟ خۆبێ گومان بەسەفەرێکی زیاد لە دوو مانگی مرۆڤ بەتەواوی دەرئەکەوێ و ئەناسرێ ، بێ‌گومان خەدیجە ئاواتەخوازبوو کـە کەنجێکی وەکو محمد ـ د . خ ـ بیێتە هاوسەری ژیانی ئەگەر مرۆیەکی ڕێك‌و پێك‌بێ ، بۆیە مەیســەرە هەمیشە چاودێری محمدی کرد لە ڕۆیشتنیانەوە تا هاتنەوەیان .

کاروان دەشت‌و بیابــانی دایە بەرو تێ‌پەڕیو بە ( وادی‌القری ) و مەدیەن و ناوچەی (ثَمُود) دا وەلەم ڕێگەیەدا محمد ـ درودی لەسەربێ ـ زۆرشتی‌وای بینی‌کەسەرنجی زیاترڕابکێشێ‌و بیخاتە جیهانی بیرکردنەوەوە

بەم پێیە چونە شام و اکرین و فرۆشتن‌و ئیش وکاریان بەجێ هێنا و بە قازانج‌و دەسکەوتێکی زۆروە گەڕانەوە و توشی هیچ جۆرە زەرەر و زیانێك نەهــاتن کە نزیکی مەکە بونەوەو گەیشتنە ( مرالظهران ) مەیسەرە وتی بە محمد : واجوانە تۆ لەپێشەوە بڕۆیتەوەو مژدەی گەڕانەوەو بێ‌وەیی‌و قازانجمان بدەی بەخەدیجە ، چونکە ئێستە چاوەڕێ‌بیمان ئەکات . خاتو خەدیجە ماوەیەك بوو بەڕۆژ ئەچوە شوێنێکی بەرزوئەی‌ڕوانی بۆ ڕێگای شام و چاوەڕێی گەڕانەوەی محمدو کاروانەکەی ئەکرد ، ڕۆژێ وشتر سوارێکی بەدی‌کرد و دڵی کەوتە لێدان تا بۆی ڕوون بۆوە ئەوە وشترەکەی خۆیەتی‌و سوارەکەش محمدە ، کەهاتە بەرەوە بەپێی‌یاساپێش‌وازی

لێ کردو بەخێر هاتنەوەی کرد ، دوای کەمێك حەسانەوە کەوتنە باسی چون و هاتنەوەو کڕین و فرۆشتن و قازانج وسوود وئیش و کارەکانیان و خەدیجە زۆر دلشاد بوو لە هەموو کاروبارێکیان .

پاشان کاروان هاتەبەرەبەو ساتەر کرا و کەلوپەل خرایە ژوورەوە مەیسەرە هاتەلای خاتو خەدیجە و بەدرێژی و بە وردی - وەکو تۆماری کردبێ - کەوتە دواندن لەبارەی محمدەوە لە : ڕەوشت و خووو دلسۆزی و ئارام و جوامێری و ئەمینی و دەس و دەم و دلپاکی و سۆزو بەزەیی . . باسی قازانجی زۆرو بەلێشاوی چەند ئەوەندەی چارانی بۆ کرد ، وەلەو ڕووەوە کەلەڕێ کەوتنیانەوە هەتا هاتنەوەیان تەنکە هەورێکی سپی بەسەریانەوەبووەو سێبەری بۆکردون و لەگەرماو ناڕەحەتی ڕێگا پاراستوونی ، وە لە نزیکی شام ڕاهیبێکی نەستورایی باسی گەورەیی و پایەی پاشەڕۆژی محمدێ کردووەو ناسیویەتی و داوای کرد لە مەیسەرە کە ئاگاداری بکاو لە پیلانی جووەکە بیپارێزێ و ، گەلێ شتی کرتکتر و سەرسوڕێنەری تری لەوانەی کەدیبووی بۆی گێڕایەوە .

بەم باس و خواسە چەند ئەوەندەی جاران خۆشەویستی و ڕێزی محمد لە دلی خاتو خەدیجەدا جێگیر بوو ، بڕیاریدا ئەگەر محمد پێی ڕازی بێ شووی پێ بکا .

## شووکردنی خەدیجە بە محمد :

هەتا پێی ئەچوو خۆشەویستی محمد لە دلی خاتو خەدیجەدا زۆر ئەبووو پەرەی ئەسەند ، وەهەرچەندە تا ئەوکاتە وڵامی ئەو هەموو گەورەو سەرۆکانەی قورەیشی نەدابۆوە کە خوازبێنییان کردبوو ، بەلام ئێستە ئەبینێ خۆی تەمەنی گەورەبووە و گەیشتۆتە چل ساڵەو محمد لاویکی شۆخ

شەنگە و لەسەرەتای ژیانایەو تازە تەمەنی گەییوەتە بیستو پێنج ساڵ ، وە مرۆڤێکی وانی یە کە سوورو هەتەربێ لەسەر ماڵو سـامان تا بەهۆی تەماعەوە چاو لە هەموو شتێ بقونجێنێ ، لەبەرئەمانە پرکێشی نەکرد پێی رابکەبەنێ و ئەیەوێ شووی پێبکا ، وە ئەترسا ئەو ئارەزووی خواستنی ئەمی نەبێ ، بۆیە هات ئەم رازونیازەی لای خوشکەکەی خۆی باس کرد - وەکو هەندێ ئەڵێن - یالەلای ( نفیسە ) ی کچی (منیە) ی هاوەڵی - وەکو هەندێ تر ئەڵێن - وەداوای لێکرد کەبچێتە لای محمدو لەمڕووەوە بی دوێنێ . ئەویش هاتەلای و پێی وت : بۆچی ژن ناهێنی ؟ محمدیش وتی : سامانو ماڵم نی یە ، وتی : باشە ئەگەر بانگ کرای بۆلای جوانی و شەرەف و ماڵوسامان و دارایی تۆ وڵامت چی ئەبێ ؟ محمد وتی : ئەوە چۆن وکێ یە ؟ وتی : خاتو خەدیجە وتی چۆن خۆهەموو پیاوەگەورەکانی هۆزەکەی داوایان کردووە و شووی پێ نەکردون ، وتی ئەوەیان لەسەرمن . ئەڵبەتە محمد بەدڵ ئیشەکەی پێخۆشبوو بۆیە فەرمووی : ئەگەروابێ باشە و زۆرم پێخۆشە . کاتێ نەفیسە هاتەوە و باسەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە خەدیجە دڵشادبوو کاتێکی نزیکی دانا بۆ خوازبێنی و جێبەجێبوونی بەیەك گەیشتنیان .

محمد لەم ڕووەوە لەگەڵ مامەکانیادواو ئەوانیش چون بۆلای عەمری کوڕی ئەسەد کە مامی خەدیجەبوو خوازبێنی یان لێکرد ، چونکە خوەیلیدی بـاوکی خەدیجە لە جەنگی ( فجار ) ا یا لە پێشترا کۆچی کردبوو ، ئەبوتالیب وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کردوینی بەنەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل و بە پاسـەوان وزێڕەوانی ماڵەپیرۆزەکەی و بەئەمین داری حەرەمەکەی ، وە بەوبۆنەیەوە کردوینی بەگەورەی عەرەب ، پاشان . محمدی

برازام - وەکو ئەزانن - هیچ پیـاوێك نی یە هـــاوتایی بـــکا لە کەورەیی‌و ژیری‌و جوانی و پلەوپایەو جوامێری‌دا ، بەڵێ ســـامان و دارایی کەمە بەڵام سامان وەکو سێبەروایەو ئەڕوا و نامێنێتەوە ، داواتان لێ ئەکەم خەدیجەی بدەنێ ، وە خەدیجەیش خۆی پێی خۆشە و ئارەزووی لە هاوسەرێتی محمد هەیە ، وە بیست وشتر مارەیی پێشەکی‌و پـاشەکی ئەدات » .

مامی خەدیجەیش ووتی : بەڕاستی محمد پیاوێکی شـایانەو جێـگـای شانازی‌یەو دەست بەڕوویەوە نانرێ‌و کارەکەیان پیرۆزبێ‌و بەخۆشی‌پێکەوە بژین . وەهەرئەو ڕۆژە خەدیجەیان لەمحمد مارە کرد بەپێی مارە کردنی شەرعی ولەسەر شەریعەتەکەی ئیبراهیم وەبەپێی دەستووری گـەورەکانی قورەیش شایی‌و ئاهەنگ کـــێڕراو محمد - د.خ - چووە سەر ماڵەکەی خەدیجە .

ئەم ژن هێنانەی محمد و ئەو هاوسەرێتی‌یەی لەگەڵ ژنێکی بەشەرەفی وەکو خـــاتو خەدیجەدا تینێکی گەورەی هەبوو بۆ گەشە پێ‌کەیشتنی لە هەموو ڕوویەکەوە ، چونکە بەهۆی ماڵ‌و سامانەکەی خەدیجەوە دەسەڵاتی پەیدا کردوە و لە ئێش‌و ئازاری نەبوونی و ڕەنج‌کێشان ڕزگاری بوو ، وەکاتی بۆ خۆش‌بوو بۆ بیرکردنەوەو سەرنج‌دان و تێ‌بینی کردن لەکەردون و بوونەوەر . وەپەیوەندی ژن و مێردایەتی لەنێوانیـانا جوانترین شێوە و شیرینترین دیمەن و بەڕێزترین نیکاری هەبوو ، وەلە چوارچێوەو بەرگی خۆشەویستی و شەرەف و ڕێزگرتن لە یەکترین‌دا درێژەی کێشا هەتا خاتوخەدیجە لە تەمەنی ( ٦٥ ) ساڵیدا کەمێك لەپێش کۆچیانا بۆمەدینە کۆچی دوایی کرد .

وه هەتا ئەوکاتەی محمد ـ د . خ ـ ژنی تری نەهێنا ، وەبێجگە له ئیبراهیم ـ کە له ماری یەی ( قبطی ) بوو ـ منالەکانی محمد کەبریتی بوون له قاسم و زەینەب و ڕقیەو ئومو کـولثوم و فاطمەو عبدالله ) هەموویـان له خاتو خەدیجە بوون ، قاسم کاتێ مرد ئەوەندە گەورەبوو بوو ئەی توانی بۆ خۆی سواری ولاخ ببێ وه عەبدوللا ـ کە ( طیب ) و ( طاهر )یشیان پێ ئەوت ـ بەمنالی مرد .

بێ گومان مردنی ئەم دووکوڕە زۆر تینی کردە ســــەردلی ئەو باوك و دایکە بەڕێزانە ، چونکە نەبوونی کوڕ ( یاوەکو ئەلێن وەجاخ کوێری ) بە پێی سروشت و باوی ناوکۆمەڵ ـ بەتایبەتی لەکاتی تیرەو هۆزبازیدا ـ زۆر گرانە بەسەر دڵو دەرونەوە ، ئەلبەتە لێرەدا خەدیجە زیاتر دڵگران بووە . خۆتازە تەمەنی درێژو کاتی منال بوونی بەســــەرچوەو ، وا دوو کوڕەکەشی مردن و کوڕی تری نەماوە . وه محمدـ د . خ ـ هەرچەندە خۆیشی پێ ی ناخۆش بوو بەلام هەر دلخۆشـــی خەدیجەی ئەدایەوە ، بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلەبەرە گەورەیە ، هـات بەندەیەکی کڕی کە نـاوی ( زید )ی کوڕی ( حارث ) بوو ، وەبەپێی باوی ناوقوڕەیشەکان ئازادی کردو کردی بەکوڕی خۆی ، وه ئیتر بەکوڕی ئەوان ئەناسرا و بەناوبانگ بوو .

کچەکانی زەینەب کە گەورەکەیان بوو مارەی کرد له ( أبوالعـاصی ) کوڕی ( ربیع ) ی ( عبدالشمس ) کە خوشکەزای خەدیجەبوو ، وه بەلایەوە مایەوە تا زەینەب ویستی کۆچ بکا بۆ مەدینە ( وەکو لەمەودواباسی ئەکەین ) . وەڕوقیەو ئوموکلثومی مارەکرد له ( عتبەو عتیبە ) ی کوڕی ( أبولهب ) ی مامی ، بەلام لەدوای بوونی محمد ـ درودی لەسەربێ ـ بەپێغەمبەر و هاتنی ئیسـلام ئەبولەهەب زۆری کرد له کوڕەکانی پێ ی تەلاق دان ،

بەرودوا عوسمانی کوڕی عەففان مارەی کردن و بەبێ ئەوەی منالیان لەدوا بەجێ بهێنێ ، کۆچی دوایی‌یان کرد ، وەفاطمە دوای کۆچ کردن بۆمەدینە عەلی کوڕی ئەبی‌تالیب مارەی کرد . وەخاتو فاتمەنەبێ کچەکانی تری لە ژیانی محمدا مردن ، وەهیچیان منالیان لەدوابەجێ‌نەما .

بەڵێ بەهۆی سامانەکەی خاتوخەدیجەوە محمد ( د . خ ) دەوڵەمەندبوو، بەڵام نەك وەکوو دەوڵەمەندەکانی تر بکەوێتە شانازی‌و لووت بەرزی‌و خۆ هەڵبڕین بەسەر ئەمو ئەودا ، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەتا بڕێ ئەچوو ڕەووشتی جوانترو خووی شیرینتر ئەبوو ، هەمیشە هەوڵی ئەدا بۆ یارمەتی دانی هەژاران‌و دەستگرتنی لێقەوماوان وبەزەیی‌و سۆز تیایا بەرزئەبووەوە بووبوو بەنموونەی جوامێری ، لەناو قورەیشەکانا بەڕاستگۆو ئەمین ناوی دەرکردبوو .

## دروستکردنەوەی کەعبە

محمد – درودی لەسەربێ – هەرچەند لەخراپکاری‌و نەفامێتی‌دا هاوبەشی قورەیشەکانی نەئەکرد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا وازی لەتێکلاوی‌یان نەئەهێنا، وەلەدروست کردنەوەی کەعبەدا هاوبەشێکی دیاری کردن .

لەوسەردەمەدا لافاوێکی گەورە دیوارەکانی کەعبەی ڕووخان ، وەلەپێش ئەوەیشا ئاگرێك لەق‌و لۆقی کردبوون . لەبەرئەمە قورەیشەکان ناچاربوون بەدروست کردنەوەی سەرلەنوێ ، وەلەوە پێش زۆرجار بیریان لەوەئەکردەوە کەبی‌ڕوخێنن‌و دروستی بکەنەوەو سەریشی بکرن ، چونکە تائەوساتە سەری نەگیرابوو دزو پیاوخراپەکان ئەچون شتە گران بەهاکانیان ئەدزی ، بەڵام نەیان ئەوێراو ئەترسان خوای کەعبە نارازی بێ‌و تووشی ئەشکەنجەو ئازاریان بکات ، وەلەم ڕووەوە ئەفسانەو درۆی زۆر هەڵبەسترابوو وبڵاوەی

کردبوو ، بەڵام هاتنی ئەم لافاوە ناچاری کردن بەتێکدانو تازە کردنەوەی ئەکەرچی بەترس‌و لەرزەوە دەستیان بۆنەبرد .

وەبەرێ کەوت لەوکاتەدا دەریا دابووی لە کەشتی پیاوێکی ڕۆمی( باقوم) ناو شکاندبووی‌و فڕێی دابوە قەراغەوە لەلای ( جدە ) ، وەکابراش لەبەنایی وخانو دروست‌کردنا شارەزابوو ، قورەیشەکان کــەبەمەیان زانی وەلیدی کوڕی موغیرەو کۆمەڵێکیان نارد بۆکڕینی تەختەی کەشتی‌یەکە بۆسەرکرتنی کەعبە ، وەلەکەڵ باقومدا ڕێ کەوتن : کەشتی‌یەکەیان لێ‌کڕی‌و خۆبشی‌بێ لەکەڵیانا بۆوەستایی لەدروست‌کردنەوەی کەعبەدا .

قورەیشەکان دیوارەکانی کەعبەیان کرد بەچواربەشەوە وهەربەشەیان دا بەتیرەیەکیان بۆتێك دانو دروست‌کردنەوەی . لەپێشەوە کەسیان نەیان ئەوێرا دەستی پێ‌بکەن هەتا وەلیدی کوڕی موغیرە ـ دوای نزاو پـاڕانەوە لەخواکانیان ـ بەمەترسی‌یەوە دەستی کرد بەتێك‌دانی لای ڕوکنی یەمانی‌یەوە خەڵکی هەموو سەیریان ئەکرد بۆئەوەی بزانن چی‌بەسەردێ ، کەشەوێکی بەسەرا هات وەلید تووشی هیچ نەبوو هەموو لایەکیان دەستیان کردبەئیش کردن . وەمحمد ـ دروودی لەسەربێ ـ لەکەڵ مام‌و خزمەکانیا ئیشی ئەکرد وبەردی ئەکێشا ، دەستیان کــردە بناغە دانەوەی هەتا کەییشتنە سەر بەردێکی سەوز ڕەنگ هەرچی پاچ‌و قوڵنگیان لێ‌ئەدا کاری لێ نەئەکرد ، لەوێدا وێستان‌و کــردیان بەبنەڕەت‌و دیواریان لەسەر هەڵ‌ســاند ، وە لە کەژەکانی دەوری مەکەدا بەردێکی‌شین هەبوو لەوەیان ئەهێنا بۆدیوارەکەی .

دیوارەکەیان بەرزکردەوە تاکەییشتنە جێکای دانانی بــەردە ڕەشەکە ( الحجر الأسود ) لێرەدا تێك‌چوون و قرەو هەرا بەرپابوو لەسەر ئەوەکێ ئەو بەردە دابنێ و ئەو ڕێزو شانازی‌یە مێژوویی و ئایینی‌یەی دەست‌کەوێ ؟

وەهەرتیرە ئەی‌ویست ئەو شەرەفە دەس خۆی کەوێ ، تابەرەی (عبدالدار) و بەرەی ( عدی ) پەیمانیان بەست تاگیانیان تیابێ نەهێڵن کەسی‌تر ئەو بەردە دابنێ ، وەخەریك‌بوو بیێتە هۆی جەنگی خوێناوی و یەکتری لەسەر بیڕنەوە ، کە ( أبوأمیە ) ی کوڕی ( مغیرە ) ی مەخزومی - کە ڕیش سپی‌و ڕێزلێ‌گیراوی ئەوکاتەی قورەیش‌بو - زانی خەریکە ئەقەومێ ، بانگی‌کردن‌و پێی‌وتن : ئێوە حەکەمێك دابنێن و هەرچووت کەس لە ڕاکەی دەرنەچێ ، وەیەکەم کەسێ لەلای (صفا)وە هات بیکەن بەحەکەم .

بەفەرمانی‌خوا یەکەم کەس لەلای سەفاوە هات محمدی کوڕی‌عبداللەبو - د . خ - ، هەموو وتیان : بەخوا باش‌بو ، ( محمد الأمین ) بوو هات و ڕازین حەکەم‌و ناوبژی‌کەرمان‌بێ . کە محمد لە ئیش‌وکارەکە تێ‌گەیی تۆزێ بیری کردەوە و فەرمووی : جاجمی یاشتێکم بۆ بێنن ، کە بۆیان هێناو ڕای‌خست‌و بەردەکەی خستەناوو فەرمووی : با سەرۆکی هەرتیرەیەك چمکێکی بگرێ‌و بەرزی بکەنەوە ، بەوپێیە بە هەمولایەکیان بەردەکەیان بەرزکردوە تاگەیشتە جێکاکەی خوی ئینجا خۆی دەستی‌برد هەڵی‌گرت و لەجێکاکەی خۆیــــادای‌نــا . وەبەم جۆرە ئــاژاوەکەی کۆتایی پێ‌هێناو هەموو تیرەکانی کرد بەهاوبەشی ئەوشانازی یەو کیەوگرفتەی کووشاد کرد . وەلەو کاتەدا محمد - د . خ - لەتەمەنی سی‌وپێنج‌ساڵی‌یابو .

## تێکچوونی دەسەڵات لە مەکەدا :

لەپاش مردنی ( عبدالمطلب ) قورەیش پیاوێکی‌وایان نەبوو بتوانێ لە هەموو ڕوویەکەوە ئیشروکارەکان بگرێتەدەس ، وە ناڕێکی لەنێوانی بەرەی هاشم‌و بەرەی ئومەیەدا ڕوویدا لەسەر کاربەدەستی ، وە ئەمەیش سەری کێشابۆ ئەوە کاوورووو جوولەکەکان ترسێکی‌وایان لە عەرەبەکان نەمێنێ ،

وه به ئاشکرا له وه‌ختو بێوه‌ختا بانگه‌واز بۆ ئایینه‌که‌ی خۆیان بکه‌نو له دژی بت په‌رستی بدوون و گاڵته به بت په‌رسته‌کان بکه‌ن ٠ ئه‌مه له‌لایه‌که‌وه ، وه له‌لایه‌کی‌تره‌وه تێ‌گه‌یشتوانی عه‌ره‌ب باوه‌ڕیان بوو به‌خوای په‌روه‌ردگار به‌ڵام بته‌کانیان ئه‌کرد به هاوه‌ڵو تکاکه‌ر و نزیك خه‌ره‌وه‌ی مه‌ردم له په‌روه‌ردگار .

قورئان ئه‌فه‌رموێ : [ وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ ؟ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ العَزِيزُ العَلِيمُ ] سووره‌تی[1] ( الزخرف ) واته : ئه‌گه‌ر له ( بت په‌رسته‌کان بپرسیت کێ ئاسمانه‌کانو زه‌وی دروست کردوه ؟ ، ئه‌ڵێن : خوای به‌ده‌سه‌ڵاتو زانا دروستی کردون . [ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللهِ زُلْفَى ] سووره‌تی ( الزمر )[2] واته : ئه‌وانه‌ی بێجگه له خوا چه‌ند دۆستو چه‌ند بتێکیان بۆ خۆیان داناوه‌و ئه‌ڵێن : هه‌ر له‌به‌رئه‌وه ئه‌یان په‌رستین که‌له خواوه نزیکمان بخه‌نه‌وه .

## بت په‌رستی که‌وته له‌رزه :

هه‌ندێ له‌بت په‌رسته‌کان له‌م دواییه‌دا که‌وتنه گومانو دوودڵی له بت په‌رستنا و باوه‌ڕیان پێی نه‌ماو ئه‌گه‌ڕان بۆ دۆزینه‌وه‌ی ئایینی ڕاسته‌قینه . .

کاتێ که قوره‌یش له جه‌ژنی ( عزی ) دا له ( نخله ) کۆبوونه‌وه‌یه‌کیان ئه‌کرد ( زید ) ی کوڕی ( عمرو ) و ( عثمان ) ی کوڕی (حویرث) و ( عبیدالله ) ی کوڕی ( جحش ) و ( ورقه ) ی کوڕی ( نوفل ) یان لێ‌جیابوونه‌وه‌و وازیان له‌بت په‌رستی هێناو ڕایان وابوو بت په‌رستی سه‌رلێ‌شێواوی‌و گومراییه‌و پێویسته ئایینێکی‌تر بدۆزنه‌وه که شایسته‌ی

(١) آ . ٩ (٢) آ . ٣

ئادەمیزادبێ .

( زید ) ی کـوڕی عەمر گەڕایەوە سـەر ئایینەکەی ئیبراهیم و و دەس بەرداری ژنەکەی‌و مامی ( خطاب ) بوو .

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەسمای کچی ( ابوبکر ) ەوە :

« زەیدی کوڕی عەمری کـوڕی نەوفەلم بینی ڕاوەستابوو پشتی‌دابوبە کـەعبەوە و ئەی‌وت : بەخوا ئەی کرۆی قوڕەیش بێجگە لەمن کەستان لەسەر ئایینەکەی ئیبراهیم نەماوەتەوە . وە نەی‌ئەهێشت کچ زیندەبەچاڵ بکرێ ، وەئەی‌وت بەوباوکەی ئەویست کچی خۆی زیندە بەچاڵ بـکا : من بۆت بەخێوئەکەم و لێی وەرئەگرت‌و بەخێوی ئەکرد تاگەورەئەبوو ، ئەمجار پێی ئەوت : ئەگـەر ئەتەوێ بی‌بەرەوە ، وەئەگەر حەزیـش ئەکەی من بەخێوی ئەکەم » .

عثمانی کوڕی ( حویرث ) کە خزمی خەریجە بوو چوو بۆ نـاو ( بیزنطی ) یەکان و بوو بەگاور ، وەلەلای قەیسەر ( پاشای ڕۆم ) زۆر بەڕێزبوو .

( عبیدالله ) ی کوڕی ( جحش ) هەربەوپێیە مایەوە تاموسلمان بوو کۆچی‌کردبۆ حەبەشە لەگەڵ موسلمانەکانا ، بەڵام لەوێ بوو بە گـاور و لەسەر گاورێتی مرد ، وەئوم‌وحبیبەی کچی ئەبوسـوفیان کـە خێزانی بو مایەوە تاله پاشان پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ مـارەی کرد و بوو بەدایکی موسڵمانان .

وەرەقەی کوڕی نەوفەل بوو بەگاور ، وەئەڵێن : هەندێکی لە ئینجیل وەرگێڕایە سەرزمانی عەرەبی .

* * *

## باری گیتی لەپێش هاتنی ئیسلامدا

لەپێش هاتنی ئیسلاما باری مرۆڤایەتی لەهەموو ڕوویەکەوە ئەوپەڕی پلەی خراپیو نالەباری گرتبوو ، وەشیرازەی پچڕابوو بـــەڕادەیەك کە گەیشتبووە لێواری چاڵی لەناوچوون ئەگەر یارمەتیو بەزەیی خوا فریای نەکەوتایەو پێغەمبەرێکی وەکو محمدو ئایینو بەرنامەیەکی وەکو ئیسلامی بۆنەناردایە ، وابۆئەم باسە ئەچین بۆلای مامـۆستاو زانای بەرزی هیندی ( أبوالحسن الندوی ) لـەپەڕاوی ( ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمین)ەوە هەندێ دێنین :

## سەرنج دان لەئایینو ئومەتەکان

ئایینە گەورەکان بووبوونە یاری دەستی تێکدەرو ناپاكو چاوچنۆکەکان ، بەڕادەیەکی وا کەنەکیانیان مابوو وەنەوێنەو نیگار ، وەئەگەر ئاییندارەکانی پێشوویان بهاتنـایەوە نەیان ئەناسینەوە ، وەباری شـارستانێتیو زانیاریو حوکمڕانی و ڕامیاری بووبوون بەشانۆ بۆ پشێویو بێباوەڕیو خراپکاری ، بەڕادەیێ کە مرۆڤەکان هەربەدەردی خۆیانەوە ئەیان ناڵاندو ڕێیان نەئەکرا پەیامو مەشخەڵی ڕزکاری هەڵبکرنو ڕێکابۆ مرۆڤەکان ڕۆشن بکەنەوە ، وەئەوەندە لاوازو هەژار بووبوون کەنە ئایینێکیڕاســـتە قینەو نەیاسا دەستوورێکی ڕێكو پێکیان بۆ فەرمان ڕەوایی مرۆڤ مابوو .

## گاورێتی لە سەدەی شەشەمیا :

ئایینی عیسا پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ بەوشێوەیە نەبوو کە دەوڵەت لەسەر بەندەکانی بڕواو شارستانێتییـان لەسەر دابمەزرێنێت ، چونکە بریتیبوو لە چەند دەستەیەك لەڕێو شوێنی عیسا پێغەمبەر و لەوێنەیەکی سادەو شیرین لە باسی تاكو تەنیـایی خوای گەورەدا و لە پـالفتەکردنی

دڵو دەرون و وینەیان .

وەلەسەر ئەم شیوە ڕاســـتەی خۆی مایەوە هەتا ( پۆلس ) هات و دەستی بەسەراکرت و ڕۆشنایی‌یەکەی شاردەوە و خارافاتی نەفـامیتی و بت پەرستیتی تیکلاوکرد ، وە کاتێ ( قسطنطین ) هات ئەوەی کەمابووی لای‌برد و ئایینەکە بوو بەشتێکی تیکلاو لە خەرافاتی یۆنانی‌و بت‌پەرستی ڕۆمی‌و ئیفلاتونیتی میسری و گۆشە نشینیتی ( رهبانیته ) ، وەڕێ‌و شوێن‌و تەعالیمەکانی عیسا پێغەمبەر ـ د . خ ـ تووانەوەو داپۆشران .

لێرەدا گاورەکان بوون‌بە چەند بەش‌و کـۆمەڵەوە بەهۆی مشت‌ومڕ و نارێکی لەڕاو بڕواو ڕێبازا ، وە بەشـەکان بوون بە دوشـمنی یەکتر بەڕادەیەك کەچەند شۆڕش‌و جەنگی خوێناوی لەنێوانیانا بەرپابوو ملیونەها قوربانی تیادرا .

## تێکچونی کۆمەڵایەتی و ئابووری :

شیرازەی کۆمەڵایەتی پچڕاو نارێکي ناوکۆمەڵ کەییشتە ئەوپەڕی پلەوە ، وەلەلایەکی‌ترەوە خەرج‌و باج و گومرك پەرەی سەندو زۆر بوو بەشێوەیەکی وەهامەردمەکان‌لە (میری) بێزار بوون کە ئاواتەخواز بوون بەهەر جۆربێوایە خۆیان لە دەستی ڕزگـاربکەن ، وەبەم بۆنەیەوە چەندڕاچەنین‌و شۆڕشێك ڕوویدا ، وەهەرلە سالی ( ٥٣٢ )ز بەس لەپایتەختەکەیانا ( ٣٠،٠٠٠ ) کەس کوژرا . وەلەگەل باری هەژاری و نەبوونی‌یا ئیسراف و ڕابواردن پەرەی‌سەندو بوبەباو ، کەهەرکەسە تەنیا بیری لەوەنەکردەوە چۆن مـاڵ پەیابکات‌و لە ڕابواردن‌و شتی پڕوپوچا بەختی بکا .

بنەڕەتەکانی ڕەووشـــت‌و داوێن پـاکـی پووکانەوەو لەناوچون و بێ‌نابڕوویی بوو بە باو ، بە ڕەنگێ زوربەی خەلکی ئەیان‌ویست بەسەڵتی

بژین‌و ژن نه‌هێنن و هه‌رکاه بیانه‌وێ ئاره‌زو به‌سه‌ربه‌رن به‌بێ شه‌رم و ترس ده‌ستیان ئه‌که‌وێ .

ئه‌م باره‌ناله‌باره‌ی ده‌وله‌تی ڕۆم سه‌ری کێشا بۆ ولاته ژێرده‌سه‌کانیش ، میسر که‌یه‌کێك بوو له‌ وولاتانه که‌یبروه پله‌یه‌کی ناره‌واوه چ له‌ڕووی ئاینه‌وه وه‌ج له‌ڕووی ڕه‌وشت و ئابڕووه‌وه ، وه‌چ له‌ڕووی ئابووری و به‌روبووم و ژیانه‌وه ، وه‌هه‌رچه‌ند به‌ناوبوبوو به‌کاور به‌لام به‌هۆی پشێوی‌یه‌وه نه‌ی‌ئه‌په‌رژایه سه‌ر ئاین یا سه‌رئێش‌وکاری ژیان .

وه‌حه‌به‌شه که ده‌راوسێی‌ی ئه‌وده‌وڵه‌ته بوو له‌که‌ڵ ئه‌وه‌دا که به‌کاور ئه‌ژمێرران چه‌ندبتێکیان هه‌بوو شان‌به‌شانی کاورێتی ئه‌یان‌په‌رستن ، وه سه‌ربه‌ستی‌و ئازادی نه‌مابوو به‌کۆیله‌یی ئه‌ژیان .

وه ئومه‌ته ئه‌وروپایی‌یه‌کانی خۆر ئاواو ژووروو له‌شه‌پۆلی نه‌فامێتی‌و نه‌زانین و تاریکایی‌دا ته‌پاوتلیان ئه‌کردو جێگای به‌زه‌یی هه‌موو مرۆڤێکی خاوه‌ن سۆزبوون ، چونکه شه‌ڕوشۆڕوتێکچوون‌و کوشتن و برین‌و دورێتی له‌گیانی شارستانێتی و زانیاری و جوامێری بووبووه کالای بالایان ، وه‌له نێوانی کاورێتی‌وبت په‌رستی‌و خه‌رافیاتا ئه‌ژیان و مانای مرۆڤایه‌تی و شه‌رم‌و ئابڕوویان له‌ناوا نه‌مامابوو .

وه‌به‌شێوه‌یه‌کی کشتی باری شه‌وه‌زه‌نگ‌و تاریکایی هه‌موو ئه‌وروپا و ژێرده‌سته‌کانیانی داکرتبوو ، وه‌ئه‌مه‌یش له‌سه‌ده‌ی پێنجه‌مه‌وه بۆ سه‌ده‌ی ده‌یه‌م - بکره به‌م لاتریشه‌وه - درێژه‌ی کێشا ، وه‌ژیانیان له‌که‌ژێتی و دوڕندایه‌تی‌یه‌وه نزیکتر بوو تامرۆڤایه‌تی .

## جووله‌که :

جوله‌که به‌ناو ئه‌وروپاو ئاسیاو ئه‌فه‌ریقادا بلاوه‌یان کردبوو ، ئه‌مانه

لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەنی ئایینێکی بیرو باوەڕو یاســاو دەستوور دارو ئاشکراو ڕۆشن‌بوون هیچ جۆرە دەستێکیان نەبوو لە شارستانێتیو ڕامیاری و لە فەرمان‌ڕەوایی دا ، وە بەدرێژایی مێژوویان ژێر دەستەی ئەم‌ونەو و نموونەی خواریو بێ‌دەســەڵاتیو پەرتەوارەیی بـوون وە لەلایەکی ترەوە هەمیشە نموونەی چاوچنۆکــیو ســووکاری بوون و خۆیـان بەگەورەوەو هەڵبژێرراو داناوەو شانازی‌یان بەنەژادەوە کردوە . وە زیاتر لەم سیفەتانەی سەرەوە چەند سیفەتو ڕەوشتێکی سەیریان بووە بەدرێژایی مێژوویــان ، وە پشتاوپشت لەگەڵیانا هاتۆتە خوارەوە و لەناو هەموو ئوممەتەکانا پێ‌یان ناسراو بوون . . وەك سەرشۆڕی لەکاتی بێ‌دەســەڵایەتی‌یاو دوڕندەیی لە لەکاتی دەسەڵاتا ، وە دووڕوویی و خیانەت و پیلان‌بازیو فێڵو تەڵەکەو ناڕاستیو ناپـاکی ، یاوەك دڵ‌ڕەشیو بێ بەزەییو مـاڵی خەڵکی بەفیرۆ خواردنو بەربەست کردنی ڕێگـای خوا ، یـــاوەك نزم‌بوونەوە لـەڕوی ڕەوشتو ئابڕووەوە و شۆڕبونەوە لـەڕوی دەروونەوە و خراپکاری لە نــاو کۆمەڵا .

بەهۆی ئەمانەو وێنەیانەوە هەمیشە لەپلەی پێشەواپەتی دورخراونەتەوەو ژێردەس خراون

## لەنێوانی گاورەکانو جوو لەکەکانا :

لە نێوانی گاورو جوولەکەدا بە درێژایی ژیانیان دوژمنایەتیو ناڕێکی بووە ، وەهەر ڕووداوێك ڕووی‌ئەدا ئاگری ئەو دوژمنایەتی‌یەی خۆش ئەکرد ، لەسەرەتای سەدەی حەوتەما ئەودوژمنایەتی‌یە تازەبووەوە لەساڵی ( ٦١٠ )ز جوولەکەکان کەوتنە دەست‌وەشاندن لە گاورەکانی ( أنطاکیە ) وە بەهۆی ئەوەوە ( إمبراطور ) فەرماندەیەکی ناردەسەریان بە سوپایەکەوە ، ئەویش

بەبێ بەزەیی تێیان کەوتو کەسی نەهێشتن و پاکی کردنەوەو لەناوی بردن.

بەمەتێ ئەگەین تاچ رادەیەك دوژمنایەتی و نارێکی یان بەهێزو توندبوو، وەئەمەیش دەری ئەخا کە ئەمانە هیچ لایەکیان لێیان نایەت رەورەوەی مرۆڤ و گێتی بکرنەدەست و بیبەن بەرێوە و پەیامی دادو ئاسایش بڵاوبکەنەوە.

## فارس و ئێران :

دەوڵەتی فارس هەرلەکۆنەوە زەوی یەکی بەپیتی هەبووە خراپکاری و نارەوایی وە بنچینەی رەوشت و خووی بەرز تیایا هەر لە دێر زەمانەوە لە لەرزەدابووە، هەتا مارەنەکردنی ژن وەیا خواستنی ژنی مەحرەم ـ کە هەموو میللەت و ئوممەت و مرۆڤێ بەلایەوە نارەواو ناشیرین بووە و بێزی لێ کردۆتەوە ـ لەناویانا باوبووە تا ( یەزدی جورد ) کەلەناوەراستی سەدەی پێنجەمی زایینی‌دا پاشایەتی کرد کچی خۆی مارەکردو لە پاشیشا کوشتی، وە ( بارامی چۆبین ) کە لەسەدەی شەشەما پاشا بوو خوشکی خۆی مارەکرد.

پرۆفیسۆر ( آرتهر کرستن سین ) مامۆستای زمانی خۆرهەڵاتی یەکان لە دانشگای ( کۆپنهاجن لە دانیمارك ) لە پەڕاوی ( ئێران لە تاقی ساسانی یەکانا ) ئەڵێ :

« مێژوو نووسەکانی دەمی حوکمرانی ساسانی یەکان وەکو ( جاتهیاس ) و ئەوانی‌ترلایان وابووە کەلە ناوئێرانی یەکانا مارەکردنی ژنی مەحرەم باوبووە، وەلە مێژووی ساسانی یەکانا نموونەی ئەمە زۆرە.. بارامی چۆبین و گۆشتاسب ـ پێش ئەوەی ببێ بەگاور ـ ژنی مەحرەمیان هێناوە، وەئەم جۆرە ژن هێنانە بەلای ئێرانی یەکانەوە نەك گوناهو نارەوا بەڵکو

بەکردەوەی چاکە دانراوەو گوایە بەوە خۆیان لە خواوە نزیك کردۆتەوە .
وەلاموایە کەرۆکی چینی ( هوئن سوئنج ) مەبەسی ئەمەبووە کە ئەلێ :
« ئێرانی یەکان بەبێ سنوور ژنیان هێناوە » (١)

لەسەدەی سێهەمی ( ز ) دا ( مانی ) هاتەڕوو ، وەپەیابوونی ئەم لە ئەنجامی بێپەردەیی و شوڵ لێهەڵکێشانی هەواو هەوەسەوە بوو کەسەرا سەری وولاتی داگیرکردبوو ، وەمانی کەوتە بانگ کردن بۆسەر ژیانی سەڵتی و کەنجی و وازهێنان لەژن هاوردن ، بۆئەوەی تۆوی خراپەو شەڕ لەجیهانا نەمێنێ ، وەژن هێنانی یاساغ کرد تا منال نەبێ وجیهان کۆتایی بێ و ڕۆشنایی سەرکەوێ بەسەر تاریکی دا . تالەسالی (٢٧٦) ز دا بارام کوشتی و وتی : ئەم بانگ کەرە ئەیەوێ جیهان کۆتایی بێ ، باش وایە لەخۆیەوە دەس پێ بکرێ پێش ئەوەی هیچ ئاواتێکی بێتە دی .

لەدوایی دا گیانی سروشتی فارسێتی شۆڕشی کرد لەدژی باوەڕە نارەوا کانی ( مانی ) وبانگەکەی ( مەزدەك ) ی کردە بەر کەلە (٤٨٧) ز ، دا لەدایك بوو هاواری کرد : « مرۆڤەکان وەکو یەك لەدایك بوون وجیاوازی یان لەنێوانا نەبوە ، ئەبێ وەکو یەکیش بژین وجیاوازی یان نەبێ » .

لەبەرئەوەی خەڵکی سوورو هەتەرن لەسەر دەس گرتن بەسەر ژن ومالاّ مەزدەك بەلایەوە وابوو لەهەموو شتێ پێویستتر ئەوەیە خەڵکی لەمدووانەدا یەکسان بن وپەردە لەنێوانا نەبێ . ( شهرستانی ) لەپەڕاوی ( الملل والنحل ) دا لەبەرگی یەکەم ولاپەڕە (٨٦) دا ئەلێ : « مەزدەك ژنی حەلاّل کردو مال و سامانی بەرەلاّو بێ پەردە کردو مرۆڤەکانی تێدا هاوبەش و یەکسان کرد ، هەروەکو یەکسانی یان لەئاوو ئاگرو لەوەڕی ئاژالدا» ئەم بانگەیە

(١) ( ئێران لەکاتی ساسانیدا ) ٤٣٠ ـ ٤٣٩

لەگەڵ هەواو هەوەسی کوڕو کاڵو گەنجەکانا وئەوانەی لەجیهانا ئامانجیان تەنیا ڕابواردنو ژیانی حەیوانی‌یە ، وەلەگەڵ هەوای کۆشکی شاهەنشادا ڕێك بوو وقوباد کۆمەکی پێ کرد ، وەبەم بۆنەیەوە ئێران ڕۆچوو لەشەپۆلو گێژاوی بێ‌ئابڕوویی‌و یاخی گەرێتی‌و هەوا پەرستیدا .

## بەگەورە گرتنی پاشایان

پاشاکانی فارس لایان وابوو خوێنی خوایەتی بەرەکەکانیانا هات وچۆ ئەکات ، وەفارسەکان بەچاوی خوایەتی سەیری پاشاکانیان ئەکردو لایان وابوو کەبەپێی سروشت گەورەو بەرزن ، وەسروودی خـوایەتی‌یان پیـا ئەخوێندن ، وایان ئەزانی زیاترن لەمرۆڤـو بەرزترن لەوەی ڕەخنەیان لێ بگیرێو یاساو نەریتیان بدرێ بەسـەرا ، وە ڕایان وابوو کەهەقیـان بەسەر هەموو کەسەوە هەیە وکەس هەقی بەسەریانەوە نیە ، وەئەگەر لە ڕەنجی شانی خەڵکی شتێکیان پێ بدانایەتەوە زۆر بەپیرۆزو مونەڕکیان دائەنا ، وەبێجگە لەبیستنو کوێ ڕایەڵی کەس هیـــچ مافێکی نیە لە بەرابەریانەوە ، وەپاشایەتی‌و سەرۆکایەتی ئەبێ هەرلەخانەوادەکەی ئەوان‌بێ وەئەگەر پیاویان نەما ژنیان یا منالیان ئەکرێ بەپاشا ، بەبێ ئەوەی بیر بکەنەوە لەدانانی پێشەوایەکی گەورەو زاناو لێهاتووی وەکو ڕۆستەم یا جاباں یا هەرکامێکی‌تر ، چونکە لەونەژادە نەبوون .

## ئاگر پەرستن

لەتاقە کۆنەکانا فارس خوا پەرست بوون ، دوایی بـەڕێزەوە سەیری ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانیان ئەکرد . کەزەردەشت پێغەمبەر هـات داوای لێ کردن : کەخوای تاكو تەنیا بپەرستن وبت پەرستی لابردو وتی : نوری خوا ئەدرەوشێتەوە لەهەمـوو شتێکی ڕۆشنو خاوەنی گـڕو بڵێسەدا ، وە

داوای لێ کردن کەئاگرو هەواو خۆڵو ئاو پیس نەکەن . لەدوای خۆی زانایانی ئایینەکەی هاتن ئایینەکەیان گـــۆڕیو شەریعەتو ئایینێـکی جیاوازیان بۆزەردەشتی یەکان دانا ، وقەدەغەیان کرد لێیان خەریـك بوون بەوشتانەی ئاگریان ئەوێ ، وەئەبێ تەنیا بەکشتوکاڵو بازرگانی یەوە خەریك بن ، ئەمە وردەوردە سەری کێشا بۆ ئاگرپەرستیو هاتن ئاتەشکە دەیاندروست کردو پەیکەریان بۆ ئاگر داناو هەموو ئایینو باوەڕەکەیان کورت کردەوە لەسەر پەرستنی ئاگر ، وەڕاستیتی لەبیرچووەوە و بووبە ژێرەوە .

وەبەم پێیە فارسەکانیش ئاینێکی وایان نەبوو کەکشتیو فراوان بێ ، وەپەرەوەرش کەری دەروونو پـالفتەکەری ڕەوشـتبێو جلەوی هەواو ئارەزوو بگرێتەدەسو پاڵ پێوەنەربێ بۆ کردەوەی خێروچاکە ، یا خاوەنی بیروباوەڕو یاساو دەستورو نەریتبێو بۆ فەرمانڕەوایی مرۆڤەکان دەس بدا بەشێوەی دادپەروەری .

## بت پەرستی :

بت پەرستی لەهیندا لە سەدەی شـــەشەما کەیشتبووە ئەوپەڕی پلە ، ژمارەی بتەکان لە ( ٣٣٠ ) ملیۆن پتربون ، وەهەرشتێکـی جوانو دڵ فڕێن و هەردیمەنێکی شیرین بوایە ئەکرا بەخواو ئەپەرسترا . .

لە ڕوی ئایینەوە زۆر پەرێشانبوون و بت پەرستی کاڵای باڵایانبو ، وە لەڕووی کۆمەڵایەتی یەوە تووشی چەندەها دەردو نەخۆشینی جۆربەجۆر بووبوون ،

وە هەموو خراپەیەکی نەفامیتی پیایانا بڵاوەی کردبوو ، وە چەندەها ڕەوشتو خووی ناشیرینو بێئابڕووی رووی تێ کردبوون .

* * *

کۆلەکەی ئابووریان وبەدروشمی بازرگانیێو کێشەی ژیانیان .

قومارکردن لەوانەبوو شانازی پێوە ئەکراو هۆنراوەی پیا هەڵ ئەدراو ببوو بەنیشانەی بەرزیو پیاوەتی‌یان .

( قتادە ) ئەڵێ : « پیاو لە[illegible]ردەمی نەفامێتی‌دا ژنو ماڵی لەقومارا ئەدۆڕانو بەخەفەتەوە سەیری ئەکردن کەبەدەستی خەڵکەوەبوون ، وەئەمەش سەری ئەکێشا بۆداگیرساندنی رقو قینو دوژمنایەتی لەناویانا . سوودکاری ( الربا ) بەجارێ باوی نیوەدورگەی عەرەب بوو ، عەرەبو جولەکەکان سوودکاری‌یان ئەکرد ، وەبەشێوەیەکی بێ‌بەزەیی‌و ستەمکارانە تیایا ئەجولانەوە ، وە زۆرجار بەچەند قاتی ماڵەکە زیادەیان ئەسەندو پەرەیان ئەدا بەسووەکەی ( طبری ) . لەتەفسیرەکەیا ئەڵێ : « ئەگەر پەنجا دینار بدرایە بەسوو وەلەساڵی دوایی‌دا نەدرایەتەوە ئەبوو بەسەد دینار وە بۆ ساڵەکەی تر ئەبوە دووسەد وەبۆساڵەکەی تر ئەبوە چوارسەد ، وەبەوپێیە هەموو ساڵێ دووقات ئەبووەوە » وەبەڕادەیەك بڵاوەی کردبوو جیاوازی لە نێوانی سووکاری‌و بازرگانیدا نەبوو .

شەرواڵ پیس ( زنا ) بەلایانەوە ناڕەوا نەبوو ، وەلەناویانا باوبوو هەر پیاوێك چەند یارو هەرژنێك چەند دۆستی بێ‌و بەبێ‌مارەو تەڵاق لەگەڵیانا ڕابوێرن ، وەهەندێ جار بەزۆر پاڵیان ئەنا بەژنانەوە بۆ بێ‌ئابڕویی .. ( إبن عباس ) ئەڵێ : « لەکاتی نەفامێتی‌دا زۆریان ئەکرد لەکەنیزەکەکانیان بۆ شەرواڵ پیسی‌و کرێ‌یان وەرئەگرت »

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەخاتوعایشەوە ـ خوا لێ‌یان ڕازی بێ ـ ئەڵێ : « لەچاخی نەفامێتی دا ژن هێنان چوار جۆری هەبوو : یەکەمیان وەکوو مارە کردنی ئیسلامی وابوو : پیاو ئەچوە لای باوكو کەسی ژنەکە

وخوازبێنی لێ ئەکردو دوای ڕێکەوتـــن مارەیی ئەداو مارەیان ئەکرد
دووەمیان پیاو ئەی ووت بەژنی خۆی کەلە ( حیض ) پاك ئەبووەوە بڕۆ
لای فلانە پیاو با لەکەڵتا جووت ببێ وبێتە لات ئیتر پیـاوەکە نزیکی
نەئەکەوتەوە هەتا دەرئەکەوت سکی پڕ بووە ، وەئەمەیان بۆئەوەبوو کەمناڵی
ڕەسەنیان ببێت

سێ‌هەمیان کۆمەڵێکی کەمتر لەدە کەس ئەچونە لای ژنێك ولەکەڵیـا
دروست ئەبوون ، وەکە ژنەکە سکی پڕ ببوایە ئەی‌نارد بەشوێنیاناو ئەبوایە
هەموویان بچونایە بۆلای وئەویش بەئارەزووی خۆی سکەکەی ئەبڕی بە
سەر یەکێکیانا وەکابراش نەی‌ئەتوانی وەری نەگرێ‌و ئیتر بەمناڵی ئەو
ئەناسرا

چوارەمیان سەلیتەبون وئالایان بەسەر دەرگاوە هەڵواسی‌بوو ، هەرکەس
بی‌ویستایە بۆلای هەرکامیان ئەچو ، وەهەرکامیان مناڵی ببوایـــە کۆی
ئەکردنەوەو سەرناس‌یان بانک ئەکردو سەرنجیان ئەدایە مناڵەکەو پیاوەکان
وئەیاندا بەسەر یەکێکیاناو ئەویش بەمناڵی خۆی دای ئەنا » .

## پلەی ژنان لەدەوری نەفامێتی‌دا

ژنان لەدەوری نەفامێتی‌دا زۆرلێ‌کراوو چەوساوە بوون بەش خوراوو
مال لێ‌سەنراوو بێ‌بەش کراو بوون لەکەلەپور ، ئەکەر ژنێ تەلاق بدرایە
یا مێردی بمردایە قەدەغە ئەکرا لەوە کەشووبکاتەوە ، وەهەروەك کەل‌وپەل
وئاژاڵ بەکەلەپور ئەبران ( ابن عباس ) ئەڵێ « ئەکەر پیاوێ بمردایە
باوکی یا خزمێکی ئەبوە سەرپەرشتی کەری ژنەکەی ئیتربەهەوەسـی خۆی
ئەی‌هێشتەوە تا ژنەکە یا بەمارەیی‌یەکەی خۆی ڕزکار ئەکرد ، یـا ئەمردو
پیاوەکە ماڵەکەی ئەخوارد »

( عطای ) کوڕی ( أبورباح ) ئەڵێ : « لەدەمی نەفامێتیدا ئەگەر پیاوێ بمردایەو ژنو منالی لێ بەجێ بمایە ژنەکەیان بەسەر منالەوە ئەبەستەوە »
وە ( سدی ) ئەڵێ : « پیاو لەنەفامێتیدا ئەگەر باوکی یاکـــوڕی یا برای بمردایەو ژنی لێ بەجێ بمایە ئەگەر پیاوەکە پێش بکەوتایەو بچوایە جلێکی فڕێ بدایەتە سەر ژنەکە ئەبوو بەخاوەنی وئەی توانی بە مارەیی یـــەکەی پێشووی مارەی بکردایە یا بیدایە بەشوو مارەیی یەکەی بۆخۆی وەربگرتایە وەئەگەر ژنەکە پێش بکەوتایەو بچوایـەوە ناوکەسی خۆی ئیتر ڕزگـاری ئەبوو ، وەئەبوو بەخاوەنی خۆی » .

## کچ زیندە بەچاڵ کردن

ڕقو قینیان لەکچ گەییشتبووە پلەیەکی ئەوتۆ بەزیندوویی ئەیانخستنە ناوچاڵو دایان ئەپۆشین . ( هیثم ) ی کوڕی ( عـدی ) ئەڵێ : « لەناو هەموو تیرەکانی عەرەبا کچ زیندە بەچاڵ کردن باوبو ، یەکێ ئەی کردو دەیان وازیان لێ ئەهێنا . عەرەبەکان لە کچ زیندە بەچاڵ کـردن دا چەند جۆرێکیان هەبوو : بوویان لەترسی شورەیی‌و ئابڕوو چون ئەی کـرد ، وە بوویان ئەگەر کچەکەی ڕەش یا بۆر یا بەڵەك یا هەرناتەواوی یەکی ببوایە زیندە بەچاڵی ئەکرد . وەبوویان لەبەر نەبوونی‌و هەژاری ئەیان کرد »

## دەمار گیرێتی

تیرە بازی‌و دەمار گیرێتی تیرەیی لەناو عەرەبەکانا زۆر توندو بەهێزبوو ، وەچینایەتی لەناویانا باوبوو ، زۆر لەخانەوادەو تیرەکان خۆیان لەوانی‌تر بە گەورەترو ڕەسەنتر دائەنا ، هەتا لەحەج کـردنو پەرستنو هەندێ ئیش‌و کاری تریشا لەگەڵیا نەئەڕۆییشتن . وەجەنگو هەراو داگیرکـردنو تالانو یەخسیرو بەدیل بردنو کردن بەبەندەو کەنیزەك بەڕادەیەك باوبوو کە

بووبووه پارچەیەك لەسروشتیان وەبەهۆی ژیانی بیابانی و ڕەوەندەیی یانەوە خوێن ڕێژی بەڕادەیەك سوك بووبوو بەلایانەوە کەلەسەر ڕوداوێکی بچوك جەنگێکی گەورە بەرپا ئەکرا .

## جەنگی بەسوس :

ئەنێوانی بەکرو تەغلەبدا ـ کە دووتیرەبون و هەردوکیان لەبنەماڵەی وائیلبون ـ جەنگێ داگیرساو چل ساڵ درێژەی کێشا .

هۆکەش ئەوەبوو ( کەلیب ) سەرۆکی مەعد تیرێکی دا لە گوانی وشتری ( بەسوسی ) کچی ( منقذ ) خوێنو شیر تێکلاوبوو ، وە ( جەساسی ) کوڕی ( مرە ) کەلیبی کوشت ، ئەنجار تیرەی بەکرو تەغلەب تێکرژان و چل ساڵی خایاند ، وەچەند دایکی خستە سنگ کوتان و چەند منال هەتیوو چەندژن بێوەژن کەوتنو فرمێسك ووشك نەئەبووەوەو لاشە نەئەشارایەوە .

## جەنگی ( داحیس و غەبراء ) :

هۆی ئەم جەنگە ئەمەبوو : قەیسی کوڕی زوهەیرو حوزەیفەی کوڕی بەدر ، کرەوی پێشکەوتنیان کرد لە سواریدا ، قەیس ولاخێکی هەبوو ناوی داحیس بوو ، بەپیلانی حوزەیفە پیاوێك لەکاتی تاودا بەرەنگاری بوو ، وەشەقازلەبەکیدا بەرووی داحیسداو هەتا ولاخەکانی‌تر لێی پێش کەوتن . لەسەرئەمە کوشتنو بڕینو جەنگو هەراو تالانو یەخسیر کردن بەرپا بوو چەند هەزارکەسی تیاکوژرا .

وەهەروەها کەلێ جەنگی خوێناویش ڕوویدا وەکو جەنگەکانی (فجار) . . وە لە ڕووی ڕامیاری و ئابووریو کۆمەلایەتی‌یەوە لەوپەڕی ناڕێکی و نالەبارێدا بوون و جێگای لاواندنەوەبون ئەگەر دلسۆزیان ببوایە » (١)

---

(١) « ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين » ٢٨ـ٦٢ چاپی شەشەم ، لەگەل کورت کردنەوەدا .

## ( بەشی چوارەم سەرەتای پێغەمبەرێتی )
## گۆشە نشینی محمد لە ئەشکەوتی ( حراء )دا :

باوبوو لەناو قورەیشا کە مرۆڤە خاوەن هۆش‌و بیرەکان هەموو ساڵێ ماوەیەك لەکاتیان تەرخان ئەکرو و لە شوێنێکی چۆڵا ئەژیان و پەرستنیان ئەکرد ، محمدیش - درودی لەسەربێ - ئەم باوەی بەهەلزانی بۆ ئەوەی بەدڵی خۆی بیربکاتەوە و سەرنج‌بداو وردبێتەوە ، وەئەم کاتە ناوازەیە لە خواپەرستی و کەیشتن بەئامانج لە ئەنجامی بیرکردنەوەدا بەسەربەرێ کە دەمێکە بەدڵ‌ودەرون‌و مێشکی پێوەی خەریکە ، تالە پاشە ڕۆژی ژیانیا لە سەری بڕوات .

وەبۆ ئەم مەبەسە گرنکەی ئەشکەوتێکی بەناوی ئەشکەوتی حەراوە هەڵبژارد لە کەژی ( نور ) لە سەراوردی مەکەوە - نزیکەی سێ میل لەمەکەوە دووربو - هەموساڵێ لە مانگی ڕەمەزانا توێشووی ئەبردو ئەچووە ئەو ئەشکەوتەوە ، کە تێشووەکەی تەواو ئەبوو ئەهاتەوە هەندێ تری‌ئەبردو ئەچووەوە ئەوێ تا ڕەمەزان تەواو ئەبوو ئەوسا ئەهاتەوە .

وەلەو ماوەی ئەومانگەدا خواپەرستی ئەکرد بەپێی ئایینی ئیبراهیم وەسەرەڕای خواپەرستی‌یەکەی لە جیهانی بیرکردنەوەدا ئەژیاو سەرنجی وردی دووربینی ئەداڵە پەڕاوە گەراوەکەی گێتی‌و بوونەوەر ، بیری ئەکردەوە لە هەموو بەش‌و پارچەکانی بەکیاندارو بێ‌گیان و خواروژوور و دوورو نزیکیانەوە ، بیری‌ئەکردەوە لەو یاسا شیرین‌و ناوازەو سەرسوڕهێنەرە نەگۆڕراوانەی ئەو خوایەی کە ئەم گێتی‌یە گەورەیەی بەستووە بەیەکەوە و بەشیرینی‌و بەجوانی‌و ڕێك‌وپێکی ئەیان‌با بەڕێوە .

هەرچەندە محمد - درودی لەسەربێ - گومانی‌نەبوو لە بوونی خوای پەروەردگارا وە لەسەر ئایینەکەی ئیبراهیم خوا پەرستی ئەکرد ، بەڵام چونکە لەو ئایینە هیچ شوێنەوارێکی دیاری نەمابوو ، وە عەرەبەکانیش هەموو بت پەرستبوون ئەویش کەوتبوە گێژاوی دەروونی‌یەوە و هەمیشە لە لێکدانەوەدابوو ئەی‌وت : بێ‌گومان ناگونجێ ئەم هەموو شتانانە بەوشێوە شیرینەیانەوە لەخۆیانەوە پەیابووبن ، وەیا ئەوبتە بێ‌گیانە رەق‌وتەقانە ئەبێ چی‌بن و چ نرخ‌و بەهایەکیان بێ ؟ چۆن ئەمانە مرۆڤ لە خواوە نزیك ئەکەنەوە ؟یا بۆ ئەبێ شەفاعەت و تکایان لێ‌وەربگیرێ ؟ بێ‌گومان ئەمانە هەموو درۆو ئەفسانەو سەرلێ‌تێکچوونن .

سەرنجی مرۆڤەکانی‌ئەدا کە هەموو گومڕاو سەرلێ‌شێواوون ، لەدڵی‌خۆیا ئەی‌وت : ئەو هەموو ناڕەوایی‌یەی ئەکرێ و ئەو هەموو زوڵم‌و زۆرەی لەیەکتری ئەکەن ، ئایا هەروا ئەڕواو کووم ئەبێ ؟ یالێ‌پرســـینەوەیەك هەیە ؟ کێ‌ئەم پرسیارە ئەکاوکەی و لەکوێ ئەبێ ؟ ئاخۆ کێ ئەم گروهی ئادەمیزادە لەم جەور و ستەمە ڕزگار ئەکار ئەیانکا بەیەك ؟ وەکەی و لەکوێ ئەبێ ؟ .

وەکە بیری لەوتەکانی گاورو جوولەکەکانیش ئەکردەوە ئەی بینی لە چەند هەنگاو وێکاونەبێ ئەوانیش شتێکی وایان لەبت پەرستەکانی خزمی خۆی زیاترنیەو ئەوانیش ڕاستنین‌و سەر لێ‌شێواون ، وە ئەبێ ڕاستی لە لایەکی‌ترەوەبێ .

هەربەم پێیە پێغەمبەری گەورەمان محمد - دروودی لەسەربێ - لەم بیرکردنەوەو ووت‌و وێژی‌یە دەرونی‌یەدا بوو هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵە ئنجا هەر لەو مانگەو لەو ئەشکەوتەدابوو کە خوای پەروەردگار

بە ( جبرائیل ئەمین ) دا پەیامی بۆ نـاردوبە چرای پێغەمبەریتی دل و دەرونی ڕۆشن کردەوە و کردی بەپێغەمبەری جیهانو بەکۆتایی زنجیرەی پێغەمبەران لەسەرزەویدا .

## دەس پێ کردنی نیگا ( وحی ) :

محمد ـ درودی لەسەربێ ـ لەسەرەتاوە کەوتە خەوبینین ، وەخەوەکانی وەکو ڕۆژی ڕوناك ڕاست دەرئەچوون ، وەبەهۆێ ئەو خەوانەوە بەتەواوی دڵو دەروونی وەك ئـاوێنەی بێ گەردی لێ هات ، وەبەکسـەر ڕووی دڵی کردە خواو ڕێگای ڕاســـت ، وەلەم کاتانەدا زیاتر ئارەزووی تەنیایی و کۆشەگیری ئەکـرد . هەتا ڕۆژی دوشەممەو لە حەڤدەهەمی ڕەمەزانا بەرێ کەوتی (٦ ـ ٨ ـ ٦١٠ ) ز کوتوپڕ پیاوێکی لێ پەیابوو پێی وت : « محمد مژدەبێ تۆ بووی بەپێغەمبەری خوا بۆ ســـەر ئادەمیزادو منیش جبرائیلم » .

خاتو عایشە ـ خوالێی ڕازی بێ ـ ئەڵێ :« لەسەرەتاوە نیگا (وحی)ی پێغەمبەریتی بەخەو بینین دەســـتی پێ کرد ، وەهەر خەوێکی ئەدی وەکو سپیدەی بەیانی ڕاست دەرئەچوو ، وە لەمەوە زیاتر تەنیایی بەلاوە شیرین بوو ، ئەچوو بەتەنیا لە ئەشکەوتی حەرادا خواپەرستی ئەکرد و چەند شەوێك ئەمایەوەو توێشوی لەگەڵ خویا ئەبرد ، کە توێشوەکەی تەواوئەبو ئەهاتەوە هەندێکی تری ئەبرد و ئەڕۆیشتەوە ، هەتا هەقو ڕاســـتێی و پێغەمبەریتی بۆ هات فریشتەیەك هـاتەلایی وپێی وت : بخوێنەرەوە . وتی من خوێندەوارنیم . پێغەمبەر ـ درووی لەسەربێ ـ ئەفەرموێ : کوشیمی بەخۆیەوە تانـاڕەحەت بوومو ئازارم پێ گەیی ، پاشـان بەریدام و وتی : بخوێنەرەوە . وتم خوێندەوارنیم ، بۆ جاری دووەم گوشیمی یەوە بەخۆیەوە

و زۆرتر ئازارم پێ کەیی و بەرەڵای کردمەوە و وتی : بخوێنەردوە . منیش وتمەوە : ئاخرخوێندەوارنیم . وە بۆ جاری سێیەم گوشیمی‌یەوە بەخۆیەوە و ئەمجار زۆر زیاتر ئێشم پێ کەیی و پاشان بەری‌دامەوە و وتی : بخوێنەرەوە و ئنجا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندمەوە : [ إِقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ، خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ ، إِقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ عَلَّمَ الإِنْسَانَ مَالَمْ يَعْلَمْ .(١)
وە پێغەمبەریش دووبارەی کردەوە .

پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - گەڕایەوە بۆ ماڵ و دڵی تەپەتەپی ئەکرد هەتا چووەوە لای خاتوخەدیجەی خێزانی و وتی : «دام پۆشن ، دام پۆشن» ئەوانیش دایان پۆشی هەتا ئەختێ ئارامی گرت و ترس و بیمەکەی لە دل دەرچوو ، ئەمجار ڕووی کردە خێزانە دڵسۆزەکەی و فەرمووی : «خەدیجە من چیم بەسەرهاتووە ؟» ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە ووتی : «لەخۆم ئەترسم» خەدیجە وتی : نەء مەترسە ، هیچ کاتی خوا تۆ تووشی خراپە ناکات چونکە تۆ سەرلە خزم و کەسـت ئەدەیت و یارمەتی‌یان ئەدەیت ، وە بە هاواری پەك کەوتووانەوە ئەچی و دەسـتی لێ قەومـاوان ئەگری و کۆمەکی نەبووەکان ئەکەیت و میوان داری ئەکەیت و پشت گیری لە حەق ئەکەیت .

ئەمجـار خەدیجە چو بۆلای وەرەقەی کـوڕی نەوفەل کە ئامۆزای بو و شـارەزای ئینجیلی عیسا پێغەمبەر بوو وەلـەوکاتەدا پیر و کویربوو بـوو وە محمدیشی لەگەڵا بو ، خەدیجە وتی ئامۆزای بەڕێزم گوێ بگرە لەم برازایەت بزانە چی بەسەر هـاتووە ؟ پێغەمبەریش - درودی لەسەربێ - بەسەر- هاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە . وەرەقەش وتی : ئەو پیاوە ئەو فریشتەیەیە کە مژدەی‌داوە بە پێغەمەرێتی پێغەمبەرەکان ، خۆزگە گەنج بوومایە و بمامایە لەوکاتەی خزمەکانت دەریان ئەکردی . پێغەمبەر - د . خ - فەرمووی :



(١) - آیە - ١ - الی - ٥ «

بۆچی دەرم ئەکەن ؟ وتی : بەڵێ ، هیچ پیـاوێك نەبووە پێغەمبەرێتی هێنابێ و دوژمنایەتی لەگەڵا نەکرابێ ، ئەگەر بگەمە ئەورۆژە یارمەتێکی گرنگت ئەدەم . بەڵام وەرەقە مرد و نیگایش وەستا » (١)

هەرلەوکاتەدا جبرائیل پێی‌وت : ئەی محمد تۆ پێغەمبەری خوای بۆسەر ئادەمیزاد و جنۆکە ، ئەبێ بانگیـان بکەی بۆ سەر ئاینی ئیسـلام و بۆ پەرستنی خوا بەتاك و تەنیا بۆ وتنی ووشـەی ( لَاإِلَهَ إِلَّا اللهُ ) واتە بێجگە لە خوا کەس شایەنی پەرستن نیەو نابێ بەندایەتی بۆ کەس بکرێ . ئەمجار دەستی گرت و بردی بۆسەر ئاوێك و خۆی دەستی کرد بەدەس نوێژ شورین و محمد سەرنجی ئەدایە هەتا فێربوو ئەویش دەسـنوێژی شـۆری ، جبرائیل پێش کەوت و محمد لەدوایەوە دووڕکات نوێژی بەکۆمەڵ (جماعت) یان کردو بەتەواوی فێری دەست نوێژو نوێژکردن بوو .

## وەستاندنی نیگا ( الوحی ) : ـ

محمد ـ د . خ ـ بۆی‌دەرکەوت و گومانی نەما کەوا بووە بەپێغەمبەرو ڕابەری هەموو مرۆڤ ، ئەبێ هەڵسێ بەڕوخاندنی قەڵای بت پەرسـتی و وکۆشکی پتەوی ئیسلامەتی دروست بکا ، ئەبێ ئەوبارە نالەبارە بگۆڕێ کە ئادەمیزادەکان گیریان خواردووەتیایا و ئاڵ و گۆڕێکی تەواوو کشتی بکا بەشێوەیەکی نوێ و لە قالبێکی تردا ، ئەبێ زۆر بیرلەمە بکاتەوە . . چۆنی بکا ؟ لەکێ و لەکوێوە دەسی پێ بکا ؟ خۆ ئیشی وا زۆرگرانە و لەتوانای ـ نەك مرۆڤێکا ـ ولاتێکیشانیە و ئەبێ چۆن سەرکەوێ ؟

ئەمانە بوبوونە ڕازی دڵ و دەروونی ئەو پیاوە ناوازەیە ، ئالەم کاتە ناسـکەدا خوای پەروەردکار خواهیشی وابوو ماوەیەك نیگا بوەستێنێ

---

(١) بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە

وە فریشتەش سەری لێنەدا هەتا زۆرتر شەوق و ئارەزوی تیاپەیدا ببێ و بێتاقەتی بکا .

بەڵێ پێغەمبەری خوا - د . خ - بەم سەرلێنەدان و وەســـتاندنی نیگایە زۆر بێتاقەت و نارەحەت بوو ! . لەلایەکەوە ، ئەزانێ بووە بە پێغەمبەر و ئەبێ شان بداتەبەر ئەوبارە گرانە . کەچی لە لایەکی ترەوە سەری لێنادەن و هیچ پەیك و پەیامێك نابینێ ، ئەوەندە پێی گران بوو ئەی ویست بچێتەســـەر شاخێك و خۆی بخاتە خوارەوە و لەم مەینەتی یە دەروونی یە رزگاری ببێ ، کەچی کوت و پڕ فریشتەکەی ئەوسا خۆی پیشان دا و پێی وت : ئەی محمد بەراستی تۆ پێغەمبەری راستەقینەی خوایت . بەو دڵنیا ئەبووو ئەکەرایەوە .

## هاتنەوەی نیگــا

ئەم ماوەیە کەمی خایان یا زۆر لەناکاو رۆژێ جبرەئیل هات و سوورەتی « والضحى »ی بۆهێنا ئەکێرنەوە لەکاتی وەستاندنی نیگادا بت پەرستەکان وتیان : محمد خواکەی لێی توورە بووەو وازی لێهێناوە . خوای گەورەیش بەم سوورەتە دڵنیای کرد وسوێـندی بۆخوارد کە خوا لێت تـورە نەبووەو وازی لێنەهێناوی و پاشە رۆژێکی باشترت هەیەو بەئارەزووی خـۆت خوا رازیت ئەکا ،

جابیری کوری عەبدولا لەباسی وەستاندنی نیگادا ئەڵێ : ( پێغەمبەری خوا - ددوودی لەسەربێ - فەرمووی : لەکاتێـــکا ئەرۆییشتم گوێم لە دەنگێکەوە بوو لەئاسمانەوە ، کەسەرم هەڵبری ئەبینم ئەوفریشتەیەیە کە لە ( حیرا ) دا هات بۆلام لەسەر کـورسی یەك لەنێوانی ئاسمان و زەویدا دانیشتووە ، منیش لەرزەم پێ کەوت و ترسام وگەرامەوە بـۆماڵەوەو وتم :

«زملونی زملونی» = واتە: دام پۆشن دام پۆشن . ئەوانیش دایان پۆشیم ، لەم کاتەدا خوای گەورە ئەم ئـــایەتەی نارد: ( یا المدثر قم فأنذر وربك فكبر وثيابك فطهر والرجز فاهجر ) سوورەتی ( المـدثر ) یانی: ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوەو خۆت داپۆشیوە هەڵسە ڕاپەڕە مەردم بترسێنە وەخوای پەروەردگارت بەگەورە بگرە ، وەبەرگ و کاڵات پاك بکـەرەوەو دووربکەوەرەوە لەهەموو خراپەیەك . وەئیتر پەیتا پەیتا نیگا هاتەخوارەوە(١)

## نیگـا = الوحی

نیگا = بریتی یە لەدەنگێکی نهێنی کەئەکاتە دڵی پێغەمبەران بەڕادەیەکی ئەوتۆ گومانیان نابێ لەڕاستێتیو لەوەی لەلایەنی خـواوەیـە . ( ترمذی ) ئەڵێ « پێغەمبەری خوا ـ درووودەی لەسەربێ ـ کەنیگای بۆئەهات لەلای ڕوویەوە دەنگێ ئەبیسترا وەك گیزەی هەنگ » وەزۆر جار نیگای بۆئەهات وەك زرەی زەنگ وابوو ، ئەمەیان زۆر بەسەختی وەرئەگیرا ، بەجۆرێـك ئەگەر بەسەر وشترەوە بوایە وشترەکەی ئەخست ویخی پێ ئەدا ، وەلەسارد ترین کاتا بوایە ناوچاوی ئارەقی پیـــا ئەهاتە خوارەوە ، وەهەندێ جار فریشتە لەشێوەی پیاوێکا ئەهاتو لەگەڵیـــا ئەدوا ، پێغەمبەر ـ د.خ ـ هەموویانی وەرئەگرت بێ کەم و زیاد (٢)

« جارێکیان نیگای بۆهات و لەوکاتەدا ڕانی کەوتە سەر ڕانی (زیدی) کوڕی ( ثابت ) ئەوەندە قورسایی کەوتە سەر زەید وەخت بوو بکەوێ بە زەویدا « (٣) . بەڵام دوژمنانی ئیسلام ـ بەتایبەتی خۆرهەڵات ناسەکان ـ لە دمرەوە وبەکرێ گیراوەکانیان لەناوەوە کەوتنە پڕوپاکەندە لەدژی ئیسلام

(١) بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە .

(٢) بوخاری لەعایشەوە ڕیوایەتی کردووە .

(٣) احمد و حاکم لەعایشەوە ڕیوایەتیان کردووە .

وپێغەمبەرەکەی ، ئەمەش زۆر ڕوونو ئاشکرایە لەبەر بەرزیو گەورەیی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی ناتوانرێ بەهیـــچ کلۆجێ ڕەخنەی لێبگیرێ ، ماوەی چواردە سەدەیە لەگەڵ زۆری دوژمندا ئەوەندەی نووکی دەرزییەك خراپەی لەهیچ ڕوویەکەوە تیا نەبینراوە ( چونکە تیایا نیە ) . وەلەلایەکی تریشەوە نایانەوێ دان بەڕاستێتی قورئاناو بەپـێغەمبەرێتی محمدا بنێـن . لەبەرئەمانە ناچار بوون هەندێ پەلەقاژەی ناڕەوا بکـەن لەئەنجامیش دا بووبەنیشانەی ئابڕوو چونیانو هیچیان لێنەبەستنەوە .

وەك ئەڵێن ئەوکاتەی نیگای بۆهاتووە فێ ( واتە پەرکەم ) ی لێهاتووە بەڵام سەیری درێژایی ژیانی محمد بکەی فێی بە هیـچ کلۆجـێ نەبووەو لێی نەبینراوە . دیسان عەقڵ پێمان ئەسەلمێنێ فێدار کەهاتەوە سەرخۆی ئاگای لەهیچ نامێنێو نازانێ چیبووەو چی ووتراوە ، خۆ محمد هەمـوو فەرموودەکانی لەبەربوو یەك وشـەی لێ تێك نەئەچوو .

یا ئەوە ئەڵێن : محمد بەژیریو هەڵکەوتوویی خۆی ( واتە بەعەقڵی ئەزێنی ) بۆی دەرکەوت کەخزمەکانی وان لەسەر بارێکی ناڕێكو ئەوعەقڵە ئەزێنییەی شتی پیشان ئەداو وای ئەزانی فریشتەیە .

یا ئەوە ئەڵێن : لەئایینی کاورو جوولەکەکانەوە شـتی وەرئەگرتو ئەی کرد بەپەیامی خۆی . وەزۆری تریش لەم بابەتە بێسەرو بەرانە .

وە ئێمە بەبێ خۆ ڕەنجاندن ئەمانە بەدرۆ ئەخەینەوە : چونکـە محمد ئەگەر عەقڵو ژیری خۆی بوایە یا لەئایینەکانەوە وەری بگرتایە بۆچی ئەو شتانەی ئەکرد کەببێتە هۆی ڕەخنەی خوا لێی . وەك لەکاتی عەبدوڵای کوڕی ( ام مکتوم ) یا بەرەڵاکردنی دیلەکانی بەدریا .. هتد .

با هەواڵی پاشە ڕۆژی زۆرو زەبەندەی ووتووە کەپەیتا پەیتا دیتە دی

ودەرئەکەوونو گاورو جوولەکەکان خۆیان نەیان زانیون ، وەلەزۆر ئایەتا باسی ئەوە ئەکا کەمحمد غەیب نازانێو نەی زانیۆە .

وەزۆر شق وای تیایە لەهیچ لەپەڕاوە ئاسمانییەکانی ترا نـین وکەس نەی زانیون ، وەشێوەی ڕەوان بێژیو داڕشتنی وشـەو ڕستەکانی قورئـان تا ئێستە کەس پەی پێ نەبروون ، وەلـەگەڵ وتەکانی تری محمدا کەپێیان ئەڵێن : فەرموودە ( حدیث ) زۆر لێك جیاوازن . وەزۆرو زەبەنەی تر کەلێرەدا جێگایان نابێتەوە . (١)

## دەس پێ کردنی بانگ بەنهێنی

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ لەپاش ئەوبانگـــە خواییە هەڵسایە سەرپێو بۆماوەی بیستو سێ سال تێ کۆشاو خۆی ڕەنجان و دانەنیشـتو وتی بەخاتو خەدیجەی خێزانی : « خەدیجە جێگاکە هەڵ بکرە کاتی ڕەحەتیو حەوانەوە بەسەرچوو » . جبرەئیل یەکەم شتێ کە پیشانی محمدی دا نوێژکردن بوو ، چونکە بەهۆی نوێژەوە بـەتەواوی دڵو گیـانی پێغەمبەر ـ د . خ ـ پەیوەندیو وابەستەیی بـە خوای پەروەردگارەوە پەیـا کردو دڵنیایی دەست کەوت ، بۆیە هەرکەناڕەحەتییەکی تووش ئەهـات گورج پەلاماری نوێژکردنی ئەدا ، وەئەی فەرموو : چاوم بە نوێژ کـردن ڕوون ئەبێتەوە .

یەکەم کەس کەهاتە سەر ئایینە تازەکەی محمد لەژنانا خاتو خەدیجەی ژنی بوو ، وەلەگەڵیا دەستی کرد بەنوێژکردن .

---

(١) بۆئەم باسە بڕۆ بۆ (تەفسیری خال) بەرگی یەکەم ٦٨ـ٨٣ . وەبـۆ پەڕاوی ( الوحی المحمدی ) ل ١٠٢ـ١١١

# ئیسلام بوونی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

ساڵێکی گرانیو نەهاتی ڕوویدا ، ئەبوتالیب خێزانی زۆرودارایییەکی کەمی بوو ، محمد وتی بەعەباسی مامی ( کەدەوڵەمەند ترینکەسی بەنی هاشمی بوو ) : ئەبوتالیبی براتو مامی من خێزانی زۆری هەیە وەك ئەبینی خەڵك بەگیرهاتون ، بـا کەمێ باری شانی سووك بکەین و یەکی منالێکی بکرینە لای خۆمان ، بۆی بەخێوبکەین . عەباس جەعفەری بردە لایخۆی وعمدیش عەلی هێنایەلای خۆی ، وەبەم بۆنەیەوە عەلی لە مـالی پێغەمبەرا ژیا ، تا کاتی پێغەمبەریتی هات بۆ محمد ، عەلی کە تەمەنی لە هەشت ســالیدابوو ، ڕۆژێك لەناکاو چوە مـالەوە و بینی واپێغەمبەرو خەدیجە نوێژ ئەکەنو سوژدەئەبەنو ئەوئایەتانەی قورئان ئەخوێنن کە هاتۆتەخوارەوە ، بەسەر سامییەوە وەستا تالێبونەوە ، پـاشان پرسی : ئەوە سـوژدە بۆکێ ئەبەن ؟ پێغەمبەریش - د . خ - فەرمووی : سوژدەئەبەین بـۆ ئەو خوا تاکوتەنیایەی کردومی بە پێغەمبەری خۆیو فەرمانی پیاداوم خەڵکی بانك بکەم بۆ پەرستنی . ئنجـا داوای کرد لە عەلی کە بـاوەڕ بەخوای تاکوتەنیا بێنێ و بتەکان بە پروپوچ سەیربکاو بێتە سـەر ئایینی ئیسـلامی پیرۆز ، وتارە شیرینەکەی پێغەمبەر - درودی لەسەربێ - تینێکی گەورەی کردەسەر دەرونێ خاوێنی و دلی نەرم بوو ، بەڵام داوای لێکرد کەئەوەندە مۆلەتیبدا تاڕاوێژێ بە ئەبو تالیبی باوکی ئەکا . پێغەمبەر - د . خ - فەرمووی : ئەگەر موســلمان نابی ئەمڕازە لایکەس باس مەکە ، عەلی بەگوێیکرد و ئەوشەوە لە دلی خۆیدا هەرلێکیدایەوە ، لە ئەنجاما خوای گەورەخستیە سەرڕێگەی ڕاست و بەیانی هاتەلای پێغەمبەرو وتی : خوا مني دروست کردوە بێئەوەی ڕاوێژبکا بەئەبو تالیب ، وەمنیش بۆ پەرستنی

ئەوخوایە پێویستم بەڕاوێژی ئەبوتالیب نیەو موسڵمان بوو .

ڕۆژێ ئەبوتالیب هات بەسەریانا لە ( نەخلە ) دا نوێژیان ئەکرد ، پرسی لە پێغەمبەر ئەم ئایینو پەرستنە چیە کەوا بەجێی دێنن ؟ پێغەمبەر - د . خ - فەرموی : ئەمە ئایینی خواو فریشتەکانی خواو ئایینی ئیبراهیمی باپیروگەورەمانە ، خوای پەروەردگار منی کردوە بەپێغەمبەری خۆی بۆسەر بەندەکانی ، ئەی مامی خۆم تۆ لە هەمووکەس شایان تری بەوە کەدڵسۆزیت بۆبکەم و بانگت بکەم بۆسەر ئیسلامەتی ، وەتۆ زیاتر لە هەمووکەس شایانی بەوە کە وەڵامم بدەیتەوە و باوەڕبهێنی و موسڵمان ببیو کۆمەکیم بکەی لەسەر ئەم کارە . ئەبوتالیب وتی : ئەوەی ڕاستبێ ناتوانم واز لە ئایینی باوو باپیرم بێنم و لە باری ئەوان لابدەم . هەرچەندە لەبەر ڕاستیو ئەمینی تۆ باوەڕم هەیە کە ئەوەی بانگی بۆ ئەکەیت ڕاستە ، وە بەو خوایەش تامـاووم یارمەتیت ئەدەم ە نایەڵم تووشی خراپە بێیت . وە لای کردەوە بۆلای عەلی کوڕی و وتی : بزانە بۆسەر شتێکی خێر و چاك بانگی کردوی وازی لێمەیەنە .

وەهەرلەم سەرەتاوە زەیدی کوڕی (حارث) ە - کە بەندەی ئازادکراوی خۆێ بوو لەناویانا ئەژیاو بەپێی یاسای قورەیـش بەزەیدی کوڕی محمد ئەناسرا - موسڵمانبوو ، وە بەمپێیە خێزانەکەی هەموو موسڵمان بوون .

## موسڵمان بوونی ئەبوبەکر :

پێغەمبەری مەزن - د . خ - کەوتە بیرکردنەوە لەوە چۆن قورەیشەکان بانك بکاو بۆسەر ئەم ئایینە تازەیە ، خۆخۆی ئەزانێ چەند سوورن لەسەر بت پەرستی و چۆن دەسیان پێچاوە بەئایینی باووباپیرانیانو بەبتەکانیانەوە !!.

ئەبو بەکری (١) کوڕی ئەبو قحافە دۆستێکی خۆشەویست و ڕاستەقینەی بوو ، وەپیاوێکی زاناو ژیروتێگەیشتوو بوو ، وەلەبەرئەو ڕەوشتە جوانانەی محمد تیایا بەدی کردبوو یەکەم کەسێ بوو کە بانگی کرد بۆسەر ئایینی ئیسلام و پێڕاگەیان : کەخوا کردویەتی بە پێغەمبەرو نیگای بۆ هاتووە داوای لێکراوە بانگی مەردم بکا بۆخوا پەرستن و وازهێنان لەبت پەرستی . ئەبوبەکر لەبەرئەوەی لەدرێژایی تەمەن و هاوارێیەتی یانا درۆو پێچ وپەنا و ناڕاستی لێ نەدیبوو ئەیزانی شایانی ئەوەیە بکرێ بەپێغەمبەرو مەشخەڵی ئازادی بدرێتە دەس ، بەخێرایی و بێ خۆڕاگرتن باوەڕی پێکردو وتی : باوك و دایکم فیدات بێ ڕاستە کەی و تۆ ڕاست گۆیت « أشهد ألا إله إلا الله وأنك رسول الله » وەموسلمان بوو .

پێغەمبەر - درودی لەسەربێ - ئەیفەرمو : « هەرکەسم بانگ کردبێ بۆ ئیسلام بوون خۆگرتنێکی بووە تەنیا ئەبوبەکرنەبێ کەبانگم کرد هات بەدەنگمەوە » .

بێگومان بەئیسلام بوونێ ئەبوبەکر دڵ و دەروونی پێغەمبەر خۆش بوو وکەشەی پێکەوت ، خۆ ئەبوبەکر پیاوێکی گەورەیەو جێگای ڕێزوباوەڕو متمانەبوو لەناو خزمەکانیاو لەناو هەموو قورەیشا ، وەپیاوێکی دەوڵەمەندو بازرگان و ڕەووشت جوان و زاناو بەتام بوو شارەزای نەژاد بوو ئەیزانی چاکەو خراپەیان ، وەهەموو پیاوێك حەزی لەهاوڕێی و هات و چۆ کردنی ئەکرد ، بێگومان خشتێکی بەکەڵك بوو لەبناغەی قەڵای ئیسلامەتی دا .

(١) ئەبو بەکری کوڕی عثمانی کوڕی عامیری کوڕی عەمری سەعدی کوڕی تەیمی کوڕی کەعبی کوڕی لۆیە ، دایکی ناوی أم الخیر سەلمای کچی (صخر) و ئامۆزی ئەبو قحافەبوو ، ئەبوبەکر لە ( ٥٧٢ ) ز لەدایك بووە .

# دەوری ئەبوبەکر لەسەرەتای ئیسلاما

پێغەمبەری خوا ـ د.خ ـ کەوتە پەروەرش کـردنی ئەبووبەکرو ئاراستەی ئەکردو قورئانی بۆئەخوێنـدەوەو پێویستی‌یـەکانی تێ‌ئەگەیاند ، ئەبوبەکر تێ‌گەیشت کەمرۆڤ بەوە ڕزگار نابێ کەخـۆی موسلمان بێ‌و پەرستنە تایبەتی‌یەکانی بەجێ بێنێ‌و بەس ، بەڵـکو ئەبێ بەگوێرەی توانایی هەوڵ بدا بۆبڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام .

بەپێچەوانەی زۆر لەموسڵمانەکانی ئەم‌دەمەی ئێستەی ئێمە کەوائەزانن ئیسلامەتی بریتی‌یە لەوە نوێژ بکەیت‌و بەس ، ئیـــتر سەرو ڕووی خۆت دابخەیت‌و کەس نەت بینێ باسی خواو ئیسلام بکەیت ، بەڵکو زۆریـان هەیە ئەم خۆشاردنەوەیە بەجێگای شانازی دائەنێن .

ئەبوبەکر ـ خوا لێی ڕازی‌بێ ـ ڕاو باوەری وانەبوو ، بۆیە بەخێرایی ڕۆیی بۆلای ئەوهاوەڵانەی بەلایەوە جێگای هیواو متمانە بوون ولەژیری و دانایی‌یان ڕازی بوو ، کەوتە بانگ کـــردنیـان لەوانەی لەسەر دەستی ئەبوبەکرا موسڵمان بوون : عثمانی کوڕی عفان‌و زبیری کـوڕی عوام‌و عبدالرحمانی کوڕی عوف‌و سعدی کوڕی أبی وقاص‌و طلحەی کوڕی عبیداللەی ئەبوبەکر هێنانی بۆلای پێغەمبەرو بەتەواوی موسڵمان بوون‌و نوێژیان کرد لەگەڵیانا .

وەهەر لەوحەلەدا أبوعبیدەی کوڕی جراح‌و عبیدی کوڕی (حارث)ی کوڕی (عبدالمطلب) وأبوسلمە (عبداللەی کوڕی عبدالاسد) وأرقمی کوڕی أبی الأرقم‌و عثمانی کوڕی مظعون‌و قدامەو عبداللەی برای‌و سعیدی کوڕی زەیدو فاطمەی کچی وهبی خێزانی‌و أسمائەی کچی ئەبوبەکرو خاتوو عایشەی کچیشی‌و ضبابی کوڕی أرت‌و عمیری کوڕی أبی وقاص‌و عبداللەی کوڕی

مسعودو مسعودی کوڕی قاریو جعفری کوڕی أبیطالبو أبوذری غفاری وصهیبی ڕۆمیو عماری کوڕی یاسیرو یاسیری باوکیو مسمیەی دایکیو ( أم أیمن ) کەنیزەکی باوکی پێغەمبەرو کچەکانی پێغەمبەرو کەلێکی تریش(١) وەهەرکەسێ موسلمان ئەبوو بەدزییەوە ئەچوە لای پێغەمبەرو پەیمانی لێ وەرئەگرت کەبەهەموو توانایەوە سەربازی ئیسلام بێو بەهیچ کلۆجێ دەس بەرداری نەبێ ، وەدەستووری تەواوی لێوەرئەگرت . وە لەبەرئەوەی پێغەمبەرو موسلمانەکانی تریش ڕادەی دەمارگیرێتی قورەیش بۆ بتو بت پەرستییان ئەزانی بەدزیو نهێنییەوە ئەچون لەدۆلو شیوو چۆلاییەکانا نوێژو خوا پەرستییان ئەکرد ، وەبەنهێنیو پەنامەکی بانگی خەلکیان ئەکرد بۆسەر ئیسلام .

## نهێنی بانگ

شێوەی نهێنیو پەنامەکی بۆهەر بانگو هەربیرو باوەڕێ کەبیەوێ سەر بکەوی و پەرەبسێنێ و بکاتە ناوجەرگەی جەماهیرو کۆمەل ـ شتێکی سروشتییە ، بەلکو تاقانە ڕێگەی سەرکەوتن و گەشەکردنە ، بۆئەوەی پەلو پۆلیداو بال بهاوێژێ و ئەوەندە هێزوتین پەیابکا بتوانێ بەربەرەکانی دوژمنانی بکاو خۆی لەناو کۆڕا بچەسپێنی و بتوانێ سنگ دەرپەڕێنێ ، چونکە ئەگەر لە ڕێوە بە ئاشکرایی پەیدا بوو ئەوە بەگورجی ناحەزودوژمنی بۆ پەیدا ئەبێ ، کە هیچی ترنەبێ ئەو دوژمنانەی ئەکەونەی دواندن لە دژی و پەردەی پۆلایین لەنێوانی ئەو مەردمانەدا ( کەماددەی خاون و بانگە کە ئەیەوێ ڕوویان تێبکا ) دروست ئەکەن و ڕێگەنادەن

(١) بۆزانینی ناوو نەژادەیان سەر لە پەڕاوی ( سیرەتی ابن هشام ) بدە ل : ( ٢٦٧ ـ ٢٨٠ ) بەرگی یەکەم

بانگەکە یان بکاتێ . بۆیە فەرمانی خوای پەروەردگار وابوو . کە پێغەمبەری مەزن ـ درودی لەسەربێ ـ بە نهێنی بـانگەکەی بڵاوبکاتەوە . وە ئەمە سروشتی خوایە لە سەرزەویدا [ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللهِ تَبْدِيلاً ] .

## شیاوی بانگ و بانگ کەر :

ئایینی وەکو ئیسلام و دەستوری وەکو قورئان شایانەکە ببێتە دەستورو بەرنامەی مرۆڤایەتی هەتا هەتایە لە هەرڕوو هەرلایەکەوە سەیری بکەیت و لێی بکۆڵێتەوە ، بێ‌گومان ئەبێ وابێ چونکە بەرنامەیەکی خواییە بۆ ئادەمیزاد لەسەر زەویدا .

پیاوێکی وەکو محمد ـ د . خ ـ شایانە کەببێتە پێغەمبەری خواو بانگی ئیسلامەتی لەسەر دەسیا بەزویی بڵاوبکاو پەرەبسێنێ ، چونکە لـە هەمو ڕووشێوەیەکەوە بەرزترین ڕەوشت و جوانترین خووشیرینترین ڕەفتاری هەبوو ، زۆر دڵسۆزو دڵکەرمو بەشەوق و ئارەزوو بوو ، وە هەموو سیفەتێکی پێشەوایی و مامۆستایی لەبەرزترین دیمەندا تیا ئەدرەوشایەوە ، وە زۆر بەوردیو حەکیمانە پەروەرشی کیانو دڵ و دەروونی موسڵمانەکان و شوێن کەوتوەکانی ئەکرد و باوەڕو ئیسلامەتی بە پتەوی لە دڵیانـا ئەڕواند ، قورئانی بۆئەخوێندن و بۆی باس ئەکردن و سەرنجی ڕائەکێشان و هەستی ئەبزوانن بۆ بیرکردنەوە لە ئاسمان و زەوی و کیاندارو بێ‌کیانەکانی کێتی و لـەم ڕووەوە بۆی ڕۆشن ئەکردنەوە کەخوای پەروەردگارو بەدەسەڵات پێویستـە بپەرسترێ وەئەبێ بەندایەتی تەنیا بۆ ئەوبکرێ . وەبەم پێیە موسڵمانەکان بەڕاستی موسڵمان ئەبوون و باوەڕێکی پتەوی ئەوتۆیان تیـا پەیدا ئەبوو جیهان لە چاویا سووك و بێ‌بایەخ بێ و بەهیچ‌شتێ و بەهیچ نرخێ نەیان ئەگۆڕی‌یەوە لەڕێیا هەموو ئـازارو چەوساندنەوەیەکیان قبوڵ

ئەکرد بەجۆرێك هەرکەس موسـولمان ئەبوو هێزنەبوو بتوانێ پەشیمانی بکاتەوە .

## قورئانی مەکە :

پێغەمبەری خوا محمد - درودی لەسەربێ - دەسی کرد بە ڕاگەیاندنی پەیامەکەی بەمەردما بەبێ خۆکرتن یاسستیو کەمتەرخەمی ، بەڵکو بەوپەڕی تێکۆشان و دڵسۆزی یەوە ئەکەڕا بۆ هەل و هەڵکەوتو بـانگی ئەکردن بۆلای خوای تاك و تەنیا و پەروەردگار ، وە لەبێ کەڵکیو بێسەروبەری بتەکانیان ئەدواو بـاسی خواو ئیسلامەتی بەڕۆشنی بـۆ ئەکردن ، وەکرێ کوێرەی دڵو مێشکیـانی ئەکردەوە و ژیری یـانی ئەبزوان و ئەی خستنە ئیشەوە ، وەسوورەتە پیرۆزەکانی قورئان کە لە سەردەمی (مەکە) دا ئەهاتنە خوارەوە بەزۆری ئەم بابەتـانەی خوارەوەیان شەرح ئەکردو ڕۆشنیان ئەکردنەوە :

## ١ - تەنیایی خوای پەروەردگار :

مرۆڤ نابێ بەندەیی بۆهیچ شتێك و هیچ بەشو پارچەیەکی سەرزەوی یاناسمانی بکا ، چونکە ئەوانەو وێنەیان بێدەسەڵاتو دروست کراون ، وەخوا هیچ جۆرە هاوبەشو هاوسەرو هاوەڵو هاو دەمی نیەو کەس ناتوانێ بکەوێتە نێوانی خواو مرۆڤەکانەوە و خۆی بکابە کۆلکەخوایەك لێیان ، وە هەموو کەسێ ئەتوانێ و بۆی هەیە خۆی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لـەکەڵ خوادا پەیدابکات . وەبەم هەنکاوە کرنکە باوەڕیانی پتەو قاییم کرد .

وەهەروەها ئەو پـاپاو قەشەو ڕوهبـانانەش کە کاورەکان لە ناوەندی خۆیانو خوادا دایان ئەنان بەکەیەننە ڕوێو نزیك خەرەوە لە خوایان دائەنان و چەکی لێخۆشتبوون یـاکلیلی بەهەشتیان ئەدانێ - ئەمـانیش

ڕۆیشتن و گۆڕکران . موسڵمانان ئەبێ یەکسەر هەرکەسە خۆی وابەستەی بەخوای خۆیەوەبێو بەس .

بەم جۆرە بەردی بناغەی یەکێتیو بڕوا بەتەنیایی خوا لە هەمسوو ڕوو هەموو کارو ئیشێکا لەئیسلاما دامەزرا ئەمەیش بوە هۆی سەربەستی مێشك ودڵو دەروونو ژیری بۆبیرکردنەوەو سەرنج دانو لێکدانەوە ، وەپەیتا پەیتا ئایەتەکانی قورئان داوای ئەم مەبەسەو ئەم سەربەستیو ئەم جۆرە بیرکردنەـ وەیەی لێ کردن . وەبەم هەنگاوە گرنگە یەکەم هەنگاو نرا لەڕێی یەکێتی وبرایەتیو خۆنەویستن .

## ٢ ـ باسی ڕۆژی دوایی

ژیانو تەمەنی مرۆڤ بریتی نیە ـ تەنیا ـ لەم چەند ڕۆژە کورتەی ژیانی جیهانیە کەبەمردن کۆتایی پێ دێت ، بەڵکوو ڕۆژی دواییو جیهانێکی فراوانی بەربڵاوی تر هەیە کەبەمردن دەوکاکەی ئەکرێتەوە وەلەو ڕۆژەدا مرۆڤ ـ هەموویان بەکشتی ـ ئەچنەوە خزمەتی خوای خۆیانو پرسیاریان لێ ئەکا ، یەکە یەکە لەهەموو کارو کردەوەیەکیان ، وبەوپێیە بەچاکەیان خراپە پاداشیان ئەداتەوە ، ( فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ ) . وەلەپاش ئەوە جێگای هەرکەسەیان یا بەهەشـتی بەرینی نەبڕاوەیە کەئیتر هەتا هەتایە ناخۆشی تیـــا نیەو نایبینێ ، وەیا دۆزەخی سەختی پڕ لەئێشو ئازارە .

مرۆی موسڵمان باوەڕی بەوڕۆژو کاتە هەیەو بەماڵو جێـگای خۆی ئەزانێ ، ئیتر ئەم ژیانو جیهانەی بەلاوە سـووك ئەبێو بەڵکو بـە بەندی خانەی ئەزانێ و تەنیا ئەوەی بەلاوە بـــاشە کەکردەوەی چاکەی تیا بکاو ئازوخەی زۆر دەست خۆی بخا . وەئەم باوەڕو لێکدانەوەیە ئەبێتە هۆی

بڵاوبوونەوەی مانای بەرزی مرۆڤایەتیو سۆزو دڵسۆزیو دادو ڕاستێتی لەناو مرۆڤەکانا ، وەخراپەو خراپکاریو ئەوشتانەی ئەبنە هۆی سزاو ئازاری ئەوڕۆژە لەناویانا نامێنێ ، وەئیتر بەندایەتی تەنیا بۆخوای پەروەردگار ئەکرێو بەس . وە ئاسایشی ڕاستەقینە بڵاوئەبێتەوە بەزەویدا .

## ٣ - پاك کردنەوەی دڵو دەروون

قورئان لەماوەی مەکەدا زۆر تەدوا لەوشتانەی تێن ئەکەنە سەرئادەمیزاد بۆخاوێن کردنو پاك کردنەوەو پاڵفتە کردنی دڵو دەروونو لاشەی . وە موسڵمانەکانیش بەگەرمی ئەچون بەدەمیانەوەو بەجوانی جێ بەجێیان ئەکردن . پەرستنو بەندایەتییەکانیان بەجێ ئەهێناو هەڵ ئەسان بەکردنی ئەوشتانەی قورئان بەخێرو چاکەیان دائەنێ ، وەخۆیان دوور ئەخستەوە لە هەرچی شتێ قورئان بەخراپەو ناڕەوای دائەنا ، وەهەرچی قورئانو فەرموودەیان ئەبیست وەکوو ( ڕەچەتە ) ی پزیشکێکی باوەڕ پێ کراو لە پێش چاوی خۆیان دایان ئەناو پەیڕەوییان ئەکردو پێی هەڵ ئەسان .

پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر - دروودی لەسەربێ - ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا قورئانم پێ بڵێ ، پێغەمبەریش سوورەتی ( زلزال ) ی لەقورئانی گەورە بۆخوێندەوە هەتا گەیشتە (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ ) کابرا ووتی : قوربان بەسمە ، خۆ هەموو کردەوەیەك چاکە یاخراپە یا زۆر بچووکیش بێ لێکۆڵینەوەو پاداشی هەیە . فەرمووی : بەڵێ ، ووتی : دەئیتر بەسمە .

## ٤ - پاراستنی قەوارەی کۆمەڵایەتی

یەکێ تر لەوشتانەی قورئانی مەکە لەسەری ئەڕۆییو باسی لێ ئەکرد ، پاراستنی قەوارەی کۆمەڵی موسڵمانانو بەیەك دانانیو دامەزراندنی لەسەر

بناغەی برایەتیو یەکێتیو هاوکاریو خۆشەویستی بوو .

بێ‌گومان ئەمەیش سەرنەکێشێ بۆخۆ نەویستنو یارمەتی زۆر لێ‌کراوو دەس‌گیرۆیی هەژارو بەهێزکردنی لاوازو پشتگیری کردنی یەکتری ، بۆ نموونە : ئەوەبوو ئەبوبەکری صدیق ـ خوا لێی ڕازی‌بێ ـ هەربەندەیەکی موسلمانی بدیبایـە ئازار ئەدرا خێرا ئەی‌کڕیو ئازادی ئەکـردو ئەمەی بەهەقی کۆمەڵ لەسەر ئەندامەکان دائەنا .

## قورەیش‌و موسڵمانەکان

دەنگ‌و باسی پێغەمبەرێتی محمدو ئایینە تازەکەی وورده وورده بڵاوەی ئەکرد بەناو قورەیشاو باس ئەکرا . بەڵام لەسەرەتاوە گـوێیان نەدایەو وایان ئەزانی کەئەم ئایینو باسو خواسەی محمدیش ـ درووەدی لەسەربێـ وەکو ووتەکانی پیاوە خوا پەرستەکانی تریان وایە ، کەماوەیـەك ئەدوانو دوایی ماندوو ئەبوونو کەس نەئەچو بەدەمیانەوە ، وەلایان وابـوو پـاش ماوەیەك بتەکانیان زاڵ ئەبن بەسەریاو دەنگ‌وباسەکەی ئەمیش ئەکوژێتەوە ، بۆیە ئەوەندە بەگرنگ نەیان ئەکرت ، بەڵام تا پێی ئەچو گەرمـتر ئەبوو هەندێ مەترسی‌یان لێ‌نیشتو بیمیان پەیدا کـرد ، وەئەیان ویـست لێی ئاگاداربنو بزانن بەچی ئەکا . وەلەبەرئەوەی بەلایانەوە شورەیی بوو واز هێنانیان لەئایینەکەی باوو باپیریان وئەترسان لەم ڕووەوە زیانیان پێ بگاو پلەو پایەی ناوکۆمەڵیان لەدەس بچێ ، هەرکامیـان دەس‌و پێوەندیان موسڵمان ئەبوو ئەکەوتنە سزادانیانو هەولیان ئەدا پەشیمانیان بکەنەوە . بۆ نموونە :

١ ـ عثمانی کوڕی عفان ، کاتێ موسڵمان بوو تەمەنی نزیکەی سی(٣٠) ساڵ بوو ، کەحەکەمی مامی پێی زانی لێی تووڕەبوو کەوتە ئازاردانی.

هەردوو باڵی بەستو ووتی : واز لەئایینی باوو باپیرت دێنی ؟ بەخوا نات کەمەوە تاواز لەم ئایینە تازەیە نەهێنی ، عثمان ووتی : بەخـــوا پەشیمان نابمەوە و هەتا هەتایە واز لەئیسلامەتی ناهێنم . کەمامی زانی بێ سوودە بەرەڵای کردو لێی گەڕا .

٢ ـ زبێری کوڕی عوام کەدایکی ( صفیە ) ی کچـی ( عبدالمطلب ) بوو ، کەموسلمان بوو تەمەنی لەدەوری (١٥) ساڵیدابوو ، مامـی کەوتە سزادانی بۆئەوەی پەشیمانی بکاتەوە . لەناوحەسیرا لوولەی ئەکردو هەڵی ئەواسیو لەژێرەوە بەدووکەڵ قانگیان ئەدا بۆئەوەی یا بخنکێ یـا واز لە ئیسلامەتی بێنێ ، بەڵام ئەو هەتا پێی ئەچو سوورتر ئەبوو لەئیسلاما .

٣ ـ سعدی کوڕی أبی وقاص لەتیرەی بەنی زوهرەی قورەیشی ، لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا موسلمان بوو ، کەدایکی ( حمنەی کچی أبی‌سفیان ) پێی زانی ووتی : بێستوومە شێت بویتو چویتە سەرئایینەکەی محمد ، بەخوا سێبەری خانوو ناکەوێتە سەرمو لەگەرماو سەرما نام پارێزی ، وەخواردنو خواردنەوەم لێ‌حەرام بێ‌هەتا پەشیمان نەبێتەوە . سێ‌ڕۆژ بەم پێیە مایەوە ، سەعد لەتاوا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ شکاتی دایکی‌لاکرد ، وەلەوکاتەدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ( وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ، وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ، وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ] سوورەتی لقمان:آیە١٥

واتە : ئامۆژگاری ئادەمیزادمانکرد بەچاکە کردن لەگەڵ باوك ودایکیا ، دایکی بەچەرمی سك هەڵی‌ئەگرێو زۆر ئێشو ئازاری توش ئەبێ ، وەتا

ماوەی دووسال شیری ئەداتێو نارەحەت ئەبێ پێوەی، وە داوامان لێ کرد سوپاسی خواو باوکو دایکی بکا، ئەگەر زۆریـان لێ کردی و ئەیانویسـت بت کەنەوە بە بت پەرست و هاوەڵ دابنێ بۆخوا - مادەم ئەزانی ڕاست نیە - بەگوێیان مەکە، بەڵام بەجوانیو چاکی لەگەڵیانـا بجوڵێردوە لە ئیش‌وکاری جیهانا، وبکەوەرەسەر ڕێگەی ئەوانەی ئەگەڕێنەوە بۆلای من و من ئەپەرستن، وەپـاشان یەنەوە بـۆلای خۆمو هەواڵتـان ئەدەمێ لەو کردەوانەی کردووتانە.

ئەمجار سەعد چوەوە لای دایکیو پێیوت: دایکی خۆم بزانە ولێت ڕوون بێ: بەخوا ئەگەر سەد گیانت لەبەرابێو یەکەیەکە هەموویان بێنە دەرەوە لەسەرئەوەی واز لەئایینەکەم بێنمو کافربم بەگوێت‌ناکەم و وازی لێ نایەنم، جائێتر ئەگەر ئارەزووت هەیە بخۆو بخۆرەوەو بچۆرەوە ماڵ وەئەگەر ئارەزوت‌نیە لەسەر ئەم مان‌گرتنەت بەردەوام‌بە. دایکی کە زانی بێ‌سوودە واز نایەنێ مان‌گرتنەکەی شکان.

٤ — خالیدی کوڕی سعیدی کوڕی عاصی کوڕی أمیه. باوکی لە گەورەکانی قورەیش بوو زۆر بەڕێز بوو لەنایـــانا، کە باوکی زانی بە ئیسـلام بوونی کوڕەکەی، ڕقی هەڵسـاو کەوتە ئازاردانی و خواردنی لێ قەدەغە کرد، ئەویش چوە خزمەتی پێغەمبەرو لە خزمەتیا ئەژیاو لەوێ خواردنی ئەخواردو لەدەوروبەری مەکەدا خۆی لە باوکی ئەشاردەوە.

وە زۆرکەسی‌تریش بەم پێیە لەدەس کەس‌وکاریانەوە ئیش‌و ئازاریان چەشت - وەکولەمەودوا هەندێکی لێ ئەدوێین - بەڵام لەگەڵ ئەمانەیشا بە شێوەیەکی ئاشکرا نەکەوتبوونە دوژمنایەتی کردنی ئایینو خاوەن ئایینەکان. موسلمانەکان بەدزیەوە ئەچونە شـیووو دۆڵە چۆڵەکانی دەوروبەری مەکە و

نوێژو خواپەرستی‌یان ئەکرد ، تارۆژێ هەندێ لە قورەیشەکان چون بەسەریانا نوێژیان ئەکرد ، دەسیان‌کردە گاڵتەپێ کردنیان و ئەوانیش خۆیان پێ نەگیراو وەڵامیان دانەوە ، وە جەنگو هەرا لەنێوانیانا بەرپابوو ، سعدی کوری أبی وقاص پەلاماری کەللەی وشترێکی‌دا کە لەوێدا کەوتبوو بە هەموو هێزی‌یەوە دای بەدەم و چاوی کافرێکیانا خوێن فیشقەی کرد . ئەمە یەکەم خوێنێ‌بو لە ئیسلاما ڕژێنرا ، پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - ویستی مرسلمانەکان لەو گیروگرفتانە دوربخاتەوە بۆ ئەوە بریاری‌دا کەمالی ( أرقمی کوری أبی أرقم ) بکەن بەجێگەی نوێژو موسلمانەکان تیاکۆبینەوە و خواپەرستی تیابکەن ، چونکە شوێنەکەی کەنارو دور لە ئاوەدانی و پەربوو ، وەهەموکاتێ پێغەمبەرو موسلمانەکان تیا کۆئەبونەوە .

## ئاشکرا کردنی بانگی ئیسلامی

بۆماوەی سێ‌ساڵ پێغەمبەرو موسلمانەکان بەشێوەی نهێنی‌و پەنامەکی بانگەکەی خوایان بەمەردم ڕائەگەیان ، وەبەدزی‌یەوە نوێژو خواپەرستی‌یان ئەکرد ، هەتا خوای گەورە ویستی بانگەکە ئاشکرا بێ‌و بەبێ پەردە گوێی قورەیشەکان بکوتێتەوە ، ئایەتی ئاشکرا کردنی بانگەکەی بۆنارد وفەرمووی : ( وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ ) الشعراء[1] یانی : هەڵسە خزمە نزیکەکانت بترسێنە لەڕق‌و قین‌و غەزەبی خوا ، وەباڵت داخە بۆ ئەو موسلمانانەی باوەڕیان پێ‌کردویت وشوێنت کەوتوون ، ئەگەر ئێت یاخی بوون‌و بەقسەیان نەکردی بڵێ : من دوورو بێ‌بەشم لەوکردەوانەی ئێوە ئەی‌کەن . وەفەرمووی : ( فاصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين )الحجر .

یانی بەوفەرمانەی پێتا دراوەو بەوپەیامەی بۆت نێرراوە گوێیان بکوتەرەوە وپیایانا ڕابگەیەنە وەکوێ مەدەرە ئەوکارانەی نەفامو هاوەڵ دانەرەکان ئەیان کەن .

لێرەدا بانگەکە بەرگێکی تری کردە بەرو لەپەنهانی‌یەوە ئاشکرابوو . پێغەمبەری خوا ـ درووودی لەسەربێ ـ لەپێشەوە کەوتە بانگ کردنی خزمەکانی .. ئەبوهورەیرە ئەڵێ : « کەئایەتی (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) هاتە خوارەوە پێغەمبەر بانگی کرد : ئەی‌کرۆهی قورەیش فریای خۆتان کەونو ڕەزامەندی خوا دەس خۆتان بخەن من ناتوانم هیچتان بۆبکەم ، ئەی عەباسی کوڕی (عبدالمطلب) من‌هیچم بۆناکرێ بۆت ، ئەی صفیەی پوری محمد من ناتوانم لای خواوە هیچت بۆبکەم ، ئەی فاطمەی کچی محمد لەماڵی خۆم داوای چیم لێ‌ئەکەی پێکە بەڵام لەلای خوا هیچم بۆ ناکرێ بۆت » (١)

بەیانێکیان محمد ـ د . خ ـ بانگی کەسەکانی خۆی کردو ئەی‌ویست باسی خواو خوا ناسی‌یان بۆبکاو بانگیان بکا بۆ سەر ئیسلامەتی ، بەڵام ئەبولەهەبی مامی قسەکانی پێ‌بڕی‌و بەزۆر خزمەکانی هەڵساندن لەلای .

جارێکی تر بۆقاوەڵتی بانگی کردنو دوای نان خواردن پێی ووتن : خزمەکانم وانازانم هیچ کەسێ لەعەرەب شتێکی گەورە تري بۆ کەسەکانی هێنابێ لەوەي من بۆئێوەم هێناوە . من خێرو بێرو سەربەرزي ئەم‌جیهانەو جیهانەکەي تریشم بۆئێوە هێناوە ، خـواي گەورە داواي لێ‌کردووم کە بانگتان بکەم بۆسەر ئاینی ئیسلام ، کـێتان لەسەر ئەم ئیشە کرنکـە پشتیوانیم ئەکەن ؟ هەموویان ڕوویان لێ‌وەرگێڕاو ویستیان بەجێي بێڵن

---

(١) بوخاری ڕیوایەتی کردوە .

بەلآم عەلی ڕاست بۆوەوەکەهێشتا منالْ بوو وتی : من ئەي پێغەمبەري خوا یارمەتی دەرت ئەبم ، من هەرا بەرپا ئەکەم لەدژي ئەوەي هەرات لەگەلاّ ئەکا ، بەنی هاشمی یەکان کەوتنە بزەگرتن‌و هەندێکیان قاقاێ پێکەنینیان لێداو هەندێ تریان لەژێرەوە بۆعەلی‌و ئەبوتالیبیان ئەڕوانی ، پاشان بەکاڵتە کردنێکەوە هەڵسانو بەجێیان هێشت .

جارێکی تر خزم‌و کەسەکانی کۆکردەوەو فەرمووی پێیان : « پێشەوا درۆ لەگەڵ کەس‌و کاری خۆیانا کات ، بەخوا ئەگەر ـ خوا نەخواستە ـ درۆم لەگەڵ هەرکەسا بکردایە لەگەڵ ئێوەدا نەم ئەکرد ، وەئەگەرخەڵکیم بخەڵەتانایە ئێوەم نەئەخەڵەتان ، بەوخوایەی هاوەڵی نیەو بێجگە لەوخوایە کی‌تر نیە من پێغەمبەری خوام بۆلای ئێوە بەتایبەتی‌و بۆلای هەموومرۆڤێك بەگشتی ، بەخوا چۆن ئەخەون هەروەهاش ئەمرن ، وەچۆن لەخەو هەڵ ئەسن بەوڕێیە زیندوو ئەکرێنەوە ، وەلەسەر کردەوەکانتان پرسیارتان لێ ئەکرێ‌و ( موحاکەمە ) ئەکرێن‌و پاداشتتان ئەدرێتەوە بەچاکە لەسەرچاکە وبەخراپە لەسەر خراپە ، ئەمجار یا بەهەشتی هەتا هەتایی‌یە یا دۆزەخی هەتا هەتایی‌یە . خزمەکانی هەمووبان بەنەرمی وەلآمیان دایەوە تەنیا ئەبولەهەب نەبێ ووتی : دەسی بگرن پێش ئەوەی هەموو عەرەب کۆمەڵە بکاتە سەری ئەوسا ئەگەر ئەی‌دەن بەدەسەوە ڕیسوایی‌یەو نایدەن بەدەسەوە لەناوئەچن ، ئەبوتالیب ووتی ؟ بەخوا تاماوین پشتگیری لێ ئەکەین » .

بانگی ئیســـلام ووردە ووردە پەرەی سەندو لەسنووری خزمەکانی پێغەمبەری خوا ـ درووودی لەسەربێ ـ تێپەڕی‌و گەییشتە هەمووقورەیش‌و مەکەیی‌یەکان . (ابن عباس) ئەفەرموێ : پێغەمبەر دوای هاتنی ئایەتەکەی پێشەوە چوە سەرتەپی سەفاو کەوتە بانگ کردنی قورەیشەکان : ئەی نەوەی

فەهر ، ئەی نەوەی عەدی و . . . . . هەتا هەموو تیرەکانی بانگکرد ، قورەیشەکان وتیان : محمد بانگ ئەکا ، هەمووڕویان تێ‌کرد و چون بۆلای و بزانن بۆچی بانگیان ئەکات ، فەرمووی پێیان ئەگەر هەوالتان بدەمێ : هۆردویەك وا لەوشیوەدا ـ یاله پشتی ئەو کەژەوە ـ ئەیەوێ شەبەیخون بکاتەسەرتان ، ئایا باوەڕم پێ‌ئەکەن ؟ وتیان : بەڵێ چونکه هیچ درۆت لێ‌نەبیستراوە . فەرمووی : دەی ئەتان ترسێنم بەسزای سەخق خوا ئەگەر باوەڕ بەخوای تەنیا نەیەنن و موسـلمان نەبن و واز لەبت پەرسـتی و له هاوەڵ‌دانان بۆ خوا نەیەنن . ئەی‌نەوەی عەبدو مەناف ، ئەی نەوەی زوهرە ئەی نەوەی تەمیم ، ئەی نەوەی مەخزوم ، ئەی نەوەی ئەسەد . . . خوا فەرمانی پیاداوم کـە خزمە نزیکەکانم بترسێنم ، وەمن نەلەم جیهـانەداو نەلەپاشا ڕۆژا ناتوانم هیچ کەڵك و سوودتان پێ‌بکەیەنم هەتاشایتومـان نەیەنن‌و نەڵێن : ( لاإله الاالله ) .

ئەبولەهەبی مـامی کە پیاوێکی قەڵەوی ڕق ئەستوور بوو ـ ڕاست بۆوەو هاواری کـرد : دامـاوی بۆتۆ ئابۆئەمەت کۆکـردوینەوە ؟ ! !

پێغەمبەری خوایش ـ درودی لەسـەربێ ـ بەدڵتەنگیەوە بۆی ڕوانی ، زۆری‌پێ‌نەچو خوای گەورە لەجیـاتی پێغەمبەرە شیرینەکەی وەڵامی‌دایەوە و ئەم سورەتەی نارده خوارەوە ( تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ، مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ، سَيَصْلَى نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ ) . (١)

## بۆچی ئیسلام لەناو عەرەبەکانا وە لە مەکەدا هات ؟

خوای گەورە و پەروەردگار ـ کەهەر خۆی زاناو ئاگاداری ڕاستەقینەیە و

---

(١) بوخاری ڕیوایەتی کردوە .

هەمووشتێ هەربە دەستی خۆیەتی و خـۆی ئەزانێ چـیو کوێو کامەو کەی باشە ، الله أعلم حيث يجعل رسالته ـ بۆ ئایینی ئیسلام کە کۆتاییو بەرنامەکانی خواو دوایین پەیامی پێغەمبەرانە زمانی عەرەبی و نەتەوەی عەرەب و نیوە دورگەی عەرەب و شاری مەککەی هەڵبژارد . ئایائەمە بۆچی بو ؟ وەهۆیەکانی چین ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە هەرچەندە زۆر گرانەو ڕەنگە ـ لەڕاستی یەکەیا ـ بەرزتربێ لە پلەی مێشکی مرۆڤـایەتی و هەربەتەنیـا خوای گەورە خۆی بیزانێو بەس ، بەڵام لەگەڵ ئەویشا ئێمە بەدەوری خۆمان بۆ ڕون کردنەوەی هەندێ لەڕوەکانی وەڵامەکە سەرئەکەین بەکۆشی زانا دلسۆزەکانا ، وە لە ئەنجامی کارەساتو بەسەرهاتە مێژوویی یەکان و بەپێی کاتوداخوازی یەکانو بەپێی ڕۆیشتنو سەرکەوتنی بانگەکەو بەپێی بەروبومو بەرهەمەکانی ... بەپێی ئەمانە هەندێ لە حیکمەتەکەی خوا ئەیخەینەڕوو ، بۆ هەڵبژاردنی ئەو شوێن و ئەو نەتەوەو ئەو زمانەو ئەو جێگاو ڕێگایە ، وەئەوەی ئەیڵێم پلەی تێگەیشتنی خۆم دەرئەخا ئەگینا ( نوری ئەولەکوێو بینایی‌خفاش)؟:

بەشی ئاوەدانی لەسەر زەویدا ـ کاتی هاتنی ئیسلام ـ چوار ئیمپەراتۆرێتی گەورە دابەشیان کردبوو لەناو خۆیانا : ـ

١ ـ ئیمپەراتۆرێتی ڕۆمان لە ئەوروپا و لە هەندێ لە ئاسیاو ئەفەریقادا .
٢ ـ ئیمپەراتۆریتی فارس کەدەسی کێشابوو بەسەر زوربەی ئاسـیا و ئەفەریقادا .
٣ ـ ئیمپەراتۆرێتی هیندی .
٤ ـ ئیمپەراتۆریتی چینی .

هەرچەندە ئەم دوانەی دوایی تەنیا بۆ وڵاتەکەی خۆیـان بوون و لە

سنووری خۆیان نەئەترازان بەخۆیانو بیرو ڕاو فەلسەفەیانەوە خۆیان پێچابۆوە ، بەڵام دوانەکەی پێشوویان سنگیان دەرئەپەڕان و شەرەقۆچیان ئەکرد و هەوڵیان ئەدا بۆتێن کردنە سەرمرەقەکان و بۆ گۆڕینی ژیان و بۆ ئاڵوگۆڕی لە کاروبارەکانی جیهاندا .

وەئەبێ لەبیرمان نەچی کە حەبەشەیش خۆی بە پێنجەمێ دائەنا لەجیهاناو زۆرکات دەسی ئەوەشان لەدراوسێو ئەمولاولاکانی و دەوری ئەبینی .

وە لەسەراسەری جیهانا دووئایین مابوون کەناوی ئاسمانییان بەسەرەوە مابێ : جولەکەو گاور ، وەهەمو ئایینەکانی تربووبوونە بت پەرستێکی پەتی و کاکڵەو تامو مەزەیان تیانەمابوو . وە ئەو دوو ئایینەیش کەوتبونە ژێر چەپۆکـی دوردەوڵەتەی ڕۆم و فارسەوە ، وەئەم دووئـایینەیش هەرچەندە بەئایینی ئاسمانی ئەناسـران بەڵام لە ڕاسـتییەکەیا مەبادئیو کاکڵەو مەبەسەکانیان وەکو وێنەو نیگاریان گۆڕابون و دەستی ناپاکییان تیخرابوو وەوایان لیهاتبوو دەوڵەت زاڵبوو بوو بەسەر ئەوانا نەك ئەوان بتوانن تێن بکەنە سەر دەوڵەتو بیبەن بەڕێوە .

وەکو لەپێشەوە باسـمان کرد جولـەکەیەتی دەمێ چەوساوەی ڕۆمان و دەمێتر چەوساوەی دەستی فارسەکان بوو ، وەدەسەڵاتی لەهیچ شوێنکا بەسەر هیچیانەمابوو ، وەلەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی بووبوو بەئایینێکی ئەوتۆ کەهەر بۆ بەنی ئیسرائیلی بێو بەس ، ئیتر هیچ هیوا و ئامانجێکی نەبو کە گەل و وڵاتەکانی تر بخاتە ژێر باڵی خۆیەوە .

وەئایینی گاورێتی پەیابو و بەرزبۆوە لەژێر سێبەری دەوڵەتی ڕۆمانیدا کە لەوکاتەدا دەسەڵاتی پەیاکرد بوو بەسـەر فەلەستینو سووریەو میسر و ئەو وڵاتانەی ترا کە گاورێتی بەئایینی تیایانا بڵاوەیکرد بوو ، وەگاورێتی

ی پەوە ئەجولاّیەوە ئیمپەراتوریّتی ڕومـانی بەشـێوەیەکی دوڕندانەو بێبەزەیی ئەچو بەگژیانا ، وەچەندەها هەرای پێ‌گیرا کە بەدەیان هەزاران قوربانی تیائەدرا .

وەکە کاتی ئازاردان و چەوسانەوەی ڕۆمانی بەسـەرچو ئیمپەراتۆری ڕۆمانی ( قوستەنتین پاشا ) چوە ناو گاوریّتی‌یەوە ، وەلەگەڵ ئەمەدا چەند پێکەوئەفسانەیەکی بت پەرستی‌وچەند باسێکی فەلسەفەی ئیغریقی بت‌پەرستیش پێیی‌و تێکەڵی ئایینەکە کراو مۆری گاوریّتی پیـانرا ، وەلێرەوە ئیتر ئایینە ئاسمانی‌یەکە نەماو تێکچوو گۆڕرا ، وە دەوڵەتیش هیچ تینێکی لـە لە ئایینەکەوە وەرنەگرت ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو زاڵ بوو بەسەر ئایین‌او تینی کردەسەری هەتا عەقیدەو بڕوا کەیشی نەی‌توانی زاڵ بێ بەسـەر دڵو دەرونو مێشکا .

وەبێجگە لەمەیش بەش بەش بوونی گاوریّتی‌و بوونی بـە چەند بەشـی جیاوازەوەو ناڕێکی‌و تێك چوونی ئەوبەشانە لەناوخۆیانا ـ کەنشتەی لەت‌و پەت‌و پەرتەوازە کردبوو نزیك‌بوو دەوڵەتیش هەمووی تێك بدا ، وەئەوانەی پێچەوانەی ( مەزهەبی ڕەسمی ) دەوڵەت بوون توشیـاری چەرمەسەری‌و سزاو ئازارێکی زۆرو زەبەنە هاتن . وەئەمانە هەموویان وەکـو یەك لە ڕاستی ئایینە پیرۆزەکەی عیسا پێغەمبەر ـ د . خ ـ لایان دابوو .

ئا لەم کاتەدا ئیسلام هات .. هات بۆڕزگارکردنی مرۆڤایەتی ئەوخراپە وناڵەباری‌و نەفامێتی‌و ژێر چەپۆکەیی و چەوسانەوەیەی تووشی هاتبوون لە هەموو شوێنێکی سەرزەویدا . هات بۆئەوەی وەرگـــێڕانو ئاڵو گۆڕێکی تەواوی بکا لەهەموو ڕویەکەوەو لەهەموو کاروبارەکانی مرۆڤایەتی‌یا ، هات هەتا هەموو مرۆڤەکان بیاتەوە جێگای خۆیانو بیان‌کاتەوە بەمرۆڤ دوای

ئەوەی مرۆڤایەتی‌یان لێ تێك چووبوو لەجێگای خۆیان ترازابوون . هـات هەتا ـ بەئاگاداری‌یەوە ـ دەس بکێشێ بەسەر ژیانی ئادەمیزاداو هەموویان بخاتە سەر ڕێگای ڕاستەو ڕەوانو بێ‌پێچو پەنادا وبەڕۆشنی‌و شـارەزایی یان کێڕێتەوە بۆلای سەرچاوە ڕاستەقینەکەی لێوەی هەڵقوڵیون .. بۆلای خوای پەروەردکاری خاوەنی هەموو شتێ لەهەموو جیهانا ،

سروشتی بوو بۆئەوهەموو کارە کەورەو کرنکانەو بۆئەوهەموو ئاڵو کـــۆڕو گواستنەوە کشتی‌یە ، سروشتی بوو بۆبەجێ هێنـانی ئەوانە کەئەبوایە ئیسلام زاڵ ببوایەو ژوور دەسێکی نەبوایەو خۆی فەرماندەرو کارگوزار بوایە . وە ئەبوایە ئەم کارە کەورەیە لەشوێنێکی ئازادو سەربەخۆدا دەستی پێ‌بکردایە کە دەسەڵاتی هیچ کامێ لەودەولەتو ئیمپەراتۆرانەی بەسەردوە نەبوایە ، وەخۆیشی ئەبوایە بەشێوەیەکی سەربەستی ببوایەو بژیایەو پێ‌بکەییشتایە ، وەهیچ هێزێکی تر زاڵ نەبوایە بەسەریا ، بەڵـکو هەرخۆی زاڵ ببـــوایە بەسەر خۆی‌و دەورو بەریا .

نیوە دورگەی عەرەبو شـاری مەکەو دەورو بەری باشـترین شوێن و ڕێ‌کەوتووترین جێگاو هەڵبژێرراو ترین زەوی بوو بۆ هەڵقوڵاندنو پەرە سەندنی ئاینی ئیسلام لەوکاتەدا ، وەکونجاوترین نوختەبـوو بۆئەوەی ئەو کاروانە جیهانی‌یە لەوێوە دەس پێ‌بکا .

لە وکاتەدا دەولەتێکی دامەزراوو خاوەنی دەستوورو ڕژێمو سوپاو هێزو دەسەڵات نەبوو لەنیوە دورگەکەدا کە بەدەسەڵاتەکەیـەوە ڕابوەستێ لە ڕێی عەقیدەو باوەڕەکەدا وخەڵـکی لێ‌دووربخاتەوە ، یاخۆ بە زۆر خەڵــکی لێ کۆبـکاتەوەو لە ترسانا هەموو جـــۆرە کەسـێ ، یا ـ وەکو ئەڵێن ـ : ڕەش‌و بۆرو بازوی تیا کـــۆبـبێتەوە ، نەك بە

پێی باوەڕ بەڵکو لەترسی شوڵو لێدانو لەترسی ژیان . وەکو لەناو ئیمپەراتۆرێتی یەکانا ڕووی ئەدا .

وەلەوێدا ئایینێکی ڕێكو پێكو خاوەنی بیرو باوەڕ نەبوو ، وەبت پەرستی یەکەیان شتێکی پڕو پوچو شەڕو شێواوو بێسەروبەر بوو ، وە بڕواو پەرستنیان جیاوازبوو، وەهەریەکەیان شێوەیەکی تایبەتی بوو ، وەقورەیشەکان هەرچەند چاودێری کەعبەو دەسەڵاتێکی کشتی ئایینییان بوو بەڵام بە شێوەیەکی وانەبوو بتوانێ لەڕێی ئایینە تازەکەدا بوەستێ ، وەئەگەرمەترسی لەناوچونی بەرژەوەندی ئابووریو سەرۆکایەتی سەرۆکە قورەیشەکان نەبوایە بەوشێوەیە لەڕووی ئیسلاما نەئەوەستان . چونکە خۆیان هەستیان ئەکرد کەئایینو بیرو باوەڕەکەیان چەندە پەشێوو نارێکەو هیچ نرخێکی نیە .

ئەم نەبوونیو نارێکییەی یاسای ڕامیارییە لەگەل نارێکیو بێبایەخی بیرو باوەڕو ئایینا لەناو نیوە دورگەی عەرەبدا ـ باشترین هەلو چاکترین کاتی هەڵخستن بۆبەرپا بوونی ئایینە تازەکەی ئیسلام ، کە بەسەربەستی بڕی بێئەوەی هیچ هێزێکی دەرەوە زاڵ بێ بەسەریا ، وەلەسەرخۆ گەشە بکاو دابمەزرێ .

وەلەلایەکی ترەوە باری کۆمەڵایەتی نیوە دورگەکە نرخو بەهایەکی گەورەیبووبۆپاراستنی ئایینەکەو بۆلایەن گیری بانگەتازەکە . . دەور دەوری عەشایەریو تیرە پەروەری بوو ، یاسای دەمارگیری ڕەگەزایەتیو کەسایەتی لەبرەوو باوابوو .

هەرکەپێغەمبەری خوا محمد ـ درودی خوای لەسەربێ ـ هەڵسابەبانگە تازەکەی لەشیرو تیرو شمشێری بەنیهاشمییەکانی خزمی پارێزکاری باشی دەس کەوت ، وەلەهاوتایی ترازووی تیرەکان هەلی بۆهەڵکەوت ، تیرەو

هۆزەکان ئەترسان لەوەیٚ نەوەی هاشم جەنگو هەرایان لەگەڵاهەڵگیرسێنن لەسەر محمد هەرچەن لەسەر ئایینەکەیشی نەبوون وەلەدەس درێژی‌یانا بۆ سەر هەرموسڵمانێك لەکەس‌و کارەکانی ئەترسان ، بۆیە هەرکەس موسڵمان ئەبوو ئەیان‌دا بەدەس خزمەکانی کەپەشیمانی بکەنەوە یا ئازاری بدەن . وەئەو بەندەو کەنیزەکانەی موسڵمان ئەبـوون ئەیان دانە دەس ئاغاکانیان و ئەوان ئازاریان ئەدان ، بۆیە ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازی‌بێ - ئەی‌کڕین وئازادی ئەکردن‌و ، ئیتر لەسزاو چەرمە سەرێ ڕزگـاریان ئەبوو . بێ گومان ئیسلام سوودی گەورەی لەمەدا دەس کەوت . وەلەلایەکی‌تریشەوە عەرەبەکان خاوەنی چەندەها ڕەووشت‌و سیفەت‌و خووی بەرز بوون ، وەکو ئازایەتی‌و جوامێری‌و ڕاستی‌و سەخاوەت‌و دڵ گوشـادی‌و فیداکاری‌و وەفاو دڵپاکی‌و خۆگرتن‌و لێهاتن .. کەئەمانەیش شتێکـــی پێویست بوون بۆ هەڵگرتنی باوەڕە تازەکەو بۆهەستان بەپێوویستی‌یەکانی ئیسلام‌و بۆ شان دانە بەر باری گرانی .

نیوە دورگەکە خاکێکی بەپیت‌بوو بۆڕواندنی تۆوی ڕاچەنین‌وشۆڕشەکە ، وە پڕبوو لەومرۆڤانەی بتوانن ئاڵای ئیسلام هەڵ بگـرن‌و سـەرزەوی پێ ڕۆشن بکەنەوە ، وە زۆر بەراوردو تاقی‌کردنەوەیان هاتبوە دەس بەهۆی هات‌و چۆکردنیان بۆدەورو بەری ئەودوو ئیمپەراتۆریی‌یەی ڕۆم‌و فارس ، بەتایبەتی لەکاروانی هاوینەی شام‌و کاروانی زستانەی یەمەن‌دا ، وەئەمانەیش پێ‌گەییشتن‌و ئامادە بوونێکی گەورەیان تیا دروست کردبوون ، وایان لێ هاتبوو چاوەڕێی بزوتنەوەیەکی گەورەبن کەخۆیان بکەن بە پاڵەوانەکانی وەدەوری تیا بگێڕن .

کاتێ کەئیسلام لەئاسۆی بەختیاری‌یەوە سەری کێشا ، ئەوهەموو ئامادەیی

وگەنج و خەزێنەی ئەوپیاوانەی وەرگرتو کردنی بەبەردی بناغەی ڕژێمەکەیی و بەهەڵگری ئاڵاکەی و بەپاڵەوانی شانۆکەی . خوا حەقەئەوانیش بەڕاستی چونە ژێری و بەتەواوی شانیان دایە بەرو ئەوپەڕی فیداکارییان لەڕێیا کرد و سیحرو موعجیزەیان بەرپاکرد .

بەم پێیە ئیسلام و قورئانی پیرۆز بەزمانی عەرەبی و لەناو عەرەبەکانا هاتونیوە دورگەی عەرەب و شاری مەکەی کرد بەبنکە ، وەکە بەتەواوی نیوەدورگە ساغ بۆوە بۆ ئیسلام و لە کوفروبت پەرستی و نەفامێتی پاک بۆوە ، ئەو موسڵمانە ڕاستەقینەو ناوازانە ئاڵاکەیان هەڵگرت و ڕوویە خۆرەڵات و خۆراوا و باشوور و باکوور بردیان ، وە ئەو پەیامە شیرینەو ئەو یاسا بەرێزەیان پێشکەشی هەموو مرۆڤایەتی کرد ، وەهەڵگرەکانی ئالاو بیرو باوەڕەکە باشترین کۆمەڵ بوون بۆ هەڵگرتنی و بۆ بڵاوکردنەوەی وەلە باشترین شوێن و جێگادا ئایینەکە ژیاو پێ گەیی .

شتێکی گرنگ ماوە لێی بدوێین ئەویش زمانی عەرەبی یە . . بەڕاستی و بێ دەمارگیری زمانی عەرەبی زمانێکی تەڕو پاراوو ڕەوان و گوشادو فراوانە ، وەزمانێکی بەرزی جیهانیی یە ، بەتایبەتی لەکاتی ئیسلاما باشترین زمان بوو بۆ وەرگرتنی ئایینەکەو بۆ هەڵگرتن و ڕاگەیاندنی بەمرۆڤەکانا ، وەئەگەر کەم وکوڕی تیا ببوایە نەی ئەتوانی ئایینەکە ئاوەها بڵاوبکاتەوە و لە نیوە دورگەدا ئەمایەوە .

وەبەم پێیە بۆمان دەرکەوت زمانی عەرەبی وەکو شوێن و مرۆڤەکان و کاتەکە باشترین شت و چاکترین هۆبوون بۆ گەشەکردن و بڵاوبونەوە و دامەزراندنی دام و دەزگای ئایینی ئیسلام ( أللهُ أَعلَمُ حَيثُ يَجعَلُ رِسَالتهُ ).

* * *

## قورەیشەکانو محمد :

کاتێ خوای گەورە فەرمانی دا بەئاشکرا کردنی بانگی ئیسلام پێغەمبەرو موسلمانەکان بە ئاشکراله دەوروبەری کەعبە کەوتنە نوێژکردن و کەتنە پەرستنی خوای تاکو تەنیاو دەستیان کردە بانگ کردنی مرۆڤ بۆلای خواپەرستی و بۆ وازهێنان لەبتە بێ‌گیانو بێ‌کەڵك و سوودەکان .

لەسەرەتاوە قورەیشەکان گوی‌یان نەدانێ و وایان زانی کە ئەم بانگەیش وەکو بەنگی کاورو جوولەکان لەخۆیەوە ئەکوژێتەوە و ، پاشان کەزانی‌یان خەریکە بانگەکە وردە وردە بڵاوە ئەکاو بەرەبەرە پەرەئەسێنێ .. ئەوەتە سوپایەك لەلاوە خوێن گەرمەکان لـەدەوری محمدو بـانگ و ئاینەکەی کۆبوونەتەوە و وازی لێ‌نانن ، لێرەدا وردەوردە مەترسی یەکیان بۆ پەیدا بوو کەوتنە بەربەرەکانی بەڵام شێوەی بەربەرەکانی‌یەکە لە پێشەوە لەوێنەی دەمەدەمێ و گاڵتەپێ‌کردنو بەسووکی سەیرکردن‌دا بو ، ئەهاتن شایەر و هۆنەرە دەم پسەکانیان لێ هان‌ئەدا تاوەکو بەهۆنراوەی لۆتیانە بە درۆزنی دابنێن و لـەبەر چـاوی خەڵکا بی‌شکێنن ، بـائیتر ـ وەکو ئەیان‌وت ـ کەسی پێ‌هەڵ‌نەخەڵەتێ و بانگەکەی بکوژێتەوە . . لـەوانە ئەبوسوفیـانی کوڕی ( حـاث ) و عمری کوڕی عاص و عبدواللهێ کوڕی زەبعەری‌بوون ، هەتا هەندێ لە هۆنەرە موسلمانەکان کەوتنە وەڵام‌دانەوەو و دەم کوتیان .

لەلایەکی‌ترەوە ئەچونە سەر محمدو داویان لێ‌ئەکرد : موعجیزەی‌وەکو موساو عیسا بێنێ‌و داواکەی خۆی پێ‌بباتەسـەر . . بۆچی سـەفاو مەروە ناکات بەزێڕو زیو؟ بۆچی ئەو کتێبەی باسی لێ‌ئەکا ـ مەبەسیان قورئانە ـ بەسەریەکەوە بەنوسراوی نایەتە خوارەوە ؟ بۆچی مردو زیندونـاکاتەوە ؟ بۆچی کانیاوێکی خۆشی شیرین هەڵ نـاقوڵێنێ کـە ئەزانێ خزمەکانی زۆر

ئاتاجی‌یان پێ‌ی هه‌یه ؟ بۆچی خه‌زێنه‌یه‌ك نادۆزێته‌وه‌و بۆچی .. بۆچی .. ؟

قورئان یه‌ك به‌یه‌ك وه‌ڵامی ئه‌مانه‌و وێنه‌یان ئه‌دایه‌وه‌و بـه‌ شێوه‌ی گشتی ئه‌ی‌فه‌رموو : ( قُلْ لاأَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلاضَرّاً إلاّماشاءالله وَلَوْكُنْتُ أعْلَمُ الْغَيْبَ لَاسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إنْ أنا إلاّ نَذيرٌ وَبَشـيرٌ لِقَومٍ يُؤْمِنُونَ ) الاعراف . آیه : ١٨٨

واته ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر تۆ له‌وه‌ڵامیانا بڵـێ : من ده‌سه‌ڵاتم به‌سه‌ر سوودو زیانی خۆما نیه چی خوا مه‌یلی نه‌بێ ، وه‌ئه‌گه‌ر غه‌یبم بزانی‌یایـه تووشی خێری زۆر ئه‌هاتم‌و له‌ناخۆشی دورئه‌كه‌وتمه‌وه من ئیش‌وكارم ته‌نیا ترساندن ومژده دانه بۆموسڵمانان‌و خاوه‌ن باوه‌ڕه‌كان .

به‌ڵێ ڕاسته ئیش‌و پیشه‌ی پێغه‌مبه‌ر ڕێ پیشاندان‌و ڕابه‌ری كـردن‌و مژده دان‌و ترساندنه ، ئیتر چۆن ئه‌بێ ئه‌وانه داوای شتی وای لێ‌بكه‌ن كه له‌سنوورو شورای ئیشه‌كه‌یا نه‌بێ ؟! وه‌موعجیزه‌ی محمد ـ دروودی له‌سه‌ربێ ـ ته‌نیا قورئانه‌و ئیتر موعجیزه‌ی تری بۆچی‌یه ؟ .

## هه‌ر قورئانه موعجیزه‌ی محمد

به‌ڵێ ڕاسته كه پێغه‌مبه‌ری خوا محمد ـ به هه‌زاران دروودی خـوای له‌سه‌ربێ ـ زۆرو زه‌به‌نه شتی وای لێ ڕودراوه‌و كردوویه‌تی‌و فه‌رموویه‌تی وبۆی كراوه هه‌رله‌پێش له‌دایك بونی‌یه‌وه هه‌تا كۆچی دوایی ، كه‌بۆ هیچ كه‌س وبۆهیـچ پێغه‌مبه‌رێ نه‌بووه‌و هه‌موویان له‌سنووری كارو كـرده‌وه‌ی مرۆڤ به‌ده‌ربوون ـ واته هه‌موویان خارێقه بوون‌و به موعجیزه دانراون ـ وه‌ئه‌مانه‌یش له‌هه‌موو كتێبێكی فه‌رمووده‌و ئیسلامی‌و ته‌فسیری قورئانا باس كراون . به‌ڵام ته‌نیا ئه‌وقورئانه پیرۆزه‌ی په‌یتا په‌یتاو به‌گوێره‌ی پێویستی و هه‌نگاوه‌كانی بانگه‌كه‌ی ئیسلام ئه‌هاته خواره‌وه ، ته‌نیـا ئه‌وقورئانه به‌سه

بۆدامەزراندنی یاساو بەرنامەی ئیسلام و ، بۆئیسپات کردنی پێغەمبەرێتی محمد ـ د . خ ـ وەبۆدەربرینو ڕاستێتی پەیامەکەی محمد . چونکە قورەیشەکان خۆیان محمدیان ئەناسیو ئەیان زانی محمد چۆنو لەکوێو بە چ شێوەیەك ژیاو پێ گەیی و گەورەبووە ، کەچی ئێستە ئەوقورئانەیان بۆ ئەخوێنێتەوە و بۆیان باس ئەکات . ئەگەر چاوگەی مێشكو دڵیان نەکوژایەتەوەو پەردە بەسەر چاویانەوە نەبوایە ئەبوایە یەکسەر بەبێ خۆگـــرتن باوەڕیان پێ بکردایەو موسڵمان ببوونایەو خێرا ئاڵاکەیان هەڵ بکرتایەو بەجیهانا بڵاویان بکردایەتەوە .

محمد ـ د . خ ـ پەیابو وژیا بەهەتیویو لەژێر دەستی باپیرو مامو ئامۆژنا وەژیانی بەسەربرد لەناو کۆمەڵێکی نەزانی نەخوێنـدەواری بت پەرستی بێ وێڵی خاوەن خەرافاتا ، نەمامۆستایەکی بوو ئامۆژگاری بکاو نە لەلایەکی بوو ڕەوشتو خووی جوانی فێربکا ، گەورەبوو بـە نەخوێندەواری لەنـاو کەلێکی نەخوێندەوارا کە نەزانایەکیان تیـابوو نەقوتابخـانەیەکیان هەبوو هەتا چیرۆك بێژو داستان خوانیشیان نەبوو : وەئاگایـان لە هالو هەواڵی گەلو ئومەتە پێشوەکان نەبوو ، وەتۆوی شارستانێتی یان لەناوا نەچێنرابوو.

محمد ـ د . خ ـ لەناوئەمانەدا ژیا هەرچەند خوو ڕەوشتو خراپکاری یە کانی ئەوانی وەرنەگرتو خۆی ڕازانبۆوە بەڕەوشتو خووە پەسەندەکان ، بەڵام نەبینرا لێی بچێتە لای ماموستایەك شتێکی فێربکا یا چیرۆك خوانێ داستانێکی بۆباس بکا ، وە لەدرێژایی چل سـالی تەمەنیا بێجگـە لەدوو سەفەرەکەی شامو سەفەرەکەی لەگەڵ دایکیا بۆمەدینە سەفەری تری بـۆ هیچ کوێ یەك نەکردووە ، وەلەوسەفەرانەش دا لێی نەبینراوە تێـکلاوی کەس بکا بەڕادەیەکی ئەوتۆ شتی لێوەرگرێ ولێیەوە فێری ئیشوکاربێ،

دیسان تا گەیشتە تەمەنی چل ساڵی هیچ کاتێ لێی نەبینراوەو نەبیستراوە ئەمایەری گەورەبی یا ڕابەری یا پێغەمبەریتی یا سەرۆکایەتی کـردبێ ، وە هەتا ئەوکاتە لێی نەبیستراوەو نەبینراوە .

بەم پێیە ئەوپێشەوا گەورەیە ژیا وەکو یەکێ لەقورەیش هـەتا تەمەنی چل‌ساڵەی تەواوکرد ، لێرەدا کورج ڕوئەکاتە خزمەکانیو ئەلێ : خزمەکانم من بووم بەڕابەرو پێغەمبەری خوای تاکو تەنیا بۆسەر ئێوە بەتایبەتیو بۆ سەر هەموو مرۆڤەکانی‌تر بەگشتی ، مژدەتان ئەدەمێ بە ڕەزامەندی خـواو بەبەهەشتی بەرین ئەگەر باوەڕم پێ‌بکەن ، وەئەتان ترسێنم بەخشمو قینی خواو بەسزای سەختی دۆزەخ ئەگەر نەیەنە سەر ئایینو بەرنامـەکەم ، وە ئەی‌فەرموو : دەستووری ئەم کارە گەورەیەم قورئانی پـیرۆزە کەفەرمایشی خوای گەورەیەو وردە وردە بۆم ئەنێرێ . وەلەوقورئانەی بـۆئەخوێندنەوەو بۆی باس ئەکردن ، ئەوانیش ئەیان بینی ئەم قورئانو فەرمودەیە شتێـکی زۆر سەیرو ناوازەیە .. بەرزترە لەعەقـڵو ژیریو مێشـکو دەماخو دڵو دەرونو تێ‌گەیشتـنی ئەوان لە هەموو ڕوویەکیـەوە .. لەڕێکخستنیا . لە داڕشتنیا ، لەڕەوانی‌یا ، لەهێنـــانو دامەزراندنیو پیشان دانی باس و مەبەسەکانیا لەکاکڵەو ماناو بنکەو بیرو باوەڕەکانیاوە..هتد.. ئەیان‌دی شتی‌واباس ئەکا کەئەوان‌نەیان بیستبوو . باسی داستانو بەسەرهاتی ئومەتە پێشینەکان و پێغەمبەرانوپاشاو سەرۆکەکانوهەڵوێستیان لەگەڵ بانگوبانگ‌کەرە پێشینەکانی خواوئەنجامیان‌ئەکا،بەشێوەیەکی سەیرو لەبەرگو نیکارێکی ناوازەودڵ‌فڕێن‌دا، وەلەڕووداوی لەمەودوا ئەدوێو گەچی بەبێ کەموکوڕی دێتەدی ، وەزۆر و زەبەنە مەبادئی و بیروباوەڕی گەورەگەورە دێنێ لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕامیاری و زانیاری و پەروەردەو تەشریع و حوکمو یاســا و

ڕژێم . . . هتد ، کەهەریەکەیان بەدزێژایی تەمەنی مرۆڤایەتی بەوپێیە ڕێك ناخرێن . ئەمانەیش هەموویان لەسەر بنکەی خۆشەویستی و یەکسانی و یەکێتی‌وڕەوشت‌و خووی جوان‌و بەرز دامەزراون‌و هەریەکەیان ئەوانی‌تریان تەواو ئەکا و لێك جیاناکرێنەوە .

ئایا ئەگونجێ محمدێکی نەخوێندەوار لە خۆیەوە کوت‌وپڕ بێت‌و بتوانێ ئەو هەموو شتانە بێنێ‌و ڕێکیان‌بخا ؟ یا ئەگونجێ ئەو هەموو شتە ناوازەو سەرسوڕهێنەرانە هەڵقوڵاوی دڵ و دەروونی مرۆڤێك بوبن ؟

بێ‌گومان قورئـان گەورەترین بەڵگەو بەرزترین شایەت و ڕاسـترین موعجیزەبوو بۆ پێغەمبەرێتی محمد ـ د ، خ ـ وەبۆ ئیسپات‌کردنی بەشێوەیەك کەڕێگای ملە جەڕە بۆ کەس نەهێڵێتەوە وەهەموو کەسێ جگە لە گومڕاهان ئەزانێ فەرموودەی خوایە و زیاترە لەمێشك‌و دەروونی مرۆڤ (۱)

لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو ئەوانەی داوای موعجیزەیان لە محمد ـ د.خ ـ ئەکرد خۆیان بت پەرست‌بوون‌و کڕنوشیان ئەبرد بۆ داروبەردە بێ‌گیان‌و بێ‌توانا و بێ کەڵك‌و سوودەکان و بەتەمای چاکەیان بوون و لە خراپەیان ئەترسان ، بێ‌ئەوەی داوای شتێکیان لێ‌بکەن کە ئیسپاتی خوایەتی خۆیانی پێ‌بکەن ، لەگەڵ‌ئەوەش‌دا ئەهـــاتن پەلپی موعجیزەی گەورەیان لە محمد ـ درودی لەسـەربێ ـ ئەگرت . بۆیە محمدیش ـ د . خ ـ گـاڵتەی بە بتەکانیان ئەکردو بەبێ عەقڵی دائەنان . . کە لەدەوری کەعبە کۆئەبونەوەو لە نادی‌یەکەیانا دائەنیشتن ئەچوە ناویان باسی خواو ئیسلامەتی بۆئەکردن ، ئەوانیش ئەهاتن بەشان‌و بـاڵی بتەکانیانـا ، ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە

(۱) بۆ ئەوەی زیاتر لە موعجیزەکانی قورئان تێ‌بگەی سەیری تەفسیری خال بەرگی یەکەم لاپەڕە ٦٩ ـ ٨٣ بکە .

ئەکەوتە لێدوانیان و بەتایبەتی ئەدوا لە ( هبل‌ولات‌و عزی ) کە بتە کەورەکانیان بوون ، ئەوانیش جیهانیان لێتاریك ئەبوو .

## بۆچی بەسەریەکەوە قورئان نایەت بۆ محمد ؟

لەوەلاّمی ئەوەدا کەئەیان وت : بۆ چی بەسەریەکەوە قورئانی بۆنایەت ؟ قورئان هات‌و فەرمووی : ( وَقَالُوا لَوْلانزل علیه القرآن جملة واحدة ، کذلك نثبت بەفؤادك و رتلناه ترتیلا ، ولایأتونك بمثل الاجئناك بالحق وأحسن تفسیرا ) الفرقان

یانی : ئەڵێن : بۆچی بەیەك کۆمەڵ قورئانی بۆنانەتە خوارەوە؟ بەلاّم ئێمە بەوپێیە وردەوردە بۆت‌ئەنێرین بۆئەوەی هەمووجارێ دڵی تۆێ پێ‌قایم و دامەزراوبکەین ، وە داوای هەرشتێ یا هەر پرســیارێکیان لێ‌کردی ئێمە ڕاستی باسەدەو وەلاّمی شیرینت بۆ ئەنێرین .

قورئان بەشێنەیی‌و بەکوێرەی پێویست ئەهات و ڕاڤەو باســی ئەو حەقیقەتانەی ئەکرد کە بەلای خوای کەورەوەن و مێژوی حەقیقەتەکەی ئەکێڕایەوە . وەلە بانکە کشتی‌یەکەیا ( شوبوهــاتی ) جۆربەجۆریەتی و ئەیان‌خاتەڕوو پاشـان هەڵیان ئەوەشێنێتەوە ، وە بەڵکەو دەلیل لەسـەر مەبەسەکانی خۆی و لەسەر ڕاناڕێکەکانی دوژمنان دێنێتەوە .

قورئان دەستی‌کرد بە هاتنەخوارەوە لەناو کۆمەڵێکا کە کوفرو بێ‌ئایینی‌و نەفامێتی تیایا شکۆفەی کێشابوو ، لـق‌و پۆپی لێ‌دا بو ، وە دەمەدەمێ کردن‌و مشت‌و مڕو دەم بازی باوی ناویان بوو ، هەروەکو خوای کەورە بەتایبەتی ئەمانەی هەڵبژاردبێ هەتا هەرچی ڕێکای کومان‌و شوبهەو خەیاڵ و خەتەرەیە بێ‌و لەوانەبێ بێت بەدڵی مرۆڤێکا ئەوانە بیخەنەڕوو بەلەقاژەی تەواوی تیابکەن و هەرچی هەوڵ و مەرکەمەلەیانە بیننە کایەوە ، ئەمجـار

ئەمیش بە نووکی نەشتەری ڕاستیی لێی بداو شەق و پەقی بکات .

هەرپرسیارێك تاراستەی سنگی ئیسلام یا پێغەمبەری ئیسلام ئەکرا ، یا لەوانە بوو چاوەڕوان ئەکرا ڕۆژێ لەڕۆژان تاراستەبکرێ لە قورئانا وەڵامی ڕۆشن و تـەرچە لە دل بۆ دانـراوە بە شێوەیەکی وا کەوەڵامی پرسیار وەنەبێ تەنیا پەیوەندی بەپرسیارەکەوەبێ و بەس ، بەڵکو دەرسێکی هەتاهەتایی‌یەو دەرمانی نەخۆشی‌یەکانی مرۆڤ ئەکات هەرچیو هەرکاتێ‌بێ .

بەم بۆنەیەوە بۆ ماوەی ( ٢٣ ) سال نیکا لەلای خوا ئەهات بۆ سەر پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ئەیفەرموو : وابلێ و وەها وەڵامیان بدەرەوە و . . . . هتد بۆ وەڵامی ئەوپرسیارانەی ئەهاتنەسەری یا لەوانە بوون‌بێن ، وە هەندێجار لـە پێشەوە قورئان ئەهات بۆ دەرخستن و پیشاندانی بنەڕەتەکانی بانگەکە و ئادابەکانی ، وەبۆ شارەزاکردنی خەڵکی لە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بەجۆرێك کەباوەڕ پتەوبکا و ڕەگ و ڕیشەی گومان لە بێخ دەربێنێ پێش ئەوە گومانەکە بێ‌بەدلی کەسا .

## ئەبوتالیب و ئەبولەهەب و پشتگیری محمد :

ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەر ـ هەرچەند لەسەر ئایینی باوو باپیری مابوو نەهاتبوەسەر ئایینەکەی محمد ـ بەهەردوو دەسـتی باوەشی‌کرد بە محمدا و پشتگیری لێ‌کرد و ڕێگای نەئەدا کەس دەس‌درێژی بکاتەسەری ، لەگەل ئەوەدا کە ئەیزانی لەم ڕێگەیەدا چەند زەحمەت و ئازاری پێ‌ئەگاو تالی‌و سـوێری دێتە ڕێی . بەڵام ئەبولەهەب نمونەیەك بو لەو پیاوانەی لە ڕۆیشتن‌و لەدەس چونی گەورەیی‌و سامان‌و بەرژەوەندی‌یان ئەترسان ، بۆیە بەبێ ئەوەی تێ‌بگـاو گوێ بداتە ڕاستی و چەوتی بـانگەکە بەوپەڕی دڵ‌ڕەقی‌یەوە کەوتە بەربەرەکانی‌و ئازاردانی پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ ،

هەتـا زۆری کرد لە دووکوڕەکەی ( عتبە و عتیبە ) ـ کە زاوای پێغەمبەر بوون - ( رقیەو أم کلثوم ) یان تەڵاق دا ، وە ئەبولـەهەب لە پێشەنگی قورەیشەوە بوو لە ئازاردان و چەوساندنەوەی پێغەمبەرو یارەکانیا .

بەڵام ئەبولەهەب چی یە؟ وەقورەیش چیە ؟وەعەرب چی یە؟ وەهەمو جیهانیان چین؟ لەبەرابەری پیاوێکەوە کە پەیامی بۆ هاتبێ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ ڕزگارکردن و ڕێ نموویی و ڕابەری کردنی ئەو مرۆڤانەی لەمێژەوە ڕێگایان گوم کردوە و سەریان لێ تێك چوە وە بۆ دامەزراندنی دامودەزگاو ڕژێمی دادپەروەرانەی خوایی لە جیهـانێکی پڕ لە پشێوی و ئـاشوب و ئاژاوەدا ، ئەبێ هەڵوێستی نەفامەکان و ڕق و قینی گومڕاهان و بەربەرەکانی چاوچنۆکان چی یان پێ بکرێ لەگەڵ پەیامێکا کە خوا بیەوێ سەربکەوێ ؟ بانگەکەی محمد کە دەستی پێ کرد لە مەکەوە وەنەبێ بۆ دروست کردن یا پاك کردنەوەی نیشتمانێکی بچکۆلە بووبێ ، بەڵکو بۆ پێك هێنان و دامەزراندنی جیهانێکی نوێ بوو ، بۆ هەموو سەرزەوی و بۆ هەمووچین و بەرەکانی ئادەمیزاد کەهەتا بەخوا پەرست بن و هەرلەسەر خواپەرستی بڕۆن و لەپێناویا تێ بکۆشن و بجەنگن هەتاهەتاسە لەلاشەی مرۆڤاهات وچۆتەکاوژیان لەسەرزمویدائەمێنێ .

## پێغەمبەر پیاوێکی ناوچەیی یاسەرۆکێکی نیشتمانی نەبوو :

ئیش و کارەکانی بەئاسـانی بۆ ئەچوەسـەرو جێگای ئیش لە وڵاتە عەرەبەکانا فراوان ئەبوو ئەگەر پێغەمبەر پیاوێکی ناوچەیی ( إقلیمی ) یا سـەرۆکێکی نەتەوەیی بوایە ، وەلە ناو نەتەوەی عەرەباوەکو پێشەوایەکی ڕامیاری ( سیاسی ) وەسەرۆکێکی نیشتمانی بجوڵایەتەوە و هەوڵی بدایە

.. ئەی‌توانی ئالاّیەکی بۆ ئوممەتی عەرەب هەڵبکردایەو قورەیش‌وتیرەکانی تری لەژێرا کۆبکردایەوە و دەوڵەتێکی عەرەبی دابمەزرانایە و خۆی ببوایەبە سەرۆکی . بێ‌گومان ئەبولەهەبی مامی و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام‌و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی موغیرەو وێنەیان لە پێشەنگی مرۆڤەکانەوە ئەچونە ژێری ئالاکەیی و ملیان بۆ کەچ ئەکردو لە پێناویا ئەجەنگان . ئەوەنەبوو کە هەموشایەتی‌یان ئەدا بەڕاستی‌و ئەمینی محمد ؟ ئەی‌نەیان‌کرد بە ( حەکەم ) لە دانانی بەردە ڕەشەکەدا کە نزیك‌بو کارەساتی گەورەی تیاڕوویدا ؟ ئەی لەسەر زمـانی عوتبە ـ وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین ـ پێ‌یان‌نەوت : « ئەگەر بەم کارەی هێناوتە مەبەست سەرۆکایەتی‌یە ئالاّیەکت بۆ هەڵ‌ئەکەین هەتاماوی سەرۆك‌بە » ؟ ئەوکاتە ئەی‌توانی بە پـاڵەوان و دلێرەعەرەبەکان بدات لە دەوڵەتی ڕۆم‌و فارس‌و مـــانە داگیرکراوەکانی عەرەبەکان بسێنێتەوە ، وەئالاّی سەرکەوتنی عەرەبی بە سەرتەپۆلکەکانی ڕۆم‌و فارسەوە بچەقێنێ . وەئەگەر نەی‌ویستایە لەوکاتەدا دەمی‌لەگەڵ ڕۆم و فارسا سپی‌بێتەوە ، ئەی‌توانی هێرش‌بباتە سەریەمەن ، یا حەبەشە و ... بیخاتە سەر دەوڵەتە عەرەبی‌یەکەی خۆی و فراوانی‌بکا .

ئەمە هەمووی پێك‌ئەهات ئەگەر محمد ـ درودی لەسەربێ ـ وەهـای بکردایە . بەلاّم محمد بۆ ئەوە نە نێرراوە بەتاڵێك لابەرێ بەتاڵێکی‌تری لەجێدا دابنێ ، یاجۆری دەس‌درێژی بگۆڕێ بەجۆرێکی‌تر . . نەنێرراوە سەرۆکێکی نیشتمانی یا پێشەوایەکی ڕامیاری بێ‌وەمەردم لە ژێردەسـەی ڕۆم و فارس دەربێنێ بۆ ژێر چەپۆکی عەرەبی عەدنان و قەحتان .
نێرراوە مژدەدەرو ترسێنەربێ بۆ هەموو مرۆڤێ بێ‌جیاوازی ، وەبانگ‌کەربێ بۆلای خواو چرای ڕۆشن‌کەرەوەی ئادەمیزادەکان‌بێ . نێرراوە بۆ لادانی

خەڵکی لەبەندەیی‌و بت پەرستی‌و بی‌یان‌بات بۆدەشتی فراوانی خواپەرستی ، وەئادەمیزاد لەتەنگەڵانی ئەم جیهانەوە بەرێ بۆ فراوانی هەردووجیهـان ، وە لە زوڵم‌و زۆری ئاینە تێك دراوەکانەوە بی‌یان بات بۆدادو دادپەروەری ئیـسلام ، فەرمانیان پیابدا بە چـــاکەو بیان گێرێتەوە لە خراپە ، وەشتی پاکیان بۆ حەڵاڵ وشتی پیسیـان لێ‌حەرام بکا و کۆت و زنجیریان لەمل دەربێنێ .

نابینی بانگەکەی پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ بۆ یەك‌نەتەوە وەیایەك وڵات یایەك ئومەت نەبوو ، بەڵکو بۆدڵ‌و دەرونی هەموو مرۆڤایەتی بوو ، بەشێوەیەکی گـشتی و بەبێ هیچ جۆرە جیـاوازی‌یەك ، وەنەتەوەی عەرەب لەبەرئەوەی زۆرداماوو ژێردەستەو ماف خوراو بوون لەلایەکەوە ، وە لەلایەکـی‌ترەوە لەبەر هەڵکەوتویی جوگرافی شوێنەکەیان ، وەلەبەر ( خصائص ) ی دەروونی و ویژەیی‌یـان ـ وەکـو لە پێشەوە وتمـان ـ باشترین جێگابوو بۆ دەس پێ‌کردنی ئەو بانگەپیرۆزە .

## لەدەرگاوە چوەژوورەوە :

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسـەربێ ـ لـەدەرگاوە چوە ژورەوە ، وەبە کلیلی کارخانە قفڵی دڵ‌ودەرون و سروشتی ئادەمیزادی کردەوە . . بانگی کردن بۆ ناسینی خوای تاك‌و تەنیاو بۆ باوەڕپێ‌کردنی و بۆلابردنی بتەکانیان بەهەر ناوو لەژێر هەربەرگێکابن . . هەوڵی‌دا بچێتە ناو دڵ و دەرونیانەوەو ژێری مێشك و دڵیان بکاتەوە و بیان‌خاتە ئیش‌و تێ‌بینی‌کردن . یەکەم هەنگاوی بۆ ناودڵ و دەرونیان بوو ، نەچو لەپێشەوە بتەکانیـان بڕوخێنێ‌و کوێرەکە پەرستراوەکانیان سەربڕێ‌و ئیتر بادڵ‌و دەروون‌وباوەڕیان هەروەکـو خۆی بوایە ، چونکە لەوانە بوون بتی‌تریـان پەیدا بکردایە و

سەد لە جاران زیاتر لە دەوری کۆبیونایەوە . نابینی ئیستە لەم دەمی شارستانیتانیتی تازەیەدا هەر دەستەیەك ئەیەوێ بەهێز خۆی بسەپێنێ ، خەلکی هەردەمە لەدەوری جۆرەشتێکی سەیرتر ( بابەتی تازە ) کۆئەبنەو و خەباتی لەپێناوا ئەکەن .

## شێوەی ڕابەری کردنی ئیسلام :

جارێ وامەیە تۆ لەتەنك و چەلەمو پێ گیرانتا لە شوێنێکی سەخت و هەلەت و لاپێدا ، یالە ناو قوڕو چلپاوو سەهۆڵبەندانا دلسۆزێکی ئەمین پێت ئەلێ . چـاوت بنوقێنەو دەس بدەرە دەستم و بەشوێن منا وەرەبە ڕێوەو چاوت هەل مەبڕە و بەبێ پرسیارو قسە وەرەبەدواما . زۆرنزیکە تۆ لەپەیرەوی کردنیـا بەبێ وەی دەربچی و ڕزگارت بێ ، ئەوچـاو ســاغەی تۆ بیری کردۆتەوە و ئەوچارەیەی بەدلا هاتوە بۆت ، بەلام ئەوەندەهەیە ئەگەر ئەوتروش ببوایە تۆیش بەبێ گومان تیائەچویت .

ئەی ئەگەر لەوکاتە تاپیـــاوێکی ژیرو شارەزا بهاتایە و نەخشەیەکی ڕێك وپێکی بۆ ڕۆییشتنەکەت بکێشایەو شوێنی مەترسی و جێکای خەتەری بۆ دیاری بکردیتایەو ، بەڕوویەکی ڕۆشن باسی قۆناغە سەختەکانی بکردایە و ، چارەی هەریەکەیانی دابنایە و تێی بکەیانیتایەو تۆزێکیش لەگەلتا بهاتایە بەڕێوەو پەراوەی پێ بکردیتایە تاڕام ئەهانی ، تۆلەم کاتەدا ئەبویتە پێشەوای خۆت (وخەلکی تریش) و ئەت توانی بەهۆی تێبینی و ووردبوونەوەی خۆتەوە تێ پەڕ بکەیت و پێویستیت بەکەسی تر نەبێ .

جۆری یەکەمیان شایەنی منالو نەفامو سادەکانە ، لەکاتێکا کەشێوەی دوو گونجاوی پیلوو تێ گەییشتوو مرۆڤە خاوەن بیرو هۆشەکانە .

خوای پەروەردگـار محمدی کـرد بە پێغەمبەری هەمومرۆڤ ، بەهۆی

قورئانی گەورەوە هەموو جۆرە ئوصول و ئاداب و بنەڕەتێکی ڕێك و پێکی تێ‌گەیاندن ، وەداســتانی جۆربەجۆری لە باس ئوممەتە پێشینەکانەوە بۆ هێنان و هۆی سەرکەوتن یاکیرۆدەبوونیانی ڕون کردەوە ، وە هەمو جۆرە ڕێکاو جێگایەکی بەبێ پێچو پەنـا بۆ دیاری کردن و لـە هەموشتێکا وردبێ‌یان درشت ( بەردی نایەسەر مەلۆ ) بۆیان و شارەزاو ئاگـادار و ئامادەی کردن بۆیە هەریەکە لەمسوڵمانەکان ئەبوون بەمامۆستاو بەپێشەوای جیهان و بەچرای ڕۆشن کەرەوە وەلەشۆانی برکەیەك مەڕەوە ئەبوون بە کاربەدستێکی دادپەروەری جیهانی .

## گۆڕینی شێوەی بەربەرەکانی :

قورەیشەکان بینی‌یان بەشێوەی گاڵتەو پلوتك و بەسووکی سەیرکردن ڕێگای بانگی ئیسلامیان پێ‌ناگیرێ ، ئەوەتە ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی موسڵمانەکان زیاترئەبێ و پەرەئەسێنن . لەبەر ئەمە بەناچـاری باریان گۆڕی و هەڵسـان پیرو کۆمەڵێکیان لە پیاوەگەورەکانی قورەیش ـ کە ئەبوسوفیان یەکێکیان‌بوو ـ ڕێکخستو ناردینیان بۆلای ئەبوتالیب و پێ‌یان وت : ئەبوتالیب ئەم برازای تۆیە خراپ لە خواکانمان ئەدوێ و ئابڕووی ئایینەکەمان‌ئەباو گاڵتە بەعەقڵمان ئەکاو باووباپیرەکانمان بەگومڕاو سەرلێ‌شێواو ناوئەبا . تۆپیاوی چاك بەیاوازی پێ‌بهێنە لەم جۆرە کاروبارانە ، یاخۆلێمان گەڕێ بۆی ـ خۆتۆیش یەکێکی وەکو ئێمە ـ بۆت چار ئەکەین .

ئەبوتالیب بەزمانی شیرین ناردنیەوەو پێغەمبەریش لە سـەر بانگەکەی خۆی بەردەوام‌بوو هەتا پێی ئەچو بانگەکەی بڵاوەی ئەکردو کۆمەڵەکەی زۆر ئەبوو قورەیشی‌یەکان پتر کەوتنە مەترسی‌یەوەو بەتەنگ هاتن ، لەبەر ئەوە دیسان هـاتنەوە لای « أبوطالب » وپـێ‌یان وت : ئەی أبوطـالب تۆ

لەناو ئێمەدا بەتەمەنو بەنەژادو بەشەرەفو بەپایە گەورەو بەرزیت وجێگای ڕێزی هەموو لایەکیت ، ئێمە پێمان ووتیت : کەواز بـە محمدی برازات بێنێ لەوکارەساتەی دەربارەمان ئەی کات ، کەچی تۆ گـوێت نەدایە !! ، بەخوا لەمە زیاتر ناتوانین دانیشین وخۆمان پێ ناگیرێ لەسەر کەسـێ کە جنێو بەباو وباپیرمان بداو گاڵتە بەعەقڵمان بکاو قسە بەخواکانمان بڵێ ، یا ئەبێ وازی پێ بێنی ، یاخۆ ناچار ئەبین کەتۆیش وەکو ئەوسەیر بکەین ولەگەڵ ئەوا بت ژمێرین ، وەلەکەڵتانا ئەجەنگین تا لایەکمان لەناوئەچێ.

لێرەدا هەڵوێستی «أبوطالب» نەختێ کەوتە لێژی ، چونکە لەلایەکەوە لەسەر شانی سەخت بوو کەلەخزمو کەسەکانی جیا بێتەوە ، وە لەولایشەوە پێی ناخۆش بوو کەدەس بەرداری برازاکەی بێو بیدا بەدەست دوژمنەوە، لەبەرئەوە ناردی بەشوێن محمداو پێی ووت : برازای شیرینم خزمەکانت هاتنە لامو وەها وەهایان پێ ووتم ، جا تـۆیش پیـاوی چاك بە منیش و خۆیشت لەناو مەبەو تووشی کێچەڵێکم مەکە پێم هەڵ نەسووڕێو لەتواناما نەبێت . ئەم گوفتارە زۆر تیپێی کردە سەر دڵو دەروونی محمد ، وەترسا لەوەی کەمامی دەس بەرداری ببێو پشت گیری نەکات ، خۆ کەسێکی تر نیە لەخزمو کەسەکانی پەنای بدات ، وەموسڵمانەکانیش کەمدەسنو ناتوانن بەجەنگو هەرا لەڕووی قورەیشا بوەستن .

ئایا بت پەرستی زاڵ ئەبێو ڕێگای ئەونوورو ڕۆشنایییە ئەگرێ ؟ بێ گومان ئەبێ ئیسلام سەرکەوێو ڕۆشنایییەکەی تاریکایی کوفرو بێ ئاییی بپێچێتەوە ، ئەبێ چ هێزێك بێ هەڵسێ بەم سیحرو موعجیزەیە؟ ئەبێ تەنیا هێزی باوەڕی پتەوبێ بەخوای پەروەردگار ، ئەبێ محمد بەردەوام بێ لە سەر گەیاندنی ئەوبانگە ڕاستەقینەیە ، با بەتەنیا هەرخۆی بووە ، یا ئەبێ

لەو پێناوەدا لەناوبچێ ، هەرچی ئەبێ با ببێ ، خـۆ پاشە ڕۆژ بۆ محمد باشترە لەم جیهانە بەگوێرەی فەرمـوودەی ئەونیکـا ڕاستەی کەباوەڕی پێ هێناوە ، لەپا ش ئەم لێکدانەوەیە لای کردەوە بەلای مامیەوەو فەرموی :

« بەخوا ئەی مامی بەڕێزم ئەگەر ئەوخزمانە ڕۆژ بهێنن‌و بیخەنە نـاو دەستی ڕاستم‌و مانگ بخەنە ناو دەستی چەپمەوە لەسەرئەوەی واز لەم‌کارە گرنگە بێنم ، بێ‌سوودە وازی لێ‌ناهێنم ، هەتا یا خوا سەری ئەخات ، یا لەپێناویا لەناو ئەچم ؟ » ئەمەی وت‌و دلی پڕبوو وچاوی پڕبوو لەگریان‌و پشتی هەل کردو گەڕایەوە . گەورەیی حەق‌و ڕاستی‌و پتەوی باوەڕو سوور بوون لەسـەر ئایین‌و هەلوێستە دل فڕێنەکەی محمدو وتە بـــەتـین و تەووژمەکەی دلی «ابوطالب» ی ڕاچلەکاندو خستیە لەرزەوەو سۆز دلی پڕ کردو بـانگی کرد : محمد وەرە . کەمحمد هـاتەوە پێی وت : برازای خۆم برۆ چیت پێ‌خۆشە بیلێ‌و چۆن حەزئەکەی وەها بکە ، بەخواهەرگیز شتێکی واناکەم کەتۆ پێت ناخۆش بێت . ٥٠

محمد « دروودی لەسەربێ » بەدلنیاییەوە گەڕایەوە بـۆ سەر بانـگە پیرۆزەکەی خۆی ، وەقورەیشی‌یەکان زانییان « ابوطالب » وازلەپشتگیری کردنی محمد ناهێنی ، هاتنەوە بەکۆمەل بۆلای‌و کوڕێکی لاویان هێنا کە ناوی عمارەی کوڕی وەلیدی کوڕی مغیرە بوو ئینجا وتیان : ئەی ـ ابوطالب ئەمە عمارەیە ـ وەکو خۆت ئەزانی ـ جوانترین‌و بەهێز ترین‌و پێ گەوتوو ترین لاوەکانی قورەیشە ، وەرە پیاوی چاك بە ئەم کـوڕەمان لێ وەرگرەو بیکە بەکوڕی خۆت‌و محمدی برازاتمان بدەرێ بیکـوژین ، خوێنی پیـاو هەرپیاوە . ابوطـالب وتی : بەخوا کارێکی خراپ‌و نارەوام لەگەلاْئەکەن ، کوڕی خۆمتان بدەمێ بیکوژن‌و کوڕی‌خۆتانم ئەدەنێ بۆتانی بەخێوبکەم!!

هەرگیز شتی وانابێ . ئینجا قورەیشی یەکان بێ هیوا بوون لە ابوطالب وزانیان کەبەهیچ جۆرێ دەس بەرداری محمدی برازای نابێ ، وەبەناچاری پەنایان بردە بەر شێوەیەکی تر لەرێ گرتن و بەربەرەکانی ئیسلام ، ئەویش سزاو ئازاردان و چەوساندنەوەی محمدو یارە موسلمانەکانی بوو .

وەابوطالبیش - بەدەوری خۆی - چوە ناوخزمەکانی لەبەرەی هاشم و بەرەی مطلب وئەم هەموو باس و هەلوێستانەی خۆی و محمدو قورەیشی تێ گەیاندن و داوای لێ کردن کەبەیەك دەنگ پشتگیری محمد بکەن و بی پارێزن ، هەموویان کفتیان دا بەابوطالب تەنیا ( أبولهب ) نەبێ کە لێیان جیابوەوەو پالی دا بەدوژمنەکانیانەوە ،

## قورەیش ئازاری محمد ئەدەن

قورەیشی یەکان کەوتنە ئازاردان و چەوساندنەوەی محمدو یارەکانی بە هەرجۆر بۆیان کرا . أبوجهل وعقبەی کوری معیط وأبولهب و وێنەیان هەرچی رق و قینیان لەدلا بوو بەپێغەمبەریان ئەرشت ، بەجنێوو کالتەپێ کردن و تانەو تەشەر لێدان ، بەلێدان و سزادان و بەدرۆخستنەوەی .

عبداللەی کوری مسعود ئەلێ : « لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین « د . خ » لەکعبەدا نوێژی ئەکرد ، ئەبوجهل وتی : ئەوە یەکێ نیە بروا لەقەسابخانەی فلان تیرە سلخور و پیسایی ووشترێك بێنێ و بیدا بەسەری محمدا کەلەسوجدەدایە ، کورج عقبەی کوری أبی معیط راست بوەوەو چو سلخوری ووشترێکی هێناو کەپێغەمبەرچوە سوجدەوە دای بەسەریا ، وەئەوموسلمانانەی لە دەوری کعبەدا بوون هیچیان نەیان وێرا بچن لای بەن لەسەری ، چونکە دوژمنەکانی نەیان ئەهێشت و ئەمانیش چاریان نەئەکردن ، هەتا فاطمەی کچی هات و پیسایی یەکەی لابردو پاکی کردەوەو رووی کردە

قورەیشی‌یەکان‌و دەستی کرد بەقسە پێوتنیـان ، ئینجا پێغەمبەر هەڵسـاو نوێژی کرد ولەخوا پاڕایەوە . عبداللەی کوڕی مسعود ئەڵێ : گوێم‌لێ‌بوو ئەی فەرموو : خوایە قورەیشی‌یەکان بگرە ، خوایـە مضر بگـرە ، خوایە أبوجهل وعقبەی کوڕی ربیعەو عقبەی کوڕی أبی **معیط** وأبیەی کوڕی‌خلف وشەیبەی کوڕی ربیعەو ولیدی کوڕی عتبە بگـرە بەزڕقی خـۆت . کە گوێیان لەمەبوو ترسان وبڵاوەیان کرد ، وەعبداللە ئەڵێ : لاشەی‌هەموویانم دی لەبدرا کەوتبوون « (١)

( ابن سعد ) لەخاتوعائشەوە ئەگێرێتەوە کەپێغەمبـەر فەرمووی : « لە ناوەندی دوو دراوسێدا بووم کەخراپترین دراوسێ بوون : أبولهب‌و عقبەی کوڕی معیط ، ئەهاتن پیسایی‌و سلخوڕی وشتریان ئەهێناو فڕێیان‌ئەدایە بەردەرگاکەم ، هەتا پیسایی خۆیشیان فڕێ ئەدا » .

« جارێکیان پێغەمبەر ( د . خ ) لەحجرەی کەعبـەدا نوێژی ئەکـرد وەعقبە هات‌و عەباکەی لەملا باداو توندی کرد خەریك بوو بی‌خنکێنێ ، تا ابوبکر هات‌و قۆڵی گرت‌و دووری خستەوە لێی وفەرمووی : ئایا ئێوە ئەوپیاوە ئەکوژن کەئەڵێ : خوا پەروەردگارمە ، وەلەسەر ئەمەیش بەڵگەو نیشانەی ئاشکرای بۆهێناون لەلایەن خوای خۆتانەوە » (٢) .

عەباسی مامی پێغەمبەر « د . خ » ئەڵێ : ڕۆژێ لەکەعبەدا بووم أبوجهل هات‌و وتی : بەخوا ئەگەر ببینم محمد لەسوجدەدابێ بەپێوە ئەچمە سەر ملی ، منیش چـووم ئەم هەواڵەم دا بە پێغەمبەر ، ئەویـش ڕقی هەڵساو کورج هات بۆمزگەوت ، ئەوەندە بەپەلە هات فریا نەکەوت لەدەرگاوەبێ، لەسەر دیوارەکەوە هاتە ژوورەوە ودەستی کرد بەخوێندنی : ( إقْرَأْ بِاسْمِ

(١) بوخاری ڕیوایەتی کردووە . (٢) بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ـ هەتا گەیشتە ئەوشوێنەی باسی أبوجهل ئەکات ـ كلا إن الانسان ليطغى أن رآه استغنى » وە سورەتەکەی تەواو کردو چوە سوجدەوە ، یەکێ بەأبوجهلی ووت : أبوالحکـم ئەوەتـا محمد لەسوجدەدایە ، ئەویش ڕووی تێ کردو ڕۆیشت بۆلای و کوت‌و پڕ گەڕایەوە ، وتیـان : ها چی بوو ؟ بۆچی گەڕایتەوە ؟ ووتی : نابینن‌چی‌یە لەناوەندی من‌و ئەوا هەتا ئاسمان گیراوە .

أبوجهل زۆرجار بەپێغەمبەری ئەوت : نـابێ لە مزگەوتا نوێژ بکەی. جارێکیان ـ لە کاتێکا پێغەمبەر لـە نوێژ ئەبووەوە ـ پێ‌ی‌وت : من نەموت نـابێ نوێژبکەی ؟ پێغەمبەریـــش بەتوندی وەڵامی دایەوە و هەڕەشـەی لێ کـرد ، ئەویش وتی : هەڕەشەم لێ‌ئەکەی ؟ خۆمن لەهەموو پیاوێکی ئەو شیوە لە نادی‌دا کەسم زیـاترە ئەگەر بمەوێ ئەم دۆڵەت لێ پڕ ئەکەم لەسوار و پیادەی جەنگی ، لێرەدا خوای گەورە بەشی دوایی سورەتی « علق »ی ناردە خوارەوە بۆترساندنی : كَلَّا إِنَّ الإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى ، إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى ، أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى ، عَبْداً إِذَا صَلَّى ، أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى ، أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللهَ يَرَى ، كَلَّا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ، نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ، فَلْيَدْعُ نَادِيَه ، سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ، كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ . »پێغەمبەرقەرمووی بەخوا قەسەم ئەگەر بانگی پیاوەکانی( نادی ) یەکەی بکردایە ، بەئاشکرا فریشتەئەیدا بەسەریاناو لە نـاوی ئەبردن .

جارێکیـان کابرایەکی ئـاوارە بەناوی « ئەراشی » یەوە هەندێ وشتری فرۆشت بە « أبوجهل » ئەویش لەپاشـا هەقەکەی نەئەدایەو تەفرەی ئەدا کابرایش ناچار بوو پەنای بردە بەرکۆمەڵی قورەیش و داوای یـــارمەتی

لێ کردن تا ئەو ماڵەی بۆ بسێنن لە « أبوجهل » ئەوانیش بۆ گاڵتەپێ کردن نـــارديان بۆلای پێغەمبەر چونکە ئەيانزانی کە « أبوجهل » چەند دژی پێغەمبەرە ، کابرايـــش هـــاتە خزمەتی پێغەمبەرو داوای يـــارمەتی لێ کرد ، پێغەمبەریش هات لەگەڵی و دای لەدەرگای مـــاڵی ابوجهل ، أبوجهل ووتی کێيە ؟ فەرموی : « محمد » ە ، خێرا بە شپرزەيی هـاتە دەرەوە و ڕەنگی تێك‌چوو بوو ، پێغەمبەر فەرموی هەقی ئەم پياوە بدە .
أبوجهل وتی : بوەستە تائێستا بۆت دێنم ، خێرا ڕۆيی و هەقەکەی بۆهێناو دايەدەستی . قورەيشی‌يەکان وتيان : ئەوە أبوالحکم چی‌بوو ؟ بەڕاستی هێشتا ئيشی‌وامان لێ‌نەديوی ؟ . وتی : هاوار بۆ ئێوە بەخوا هەردای لەدەرگاکەم دەنگێ دای لەکوێنم کاسی‌کردم و بەسەر سەرمەوە ئێرە وشترێکم دی هێشتا شتی‌وام نەديوە .

وەيەکێ‌تر لەوانەی ئازاريان ئەدا « أبولهب » ی مامی‌و ژنەکەی بوو ، ئەچون پيسی و دڕك‌و داڵيان ئەخستە بەردەرگاکەی و پێغەمبەريش ئەهـــات فڕێی ئەداو ئەی‌فەرموو : ئەی بەرەی « عبدمناف » کەی دراوسێتی وايە ؟

« إبن إسحاق » ئەڵێ : « حسينی کوڕی عبدالله‌ی کوڕی عبيدالله‌ی کوڕی عباس بۆی گێڕامەوە ووتی : بيســتوومە لەکوڕی « عبادی ديلی » ئەی وت : کوڕێکی گەنج بووم لە گەڵ باوکما سەيری پێغەمبەری خوام ئەکرد ، ئەچوو بۆ ناو هۆزو تيرەکانی عەرەب و پياوێکی خێلی دەم‌و چاو جوانی لە دواوەبوو : ، پێغەمبەر « د . خ » لـــەلای هەموو هۆزێك ڕائەوەستاو ئەی‌فەرموو : « ئەی بەرەی فلان من پێغەمبەری خوام بۆلای ئێوەو داواتان لێ‌ئەکەم کەخوا بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن ، وەباوەڕم

پێ بکەن و پشتیوانیم بکەن هەتا خوا چی فەرمووە پێم بەخەڵکی بکەیەنم »
کەڵێ ئەبوەوە پیاوەکەی تر لەدوایەوە ئەیوت : ئەی بەرەی فلان ئەمە
ئەیەوێ لێتان کە دەس هەڵگرن لە « لات » و « عزی » و هاوپەیمانە
جنۆکەکاتتان لەبەرەی مالکی کوڕی ئەقمەس و بچنە سەر ئەوشتە خراپ
و سەرلێ شێواوی‌یەی کە هێناویەتی . گوێی نەدەنی وشوێنی نەکەون .
ووتم : بابە ئەوە کێیە ؟ ووتی : « أبولهب » ی مامێتی » (۱)

وەژنەکەیشی کە « ئەرواى کچی حربی کوڕی أمیە و خوشکی
أبوسفیان بوو وەپێیان ئەووت أم جمیل وەزۆر ئازاری پێغەمبەری ئەدا
و ئەچو بەکۆڵ درك ودالی ئەهێناو لە ڕێی پێغەمبەری خواو بلاوی
ئەکردەوە . « إبن إسحاق » ئەڵێ : « کاتێ ( أم جمیل ) بیستی قورئان
لەدژی خۆی و مێردەکەی هاتۆتە خوارەوە ، هات بۆلای پێغەمبەر کە لە
مزکەوتالای کەعبە دانیشتبووئەبوکری لەکەلابوو ، بەردێکی پڕبەچنگی لە
دەستابوو ، کەهاتە سەر سەریان خوا کوێری کرد لە حاستي پێغەمبەر و
تەنیا ئەبوبەکری بینی ، وتی : ئەی ئەبوبەکر کوا هاوڕێکەت ؟ بیستوومە
هەجوی کردوم و وتەی خراپەی پیاهەڵداوم ، بەخوا دەسم کەوتایە ئەم
بەردەم ئەمالی بەدەمیا ، داوایی ڕۆیشت . ئەبوبەکر وتی : ئەی پێغەمبەری
خوا ئەوەنەی بینیت ؟ فەرمووی : نەمە چونکە خوا کوێری کرد لەحاستی من»

وەکە سورەتی « تبت یدا أبی لهب » هاتەخوارەوە ، أبولهب بەعتبەی
کوڕی وت : ـ کەرقیەی کچی پێغەمبەری مارەکردبو و هێشتا نەی
گوێزابوەوە ـ سەری من لەسەرت حەرام بێ هەتا کچەکەی محمد تەلاق
نەدەیت ؟ ئەویش کوڕج تەلاقی‌دا ، ئەم‌کوڕە لەدوای گرتنی شاری مەکە

(۱) امام احمدو طبرانی ڕیوایەتیان کردوە .

موسلمـان بوو خوالێی ڕازی‌بێ ، وەعتیبەی کـوڕێشي « ام کلثوم » ی کچی پێغەمبەری مارەکردبو وەئەمیش هێشتانەی گوێزابووەوە ، ئەی‌ویست بڕوات بۆ کاروانی شام ووتی : ناچم هەتـا ئازاری محمد نەدەم ، هـاتە لای‌و ،وتی : مـن کافرو بێ‌باوەڕم بە « النجم اذاهوی » وە « بـــالذی دنافتدلی » ئینجا تفێکی کردە ناوچـــاوی پێغەمبەرو کچەکەی تەلاّقدا، پێغەمبەریش نـاڕەحەت بوو و فەرمووێ : « خوایە سەگێ لە سەگەکانی بۆبنێرە » أبوطالب لەوێ‌بوو هاواری لێ‌کردو وتێ : ڕۆڵە بۆ ئەو نزایەت لێ‌کرد ؟ کە چووەوە ئەم بەسـەرهاتەی بۆ ابولهب گێڕایەوە و لەگەڵ کۆمەڵێکا چوون بوشام‌و لەڕێکا لەشوێنێکا خستیان‌و ڕاهیبێك لەئەشکەوتێکا بوو هات‌و پێ‌ی وتن : ئەم شوێنە دڕندەی زۆرە ئاگاتان لەخوتان‌بێ ، أبولهب بەهاوڕێکانی وت : ئێوە نەژادو پایەی من ئەزانن وتیان بەڵێ ، وتی : دەپیاوی چاك‌بن ئەی کۆمەڵی قورەیش یارمەتیمان بدەن ئەم شەو ، چونکە من لە نزاکەی محمد ئەترسم کەلە کوڕەکەمی کردوە ، هەمووو کەل‌وپەلەکانتان بێنن لای ئەم ئەشکەوتە کەلەکەیان بکەن و لەســەر ئەوانەوە جێگەی کوڕەکەی من دابخەن‌و بەدەوریا جێگای خۆتان‌دابخەن ، ئەوەی ابولهـب وتی جێ‌بەجێـیان کردو ووشتـرەکانیشیان بەدەوری خۆیانا مۆڵ‌داو هەموو چاویان بڕی‌یە عتیبە ، بە فەرمانی‌خوا شێرێك هات و یەکەیەکە بۆنی پێوەکردن تاگەیشتە سـەر عتیبەو لێ‌ی‌دا و کوشتی ، وەلە هەناسەی دوایی‌دابو وتی : ئەموت نزای محمد ناگەڕێتەوە و مرد . باوکیشی وتی : بەخوا ئەمزانی لەنزاکەی محمد دەرناچێ .

وەیەکێ ترلەوانەی ئازاری پێغەمبەریان‌ئەدا « عقبەی کوڕی معیط » بوو : ئەمیش ـ وەکو ابولهب ـ دراوسێ‌ی بوو ، جارێکیان نان‌و چێشتکی

دروست کردو گەورەگەورەکانی قورەیشي بانگ کردو پێغەمبەریشیان تیابوو ، پێغەمبەر « درودی لەسەربێ » فەرمووی : بەخوا نانت ناخۆم هەتا باوەڕ بەخوا نەکەیت ، ئەویش شایتومانیهێنا ، ئەمڕووداوە کەیشتەوە « أبیەی کوڕی خلف » جەمحی کەهاوڕێی بوو ، وتی چییە ئەو هەواڵەی بیستومە ؟ وتی : هیچ نیە . پیاوێکی ناودار هاتە ماڵەکەم و وتی : نانت ناخۆم تا شایتومان نەهێنی ، منیش شەرمم کرد بێتە ماڵم ونانەکەم نەخوا ، شایتومانم هێنا أبیە وتی : ڕوی من لەڕوی تۆ حەرام بێ ئەگەر کەیشتي بە محمدو پێت نەنایە گەردنیاو تفت نەکردە ناوچاویو شەقازللەت نەدا لەچاوی . کە عقبە پێغەمبەری دی بێ شەرمی کرد لەخزمەتیاو خوایش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە لەباسی عقبەدا :

« ویوم یعض الظالم علی یدیه یقول یالیتنی اتخذت مع الرسول سبیلا ، یاویلتالیتنی لم اتخذ فلاناً خلیلاً لقد أضلني عن الذکر بعد اذجاءني وکان الشیطان للانسان خذولا » (١)

لەپێشەوە باسمان کرد کەعقبە بەواتەی أبوجهل چو سلخوری هێنا ، وەجارێکی تر عەباکەی لەملي پێغەمبەرا بادا ، وەدراوسێیەکی خراپ بوو.

وەیەکێ تر لەوانەی ئازاریان ئەدا ( حەکەمی کوڕی عاص ) بوو .

کچەکەی پێی ووت : بەخوا ئەی کۆمەڵی بەرەی أمیە ئێوە کۆمەڵێکی بێ ڕاو ڕاوێژو بێدەسەڵات بوون لەبەرابەری پێغەمبەرەوە ، ووتی : کچی خۆم سەرزەنشتمان مەکە بەخوا چیم دیوە ئەوەت بۆنەگێرمەوە : جارێکیان بڕیارمان دا بچینو شەو بیکوژین ، کەچوین نوێژی ئەکردو چوینە پشتیەوە کوێمان لەدەنگێك بوو وامان زانی چی کەژو چیا لە تیهامەدایە ئێستا

(١) سورەتی « الفرقان »

ئەکەوێ بەسەرمانا ، وەئاکامان لەخۆمان نەما ئەو لەنوێـژەگەی بوەوە و ڕۆیشتەوە ماڵەکەی خۆی ، لەپاشا شەوێ‌تر بڕیارماندا کەبێ‌کوژین وبۆی دانیشتین کەهات هەڵسااین بۆی کەچی سەیرمان‌کرد سەفاومەروە کەوتونە نێوان ئێمەو ئەوەوە .

وەیەکێ تر لەوانە عاص کوڕی وائلی سەهمی قورەیشی باوکی عەمری کوڕی عاص بوو : زۆر ڕقی لەپێغەمبەری خوا بوو ودوژمنایەتی ئەکرد ، ئەی ووت : محمد بەوە شوێن کەوتوەکانی هەڵخەڵەتاندووە کەلەدوای‌مردن زیندوو ئەبنەوە ، بەخوا تەنیا چەرخی گەردون «الدهر» ئەمان مرێنێ . خوایش لە بەدرۆخستنەوەی ئەما ئەفەرموێ : « وقالوا ماهـی إلا حياتنا الدنيا نموت ونحيا وما يهلكنا الا الدهر وما لهم بذلك من علم إن هم إلا يظنون » (١) . ( عاص ) قەرزێکی خەبابی کوڕی ئەرەتی بەسەرەوە بوو داوای لێ‌کرد ، عاصیش وتی : ئایا محمد کەتۆ لەسەر ئایینەکەیتی بەلایەوە وانیە لەبەهەشتا زێڕو زیوو بەرگو نۆکەر هەیە ؟ وتی : بەڵێ وایە . وتی دەلێم کەڕێ لەو ڕۆژەدا ماڵو منالم ئەبێو قەرزەکەت ئەدەمەوە . خوایش لەدژی ئەو فەرموی : « أفرأيت الذی كفر بآياتنا وقال لأوتين مالاً وولداً اطلع الغيب أم اتخذ عند الرحمن عهداً ؟ كلا سنكتب مايقول ونمد له من العذاب مدا ونرثه مايقوله ويأتينا فردا » (٢) .

وەیەکێ تر لەوپیاو خراپانە وەلیدی (٣) کوڕی مغـیرەی مەخزومی‌و مامی ابوجهـل بوو : ئەمە لەگەورەکانی قورەیش بوو زۆریش دەوڵەمەندو بەدەسەڵات بوو . بەپێغەمبەری ئەووت : ئەگەر پێغەمبەریتی ڕاست بوایـە

---

(١) سورەتی ـ الجاثیە ـ (٢) سورەتی ـ مریم ـ

(٣) سامانو دەسەڵاتی وەلید بەجۆرێ بووە پێیان ئەوت تاقانە (وحید) .

من شایانتر ئەبووم پێی لەتۆ ، چونکە بەتەمەنو ماڵو سامانو دارایی لە تۆ زیاترم . جارێکیان گوێی لەپێغەمبەربوو قورئانی ئەخوێند ، زۆر بە لایەوە ناوازە بوو وتیی تێ‌کرد ، ئینجا بەبەرەی مەخزومی خـزمی وت : بەخوا وتەیەکـــم لەمحمد بیستوە ، نە وتەی ئادەمی‌یە وە نەوتەی پـەری ـ جنۆکەـ یە ، وتەکەی شیرینی تیایەو ڕازاوەیە ، سەرەکەی میوەدارو بنکەکەی قووڵە ، بەخوا ئەو وتەیە سەرئەکەوێو هیچ شتێ بەسەریا زاڵ نابێ . قورەیشی‌یەکان کەئەمەیان زانی وتیان : بەخوا وەلید شێت بووەو ئیتر هەموو قورەیش شێت ئەبێ . ابوجهل وتی : من ئەمەتان بۆچارئەکەم ، هەڵسا چووە لایەوەو بەخەفەت باری‌یەکەوە لای دانیشتو کەوتە دواندنی هەتا گەرمی کرد ، ئنجا هەڵساو هاتە لایانو وتی :

ئێوە ئەڵێن محمد شێتە ، ئایا هەرگیز دیوتانە شتی ناڕەوا بکات ؟ ئەڵێن کاهینە ، ئایا هێشتا ڕملی لێ داوە ؟ ئەڵێن شاعیرە ، ئایا هەرگیز شێعری وتوە ؟ وەئەڵێن درۆزنە ، ئایا تا ئێستا درۆتـان لێ بیستووە ؟ لە وەڵامی هەموویا ئەیان وت : نەبەخوا . وتیان : ئەی چی یە ؟ بەخـوا وازت لێ ناهێنین تا شتێکی لێ‌نەنێی ، هەندێ بیری کردەوە ولەپاشا وتی : هـەر جادووکەرە ئەوە نیە جیاوازی ئەخاتە نێوانی پیـاوو ماڵو منداڵو کەس و کاری . بەم ڕایە یەکســەر نادیەکە پڕبوو لـە خۆشی‌و شـادی . خوای گەورەیش لەدژی وەلید ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە : « ذرني ومن خلقت وحيداً . وجعلت له مالاً ممدودا وبنين شهودا . ومهـدت له تمهيدا . ثـم يطمع أن أزيد ، كلا إنه كان لآياتنـا رغيدا . سأرهقه صعودا إنه فكـر وقدر . فقتل كيف قدر . ثم قتل كيف قدر . ثم نظر . ثم عبس وبسر ثم أدبر واستكبر . فقال إن هذا إلا سحر يؤثر . إن هذا الا قول البشر

ساصليه سقر » (١) .

وەیەکێ‌تر لەو بەدخووانە « نضری کوڕی حارث » بوو : ـ کەلەبەری عبدالدار کوڕی قصي بوو ـ ، کەپێغەمبەر لەناو کۆمەڵێـــکا دائەنیشت‌و ئامۆژکاری ئەکردن‌و بانگی ئەکردن‌و باسی ئومەت‌و کەلە پێشوەکانی بۆ ئەگێڕانەوە ، « نضر » یش ئەی ووت : ئەی‌کۆمەڵی قورەیش وەرن بۆلای من ، من قسەم خۆشترە لەو ، وەدەستی ئەکرد بەباسی پاشاکانی فارس ، وەئەی وت : قسەکانی محمدیش هەرئەفسانەی ڕابوردوەکانە .

وەزۆری‌تر لەقورەیشەکان ئازاری جۆر بەجۆری پێغەمبـەریان ئەدا ، وەئەمەیش نموونەیەکە لەخەروارێك .

بەڵام پێغەمبەری خوا لەبەر ئەو هەموو جەورو سـزاو ئازارەدا خۆی ڕاگرت وخۆی نەئەلەخشان : چونکە ئیش‌و کاری ئەو گەورەتربـوو لەوەی بەوجۆرە کارانە بەرهەڵستی بکرێ ، وەئەو خۆی بەخشی بوو بەخـــوای پەروەردکار ، وەئەی‌ویست مرۆڤایەتی بەجارێ ڕزگاربکا ، ئیترنەفامەکان چی ئەکەن بابیکەن .

## ئازاردانی یارانی پێغەمەر

ـ درودی لەسەربێ ـ

وەلەم سزاو جەورو چەوسانەوەیەدا بەشی یارە موسلمانەکانی کەمتر نەبوو ـ بەپێی پلەی خۆیان ـ لە بەشەکەی پێغەمبەر ، بەتایبەتی بەندەو کەنیزەك‌و ئـاوارەو ئەوانەی کەس‌وکاری وایـان نەبوو بیان پارێزێ ، وە لەوانەی ئـازاردران : ١ ـ ابوبکـرێ صدیق ـ خـوالـێ‌ی‌ڕازی‌بێ ـ جارێکیان لە کەعبەدا خواپەرستی ئەکرد ، قورەیشی‌یەکان لێـی کۆبونەوە

(١) سوورەتی ـ المدثر ـ

و کەوتنە ئازاردان‌و لێدانی و خستیانە ژێر پێوە و زۆریان لێ‌داو «عتبەی کوڕی ربیعە» پێڵاوەکانی گرت بەیەکەوەو ئەی‌کێشا بەسەروچاویا ، وای لێ‌هات چاو و لووت‌و دەمی لێك جیانەئەکرایەوە ، بەرەی تەیمی‌یەکانی خزمی هاتن و خەڵکەکەیان لێ‌دوورخستەوە و خستیانە جلێك‌و بردیانەوە بۆ ماڵەوە و گومانیان نەبوو کە ئەمرێ ، هاتنەوە بۆ مزگەوت و وتیان : ئەگەر ( ابوبکر ) مرد عتبەی لەسەر ئەکوژین . چوونەوە بۆلای «أبوقحافە»ی باوکی و خزمەکانی هەرچی بانگیان لێ‌کرد وەڵامی نەدایەوە . هەتا لای ئێوارە چاوی هەڵ‌بڕی‌و وتی : پێغەمبەری خوا چی‌بەسەرهات ؟ لێرەدا دەستیان کرد بەقسە پێ‌وتنی و بەجێ‌یان هێشت‌و وتیان بە«أم‌الخیر»ی دایکی : بزانە بەڵکو ئاوێ خواردنێکی دەرخواردبدەی ، دایکی چووەپشت سەری‌و زۆری لەگەڵاوت بەڵام ئەو هەرئەیوت : پێغەمبەر چی‌بەسەرهات ؟ دایکیشی وتی : بەخوا نازانم و ئاگام لە هاوەڵەکەت نیە . وتی : دەبرۆ بۆلای « أم جمیل » ی کچی خطاب و لێ‌ی بپرسە . دایکی چو بۆلای « ام جمیل » و پێ‌ی وت : « أبوبکر » داوای هەواڵی «محمد»ی کوڕی « عبدالله » ت لێ ئەکا ، ئەویش وتی : نە « محمد » ئەزانم‌و نە « ابوبکر » حەزئەکەی باپێکەوە بچین بۆلای « ابوبکر » ی کوڕت ، وتی : باشە ، وەپێکەوە هاتن ، کە ابوبکری بەوشێوەیەدی واپەرێشانە لێ‌ی نزیك‌بووەوە و هاواری کردو وتی : بەخوا ئەوانەی وایان کردوە لەتۆ کافرو پیس‌و بەدخوون و هیوام وایە خوا تۆڵەی تۆیان لێ بسێنێ ، ( ابوبکر ) وتی : تۆواز بێنە لەوانە پێغەمبەری خوا چی بەسەرهات ؟ وتی دایکت کوێ‌ی‌لێ‌یە ، ئەویش وتێ قەی‌ناکات‌و زیانی‌نیە ، ئینجا « أم‌جمیل » وتی : ساغ‌و بێ‌وەیە ، وتی : لەکوێ‌یە ؟ وتی : لەماڵی

« أرقم » ی مەخزومیی‌یە ، وتی : بەخوا سا تامی هیچ ناکەم هەتا نەچمە خزمەتی پێغەمبەر ، دانیشتن تا ئێوارەو هات‌وچۆ نەما چوونە ژێر بالی وبردیان تا گەییشتنە خزمەتی پێغەمبەر ، پێغەمبەرو موسلمانەکان زۆر بەزەیی‌یان پیا هاتەوەو دەستیان کرد بەماچ کردنی ، أبوبکر فەرمووی بە پێغەمبەر : دایك‌و باوکم فیدات بێ هیچم نیە ئەودەمەو چاوەم نەبێ ، ئەوە دایکمە وزۆر باشە بۆم بەڵکو لەسایەی تۆوە خوا لەئاگری دۆزەخ رزگاری بکا ، پێغەمبەریش لەخوا بۆی پاڕایەوەو بانگی کرد بۆئیسلامەتی وموسلمان بوو .

خاتو « عائشە » ـ خوا لێی رازی بێ ـ ئەڵێ : کاتێ بێ‌شەرمی قورەیشی‌یەکان (١) ئازارو چەوساندنەوەی زۆریان چەشت لێ یانەوەو پێغەمبەر فەرمانی‌دا بەموسلمانەکان کەکۆچ بکەن بۆحەبەشە ، ئەبوبەکریش زۆر بێ‌تاقەت بوو ، ویستی کۆچ بکا بۆحەبەشەو بچێتە شوێنێ بەسەربەستی خوا پەرستی بکا ، لەماڵ هاتە دەرەوەو بەرەو حەبەشە کەوتە رێ هەتاگەیشتە شوێنێ پێی ئەڵێن « برك الغماد » لەوێدا « إبن‌الدغنة » ی پێ‌گەیشت ـ کەسەرۆکی هۆزی قارە بوو ـ لێی پرسی : أبوبەکر ؛ ئەوە بۆ کوێ ئەچی ؟ وتی : خزمەکانم دەریان‌کردوم وئەمەوێ بکەڕێم بەجیهاناو خوای خۆم بپەرستم ، ئەویش وتی : پیاوی وەکو تۆ دەرناکرێ ، تۆ ئیشی چاك ئەکەی‌و سەر لەخزم‌و خوێش ئەدەی‌و دڵنەوایی داماو وهەژار ئەکەیت‌و میوانداری ئەکەیت‌و یارمەتی لێقەوماوانی ئەدەیت . من ئەبمە پەناگیری تۆ ، بگەڕێرەوە لەووڵاتی خۆت‌تا خوای خۆت بپەرستە ، پێکەوە گەڕانەوە کەگەیشتنە مەکە « ابن الدغنە » گەڕا بەناو گەورە گەورەکانی قورەیشداو وتی : پیاوی وەکو « أبوبکر » دەرناکرێ چونکە خزمەتی گەورەی هەیە

ومن پەنام داوەتێ ، قورەیشی یەکان پەناکەی « ابن الدغنە » یان وەرگرت و وتیان : بڵێ بەابوبکر بچێ لەماڵی خۆیا خوای خۆی بپەرستێ وچەندی ئەوێ نوێژ بکاو چی پێخۆشە بێخوێنێ ، بـــەوانە ئازاری ئێمە نەداو ئاشکرایان نەکا ، چونکە ئەترسین ژن و منداڵەکانمان بەهۆیەوە تووشی خراپە بین و هەڵ بخەڵەتێن . « ابن الدغنە » ئەمەی گەیاند بە « ابوبکر » ئەویش لەماڵەوە خوا پەرستی ئەکردو نوێژو قورئانی لەماڵا ئەخوێند ، پاش ماوەیەك ابوبکر لەماڵی خۆیا مزگەوتێکی دروست کردو نوێژی تیا ئەکردو قورئانی تیا ئەخوێند ، ژن و منداڵی قورەیشی یـەکان ئەچوون بۆلای و دەورەیان ئەداو سەیریان ئەکرد زۆریان پێخۆش بوو وتیی تێ ئەکردن ، أبوبکر پیاوێکی دڵ نەرم بوو هەرقورئانی بخوێندایە خۆی پێنەئەگیرا لەبەر گریان ، ئەمەیش سەرۆکە قورەیشی یـەکانی نارەحەت کرد ، بۆیـــە ناردیان بە شـوێن « ابن الدغنە » داو پێیان وت : ئێمە لەبەر پەناکەی تۆ پەنای ابوبکرمان دا کەلەماڵا خوا پەرستی بکا ، ئێستا ئەوبەوە نەوەستاوەو مزگەوتێکی لەماڵەوە دروست کردوەو بەئاشکرا نوێژی تیا ئەکاو قورئانی تیا ئەخوێنێ ، ئێمەیش ئەترسین کەژن و منداڵەکانمان لێوەی تووشی خراپە بـن ، جا ئەگەر پێی خۆشە ـ وەکو پێمان وتی ـ بچێتە ژوورەوەو کەس پێی نەزانێ ، وەئەگەر رازیش نابێ ، پەناکەی خۆتی لێبسێنەرەوە ، ئێمە پێمان ناخۆشە پەنای تۆ بشکێنین وناتوانـین ابوبکر بەو ئاشکرایی یە خوا پەرستی بـکات . « ابن الدغنە » یش چوە لای ابوبکـر وپێی ووت : خۆت ئەزانی مـن لەسەر چ مەرجێ پەنام دایت ، ئێستایش یا بچۆرەوە سەرمەرجەکە ، یان پەناکەم بدەرەوە ، من پێم ناخۆشە عەرەب ببیسن کەمن پەنای پیاوێکم داوەو پەنـاکەم شکاوە . ابوبکـر « خـوا لـێی رازی بێ » فەرموی :

پەناکەت ئەدەمەوەو تەنیا بەپەنای خوای پەروەردگار ڕازیم . بەم بۆنەیەوە ئازارێکی زۆری ابوبکر درا (۱) .

۲ ـ « بلال کوڕی رباح » ی حەبەشی : وەیەکێ‌تر لەوانەی تووشی ئازاردان بوون ( بـلال ) ی حەبەشی بوو ، کەبەندەی « أمیـەی کـوڕی خلف » بوو ، کاتێ کەزانی موسلمان بووە هەوڵی‌دا پەشیمانی بکاتەوە ، بەڵام بێ‌سوودبوو ، ئینجا کەوتە ئازاردانی ، بەجۆرێ ئەچو پەتی ئەخستە ملی‌و ئەیدایە دەست منداڵە ووردە هەتا ڕای کێشن وپەت پەتی پێ‌بکەن ، ئەویش هەر ئەی‌وت « أحد ، أحد » واتە خوا هەریەکە ونابێ بەدوو ، وەئەوهەموو ئازارە لەخوا پەرستی لای نەئەدا . یا لەکاتی گەرمای هاوینا ئەی‌هێنا لەناو ئەولە گەرمەی مەکەدا ـ ئەی‌خست‌و بەردی گەورەیان‌ئەخستە سەرسنگی‌و ئەی وت : ئەبێ ئەوە پیشەت بێ هەتا یائەمری ، یا پەشیمان ئەبیتەوە لەسەر ئایینەکەی محمد و « لات‌و عزا » ئەپەرستی ، ئەویش هەر ئەی‌فەرموو : « أحد ، احد » . بەوپێ‌یە مایەوە تا ڕۆژێ أبوبکـر بەوێدا تێ‌پەڕی‌و ئەودیمەنە ترسێنەرەی بیـنی بە« أمیـە »ی وت : ئەوە لەخوا ناترسی‌و تاکەی ئازاری ئەوداماوە ئەدەی ؟ وتی : تۆ خراپت کردووە دە ڕزگاری بکە ، لێرەدا أبوبکر لێی کڕی‌و ئازادی کرد . وەبێـجگە لە بلال ، ابوبکر « خوای لێ ڕازی بێ » کۆمەڵێ بەندەو کەنـیزەکی کـڕی ـ کەلەسەر ئیسلام بوونیان ئاغاکانیان سزایان ئەدان ـ وئازادی کردن ، وەلەناو ئەوانەدا حەمامەی دایکی بلال‌و عامری کوڕی فەهیرە ـ کەلێیان ئەدا لەسەرخۆی ئەچوو ـ وە ابوفکیهة کەبەندەی « صفوان » ی کـوڕی « أمیە » بوو .

---

(۱) نجاری ڕیوایەتی کردوە .

٣ ـ خێزانی یاسر : وەلەوانەی کە ئازاردران خێزانی یاسر بوو . یاسر خۆی و « سمیە » ژنی و عماری کوڕی . . بەسەخت ترین شێوە ئازاریان ئەدان ، بەئاگرو ئاسنی داغ دەم و چاو و پشتیان داغ ئەکردن ولێیان ئەدان بۆ ئەوەی پەشیمان بینەوە لە ئیسلام ، بەڵام ئەوان ڕووناکی - نور - ی ئیسلامەتی دڵی ڕۆشن کردبوونەوە و بیریان لەخۆشی بەهەشت و لەگەرماو سزای سەختی دۆزەخ ئەکردەوە .

ئیتر ئەو ئازارەی ئەوانیـــان بەلاوە سووك بوو و ئەیـان ووت : « لاإلەإلا الله محمد رسول الله » . ڕۆژێ پێغەمبەر بەو حاڵەوە بەلایانـا تێپەڕی ، بەدڵی پڕ لەناســـۆرەوە فەرموی : « بەورە و بەئارام بن ئەی بەرەی یاسر بەڕاستی جێگاتان بەهەشتە ، خوایە بێ بەهاواری بەرەی یاسرەوە . »

بەوچەشنە سزادران هەتا یاسر لەژێر سزادا مرد ، ڕۆژێکیش « ســمیە » بەتوندی وڵامی أبوجهلی دایەوە ، ئەویش نێزەیەکی کرد بە ورگیاو کوشتی ، وەبوو بەیەکەم شەهیدێ کەلە ئیسلاما خوێنی ڕژابێ .

وەئازاردنی عماری هەژار هەتا پێی ئەچو ســـەختتر ئەبوو : جارێك بە ئاگر داخیان ئەکرد و جارێ لە ئاوا نوقمیان ئەکرد و پێیان ئەکرد و پێیان ئەوت : لێت ناگەڕێین و وازت لێ ناهێنین هەتابە خراپە لە محمد نەدوێی ، یابەباشی ناوی خواکانمان نەبەیت ، تارۆژی کەپێیە گیانی و قسەیەك هات بە دەمیا ، ئەوانیش بەریاندا ، بەگریانەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەرو هاواری بۆهێنا ، پێغەمبەیش فەرمووی : چی یە ؟ ووتی خراپە ، وەها وەهام وت و وەهاوەهام کرد . فەرمووی : دڵت چۆنە ؟ وتی : بەخوا دڵم زۆر باشە و لەسەر باوەڕێکی بتەو دامەزراوەو نەگۆڕاوە

خەڵکی وتیان : عمـــار خۆی کافر کردوە . پێغەمبەر فەرمووی : نەء ، عمار پڕە لەباوەڕ هەر لەســەریەوە هەتاپێی . لێرەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : « مَنْ كَفَرَ بِاللهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ ـ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ ـ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ . » (١)

وعمار لەسەر ئیسلامەتی بەردەوام بوو و لەهەموو جەنگەکانا لەگەڵ پێغەمبەرا ئامادەبوو ، تالە جەنگی نێوان علی و معاویەدا کۆمەڵی معاویە شەهیدیان کرد .

٤ ـ زەنیرە : یەکێ تر لەوانە زەنیرە بوو ، کەکەنیزەکێ بوو لەنـــاو قورەیشەکانا و موسڵمان بوو بوو ، قورەیشی‌یەکان زۆر ئازارو ســـزاو چەرمەسەرێیان ئەدا ، وە بەبۆنەی زەنیرەوە گـاڵتەیان بە موسڵمانەکان ئەکرد ، ابوجهل ئەی‌وت : ئەگەر ئەوەی محمد بانگی ئێمەی بۆئەکاباش بوایە ، زەنیرەلێمان پێش نەئەکەوت تیایا ، ئایا زەنیرە لە ئێمە ژیرترە ؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی نـاردە خوارەوە : « وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا لَوْ كَانَ خَيْراً مَا سَبَقُونَا إِلَيْهِ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ فَسَيَقُولُونَ هَذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ» (٢)

وەئەوەندە ئازاری زەنیرەیان‌دا هەتاکوێر بوو ، ئینجا وتیان : خواکانمان کوێریان کردی و پێیان نوانی . ئەویش وتی : درۆئەکەن خواکانی ئێوە هیچیان لەدەس نایە ، بەڵام ئەگەر خواکاگەورە بی‌یەوێ چاوم چاك ئەبێتەوە ، وەبەفەرمانی خوا بەیانی چاوی چاك بووەوە .

٥ ـ « خبابی کوڕی أرت » : یەکێ‌تر لەویـارە ئازاردراوانە « خبـابی کوڕی أرت » بوو ، کەلەکاتی نەفامی‌یا (٣) بەدیل گیراو کرا بەبەندە و

---

(١) سورەی ـ النحل ـ ئ١٠٦ (٢) سورەی ـ الأحقاف ئ١١ (٣) واتە پێش موسڵمان بوونی

« أم أنمار » گرى ، وەپێش ئەوەى کە محمد ببێ بەپێغەمبەر ، خووى بە محمدەوەگرتبوو ، وەیەکتریان خۆش ئەویست ئنجـا کەبوو بە پێغەمبەر « خباب » موسـلمان بوو و باوەڕى پێ هێنا ، کاتێ کە خانمى ئاغـاى پێ ى زانى کەوتە سـزادنى و ئەهات بە ئـاسنى سوورەوەکراو لاشەى داخ ئەکـرد و ئازارێ ئەدا . جارێکیان خەباب زۆر ناڕەحەت بوو کەیشتە گیانى و هاتە خزمەتى پێغەمبەر ، ئەویش لەسێبەرى کەعبەدا شانى دادابوو وتى : ئەى پێغەمبەرى خوا بۆچى لەلاى خواى گەورە بۆمان ناپاڕێتەوە بالەم سزاو چەوسانەوە ڕزگارمان ببێت ؟ پێغەمبەرهەڵسایەوەو ڕەنگى سوور هەڵگەڕاو فەرمووى : « ئوممەتە پێشوەکان بەشانەى ئاسنین هەموو گۆشت و پێست و ڕەگ و پەیان دائەڕنین ، یابەمشار لەسەریانەوە بۆ خوارەوەدایان ئەهێنان کەچى لە ئایینەکەیان وەرس نەبوون ووازیان لێ نەئەهنا . بەخوا بەجۆرێ خوا ئەم ئایینە سەر ئەخات سوار لە « صنعا » وە ئەڕوات بۆ « حضرموت » بێحگە لەخوا لە هیچ ناترسێ بەلاّم ئێوە پەلەئەکەن »(١)

## موسلمان بوونى حەمزە

ئەم هەڵوێسـتە ناڕەوایەى قورەیش بەرابەرى پێغەمبەر و یـارە موسڵمانەکانى و ئازاردان و چەوسانەوەیان بۆیان بوو بەهۆى خێرێکـى گەورە ، بوو بەهۆى موسـلمان بوونى « حمزەى کوڕي عبدالمطلب »ى مامى پێغەمبەر .

إبن اسحاق ئەڵێ : جارێك أبوجهل ڕۆیشت بەلاى پێغەمبەرا لەتەپى « صفا » قسەى پێ وت و ئازارى داو بەناشیرینى لەگەڵیـا جووڵایەوە ،

---

(١) بخارى ڕیوایەتى کردوە .

بەلآم پێغەمبەر وەلآمی نەدایەوە ، إبوجهل هاتەوە بۆلای قورەیشی‌یەکان لە نادی‌یەکەیانا ، زۆری پێ‌نەچوو حەمزە لەڕاو هاتەوە و شمشێرەکەی کردبوەشان ، خوویشی وابوو کە لەڕاو ئەهاتەوە پێش‌ئەوەی بچوایەتەوە بۆ ماڵەوە ، بەدەوری کەعبەدا ئەگەڕا ، لەم کاتەدا تووشی کەنیزەکێکی(١) ( عبداللەی کوڕی جدعان ) بوو و ئەم هەواڵەی بۆگێڕایەوە ، وتی : ئەگەر محمدی برازاتت بدیایە کە ابو جهل جنێوی ئەدایەو ئازاری ئەدا و بێ‌شەرمی لەگەڵائەکرد : حەمزە وتی : هەرخۆت چاوت لێ‌بوو : وتی : بەڵێ ، حەمزە ڕقی هەڵسا و چوە ( نادی ) یەکە و سەیرئەکا إبوجهل لە ناو کۆمەڵی قورەیشا دانیشتووە ڕووبەڕووی ڕۆیشت هەتا چوە سەرسەری و کەوانی لێ‌بەرزکردەوە و دای‌بەتەوقی سەریاو سەری شکاندو کەوتە قسەپێ‌وتنی و وتی : قسەبە محمد ئەڵێی کەمن وام لەسەر ئایینەکەی و چی‌ئەڵێ من وائەڵێم ، ئەگەر ئەتوانی وەلآمم بدەرەوە ، ( أبوجهل ) کەوتە پاڕانەوە :.. ئاخر ئەو کاڵتە بە عەقڵمان ئەکاو توانج لەخواکانمان ئەگرێ و پێچەوانەی باو و باپیرمان ئەجووڵێتەوە ، حەمزە وتی : جاله ئێوە بێ‌عەقڵو نەفامتر هەیە ئەچن داروبەرد ئەپەرستن ؟ من ئەڵێم : أشهد انلاإله إلاالله وأشهد أن محمداً رسول‌الله . کۆمەڵێ لەبەرەی مەخزومی خزمەکانی أبوجهل هەڵسان بۆیارمەتی ابوجهل‌و وتیان : باوەڕ ئەکەیت تۆیش شێت بوویت ، حەمزەیش وتی : کێ بەرهەڵستیم‌ئەکا ؟ بۆم دەرکەوتوە محمد پێغەمبەری خوایە چی‌ئەڵێ ڕاستە ، ئەگەر ڕاست ئەکەن بەرهەڵستیم بکەن . أبوجهل‌وتی : وازبێنن لە«أبوعمار» بەخوا وتەی ناشیرینم وتوە بەبرازاکەی . کە پێغەمبەر بەمەی‌زانی زۆری پێ‌خۆش‌بو و زۆر ئاموژگاری کردو

---

(١) هەندێ ئەڵێن کەنیزەکی سەفیەی خوشکی بوو بۆی گێڕایەوە .

ئەویش بوو بەموسلمانێکی ڕاستەقینە ، وەلەبەرئەوەی یەکێ بوو لەپاڵەوانەکانی قورەیش‌و چاو نەترسرو لێهاتو بوو ، قورەیشەکان زۆر پێی پەست و غەمباربوون ، وە موسلمانەکان زۆر پێی بەهێزبوون و زۆر دلخۆش بوون .

## هەڵ خەڵەتاندن

قورەیشی‌یەکان کەزانی‌یان جەورو ستەم‌و ئازار تین ناکاتە سەرپێغەمبەر و یارەکانی ، وەسوود ناکەیەنێ بەخۆیان ، ئەوەتا ئەوان هەر ئەزمیان پتەو ئەبێ‌و دامەزراوتر ئەبن‌و پەشیمان نابنەوەو هەتا پێی ئەچێ قایم تر ئەبن لەسەر بیرو باوەڕەکەیان ، لێرەدا بێ‌هیوا بوون لەوە کە بتوانن بەڕێگای زۆرو ئازارو کوشتن‌و بڕین زاڵ بن بەسەریانا ، یان بیان ترازێنن‌و لە خشتەیان بەرن . هەروەکو بەکاڵتە پێ‌کردن‌و دەمە دەمێ هیچیان بۆنەکرا. کۆبونەوەو کەوتنە ڕاوێژ کردن لەم ڕووەوە ، ئینجا ڕایان هاتە سەرئەوە کەبزانن بەڵکو لەڕێگای تەماع نانە بەرچاو بەماڵ‌و سامان‌و پلەوپایەو... هتد بیان خەڵەتێنن‌و پەشیمانیان بکەنەوە .

هشام ئەڵێ : جارێك کۆمەڵێ لەگەورە گەورەکانی قورەیش لەدەوری کەعبەدا دانیشتبوون ، پێغەمبەریش بەتەنیا لەگۆشەیەکی مزگەوتا نوێژی ئەکرد ، لەم کاتەدا « عتبەی کوڕی ربیعی عەبشەمی » ـ کەلەبەرەی (عبد شمسی ) کوڕی عبد مناف بوو وسەرۆك‌و باوەڕپێ‌کراوی هۆزەکەی بوو ـ وتی : ئەی‌گرۆی قورەیش بۆنەچم بۆلای محمدو نەخشێ لەگەڵیا بدوێم وچەند شتێکی بخەمە پێش‌چاو وتەماع بنێمە بەری بەڵکوهەندێکیان لێ‌هەڵگیرمەوە ؟ با هەرچی ئەوێ بیدەینێ‌و وازمان لێ‌بێنێ . وتیان : باشە باوکی وەلید بچۆ ولەگەڵی بدوێ‌و چی ئەوێ بیدەرێ . عتبە چوو بۆلای‌و پێی وت : کوڕی برام تۆخۆت ئەزانی لەناو ئێمەدا پایەو جێگای بەرزو

شەرەفی تیرەو هۆزو نەژادی گەورەت هەیە ، وە تۆشتێکی گەورەو گرانت هێناوە بۆسەر خزمو خوێشەکانت وپەڵپێ اەوزەدا نەبوویـان لی‌ئەگـری ، ئەوەیە بڵاوەت کردووە بەکۆمەڵیان وگاڵتە بەعەقڵیـان ئەکەیتو ئابڕووی ئاینو خواکانیان ئەبەیتو بەناشیرین باسیان ئەکەیت ، ئێستایش وەرە تۆ پیاوی چاك بە گوێ بگرە لەمن چەند شتێکت ئەخەمە پێش چاو بەڵکو کامەت ئەوێ هەڵی بگریو واژلەم بانـــگو داوایەت بێنی . پـێغەمبەر فەرموی : باوکی وەلید بڵێ بزانم گوێم لێیە . عتبە وتی : ئەگەرمەبەستت بەم کارەی هێناوتە ماڵو سامانە ، ئێمە ئەوەندە ماڵت بۆکۆئەکەینەوە کە ببیتە یەکەم دەوڵەمەندو سەرمایەدار لەناومانا ، وەئەگەر گەورەییوشەرەفت ئەوێ ، ئەت کەین بەگەورەی خۆمانو بەبێ تۆ پەنجە ناکەین بەئاوا ، وە ئەگەر بۆپاشایی ئەگەڕێیت ئەت‌کەین بەپاشای خۆمانو بۆت مۆر ئەکەین، وەئەگەر ئەوەی دێتە سەرت ـ پەری ـ جنۆکەیەو ناتوانی لەخۆتی دوور خەیتەوە پزیشکت بۆئەهێنین وهەموو سامانی خۆمانت لەپێناوا بەخت‌ئەکەین تا ڕزگارت ئەبێ لەچنگی . ئینجا پێغەمبـەر فەرموی : لێبویتـەوە ئەی باوکی وەلید ؟ وتی : بەڵێ . ئەویش فەرموی : دەگوێم لێ‌بگرە تا تێت ئەگەیەنم . ئینجا دەستی کرد بەقورئان خـــوێندن بەسەریا لەسـەرەتای سورەتی » حم سجدە » وە دەستی پێ‌کرد : « بسم‌الله الرحمن الرحيم . حمٓ تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ . كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّـــاً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ .. هەتا گەیشتە .. فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنْذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ . » لێرەدا عتبە هەموو گیانی کەوتە لەرزەو دەستی گـرت بە دەمی پێغەمبەرەوەو بەخزمایەتی لێی پاڕایەوە وازی لێ بێـنێ ، هەڵساو گەڕایەوەو ئەت‌وت هەورە تریشقە بەشوێنیەوەیە ، کەقورەیشی‌یەکان بینی‌یان

هاتەوە وتیان : بەخوا عتبە هاتەوە بەڕوویەکی جیـاواز لەو ڕوەی پێوەی ڕۆیی بوو ، کەهاتەوە ، وتیان : ئێ باوکی وەلید ، ئایا چۆن هاتیتـەوە ؟ وتی : بەخوا وتەو قسەیەکم لێ بیست هێشتا شتی وام نەبیستوە ، بـەخوا نەشیعرەو نەسیحرەو نەوتەی کاهین‌و نجوم گەرە . ئەی کـرۆی قورەیـش وەرن بەگوێم بکەن‌و وازلەوپیاوە بهێـنن ، چی ئەکا بابیـکا ، بەخوا ئەو وتەیەی من لێم بیست لەپاشە ڕۆژا دەنگو باسی گەورەی ئەبێ ، ئەگەر عەرەب لەناویان برد ئەوا لەکۆڵتان ئەکەوێ ، وەئەگەر زاڵیش بووبەسەریانا موڵک‌و ماڵی ئەو بۆئێـوە ئەبێ‌و گەورەیی ئەو ئێوەی پێ‌گەورەو بەختیـار ئەبێ ، وتیان : ئەی باوکی وەلید ئەوە بەزمانی شیرین تۆیشی ئاواخەڵەتان وچاوبەستی لێ کردی ، وتی : ئەوە ڕای منەو ئێوەیش ئارەزوی خۆتانە .

## یارەکانی محمد لە ئیسلام پەشیمان‌نابنەوە

محمد چی‌پێ‌ئەکرێ دەربـارەی ئەو موسڵمانە ئازار دراوانە ؟ ئایـا جەنگ و هەرایـان لەســـەر بەرپابکا ؟ خۆهێشتـا ئەو ڕەگی بەتەواوی دانەکوتاوە ، بستێ زەوی ڕزگارکراوی بەدەستەوەنیە کە دەوڵەتێکی تیـا دابمەزێنێ ، تا فەرمان دەربکا بۆ جەنگ و ئـاشتی و پێویستی‌یەکانی تر ، ئایا بەیاسای تیرە پەرستی بیکا ؟ خۆئەم ئەیەوێ وێنەی ئەو یاســـایانە قەلاچۆبکا و لەناویان بەرێ ، باچارێکان بانگەکەی بڵاوەبکاو ، شوێنێکی تایبەتی‌یان دەس‌بکەوێ، ئەوساشێوەیەکی‌بر دێتەپێشەوە ئەڵێی لەگەڵ شمشێرا لەدایك‌بوون ، ئەگینا محمدویارەکانی وەنەبێ ترسنۆك‌و لێ‌نەهاتووبن ، باجەنگ‌و هەرایان نەدیبێ ، بەڵکو بە پێچەوانەوە جەنگ و هەرایان بەشیرەوە خواردوەو بەڕادەیەك شەیدای بوون[1] وەکو جەنگەکانی دوایی دەریان‌خست ،وەجەنگی «بسوس‌و داميس‌و غبرا» کەئەوان‌و نەتەوەکەیان بڕبڕەی پشتی بوون‌هێشتا تۆزو

(1) شەیدای بوون ئەڵێـی لەگەڵ شمشێرا لەدایك بوون وەکو جەنگ

گەردەکەی نەنیشتوەتەوە. پێغەمبەر پەروەرشی گیانی کردنو دەرونی پێ گەیاندن لەسەر باوەڕی ڕاستەقینە ، هەموو ڕۆژێ پێنج جار لەنوێژەکانا کڕنوشی پێ ئەبردن بۆخوای پەروەردگار ، بەپاكو خاوێنی کالاو لەشیانەوە ، لەگەل ئاگاداریو دلسۆزیو گەردن کەچی دلومێشكو ئەندامیانا ، وەبەم ڕاهێنانە ڕۆژبەڕۆژ گیانیان بەرز ئەبوەوەو دلیان پاك ئەبوەوە و ڕەووشتیان شیرینوجوان ئەبوو دروونیان پاڵفتە ئەبوو،وەرزکاریان ئەبولەچنگی دەسەلاتەکانی ماددە و ئارەزوو. وەمەیلو ئاواتیان بەرزئەبوەوە بۆلای خوای پەروەردگاری ئاسمانو زەوی ، دلوای ئارام و خۆگرتنی لێ ئەکردن ، خۆگرتن لەبەر هەموو جۆرەناخۆشیو ئازارو سزایەك ، وەخۆگرتنو ئارامی خۆی ئەکرد بە دەرسێکی عەمەلی لەبەرچاویانا ، بێزاربوونو وەڕسیو دەرمار گیری لێدوور ئەخستنەوەو ئەی فەرمو : « دەستان بگرنو پەلاماری کەس مەدەنو نوێژەکانتان بکەن»

## قوتابخانەکەی محمد

پێغەمبەر « درودی لەسەربێ » بەپەتو گوریس کەسی ڕانەئەکێشا بۆسەر ئیسلامەتی ، وەبەچاو بەستیو هەلخەلەتاندن کەسی فریو نەئەدا ، وەیارەکانی لەسەر سوودێکی کاتی و ئێستایی کۆنەئەکردەوە ، بەلکو هات چاوپێچکی لەسەر چاویان لاداو ئەو حەقەیان بینی کە چەند ساڵە داپۆشراوە ، پەردەی لابرد لەسەر دلیان ، ئەوباوەڕیان دۆزیەوە کەنەفامێتی لێی شاردبوونەوە ، مرۆڤەکانی گەیاند بەخوای خۆیان و پەیوەندی پتەو و بە هێزی خستە نێوانیان ، کەلەپێشەوە سەرگەردان و سەرلێ شێواو بوون ، بەراوردی بۆ کردن لەنێوانی هەتا هەتایی لەگەل لەناوچوونا ، ئەوان پاشەڕۆژیان هەلبژارد بەسەر ئەم جیهانەدا ، کردني بەسەر پشك لەنێوانی بتەبێ گیانە برو پووچەکان

لەگەڵ خوای گەورەو پەروەردگارا ، ئەوان بتەکانیـان فڕێداو ڕوویـان کردە خوای پەروەرگاری ئاسمان و زەوی .

محمد « دزوودی لەسەربێ » مێشك و ژیری کردنەوە و هانی هۆش و عەقلـیدان بو بیر کردنەوە و لێکدانەوەو وردبوونەوە ، ئەوانیـش نەختێ تۆزیان لەسەر دڵ و چاویان تەکان ، سەیریان کرد هەموو تیرەیەك بگرەهەموو بنەماڵێ بتێکیان هەیە ، ئەبێ کام بتیان ڕاســـت وکامیان پڕوپوچ بێ ، خوهەموویشیان بێ گیان و بێ دەم و زمانن و دەسکردی مرۆڤن ، نەسوود ئەگەیەنن و نەزیان و هیچیان لێ نایەت ، وەلە دراوســـێی عەرەبەکانا ئاگرپەرست و ئەستێرە پەرست و شەیتان پەرســـت هەیە ، ئەبێ ئەمانە کامیان لەسەر هەق و کامیان لەسەر بەتاڵ بێ ؟

جگە لەمانەیش گیتێ هەموو بەشەکانی پەیوەندییان هەیە بەیەکەوە ، مرۆڤ بەکەس وکارو دراوسێکانییەوە ، کەلەکـەی بەکەلانی ترەوە ، ئادەمیزادەکان پەیوەندییان هەیە بەگیانداروبێ گیانەوە ، زەوی پەیوەندی هەیە بەڕۆژو مانگ وئەستێرەکانەوە ، وەبەمپێیە هەموو پارچەکانی گیتیی گەورە وابەستەییەکن بەگوێرەی یاسایەکی ڕێك وپێکی دامەزراوی نەگۆڕاو کە هەرشتە بەگوێرەی پرۆگرامێکی هەمیشەیی پەیوەندی خزمەتکردنی بەوانیترەوە هەیە ، وە ئەگەر هەناســـەیەك یەکێ لەم پەیوەندیو وابەستەیانە تێك بچێ یابگۆڕێ یەکســـەر گیتی بەتەواوی کاول ئەبێ . خۆئەمــە هەمووی بەدیار چاوەوەیەو هــەروا بووە . کەواتە ئەبێ هێزێك و دەستێکی نهێنی ئەم گیتییەی گرتبێ و خواهیش و هێزێك پێکی هێنابێ ڕێکیخستبێ ، وەهەمووی ئەبێ هەربەدەست ئەوخاوەن هێزو خواهیشەوەبێ ، وەئەبێ گەردن تەنیا بۆ ئەو کەچ بکرێ و ڕووهەر لەوبکری و هەرئەو

بپەرستریّ ، وەئەبێ بەرنامەو پرۆگرامی مـرۆڤەکانیش هەرلەوەوە بێ و ئەو بۆیان دابنێ .

موسلمانە پێشینەکان بەم پێیەو لەم ڕێیەوە و بەگوێرەی ئامۆژگاری قورئان و محمد خوایان ناسیو موسلمـان بوون ، ئیتر ئەبێ قورەیش یـا عەرەب یاجیهان لەبەر چ'ویانا نرخی و بەهای‌چی‌بێ ؟ یا زۆر و جەورو ستەمو کوشتن برین چۆن بتوانێ ئەوان پەشیمان بکاتەوە ؟ خۆ ـ لـەو سەردەمەدا ـ موسلمانەکان هەموویان عەرەب بوون و بەجوانی لە قورئانی پیرۆزو فەرمودەی محمد تێ ئەگەیشتن ، وەئەیان‌زانی کە موسلمان‌بوونیـان بریتی‌یە لەگەردشتێکی گشـتی « انقلات عام » لەبیرو باوەڕو وتن و بیستنیانـا و لەکارو کردەوەو لـەپیشەو باوو لـە هەموو ڕوو و هەموو شوێنێکیانا ، وەبۆیان ڕوون بووبوو وە کە ئیسلامەتی جەنگو هەرایە لە دژی بتو بت‌پەرستی لەهەموو ڕوو بەرگ ونیکارێکا ، هەروەها بەگژا چوونی نەفامیتی‌یە لەتەواوی سەرزەوی‌دا ، وەهەرلەوکاتەدا نەهێزو دەسەلاتکی کاتی بوو کە بەزۆر ڕایان بکێشێ بۆ سەری و لەترسا موسلمان ببن ، وەنەدرۆو دەلەسەو هەلخەلەتاندن یامالو سامان و نازو نیعمەتێ بوو کە تەماع بیان‌گرێو بۆی موسلمان‌بن بەلکوتێ ئەگەیشتن کە ئیسلام بوونیان تووشی هەژاری و گیروگرفت و ئازارو سزاو چەوسـانەوە یان ئەکا ، وە هیوایان بەس ڕەزامەندی خواو گەیشتن بەبەهەشتی بەردین بوو . وەترساندن لەڕق و غەزەبی خواو لەسزای دۆزەخ ئەوانی موسلمان ئەکرد ، وەمسلمان بوونێ ئەمە شێوەو کاکلەی بێ هەموو هێزی سـەرزەوی‌وگێتی بەتیکڕایی ناتوانێ پەشیمانیان بکاتەوەوە هەروەهایەو وەهاش هاتووەپیشەی بانگ کەرە ڕاستەکانی ئیسلام لە هەمووچەرخو تافێکا ، چونکە لەئیسلام

تێ گەیشتوون و بوونەتە پەروانەی و بانگیان بۆکردەوەو لە بەرابەری
هەموو هێزێکی سەرزەوی یانەفامێتیدا وەستاون بەرەقیو توندی و لەو
پێناوەدا لەسەر هەموو تووش هاتنێ ئارامیان کرتوە. وەچەندەها قوربانی
گەورەیان تیاداوە ، وەهەرئەبێ وەهابێ هەتا ئاوەدانی لەسەر ئەم
ئەستێرەیەدا بمێنێ ، ئیتر نەفامێتی هەربەرگێ بکاتەبەرو هەروێنەو نیگارێ
بۆ خۆی بکێشێ ، ئەمە سوننەتی خوایە لەگێتیدا «ولن تجدلسنة اللهتبديلا» .

## گەڕانەوەی قورەیش بۆسەر باری پێشوو

بەم هەلوێستە بێ‌پشوەو بەم وورە بەردەوامەی پێغەمبەرو یارەکانی لە
سەر ئیسلامەتیو بەم وەرس نەبوونەیان لێی - لەگەل ئەوهەموو جۆرە
بەربەرەکانیو جەنگو هەرایەی نەفامێتی لەبەرگی قورەیشەکانا بەرپای کرد
لەدژیان - بەمسانە قورەیشەکان وورەیان بەرداو فێلو تەلەکەیان لەدەستا
نەماو بەناچاری چوونەوە سەر بەزمە خراپەکەی کۆنیانو دەستیان‌کردەوە
بەکالتە پێ‌کردنو ناوو ناتۆرەی ناشیرین پێوە نانو ئازاردانی پێغەمبەرو
موسلمانەکان ، دەمێ ئەیان ووت : محمد شێتە « وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ
عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ » . وەجارێ ئەیان ووت جادوگەرو درۆزنە
« وَعَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ »[1]
وەئەیان ووت : شاعیرە ، کاهینە ، نجومگەرە و .. هتد وەخوایش بەدرۆی
ئەخستنەوە . وەهەولیان ئەدا کەنەیەلن ئەوبانگە بگا بەگوێی ئەوعەرەبانەی
دێن بۆمەکە بۆبازرگانی یا بۆحەج کردن ، «ولیدی کوڕی مغیرە» ئەی
ووت بەپیاوەکانی قورەیش : لەکاتی حەجدا خەلکی دێن بۆلاتانو هەوالی
محمد تان لێ‌ئەپرسن ، ئێوەش وەلامەکانتان جیاوازن لەیەکتری یەکێ‌ئەلێ:
سیحربازە ویەکێ‌تر ئەلێ : شاعیرە وئەم ئەلێ : کاهینەو ئەو ئەلێ : شێتەو

محمدیش لەهیچ کام لەوانە ناچێ . بەڵام باشتر وایە هەموو بڵێین : سیحر بازەو جیاوازی ئەخاتە نێوانی براو ژنو مێرد و کەسو کارەوە . وەسوێندیان ئەخوارد هەموو ڕێگاکانی مەکە بگرنو خەڵکی لەو بانگە بترسێننو نەیەڵن نزیکی ببنەوە . بەڵام پێغەمبەر گوێی نەدانێو خۆی ئەگەیاند بـە هەموو کەسێ یا کۆمەڵێ کەئەهاتنو بانگیئەکردن بۆسەر ئیسلام وداواییارمەتی لێئەکردن . « جابری کـوڕی عبدالله » ئەڵێ : پێـغەمبەر خۆی پیشان خەڵك ئەداو لەهەموو هەڵکەوتێکا وئەیووت : « ئایا کەسـی وانیـە من بەرێ بۆناو خزمەکانی ؟ خۆ قورەیش ڕێـگەم نادەن فەرموودەی خوا بڵاو بکەمەوە » حالی موسڵمانەکان لەم جۆرە هەڵوێستەدا لەحاڵی پێغەمبەرباشتر نەبوو ، بەڵکو ئەوبەسەزمانانە لەئێوارەو بەیانیانا جێگای پێکەنینو گاڵتەو پلۆتکی نارەوای کافرەکان بوون « إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ »(١)

( أسود ) ی کوڕی ( عبد یغوث ) لەبەرەی زەهرەی خاڵوانی پێغەمبەر کە چاوی بەیارەکانی پێغەمبەر ئەکەوت ئەیوت ئەوا پاشاکانی سەرزەوی هاتن ، وەلەگەڵ هاوەڵەکانیا چاویان لەیەکتردائەکرتو ئەیانوت : ئەمانە سبەینێ زاڵ ئەبن بەسەر «کیسری و قیصر» ، ئینجا فیکەیان ئەکێشاو جڕتیان لێ ئەدا . وەبەگاڵتەوە پرسیاری لەپێغەمبەر ئەکرد : ئایا ئەمڕۆ لەئاسمانەوە قسەت لەگەڵا نەکرا ؟!

## دەرسێکی گرنگ

لەکاتێکا کەپێغەمبەری خوا لەگەڵ گەورە گەورەکانی قورەیشا ئەدواو بانگی ئەکردن بۆلای باوەڕهێنان بەخوای تاكوتەنیاو بۆسەر ئایینیخاوێنی ئیسلام ، وەبۆئەم ئامانجە بەرزە بەژیـرانە وبەوتەی جوانو شیرینو بـە

(١) مطففين

شێوەیەکی نەرمو نیانو پەسەند لەگەڵیانا ئەدوا ، بەڵکو لەگەڵی شەیتـان دابەزنو بێنە سەر شـەقامی ڕاستو ڕەوانی خـوا پەرستی ، ئا لەم کاتەدا ( عبداللە ) ی کوڕی ( أم مکتوم ) کەکوێر بوو وەلە موسڵمانە پێشینەکان بوو هاتو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوقورئانەی خوا فێـری کـردوی بۆم بخوێنە ، وەفێرم بکـە . پێغەمبەر لەبەر خەریـك بوونی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا کـەبەهیوا بوو دڵیـان نەرم بووبێ ، ڕووی لەعبداللە وەرگـێڕاو نەیویست دواندنەکەی ئەوان بپچڕێو ترسا لەوەی کەئاوڕدانەوەی ـلەم کاتەدا ـ بۆلای عبداللە تێن بکاتە سەر دەروونی ئەوانو پەشیمان بنـەوە ، خۆئەم موسڵمانەو کات زۆرە بۆفێرکردنی ، با ئێستە چیکرنگە ئەوە بکات، عبداللەیش کۆڵی نەداو داوای قورئان خوێندنی لەپێـــغەمبەر کرد ، وە پێغەمبەریش ڕووی لێ وەرچەرخان . لێرەدا خـوای گەورە ڕەخنـەی لە پێغەمبەر گرتو ئەم سوورەتەێ ناردە خـوارەوە : « عبس وتولى أن جاءه الاعمى وما يدريك لعله يزكى أويذكر فتنفعه الذكـرى أما من استـغنى فانت له تصدى وما عليك ألا يذكى . وأما من جاءك يسعى وهويخشى فأنت عنه تلهى » لەدوای ئەمە ، پێغەمبـەر لەڕووی کەســـا ناوچاوی گـرژ نەکرد ، وەهەر کەعبداللەی ئەدی ئەی ووت : مـەرحەبا لەوکەسەی خوا ڕەخنەی لێگرتم لەسەری .

## کۆچ کردن بۆحەبەشە

پێغەمبەر « دروودی لەسـەربێ » زۆر خەفەتی ئەخـواردو نارەحەت ئەبوو بەوکارەساتە ناڕەوابانەی دەربارەی یارە موسڵمانەکانی ئەکرا ، وە زۆر ئێشی پێ ئەگەیشت بەوجۆرە تاوانە ناڕەوایانەی کەئەدرایە پاڵیـانو پێی سزا ئەدران . ئەبێ حاڵی پیاوێکی گەورەو پێشەوایـەکی دڵنەرمی

دلسۆزی خاوەن سۆزو بەزەیی وەکو محمد چۆن بێ ، کەبیینێ چاکترین مرۆڤ‌و خۆشەویست‌ترین ئادەمیزاد بەلای خواوە ئەوهەموو دەردی سەری‌و ئازارە ئەدرێن بەبێ هیچ تاوانێ ، تەنیا ئەوە نەبێ کەموسلمانن‌و ئەڵێن : خوا هەریەکەو نابێ بەدوو .

وەبەسوود ترین چارە بەلایەوە ئەوەبۆ کەپێی فەرموون : بلاوە بکەن و ئەم ولاتە پیس کـراوە و ئەم کۆمەڵە بەدخوا هەبەجێ بێلن . کە وتیان : بۆ کوێ ؟ فەرموی بچن بۆ حەبەشە ، بەڵکو لەوێ بحەونتەوە ، چونکە پاشایەکی هەیە کەس زۆری لێ‌ناکرێ لەژێر دەسیا ، تا خوا ڕزگارتان ئەکات لەو ناڕەحەتیەی کەتیایـا ئەژین . وەئەمەیش لە سـالی پێنجەمی پێغەمبەرێتی و دووسال دوای ئاشکراکردنی بانگی ئیسلامەتی بوو .

لەدوی ئەو فەرمودەیە هەندێ لەموسلمانەکان کەوتنە خۆ کۆکردنەوە بۆ ڕۆیشتن بۆ حەبەشە ، وە ژمارەیان ( ١٥ ) وەیا (١٦) بوو بە پیاو و ژنەوە ، ئەمەش یەکەم کۆچ بوو ، وە عثمان کوڕی مەزعون کرا بە سـەرۆکیان ، ئەمانە لەپەنای خوادا ڕۆیشتن ، کە گەیشتنە قەراغی دەریا کەشتی‌یەکیان بەکرێ گرت و پێی پەڕینەوە و گەیشتنە « حبشه » و چوونە لای «نجاشی» و بوونە پەنابەر و نەجاشیش بەخێرهاتنی گەرمی لێ‌کردن و بەڕێزەوە بەهێمنی لەلای نجاشیدا ژیان و حەوانەوە بۆماوەی سێ‌مانگ ، وەلەم ماوەیەدا ـ وەکو لەمەودوا باسی‌ئەکەین ـ عمری کوری خطاب موسلمان بوو و موسلمانەکان نەختێ بەهێز بوون ، وەقورەیشی یەکان بۆ ماوەیەك وازیان لە ئـازاردانیان هێنا ، دەنگ و بـاس گەیشتە حبشە کە قورەیشی‌یەکان وازیان لە ئازاردانی موسلمانان هێناوەو موسلمانەکان بەهێمنی و بەبێ‌تـرس خواپەرستی ئەکەن‌و بۆ خۆیـان ئەژین ، ئەمانیش

شەوق و ئارەزوویان بۆلای پێغەمبەر لەلایەکەوە ، وەبێ تاقەت بوونیان بۆ کەس و کارو نیشتمانیان لەلایەکی ترەوە پاڵی پێوەنان بۆ گەڕانەوەیان بۆ مکە بەڵام کە هاتنەوە سەیریان کرد بێ ئابڕوویی قورەیشەکان پتربووەو زیاتر ئازارو سزای موسـلمانان ئەدەن هەررۆژە لاپەڕەیەکی ترلە چەوسانەوەدا هەڵ ئەکێڕنەوە . وە بڕیاری کشتی یان داوە بەخۆ دوورخـتنەوە لە پێغەمبەر و خزمەکانی و ئەمەیان لەپەڕەیەکا نووسیوە و لە ( کعبە )دا هەڵیان واسیوە ـ وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین ـ لێرەدا بۆ جـاری دووەم پێغەمبەر فەرموی پێیان کوچ بکەنەوە بۆ حەبەشە ، وەئەمەش کۆچی دووەم بوو ، ژمارەی موسلمانەکان (٨٣) پیاو بوو بێجگە لە ژن و منال ، وە هەتا دوای کوچ کردنی پێغەمبەر بۆ ـ مدینة ـ مانەوەو بەئاســایش ژیان و خواپەرستی یان کرد .

کاتێ قورەیشی یەکان بەمەیانزانی مەترسی یان لێ نیشت و ترسـان ، لە لایەکەوە ئەمانە تازە لە دەست دەرچوون و وازلەم ئایینەیان ناهێنن و ئەبنە بنکە بۆ ئەوانی تریشیان ، وە لەلایەکی ترەوە کەتیرەکانی عەرەب بەمەیانزانی لەوانەیە شوێنی محمد و ئایینەکەی بکەون وکۆمەڵەکەی زۆر بکەن ، وەئەمانەیش لەوانەیە پشتیان قایم بێ و ڕۆژێ لەڕۆژان بەخۆیان و یارمەتی دەرو دۆستانیانەوە بدەن بەسەر قورەیشا ، یارێکەی لێ ببەستن ، لەبەر ئەمانە بیریان کردەوە کە چەند کەسێ لەگەڵ دیاری یەکی قورسـا بنێرن بۆ نجاشی و بۆ قەشەکان بەڵکو بتوانن بە هەرپیلانێ بووە ئەم ڕاکردوانە بهێننەوە . بڕیاریان هاتەسەر نـاردنی دووکەسی زانـای ژیری پیلان بازی بلیمەت : عمری کوڕی عاص وە عبدالله کوڕی أبی ربیعة ـ لەپێش ئیسلام بوونیاندا ـ وەدیاری زۆرو ناوازەیان برد بۆ نجاشی و

بۆقەشەو بەتریکەکان ، وەلەژێرەوە وایان کرد لەقەشەو دەس‌و پێوەندەکانی نجاشی کە بەبێ ئەوەی بانگیان بکاو پرسیاریان لێ‌بکا بیان‌داتەوە بەمانو لە حەبەشە نەیان هێلن . کەچوونە لای نەجاشی تاقمی قەشەو بەتریکەکان لەدەوری دانیشتبوون ئەمانیش چوون و دوای خۆپێ‌ناسین وتیان بەنجاشی : ئەی پاشـا ؛ کومەڵێ لـەلاوانی ئێمە ( قورەیش ) شێت بوون و لەئایینی باووباپیریان لایان داوە و بەئایینەکەی ئێوەیش ( کەئایینی عیسا پێغەمبەر ) ڕازی نەبوون و خۆیان ئایینێکیان داهێناوە نەئێمە ئەی زانین و نەئێوە ، کە داوامان لێ‌کردن بێنەوە ســـەر ئایینەکەی خۆیان هەڵهاتن و هاتنە وولاتەکەی تۆ ، ئێستە کەس وکارەکانیان ئێمەیان ناردووە بە شوێنیانا و بیان بەینەوە وەلەگەڵ قەشەو بەتاریکەو دەس‌و پێوەندەکانا زۆر هەولیان‌دا کە بەبێ نـاردن بەشوێنیانا بیان داتەوە بەمـان ، بەڵام هەوڵەکەیان بێ‌سوود بوو ، نجاشی وتی : هەتا چاوم پێیـان نەکەوێ و هەندێ نەیان دوێنم ناتان دەمەوە . ئنجا ناردی بەشوێنیاناو هاتن .

( أبوموسی ) ی ئەشعەری ئەڵێ : « کەچوین بۆلای نجاشی ئەبینـین دانیشتوەو عمری کوڕی عاص وا لەلای ڕاستیەوە وعبداللەیش لەلای‌چەپیەوە وقەشەکانیش لەم‌لاولایەوە دانیشتوون ، عمر وعبـدالله ووتبوویان : پاشـا سوژدە بۆنۆیش نابەن . کەگەیشتینە ئەوێ قەشەو ڕاهبەکان پێیان ووتین: سوژدە بەرن بۆپاشا . جعفر وتی : ئێمە بێجگە لەخـــوای پەروەردگار سوژدە بۆ کەسی‌تر نابەین . »

کەگەیشتنە بەرەوە پاشا لێی پرسین : ئەوئایینە چی‌یە کەوا داتـان هێناوە ولەکەس‌و کارەکانتان جیا بونەوەو نەچونە ناو هیچ ئایینێکەوە نە ئاینی ئێمەو نەئایینەکانی تریش ؟ . جعفری کوڕی أبوطالب قسەکەربوو

لەناویاناو وتی : پاشا ئێمە گەلێکی نەزانی بت پەرستی بێ ویلی خاوەن خەرافات بـوین ، مردارەوەبوومان ئەخواردو شەروال پیسیمان ئەکـرد و سەرمان لەخزمو کەس‌و کار ئەئەداو دراوسێ لەدراوسێ‌ی نەئەپرسیەوە ، تا خوای گەورە لەخۆمان پێغەمبەرێکی بۆناردین ، کەنەژادو تیرەی ئەناسین وهەموومان ئەزانین کەپیاوێکی ڕاستی ئەمینی دەس‌و دەم‌و دڵ‌و دەرون‌پاکە ئەویش بانگی کردین بۆئەوەی خوا بەتاک‌و تەنیا بزانین‌و هەرخوا بپەرستین و واز لەپەرستنی ئەودارو بەردانە بێنین ، وەداوای لێ کـردین کەڕاست‌و ئەمین بین‌و سەر لەخزم‌و کەس‌و کارمان بدەین‌و چاکە لەگەڵ دراوسێ دا بکەین وخۆمان لەگوناهو خراپە بپارێزین بەهەموو جۆر ، وەداوای لێ کردین کەخوا بپەرستین‌و هاوەڵی بۆدانەنێین‌و نوێژ بکەین‌و ڕۆژو بگرین‌و زەکات بدەین .. وهتد . جعفر وتی : ئێمەیش باوەڕمان پێ‌هێناو شوێنی کەوتین‌و بەڕاستمان زانی‌و هەرچی بۆحەلاڵ کردبێ بەحەلاڵ‌و هەرچی بـۆ حەرام کردبێ بەحەرامان دانا ، خزمەکانمان کەئەمەیان زانی کەوتنـــە دەس درێژی کردن بۆسەرمان ، ئازاریان داین و جەورو ستەمیان لێ کـردین بۆئەوەی بمان گێڕنەوە سەر بت پەرستی ، کاتێ تەنگمان پێ‌هەڵچنرا ، تۆمان بەیاد کردو پەنامان هێنا بۆت‌و هیوامان وایە ئێستایش لای‌تۆپارێزراوبین .

نجاشی وتی : باشە لەوکتێبەی لەلای خواوە بۆتان هـاتوە هیچتـان لەبەرنیە بۆم بخوێننەوە ؟ جعفر وتی : بەڵێ ، لەسەرەتای سورەی «مریم» ەوە کەباسی ( عیساو مریمی ) تیایە بۆی خوێندەوە هەتا گەیشتە ئایەتی « والسلام على يوم ولدت ويوم أموت ويوم أبعث حيا » .

نەجاشی‌و قەشەکان دەستیان کرد بەگریان‌و وتیان : بەخـوا لەو سەر چاوەیەوە هاتووە کە « انجیل » ی عیسای لێوە هاتووە ، ئینجا نەجاشی بە

عمرو عبداللهی وت : بەخوا هەرگیز ئەمانەتان نادەمەوە . لێرەدا عمرو عبدالله دەستو دڵیان سارد بوەوە ، (عمرو) وتی : بەخـــوا بۆبەیانی شتێکتان بۆئەدۆزمەوە پردیان بدا بەئاوا . ئینجا بەیانی (عمرو) وتی بە نجاشی : پاشا ئەمانە لەباسی عیساو مریمی دایکیا قسەی گەورە ئەکەن. نەجاشی ناردی بەشوێنیاناو وتی : ڕاتان چی‌یە دەربارەی عیسا ؟ جعفر وتی : « ڕامان لەعیسادا ئەوەیە قورئان تێمان ئەگەیەنێ عیسا بەندەو پێغەمبەرو ڕۆحی خوایە . وتەی خوایەو هاویشتویەتە لاشەی مریمی پاكو خاوێنەوە » نەجاشی دارێکی هەڵگرتو هێڵێکی کێشاو وتی : بەخوا عیسا ئەوەندەی ئەم دارە لەوقسانەی تۆ تێنەپەڕیوە ، وەزیاتر لەم هێڵە لەناوەندی ئاینی ئێمەو ئێوەدا نیە ، وەبەموسڵمانەکانی وت : بڕۆن بۆ خۆتان سەر بەستو دڵنیایش بن کەناتان دەم بەدەس کەسەوە ، وەمن نامەوێ ببم بە خاوەنی چیای ئاڵتون بەرامبەر بەئازاردانی یەکێك لە ئێوە ، وەدیاری قورەیشی‌یەکانی گل نەدایەوەو وتی : خوا بەرتیلی لەمن وەرنەگرتوە تا من لەئێوەی وەرگرم ، وەلێرەدا بۆنەجاشی‌و حەبەشی‌یەکان دەرکەوت کە موسڵمانەکان دان ئەنێن بەئاینی عیسادا وەعیسا بەپێغەمبەر دائەنێن و خوای تەنیا ئەپەرستن ، وەموسڵمانەکان بەهێمنی‌و ئاسایش لەپەنای نەجاشی‌دا ژیان ، وەنێلی قورەیشی‌یەکان سەری نەگرتو بەدەستی خاڵیەوە گەڕانەوە .

لێرەدا زۆر لەڕەوشت نووس‌و مێژو نووسەکان شێوەی ئەم کۆچ کردنە بەخۆ ڕزگار کردن لەدەس ئازاردنی بێ‌ئاینەکان دائەنێن ، بێ‌ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی بەجێ‌یان بەدەستەوە بێ کەمرۆڤ دڵنیا بکات .

بەڵام لەڕاستی‌دا ئەم کۆچ کردنە بۆپەیدا کردنی شوێن‌و بنکەیەکی

سەربەست بوو بۆبانگە وازەکەی ئیسلام ، تا پەرە بسێنێ‌و کەشە بکاو پێغەمبەریش بچێ‌و دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنێ‌و ئاڵای ڕزگارکەر هەڵ بکەن‌و نیوە دورگەی عەرەبی‌و وڵاتانی‌تر ڕزگار بکەن .

بەڵام بەرپابونی شوڕشی قەشە وبەتاریکەکان لەدژی نەجاشی بوو بە هۆی پێك نەهاتنی ئەوئامانجە ، پێغەمبەر زانی لەحەبەشەیشدا هەر ئەبێ خەریك بێ لەگەڵ کوژاندنەوەی شۆڕشی ناوخۆدا ، بۆیە لای‌دا لەحەبەشەو گەڕا بەشوێن دۆزینەوەی بنکەیەکی ترا ، ئەوەبوو چو بـــۆ « طائف » وزانیشی ئەوێش دەست نادات بۆئەم مەبەستە ، هەتا شاری « یثرب » یان دەس کەوت .

وە لێرەدا ئەتوانین بڵێین : ئەگەر کۆچەکە بۆ خۆ ڕزگار کـردن‌و خۆ شاردنەوە بوایە ، ئەبوایە بەندەو کەنیزەك‌و بێ‌کەس‌و بێ‌نەوایەکان بچونایە وڕایان بکردایە بۆئەوێ .. بەڵام بەپێچەوانەوە گەورەو خاوەن دەسەڵات‌و هۆزو تیرەکان چوو بوون ، وەکو جعفری کوڕی ابوطالب کەباوکی ئەوبوو محمدی ئەپاراست ، وەعثمان کوڕی عفان وزبیر کوڕی عوام‌و .. یا وەکو ام حبیبەی کچی ابوسفیـاة کە باوکی ئەوبـوو سـەرۆکی قورەیشە ئازار دەرەکان . وە وەکو زانیشمان یاسای دەمارگیری ونەژاد پەرستی زۆر باو بوو لەنێوانیاندا .

## شۆڕشی حەبەشە

لەوکاتەدا حەبەشی‌یەکان هەڵسان بەشۆڕش دژی نەجاشی بـە پیلانی قەشەو بەتاریکەکان ، وەهەندێ لەوخراپانەی لێیان ئەگـرت شێوەی جولاندنەوەی بوو لەگەڵ موسلمانەکان ، لەگەڵ ئیسلام بوونی خۆی کەوایان ئەزانی موسلمان بوە ، هەرچەند نەجاشی موسلمان بوونەکەی ئەشاردەوە

وەموسڵمانەکان هەرچەند هاوبەشییان نەکرد لەگەڵ نەجاشیدا ، بەڵام زۆر لە خوا ئەپاڕانەوە بۆ زاڵکردنی نەجاشی بەسەر دوژمنەکانیا ، وە لەم کاتەیشا دەنگوباسی ئاشتبوونەوەی قورەیشەکانیان پێگەیشت بوو لەبەرئەوە وایان بەباش زانی کەبێنەوە بۆ مەکەو ئەو هەراو هوریایە بەجێبلێن . ئەمەیش وەکو وتمان لە کۆچییەکەمابوو ، وەتا گەڕانەوە بۆ حەبەشە ئەو شۆڕشە تەواوبوو .

## ئیسلام بوونی عمری کوڕی خطـاب

عمری کوڕی خطاب کە لەبەرەی « عدی » یە ، لەوکاتەدا تەمەنی لەنێوانی (٣٠)و(٣٥) سالی دابوو ، پالەوانێکی بێوێنەو لاوێکی بلیمەت بوو ، وەزۆر ئازاو بەجەرگ بوو ، وەئارەزوی ڕابواردنو خواردنەوەیشی زۆر بوو ، لەگەڵ ئەوەشا دڵنەرم بوو بەرامبەر بە کەسەکانیو باش لەگەڵیانا ئەجووڵایەوە ، عمر ـ لەسەرەتاوە ـ زۆر دژی ئیسلام و پێغەمبەر بوو . وە زۆر ئازاری موسڵمانەکانی ئەدا ، وەکە زانی موسڵمانەکان کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە پێی ناخۆشبوو ، ( لیلی ) ی ژنی عامری کوڕی ربیعە ئەڵێ : عمر لە هەمووکەس زیاتر ئازاری ئەداین ، وەلەوکاتەدا کە خەریکبووین خۆمان کۆ ئەکردەوە ـ وە عامر چوو بوو بەلای هەندێ پێویستییەوە ـ عمر هاتو وتی : ها دایکی عبداللە بۆکوێ ؟ وتم : ئێوە ئازارمان ئەدەن و خراپ لەگەڵمان ئەجوڵێنەوە لەبەر ئەوە ئەچین بۆشوێنێ لەسەر ئەم زەمینی خوا کە ئازار نەدرێینو . وتی : باشە خواتان لەگەڵ بێ ، وەمن نەرمیم تیابینی ، کە عامر هاتەوە و بۆم گێڕایەوە وتی : بەهیوایت موسڵمان بێ ؟ وتم : بەڵێ ، وتی : بەخوا موسڵمان نابێ هەتا کەری خطاب موسڵمان نەبێ . لەبەر ئەو هەموو دڵڕەقیو نارەحەتییەی لێی دی بوو

بەڵام لە ڕاستی‌یەکەیـا دڵی ژنەکە ڕاستتر بوو لە ڕاکەیا تاوەکو دڵـی پیاوەکەی ، وەئەو توندو تیژی‌یەی عمر لە توێکڵێکی تەنکا وەستـابوو ، وەلە ژێری ئەوەوە چاوگەی دڵنەرمی و سۆز و بەزەیی و چاوپۆش بوو...
عمر ڕۆژێ بیستبوی کەوا پێغەمبەرو یارە موسڵمانەکانی لەماڵێکا کۆبوونەوە لەلای سەفاوە کە أبوبکر و علی و حمزەو کەلی‌تریشیان لەگەڵایە، کە ئەمەی زانی شمشێری کردەشانو ویستی بچێ محمد بکوژێ تا قورەیش ڕزگاریان ببێ و یەك بکەونەوە و بچنەوە جێگاکەی ئەوسـای خۆیـان . لەڕێگادا توشی « نعیم » ی کوڕی عبداللە بوو کە موسڵمان بووبوو بەڵام لە بەر خزمەکانی ئیسـلامەتی‌یەکەی دەرنەبڕی ، وە زانی عمر بەتەمـای چیە ، لێی پرسی : ها .. عمر بۆکوێ ئەچی ؟ ئەچم بۆ محمد کەئاوای بەسەر هێناوین و بڵاوەی پێ‌کردوین ، سوێندم بەخواکانمان هەتانەی‌کوژم وازنایەنم . نعیمیش ئەڵبەتە مەترسی لێ‌ئەنیشێ کە محمد لەدەسـت ئەم زۆردارەوە تووشی ئازارێ‌ببێ و ئەیەوی بەفێڵێك لای‌بدا ، ئەڵێ : بەڕاستی عمر نەفس و دەرونت خەڵەتاندویتی . ئایا ئەگەر تۆ محمد بکوژی باوەڕت وایە کەبەرەی عبدمناف لێت ئەگەڕێن بۆخۆت بەسەرزەویدا بسووڕێیتەوە؟ ئەی بۆچی ناگەڕێیتەوە بۆ ماڵو ئیش و کاری خێزانو کەسەکانی خۆت چاربکەیت ؟ عمر بەتووڕەیی‌یەوە وتی : کەسی‌خۆم کێ‌یە ؟ وتی : فاطمەی خوشکت‌و سعیدی کوڕی زیدی مێردی موسڵمان بوون (فاطمەی خوشکی‌و سعیدی ئامۆزای کە مێردی فاطمەبوو موسڵمان بوو بوون ، وە ســـعید یەکێکە لەو دەکەسەی کە بەئاشکرا مژدەی بەهەشتیان درابوویە ) عمر بەڕق هەستانەوە گەڕایەوەو ڕوی‌کردەماڵی خوشکی ، وە لەوکاتەدا موسڵمانی ڕاستەقینە « خبابی کـوڕی ارت لەلایان بوو قورئـانی پێ‌ئەخوێندن ،

کەزانیان وایە کێ هات خباب خۆی شاردەوەوفاطمەیش قورئانە کەی شاردەوە، عمر خۆی کرد بەژوراو وتی : ئەو دەنگە چیبوو ئەم بیست ؟ ووتیان : هیچ دەنگێ لێرەوە نەبووە ، عمر قیژانی بەسەریانا : بیستومە شوێنی ئایینە کەی محمد کەوتوون و پەلاماری سعیدی دا فاطمە هەڵسا لەسەر مێردە موسڵمانە کەی بکاتەوە و لەبراکافرە کەی بدا ، عمردای بەناودەمی خوشکیدا و دەمی پڕ کرد لەخوێن ، لێرەدا ژنو مێرد هاواریان لێبەرزبووەوە و وتیان : بەڵێ موسڵمان بووین و تۆیش چیت لە دەستدێ بیکە . ئەم شێوەو هەڵویستە تێی کردە سەر عمر و شەرم گرتیو لە کردەوە کەی پەشیمان بووەوە و بەخوشکی وت : ئەوەچیبوو ئەتانخوێند بۆم بێنە تابزانم محمد چیبۆ هێناون ؟ خوشکی وتی : ناتوانین بیهێنین . ئەویش وتی : مەترسن و سوێندی بۆ خواردن کە هەر ئەی خوێنێتەوە ، وتی : ئـاخر تۆپیسی هەتا خۆت نەشۆری نابێ دەستی لێبدەی ، عمر هەڵساو بەوجۆرە خوشکی وتی خۆیپاك و خاوێن کرد ، ئنجا ئەو پەڕە قورئانەیـان دایە دەستی ، عمریش خوێندەوار بوو دەسـتیکـرد بەخوێندنەوەی ، پەڕەکەیش لە سوورەتی « طه » تیابوو ، کاتێ خوێندیەوە وتی : « بەخوا وتەو واتەیەکی جوانو بەرزوپیرۆزە » . لێرەدا خباب کەزانی عمر دڵی نەرم بووە هاتە دەرەوە و وتی : عمـــر بەخوا هیوام بەخوا وایە کەخـوا تۆی کردبێ بەچێکەی نزای پێغەمبەر ، چونکە لێم بیست ئەیفەرمو : خوایە ئیسلام بەهێزبکەی بەهۆی عەمری کوڕی هشام یا بەهۆی عمری کوری خطابەوە.. عمر وتی محمدم پیشان بدەن لەکوێیە بابچم بۆلای ، ئەوانیش ناونیشانی مالی « أرقم »ی کوڕی « مخزوم » یان بۆهەڵدا کەلە لای تەپی « صفا » بوو ، عمر ڕووی کـردە ماڵەکەو دای لەدەرکا ، لەوکاتەدا کۆمەڵێ لـە

موسـلمانەکان کۆبووبوونەوە و پێغەمبەر قورئـانی پێ ئەووتن و پەند و ئامۆژگاری دائەدان ، یەکێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەر ڕۆیشت لـە درزی دەرگاکەوە عمری بینی هاتەوە و وتی : ئـەی پێغەمبەری خوا عمری کوری خطابەو شمشێری کردوەتەشان . پێغەمبەریش «د . خ» بەهێمنیەوە فەرمووی : « دەرگاکەی بۆبکەنەوە ئەگەر بەباشی هاتبێ باش لەگەڵیـا ئەجووڵێینەوە ، وەئەگەر خەیاڵی خراپ بێ بە شمشێرەکەی خۆی ئەی کوژین » کورج دەرگاکەیان لێ کردەوە و عمر هاتە ژوورەوە و پێغەمبەر بەخێرایی چوو بە دەمیەوە و لەناو دالانەکەدا پێی گەیشت و یەخەی گرت و ڕای تەکاندو فەرمووی : « عمر تاکەی وازناهێنی ؟ موسلمان بە ئەی کوڕی خطاب خوایە ئیسـلام بەهێزبکە بەعمری کوڕی خطـاب ، عمر بۆچی هاتوی ؟ بە خوا وابزانم بەڕەحەتی نساچیتە دەرەوە »عمر بەهیواشی یەکەوە ووتی : هاتم موسلمان بیمو باوەڕ بێنم بەخواو پێغەمبەرەکەو بەوقورئانەی ناردویەتی . پێغەمبەر « درودی لەسەربێ » فەرموی : اللّٰهُ أَکْبَرُ . یەکسـەر هەموو هـاوڕێکانی بۆیان سـەندەوەو وتیان : اللّٰهُ اَکْبَرُ . عمر وتی : « أشهد اَنْ لَّا اِلٰهَ اِلَّا اللّٰه وَاَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللّٰهِ . » ئیتر بەجارێ موسلمانەکان بەهۆی موسلمانبوونی عمرەوە خۆشی و شادی دڵی پڕ کردن .

عمر موسـلمان بوو وەلەپێش ئەویش حمزە موسلمان ، بووبوو ئەم جووتە پـاڵەوانە بلیمەتە لەوانەبوو کە قوڕەیش لـەبەریـانا بلەرزن ، وەموسلمان بوونی ئەم دووانە بووبە هۆی دەسەڵات و چاوقـایم بوونی موسلمـانەکان ، هەروەکو پشتی کافرەکانی شکاندو زراوی بێ ئـایین و بت پەرستەکان چوو . لەم کاتەدا کورج عمر نهێنی و پەنامەکیتی پێ نەکرا و بەپێغەمبەری وت : ئەی پێغەمبەری خـوا خۆ ئێمە بکوژین یا بکوژرێین

لەسەرحەقین . فەرمووی بەڵێ وتی : کەواتە ئیتر خۆشاردنەوەی بۆچی یە ؟ وەئیسلامەتی هەرچەند ئاشکرا بووبوو ، بەڵام ـ بێجگە لـە پێغەمبەر ـ موسلمانەکان بەدزیەوە نوێژو خواپەرستی یـان ئەکردو نەئەهاتن لە کەعبەدا نوێژبکەن . ئینجا لەسەر فەرمانی پێغەمبەرو بەپێی داخوازی عمری کوڕی خطاب کۆڕی موسلمانان هاتن بۆ کەعبە بە دووڕیز ، ڕیزێکیان عمر و ڕیزەکەی تریان حمزە پێشەنگی کرتبوون . وەکە کافرەکان ئەمەیـان دی چەند ئەوەندەی جاران مەترسی یان لێ نیشت وازانیان ئیتر وائەوان پەرەیان سەندوەو لەچاری ئەمانا نین ، وەبەتایبەتی بە ئیسلام بوونی عمر وورەیان بەردا . وەلەڕاستیشا ئیسلام بوونی عمر بوو بەهۆی زاڵ بوونی موسلمانان . ( بخاری ) لە عبدالله کوڕی مسعودەوە ئەگێڕێتەوە کەوتویەتی : « ئێمەی موسلمانان ـ لە کاتی مەسلمان بوونی عمرەوە دەسەڵاتمان پەیداکرد » . وەکافرەکان کەوتنە ڕاوێژکردن لە کوشتنی عمر . عمر بێجگە لەو هاتنەی بەئاشکرا بۆ حەوشی کەعبە هەرکە کەیشتە سەر شەقام بینی یەکێ لەبت پەرستەکان کە ناوی « جمیلی کوڕی معمری جمحی بوو » تێ ئەپەڕی و بانگی کرد و پێی وت : ئایا زانیوتە من موسلمان بووم و چوومە نــاو ناو ئایینەکەی محمدەوە . جملیش پیاوێکی چەند باز بوو ، هەر ئەمەی بیست ڕای کرد هەتا کەیشتە دەرکای کعبە بەهەموو دەنگی هاواری کرد : ئەی کەلی قورەیش هەواڵێکی ناخۆشتان بدەمێ : عمری کوڕی خطـاب شێت بووە . عمریش بە شوێنیا هات و وتی : درۆئەکەیت ، بەڵام موسلمان بووم و شایەتی ئەدەم : أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله . لێرەدا قورەیشەکان کۆستی کەورەیان کەوت و بڕیاری کوشتنی عمریان دا کۆمەڵێکیان نارد بۆ کوشتنی و هاتنە دەوری ماڵەکە چاوەڕوانیا ئەکرد ،

عاص ) ی کوڕی وائیلی سەهمی لە بەرەی سەهم کە هاوپەیمانن لەگەڵ
رەی ( عدی ) دا هات و چوە لای عمرو لێی پرسی ئەوە چییە ؟
مریش فەرمووی : من موسڵمان بووم و خزمەکانت نیازیان وایەبمکوژن
صیش وتی : ناتوانن من پشتیوانی تۆم ( عمر ) بەمە دڵنیابوو ، کە
عاص ) بینی خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە وتی : بۆ کوێ ئەچن ؟ وتیان :
ڕی ( خطاب شێت بووەو ئەیکوژین ، وتی : « ڕێتان نییەو لەپەنای
نایە ، ئیتر خەڵکەکە گەڕانەوە .

## بەشی پێنجەم

### لەدەنگ دابڕینەوە تاکۆچ کردن بۆمەدینە

### دەنگ دابڕینی قورەیش

قورەیشەکان بینیان موسڵمانەکان هەر پەرە ئەسێنن ، ئەوەیە هەرڕۆژە
ڵەوانێك ئەچێتە لای ئەوانو کەلەبەرێك لەقەڵای بت پەرستی دا پەیدا
ەکا ، دوێنێ حەمزەو ئەمڕۆ عمر چوونە ڕیزیانەوە ، وابەئاشکراو بەکۆمەڵ
لەکەعبەدا نوێژ ئەکەن ، بۆیە کەوتنە پەلەقاژەو ناردیانە لای پێغەمبەر :
تۆ ساڵێك بتەکانمان بپەرستە ئێمەیش ساڵێك خوای تۆ ئەپەرستین ،
پێغەمبەریش وەڵامی دانەوەو لەم روەوە سوورەتی (الکافرون) هاتەخوارەوە
وەلەم ڕوەوە هەرچییان کردو وتیان بێسود بوو ، ئینجا ناردیانەوە بۆلای
أبوطالب کەمحمد نەکوژینو خوێنتان ئەدەینێ ، أبوطالبیش گوێی نەدانێو
وەڵامی نەدانەوە .

ئینجا کۆبونەوەو بیریان کردەوە لەوە کارێکی وا بکەن خزمە بت
پەرستەکانی محمد ناچار بین واز لەمحمد بێننو پشتگیرییان نەکەنوئەوسا
ئەمانیش بەهەرجۆرە بووە لەناویان بەرن ، وەبڕیاریان هاتە سەر ئەوە :

دەنگیان لێدابڕن ولەسەرئەمە پەڕەیەکیان نووسی کادەنگ دابـڕن لە کۆمەڵی محمد بەبەرەی هاشمو بەرەی عبدالمطلبو موسڵمانـــەکانەوە ، بە ڕەنگێ لەگەڵیانا نەدوێنو شتیان لێنەکڕنو شتیان پێنەفرۆشنو ژنو ژن خوازیان لەگەڵا نەکەن ، وەپەڕەکەیان مۆرکردو لەکەعبەدا هەڵیانواسی، وەپێغەمبەرو بەرەی هاشم هەمـوویان بەموسڵمانو بت پەرستیـانەوە ، وە موسڵمانەکان هەموویان چونە شیوی أبوطالبەوە ، تەنیا أبولهـب نەبێ کە چوە پاڵ بت پەرستەکانی قورەیش ودوژمنایەتیخزمەکانی ئەکرد ، بەجۆرێ هەرکاروانێ بهاتایەو خۆراکی پێبوایە أبولهب هەڵ ئەساو بانگی ئەکرد : ئەی بازرگانانی مەکە بڕۆن ئەو خۆراکە گران بکەن بەسەر هاوەڵەکانی محمدەوە تا نەتوانن هیچی لێبکڕن ، خۆئێوە ئەزانن سامانی منوڕاستیەتیم قازانجتان لەسەر من بێ ، ئەوانیش چەندقات نرخی شتەکەیان بەرزئە کردەوە و موسڵمانەکان نەیان ئەتوانی بیکرن و بەناچاری ئەگەڕانەوە منالەکانیان لەبرسا هاواریان ئەکرد و هیچیان نەبوو بێدەنگیان بکەن ، دوایی أبولهب قازانجی ئەدا بەبازرگـانەکان . وە ئامۆزاکانیـان لەبەرەی عبدالشمس و وە بەرەی نوفلیش چوونە پاڵ قوڕەیش .

ئەم دەنگ دابڕینە و دورکەوتنەوەیە زۆر تینی کردە ســـەریـان خواردن و خۆراکیان تەواوبوو و هیچیان بەدەسەوە نەماو ڕێگای ئیش و کارریان نیەوکەس نایـان دوێنێ و ئیشیان ناداتێو شتیـان لێنـاکڕن و شتیان پێ نافرۆشن و ژنو ژن خوازیان لەگەڵا ناکەن ، وەتەنیا لەمانگە قەدەغەکانا نەبێت ڕێگـــای بازاڕیشیان نیە لەبەر ئەمانە خواردەمەنی و هۆی ژیان نەما و زۆرکەمو کورِبوو . وەلەدەرەوەی شیوەکەوە دەنگ و هاواری منالان لەبرسانا ئەبیسترا ، وە ناڕەحەتیان بەڕادەیەك بوو کـە

دوژمن بەزەیی بەحالیانا بێتەوە ، یونس لـە سعدی کوڕی أبیوقـاصەوە ئەگێڕێتەوە ئەڵێ :« شەوێ بەئیشی پێویست هاتمە دەرەوە لەژێر مێزەکەدا هەستمبە شتێ کرد کە سەیرم کرد پارچەیەك چەرمی ووشك بوو ، هەڵم گرت و شـۆریم و دوایی برژاندم و بەئاوەوە خواردم و سـێ ڕۆژ بەوە ژیام » وە ،لەگەڵ ئەم نـاڕەحەتیو برسـیو ڕوتیوقوتییەدا ، لە مـانگە قەدەغەکانا ئەهاتنە ناو بازاڕو شارەوەو خۆیـان ئەگەیـاندە ئەو کەسانەی کەلەدەرەوە ئەهاتن و باسی خواو ئیسلامیان بۆ ئەکردن ، ئەم هەموو جەورو سزاو برسێتی و نارەحەتی و دوور خستنەوەیە هەتـا ڕێی ئەچو دلی موسلمانیٌ قایم ترو دامەزراوتر ئەکرد و باوەڕیانی پتەوتر ئەکرد بەتایبەتی هەمیشە پێغەمبەر بە خوێندنی ئـایەتە پیرۆزەکانی قورئان و بـە ئامۆژگاریە شیرینەکانی دلی زاخاو ئەدانەوە و بـاشتر ڕای ئەهێنـان ، وەئەم دەنگ دابڕینە بوو بە گەورەترین قوتابخانەو باشترین تاقیکردنەوە ، وای لێکردن کە ئیتر جیهـان لەهەر بەرگێکاو خۆشی لـەهەر شێوەیەکا وەنارەحەتی لە هەرچوار چێوەیەکا بێت نەتوانێ هەڵیان بخەڵەتێنێ ، یا لـە ئیسلامەتی دووریان بخاتەوە ، ئەمانە دەریانخست کەموسلمانن و شاگردی ئیسلام و باوڕن و بەس .

ئەم چونە شیوودەنگ دابڕینە لەسەرەتای سالی حەوتەمی ئیسلامەوە دەستیپێکرد و سێسالی خایان ، وەئەگەر یـارمەتی خوای زێڕی هەندێکیـان نەبوایەنەئەژیانو بە تەواوی بەتەنگ ئەهـاتن ، چونکە زۆر لەو پیـــاوە قورەیشییانە بیریان ئەکردەوە لەم کردەوە دڕندانەیان و ئەیـانبینی ئەم کۆمەڵی بەرەی هاشمە خزمو کەسو تێکلاوی ئەمانو ئەمکارە نالەبارەیش بەوپێیە تیی کـردوەتە سەریانو لاوازی کـردون پەشیمان ئەبوونـەوە ،

پیاوی وایان هەبرو وشتری بارئەکرد لەخۆراكو ڕوو بەشیوی أبوطالب لێ ی ئەخوری وچلەوەکەی لەسەر دائەمالیو ئەچــوە شیوەکەوە وئەوانیش بارەکەیان ئەخستو بەشیان ئەکرد ، وەلەوپیاوانەی ئەمەیان ئەکرد یەکێکیان هشامی کوری عەمری عامری بوو . هەتا ئەڵێن جارێ أبوجهل ئەکاتە حکیمی کوری حزام بەندەیەکی لەگەڵا ئەبێ و کۆڵێ گەنمی پێ ئەبێ بیبات بۆ خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر کە پووری بوو ، ئەڵێ : ئەوەخواردن بۆ بەرەی هاشم ئەبەیت ؟ بەخوا ئابروت بۆ ناهێڵم لەمەکەدا تا تووشی ابوبحتری کوری هشام ئەبن لەرێگەدا ئەپرسێ : ئەوەچییە ؟ أبوجهل ئەڵێ : خواردن ئەبا بۆ بەرەی هاشم ، ئەویش دەڵێ : دەی پووریەتی و خوشکی باوکیەتی لێی گەرێو ناپیاوەمەبە ، أبوجهل رێی نـاداو لەوێدا هەرایان ئەبێو أبوبحتری پەلامـاری شەویلەی ووشترێك ئەداو ئەیدا بە ابوجهلدا و ئەکەوێ و ئەچێتەسەری و ئەیشێلێ . وەلەم ماوەیەدا خزمە بت پەرستەکانیشی لەسەر دەمارگیری ڕەگەزایەتی خۆیان ئەڕۆن وبەردەوام ئەبن ، هەتا أبوطالب بەشەو محمدی ئەهێناو لە ناوەڕاستەوە ئەیخەوان . نەوەك شەو بەدزیەوە بێنو بچکوژن .

## هەڵوەشانەوەی دەنگ دابڕینەکە

بەم پێیە کۆمەڵەکەی پێغەمبەر سێ ساڵی ڕەبەتیـان بردە سەر لەو شێوەدا بەناڕەحەتیو ناخۆشی ، هەتا هەندێ لەپیاوە گەورەکانی قورەیش ڕێك کەوتن لەسەر هوڵوەشانەوەی ئەوبڕیارە نالەبارە پڕلەجەورو ستەمە. یەکەم کەسێ کەزۆر بەمکارە ناڕازی بوو وتیبی تێ کردبوو : هشامی کوری عەمری کوری حارثی عامری بوو - کەلەپاشا موسڵمان بوو وبوو بەیاری پێغەمبەر - چوە لای زهیری کوری ابوأمیەی مخزومی کەلەعاتکەی کچی

عبدالمطلب بوو . پێی وت : ئەی زهیر ئایا تۆ ڕازیت بەوە بخۆیت‌و بخویتەوەو بەرگ بپۆشی‌و ژن بهێنیت ، خالوانیشت ـ وەکو ئەزانی ـ ئەوە حالیان بێ کەهەیانە ؟ من سوێند ئەخۆم بەخوا ئەگەر خالوانی ابوالحکمی کوڕی هشام بوونایە تۆ بانگت بکردنایە بۆ شتی وەها هەرگیز بەگوێی نەئەکردی . زهیر وتی : جا چی بکەم من تەنیا پیاوێکم ، بەخوا ئەگەر هاوەلم بوایە هەلم ئەوەشاندەوە . وتی : هاوەلت هەیە . وتی : کێیە؟ وتی : من ئامادەم . زهیر وتی : با سێ‌هەمێك پەیا بکەین ـ ئەم زهیرەش لەدوایی‌دا موسلمان بوو ـ ئینجا چون بۆلای مطعمی کوڕی عدی نوفلی‌و پێیان وت : تۆ ڕازیت کەدوو بەرە بابی بەرەی عبد مناف لە ناو بچن‌و تۆیش ئاوا بێ‌دەنگ دانیشی ؟ وتی : جا من بەتەنیا چی بکەم ؟ وتیان ئێمەیش لەگەلتاین وتی : با چوارەمێ پەیا بکەین ، چون بۆلای أبوبحتری کوڕی هشامی اسدی ودوان لەگەلیاو ئەویش وتی : بەتەنیا هیچم بۆنا کرێ وئەوانیش وتیان : لەگەلتاین ، ئینجا هەموویان چون بۆلای زمعەی‌کوڕی أسودەی ئەسەدی وهشام لەگەل ئەویشا دواو باسی خزمایەتی ئەویشی کرد لەگەل بەرەی هاشمی‌دا ، ئەویش لەگەلیانا هاوکاری پیشاندا ، ئەم‌پێنجە ئامادە بوون‌و بڕیاریان دا لوسەر دڕینی پەڕە نوسراوەکەو هەلوەشانەوەی پەیمانەکە ، وەلەسەراوردی مەکەوە لە « خطم الحجون » دا کۆبوونەوە ئەم پەیمانەیان تەواوکرد ، زهیر وتی : من ئەم بلەسە دەرئەبڕم وئێوەیش یارمەتیم بدەن . بەیانی لەکاتی دیاری کراوا لەکعبەدا کۆبوونەوەو أبوجهل وقورەیشی‌یەکانی تریش لەوێ بوون ، لەنادی‌یەکەیان زهیر هات‌و حەوت جار گەڕا بەدەوری کعبەدا ، ئینجا ڕوی کردە خەلکەکەو وتی : ئەی خەلکی مەکە ئایا ئێمە خواردن بخۆین‌و بەرگ بپۆشین‌و بەرەی هاشمیش

بەوپێیە لەناو بچن؟ بەخوا دانانیشم هەتا ئەوپەڕەیە نەدڕێو ئەو پەیمانە ستەمکاریە هەڵ ئەوەشێتەوە . أبوجهل لەگەڵ گوێی لێبوو هاواری کرد درۆ ئەکەیت بەخوا نادڕێ ، زمعەی کوڕی أسود وتی : بەخوا تۆ درۆ ئەکەیت ، کەنووسیوتە ئێمە ڕازیمان نەبووە . أبوبحتری هەڵی دایەو وتی : زمعە ڕاست ئەکا ڕازیمان لەنووسینەکەی نەبووە . مطعمو هشام وتیان ئەو دوانە ڕاست ئەکەنو تۆ درۆئەکەیت . أبوجهل وتی : ئەمە کارێکە هەرشەو بڕیاری لەسەر دراوە ، کەزانی وا ڕێکەوتون پێنچەوانە جولانەوەیان شەڕ هەڵ ئەگیرسێنێ ، ناچار بێدەنگ دانیشت . مطعم هەڵساوپەلاماری پەڕە هەڵواسراوەکەی داو دای گرت ، کەهەموویان سەیریان کرد مۆرانە هەمووی خواردوە تەنیا ئەمە نەبێ « بِاسْمِكَ اللّٰهُمَّ » (کەعەربەکان لەهەموو پەیمانێکا ئەیان نووسی) وەئەمەیش بوو بەمعجزەیەك بۆئیسلام . وەپێغەمبەریش زووتر ئەم هەواڵەی دابوو بەأبوطالبی مامی ، وەئەڵێن لەپاش دڕینی پەڕەکە ئەوپێنج پیاوە هەڵسان بەخۆیانو دەستەیەك کوڕی لاوەوە شمشێریان کردە شانو چوونە ناو بەرەی هاشمو ئەم باسەیان بۆ گێڕانەوەو ئینجا بەڕێزەوە هێنانیانەوە بۆ شوێنو جێگای خۆیان لەناوشارا . بەم پێیە لەساڵی دەیەمی ئیسلامەتیدا پەیمان دەنگ دابڕینەوە هەڵوەشایەوە . وەئەو پێنج پیاوەی هەڵسان بەو کارە پیرۆزە هشام وزهیر لەدواییدا موسڵمان بوون خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵام ـ بەداخەوە ـ مطعم لە مەکەدا بەکافری مرد ، وە أبوبحتری وزمعە لەجەنگی بەدرا بەکافری کوژران .

## ساڵی هاتەمی

محمدو موسڵمانەکانو بەرەی هاشم هاتنەوە جێگاو شوێنی خۆیان ، وە سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە بڵاو کردنەوەی بانگی خواو ڕووناکی

ئیسلامەتی ، بەڵام چەند مانگێکی پێ نەچو تووشی دوو کۆسپی گەورە هات کەزۆر گران بوون لەسەرشانی کەبریتی بوو لە مردنی مامی‌و خەدیجەی خێزانی ، ئەبوطالب یاریدەدەرێکی گەورەی بوو ، وەئەگەرچی لەسەرئایینی باوو باپیری مابوو - وەکو ئەڵێن - بەڵام دەسی گرت بەپشتی پێغەمبەرەوە ولایەنی بەرنەداو لەپێناویا هەموو جۆرە تاڵو سوێری‌یەکی چەشت .

ابوطالب تەمەنی نزیك بووبووەوە لەهەشتا ساڵ ، کەقورەیشەکان زانیان بە نەخۆشی‌و کەوتنە هیلاکەتی ترسان کەدوای ابوطالب ئەم نارێکی‌یانە زیاتر بێت ، خۆئەوەتە پاڵەوانی وەکو همزەو عمریان هەیە ، کە بەتووڕەیی‌و دەسەڵات بەناوبانگن ، لەبەرئەمە سەرۆکەکانیان هاتن بۆلای‌و پێیانوت: أبوطالب تۆئەزانی چەند بەرێزی لەناوئێمەدا وا ئێستە تووشی ئەم نەخۆشی‌یە بوویت ئەترسین شتێکت بەسەربێ وئێمەش لەگەڵ محمدی‌برازاتا نارێکین ، تکایە بانگی بکەو رێکمان بخە ، کاتێ محمد هات‌و بینی ئەم کۆمەڵە لای مامی دانیشتون تێ‌گەیشت بۆچی هاتوون ، فەرمووی : باشە ئەوان یەك ووشە بدەن بەمن ، ابوجهل وتی : یەك ووشە ؟! بە سەری باوکت دە ووشەیشت ئەدەینێ ، فەرموی : دەبڵێن : « لاإله الا الله » وە بت پەرستی لەخۆتان داڕنن . هەندێکیان وتیان : محمد تۆئەتەوێ هەموو خواکان بکەی بەیەك خوا !! ئینجا لەناوخۆیانا وتیان : بەخوا ئەم پیاوە هیچتان ناداتێ لەوەی ئێوە بەهیوایینی لەپاشا بەجێیان هێشت . وەلەکاتی مردنیا پێغەمبەر زۆر هاواری لێ‌کردو فەرموی : مامەگیان بڵێ : لا الهَ إلا الله با لەپاشە ڕۆژا بیکەم بەبەڵگە بۆ ڕزگاربوونت ، وەزۆر پەرێشان بوو کەشایەتمانی نەئەهێنا ، وەوا بەناوبانگە کە ابوجهل‌و کۆمەڵەکەی وازیان لێ نەهێناو وتیان : دەس بەرداری ئایینی باوو باپیرت نەبی ، ئەویش

گەمرد وتی ؛ لەسەر ئاینی عبدالمطلبم وگیانی دەرچو ، وەئەم ئایەتە هات بۆپێغەمبەر « إنك لاتهدی من أحببت ولكن‌الله یهدی من‌یشاء وهـو أعلم بالمهتدین (۱) » . . بەمردنی ابوطالب پێغەمبەر زۆر پەرێشان‌و خەمبـار بوو ، ئیتر کەسی وانەما پشتیوانی‌بێ‌و قورەیشەکان شەرمی لێ‌بکەن وەمامی زۆر دڵنەوایی ئەکردو ڕاوێژی بۆئەکردو قەڵایەکی سەخت بوو بۆی ، وا ئەوقەڵایەی ڕوخاو ئیتر بێ‌شەرمی قورەیشەکان پتر پەرە ئەسێنێ‌و شێوەکەی ناشیرین‌تر ئەبێ .

لەدوای ابوطالب بەچەند ڕۆژێکی کەم ـ وەهەندێ ئەڵێن مانگێ‌پێش مردنی ابوطالب ـ خاتو خدیجەی خێزانیشی کـۆچی دوایی کـرد ، ئەو خدیجەیەی لەپێش پێغەمبەرێتی‌دا بەماڵی خۆی محمدی دەوڵەمەند کـردو خستیە ڕەحەتی‌یەوە ، وەلەیەکەم ڕۆژی پێغەمبەرێتی‌یەوە باشترین دڵسوزو پشتیوانی بوو .

پێغەمبەر ( درودی لەسەربێ ) ئەوەندە نارەحەت‌و خەم بار بوو بـوو لەم ساڵەدا ، بۆیە ئەم ساڵەیان ناونا بوو « ساڵی ماتەمی » مردنی ئەم دوانەش لە ئەنجامی برسێتی و بێ‌خۆراکی ماوەی دەنگ دابڕینەکەبوو .

کە خەدیجەو « ابوطـــالب » مردن ئیتر لـە قورەیشەکان کەسی وانەمابوو کە شەرمی لێ‌بکەن و لێی بترسـن ، بۆیە ئەمــاینیش شووڵیان لێ‌هەڵکێشاو بێ‌شەرمانە هەرجۆرە بۆیان بکرایە ئازاریان ئەدا .

نەفامەکانیان ڕێـان پێ‌ئەگرت و خۆڵیان ئەکرد بەسەریـا ، ئەویش بەم حاڵەوە ئەگەڕایەوە ماڵەوەو فاتمەی کچی جلەکانی بۆ ئەشت‌و دەستی ئەکرد بەگریان . پێغەمبەریش ، ڕووی ئەکردە ئەو کچە نـازدارەی کە

---

(۱) لەسورەتی « القصص »

بەمردنی دایکی دڵی بریندارە بووبوو ، وەبەم حاڵەی باوکیشی زیاتر دڵ شکستە ئەبوو وەباری خەمی گرانتر ئەکرد ، ئەیفەرموو : « کچی شیرینم مەگری ، باوکت خوا ئەی پارێزێ و سەریشی ئەخا» وەئەیفەرموو : « بەخوا تا ( ابوطالب ) مابوو شتێوایان لەگەڵا نەئەکردم کە بەمشێوەیە دڵگرانو نارەحەتم بکەن » .

## ( طفیل ) ی کوڕی عەمری دەوسی

توفەیل ناو خزمی ( ابوهریرە ) بوو ، جارێکیان هات بۆ مەکە ، ئەم توفەیل ناوە پیاوێکی ژیرو زاناو کەلێ دانا و بەڵکوو ئیژەوانیش بوو، وەبکرە دەم راستی هۆزەکەی بوو ، قورەیشەکان ترسان لەوەی بچێتەسەر ئایینە تازەکەی محمد ( د خ )، بۆیە چوونەلای و پیانوت : « محمد جادوگەرو دەس بڕو پیاو ئەخەلەتێنێ ، ئەترسین ئەگەر بچیتەلای تۆش وەکو خزمەکانی ئێمەسەرت لێ بشێوێنێ ، چاکوایە هەرنەی بینی، توفەیل ڕۆژێ چوو بۆکەعبە و محمدیش لەوێبوو گوێی لەقسەکانی بوو بەلایەوە جوانبوو ، لەدڵی خۆیا وتی : ( دایکم بۆم بگری خۆمن پیاوێکی زاناو شاعیرمو ئەتوانم چاك و خراپ جیابکەمەوە ئەی بۆ نەچم گوێ لەم کابرایە بگرم ئەگەرقسەکانی جوانبوون لێی وەرئەگرم وەئەگەر خراپبوون گویان نادەمێ ) . کە محمد ڕۆیشتەوە شوێنی کەوت و چوەماڵیان و مەبەستەکەی خۆیی تێ گەیان پێغەمبەریش ئیسـلامی بۆ باس کردو قورئانی بـۆ خوێندەوە ، توفەیل موسڵمان بوو شایتومانی هێنا ، پاشان چوەوە ناو خزمەکانی و بانگی کردن بۆ ئیسلامەتیو هەندێ باوەڕیان پێکردو هەندێکیان هەردوایان ئەخست ، ئەویش هەرلەگەڵیانا ئەدوا هەتا بەشی زۆریان موسڵمان بوون .

# گاورەکانی نەجران

کاتێ بەهۆی موسڵمانەکانی حەبەشەوە هـات و چۆکەری ئەم لاولاوە دەنگو بـاسی ئیســلام و پێغەمبەری ئیسلام بڵاوەی کرد ، گاورەکانی نەجران (١) کۆمەڵێکیان نـارد بۆمەکە هەتا دەنگو باسی ئەوپیاوە بزانن کـە خۆی بەپێغەر ئەزانێ ، وەلەگەڵ ئەو ناوو نیشانانەی کە لە کتێبی ئینجیلایە بەراوردی بکەن ، کۆمەڵەکە بیست پیاو بوون ، هاتن لەمزگەوتا بینی‌یان و لەگەڵیا دوان و پرسیارو وەڵامیان لەگەڵا کرد .وەبۆیان دەرکەوت بەگوێرەی ئاگاداری کتێبی خۆیان محمد هەمـان مژدەپێ دراوەکەی عیسـا پێغەمبەرە ، پێغەمبەر داوای ئیســلامی لێکردن و قورئانی بۆخوێندن ئەوانیش هەموویان موسڵمان بوون و پەیمانیان لەگەڵا بەست ، قورەیشەکانیش ئاگایان لەم بەسەرهاتەبوو کاتێ کە هەڵسان بڕۆنەوە ئەبوجهل و تاقمێك هاتن بەرەنگاریان بوون و قسەی ساردیان پێووتن و وتیان : ئەی بەخێر نەیەنەوە چ کۆمەڵێکن ، لـە ئێوە نەفامترمان نەدیوە ، ئێوە خزمەکانتـان ناردونیان کە هەواڵی ئەو پیاوە بزانن ، کەچی ئەوەندەی نەخایاند وازتان لە ئایینەکەی خۆتان هێناو شوێن ئەو کەوتن و باوەڕتان پێ کرد ، ئەم وت‌و وێژە تینێکی نەکردە ســەریان و باوەڕیـان پتەوتربوو ، وتیان : سڵاوتان لێ بێ ئێمە لەگەڵ ئێوە ناڵێن ، ئاینی خۆتان بۆخۆتان و ئێمەش ئەو ئاینەی پەســەندمان کردووە بۆ خۆمان خوای(٢) گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە : ( اَلَّذِينَ آتَيْنَـاهُمُ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِهِمْ بِهِ يُؤْمِنُونَ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّنَـا إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ، أُولَئِكَ

---

( ١ ) نەجران شارێك بوو لەنێوانی مەکەو یەمەنا حەوت قۆناغ لە مەکەوە دووربوو . (٢) ڕاست : مِنْ قَبْلِهِمْ بِهِ...

يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَأُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ، وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَانَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ (١)

## پیاوە گەورەکانی قورەیش‌و قورئان

ئیش‌و کاری ئیسلام گەورەتربوو لەوەی بەرگری بکرێ ، وە بلاو بوونەوەی وای لێهات بەناچاری دانی پیا بنرێ هەرە دوژمنەکانی پێغەمبەرو ئیسلام وایان لێهات لەدلی خۆیانا ئەیان وت : ئایا ڕاستە محمد بانگ ئەکات بۆسەر ئاینی ڕاستەقینە ؟ ئایا ئەوهەموو بەلێن‌و مژدەو هەڕەشانە ڕاست بن ؟ شەوێك لەشەوان ( أبوسفیانی ) کوڕی (حرب) و (أبوجهل) کوڕی (هشام) و ( أَخْنَسِی ) کوڕی ( شریق ) هەرکەسە لەمالی خۆیەوە هات بۆئەوەی گوێی لەدەنگی محمدو گوێی لەقورئان خوێندنی بێ ، وهیچیان بەوانی تریان نازانن ، پێغەمبەریش ( د . خ ) شەوهەل ئەسا ـ تەنیاکەمێکی ئەبێ ـ قورئانی ئەخوێند بەدەنگێکی خۆشی فریشتەیی کەلەوانەبوو ئاسن وپۆلا بتاوێنێتەوە ، هەتا سپیدەی بەیانی ئەمانە گوێیان لێ گرت ، ئنجا هەرکەسە هەلساو بەدزییەوە بگەڕێتەوە تاکەس پێی نەزانێ ، کە چی بەفەرمانی خوا لەڕێگا بەیەك گەیشتن‌و لەیەکتر تێگەیشتن وکەوتنە سەر زەنشتی یەکتری‌و وتیان : ئیتر جارێکی‌تر شتی وانەکەن ، چونکە ئەگەر نەفامەکانتان بەمە بزانن ئێوە بێدەستەلات ئەبن ومحمد زال ئەبێ بەسەرتانا کەشەو هاتەوە هەریەکەیان وای ئەزانی قاچی ئەیبات بەڕێوە بۆشوێنەکەی دوێنێ شەوو بۆگوێ گرتن لەمحمد ، وەخۆیان پێ نەگیراو چونەوەو هەتا بەیانی گوێیان گرت ، دیسانەوە بەیانی بەیەك گەیشتنەوەو کەوتنەوەسەر

---

(١) سورەتی ( القصص ) آیە : ٥٥

زەنش کردنو بڕیاریان داوە کەنەچنەوە ، کەچـــێ شەوی سێ یەم هەم چوونەوەو لەبەیانیدا یەکیان گرتەوە . ا ئەمجـارە بڕیاری تەواویان داو سوێنیان بۆیەك خوارد کەنەچنەوە .

ئەم بیستنەی قورئان لەیەکەم سەرچاوەی سەرزەویوە زۆر تینی کردە سەر هەستو دڵو دەرونیان ، هەمیشە لە دڵی خۆیانا لێکیان ئەدایەوە و ئەترسان کە گەورەییو سەرۆکیان لەکیس بچێ ئەگەر شوێنی محمدبکەون خۆیانو خزمەکانیان موسلمان بین ، وەپرسیاریان لەدڵی خۆیان ئەکرد : بۆچی شوێن محمد نەکەوین ؟ خۆنە مـــاڵی ئەوێ لیمان و نەکرێ و نەپاداش و نەگەورەیی ، ئەوەتە پیاوێکی بێ فێزی بێ هەوای لەسـەرخۆیەو دڵی پڕەلە خۆشەویستی و ســـۆزو چاکە و ڕێنموی بۆ خزمەکانی ، وەزۆر خـــاوەن بەزەییو دڵ نەرمە ئایاچ خراپەیەك لەشوێن کەوتنیا ڕوودات ؟ بێ گومان هیچ . بەلاّم ئەمـانە سەروکن ئەبێ جیاوازییـان بێ لـەگەڵ خەڵکاو وەك بەندەو هەژارەکان سـەیرنەکرێن . خۆئەوەبوو قورئان ڕەخنەی لە محمد گرت بۆکوێرێ وەنەبێ ئەمان لە ئیشو کاریانـا پرسیاریان لێ نەکرێ و بەرزترن لەیـاسا ، بەلاّم قورئان دان بە بەرزی ئەمانا نانێ و گەورەیی ئەدا بەوەی کەزیاتر خوا بپەرستێ و لێی بترسێ بـابەندەش بێ ( إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللهِ أَتْقَاكُمْ ) (۱) واتە : بەڕاستی بەرزترینتان ئەوەیە کە خواپەرستترو لەخوا ترساوتربێ . لەگەڵ ئەمەشـا بەخێلی دەستێکی بالآی هەبوو لە موسلمان نەبوونی ئەو ســـەرۆکانەدا . [ أمیه ] ی کوڕی سەڵت کە ئەی بیست پێغەمبەرێك لەو ولاّتە پەیدائ بێ ئەویش بەهیوا بووخۆی بێ . چونکە زاناو شـــاعیرو هونەروەر بوو . کاتێ

(۱) سورەتی ( الحجرات ) آیە ۱۳

محمد بو بەپێغەمبەر ئەو هیوایەی نامـاو بەخیلی ڕێگەی نەدا موسلمان بین .
وە [ ولید ] ی کوری [ مغیرە ] ئەیوت : چۆن قورئان بۆ محمد دێت و
و من بۆم نایە . . ! خۆمن گەورەترو بەدەسەلات ترو منال دارترم ، یـا
چۆن نایەت بۆ [ أبومسعود عمروی ] کوری ( عمیری ) سەقەفی سەرۆکی
هۆزی سەقیف لە تایفاخۆ ئێمەدوو گەورە پیاوی ئەم دووشوێنەین قورئان
لێرەدا ئەفەرموی : [ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ (٢) عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ، أَهُمْ
يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ، نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ] (١)
لەدوای ئەو سێشەوە أخنس چوو بۆلای أبوجهل لەمالاو لێی پرسی .
ئەی ( أبوالحکم ) ڕاتچی‌یە لەوەی بیستمان لە محمد؟ أبوجهل ئەلێ :
چیت بیســـت ؟ ئێمەو عبدمناف نەبەردمـان کرد لـە گەورەیی و
شەرەفا : میوان داری‌یان کرد ئێمەش کردمـان ، یارمەتی خەلکیان دا
ئێمەش یارمەتیمان‌دا ، شتیان دابە هەژاران ئێمەش دامان ، هەتاوامـان
لێهات لە کاروانی مرۆڤایەتی‌دا بەرابەربووین ، وەهەریەکەمان ئەی‌ویست
پێشی ئەوی‌ترمان بکەوێ ، تا ئەوان ووتیان : ئێمە پێغەمبەرمان هەیە و
نیگای لە ئاسمانەوە بۆ دێت . چۆن بەمە بگەین ؟! بەخوا قەت باوەڕی
پێناکەین و شوێنی نـاکەوین بەڵێ بەڕاســـتی هەر بەخیلی و
ترسی لەدەس چوونی گەورەیی‌و پایەبوو ئەمانەی بەکافری هێشتەوە ، وە
ئەم جۆرە خووانە لە هەموو کاتێکا کاری خویان ئەکەن و ڕێگای ڕاست
لەمەردوم گوم ئەکەن و سەری لێ‌ئەشێوێنن و ڕای ئەکێشن بۆناو شیوی
جهنم و بئس المصیر ،

---

(١) لەسورەتی ( الرخرف ) آیە ٣٢

(٢) نزّل هذا القرآن على رجل : [illegible]

## ژن هێنانی پێغەمبەر :

لەدوای مردنی خەدیجە نزیکەی مانگێکی پێ چوو پێغەمبەر (سودە)ی کچی زەمعەی عـــامری قورەیشی مارەکردو گوێزایەوە ، لە پێشەوە سەودە ژنی [ سکران ] ی ئامۆزای خۆی بوو ، هەردوکیان موسڵمان بوون ، وە لەکۆچی[1] بۆ حەبەشەو پـــاش ماوەیەك هاتنەوە بۆ [ مەکە ] ، لەوێ سەکران کۆچی دوایی کرد ، وەکە [ عدە] ی بەسەرچوو پێغەمبەر(دروودی لەسەربێ [٤٠٠] درەم مارەیی داو مارەی کرد ، وەمانگێ دوای مارەکردنی سەودە پێغەمبەری خوا عائشەی کچی ئەبوبکری صدیقی مـارەکرد ، وە بێجگە لەعایشە پێغەمبەر کچی نەهێناوە ، وەلەبەرئەوەی عایشە منالو حەوت ساڵان بوو نەی گوێزایەوە هەتا دوای کۆچ کردنیان بۆ مەدینە ، پێغەمبەری خوا ( درووەدی لەسەربێ ) بەم ژن هێنانە چەن شتێکی گرنگی پێك هێنا : لەپێشەوە خۆی ژنێ نەمابوو هاوسەرێکی نەبوو کە ڕازو نیازی تەواوی لادەرببڕێ و ئەویش یارمەتی بداو دڵنەوایی بکاو پاڵی پێوەنێ بۆ زیادە بەرگە گرتن ، وە کەیبانۆیەکی نەبوو دەست بەســەر منالەکانیـا بگرێ و ئیشی مالی بۆرێك بخات ، چونکە رقیەی کچی دا بوو بە ( عثمان )ی کوڕی ( عفان ) و [ أم کلثوم و فاطمە ] ش منال بوون ولێیان نەئەهات ئیشی مالی پێغەمبەر بەرن بەڕێوە .

وە سەودەیش لەناو خێزانەکەیانا تەنیا ئەوو مێردەکەی موسڵمان بوبوون . خۆ یا ئەبوایە بێ کەس و بێ یـارمەتی دەر بەڵێ قەوماوی بژیـایە، یا ئەبوایە بچوایەوەسەر مالی باوکی و ئەوانیش لە ئایینەکەی پەشیمانیان بکردایەوە هەتا کاتێ خوازبێنێ کەر ( خولە ) ی کچی ( حکیم ) چووەلای وتێی کەیاند کەپێغەمبەر ئەیەوێ بیخوازێ ، وتی : پێم خۆشە بچێتەلای باوکم .



(١) وەلەکۆچی دووەما چوون بۆحەبەشە

که چووەلای ( زمعه ) ئـەویش پێ‌خۆش بوونی دەربـڕی و وتی : هاو نەژادێکی باشە . لەو کاتەدا براکەی ( عبدی) کوڕی (زمعه) که بەم کارەساتەی زانی لەداخا خۆلی ئەکرد بەسەر خۆیا . بەم مارەکردنەی پێغەمبەر هەمهاوسەرێکی بۆ خۆی پەیدا کرد هەم موسڵمانێکی له خراپەی ئـاینی ڕزگارکرد ، وەلەگەڵ ئەمانەشا بەم کارە بووبە زاوای تیرەی [ بنی‌عامر ) که ئەمەش بەپێی یاسای تیرەپەرستی گرنگ بوو ، بەمارەکردنی عائشەیش ( ئەبوبکر ) ی له خۆی نزیکتر کردەوە و خۆی کرد بەخزمی هۆزەکەی ، وەئەم جۆرە کارانە تینی کەورەیان هەبوو بۆ ئەوچاخەی پێغەمبەر و ئیسلام .

## ( چونی پێغەمبەر بۆتایف )

کەپێغەمبەری خوا ( درودی لەسەربێ ) بۆی دەرکەوت هەتا دێ قورەیشەکان سوورتر ئەبن لەسەر بەربەرەکانێی ئەم بانگە پیرۆزەی ئیسلام وەنایەڵن ( مکه ) ببێتە بنکە بـۆ بڵاو کرد نەوەی نووری ڕزگارکەری ئیسلام ، خۆ ئەوەتە زیـاتر له ( ١٠ ) دەسـاڵە ئەم بانگە هاتووە و ئیش ئەکا ، وەهەرچەند ژمارەی موسڵمانان زۆر بووە بەڵام بانگە کەسەربەستی وەرنەگرتووە و نایەڵن دەڵەتێك دابمەزرێنێ و لەوێوە دەس بکرێ بەڕزگار کردنی سـەرزەوی بەتەواوی . وەبت پەرسـتەکان ڕۆژبەڕۆژ له ئازاردان و بێ‌شەرمیدا زیاتر تیژئەبن ، لەبەر ئەمانە ئەگەڕا بەشوێنی هۆزو جێگایەکا ئەم بانگە تیایا سەربەست بێ و ببێتە بنکەیەکی ڕزگار بوو بۆ ئیسلامەتی ، ئەوەبوو له پێشترەوە ناردی بۆ حەبەشە بەڵام قەشەو بەتاریکەکان کردیان بەهەراو نەیان هێشت ئەوکارە ڕێك وپێکه له حەبەشەدا سـەربگرێ ، هەرچەند (نەجاشی) پێی‌خۆش‌بوو ، وە لەناو ئەوشوێنانەی بەدڵیا ئەهاتن شاری ( طـائف ) هەڵبژارد ،چونکه نزیك‌بوو ( له مەکەوە پەنجامیل

دوور ) وەدایکی هاشمیش لەوان بوو ، واتە نەختە خزمایەتی یەکێ شك ئەبرد بەڵکو بەوبۆنەوە رێگای بکەن و بی پارێزن . لەگەڵ ( زید ) ی کوڕی حاریسەدا بەپێ رۆیشتن بەدزی یەوە تاگەیشتنە تائیف ، لەوێ چووەلای سێ سەرۆکەکانی سەقیف (عبدویالەیل ، مەسعود ، حەبیب ] کەبرابوون ، وەسەرۆکایەتی ( سقیف ) و طائف بەدەست ئەمانەوەبوو ، کەوتە دواندن و ئیسلامی بۆباس کردن و قورئانی بۆ خوێندنەوە و داوای یارمەتی لێ کردن و تێی گەتاندن بەچ نیازێ هـاتووە بەڵام ئەوان بەشێوەیەکی نـاشیرین و نامەردانە وەڵامیان دایەوەو بەنەفامیانە چوون بەدەمیەوە ، یەکێکیان وتی : بەرگـی کەعبەی دڕیبێ ئەگەر تـۆ پێغەمبەربی . یەکێ تریـان وتی : خوا کەسی دەس نەکەوت بیکا بە پێغەمبەرتۆ نەبێ ؟ سێ هەمیان وتی : بەخوا قەت قسەت لەگەڵاناکەم . ئەگەر پێغەمبەربی لەوە گەورەتری من قسەت لـەگەڵ بکەم ، وەئەگەر درۆیش بکەیت نابێ قـسەت لەگەڵ بکەم . بەکورتی پێغەمبەر ( د . خ ) لێیان بێ هیوابوو ئومێدی هیچ چاکەیەکی لێ نەکردن ، بۆ ماوەی دەرۆژ مایەوە بێ سوودبوو ، لە پاشـا داوای لێ کردن کە باسی ئەم هاتنەی نەکەن باقورەیشی نەزانێ ، ئەمەیشیـان نەکرد ، زیاتر لەمەیش منالە وردەیان لێ هاندان و بەردیان ئەگرتە قاچو قولی ، زید هەولی پاراستنی ئەداوخۆی ئەدایەبەر بەردەکان بەڵام بێ هودەبوو ، قاچە پیرۆزەکانی برینداربون و خوێنیان پیـائەهاتە خوارەوە وەکەئێش بە دلی ئەگەیی دائەنیشت تا ئەحەسایەوە ئەمجارە هەل ئەساو ئەهات و ئەوانیش بەدوایەوە هەتا خۆیان فڕی داناو باخی [ عوتبەو شیبە ] ی کوڕانی ( ڕەبیعە ) ی کوڕی ( عبدالشمس ) ی کوڕی [ عبدمناف ] وە ، چونە بنکی میوێك ، وەئەو دووبرایەیش کەخاوەنی باخەکەبوون بۆیان ئەڕوانی ،

ئەگەرچی دوژمنیشی بوون بەڵام بەزەیی‌یان پیایا هاتەوەو منداڵەکانیان لێ دوورخستەوە ، کە تۆزێ حەسایەوە سەری بەرز کردەوەو کەوتە نزاو پاڕانەوەو فەرمووی : « خوایە هەرلای‌تۆ سکاڵای کەم هێزی و بێ‌دەرنەتی و سووکیم لای خەڵك ئەکەم ، تۆ خوای منی و هەموو بێ هێزانی‌و بەزەییت لە هەمووکەس زیاترە ، بکێیم ئەسپێری ؟ بەبێگانەیەك کە بە ڕووگرژی و بەدرژی‌یەوە سەیرم بکا یان بەدوژمنێك کاروبارم ئەخەیتە ژێردەسیەوە ؟ ، لەگەڵ ئەمانەش‌دا هەموو شتێك ئەخەمە پشت گوێ بەمەرجێك تۆم‌لێ‌نەڕەنچی ، بەڵام خوشنوودی‌و میهرەبانیت بۆمن فراوان‌ترە ، پەنائەگرم بە تیشکی ڕووت کە هەموو تاریکی یەکی لابردوەو بووە بە هۆی ( اصلاح ) ی هەردو دونیا لەوەی کە غەزەب‌و خەشمت بڕژێنی بەسەرماو لێم زویربێی . هەمووکەس . هەموو دەم شایانی سەرزەنشتە تاتۆ لەخۆی ڕازی‌ئەکا ، هیچ پەناو هێزێك‌نی‌یە جگە لە تۆوە نەبێ » .

دووکوڕەکەی ڕەبیعەیش هەرچاویان تێ‌بڕیبوو لەپاشا بەزەیی‌یان پیاهاتەوە بەرامبەر بەو هەموو ئازارەی هاتبوە ڕێی ، بەندەیەکیان هەبوو ( عداس ) ناو لەگاورەکانی موسڵ بوو هێشوویەك ترێ‌یان پیانارد بۆ محمد کە تریکەی لەبەردەستادانا پێغەمبەریش دەستی بۆ درێژکرد و فەرمووی [ بِسْمِ اللهِ ] ئنجا دەستی کرد بەخواردنی ، ( عداس ) وتی : ئەم وتەیە خەڵکی ئەم ناوچەیە نایڵێن ! پێغەمبەریش (درووودی لەسەربێ) فەرمووی : بێچی تۆخەڵکی کوێیت ؟ وتی گاورم‌و خەڵکی نەینەوام (١)

---

(١) چەندساڵێك پێش لەدایك‌بوونی عیسا «نەینە» ناوێك کە یەکێك بوو لە پاشاکانی ئاشوور ئاوەدانی کردەوە ، ئنجا کوردەکان بەو هۆیەوە ناویان‌نا نەینەوا لەم وشەیەوە عەرەبەکان کردیان بە ( نینوی )

فەرمووی : تۆ خەڵکی شارەکەی ( یونسی کوڕی متی ) ی وتی : تۆ ( یونس ) لەکوێ ئەناسی ؟ فەرمووی : « یونس برامەو » پێغەمبەری خوا بوو منیش پێغەمبەرم . خوای گەورەیش داستانی ( یونس ) ی برامی بۆگێڕاومەتەوە ، ئنجا دەستی‌کرد بەباسی یونس‌وەکو قورئان بۆی باس‌کردوە (عداس) خێرازانی کە پێغەمبەر نەبوایە ئەوشتانەی نەئەزانی‌و ئیتر کەوت بەسەر دەست‌و پێیاو ماچی‌کرد و موسلمان بوو . دوو کوڕەکەی ( ربیعە ) وتیان : ئەو بەندەیەمان گومڕابوو یەکی‌وت ، کە هاتەوە پێیان وت : خوابت گرێ بۆوات ئەکرد ؟ ئەویش وتی : بەخوا لەسەر زەویدا لەم پیاوە باشتر و گەورەتر نابێ‌و نی‌یە . ئەوانیش ئەیانویست پەشیمانی بکەنەوە و محمد بشکێنن لەبەرچاوی‌و وتیان : بابەئاینەکەی خۆت لە ئاینی ئەو باشترە . بەڵام ئەو تازەموسڵمان بووبوو . پێغەمبەری خوا (دروودی لەسەربێ) لەگەڵ ( زیدا ) ویستیان بگەڕێنەوە بۆ ( مەکە ) .

( زید ) وتی ئایا ئەتەوێ بچیتەوە ناوکۆمەڵێ کەناچاریان کردی بە ڕۆین ؟ فەرمووی : ئەی زید خوا بۆئەوناڕەحەتی‌یە چارەی داناوە . لە ڕێگادا بوون‌و نزیك بوونەوە لە ( مکە ) فریشتەیەك هاتە لای‌و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من نێرراوم لەلایەن خواوە بۆ لای تۆ ئەگەر ئەفەرمووی با ئەوکەژانە بدەم لەیەك‌و (طایف) کاول بکەم . پێغەمبەریش فەرمووی : نەء چونکە هیوایە لەنەوەی ئەوانە خوا مەردمی وادروست بکات کەخوا بەتەنها بپەرستێ ، ئەمجارە فەرمووی : خوایە ڕێ نموویی ئەو خزمانەم بکە چونکە نازانن . ئەویش وتی : بەخوا ڕاستە تۆ ( رئوف‌و رحیم)ی . قورەیشەکان زانیبوویان بەم ڕۆیشتنەی پێغەمبەر چونکە دەرۆژی خایاندبوو

لەبەرئەوە پێغەمبەر ویستی بەپشت قایمیی‌یەوە بچێتەوە (مکە) بۆیـە ناردی بۆلای (مطعم) ی کوڕی (عدی)و داوای لێ‌کرد کە پەنای بدا . مطعمیش کوڕو خزمەکانی چەکدار کردو هاتن بەڕیز لای پایەکانی (کعبە) وەستان و (مطعم ) بەسەر حوشترەکەیەوە وەستاو بانگی کرد : ئەی‌گرۆی‌قورەیش من پەنای محمدم داوە ، کەس قسەی پێ‌نالێ‌و دڵی ناشکێنێ ، پێغەمبەریش هاتە لای کعبەو دوورکات نوێژی کردو لەپاشان چووە ماڵەوەو (مطعم)و دەس‌و پێوەندەکانی بەچەکەوە ئەیان پاراست .

## محمد ئەچوە ناوتیرەکان

پێغەمبەری خوا ( درووذی لەسەربێ ) کەلە (طـائف و ثقیف ) یش بێ‌هیوابوو کەوتە گەڕان‌و هەوڵ دان بۆدۆزینەوەی جێگایەك تاپیکابەبنکە بۆبانگە پیرۆزەکەی ، ئەوبانگەی لە ( مکـــە ) و ناوقورەیشەکانا وشك‌و ڕاوەستاوە ، لەکاتی هاتنی تیرەو هۆزەکانی عەرەب بۆ (مکە) وبۆ ( کعبە ) وبۆ بازاڕەکان بەنهێنی‌یەوە ئەچووە ناویان‌و یەکەیەکە خـۆی پێ‌ئەکەیان‌و باسی ئیسلام‌و بانگی خوای بۆئەکردن‌و داوای پشت‌گیری لێ‌ئەکـردن ، وە ( أبولهب ) ی مامیشی هەرکەبیزانیایە ئەچوو لەکەڵیاو بەدرۆی‌ئەخستەوە وخەڵکی لێ‌دورئەخستەوە ، پێغەمبەر تەنها بەهاتنیان بۆ (مکە) وازی لێ نەئەهێنان‌و ئەچوو بۆناویان لەهەوارەکانیانا ، چۆوە ناو (کندە) و ( کلبی )و بنی‌حنیفەیی‌و بەنی عامر . . هتد .

(واقدی) ئەڵێ : چووە ناو تیرەی ( بنی‌عبس وبنی سلیم وبنی‌محارب، فەزارە ، مورە ، بنی نضر ، عزە ، خضارمە ) ، بەڵام هیچ کەسێ لەمانە وەڵامیان نەدایەوەو بەڵکو بەناشیرینی هاتن بەدەمیەوە ، ( بنی‌حنیفەیی) زۆر

بێئابڕوانە وەڵامیان دایەوە ، بەڵام بەنی عامر وتیان : ئەگەر تۆسەرکەوتی لەدوای تۆ ئیشەکە بکەوێتە دەس ئێمە ، کەپێغەمبەریش فەرمووی : ئیش و کارەکە بەدەس خوایەو ئەیدا بەهەرکەس خۆی ئارەزوو بکا ، ئەوانیش پشتیان تێکردو گوێیان نەدایە .

## شەوڕەویو بوڵندبوونەوە ( الأسراء والمعراج )

لەم کاتی تەنگو چەڵەمەدا ، کاتی ئازاری سەخت و چەوسانەوەی بەلێشاوو زەحمەت کێشانی زۆر ، لەم کاتەدا پەنجەی قەدەر لاپەڕەیەکی تر لەژیانو لەپەیامی پێغەمبەرا هەڵئەداتەوە ، خوای گەورە ئەیەوێ بەتەواوی محمد دڵنیا بکاو تێی بگەیەنێ لەوشتانەی کەهێشتا تێیان نەگەیشتووە ، ئەیەوێ ئادەمیزادێك بەرزبکاتەوەو بوڵندی بکا بۆ ئەو جێگایەی کەهێشتا فریشتەیش نەیگەیشتوونێ ، ئەیەوێ شەوڕەوی [ إسراء ] وەبوڵندبوونەوە ( معراج ) بکات بەمحمد پێغەمبەری مرۆڤایەتیو گیتی ( بەهەزاران دروودی لەسەربێ ) جەماهیری زانایان بەکۆنو تازەوە ڕایان وایە کەئەم شەوڕەویو بوڵندبوونەوە بەگیانو لاشەو لەکاتی بێداریدا بوو ، وەئێمەیش لەسەر ئەم ڕایە ئەڕۆین .

ئەم کارە گرنگەو ئەم (معجزە) گەورەیە لەساڵی یانزەهەمی پێغەمبەرێتیدا بوو ، واتە نزیکەی دووساڵ لەپێش کۆچ کردنی بۆمەدینە . لەشەوی دووشەمەو (٢٧) ی مانگی ڕەجەبا بوو . لەوشەوەدا پێغەمبەر لەماڵی (هند)ی کچی أبوطالبی ماميا بوو کەپێی ئەڵێن ( أم هانیء ) . أم هانیء ئەیوت: پێغەمبەری خوا ( دروودی لەسەربێ ) ئەوشەوە لای من مابووەوە ، نوێژی خەوتنانی کردو ئێمەیش نوێژەکەمان لەگەڵا کرد ، پاشان نووستو ئێمەیش

نوستێن ، تابەیانی لەپێش ڕۆژەوە بوونا خەبەری کردینـەوەو نوێژی بەیانیمان لەگەڵا کرد ، ئەمجار فەرمووی : تۆئەزانی من نوێژی خەوتنانم لێرە لەگەڵ ئێوەدا کرد ، پاشان چوومە « بیت المقدس » لەوێـش نوێژم کردو و هاتمەوە نوێژی بەیانیشم لەگەڵ ئێوەدا کرد . ئەڵێ : منیش‌وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەم قسەیە بۆخەڵك مەگێڕەرەوە چونکە باوەڕت پێ ناکەن‌و ئازاری دڵت ئەدەن . فەرمووی : « بەخوا بۆیان ئەگێڕمەوە » . قورئان باسی ئەم شەوڕەوی‌یە ئوکاو ئەفەرموێ :

( سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ . الآية[1] . شەوڕەوی ەپێی ئەم ئایەتە شتێکی ئاشکرایە لەئاینداو جێگەی گومان نی‌یە بەڵام ەرزبوونەوە بۆئاسمانەکان‌و (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى) وەکو شەوڕەوی نیە ، لەبەرئەوە ۆربەی زانایانی ئیسلام ڕایان لەسەرەو بڕوایان پێ‌یەتی بەبـەڵگــەی ەرموودەی پێغەمبەر ( د . خ ) کە ( مُسْلِمُو بُخَارِي ) ڕیوایەتیان کردووە ە (صحیح)یان داناوەو قاضی(عیاض)یش لە( أنس)ی کوڕی (مالك)ەوە وایەتی کردوە .

وەلەم فەرموودەدا باس کراوە کەپێغەمبەر ( د . خ ) بەرز کـراوەتەوە اسمانەکان و (سدرة المنتهى) ولەئاسمانەکان‌دا هەندێ لەپێغەمبەرە گەورە- ، بینیوەو نزای خێریان بۆکردووە ، وەلە ( سدرة المنتهى ) دا یەکسەر ەڵ خوادا دواوەو نیگای لەگەڵدا کراوەو پەرە لەڕووی نهێنی‌یەکانـا اوە . (٢)

---

» ئەگەر ئەتەوێ ئاگاداربی بەسەر ڕووداوی شەوڕەوی بەرزبوونەوەی ێەمبەردا ، سەیری کتێبی مسلمو بوخاری‌و سـەرچاوە ڕاستەکانی تر

[1] ) آیە : ١

←

# دواندن لەم شەوڕەوی‌و بولندبوونەوەیە

ئەم داستانە پیرۆزە ئێمەی موسلمان هەرچۆنێ باس‌و بەیان کراوە لە ئایەتی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرا ، هەر بەوشێوەیە باوەڕی پێ ئەکەین ودل‌نیاین لەسەر ڕاستێتی . وەبەهیچ کلۆجێ دوودلیمان تیا نی یە ، وە ئاتاجیمان نی‌یە بەکەڕان بەشوێن بەلگەو بورهانی عەقلی‌دا ، وەئەوەی کە لەچۆنیەتی‌و فەلسەفەکەی نەگەیشتین ئەی‌گێڕینەوە بۆلای زانیاری‌ودەسەلات وخواهیشی خواو لەسەری ناڕۆین ، وەهەرکەسێ لەسروشتی دەسەلاتی‌خواو لەسروشتی پێغەمبەرێتی تێ‌گەیشتبێ ئەم جۆرە شتانە بەدروو جێی سەر سورمان نازانێ ، خۆ لەچاو دەسەلاتی خواوە ئەمە زۆر شتێکی سووک‌و ئاسانە ، وەبەرزی‌و نزمی‌و دوورو نزیکی‌و کەم‌و زۆری‌و کورت‌و درێژی‌و دیاری‌و پەنهانی یەکسانن بەلای دەسەلاتی خواوە . هەرکاتێ هەرشتێکی ویست کەبی‌بەوێ‌و بفەرموێ : ببە ، ئەبێ‌و تەواو . وەسروشتی پێغەمبەرێتی پێغەمبەر بریتی‌یە لەگەیشتن بەکۆمەلی ژوورو [ الملأ الأعلى ] وەگەیشتنی پێغەمبەر بەکۆمەلی ژوورو بەهۆیەکی دیاری یا نادیاری‌یەوە لەم‌شەوڕەوی وبولند بوونەوەیە کەم ترو بێ‌بایەخ‌تر نی‌یە .

بۆیە ( أبوبكر صديق ) ئەی‌فەرموو : لەوە گەورەتریش بێ‌من باوەڕی پێ ئەکەم . بەلام لەگەل ئەمانەیشا هەندێ باســی لێ‌ئەکەین ، بـۆئەوەی

---

بکە ، بەلام تەماشای کتێبی ( ابن عباس ) مەکە لەباسی میعراجدا چونکە پڕە لەدرۆو خەرافات ، شتێـکی ئاشکـــرایە بە دەم ( ابن عباس ) وە هەلبەسراوە ، ( ابن‌عباس ) دوورە لەوانە . دوکتور محمد سعید رەمەزان ( فقه السيرة ) ل ١٤٦ چاپی چوارەم ١٩٧٢

دوژمنەکانی ئیسلامو ناحەزەکانی پێغەمبەر ( دروودی لەسەربێ ) ڕێگای پەلەقاژەیان نەبێو بەم بۆنەیەوە ئاگری گومان لەدڵی سادەو ساویلکەکانـا هەڵ ئەگیرسێنن . کافرو بتپەرستەکانی دەوری نەفامێـتی پێشوو باوەڕیـان نەئەکردو گومانیان بوو ، بەڵام بەڵگەیان هەرئەوەندە بوو : چۆن محمد بە شەوێك ئەوماوە دوورو درێژە ئەبڕێ .! کەکاروانی ئێمـــە لەم سەرەوە مانگێك‌و لەوسەرەوە مانگێکی پێ ئەچێ ، وەچۆن ئەتوانێ بەرزبێتەوە بۆ ئاسمان خۆ ئەوان کەسیان ناتوانن بەرزبنەوە تا سەربانی خۆیان ؟

بەڵام وەڵامی ئەم ڕەخنەیە زۆر ئاسانە کەتۆ باوەڕت بوو بەخواو بـە دەسەڵاتیو بەفەرموودەکەی ئیتر ئەمەت لەبەرچاوا ئاسان ئەبێ ، ئەوەیـە خوا ڕۆشنایی دروست کردوە کەلەسانیەیەکا سەدو هەشتاو شەش هەزار میل ئەبڕێ . وەسەرەو ژوورو سـەرەو ژێر هیـچ جیاوازی نادات بـەم خێراییە . ئەگەر خوا بیەوێ گیانی محمد بەرزبکاتەوەو جلەوی لاشەکەی بگرێو بەخێرایی تیشك‌و ڕۆشنایی بیبات ، یا تیشك‌و ڕۆشنایی بۆ بکات بەوڵاخی سـواریو بەخێرایی بیبا بۆفەلەستین ( فلسطين ) ولەوێشەوە بۆ ئاسمانەکان ئەبێ چ جێگەی سەرسرمان یا هۆی گومان بێ ؟ . کافرە بت پەرستەکانی دەوری زانیاری ماددی ، یا بڵێین دەوری نەفامێتی تازە ، بە شێوەیەکی تازە ئەیانەوێ باوەڕ بەم بەسەرهاتە بەرێزە نەکەنو بەگومان بن تیایا . ئەڵێن :ـ بێجگە لەبیانوەکانی دەوری پێشوو کەمحمد هۆی گواستنەوەی خێرایی نەبووە ـ لەتوێکڵی زەوی کەتێپەڕیو سنووری ڕاکێشان(جاذبە)ی نەما ئیتر لەوێدا کێش نامێنێو ئۆکسجین کەهۆی ژیانی هەمووزیندوویەکە نامێنێو ئیتر هیچ زیندویەك ناتوانێ بژی چ جای ڕۆیشتن ، هەروەهـا بەگوێرەی پلەی زانیاری تازە بەجۆرەها کۆسپو کـرێ بەربەستی بەرز

بوونەوە ( معراج ) ئەکەنو شتـی وەك ڕووداوەکەی بەردەسمان ئەگەن بەڕوداوێکی نەگونجاو ( مستحیل ) بەڵام لەم دوایی‌یەدا هەروێنەی ئەمانە خۆیان شتی وایان داهێنا کەبیێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی بوڵند بوونەوەکەی محمد ( د خ ) ئەوەیە ساروخو مانگو ئەستێرە لەقەوارەی بچووكو گەورەدا ئەنێرن بۆمانگو بۆزەهرەو مریخ . . وەمرۆڤ یا گیانداری تری تێ ئەخەن وئەڕواو یەتەوە ، وەبەهۆی وێنەو تێبینی لەکورەکان ئەکەنو شارەزا ئەبن. ئەمەیش هەمووی بەگوێرەی زانیاری‌یەکی ماددی سنوور داری مرۆڤایەتی، ئەی ئەگەر ئەوخوایەی کەبەوزانینو دەسەڵاتە بێ‌سنوورەوە کەهەیەتی تواناو هێزی وابدا بەخۆشەویستو پێغەمبەرەکەی ، کەئەوماوەیەی پێ‌ببڕێو ئەو مەوادانەی کەژیان پێویستی پێیان هەیە ، یا ئەگەر بەفـریشتەیەکی وەك ( جبرئیل ) ئەو پێویستیانە بەجێ بێنێ بۆی چ جێی سەرسڕمانو گومان ئەبێ ؟ کێ‌بڵێ ئەوسنك لەت کردنو شۆرینو پڕکردنەوەیە کەبەمحمد کرا لەلای ( کعبە ) دا بریتی نەبوو لەئامادە کردنو پڕکردنی لاشەی محمد لەومەوادانەی بۆئەو ڕۆیشتنە پێـــویستی پێ‌ئەبێ وەتوێشووی ئەوسەفەرە کوتو پڕیە نەبوو . وەهەرکەسێ سەرلەخۆی نەشێوێنێو شـارەزایی‌یەکی ئەوتۆی لەژیانی ئەوپێغەمبەرە ناوازەیەدا هەبێ بەبـێ چەنو چون دان بە شێ لەمە گەورەترا ئەنێو باوەڕی پێ‌ئەکا . ئەمە دواندنێکی کورت بوو لەباسی داستانەکەو هیوام وایە جێگای کەڵك‌بێ .

## ( بەشی شەشەم لە کۆچ کردنەوە تاجەنگی بەدر )

## سەرەتای کۆچ کردن :

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ هەمیشە لەبیری ئەوەدابوو کە

جێگایەکی باش بدۆزێتەوە دەرێدا بۆ ئەوەی بێتە بنکە بۆ بانگەکەی ، تا بانگەکەی بەسەر بەسی تێدا بڵاوبکاتەوە و لەوێدا بارەگاو دەسەڵات دابمەزرێنێ و ئنجا خۆی و یارەکانی مەشخەڵی ئازادی هەڵگرن و سەر زەوی پێ ڕزگار بکەن و مرۆڤایەتی پێتەوە سەرشەقامی مرۆڤایەتی راستەقینە . خزۆورەیشەکان بەخێل و عیناد بەرچاوی گرتوون و وائەزانن ئەگەر بێتو بچینە سەر ئاینەکەی محمد ئیتر ئەوپلەی ئاینی‌یەیان نامێنی و عەرەبەکان نایەن بۆحەج کردن لە کەعبەکەیاندا ، وە هۆزوخێڵەکانی دەوروبەری مەکەیش کە قورەیشیان لەو هەڵوێستە دابینی ئەوانیش خراپتر چون بەدەمی ئاینە تازەکەوە .

قەشەکان و پیاوانی ئاینی حەبەشەیش هەڵسان بەشۆرشێ دژی نەجاشی و نەترسان ولاتی حەبەشە بکاتە مەڵبەندی ئاینی ئیسلام و ئایینی گاوری لەناو بەرێ . وەزانیمان لە طائفدا سەقەفی‌یەکان بەچ شێوەیەکی بێ ئابڕوانە جووڵانەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ـ د خ ـ . ئەم جۆرە کارو هەڵوێستانە وەنەبێ تیق پێچەوانەیان کردبێتە سەر دڵ و دەروونی خاوێنی محمد . ئەم وانەبوو ، خۆ محمد ـ درودی لەسەربێ ـ پێغەمبەرەو فەرمانی پیادراوە ئەو ئاینەبەرزە ڕاگەیەنێ بەمەردومەکانا ، سروشتی ئاینەکەش سروشتێکی زانیاری یەو نەبێ بەخەبات و ڕەنج و تێکۆشان بڵاوبکرێتەوە ، بەهیچ جۆرێ موعجیزە پەیوەندی نیەبەبڵاوکردنەوەی ئەو ئاینەوە . ئەو ئاینەئەبێ بەپێی یاسای خوا لەزەویدا جێگای خۆی بکاتەوە لە ناو دڵ و دەروون و مێشکدا « ولن تجد لسنة الله تبديلاً » . بۆیە پێغەمبەری خوا هیچ کاتێ بەتەمای ئەوەنەبوو خوای گەورە بەشێوەی موعجیزە خەڵکی بێنێتەسەر ڕێگاکەی ، یافریشتە بنێرێ بۆگەیاندنی پەیامەکەی سروشتی هەروا بووە و هەروایش

ئەبێ . هەمیشە ئەبێ بەرەنجو هەوڵدان و تێکۆشانی دڵسۆزانە بڵاوبێتەوە و سەرکەوێ و قەت لەخۆیەوە نابێ .

## مەدینەو مەدینەیی کان

وشەی مەدینەیانی شار ، واتە شاری پێغەمبەر ، ئەم شارە لەپێشەوە ناوی (یثرب) بوو ئەم ناوە ناوی کاتی نەفامێتی بوو ، ئەڵبەتە شتێکی نارێکی تیابووە بۆیە لەپاشان (خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرناوی نا «طیبة یا طابە» (١)وەلە دوایی‌دا ناوی مەدینەی بەسەرابڕوا ئێستا بەوناوەوە بەناوبانگە .

لەم شارەدا دووبەرە باب : ـ (أوس وخزرج) کە دووتیرەی عەرەبن ولەپشتایەکن ئەژیان ، وەسێ تیرەی جوولەکەیش : (بەنوقریضەو بەنونصیر بەنو قینقاع) لە کەڵیانا ئەژیان ، عەرەبە گاورەکانی شام لە ماوەی دەساڵاتیانا هاتن‌و دایان بەسەر ئەم جوولەکانەدا (چونکە باوەڕی گاوور وایە کەجوولەکە (عیسی) یان کوشتووەوهەڵیان واسیوە) بەکوشتن‌و بڕین و تاڵان‌کردن ، وەعەرەبەکانی (یثرب) هەرچەند بت‌پەرست بوون بەڵام بە دەمـارگیری نەتەوایەتی یارمەتی عەرەبە گاورەکانیان دا .

دوایی جوولەکە ئەیەن‌زانی بەچەنك و هەرا چـاری ئەم عەرەبـانە ناکەن بەفێڵ‌و تەڵەکەو پیلان دوژمنایەتی‌یەکی نەبڕاوەیان خستە ناویانەوە و (١٢٠) ساڵ درێژەی کێشاو چەند جەنگی خوێناوی لە نێوانیا ڕوویدا کە دواینەکەیان جەنگی (بعاث) بوو کە چەندپیـاوی ناودارییانی تیـا کوژرا لەم مـاوەیەدا عەرەبەکان بوونە هاوپەیمان لەگەڵ جوولەکەدا ، ئەوسی‌یەکان پەیمانیـان لەگەڵ (بەنوقریضە) دا و خەزرەجی‌یەکان لەگەڵ

---

(١) مسلم و أحمد ڕیوایەتیان کردوە .

( بنو النضیرو بنو قینقاع ) دا بەست . وەلەم دوایی‌یەدا هەموو جارێ جوولەکـە عەرەبەکانیان ئەترسـان بەمە : کەوا پێغەمبەرێك بەم نزیکانە پەیدا ئەبێو ئەوان شوێنی ئەکەون و عەرەبی پێ لەناو ئەبەن .

## ئیسلام‌بوونی مەدینەیی‌یەکان :

خوای پەروەردگـار ویستی ئاینەکەی خۆی سـەربخاو پشگیر بۆ پێغەمبەرەکەی پەیدابکاو پەیمانەکانی بۆ بەجێ بێنێ ، پێغەمبەر (د . خ) لە کاتی حەجاوەکو جارەکانی‌تر چوەلای ئەو خەڵکەی هاتون بۆ حەج ، وولەوساڵەدا کۆمەڵێکی شەش کەسـی لە ( خزرج ) کە بیریتی‌بوون لە : أسعد کوری زوراره ، عوف کوڕی حارث لە بنی‌نجار ، وە دافع کوڕی مالك لەبنی زریق ، وەقتبە کوڕی عامر لەبنی سلمە ، وەعقبە بنی‌عامر لە بنی حرام ، وە جابر کوری عبداللە لە عبید کوری عدی . لەلای (عقبە) پێیان‌گەیشت و لێی‌پرسین : ـ ئێوە کێن ؟ وتیان : خەزرەجین . فەرمووی : هاوپەیمانن لەگەڵ جوولـەکەدا ؟ ، وتیـان : بەڵێ . فەرمووی : ـ دەی دانانیشن نەختێ لەگەڵتانـا بدوێم ؟ ووتیـان : بەڵێ ، پێغەمبەر لە گەڵیانا دانیشت‌و بانگی‌کردن بۆلای خواو بۆسەر ئیسلام و پێغەمبەریەتی خۆی بۆ باس‌کردن قورئانی بۆ خوێندن ، ئالێرەدا بۆ یەکیان ڕوانی وتیان : ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکەکان ئەمانترسێنن پێی ، وەرن بائێمە دەسـت‌پێش‌خەربین و شوێن‌کەوتوی بین ، هەموو باوەڕیـان پێ‌کرد و موسڵمان‌بون و شایتومانیان هێناو پێیان وت : بەخوا ئێمە خزمەکانمـان ـ أوس‌و خزرج ـ بەجی‌هێشتووە ، هیچ کۆمەڵێك نیە ئەوەندە نارێکی و دوژمنایەتی‌یان لەناوابێ . ئەگەر بێتو خوا لەسەر دەسی تۆدا یەکیان‌بخاتەوە

هیچ کەس لە تۆ بەدەسەلاتترنابێ ، وە پەیمانیاندایە کە لە سالی داهاتوودا دێنەوەلایو سەری لێبدەن . وەهەتا دێنەنەوە لای خەریك بن لەمەدینەدا ئیسلامەتی بلاوبکەنەوە و نارێکییەکانی پێرێك بخەنەوە .

کە هاتنەوە مەدینە ئەم دەنگوباسەیان بۆ کەسەکانیان باس کردو ئامادەییەکی زۆر فراوانیان دەسکەوت . بینییان هەموولایەکیان ئاواتە خوازن بۆ ئاینێکی وابتوانێ یەکیان بخاتەوە و رێکیان بخاو باشتر لە لەجووەکەکان دۆستو پشتیوانی یەکتربن . هیچ مالێ نەمالە ناو ـ أوس و خزرج ـ دا کە ناوی محمدی تیانەبرێ .

## پەیمانی یەکەمی ـ عقبە : ـ

کە سال تێپەڕی و کاتی حەج کردن هاتە پێشەوە ، لە مەدینەوە دوانزەکەس لە موسلمانەکان بە ناوی حەجەوە هاتن بۆلای پێغەمبەر ، دەیان لە ( خزرج و دوانیان لە ( أوس ) ی یەکان بوون ، پێنجیان لە شەشەکەی سالی پێشوو حەوت کەسی تازەیان لەگەلابوو ( أبوهیثم ) کوڕی ( تیهان ) و ( عمیر ) کوڕی ( ساعدە ) لە ( أوس )، و ( معاذ ) ی کوڕی ( حارث ) و ( زکوان ) کوڕی ( قیس ) و ( عبادە ) ی کوڕی ( صامت و ( یزید ) ی کوڕی ( ثعلبە )و ( عباس ) ی کوڕی (عبادە) ئەم دوانزە پیاوە لە ـ عقبە ـ لە کاتێکا خەلکی وان لە ناوبەرگی تاریکایی شەواو ئارامیان گرتووە و کەس بەدەرەوە نیە ، ئەمانە بە خزمەتی پێغەمبەری خوا گەیشتن و ئیسلامەتییان تازەکردەوە ، پێغەمبەری خوا ( د خ ) پەیمانی لەگەلا بەستن لە سەرئەوەکە : « بەهیچ جۆرێ هاوەل بۆ خوا دانەنێن ، وە دزی نەکەن و شەروال پیسی نەکەن و منالی خۆیان

نەکوژن‌و درۆو دەلەسەو بوختان هەڵ نەبەستن لە کاری شەرعی‌و چاکەدا لە فەرمانی پێغەمبەر دەرنەچن ، ئەگەر ئەمەیان بەجێ‌هێنا بەهەشت جێگایان بێ وەئەگەر لەمانە ، یان لەهەندێکیان لایاندا ئەوکارە کە تەنیا بەدەس خواوەیە ، ئەگەر ویستی سزایان ئەدایان لێیان ئەبووری » ئەم پەیمانە ناوبرا بە (پەیمانی ژنان) چونکە باسی جەنگ‌وهەرای تیانیە کە کەڕانەوە بۆ مەدینە لەسەر داخوازی خۆیان پێغەمبەر ـ د . خ ـ ( مصعب )ی کوڕی ( عمیر ) ی لەگەلا ناردن ، بۆئەوەی قورئانیان پێ بلێن و فێری ئاداب و ڕەوشتی ئاینییـان بکەن . مصعب لەلای ( أسعد ) ی کوری ( زرارە ) میوان بوو ، روژێ ( مصعب ) لەگەل ( أسعد ) هاتن بۆ ناو باخێك ، لەوێ کۆمەلێك لە موسلمـانەکان دەوریان لێدابوون و فێری ڕەوشـت و و خووی ئیسلامەتی ئەکردن ، ( سـعد ) کوڕی ( معاذ ) کە سەرۆکی ( أوسی ) ی‌یەکان‌بوو لەگەل ( أسید ) کوڕی ( حضیر ) کە سـەرۆکی ( بنی عبدالأشهل ) بوو هەردوکیان بت‌پەرست بوون هاتن . ( سعد ) کە ئامۆزای ( أسعد ) بوو بە ( حضیر ) ی وت : بۆناچی بۆلای ئەو دوو پیاوەکە ئەیانەوێ سەر لە منال‌و نەفامەکانمان تێك بدەن و شێتیان بکەن دەریان بکەیت و قەدەغەی ئەو جۆرە کردەوانەیان لێ‌بکەیت . خۆئەگەر ( أسعد ) کوری مامم نەبوایە ئەمزانی چیم لێ‌ئەکرد ، ( أسید ) هەلسا نێزەکەی گرت بەدەستەوە و ڕووی تێ‌کردن ، کە بینی‌یان . ( أسعد ) وتی بە ( مصعب ) ئەمەسەرۆکێ هۆزەکەیەتی واهات بۆلات تۆش ڕاست بکە لەگەل خوادا لەکاتی قسەکردن لەگەلیا . کە هاتەسەر سەریان ڕاواستاو وتی : بۆچی هاتونە ناومان و سەر لە منال‌و نەفامەکان ئەشێوێنن ؟ ئەگەر گیانی خۆتان خۆش ئەوێ بڕۆن و وازلەو کارانە بێنن ، مصعب وتی :

تۆ فەرمو دانیشەو هەندێ گوێمان لێبگرە ، ئەگەر بەدڵت‌بوو لێمان وەر بگرە . ئەگەر پێشت ناخۆش بوو چی‌ئەڵێیت وانەکەیـــن . ( أسید ) دانیشت‌و (مصعب) باسی ئیسلامی بۆکردو هەندێ قورئانی بۆ خوێنـد ، ( أسید ) زۆر بەلایەوە جوان بوو خوا ڕێ‌نمووینی کردو موسلمان بوو ، ئەمجار وتی : پیاوێکم لەدواوەیە ( سعدی کوڕی معاذ ) ئێستە ئەی‌نێرم بۆلاتان سەرۆکی هۆزەکەیەتی ئەگەر موسلمان ببێ هەموو هۆزەکەی موسلمان ئەبن . ئنجا گەڕایەوە بۆلای (سعد) ولەدوورەوە ( سعد ) وتی: بەخوا ئەوڕووەی پێی گەڕایەوە جیاوازە لەوەی پێی ڕۆیی (سعد)لێی پرسی چیت کرد ؟ وتی : بەخوا خراپەیان تیا نابینم (سعد) ڕقی هەڵسا ورۆیی بۆیان ، کەبینی‌یان ، ( أسعد ) وتی : ئەمەیە (سعد)و سەرۆك ، کەهاتە پشت سەریانەوە ئەمان بەهێمنی‌و بەئارامەوە دانیشتبون ، وتی بە ( أسعد ) : ئەگەر خزمایەتی لەنێوانمانا نەبوایە تۆ نەت ئەتوانی ئەم پیاوە بێنی‌و لەناو ماڵی خۆمانا لەڕێکە لاماندا ( مصعب ) لەسەرخۆ وتی : تۆبۆ دانانیشی ئەختێ گوێم لێبگری ؟ ، ئەگەر قسەکانمت بەدڵ بوو وا وەری ئەگری ، وەئەگەر لێیان ناڕازی بوی بۆکوێ ئەڵێی ئەچم . ئینجا کەوتە دواندنی‌و باسی ئیسلامی بۆکردو قورئانی بۆخوێندو داوای ئیسلام بوونی لێ کرد ،(سعد) زۆر پێی جوان‌و ڕاست‌بوو خوا ڕێ نمویی ئەویشی کردو موسلمان بوو شایتومانی هێنا . ئەمجار گەڕایەوە بۆناو خـزمەکانی بەرەی ( عبدالأشهل ) وپێی وتن : ئێوە چۆن سەیری من ئەکەن ؟ ئەوانیش بە یەك دەنگ وتیـان : گەورەو گەورە زادەی ئێمەی . وتی : دەی قسەی پیاوو ژنتان لەمن حەرام بێ هەتا موسلمان ئەبن . بەم بۆنەیەوە ماڵ نەما لەناو خێڵەکەیا کەمـوسلمان نەبوبن بەژن‌و پیـاویانەوە . وەئیسلامەتی لە

شاری مەدینەدا بەجۆرێ بڵاوبووەوە ماڵ نەما کەباسی ئیسلام نەکاو قسە نەما لەباسی ئیسلام بەولاوە .

## بیرکردنەوە لەکۆچ کردن

مصعب لەپێش کاتی حەجا بەماوەیەك هاتەوە بۆمەکەو ئەم هەواڵە خۆش‌و دەنگوباسە پڕلەمژدەیە دا بەپێغەمبەر ، ئەم هەواڵە کرنگە پێغەمبەری خوای دڵشاد کردو خستیە بیرکردنەوەیەکی درێژ . ئەوەیە موسڵمانەکانی مەدینە نامەخوا پەرەیان سەندووەو لەزیادبوونان ، وەهێزێکی ڕامیاری نیە کەبتوانێ جەورو ستەمیان لێبکات . بت پەرست‌و جوولەکەکان دەستەو خواری موسڵمانەکانن . وەلەلایەکی ترەوە مەدینە خاکێکی بەپیتی هەیە بۆئیش‌و کار زۆر لەبارترە لەمەکە . ئایا مەدینە ئەو جێگایە نیە کەبیکا بەبنکە بۆبانگەکەی‌و لەوێوە دەس بکا بەهەڵکردنی ئاڵای ڕزگاری مرۆڤایەتی‌و ڕۆشن کردنەوەی سەرزەوی ؟ ئەوەبو یەکەم کۆمەڵی مەدینەیی پێیان وت : ئەگەر تۆ بتوانی ( أوس‌و خزرج ) یەك بخەیتەوە تۆئیتر لە هەموو کەسێ بەدەسەڵاتتر ئەبی . بەم پێیە محمد بەدرێژی بیری کردووەو لەئاکاما بڕیاری هاتە سەرئەوە : کەمەدینەیی‌یەکان هاتن پەیمانی تەواویان لێوەربگێ‌و بەخۆی‌و هاوەڵە موسڵمانەکانیەوە کۆچ بکەن بۆشاری مەدینە .

## پەیمانی گەورەی عقبە

لەم ساڵەدا کەڕێکەوتی (٦٢٢) ی زاینی بوو حاجی مەدینەیی زۆر بوون . لەناویانا حەفتاوپێنج موسڵمان هەبوو ، حەفتاوسێ پیاوو دووژن ، وەئەوانی تریان بت پەرست بوون . پێغەمبەر ( د . خ ) کەبەهاتنەکەیانی زانی بەپەنامەکی خۆی گەیاندێ ، وەئەمجارەی وەکو جارانی پێشووی نەبوو

کەتەنیا داوای ئیسلام بوونیان لێبکا ، بەڵکو داوای پەیمانیـان لێ ئەکا کەخۆیو موسڵمانەکانی پێ بپـــارێزێ لە هەموو دەس درێژیو ئـازارو چەوسانەوەیەك ، لەم ڕووەوە لەگەڵ سەرۆکەکانیان بەیەك گەیشتن‌وئامادەیی تەواویان تیا بەدی کردن . وەبڕیاریان دا شەو لەنیوە شەوا لای ـ عقبە ـ کۆبنەوەو کۆنفرانسێ ببەستن‌و بڕیاری تەواوی تیـا دەرکەن ، بە مەرجێ کەس ئاگای لێ نەبێو پێی نەزانێ .

دووشەو دوای جەژنی قوربان کەکاتی کۆبۆنەوە کەبوو موسڵمانە مەدینەیی‌یەکان کەسێ‌یەکی‌شەو تێپەڕی بەنهێنی یەك‌یەك‌و دوو دوو ڕۆیشتن بۆلای ـ عقبە ـ ، لەویدا یەکیـــان‌گرت ، حەفتاو سێ پیاوو دووژن : شەست‌و دووکەسیان ( خزرج ) ی و یانزەیان ( أوس ) ی بون . دوو دووژنەکەیش ( نسیبە ) کچی ( کعب ) لە ( بنی‌نجار ) و ( أسمـاء ) کچی ( عمر ) لە ( بنی سلمە ) . . لەکاتی دیاری‌کراوا پێغەمبەر گەیشتە ناویان و عباسی مامی لەگەڵابوو ، ئەگەرچی هێشتا موسڵمان نەبووبوو بەڵام دەمارگیری خزمایەتی پاڵی پێوەنابۆ حـازربوونی کۆنگرەکە ، ئەوا کۆبونەوەکە شێوەیەکی وای‌بێ جەنگێ بەرپابکا ئاگرەکەی بەنی‌هاشمیەکان بســوتێنێ ، وەئەڵێن : ـ أبوبکروعلی ـ لەڕێگـا کرد بە بەچـاودێر نەوەك بت‌پەستەکانی مەکە پێیان بزانن .

یەکەم قسەکەر ( عبـاس ) بوو وتی : ئەی کۆمەڵی ( خزرج ) محمد لەناو ئێمە داخۆتان ئەزانن چۆنە ، وەئێمە ئەوانەیشمان کە باوەڕمان پێ‌نەهێناوە پاراستوومانەو ئاگاداریمان کردوە ، وەلەناو مانا بەدەسەڵات‌و بەحورمەت ، بەڵام ئەیەوی بێتە ناو ئێوەو بەئێمە ڕازی نابێ ، جائێوەیش ئەگەر ئەزانن ئەوەی داواتان ای‌ئەکا بەجێ‌ی یەنن‌و ئەیپارێزن لەدوژمنەکانی

ئەوا باشەو ئەوەئێوەو محمد، وەئەگەر کەمتەرخەمی لەگەڵانەکەن و ڕێگەی ناحەز ئەدەن بۆسەری هەرلەئێستەوە لێی گەڕێن یـا لەناو کەس و کارەکانی خۆیابێ . گـەورەی مەدینەیی یـەکان ( براء ) کـوڕی ( معرور ) وتی : بەخوا ئەگەر لەدڵمانا شتێ بوایە پێچگەلەوەی لەسەر زمـانمانە ئەمانوت : بەڵام ئەوەی ئەمانەوێ وەفاو ڕاستیو گیان بەخت کردنە لەڕێی پێغەمبەرا بەتەواوی . ئەی پێغەمبەری خوافەرمو قسەت بکەو مەرجەکانت بۆخواو بۆخۆت چۆنت پێخۆشە دایان بنێ .

پێغەمبەری خوایش ( د . خ ) هەڵساو هەندێ قورئانی خوێندەوەهات بەباسی ئیسلام و موسلمانانەو فەرمووی : فەرمانی خوا وایە بەتەنیا هەر خوا بپەرسن و هاوەڵی بۆدانەنێن ، وەکوێ ڕایەڵی من بکەن لە خۆشی و ناخۆشیدا ، وەهەڵسن بۆ خواو لۆمەی لومەکەران ساردتان نەکاتەوە . وەیارمەتی من بدەن و بمپارێزن لەوانەی خۆتان و خاوخێزانتانی لێئەپارێزن ( عبدالله کوڕی رواحە ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوائەگەر ئەوانەمان کرد ئێمەچیمـان دەس ئەکەوێ . : فەرمووی : بەهەشتـان دەس ئەکەوێ وتی : بەخواشتێکی چاکەو موعامەلەیەکی پڕسوودە . نەهەڵێ ئەوەشێنینەوەو نەئەیشیەڵێن هەڵوەشێتەوە .

ئەمجار ( براء ) دەستی درێژکرد بۆ پەیمان بەستن لەگەڵ پێغەمبەرا و دەستیان خستە ناودەستی یەك لەسەر ئەمانەو وتی ئەوا پەیمانمان بەست لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ، قەسەم بەوەی کەتۆی بەڕاستی ناردووە ئەتپارێزێن لەوانەی خۆمان و ماڵو خێزانمانی لێئەپارێزین ، بەخوا ئێمە کوڕی جەنگین وەرۆڵەی چەکین ، ئەمانەمان لە باوباپیرمانە وە بۆ بەجێماوەتەوە

(أبوهیثم) ی کوڕی (تیهان) نەیهێشت ( براء ) بەتەواوی لەدواندنەکەی بێتەوە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەگەڵ جوولەکەکانا پەیمانمـان

لەنێوانایە ئێمە ئەی پچڕین ، ئایا ئەگەر ئێمە ئەو پەیمانەمان پچڕی لەوانەیە تۆئەگەر خوا سەری خستی بگەڕێتەوە بۆناو خزمەکانتو ئێمە بەجێ بێلی ؟!
بەزەردەخەنەیەکەوە فەرموی : نەء بەڵکو خوێن و مردن ، واتە خوێنی من و خوێنی ئێوەیەك ئەبێ پاراستنی من و پاراستنی ئێوەیەك ئەبێو قەت من خۆم لەئێوە جیاناکەمەوە و دەس بەردارتان نابم .
ئەمجار ویستیان یەکسەر پەلاماری پەیمان بەستن بدەن، بەڵام (عباس)ی کوڕی (عبادە)وتی: ئەی کۆمەڵی (خزرج) ئایا ئەزانن لەسەرچی پەیمان ئەبەستن لەگەل ئەم پیاوەدا ؟ ئێوەپەیمانی لەگەڵائەبەستن لەسەر جەنگی ڕەش و سوور ( واتە جەنگی عەرەب و عەجەم ) ، جا ئەگەر ئەزانن کەماڵ و سامانتان بەتاڵان بڕواو پیاوو سەرۆکەکانتان کوژرا ئێوە ئیتردەس بەرداری ئەبن ، لەئێستەوە لێی گەڕێن ، چونکو ئەگەر شتیواتان کرد بەخوا ئەبێتە شەرمەزاری ئەم جیهانو ئەوجیهانتان ، وەئەگەر ئەزانن ئێوەگوێ ڕایەڵێ ئەکەنو ئەچن بەدەمیەوە لەگەل ڕۆینی ماڵو کوژرانی پیاوە گەورەکانتانا دەس بەرداری نابن و بەهەردوودەس ئەی گرن بەخوا ئەمە هۆی خێروبێری هەردوو جیهانتانە . وەهەموو دەستیان بۆ درێژکردو یەکەیەکە پەیمانیان لەگەڵابەست پاشان پێغەمبەر فەرموی : دوازە کەس لەناوخۆتانا هەڵبژێرن بینە نەقیب ( واتە لێپرسراوە ) ی ئەوانی ترتان و هەرنەقیبە لێپرسراوی کۆمەڵی خۆی ئەبێ . دوانزە نەقیبەکەیان هەڵبژارد نۆیان لە ( خزرج ) و سیانیان لە ( أوس ) ی یەکان ، هەریەکە نوێنەر و لێپرسراوی بەرەبابێك بوون .

ئەم هەموو کارو پەیمانانە لەتاریکایی شەوا تەواوکرا لەشیوی - عقبە - دا بەبێ دەنگو بەتەمای ئەوە بێجگە لەخوا کەس نەیزانیبێ ،

بەڵام هێشتا بەتەواوی لێ نەبووبوونەوە گـــوێیان لەدەنگـێ بوو ئەڵێ : قورەیشەکان محمدو مەدینەیی‌یە شێت بوەکان کۆبونەوە لەسەر بەکژاچونتان، ئەم دەنگەش دەنگی پیاوێکی قورەیشی بوو ، ڕەنگە بۆئیشی خۆی هاتبێ‌و ڕێی لەمە کەوتبێ وشتێکی لێ‌تێ‌گەیی‌بێ‌و ویستبێتی لێیان تێك بدا ، وە دووریش نیـە هەر بەجاسوسی هـاتبێ لەلایەن قورەیشەکانەوە ، بەڵام مەدینەیەکان ئامادەن‌و لەجەنگ ناترسن بۆیە نەشڵەژان‌و گوێیـان‌نەدایە ، هەتا ( عباس ) یان ( سعد )ی کوڕی ( عبادە ) وتی : بەوکەسە قەسەم تۆی بەڕاســـتی ناردووە ئەگەر حەزئەکەیت بەیانی بەشمشێرەکانمانەوە هەڵمەتێ ئەبەینە سـەرخەڵکی مینا » . پێغەمبەر فەرمووی : نەء هێشتـا ئیزنی جەنگمان‌نەدراوە ، بڕۆنەوە بۆشوێن‌و جێگای خۆتان بەڵام باپێتان نەزانن » هەمویان چونەوە جێگای خۆیان و هـاوڕێ بت پەرستەکانیـان پێیان نەزانین بەهیچ جۆرێ .

هەرلەگەڵ ڕۆژبوووە قورەیشەکان وەکوشەیتـان قوڕانبێتی بەگوێیانا بەم پەیمانەیان زانی و ناڕەحەت بوون‌و هاتنە ســـەر مەدینەیی‌یەکان و پێیان وتن : زانیومـانە کە ئێوە هاتون بۆلای محمد لەژێر دەســـمانـا دەری کەن و پەیمانتان لەگەلا بەستووە بۆ جەنگ کردن لـەگەڵ ئێمەدا ، بەخوا هیچ هۆزو بەرەیەکی عەرەب نیە پێمـان ناخۆشبێ جەنگی لەگەلا دابگیرسێنن بەئەندازەی ئێوە ، بت‌پەرستەکانی مەدینە کە ئاگایان لەهیچ نیە دەستیان‌کردە ســوێند خواردن‌و پاکانەکردن بۆیـان کە ئاگامان‌نیە و هیچی وانەبووەو نابێ ـ عبداللە کوڕی(أبی)ی کوڕی سلول (١)ـ کەسەرۆکی ( خزرج ) ی یەکان بوو ئەیوت : قەت خزمەکانم بەبێ ئاگاداری من شتی

---

(١) عبداللە کوڕی أبی بووبە سەرۆکی مُنافقەکان لەدوایدا .

واناکەن . موسڵمانەکانیش بێدەنگ دانیشتبوونو قورەیشەکان باوەڕیان‌کرد و گەڕانەوە و نەیـانئەزانی چی‌بکەن و بەدڵ هەر لە مەترسیدا بوون و ژێربەژێر بۆ ڕاستی هەواڵەکە ئەگەڕان . مەدینەیەکان باریان‌کردو بەرەو مەدینە گەڕانەوە ، لەدواییدا کە قورەیشەکان ڕاستی کارو پەیمانەکەیان بۆ دەرکەوت ڕایانکرد بەشوێنیانا بەڵام پێیان نەگەیشتن تەنیابە ( سعد ) ی کوڕی ( عبادە ) نەبێ ، گرتیان و باڵیان بەســـت و هێنایانەوە بۆ مەکەو کەوتنە ئازاردانی،یەکێ تووکی ڕئەاکێشاو یەکێ شەقازلەی لێ ئەدا و یەکێ سیخورمەی تێ ئەکوتا ، هەتا ( جبیر ) ی کوڕی ( مطعم ) و ( حارثە )ی کوڕی (أميّـة) پێیان زانیو پەنایاندا ، چونکو هەموجارێ ( سعد ) پەنـای کاروانی ئەمـانی ئەدا کەلە کاروانی شاما بە مەدینەدا تێ‌ئەپەڕی .

## دەس پێ‌کردنی کۆچ بۆ مەدینە :

قورەیشەکان زیاتر مەترسی‌یان لێ‌نیشت و لەپاشەڕۆژێکی تـاریك ئەترسان بۆیەئەوەندەی توانایان‌بێ بێشەرمی‌یان ئەکردو ئازاری پێغەمبەرو موسڵمانەکانیان ئەدا ، پێغەمبەری مەزنیش ( د . خ ) بەدەوری خۆی کەوتە بیرکردنەوە ، بینی سەرەتای خۆشی‌و شادی ڕووی تێ‌کردەوە ، بەڵێنە بەرزو ڕاستەکانی خوا یەك لە دوای‌یەك ڕووئەدەن ، ئەوا شوێنێکی بەپیت‌و بەفەڕی وەکـو مەدینە دەس‌کەوت کە لە مێژەوە بۆی ئەگەڕا ، وەهۆزو بەرەی ( أوس و خزرج )ی هاتوونەتە نـــاو پەیمانیەوە ، ئیتر مەترسی‌نیە کە بەرهەڵستێکی ئەوتۆی بێ نەیەڵێ‌و بانگە شیرینەکەی بڵاوبکاتەوە کە خوا داوای بڵاوکردنەوەی لێ‌ئەکا ؛ خۆموسڵمانی مەدینەیی

دەستەبەربوون بۆ پاراستنی خۆی و یارەکانی ، بۆ پاراستنی خۆی و بانگەکەی لە هەر مەترسی‌یەك .

موسلمانەکانی کۆکردەوە و ئامۆژگاری‌یەکی بەسۆزی پڕبەدل کردن ، ئەمجار پەیمانی برایەتی لەناوا بەستن و برایی خستە ناویانەوە : برایی خستە نیوان ( أبوبکر و عمر ) وەناوەندی ( حَمزَ ) ە ی مامی‌و ( زیدکوری حارثە ) وەناوەندی ( عثمان و عبدالحق کوڕی عوف ) وە ناوەندی ( زبیرو أبن مسعود ) وەناوەندی ( عبادەی کوڕی حرثو بیلال ) وەناوەندی ( مصعب کوری عمیر و سعد کوڕی أبی وقاص ) وەناوەندی ( أبوعبادە وسالم مەولای ( أبوحذیفە ) وەناوەندی ( سعید کوڕی زید و طلحەی کوڕی عبدالله) وەخۆیشی لەگەڵ ( علی کوڕی أبی‌طالبدا ) ( خوا لەهەموویان ڕازی‌بێ ) . بەم پێیە پەیمانی پێ‌تازەکردنەوەو زیاتر لەیەکی نزیك کردنەوەو کردنی بە براو پشتیوانی یەکتری . ئەمجار فەرموی پێیان : وردە وردە یەك یەك و دوو دوو مەیەڵن قورەیش پێتان بزانن کۆچ‌بکەن بۆ مەدینە ؛ بۆلای ئەو برا موسلمانانە تان کە لەوێ چاوە ڕێتان‌ئەکەن ؛ ئەوانیش لەسەر فەرموودەکەی ئەو دەسیان کردە کۆچ‌کردن بۆ مەدینە یەك‌یەك و کەم‌کەم و بەشەو و بە پەنهانی ؛ هەتا قورەیش پێیان نەزانن‌و لێیان قەدەغەنەکەن ؛ بەڵام قورەیش کەهەمیشە چاودێری بەهێزتر ئەکرد ؛ پێیان زانین‌و کەوتنە ئازاردان‌و گێڕانەوەیان و قەدەغە کردنیان . هەتاکو یەکەم کەسیان ( أبوسلمە ) ی مخزومی بوو مێردی ( أم سلمە ) ( کەلەپاشان بوو بەخێزانی پێغەمبەر ) کە ویستی کۆچ‌بکا خزمەکانی (أم سلمە) یان لێ‌سەندەوەو نەیانهێشت بیباڵەگەڵ خۆی ، وەخزمەکانی ( أبوسلمە ) یش کوڕەکەیان لەدایکی سەندەوە و بردیانەلای

خۆیان ، وەبۆماوەی ساڵێ ( أم سلمه ) بەیانی تا ئێوارێ ئەهاتە دەرەوەو ئەگریا ، هەتا ڕۆژی خزمێکی هات بەسەریاناو وتی : ئەوە چ حاڵێکە ئێوە ژن لەمێردو دایك لەڕۆڵە ئەکەن ، لێی گەڕێن با بڕوات ، ئەوانیش ڕێگەیانداو کوڕەکەی هەڵگرتو چوو بۆمەدینە .

بەم پێیە موسڵمانەکان ووردە ووردە کۆچیان کرد بۆمەدینە ، وەبێجگە لەپێغەمبەرو علیو أبوبکرو کەمێکـــیتر کەسی موسڵمان نەما لەمەکەدا ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) ویستی کۆچ بکا ، شمشێری کردە شانیو بە شێرو تیرو نێزە خۆی پڕچەك کـردو هاتە لای کەعبە لەکاتێـــکا نادی قورەیشییەکان پڕبو لەپیاو ، حەوت جار بەدەوری کەعبەدا گەڕاو هـاتە مەقامی إبراهیم دووڕکات نوێژی کرد ، ئەمجار هاتە پشت سەری خەڵکە کەوە وەستاو وتی : چەند دەمو چاوێکی ناشیرنن ، خوا ئەودەموو لوتانە بدا لەخۆڵەوە ، ئەوساکە بزانن وامن کۆچ ئەکەم بۆمەدینە ، جاهەرکەسێ ئەیەوێ دایکی کۆتەلی بۆبکاو ژنی بێوەژنو منالی هەتیوبێ بێتە ئەودیوی ئەوشیوە پێم بکات .. إمامی عەلی ئەڵێ : « هیـچ کەس نەچو بەشوێنیاو کەسیش وەڵامی نەدایەوە ، هەرکەسێ کۆچی کرد بەدزیەوە ڕۆیی تەنیا عمرنەبێ » صهیبی ڕۆمی ویستی کۆچ بکا ، قورەیشـییەکان ڕێیان پێ گرت ووتیان : تۆبەهەژاری هاتویتە مەکەو لێرە ئەو ماڵتـە دەست خۆت خستووەو دەوڵەمەند بوویت ، ئێستە ئەتەوێ خۆتو ماڵەکەت لەمەکە دەر کەیت ؟ بەخوا نایەڵین . وتی : ئەگەر ماڵەکەمتان بۆبەجێ بێڵم ئەهێڵن بەخۆمو باوەڕەکەمەوە بڕۆم بۆمەدینە ؟ وتیان : بەڵێ وتی : دەئەوەماڵەکەم بۆئێوە . کەئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر فەرمـووی : ( قازانجی کرد صهیب ) أبوبکریش ویستی کۆچ بکاو لەم ڕووەوە وتی بـەپێغەمبەری خوا

( د . خ ) ئەویش فەرمووی « پەلە مەکە بەلکو خوا هاوەلێکت بۆبنێرێ » وەلەمە زیاتری نەوت ، بەلام أبوبکر تێگەیی کەمەبەسی خۆیەتی ، زۆر دلخۆش بوو ، دووحوشتری خۆشرەوی کڕیو دایبەستنو ئامادەی کردن بۆ ماوەی چوارمانگ .

ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە پاش گەڕانەوەی موسلمانە مەدینەیی یەکان بۆمەدینە ، بەتەواوی ئیسلامەتی لەمەدینەدا بلاو بووەوەو ئاشکرا بوو بەرادەیەك بەخەو نەبینراوە ، هێزو دەسەلاتی تەواو درا بە ئیسلام بت پەرستو جولەکە هیچ دەسەلاتیان نەما .

## یانەی ئەنجومەن ( دارالندوە ) :

قورەیشەکان هەزار حسابیان بۆ کۆچ کردنی پێغەمبەر دانا ، ئەوەموسلمانانی مەدینە دەسەلاتێکی ئەوتۆیان پەیاکردوە بێجگە لەوان کەس ناتوانێ سەرهەلبڕێ ، ئەوەیە ئەو هەموو کۆچەرییانەی مەکەیش چون بۆلایانو بونەیەك هێز لەدژی کوفروبت پەرستی ، ئەگەر ئێستو محمدیش بچێتە پالیان بەو دامەزراویو ژیری و وردبینی و ڕاپەسەندە کە هەیەتی ئیتر جێگای مەترسییە کەبدەن بەسەرمەکەدا یان ڕێگەی کاروانی شامیان لێبەستن و برسییان بکەن وەك چۆن ئەمان ( بنیهاشم ) یان لەشیوی ( أبیطالب ) دا برسی کرد . ئەگەر ناشیەلن بڕوا دیسان خۆ هەموویان پێشمەرگەی محمدن کێ ئەلێ نایەنە سەریان و جەنگێکی لەسەر بەرپا بکەن ، کەبلێسەی ئاگرەکەی قورەیشو مەکە بداتەبەر ، ئەیچی بکەن و چارەیان چیە ؟ بەم بۆنەیەوە کۆبونەوەیەکی گشتییان کرد لە یانەی ئەنجومەن دا ، وەکەوتنە لێکۆلینەوەو ڕاوێژ لەم گیروگرفتە و گرێ کوێرەیە

( أبوبحتری کوڕی هشام ) وتی : بیبەستن و کۆت و زنجیری بکەن و بیخەنەوە بەندیخانەوەهەتا ئەمرێ و ڕزگارتان ئەبێ لەدەستی «وتیان : ئەم ڕایە پەسەندنیە ، چونکو شوێنکەوتووەکانی پێی بزانن دێن بەشوێنیاو جەنگ و هەراو دوژمنایەتی بەرپائەکەن و ئێمەی تیائەچین ، ( أبو أسود ربیعە کوڕی عمری عامری ) وتی : لەناوخۆمانا دەری ئەکەین و لە وڵاتی خۆمان دووری ئەخەینەوە ، ئەوسا کەیفی خۆیەتی چی ئەکا بابیکا . ووتیان : ئەم ڕایەش هیچ نیە ، چونکو خۆی ئەگەیەنێتەوە مەدینەو مەترسییەکەی ئێمە هەربەرپا ئەبێ . ئەمجار شەیتانی گەورەیان ( بوجەهل ) وتی : من ڕایەکم بەبیردا دێ وانازانم تائێستە ئێوەڕێتان لێی کەوتبێ : لەهەر هۆزەکوڕێکی لاوچاك هەڵسێ و شمشێرێ بگرێ بەدەستەوەو بچنەسەری و بەهەموویان بەجارێ یەکی شمشێرێکی لێبدەن و بیکوژن ، ئەوسا خوێنەکەی بەناو هەمو هۆزەکانی قورەیشا بلاو ئەبێتەوە و ( بنی‌هاشم )ی یەکانی خزمی خۆچاری ئەو هەمو هۆزانەناکەن و بەناچاری ڕازی ئەبن بەخوێنەکەی ، وەکۆچەرییەکانیش کەبەمەیازانی بەناچارێ دێنەوە ئەچنەوە سەر ئایینی باوباپیریان ، وە مەدینەییەکانیش کە محمدنەما ئیتر بۆکێی ئەکەن و شوێن کێ ئەکەون ؟ ئەوانیش وازیەنن و هەمولایەك ڕزگارمان ئەبێ . دانیشتوەکان هەموریان ئەم ڕایەیان بەلاوەجوان بوو پەسەندیان کرد و پێی ڕازی بوون و لەسەر ئەم ڕایە بڵاوەیان کرد بە خەیاڵی خۆیان کرێ کوێرەکەیان ڕەهاکرد .

بەڵێ ئەمەڕای کوفرە بەرابەر بە ئیسلام لەکۆنەوە هەتا ئێستە و لەئێستەوە دوایشەوە هەروائەبێ ، وا ئەزانن ئیسلامیش وەکو بیرو باوەڕەکانی تر بت پەرست و شوێنکەوتی مرۆڤە و بەنەمانی مرۆڤەکە

( یا بڵێ بانگکەرەکە ) ئیتر بیروباوەڕەکە لەناو ئەچێو نامێنێ ، بۆیە هەرلەکاتی پێغەمبەرەوە دەسیان پێ کردوە لەپێشەوە بەناشیرین کردنو ناو و ناتۆرەی درۆو نەشایاو لێنانی پێغەمبەر : درۆزنە ، شاعیرە شێتە ، کاهینە ، .. پاشان بەهیوابوون بەکوشتنی خۆی ئـایینەکەی بکوژێننەوە ، وەلە پـاش پێغەمبەر هەتا ئێستە ـ ئەڵبەت لەمەودوایش هەروا ئەبێ ـ هەرپیاوباشێ یاکۆمەڵێك هەڵسابنو سـەرلەنوێ بانگی خەڵکیان کردبێتەوە بۆ سـەر ناوەڕاستی شاقامی ڕاستو ڕەوانو پانوپۆڕی ئیسلام دوژمنەکانی ئیسلام هەروەکو نەفامەکانی قورەیش ـ هەڵساون بەناشیرینکردنی ئەو کۆمەڵە بە هەزاران درۆو دەلەسەیان بۆ دروست کردون و هەر ڕۆژە بەشێوەیەکی ناشیرینی تازە ناویان بردون و بردونیانە دڵو مێشکی موسڵمانە سادەو دڵ نەرمو ساویلکەکانەوە ، . . . ئەمانە پیاوی ئیمپریالیزمن یا پیـاوی خۆر هەڵاتین و ئیشتیراکین ، ئەمانە بەکرێ .گیراون ، ئەمانە دژی پێشینەکانن ، ئەمانە وەهابینو دان بەشەریعەتدا نانێن ، ئەمانە داوای ئیجتیهادی تـازە ئەکەنو باوەڕیان بەکتێبە ( فقهی ) یەکان نیە ، وە . . وە لەلای چێف خوێندەوار : ئاین کۆسپەو نیشانەی دواکەوتنە ، ئەوانەی کۆنەپەرستن و . . . وە کە زانییان ئەمدرۆو دەلەسانە جێگایان نامێنێو خۆیان لائەچن ، کە ڕووی ڕاستو ڕۆشنی ئیسلام پاکو خاوێنی دەرکەوت ، کە ڕۆژ هەڵهات تاریکایی خۆی ئەپێچێتەوە ، بەناچاری هەوڵ ئەدەن بۆ کوشتن و لەناوبردنی ئەو بانگکەرانە بەڵام خەیاڵیان خاوە خۆ ئیسلام بیرو بـاوەڕو کردەی خوایە و ئەیەوێ بڵاوبێتەوە و سەرزەوی پێ ڕۆشن بێتەوە ، ئیتر هەزار فاکی ئەوان بەفیکێ .

* * *

## کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆمەدینە :

خوای گەورە هەواڵی کۆبونەوەی قورەیشی ڕاگەیان بە محمد و تێ گەیی کە مەبەستیان کوشتنیەتی بەشێوەی کۆمەڵی ، وە موسلمانەکانیش هەندێکی کەم نەبێ ـ کە ئەوانیش بەهۆی تیرەیـانەوە ئەپـارێزرین ـ هەمویان چون بۆ مەدینەو گەیشتوونە وولاتی ئیسـلامی و چونە نـاوبراو پشتیوانو هاوپەیمانی ئاینییان و کەوتونەتە ڕەحەتی‌یەوە بەخۆشی ئەژین و بەسەربەستی خواپەرستی ئەکەن ئیترچی‌ماوە ؟ ئەبجار کاتی ئەوەیە کە محمد کۆچ بکاو بکاتە نیشتمانە ئیسلامەکەی و لەوێ داموو دەزگایەکی نوێ دابمەزرێنێ و لاپەڕەیەکی تازە لە ژیانی ئیسلامی هەڵبداتەوە ، لەم کاتەدا خوای گەورە بە ( جبرائیل ) دا ئیگای بۆنـارد کە لەگەڵ ـ أبوبکر الصدیق ـ دا کۆچ بکات بۆلای یارەکانی بۆمەدینە . إبن إسحاق) ئەگێڕێتەوە لە ( عروە کوری زبێر ) ئەویش لە خاتو ( عـائـشە ) وە ( خـوا لێـیـان خۆشبێ ) ئەڵـێ : « پێغەمبەری‌خوا ( د . خ ) ڕۆژنەبو جارێك نەیەتەماڵی ( أبوبکر ) ئێوارە یا بەیانی ، هەتا ئەو ڕۆژەی خوای گەورە ئیزنی‌دا بۆ کۆچ کردن لەکاتی گەرمای نیوەڕۆداهات کە لەوکاتەدا نەئەهات ، ئەڵێ : کە ( أبوبکر ) دی وتی : « بەخوا هاتنی پێغەمبەر لەم‌کاتەدا هۆیەکی تایبەتی هەیە ئاخۆ چی‌تازە ڕووی دابێ کە هاتەبەرەوە ـ أبوبکر ـ چووە دواوە و تەختەکەی خۆی بۆ بەجێ‌هێلاو پێغەمبەریش دانیشت کەسیش لەوێدانەبوو تەنیـا من و ( أسماء ) ی خوشکم‌نەبێ ، فەرمووی : أبوبکر ، کێت لایەبابڕۆنە دەرەوە ، أبوبکر وتی : دایك و باکم قیدات‌بێ تەنیادووکچی خۆمە(عائیشەو أسماء) وە وتی : چی‌ڕوی‌داوە؟

فەرمووی : خوائیزنی داوم بەکۆچ کـردن ن وتی : هاوڕێیم ئەکـەی ؟
فەرمووی : بەڵێ . ( عـائشە ئەڵێ : بەخوا نەمزانیوە کەس لـە خۆشیدا ئەگری تا ئەو ڕۆژە أبوبکرمدی لە خۆشیدا دەستی کرد بەگریان ) ئنجا وتی : ئەیْ پێغەمبەری خوا دوو وڵاخم ئامادەکردوە بۆئەم کۆچ کردنەمان عبداللەی کوڕی ( أریقط ) یان بەکریگرت ـ کە بتپەرستیش بوو ، تا ڕێگایان پێشاندا ، وە هەردوو وڵاخەکەیان دایە کەبەخێویێویان بکاتا ئەوکاتەی ڕێ ئەکەون . .

کاتێ ئەم دوو پیاوە ناوازەیە ویستیان کوچ بکەن و مەکە بەجێبێڵن کومانیـان نەبوو لەوەدا کە قوڕیشی‌یەکان شوێنییـان ئەکەون و هەوڵی کوشتنیان ئەدەن ، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا بەڕێگایەکی نهێنی‌دا بڕۆن ، وە لە کاتێکدا کە کاتی ڕۆیشتن نەبێ . وەئەو کوڕانەی کە قورەیش هەڵیان بژاردوە بۆ کوشتنی هەمیشە ئابڵوقەی خانوەکەی ئەدەن نەوەکو دەربچێ و ڕابکا ، هەتا ئەو شەوەی بڕیازی قوڕەیشەکان وابوو محمدی تیابکوژن ، لەو شەوەدا خوای گەورە فەرمـانی‌دایە بەڕۆیشتنیـان و ئەم ئایەتەی بۆ ناردەخوارەوە ( وَقُل رَبِّ[1] أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَاناً نَّصِيراً » آیە: ٨٠

پێغەمبەر ( د . خ ) بەنهێنی بە (علی کوڕی ابوطالب) ی ووت : لەجێگاکەی بخەوێ بۆئەوەی کافرەکان وابزانن ئەوە محمدە وەپێی فەرموو : چی ئەمانەتی خەڵکی لایە دوایی ئەو بیداتەوە ئەوسا بێت بەشوێنیـانـا . ( بێجگەلـە علی و خێزانی أبوبکـر کەس بەم کۆچەی نەزانی ) ، لاوە قورەیشەکان بەخۆیانو شیری ڕووتی دەسیانەوە هاتوون و دەوری‌ماڵەکەی پێغەمبەریان داوە بەتەمای ئەوەن هەرکە هاتەدەردوە بەیەك دەس هەموویان



(١) وقُل رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ : ...

لێی بدەن و بیکوژن ، وەلەبەر ئەوەی پێچەوانەی باوی یـاسـای تیرە پەرستی بوو نەچونە ژورەوە بۆسەری ، کەشەو دووبەشی ڕۆیی و بەشێکی مابوو پێغەمبەر هاتە دەرەوەو دەســـتی کرد بەخوێندنی سورەتی ( یسٓ ) بەسەریانا هەتا گەیشتە ( وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ »[1] ئیتر بەفەرمـانی خوا کەسیان پێیـان نەزانی ، چوو بۆ مالی أبوبکری هـاوڕێی و لەوێوە بەجووتە هاتنەدەرەوە ڕووبە ئەشکەوتی ( ثَوْر ( ئەڵێن لەڕێگادا أبوبکر شێوەیەکی زۆر سەیری هەبوو جارێ لەپێشەوە ئەڕۆیشت ، دواى تۆزێ ئەکەتە دوایەوە ، ئەمجار ڕاستی ئەگرت ، کورج ئەکەوتە لایچەپیەوە . کە پێغەمبەر لێی ئەپرسی : بۆچی وائەکەیت . ئەڵێ : هەندێجار ئەترسم لەپێشەوە بۆمان دانیشتبن ، دوای بیرئەکەمەوە ئەترسم بێن بەدوامانا ، ئەمجار ئەڵێم ڕاست یانچەپیان لێگرتبێن ، وەلەهەمووی‌ـا ئەمەوێ ئەگەر مەترسی یەك هەبێ باڕوو بکاتە من و تۆی پێوە نەبێت ، بەم ڕێیە بەڕێ ئەڕۆن هەتا ئەگەنە دەرگـای ئەشکەوتەکە ، پێغەمبەری خوا ئەیەوی لە پێشەوە بڕواتە ژوردوە ، بەلام ( أبوبکر ) ســـوێند ئەخوا و نایەڵێ و ئەفەرموێ : ئەبێ من لەپێشەوە بڕۆم هەتا چ مەترسی‌یەکی تیابێ تـاقی بکەمەوە . أبوبکر لە پێشەوە ئەڕواتە ژوورەوە هەرچی کونو کەلەبەری تیابێ بەجلەکانی ئەیان گرێ . ئەمجار پێغەمبەریش ئەچێتە ژوورەوە .

لاوە قورەیشی یەکان هەتا فەردای بەیانی ئەمێننەوە ، بۆئەوەی کەمحمد هاتە دەرەوە بەئاشکرا بیکوژن ، هەمووجارێ لەدرزی دەرگاکەوە سەیریان ئەکردو بێئاگا بوون لەوەی کەعلی‌یەو لەجێگاکەیا نووستووە ، کەبەیانی علی هاتەدەرەوەو زۆر سەریان‌سڕماو پرسی‌یان لەعلی کواممحمد؟ وتی : نازانم



(١) آیە : ٩ ،

ئەڵێن هەندێ ئازارو چەرمەسەرێیان داو دوایی چون بۆماڵی أبو بکـر ، ئەبینن ئەویش دیارنیە ئەپرسن لە ( اسماء ) ە ی کچـی کـوا باوکت‌و محمد ؟ ئەویش ئەڵێ : نازانم ( أبوجهل ) ی ناپاك شەقازلەیەکی لێ ئەدا وکوارەکەی لەگوێ ئەپەڕێ .

محمدو أبوبکر بۆماوەی سێ ڕۆژ لەوئەشکەوتەدا خۆیان لەمەکۆئەدەن وەکەس بەم مەکۆیەیانە نازانێ خێزانەکەی أبوبکرنەبێ . عبداللهی کوڕی وعائشەو أسمای کچی‌و عامری کوڕی فهیرەی کۆنە بەندەی . عائشەو أسماء لەناکاو لەتاریکایی شەوا خۆراکیان بۆیەنن ، عبداللهی کوڕی بەڕۆژ لەناو قورەیشەکانا گوێ ئەقێ ئەکاو ئێوارە دێتە لایان‌و هاڵ‌و هەواڵ چـی بێ بۆیان دێنێ . عامریش شوانی ڕانەکەی أبوبکـرە ئێواران ڕانەکەی ئەدا لەئەشکەوتەکە بۆشیر دۆشین‌و حەیوان سەربڕینیـان ، وەدوای عبدالله أبوبکریش ڕانەکە ئەدا لەڕێگاکەی هەتا شوێن پێ‌کەی بکـوژێنێتەوە ، بەم پێیە سێ ڕۆژ لەناو ئەوئەشکەوتە ڕەق‌و تەقە پڕلەمەترسیەدا خۆیان شاردەوە .

سیرەت نووسانی پێغـــەمبەر ( دروودی لە سەربێ ) ئەڵێـن : لەو ئەشکەوتەدا مارێك دای بەابوبکرەوە .

قورەیشی‌یەکان کەزانیان محمدو أبوبکـر دەرچون بەرەو مەدینەو خۆ ئەگەیەننە هاوباوەڕەکانیان ، کەوتنە گەڕان و پەلەقاژە کـردن‌و ڕێ لێ گرتنیان‌و بەهەموو لایەکا خەڵکیان ناردو مەترسیان لێ‌نیشت ئەگەر نەیان دۆزنەوە، ئیتر وان لەوپەڕی لێ‌قەومانا ، کۆمەڵێ لەوشمشێر بەدەستانە لە نزیکی ئەشکەوتەکەوە گەیشتن بەشوانێ‌و لێیان پرسی ئەویش وتی : من کەسم نەدیوە بچێتە ئەوئەشکەوتەوە ، بەڵام بچن بگەڕێن ، بەڵکولەوێ بن

پێغەمبەر ( د خ ) هەمیشە دەمی بەزیکرو ناوی خواوە بوو ، هەتا بزانێ ئەوانەی بۆیان ئەگەڕێن ڕێیـان ئەکەوێتە ئەشکەوتەکەو ئەیاندۆزنەوە ؟
کە أبوبکر گوێی لەوتەی شوانەکەبوو لەتاو پێغەمبەر ناڕەقێکی کردو زۆر ترسا هەتا هەنـاسەی لەخۆی بڕیبوو قوڕەیشـی‌یەکان هاتن بۆ ســـەیری ئەشکەوتەکەو گەڕانەوە ، کە لێیان پرسین : بۆچی ئەچونە نـاوی و باش نەگەڕان؟وتیان:لەوەناچێ زەلامی تێچوبێ دیارەلەکۆنەوە شەقڵی ئەشکاوە، ئەڵێن : جاڵجاڵۆکە دەرگای ئەشکەوتەکەی تەنی‌بوو دووکۆتر لەسەر کونی ئەشکەوتەکە هێلانەو هێلکەیان کردبوو ، ئیتر چۆن بەم زوییە خەڵکی تێچووە ؟ . لەکاتی هاتنی قوڕەیشەکان بۆسەر دەمی ئەشکەوتەکە ـأبوبکرـ زۆر مەترسی لێ‌ئەنیشێ و خۆی ئەنوسێنێ بەپێغەمبەرەوە و ئەڵێ : ئەگەر بێتو ســـەیری قاچی خۆیان بکەن ئێمەئەبینن . پێغەمبەریش ( د خ ) بەهێواشی پێی ئەفەرموێ : (مەترسە خوامان لەگەڵە ، چونەڕات دەربارەی دووکەس کەخوا سێ‌هەمیان‌بێ ؟ ) .

بەڵێ ، خوای پەروەردگار چاوی کافرەکانی کوێرکرد لە عاستیان ، هەتا ناحەزترین کەسیان ( أمیە کوڕی خلف ) زۆر بەدووری دانەنا کە لەویدابن ، جابە نـاهومێدی گەڕانەوە بۆمەککە . وەبۆئەوەی ئەم هەلە لەدەســت‌نەدەن بڕیاری گشتی‌یـاندا خوێنی هەردوکیان ( کە دووســـەد ووشترئەکات ) بیدەن بـەهەرکەســـێ کە بیان هێنێتەوە بەزیندوویی یا مردوویی . خوێنەمەش سامانێکی گەورەبوو بۆ ئەوکاتەی ئەو ولاتە .

ڕۆژی ســێ‌هەم کە خەڵکی لـەبەر بێ‌هیوایی هێمن‌بونەوە ـ عبداللە کوڕی أریقط کە چاوساخی ڕێکایان‌بو دوو ووشترەکەی ئەوان‌و وشترێکی

بۆ خۆی هێناو هات بۆلایـان . هەرچەند ـ أبوبكر ـ ویسـتی وشترەکە ببەخشێ بە پێغەمبەر بەڵام پێغەمبەر ڕزای نەبوو هەتا پێی فرۆشـت ، وە ـ أسماء ـ ی کچی أبكر هات و تۆێشوو خۆراکی بۆ هێنان ، کە کەوتنە ڕێ هیچ نەبوو تویشووەکەیانی پێ ببەستن ـ أسماء ـ پشتێنەکەی خۆی کرد بەدوکەرتەوە بەیەکێکیان شتەکانی بەست و ئەوی تری بەستە پشت لەبەرئەوە ناونرا ( ذات النطاقين ) . وە ـ أبوبكر ـ هەرچی سامانی بووبایی پێنجج هەزار درهەم بۆهێنابووی لەگەڵ خۆیا ، وە لەبەر ئەوەی قورەیش پێیان نەزانن بەڕێگەیەکی کۆنی کوێرە ڕێدا بەشارەزایی ـ عبدالله ـ چاوساغیان کەوتنە ڕێ . بەرەو بـاشووربۆ خۆرئاوای مەکە . پاشان لەکەناری دەریای سوردوە ڕوو بە ( تهامە ) ڕۆیشتن . هەمیشەبە کوێرە ڕێدا ئەڕۆیشتن . بەدرێژایی شەو و تاقی بەیانیانیش ڕێیان ئەبڕی بێ گوێدانە زەحمەت و نارەحەتی و شەوڕەوی و بێخەوی و برسی‌وتینوێتی بەڕۆژیش خۆیان کەنارئەداو ئەحەوانەوە .

ئەم هەموو ( إحتياط ) ی پێغەمبەر و ئەم شـێوەو کاروبارانەی بەکار هێنا بۆ سەر شێوانن لە قورەیش و بت پەرستەکان ، لەکاتێکا کە پێغەمبەرێکی گەورەو خۆشەویسـتی خوایە . نـەی کردوە بە موعجیزە ئەم ڕێگایە ببڕێ ، یاهەموو کەس کوێربکا لەعاستیان ، یانەوێرن بێنەڕێگای و هتد . . ئەمانە ئەوەمان تێ ئەگەیەنێ ئیشی‌خوا لەسەر زەوی‌و لەگێتی‌دا بەپێی بنکەیەکی بەجێ‌و یاسایەکی نەگۆڕاوەو ئەبێ هەمووکارێك بەپێی ئەو یاسایانە ببرێ بەڕێوەو نابێ بانگ کەری ئیسلام بە هیوابێ کەمادام ئیسـلام حەقەو بەرنـامەی خوایە ئەبێ هەرلەخۆوە خواسەری بخاو بە

موعجیزه ئیشەکانی بکات .

قورەیشەکان دەنگو باسی کۆچ کردنی محمدو أبوبکرو بەخشیشی دۆزینەوەیان بەهەموولایەك کەیانبوو،هەمو خەڵکیان تێ کەیاندبوو . کاتێ بەلای خێڵی ( بنی مودلج ) دا تێپەڕین ، پیاوێکیان بەدی کرد ، هاتەوە لە ناو کۆمەڵێکا وتی : ئێستە تارمایی‌یەکم‌دی بەکوێی دەریادا تێپەڕین لام‌وایە محمد و هاوڕێکانی بون ( سراقەی کوڕی مالك مدلجی ) لەوێدا چەقیە دڵێوە کە ئەوان‌بن ، بەڵام بۆئەوەی بەخشیشەکە هەر بۆخۆی‌بێ و کەس نەچێت بەدوایانا وتی : نەء ، ئەوە فلان و فیساربوون . ئەمەی‌وت‌و دوای تۆزێ هەڵساو چووە ماڵەوە خۆی ئچەکدار کردو ناردی وڵاخەکەیان بەزین‌کراوی بردە شێوێکەوە لەخوار ماڵانەوە ، هەتاکەس پێی نەزانێ ، گورج چوو لەوێ سواری بوو شەوێنیان کەوت بەو ڕێگایەی کابرا هەڵی‌دابوو ، وە پێغەمبەرو هاڕێکانی لەبن دارێکا خستبوویان تاکەمێ بحەسێنەوە ماندویەتیان دەرچێ و قاوەڵتی بکەن لەگەڵ خوا پەرستیدا ، . کەڕۆژ لارەی کردو سێبەر درێژەی کێشاو هەوا بەرەو فێنکی ئەڕۆیشت ، پێغەمبەرو هاوەڵانی ئەیان‌ویست بڕۆن بۆ لای وڵاخەکانیان و بکەونەڕێ ئەبینن ( سراقە ) بەرەو ڕویان دێت و لێیان نزیك‌بووەتەوە . کە لەوەپێش وڵاخەکەی دووجار خستبووی، بەڵام کەچاوی کردن و زانی ئەوانن پیری‌کردەوە کە بەهۆی گێڕانەوەی ئەمانەوە دووسەد ووشتری دەس ئەکەوێ ، ئیتر ئاگای لە خۆی ووڵاخی‌و لەکەوتن‌و کلانی ئەماو ئاوزەنگی توندکرد لەبن دەس وڵاخو کەوتە تێ‌کوتانی ، بەڵام پەنجەی قەدەر نەخشەیەکی تری کێشابوو ، خۆ ئەوە ئێغەمبەرو هاوڕێ

بەهونەرەکەیەتی و خوا ئەیانپـارێزێ لەمولەو ئیشی کرانیان پێسپێرراوە ئەمانە نێچیری ئەونین ، بەڵێ وڵاخەکەی سراقە کلا بەڵام چۆن کلانێ : هەتا ئەژنۆی چوبەزەویدا و سراقەی بەجۆرێك فڕێدا لەوانەبوو ملی بشکێ ، ( سراقە ) زانی ئەمە ( معجیزە ) یەو خۆی خستۆتە ناو کارێکی پڕ لە ئەندێشەوە و لەوانەیە ئەمجارە پشتی بشکێنێ ، لەبەر ئەوە وەستاو هاواری کردو ئامانی خواست و وتی : من( سراقەی مدلیجی ) م بۆم بڕوانن با قسەتان بۆبکەم ، بەخوا قەسەدم لەلایەن منەوە زیانتان پێناکاو کەستان بەشوێنا نانێرم، وەبەم قسانەوە لێیان نزیك بووەوە باسەکەی بۆ گێڕانەوە و لەپاشان وتی بانان و ئاوتان بۆ بێنم ، وتیـــان هیچمان نـاوێ بەڵام ڕێکاکەمـان لـەخەڵکی گومبکە ئەویش بەڵێنیدانێو داوای کرد کە ئەمانەتنامەیەکی بدەنێ ، پێغەمبەریش (د.خ) بە أبوبکریفەرموو ، ئەویش لەئێسقان یان سواڵەت بۆی نوسی و دایانێ . سراقە گەڕایەوە و لەڕێکا توشی هەرکەس بوو ئەیگێڕایەوە و سەری لێئەشێواند و ئەیوت : کەس لێرەوە نەڕۆیوە

## لادان لە قباء :

کە پێغەمبەر و هـاوڕێکانی گەیشتنەلای قوباد پێغەمبەری خوا (د . خ) لەقوباءلەناو هۆزی (بنیعمر کوڕی عوف لایدا . بۆماوەی چوار ( یان چواردە ) ڕۆژ لە قوبادا مایەوەو لەوێ لـەناو هۆزی بنی عمر ) مزگەوتێکی دروستکرد کە ناەبرا بە مزگەوتی ( تقوی ) و لەشانی ئەوا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : «لمسـجدٌ أسِس على التقوى مِن أول يَوم

أحق أن تَقومَ فيه ، فيه رِجالٌ يحبون أن يَطهَروا والله يحب المُطهرين »
وەلەم ماوەیەدا علی کوڕی ( أبی طالب ) یش کوچی کرد .

لەپاشان پێغەمبەری خوا کەوتە ڕێ بۆمەدینەو موسلمانە مەدینەیی‌یەکان هەموویان شیروتیرو چەکیان لەخۆیان دابوو ، چواردەوریان گرتبوو ، ئەویش لەسەرخۆ ئەڕۆیی بەڕێوە ، مەدینەیی‌یەکان زیاتر ئەچوونە پێشەوەو باشتر هەولیان ئەدا کەلێی نزیك ببنەوەو بەخزمەتی بکەن‌و چاویان تێر بکەن لەسەیری ئەورەنگ‌و ڕوخسارە شیرینەی ، وەیەکسەر خەلکی ناوشار هاتبوونە دەرەوەو سەیری ئەوپێغەمبەرە گەورە بەڕێزەیان ئەکرد ، بەلای هەر بەرەو تیرەیەکا ئەڕۆیی زۆر بەسۆزەوە داوایان لێ ئەکرد کەلەناویانـا لابداو بیێتە میوانی ئەوان ، بەلام ئەویش زۆر بەهێمنی‌و لەسەرخۆ وەلامی ئەدانەوەو ئەیفەرموو : ئەم وشترە لەکوێدا وەستاو یخی کرد ئەبێ لەوێدا لابدەم‌و بیکەم بەمزگەوت‌و مال‌و جێگای خۆم . وشـــترەکەی لەسەرخۆ ئەڕۆیی‌و ئەوقەلەبالغە گەورەیەیش بەدەوریا بوون هەتا گەیشتە ناو خێلی ( بنی نجار ) ی خالوانی لەوێدا وشترەکەی بەزی (١) وە ئەوشوێنـەش کەوتبوە بەردەمی مالی ( أبوأیوب الانصاری ) ، پێغەمبەر فەرمووی : ئەمە زەوی کێ‌یە ؟ وتیان هیی ئەودوو کوڕەیە ( معاذ ) وتی : خەلاتی تۆبێ ، ئەویش فەرمووی : بەکڕین نەبێ نابێ ، وەفەرمووی : ئەگەر خوا مەیلی بێ ئەمە مزگەوت‌و جێگامان ئەبێ .

( أبوأیوب) کەل‌وپەلەکانی بردە مالی خۆیان‌و پێغەمبەر بەمیوانی لەوێ

---

(١) ئەوجێگایەش مولکی دووهەتیوبوو ناویان (سهـــل‌و سهـیل) بوو ، خورمایان تیا وشك ئەکرد ، وەئەم دووهەتیوەش ( معاذ ) بەخێوی ئەکردن .

بوو ، وه ( أسعدی کوڕی زواره ) وشتره‌که‌ی برده ماڵی خـۆیان‌و بۆی به‌خێو کرد . له‌م ماوه‌یه که‌پێغه‌مبه‌ر هاته ناوشار هه‌تا گه‌یشته شوێنه‌که‌ی خۆی له‌هه‌موو لایه‌که‌وه خه‌ڵك ئه‌م به‌رو ئه‌وبه‌ری ڕێگاکه‌یان گـرتبوو بۆ چاوپێ‌که‌وتنی پێغه‌مبه‌رو یاره‌کانی ، وه‌ده‌سته ده‌سته گه‌نجه‌کان ده‌ف‌و ته‌پڵیان لی‌ئه‌داو سروودی به‌خێرهاتنیان بۆئه‌ووت . هه‌ندێ له‌م سروودانه ئه‌مه‌بوو :

( طَلَعَ البَدْرُ عَلَيْنا + مِنْ ثَنِيّاتِ الوداع ، وَجَبَ الشُّكْرُ عَلَيْنا ما دَعا لله داع . أيُّهَا المَبْعُوثُ فينا + جِئْتَ بِالأمْرِ المُطاع ) وهه‌ندێ‌تر ئه‌یان وت : ( نَحْنُ جوار من بني النجار ، يا حبّذا محمد مِن جار ) .

ئه‌م کۆچ کردنه له‌سه‌ره‌تای مانگی ( ربيع الاول ) دا ده‌سی پێ‌کرد، له‌دوانزه‌ی ئه‌م مانگه‌دا گه‌یشته شاری مه‌دینه ، که ڕێـکه‌وتی ( ٢٨ ) ی حوزه‌یران یا ته‌موزی ساڵی (٦٢٢) زاینی ئه‌کات . (خضری) به‌ك له‌کتێبی « نورالیقین » دا ل ٨٣ ئه‌ڵێ : مه‌حمود پاشـای فه‌له‌کی ده‌ری هێنـاوه‌و ئه‌ڵێ ؛ « کۆچه‌که‌ی له‌ڕۆژی دووه‌می ( ربیـع‌الاول ) دا ده‌سی پێ کرد به‌ڕێکه‌وتی (٢٠) ی ئه‌یلولی ساڵی ٦٢٢ ز گه‌یشته مه‌دینه » ١٣ ساڵ له ته‌مه‌نی پێغه‌مبه‌ریتی‌ی تێ‌په‌ڕیبوو . واته له‌م کاته‌دا ته‌مه‌نی (٥٣)ساڵ بوو.

له‌کاتی فه‌رمان ڕه‌وایی عمری کوڕی خطاب‌دا ئه‌م کۆچ کـردنه‌ی کرد به‌سه‌ره‌تای تأریخی ئیسلامی ، له‌به‌رئه‌وی سه‌ری ســاڵ له مانگی (محرم) وه ده‌س پێ‌ئه‌کا ـ هه‌رچه‌ند دوومانـگیـشی به‌سه‌را تێ په‌ڕیبوو ، ئیمامی عمر تأریخه‌که‌ی گێڕایه‌وه بۆیه‌کی مانگی ( محرم ) .

***

# دروست کردنی مزگەوت‌و خانوو

یەکەم ئیشێك کەپێغەمبەر پێی هەستا لەمەدینەدا بریتی‌بوو لەدروست کردنی مزگەوت لەهەمان شوێن‌دا کەحوشترەکەی تیـا نوست ، بۆئەوەی ببێکا بەشوێنی نوێـژو خواپەرستی وەلەهەمان کاتا کارو باری دەوڵەتی تیـا جێ‌بەجێ بکاوشوێنی دادگاو قوتابخانەبێ بۆفێربوونی ئاداب‌و رەوشتی‌جوان ، وەبانەو نادی موسڵمانان‌و جێگای کۆبوونەوەی پەرلەمان‌و ئەنجومەنی‌گشتی ومیوانخانەی ئاوارەو جێگای بێ‌خانەو لانەکان بێ .

پێغەمبەرو هەموو یارەکانی مزگەوتەکەیان دروست کـرد ، بەڵام بـە شێوەیەکی زۆر سادەو (متواضع) ، دیوارەکانی لەخشتی کاڵ‌و قوڕو لایەکی بەپەلکی دارخورما سەرکرت‌و لاکەی تری بەرەڵلا بوو ، ناوەکەشی لم‌و کڵ‌بوو . خانوەکەشی هەربەوجۆرە سادەیی‌یە تەواو بوو ، خێرا گوێزرایەوەو چوە ناویەوە .

ئنجا دەس بەجێ ( زید )ی کوڕی ( حارث ) ەو ( أبورافـع ) ی ناردەوە بۆشاری مەکە ، وە ( عبدالله ) ی کوڕی ( اریقط ) ی لەگـەڵا ناردن بۆشارەزایی بۆئەوەی خێزانەکەی بهێـنن بۆمەدینە ، وەهێنانیـان ، بەڵام ( زینب ) ی کچی کەخێزانی ( ابوالعاص ) ی کـوڕی ( ربیـع ) بوو نەیدایەوە .

# برایەتی ئیسلامی

پێغەمبەری خوا کەوتە بیرکـردنەوە لەرێـکخستنی باری مەدینەو لە دروستکردنی کۆمەڵێکی بەیەکا شێلراوی وەها کەپیلانی هیچ بت‌پەرست

ودوو ڕوو جووله‌كه‌یه‌ك نه‌توانێ لێكیان بترازێنێ وپه‌رته‌وازه‌یان بـكات ، ویان كۆسپێكی تازه له‌مه‌دینه‌دا دروست بكات كه‌ببێته به‌رهه‌ڵست له‌ڕێی بڵاوكردنه‌وه‌ی بانگی ئیسلامدا ، خۆموسڵمانه كۆچه‌ری‌یه‌كان له‌چه‌ندتیره‌ی جیاوازو یاریده ده‌ره‌كان له‌دوو تیره‌ی (أوس‌و خزرجی ) دوژمنی ناحه‌ز پێك‌هاتوون . وه‌كۆبوونه‌وه‌ی ئه‌م دوو كۆمه‌ڵه لێره‌دا بۆحه‌وانه‌وه‌وڕابواردن وژیان نیه ، به‌ڵكو ئامانجی هه‌موان بڵاوكردنه‌وه‌ی ئایینه ڕزگاركه‌ره‌گه‌ی ئیسلامه به‌سه‌ر زه‌ویدا ئه‌بێ مه‌شخه‌ڵی ئازادی هه‌ڵبكـــرن‌و سه‌رزه‌وی ڕوناك بكه‌نه‌وه‌و مرۆڤایه‌تی ڕزگاربكه‌ن . وه‌له‌لایه‌كی تره‌وه موسڵمانه‌كانی مه‌كه كه‌كۆچیان كردووه به‌نهێنی هاتوون‌و چی‌یان بووه له‌مه‌كه‌دا به‌جـێ ماوه ، خۆمرۆڤ به‌بێ ماڵ‌وخۆراك ناژی‌و نه‌بوونی‌و هه‌ژاریش بارێكی‌گرانه

لێره‌دا پێغه‌مبه‌ری خوا كه‌وته بیركردنه‌وه‌و ڕاوێژكـردن له‌گه‌ڵ یاره زاناكانیا ، وه‌له‌ئه‌نجامدا برایه‌تی‌یه‌كی به‌هێـزی پته‌وی له‌نێـوانی هه‌ردوو كۆمه‌ڵه‌كه‌دا دامه‌زراندن وپه‌یمانی پێ‌به‌ستن له‌سه‌ر بناغه‌ی ( إنماالمؤمنون اخوة ) سوره‌تی ( الحجرات ) ، خۆی له‌گه‌ڵ (علی) كوڕی ( أبوطالب) دا ( حمزه ) ی مامی له‌گه‌ڵ (زید) ی كوڕی (حـارثه) و ( أبوبكر ) له‌گه‌ڵ (خارجه) ی كوڕی (زید) و (عـمر ) له‌گه‌ڵ (عتبان) ی كوڕی ( مالكی خزرجی) ئنجا ده‌ستی هه‌ریه‌كێ له‌كۆچه‌ری‌یه‌كانی خسته ناو ده‌ستی یه‌كێ له‌یاریده‌ده‌ره‌كانه‌وه وپه‌یمانی برایه‌تی ڕاسته‌قینه‌و پته‌وی پێ‌به‌ستن ، وه‌به‌م پێ‌یه توانی زاڵ ببێ به‌سه‌رئه‌وكۆسپ‌و گرێیانه‌ی مه‌ترسی‌یان لێ ئه‌كراو له‌وانه‌بوون ڕێگای ده‌ستیان بگرن .

به‌ڵام ئه‌م په‌یمانه‌و برایه‌تی‌یه له هه‌موو په‌یمان‌و سوێندو برایه‌تی‌یه‌كی

نەژاد و خـۆل و خوێن پتەوترو ڕاسـتترو بەهێزتربوو ، چونکەبرایەتی دڵو باوەڕبوو ، ئەوباوەڕەی مرۆڤ بتوانێ گیان و ماڵ وهەموو شتێکی لەڕێدا بەخت بکات ، بۆیە وشەی ( من ، تۆ ) ی تێدا ڤـوژابووەوە و گیـانی خۆ ویستن و دەماگیری تیاتووابووەوە . نەك وەكو پەیمان و برایەتی‌یەکانی تر وابوو بێت .

یاریدەدەرەکان بەخۆشی و دڵفراوانی‌یەوە هاتن بەدەم کۆچەری‌یەکانەوە وکردنیان بەسەر پشك لەماڵو داراییانا ، ئێستە نموونەیەك باس ئەکەین بۆئەوەی لەقوولاّیی ئەو پەیمانو برایەتی‌یـە ڕاستەقینەیە تێ بگەین :ـ

بخـاری ریوایەتی‌کردوە : « کاتێ کۆچەری‌یەکان چوونە مەدینە پێغەمبەر (د٠خ) برایەتی خستە نێوانی ( عبدالرحمن‌ی کـوڕی عوفـو سعدی کوڕی ربیعة ) وە سعد بـەعبدالرحمن‌ی وت : برا من لەهەمـوو یاریدەدەرەکان دەوڵەمەند ترم ، ماڵەکەم ئەکەم بەدوو بەشەوە هەریەکەمان بەشێکی ، وەدوو ژنم هەیە سەیریانکە کامیانت بەدڵە با تەلاّقی بـدەمو (عدە) ی بەسەرچوو تۆبیخوازە ، عبدالرحمن وتی : خـوای گەورە فەڕو بەرەکەت بخاتە ماڵو خێزانتەوە ، بازاڕەکەتان لەکوێ‌یە ؟ بازاڕی (بنی قینقاع ) یان پیشاندا ، کاتێ گەڕایـەوە هەندێ کەشـكو ڕۆنی لەگەڵ خۆیا هێناوەتەوە ، وەدەسی کردە هاتووچۆ کردن تا ڕۆژێ هاتو نیشانەی خۆ ڕازانەوەی پێوەبوو ، پێغەمبەر فەرمووی چی‌یە ؟ وتی ژنم هێـناوە ، فەرمووی : چیت بۆناردووە ؟ وتی : ئەندازەیەك ئاڵتون ، . پیاو لێرەدا چەندە سەخاوەتو دڵ فراوانی‌و پیاوەتی « سعدی » بـــەلاوە ناوازەیە ، ئەوەندەش جوامێری‌و غیرەتی عبدالرحمن‌ی بەلاوە ناوازەیە ، کەچۆن نەیویست بەسەر ئەوبرایەوە بژی‌و بەتەمەڵی دانیشـێ ، پەلاماری بازاڕی

داو توانی بەرەنجی شان سامان دەس خۆی بخاو ژن بێنێو مال پەیا بکا نەك وەکو خەڵکی ئەم کاتەی ئێمە کەئاواتەخوازن کەباربن بەسەرخەڵکەوە وبەتەمەڵیو بێکارەیی دانیشنو بەناوی ئاینەوە بەسەر موسلمانـەوە بژین ، لایان وایە ئیش کردن بۆئەوان سووکیە وپێی ئەشکێن ، ئایا ئەوانە لە ( عبدالرحمن ) ی کوری (عوف) پیاوترن ؟؟

وەنەبێ تەنها عبدالرحمن پەلاماری ئیش کردنی دابێ ، بەڵکو بەجارێ هەریەکە خۆیان خەریك کرد بەکارێکەوە . بێجگە لەعبدالرحمن هەندێ تریان بەکڕینو فرۆشتنو بازرگانێتی‌یەوە خەریـك بوون ، ئەوانی تریان وەکو أبوبکرو عمرو علیو زۆری‌تـر کشتو کاڵیـــان ئەکـرد لە زەوی مەدینەیی‌بەکانا ، وەزۆری تریشیان خۆیان ئازار ئەداو ژیانی کولەمەرکیان ئەبردە سەرو نەیانەویست بەسەر خەڵکەوە بژین . بەم پێیە ئەوموسلمانە کۆچەری‌یانە لاپەرەیەکی سپی پڕلەپیاوەتی‌یان بۆخۆیان لە مێژوودا داگیر کردو نەیان ویست بـەژیانی تەمەڵیو خۆیان بکـەن بەسەربارو بـەسەر موسلمانانەوە بژین . وەموسلمانـە یاریدەدەرەکانیش نەخشەیەکیـــان لە سەخاوەتو پیاوەتی‌و جوامێریو ڕاستیدا بۆ خـۆیان کێشا کە هەتا هەتایە لەمێژووی مرڤایەتی‌یا وەکو مانگی چواردە بدرەوشێتەوە ، قورئانی پیرۆز لەمەدحو سەناو پیاوەتی‌یانا ئەفەرموێ : « والذين تبـوؤا الدار والايمان من قبلهم يحبون من هاجر إليهم ولايجدون فيصدورهم حاجـة مما أوتوا ويؤثرون على أنفسهم ولوكان بهم خصاصة ، ومن يوق شح نفسه فأولئـك هم المفلحـون ) «١»

وەبێجگە لەمانە کۆمەڵێك لەملاو لاوە هاتبوونو موسلمان بووبوون،

---

(١) سورەتی الحشر

ئەمانە هەژارو نەبووبوون ، پێغەمبەر لایەکی مزگەوتی بۆتەرخان کردبوون تیایا ئەژیان ولەماڵی موسڵمانە کۆچەری‌و یاریدەدەرەکانا ئەیژیان ئەمانە پێیان ئەووتن : ( أهل الصُّفَّه ) .

بەم پێیە پێغەمبەری خوا ( د . خ ) توانی گیروگرفتی ئابووری چارە سەربکاو یەکیەتیێکی بێ‌مەترسی لەناو موسڵمانەکانا پێك بێنێ .

## پەیمان بەستن لەگەڵ جوولەکەدا

لەپێشەوە زانیمان لەمەدینەو دەورو بەریا جوولەکەی زۆر هەبوون لەمەدینەدا ( بنوقینقاع ) لە ( فدك ) دا ( بنوقریضه ) ولەنزیك ئەوانەوە ( بنونضیر ) وەلەسەروی مەدینەوە جوولەکەی خەیبەر ئەم جوولەکانە لە سەرەتای کۆچەوە بەشیرینی چون بەدەمی پێغەمبەرەوەو پێشوازی‌یان لێ کردو بەتەمابوون بیخەنە ناوپەیمانی خۆیانەوەو بەفێڵ‌و تەڵەکە نیودورگەی عەرەبی داگیر بکەن ولەرووی کاورەکانا بوەستن کەئەوانیان ئاوارەو دەر بەدەر کردووە ، پێغەمبەریش ( د . خ ) بەجوانی وەڵامی ئەوپێشوازی‌یەی دانەوەو ئەویش بەدەوری خۆی بیری لەوە ئەکردەوە کەکارێکی وا بکات ئەم جوولەکانە یەکەم کۆمەڵ بێ بێنە ناو ئیسلامەوە ، ئەگەر ئەمەیش نەکەن نەبنە کۆسپ لەرێی بڵاوکردنەوەی ئیسلاماو رێکەیان نەبێ دوو بەرەکی‌و دوژمنایەتی‌و ئاژاوە بنێننەوە . سەرۆکەکانی‌یانی کۆکردەوەوکەوتە دواندن‌و دڵنەوایان ، بەبۆنەی ئەوەوەکە خاوەنی کیتابیکی ئاسمانین پەیمانێکی شیرینی بەست لەگەڵیاندا کە پربوو لە راستی‌و دۆستایەتی و سەربەستی ئایین‌و بیروباوەریان بەم کارە توانی یەکیتی‌یەکی تەوا لەمەدینە دروست بکا کە ئیتر لە پاشەرۆژی بانگ‌و باوەرەکەی نەترسێ .

بەم پێیە پێغەمبەری خوا توانی یەکێتی یەك لەمەدینەدا پێك بێنێ ، وەبەشێوەیەکی داد پەروەرانە لەگەڵ بت پەرست و جولەکەدا بجووڵێتەوە بەم شێوەیە موسڵمـانەکان حەسـانەوە و کەتنە ئیش وکار و خواپەرستی ، ئالەم کاتەدا پێغەمبەری خوا خاتوعایشەی کچی أبوبکری صدیق کەلەتەمەنی یازدەساڵی‌دا بوو گوێزرایەوە .

## بـانگی نوێژ :

ابن إسحاق ئەڵێ : « کە پێغەمبەر هاتە مەدینە موسڵمـــان بەبێ بانگ یا شتێکی‌تر لـەکاتی نوێژالێ‌ی کۆئەبوونەوە . بەڵام پێغەمبەر بیری کردەوە کە زەنگێك وەکو زەنگی جولەکەکان دروست بکات بۆ بانگ و بۆ نوێژکردن لێ‌بدرێ ، بەڵام لـەبەرئەوە ئەوزەنگە پەیرەوی جوولەکەی تیابوو وازی لەوەهێناو کەوتنە بیرکردنەوەو وتوووێژ ئالەم وتوو وێژەدا بوون کە ( عبداللە ) ی‌کوری ( زید ) ی کوڕی ( ثعلبە ) خەوێکی لەم بارەیەوە دیبوو ، هاتەخزمەتی پێغەمبەرو وتی : ئـەم شەو لە خوادیم پیاوێك دووبەرگی سەوزی لەبەردا بوو بەلاماتێ پەڕی‌و زەنگێکی بەدەستەوە بوو ، وتم : ئەرێ برا ئەو زەنگە ئەفرۆشـی ؟ وتی بۆچیتە ؟ وتم : خەڵـکی پێ‌کۆئەکەینەوە بۆ نوێژ . . . وتی : ئەی بۆچی‌شتێکی باشترت پی‌نەڵێم . وتم : ئەوشتەچیە ؟ وتی اللە أکبر اللەاکبر . . . پێغەمبەر فەرمووی : ئەمە خەوێکی ڕاستە ئەگەر خوا مەیلی‌بێ ، برۆ بە ـ بلال ـ بڵێ باباڵنگی پێ‌بدا چونکە دەنگی ئەو زۆر بەرزترە لە دەنگی تۆ ، کە بلال بانگی پێدا ـ عمر ـ لەماڵا بوو بیستی‌و هات بۆ خزمەتی پێغەمبەرو وتی : قەسـەم بەوکەسەی تۆی بەڕاستی کردوە بە پێغەمبەر خەوێکی ئاوەهام دیوە ، پێغەمبەریش ( د . خ ) فەرمووی : « دەی سوپـاس بۆ

خـوا ( زهری ) ئەڵێ : بـلال لـە نوێژی بەیانیـا ئەمەی لێزیادکرد : ( الصلاه خیرٌ من النوم ) وە پێغەمبەریش بڕیاری لەسەردا .

## پێغەمبەر خۆی جیانەئەکردەوە :

پێغەمبەری ئیسلام دەســـتی کرد بەپتەوکردنی پەیوەندیان و بەدامەزراندنو ڕام هێنانیان لەسەر ئاداب و بیروبـاوەڕەکانی ئیسلام ، وەهەرجـــارە لەڕوویەکەوە وتاری بەرزی بۆ ئەدانو ئامۆژگاری جوانی ئەکردن و هەرجومعەی لـــەلایەکەوە ـ خطبە ـ ی بۆ ئەخوێندنەوە تابە تەواوی لەبیرو باوەڕو فەرمانەکانی ئیسلامی گەیاندن وەبەکردەوەو پێشانی ئەدان ، خۆی بـەیەکێ لەوان ئەدایە قەلەم و فیزو هەوای بەسەر کەسـا نەئەکرد ، نەی ئەهێشت لە خۆیان جیای بکەنەوە ، لەهەرکوێ یەکا ڕێ بکەوتایە دائەنیشت ، لەڕۆیشتنا وەکو یەکێ لەوان بوو ، ئەیفەرموو : «بەرزم مەکەنەوە وەك گاورەکان کردیان لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەما، من بەندەی خوام ، پێم بڵێن بەندەو پێغەمبەی خوا » . جـــارێ چوبۆلای کۆمەڵێ لەیـارەکانی ئەوانێش لە بەری هەڵســـان ، ئەویش فەرمووی : « هەڵمەسن لەبەرم وەکو ( عجم ) ەکان هەڵئەسن و هەندێکیان هەندێ تریان بەگەورە سەیرئەکەن » تێکەڵاوی ئەکردن و منالیـانی ئەلاواند. ئەیخستنە باوەشیەوە ، هەرکەسێ لەژن و بەندەو پیرو هەژار بانگیان بکردایە ئەچوو بەدەمیانەوە ، ســـەری لەنەخۆشیان ئەداو ( عذر ) ی لێوەرئەگرتن بەهەرکەس بگەیشتایە لەپێشـا ســلاوی لیئەکردو تەوقەی لەگەڵا ئەکرد ، هەمیشە ڕووخۆشو دەم بە زەردەخەنەوە بوو ، ڕێزی لە هەموکەس ئەگرت و زۆر بەوەفابوو ، لـە هەموڕوویەکەوە نموونەی ڕەوشتو کـرداری شیرین و پیـــاوەتیو جوامێری بوو ، بەم گوفتار و

کردارانه ڕیزی موسلمانەکانی پێەوکردو کردنی بەیەك لاشە :

## جووله‌که‌کان مه‌ترسی‌یان لێ نیشت :

تەعالیمی محمد و ڕەوشتە شیرینەکەی و قسە جوانو پڕتوێکلەکەی تینی گەورەیان ئەکردە سەر دڵو دەرونی مەردم ، وەبەم هۆیـــانەوە کۆمەڵێکی زۆر ڕویان کردە ئیسلامەتی‌و موسلمانەکان کان هێزودەسەڵاتیان پەرەی‌سەند ، لێرەدا جوولەکەکان سەرلەنوێ دەستیان کردە بیرکردنەوە دەربارەی محمدو یارەکانی ، لەپێشەوە پەیمانیان لەگەڵ بەستبوو بەتەمابوون بەوهۆیەوە بیخەنە ناوڕیزی خۆیانەوە و بەهۆیەوە زاڵ‌بن بەسەرگاورەکانـا . کەچی‌وا خەریکە ڕۆژ بەڕۆژ هێزو دەسەڵاتی ئەم پتر ئەبێ و ئیتر ئەمان نـــاتوانن لەبەرهێـزی ئەما خۆبگرن ، ئەوەیە کەوتۆتە بیرکردنەوە لە قورەیشەکان کە خۆی و یارەکانیان دەرکردوە ، لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی بانگەکەیا وەستان ، ئایـا ئەکرێ ئەمـان ـ جوولـەکە ـ دانیشن و ئەو بانگەکەی خۆی ئاوا بڵاوبکاتەوەو دەسـەڵاب پەیابکاو زاڵ‌ببێ و ئەمـان تەنیابەوە ڕازی‌بن کەلە ژێر پەیمـانەکەیاو لەژێر باڵی ئەوا بەئاسـایشی دابنیشن ؟ کێ‌ئەڵێ ئەمانیش لەسەر حاڵی خۆیان ـ واتە لـەسەر ئاینی موساپێغەمەرە ـ ئەمێننەوە ؟ خۆئەوەتە ئەبینن ئەوبانگە بەناو ســـادەکانی ئەوانیشا بڵاو بۆتەوە ( لەگەڵ ئەوەدا کە تەعالیمی ئاینەتێك دراوودەس تێخراوەکەیان ئەڵێ : نابێ ئەمـــاندان بنێن بەپێغەمبەر ڕێکاکە لەبەنی اسرائیل نەبێ ) مەترسی‌یەکەیان گەورەو سامناك بوو ، کاتێ یەکێ لەزانا گەورەکانیان ( عبدالله ) ی کوڕی ( سـلام ) چووەلای پێغەمبەری خوا ( د . خ ) قورئانی بۆخوێندو بـانگی کرد بۆ سەر ئیسـلام و ئەویش موسلمـان بوو ، وەلەبەر ئەوەی زانی ناپاکی جوولەکە لەچ پلەیەکایە و

چۆن‌شت هەڵ ئەگێڕنەوە ؟ وتی بەپێغەمبەری‌خوا : لێیان بپرسە بزانە پلەی من لەناویانـا چۆنە ؟ بەڵام پێش ئەوەی بزانن ئیـسلام‌بووە ! کە لێی پرسین وتیان : گەورەو گەورە زادەمانە زانـــاو باوەڕپێ‌کراومانە ، کە عبداللە هاتەناویان و ئیسلامەتی دەربڕی ترســـان ئەنجامێکی نالەباری هەبێ‌بۆیان ، بۆیە کورج پەشیمان بونەوەو کەوتنە قسەی ناڕەوا پێ‌وتنی ، بەڵام ( عبداللە ) چووەوە ماڵەوەو هەموو خاو و خێزانی موسڵمان کرد .

لێرەدا جولەکەکان بەتەواوی کەوتنە تـرس‌و بیمی لەنـاوچونەوە ، ئنجا بڕیاری کشتی‌یـاندا بکەونە فڕوفێڵ و پیلان و تەڵەکەبازی ـ کە شتێکی سروشتی‌یە بۆ جولەکە ـ وەپێغەمبەرێتی‌یەکەی بەدرۆ بخـەنەوە ، ئەمە زۆری نەخایان کەبت پەرستەکانی مەدینەو ئەوانەی ـ منافق ـ بوون واتە هەربەسەرزاری موسڵمان بووبوون لە ( أوس ) و ( خزرج ) ئەمانەیش چوونە پاڵیان و بوون بە کلکیان .

## هشتومڕی جوولەکە لەگەڵ پێغەمبەر

لێرەوە مشت مڕو دەمەدەمێی جوولەکە لەگەڵ پێغەرمبەری خوادا دەسی‌پێ‌کرد بەشێوەیەکی توندتر لە قورەیشەکانی مەکە ئەهاتن بەفڕوفێڵ و بۆ پڕوپاگەندە بڵاوکردنەوە زاناکانیان ئەکرد بەموسڵمان‌و لەناوموسڵمانەکانا خۆیان زۆر بەموسڵمانێکی ڕاست پیشان ئەدان ، کەچی‌زۆری پێ‌نەئەچو دەستیان ئەکرد بەپیلان گێڕان‌و گومانی‌یان لەئیسلامەتی‌دا دروست‌ئەکرد وپرسیاری وایان ئاڕاستەی پێغەمبەر ئەکرد کەلەرەکەیدا بەدل وباوەڕی مۆسڵمانەکان ، ئەهاتن ئەیانپرسی : ئەگەر خوا ئەم‌گێتی‌یەی دروست‌کردوە ئەی‌کێ خوای دروست کردوە ؟ پێغەمبەریش ( د . خ ) بەهێواشی وەڵامی

بەقورئان ئەدانەوە : ( قل هو الله احد الله الصمد لم یلد ولم یولد ولم یکن له کفواً أحد ) .

موسلمانەکان بەجوانی تێ‌گەیشتن کەمەبەس‌و ئامانجیان چی یە ؟ وە بۆچی ئەگەڕێن ؟ ڕۆژێ سەیریان کرد لەمزگەوتا کۆمەڵەیان کردووەو زۆر لیك نزیك بوونەوەو بەچپە قسە ئەکەن ، پێغەمبەر فەرمانی‌دا دەریان کردن بەخراپی . بەڵام بەمە وازیان نەهێناو هەمیشە ئەگەڕان بۆئەوەی هەلێك هەڵخەن . جوولەکەیەکیان ( شاس ) ی کوڕی ( قیس ) تێ‌پەڕی بەلای کۆمەڵێکا لەئەوس‌و خەزرجی بەیەکەوە بەبرایەتی دانیشتبوون زۆر پێ‌ی ناخۆش بوو ، لەدڵی خۆیا وتی : ئاوا عەرەبەکان ڕێك بن‌و پێکەوە ئاشتبن‌و دانیشن ؟ جا ئیتر ئێمە چۆن ئەژین لەناویانا ؟ خێرا وتی بەکوڕە جوولەکەیەك کەلەوێدا بوو : هەرهەڵت بۆهەڵکەوت باسی جەنگی ( بعاث ) وزال بوونی ( أوس ) بەسەر ( خزرج ) دا بێنەرە کایەوە . کوڕەکەباسی ( بعاث ) ی هێنایە پێشەوەو خستی‌یەوە بیری دانیشتووەکان ئەوانیش کەوتنە ناڕێکی‌و خۆهەڵکێشان‌و شانازی‌و دوژمنایەتی ، هەتا هەندێکیان وتیان : ئەگەر حەزئەکەن با دایمەزرێنینەوە . ئەم هەواڵە کەیشتە پێغەمبەر ئەویش بەخۆی‌و یارەکانیەوە هات بۆلایان‌و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیانا ئەوەی بیرخستنەوە ئیسلام دڵی کردوون بەیەك وکردوونی بەبراو دۆست‌و پشتیوان‌و خۆشەویستی یەکتری « وەلەگەڵیان‌دا دوا هەتا دەستیان کردە ملی یەك‌و داوای لێ‌بوردنیان لەخوا کرد .

ناڕێکی نێوان جوولەکەو پێغەمبەری خوا گەیشتە پلەیەکی سەخت قورئان ئەهاتە خوارەوەو بەڕوشنی باری نالەبارو ناڕاست‌و ناپاکی جوولەکەی پیشاندا ، کەئەم خووانە سروشتی یە تیایاناو هەروا بوون‌و

هەروایش ئەبن هەتا هەتایە ، لەسەرەتای سورەتی ( بقرە ) وە هەتا ئایەتی هەشتاویەك ، وەبەشی زۆری سورەتی ( النساء ) یش هەروەها باسی ئەهلی کیتاب ئەکاو ، باسی ئینکاری‌و ناپاکی‌یان ئەکاو نەفرین‌و هەڕەشەی سەختیان لێ ئەکا .

جووله‌کە بەتێکدانی بەینی موسلمانەکان‌و بەهەولدان بۆ پەشیمان کردنەوەیان وازیان نەهێنا بەلکو ئەیانویست هەول بدەن بۆسەر شێوان لە پێغەمبەر خۆی .. زاناو سەرۆك‌و گەورەکانیان چونە لای پێغەمبەری خواو وتیان : تۆخۆت ئەزانی ئێمە کێین‌و پلەو پایەمان چی‌یە لەناوکەسەکانمانا؟ ئەگەر ئێمە شوێنت بکەوین هەمو جووله‌کە شوێنت ئەکەون‌و کەس پێچەوانەی ئێمە ناجولێتەوە وەلەناوەندی ئێمەو خزمەکانمانا ناڕێکی هەیە ئەمانەوێ تۆ بکەین بەحەکەم ، تۆیش بەلای ئێمەدا دابتاشە ، ئیتر ئێمە شوێنت ئەکەوین‌و باوەڕت پێ ئەکەین .

لەم ڕوداوەدا کورج ئەم ئایەتەی بۆهاتە خوارەوە : « وأنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ » (١) لەم ئایەتەدا خوای گەورە ئامۆژگاری پێغەمبەر ئەکا کە دوای جووله‌کە نەکەوێ و بەقسەیان هەل نەخەلەتێ .

## لێکۆلینەوە لەهەلوێستی جووله‌کە بۆئیسلام

جووله‌کە بەکەم کۆمەل بوون هەلوێستێکی ناڕێکیان هەبوو بەرامبەر بەبانگی ئیسلام لەمەدینەدا ، وەچەند هۆیەك پالی پێوە ئەنان بۆ ئەو

---

(١) المائدة : ٤٩ ـ ٥٠

هەڵوێستە نالەبارە ، جوولەکەکان پایەو پلەیەکی دیارییان هەبوو لەناو عەرەبە نەخوێندەوارو نەفامەکانا ، چونکە ئەهلی کیتابو خاوەنی پەڕاوی ئاسمانی بوون ، ئەگەرچی ئەوعەرەبانە ئارەزووی وەرگرتنی ئایینەکەیانیان نەبوو لەگەڵ ئەوەشا بەزاناو خاوەن فامیان دائەنان . دیسان کاتێکی لەباربوو بۆ جولەکە کەبتوانن دوژمنایەتی بخەنە ناو دووخێلی (أوس وخزرج) وە. کاتێ ئیسلامی پیرۆز هاتو لەئاسمانی مەدینەدا کەوتە پرشەو ورشە ئەو پلەو پایەی لەجوولەکە سەندەوە . ئەوناڕێکی‌یەی لەناو دووخێڵەکەدا لای برد وبرایەتی‌و خۆشەویستی لەنێوانا چاند ،وەموسڵمانەکان جڵەوی فەرمانبەری مەدینەیان کەوتەدەست .، جوولەکە خۆیان دائەنا بەکەڵی‌هەڵبژێرراوی خواو پەیام و پێغەمبەرێتی ئەبێ هەر بۆئەوان‌بێ وتاپۆبێ لەسەریان . لەبەرئەوە بەتەمابوون پێغەمبەری دوایی ـ کەهەموکاتێ‌مژدەیان پێ‌ئەدا ـ لەخۆیان‌بێ . کەئەو پێغەمبەرە لەناوعەرەبا هات ، ئینجا بەتەما بوون لەدەرەوەی بانگەکەی بن‌و هەقی نەبێ بەسەر ئەوانەوەو تەنیا بۆ عەرەبەکان‌بێ . جا کەبینی‌یان بانگەکەی ڕوویان تێ‌ئەکا ـ چونکە ئەهلی کیتابن‌و شارەزایی ئایین‌و خوا ناسین ـ ئیترئەم بانگەیان بەشێوەیەکی نالەبار سەیرئەکردو فیزو هەوا بەرچاوی گرتن ، بەگاڵتە پێ‌کردن‌و ڕیسوایی‌یان دانا .

هەروەها بەخیلی‌یان ئەبرد بەپێغەمبەر لەدوو ڕووەوە : یەکەم کەخوا ئەوی هەڵبژاردوەو کتێبی بۆناردووە ـ چونکە گومانیان نەبوو لەڕاستی‌یا ـ دووەم کەبانگەکە ئاوەها بەزوویی بڵاوەی کردو کۆمەڵی گەورەی لێ کۆبۆتەوە .

بێجگە لەمەیش مەترسی‌یەکی گەورە تریان هەبوو : ئەوەیش‌یان دور کەوتنەوەیان لەکۆمەڵی مەدینەیی ، کەتا ئێستە لەڕووی بیری‌و ژیری‌و

بازرگانی پڕلەقازانجو لەسووی چەند قاتا ئەوان پێشەوایی‌یان بووە ، یان ئەبێ باوەڕ بەئیسلام بکەن‌و شوێن محمد بکەون‌و بتوێنەوە لەناو کۆمەڵی موسلمانەکانا . ئەم دوانەیش بەلای ئەوانەوە شیرینەکەیان تاڵترە .

لەبەرئەمانە هەموو جوولەکە هەڵسان بەوهەڵوێستە پیسەی کەقورئان لەزۆر سوورەتا بەووردی باسی ئەکا ، بەجۆرێ کەهەموو کەسێ تێ‌بگا تا چ ڕادەیەك پیس‌و ناپاك‌و پڕلەئاشوب‌و پیلان‌و ئاژاوە چین‌و ، . هتد .
ئەمانە هەر سروشتێن بۆیان ، هەرلەکاتی موسا پێغەمبەرەوە تا چاخی عیسا پێغەمبەرو تاکاتی محمدو هەتا هەتایە لەئێستەو لەمەودوایش بەرامبەری‌هەموو بانگێکی ئیسلامەتی‌و خوا پەرستی بەوشێوەیە ئەجوڵێنەوە ئەوخووانە لێ‌یان جیا نەبۆتەوەو جیاش نابێتەوە ، هەرکەسێ یا کۆمەڵێك بیەوێت هەڵسێ بە بڵاوکردنەوەی بانگی خوایی‌و ئیسلامەتی ئەبێ زۆر بەووردی ئاگای لە جوولەکەو دەس‌و پێوەندو شاگردو بەکرێ گیراوەکانیان بێ .

## مونافقەکانی مەدینە :

( مونافق ) یان دووڕو : بریی‌یە لەو کەسەی بەسەرزاری موسلمان‌بێ ، بەلام لەڕاستی‌و لەقولایی دڵیا کافرەو ناموسلمانە ، یاکردەوەی ناوموسلمانانە ئەکا ، ئەمانە لەگەڵ کۆچ کردنی پێغەمبەرا ( د . خ ) بۆ مەدینە پەیدا بوون ، ( منافق ) لەمەکەدا نەبوو ، چونکو ئیسلام لەمەکە دەوڵەت و و هێزو دەسەلاتی نەبوو ، بەڵکو کۆمەڵێکی ئەوتۆیش نەبووکە مەکەیی‌یەکان لێی بترسن و لەترسانا ئیسلامەتی پیشان بدەن و دوڕویی تیا بەکاربێنن بەڵکو بە پێچەوانەوە ـ وەکو زانیمان ـ ئیسلام لە مەکەدا چەوساوەبوو ، ئەوانەی موسلمان نەبوون ئەبوایە خۆیان بخستایەتە ناو مەترسی‌یەکی سامناکەوە لە ڕێگای باوەڕا هەموو زەحمەت و چەرمەسەرێ بەدڵ قبووڵ

بکردایە . دەی هەرکەسێ بەتەواوی موسلمان نەبوایە خۆی بە موسلمان پیشان نەئەدا بەڵام لەمەدانە ئیسلام بەهێزو خاوەنی دەوڵەتو دەسەڵاتەو هەموو ناموسلمانێ بلەرزێو ناچاربێ بەرێك کەوتن لەگەڵیا - بەتایبەتی دوای جەنگی بەدرو سەرکەوتنی موسلمانەکان تیایا - وەلەپێشەنگی ئەمانەوە هەندێ لەسەرۆكو گەورە خێڵەکان کەدەستو پێوەندو خێڵو هۆزەکانیان موسلمان بووبوون ، ئەمانە بۆئەوەی ئەوپلەو پایەیانە بمێنێتەوەو بەرژە - وەندییان لەناونەچێ بەناچاری وایان پیشان ئەدا کەوا موسلمانن‌و ئیسلامەتییان وەرگرتووە ، یەکێ لەوانە ( عبدالله ) کوری ( أبی ) ی کوری ( سلولی حزرج ) ی بوو ( أسید ) ی کوری (حضیر) لەرووداوێکا وتی بەپێغەمبەر : ئەی پێغەمبەری خوا گوێ مەدەرە بێشەرمی (عبدالله) ئەوە داخی لەدڵەو سەرۆکی لەکیس چووە ، کاتێ ئێوە کۆچتان کرد یا پەیمان لەخزمەتی تۆدا بەسترا کەکۆچ بکەیت لەوکاتەدا بریاری گشتی درابوو کەتاڵای بۆبچەقێنتو تاجی پاشایی بنرێت بەسەریەوە بەڵام بەکۆچی پرخێری ئێوە ئەوەی لەکیس چوو .

## بیرکردنەوە لەقورەیش‌و مەکە

پێغەمبەری خواو یارەکانی هەمیشە لەبیری قورەیشەکانا بوون . ئایا لەمەودوا ئەبێ هەڵوێستیان چۆن بێ لەگەڵیانا ؟ خۆئەوە کەعبەیەو ماڵی ( ابراهیم ) ی باپیریانەو جێگەی حەجی ئەوان‌و هەموو عەرەبە . ئایا ئەبێ واز لە (کعبە) و لەحەج بێنن ؟ یامەکە خۆی ئەوەتە پریەتی لە کەس‌و کاریان وزۆر لەسامان‌و ماڵیانی تیا بەجێماوە ، بێجگە لەوەیش نیشتمانیانەو جێگای باوو باپیریانە ئەبێ هەروا بەجێی بێڵن و نەیناسن‌و نەیانناسێ ؟ ئەی ئەبێ تاوبت پەرستە ستەمکارو زۆردارانەی ئەمانیان ئازار

داو دەریان کردنو بەشی زۆر لەماڵو سامانیان داگـیر کـردنو ماوەی سیانزە ساڵ بەربەرەکانی ئەوئایینو بانگەیان کردو بەرهەڵستی بڵاوبونەوەیان لەکرد ؟ ئایا ئەبێ ئاوا بەبێعارەق دەربچنو وازیان لێ بهێـنرێ کە ئێستەیش کۆسپ بنو نەیەڵن گرنگی بانگەکە بکاتە هۆزو تیرەعەرەبەکان؟ یان ئەبێ چارەیەکیان بۆبدۆزرێتەوەو لەگەڵی شەیتان بهێنرێتـە خوارەوە ؟ نابێ وازیان لێ بهێنرێ کەئێستەش بەرگری لەنەفامی بکـەن ورێـگە لە ئیسلام بگرن کەبەناو خێڵەکانا بڵاوبێتەوە ، بۆئەم مەبەسە بریاری پێغەمبەرو موسڵمانەکان هاتە سەر ئەوە چەند سریەیەك ، یەك لە دوای یەك بنێـرن بەملاولادا .

## سریەکانی (١) پێغەمبەر

پێغەمبەری خوا ( د . خ ) لەساڵی یەکەمی کۆچیدا ، واتە دوای جێ گیربوونی خۆیو یارەکانی لەشاری مەدینەدا کە شەش حەوت مانـگێ تێ پەڕی کرد بەسەر کۆچەکەیانا ، کەوتە ناردنی چەند سـریەیەك بەم لاو بەولاداو سەرۆکایەتی هەریەکەیانی دایە دەست پاڵەوانێکی کـۆچەری هەڵبژاردە .

هۆی گرنگو وورد بینی لەناردنی ئەم سریانەدا کورت ئەکرێتـەوە لە دووشتی گرنگا :

یەکەمیان ترساندنی قورەیشەکان لەئەنجامی گومڕاییەکەیان ومەترسی گەورە خستنە بەرچاویان . چونکی قورەیشیـەکان ئەوماوە درێژە دوژمنایەتی ئیسلامیان کردو ئێستە بەبێ پسانەوە دوژمنایەتی ئەکەنو لە سەر ئەوگومڕاییەیان ئەڕۆن . نایەڵن کەس لەمەکەیی موسڵمان بێ ، وە

(١) سریە : بریتییە لەپارچەیەك لەسوپا کەئەوپەڕی چوارسەدکەس بێ .

نایەڵن ئەم ئایینە لەهیچ کوێیەکا بحەوێتەوە ، لەبەرئەمە پێغەمبەر ویستی تێیان بگەیەنێ مانەوەیان لەسەر ئەوبارە تووشی زیانیان ئەکاو پەشیمان ئەبنەوە . خۆئێستەیش ئەوسا نیە ئەوان دەس درێژی بکەنو کەس کوێیان نەداتێ ، بەڵکو سوودی ئەوان لەمەودوا ئەوەیە کە رێـك بکـەون لەگەڵ موسڵمانەکانا ، ئەگینا خۆیانو سامانو بازرگانیو کاروانی شامیان ئەکەوێتە مەترسییەوە .

دووەم هۆ : تێگەیاندنی بت پەرستو جووڵەکەکانی مەدینەو عەرەبەکانی دەورو بەری ، کەموسڵمانەکان بەهێـزو خاوەن دەسەڵاتن وجیـاوازن لەو دەورەی لەمەکەدا بەبێ هێزیو لاوازی ئەژیان ، هەتاوەکو ترسیـان بچێتە دلی هەمولایەکەوەو کەس نەتوانێ خەیاڵی بەرهەڵسیو پەلاماردانیان بکات بەپێی فەرمودەی قورئان کەئەفەرموێ : ( وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ «١»

## سریەی یەکەم :

لەساڵی یەکەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ـ حمزە ـ ی مامی نارد بە (٣٠) سوارەوە لەکۆچەرییەکان بۆرێگەی کاروانی قورەیش کەلەشامەوە ئەگەڕایەوەو ( أبوجهل ) یان لەگەڵابو ، کە گەیشتنە قەراغی دەریای سوور لەناوچەی ( عیص ) دا بەرەنگاری یەکتر بوونو ویستیان لەیەکتر بدەن ، بەڵام (مجد)ی کوڕی (عمرو جهنی) کەهاوپەیمانی هەردو لایان بوو کەوتە نێوانیانو نەیهێشت لەیەك بدەنو بەبێ جەنگ هەریەکە بەلایەکا گەڕایەوە ، وەپێغەمبەر سوپاسی (مجد) ی کرد لەسەر ئەوناوبژییەی .

---

(١) سورەتی أنفال ئایەتی (٦٠)

## سریەی دووەم :

لەمانگی شەشەلآنی سالی یەکەما (أبوعبیدە)ی کوڕی (جراحی) نارد بەشەست سوارەوە بۆ سەر ڕێگای کاروانێکی قوڕەیش کە بەسەرۆکایەتی ( أبوسفیان ) بوو وەدووسەد سواری لەگەڵا بوو وەلەشیوی ( رابغ ) دا لەنزیکی دەریاوە بەیەك گەیشتن‌و کەوتنە تیرئەندازی کردن ، بەڵام بت پەرستەکان ترسان لەموسلمانەکان نەك خۆیان لەمەکۆ دابێ بۆیان شکانو هەڵاتن ، وەبەبێ کوشتار لەیەك جیابوونەوە . وە ( مقداد ) ی کوڕی ( أسود ) و (عتبە) ی کوڕی (غروان) کەموسلمان بووبوون ڕایان کردە ناویان .

## سریەی سێهەم :

لەمانگی ـ ذی‌القعدە ـ ی سالی یەکەما (سعد أبی وقاص ) لەگەل بیست سواردا چونە ڕێگای کاروانێکی مەکە ، بەڵام پێی نەگەیشتن‌و گەڕانەوە .

## کۆچی‌دوایی :

هەر لەسالی یەکەمی کۆچیدا لە کۆچەرییەکان ( عثمان )ی کوڕی ( مظعون ) کەبرای شیری پێغەمبەربوو کۆچی دوایی‌کرد ، و دوای ناشتنی پێغەمبەر فەرمانی‌دا بەردێك لەسەر گۆڕەکەی دابچەقێنن ( ئەمە بوە پیشە لە ئیسلاماو ئەوەتە هەمو گۆڕێ کێلی بۆ ئەکەن) وەفەرمووی : ( بەهۆی ئەو بەردەوە گۆڕەکەی ئەدۆزمەوە و هەرکەسێکم مرد لەلایا ئەینێژم » وە لە یاریدە دەرەکان ( أسعد ) ی کوڕی ( زرارە ) کە یەکێ بوو لە دوانزە نەقیبەکەو نقیبی ( بنی النجار ) ی خاڵوانی باپیری بوو کۆچی دوایی‌کرد ، وەپێغەمبەر خۆی بوو بەنەقیبیان چونکە خوشکەزا

بەکەس دائەنرێ . وە ( براء ) ی کوڕی ( معرور ) کە ئەویش نەقیبێك بوو ، وەقسەکەری ( بیعة العقبة ) بوو کۆچی دوایی کرد . وە لە بت پەرستەکانی مەکە ( ولید ) ی کوڕی ( مغیرە ) مرد ، کە کەوتە گیانەڵاو بێتاقەتی ئەکرد (أبوجهل) وتی : مامەبۆچی وانەکەی ؟ وتی : بەخواخەمی مردنم نیە بەڵام ئەترسم ئاینەکەی کوڕی (أبی کبشە) لەمەکەدا سەر هەڵ بدات ، (أبوسفیان) وتی : مەترسە من دەسەبەرئەبم کەنەیەڵم سەرهەڵبدا . وە (عاص) ی کوڕی (وائل السهمی) ش مردو موسڵمانەکان لەخراپەی ئەمانە ڕزکاریان بوو . .

## ساڵی دووەم :

### سریەی چوارەم :

وەلە مانگی سەفەردا لەساڵی دووەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ( د . خ ) ( سعد ) ی کوڕی ( عبادە ) ی کرد بەجێ نشین لەمەدینەدا و خۆی چوو بۆڕێگای کاروانێکی قورەیش ، بەرەو ( أبواء ) ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ( ودان ) بەڵام کاروانەکە تێپەڕیبوو ، وە لەوێدا پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ ( بنی ضمرە ) دابەست .

### سریەی پێنجەم :

وەلە مانگی مەولودی ئەوساڵەدا بیستیان کاروانێکی قورەیش لەشام ئەگەڕاوەتەوەو ( أمیە ) ی کوڕی ( خلف ) سەرقافڵەیە لەگەڵ سەد سوارا و ژمارەی کاروانەکە دووهەزارو پێنج سەد وشترە ، پێغەمبەر لەگەڵ دووسەدکەس ڕەیشتن بۆیان هەتا گەیشتنە ( بواط ) ، بەڵام نەیان گەیشتنێ ، چونکە کاروانەکە بەڕێگەی ئاسایی دا نەڕۆیشتبوو و لەکوێرە ڕێیەکەوە خۆیان دەرکردبوو .

## سریەی شەشەم :

وەلە مانگی ( جمادی الأولی ) داکاروانێکی قورەیشی دەرچوو کە هەموو مەکەیی هاوبەش‌بوو تیایا ، وەبە سەرۆکایاتی ( أبوسفیـان ) ی کوڕی ( حرب ) بوو ، پێغەمبەر کـە بەمەی زانی ( أبوسلمه ) کوڕی (عبدالأسود) لەجێی خۆی لەمەدینە داناوخۆی لەگەڵ دوسەد کەسا ڕۆیی بۆ ڕێگاکەیان هەتا گەیشتنە ( عشیرە ) لـە ( بطنی ینبع ) لەوێدا دەوری دوو مانگ مانەوە چاوەڕێی کاروانەکەیان ئەکرد ، بەڵام کاروانیـــان دەس‌نەکەوت ، لـــەوێدا لەگەڵ ( بنی صدلج ) و ( بنی ضمره ) ی هاوپەیمانیانا پەیمانی دۆستایەتی بەست و گەڕایەوە .

دوای گەڕانەوەیان لە ( عشیرە ) زۆری پێ‌نەچو (کرز) ی کوڕی ( جابر الفهری ) کە هاتوچۆی ناومەکەو قوڕەیشەکانی ئەکرد لە ناکاوێکا دای‌بەسەر ڕان‌و وشترو مەڕی مەدینەداو بردی ، پێغەمبەر (زید)ی کوڕی ( حارثەالأنصاری ) کرد بەجێ نشین لـەمەدینەداو خۆی چوو بە شوێنیـا هەتا گەیشتنە شیوی ( سفوان ) لە نـاوچەی ( بدر ) دا ، بەڵام فریایان نەکەوتن و ( کـرز ) دەرچو بوو ، وەبەم دەرچونە ئەڵێن : جەنگی یەکەمی ( بدر ) .

## سریەی حەوتەم :

وەلە مانگی (رجب) ی ساڵی دووەما پێغەمبەری خوا ( عبدالله ) ی کوڕی ( جحش ) ی لەگەڵ کۆمەڵێ لە کۆچەریەکانا نـامەیەکی دایەو فەرمووی : ( هەڵی‌مەپچڕەو سەیری مەکە هەتا دوڕۆژ بەرێ ئەڕۆن ، لـەوێدا کە کرتەوە زۆر لـە کەس مەکە و هەرکەس ئارەزووی نەبوو مەیبە لەگەڵ خۆتا . کە پاش دوڕۆژ ڕۆیشتن نامەکەی

هەڵپچڕێ دی نووسرابوو : « کە سەیری ئەم نـــامەیەت کرد بڕۆ هەتا ئەکەنە (نخلە) (١) لەوێدا چاودێری قورەیش بکەو هەواڵیان بزانەبۆمان» ئەویش هاوڕێکانی تێ گەیاند کە بە زۆرکەس نابات ، هەموویان ڕۆیشتن بێجگەلە ( سعد ) ی ( ابیوقاص ) و ( عتبە ) ی کوڕی ( عزوان ) کە وشتریان گوم بووبوو بۆی ئەگەڕان ، قورەیش پێیان زانین بەدیل بردنیان ( عبداللە ) و هاوڕێ کانی ڕۆیین هەتـاگەینە ( نخلە ) لەوێدا کاروانێکی قورەیش بەسەرۆکایەتی (عمرو) ی ( الحضرمی) تێ پەڕی ، وەئەو ڕۆژەیش دواین ڕۆژی مانگی ( رجب ) بوو کە یەکێکە لە مانگە قەدەغەکراوەکان ( الأشهر الحرم ) لێرەدا هەرچەندە فەرمانیـان پێنەدرا بوو بەتالآن یـا بەکوشتن و تەنیا بۆ چاودێریو هەواڵزانین نێرابون ، بەلآم کەبیری ئەو هەموو کارەنالەبارەی قورەیشیان کردەوە کە دەربـارەیـان کراوە کەوتنە ڕاوێژ لەناو خۆیـــانا بۆ دەس وەشـــاندن لەوکاروانە ، وەلەناو خۆیانا وتیان : «ئەگەر دەسیبۆ نابەینو لێیان ناسێنین ئەمشەو خۆیان ئەگەیەننە حەرەمی . مەکەو لەکیسمان ئەچێ ، وە ئەگەر پەلاماریان ئەدەینو جەنگیان لەگەڵ ئەکەین ئەبێتە جەنگ لەمانگە قەدەغەکانا » لەمەدا دودڵ بوون ، بەلآم لەئەنجاما دڵیان هاتەسەر پەلاماردانیان و بڕیاری تالآن کردنیاندا (عبداللەالحضرمی) یان کوشتودوانیان لێ بەدیل گرتنو کاروانەکەیان هێنا ... کە هاتنەوەو هاتنە خزمەتی پێغەمبەر و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە ، فەرمووی : من پێم نەوتوون جەنگو هەرا بکەن لـە مانگی قەدەغەدا وە کاروانو دیلەکانی ڕاگرت . عبداللەو کۆمەڵێ پەشیمانبونەوە لەکردەوەکەیان

---

(١) کە لەنێوانی مەکەو طائف دایە .

بت پەرستەکان ئەمەیان بەھەل زانی و وتیـان : محمد و یارەکانی رێزی مانگەقەدەغەکانیان نەکرت و جەنگیان تیاکردو پیاویان کوشت ، وە لەم رووەوە قیرەو قرەی زۆریـــان کرد ، هەتا قورئـانی پیرۆزهاتە خوارەوە بومەرامـی عبدالله‌و هاوەڵەکانی و دەمکوتی کافرەکانی کردو فەرموی :
«یسألونك عن الشهر الحرم قتال فيه ، قل قتال فيه كبير وصد عن سبيل الله وكفر به والمسجد الحرام وإخراج أهله منه أكبر عندالله والفتنة أكبر من القتل ، ولايزالون يقاتلونكم حتى يردوكم عن دينكم إن استطاعوا» سوورەتی ( البقرە )

موسڵمانەکان بەمەدڵشاد بون و پێغەمبەر کاروان و دیلەکانی وەرگرت قورەیشەکان داوای بەردانی دیلەکانیـــان ( عثمان ) ی کوڕی ( عبدالله المخرومی ) و ( حکم ) ی کوڕی ( کیسان) یان ، کرت کە تۆڵە یان بۆبدەن بەڵام پێغەمبەر فەرمووی : بەتۆڵە بەریان نادەم هەتا دوهاوەڵەکەمان : ( سـعد وعتبە ) نەیەنەوە ، چونکو ئەترسین بیـانکوژن ، ئەگەر ئێوە ئەوانتان کوشت ئێمە یش ئەمان ئەکوژین .
قورەیشەکان ( سعد و عتبە ) یان ناردەوە ، پێغەمبەریش ئەوانی بەرەڵا کرد . ( حکم ) موسڵمـان بوو لە مەدینەدا دانیشت هەتا لەرۆژی بیری مەعوانەدا بەشەیدی مرد . بەڵام عثمان رۆیشتەوە بۆمەکە لـەوێ لەسەر دینی باوباپیرانی مرد ، وە پێغەمبەریش تالانەکەی دابەش کرد بەسەریانـا بەپێی یاسای تالانی جەنگ .

## گێرانی کەعبەبە قیبلە

شانزە مانگ بەسەر پێغەمبەرا تێپەری لە مەدینەدا لە نوێژا رویان ئەکردە ( بیت المقدس ) پێغەمبەر بـەدل وای پێخۆشبوو کە ( کعبە )

بیێته « ڕوگەیـان ( قیبلە ) وەلەمەکەدا هەرچەند ڕویان ئەکردە ( بیت المقدس ) بەلاَم بەجۆرێ وەستان کەڕویان لەکەعبەو ( بیت المقدس )بێ ، لەوماوەیەدا هەمووجارێ چاوی ئەگێڕا بەئاسماناو داوی لەخوا ئەکرد ( کعبە ) بکاتە ڕووگەیان ، وە لە کاتێکا لەنوێژا بوون خوافەرمانی پێ کردن ڕووبکەنە (کعبە) ئەویش ڕووی وەرگێڕا بۆ ( کعبە ) و نوێژکەرەکانیش لەگەڵیا ڕوویـان تێ کرد : « قَدْنَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ، فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ، فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ »[1] خوای پەروەردگـار بەم ئایەتە دڵـی خۆش کردو پێی ڕاگەیان که ڕووبکەرە ئەو قیبلەیەی ئەتەوێ ڕووی تێ بکەی ، ڕووبکەرە کعبە ، لەمەولا لەهەرکوێیەك بوون ڕووبکەنە ئەوێ .

لێرەدا جوولەکەکان ئاگریان تێ بەربوو کەوتنە درۆو دەلەسەو گومان پەیاکردن لە ئیسلام و پێغەمبەرو لەقورئان ، لەپێشەوە تا (بیت المقدس) ڕووگە بوو ئەیانووت : ئایین ئاینی ئێمەیەو ئەوەتە محمد و هاوڕێکانی لە نوێژا ڕووئەکەنە ڕووگەکەی ئێمە ، دەی هەقی‌وایە هەربەتەوای بێتەسەر ئـــاینەکەی ئێمەو ئیتر ئەم ئایینەی محمد هێناویەتی چی‌یە ؟ وەیان ئەیانوت : ئەمەمانای وایە کە ئەم ئاینەی محمد دەس‌هەڵبەستەو لەلای خواوەنەهاتووە چونکە ئەگەر ڕووگە ( کعبە ) یە ئەبێ نوێژی ئەم چەند کاتەی پێشویان دروســـت نەبێ ، وە ئەگەر ( بیت المقدس ) ڕووگەیە ئەمەی‌تریان دروست‌نیە ، کەوا شتێکی بێ‌بایەخ و دەســت کردی محمد خۆیەتی ، هەتـا خوا بەم ئایەتە دەم‌کوتی کردن : « سَيَقُولُ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ مَا وَلَّاهُمْ عَنْ قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُوا عَلَيْهَا ؟ قُلْ لِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (١٤٢) وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى

النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنْتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَنْ يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّنْ يَنْقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِنْ كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ . . . » البقرة - ١٤٣

## ڕۆژووی ڕەمەزان :

لەمانگی ( شعبان ) ی سالی دووەما خوا ڕۆژووی لەسەر موسلمان پێویشت کرد ، لەوەپێش مانگی سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبوون

## زەکاتو سەرفطرە :

هەر لەم ساڵەدا سەرفطرە و زەکاتی مالی پێویســـت کراو ئایەتی قورئان هاتەخوارەوە و پێغەمبەر بەجوانی بۆی باس کردن .

## بەشی حەوتەم : لەجەنگی بەدری گەورەوە تاجەنگی ( أحد ) :

## لەمەکەدا جەنگ نەکرا :

پێش ئەوەی بچینە ناو جەنگی بەدرەوە هەندێ لەوە ئەدوێن کەبۆچی لەماوەی ژیانی مەکەدا موسلمانەکان لەگەل دوژمنەکانی خوادا نەجەنگان؟

لەوەلاما ئەلێن : ماوەی سیـانزە سالی مەکە موسلمانەکان جەنگ و هەرایان نەکرد ، بەلکو داوایـان لێ کرا کە نەجەنگن و بە ئـارامبن و خۆیان لەبەربـاری گرانا ڕابگرن ، ئـەمەیش چەند هۆیەکی هەبوو : یەکەم : بەهۆی شمشێری بەرەی ( هاشم ) ەوەە تـاڕادەیەك بانگەکە ئەپارێزرا و بلاو ئەکرایەوە . ئەو مـــاوەیە ماوەی پەروەردەکردن و ڕام هێناو ئامادەکردنو خۆگرتنو فێرکردنی دەروون بوو بەهەموشێوەکانی ئازارو نارەحەتیو قوتابخانەیەکی کردەوەیی بوو بۆ دەرکردنی پالەوان و بلیمەت و جوامێرەکان ، سێیەم بانگ کردنی بەئاشتی لەشوێنێکی وەك ناو قورەیشەکانا باشتر تینی ئەکردو بلاو ئەبۆوە ، چونکە ئەگەر جەنگوهەرای

بۆبگرایە ئەبووە رقەبەری دوژمنایەتی‌و دەمـــارگیری خێلایەتی چوارەم جەنگ‌و هەرالە هەموومالێك پەیانەبێ ، چونکو لەوێدا دەسەلاتێکی‌نیزامی نەبوو بۆئازاردان و چەوسانەوە ، بەلکو ئازاردنی هەرکەسێ درابووە دەســـتی کەس‌وکاری ، وەئیزنی‌دانی جەنگ لـەم کاتەدا ئـەبووە هۆی پەیـابونی هەر لە ناو هەموو خێزانێکاو ئەوکاتە پالاتەی زۆریان‌دەربارەی ئیسلام بلاوئەکردەوە ، خۆبێ‌ئەمە ئەیانوت ئایینەکەی محمد جیاوازی و دووبەرەکی ئەخاتە ناو خاوخێزانەوە . پێنجەم ئەوەبو خوای گەورە ئەیزانی زۆر لە ڕ دل ڕەقانەلەدوایدا موسلمـــان ئەبن و ئەبنەسەربازو پالەوانی ئیسلام ، ئایا ـ عمر ـ یەکێ‌لەوانە نەبوو ؟ .

وەدیسـان سروشتی عەرەب لەیاسای خێلایەتی‌یا وابوو هەل‌ئەسـان لەدژی زۆرلێ‌کراووچەوسـاوە بەتایبەتی ئەگەر لـەبەرەبابی بەڕێزبوایە ، ئاوەنەبوو پەیمـــانی ( فضول ) یان بەست ؟ یا ( إبـن الدغنه ) نەی هێشت ـ أبوبکر ـ دەربکرێ ؟ وەئەوە بوو پەیمانی دەنگ دابڕینیان‌هەل وەشانەوە . دیسان ژمارەی موسلمانەکان کەم بوون و هەربەتەنیا لەمەکەدا بوون،ئەگەرلێرەداجەنگ بەرپابکرایە لەوانە بووقورەیشەکان هەموولایەکیان لێ‌ڕاست بکردنایەوە و هەموویان لەناوبردنایەو ئیسلامەتی بکوژایەوە ،

ئەمەهەندێ لەهۆیەکانی جەنگ نەکردن بوو لەمەکەدا ، وەهەروەهـا لەسەرەتای مەدینە شاجەنگ نەکرا هەتا پێغەمبەر ( د . خ ) یەکێتی‌یەکی تەواوی لەمەدینەو دەوروبەریا پێك‌هێنا و پەیمانی لەگەل بت‌پەرستەکان‌و جوولەکەکانی مەدینە و دەوروبەریا بەســـت و خۆی یەك‌چاوکردەوە بۆ قورەیشەکان‌و ئیتر هیچ هۆیەك نەمـا بۆئەوەی دابنیشن و لەجەنگ کردن خۆیان بدزنەوە و جەنگ دەسـی‌پێ‌کرد ، وەیەکەم جەنگ کراجەنگی

گەورەی بەدربوو .

# جەنگی بەدری گەورە :

سریەی ( عبداللە ) ی کوڕی ( جحش ) بوو بەهۆی گۆڕانی ڕامیاری ئیسلام ، وەئیسلامی خستەچەقی چواردە ڕێیان . ( عبداللە ) ی کوڕی (عمرو) کوژراو بووبە یەکەم خوێنێ کەڕژا لەئیسلاما وەچەند ئایەتێ بەو بۆنەیەوە هــاتەخوارەوە وە بەدوای ئەوا ئیزنی جەنگ لـەگەڵ ئەوانەدا دراکەئازاری موسڵمانان ئەدەن و ڕێگە لە بڵاوبونەوەی ئیسلام ئەگرن، وەقورەیش‌و موسڵمانەکان ڕایان لەگەڵ یەکا گۆڕا . . موسڵمانەکان بیریان لەوە ئەکردەوە : چۆن ئەوسـامانو مـاڵەیان لەقورەیشەکان بسـێننەوە ؟ وەقورەیشەکانیش کەوتنە هاندانی هەموو نیوە دورگە لە محمد و یارەکانی بەوە کەلەمانگە قەدەغە کراوەکانا جەنگیان کردووە وخوێنیان ڕشتـوە ، پێغەمبەر لێی ڕوون بوو تازە هیوای ڕێ کەوتن لەگەڵ قورەیشا نەماوە .

پێغەمبەرو موسڵمـانەکان زانی‌یـان کەکاروانێکی گەرەی قورەیش سامانی هەموو قورەیشی‌یەکانی واتیاو بریتی‌یە لـە هەزار وشتر بە بـاری گران بەهاوە و ( أبوسوفیان ) سەرقافڵەیەو پـاسەوانەکانی سی‌یـاچل پیاو زیاترنین ، وا ئەو کاروانە لە شـــامەوە ئەگەڕێتەوە ، وەئەویش هەر ئەو کاروانە بوو پێغەمبەر ( د . خ ) چوەڕێکـای لـە ( عشیرە ) ی زانیان تێ‌پەڕیوە گەڕانەوە ؛ وەهەرلەوکاتەوە بڕیاریان‌دا لە گەڕانەوە یالێی‌بدەن هەتا ئەمە ببێتە تۆڵەی ماڵو سانی کۆچەریەکان کە لە مەکە جێ‌مـاوە و قورەیشەکان داگیریان کردەوە ، کە زانی‌یان کاتی گەڕانەوەی کاروانەکە هـاتووە پێغەمبەر ( طلحە ) ی کوڕی ( عبیداللە ) و ( سعدی ) کوڕی ( زید ) ی نارد کە چاودێری بکـەن و هەواڵیان بدەنێ ، ئەوانیش

ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ( حوراء ) (١)و لەوێ لای( کشدالجهنی ) دابەزین بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ هەتا کاروانەکە گەڕایەوە ، خێرا بە پەلـە هاتن بۆئەوەی ئەمهەواڵەبدەن پێغەمبەرو موسڵمانەکان بەڵام پێغەمبەر(د.خ) نەوەستاهەتائەوان ئەگەڕێنەوە ، چونکو زانیان کاروانەکە زۆرگەورەو بەلێشاوە سەرمایەکەی بەپەنجا هەزار دینار دائەنرێ ، لەوەترسان ئەگەر چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەوان بکەن کاروانەکەیان لەدەس ئەچێ هەروەك لەمسەرەوە لەدەستیانچو ، لەبەرئەمە موسڵمانەکانی هانداو فەرموی : « ئەوە کاروانی قورەیشە بڕۆن بۆی بەڵکو خوای گەورە بیخاتە دەســتان »وەزۆری لە کەس نەکرد بۆ ڕۆیشتن بەڵکو خســتیە ئارەزووی خۆیانەوە ، هەندی خۆیان بۆ ئامادەکردو هەندێتر گوێیان نەدایە ، چونکو نەیانزانی پێغەمبەر تەمای جەنگانێ هەیە ئەوەتە زۆر بەگرنگ نایگرێ ، هەتـا فەرمووی : « کێ وڵاخی ئامـادەیە و لەماڵایە سواربێ وەنەوەستا بەدیاری ئەوانەی وڵاخەکانیان لەدەرەوە لە لەوەڕکابوون . وەکۆمەڵێکی ناموسڵمان ویستیان بەتەمای تاڵان بڕۆن لەگەڵیانا ، بەڵام پێغەمبەر نەیهێشتو فەرمووی: نابێ بێن مەگەر موسڵمان بن‌و بـاوەڕ بەخواو پێغەمبەری خـوا بێنن . پێغەمبەری (د.خ)لەگەڵ سێ سەدو سیانزە (یاحەڤدە)کەس کەوتنەڕێ لەڕۆژی هەشتەمی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیدا . هەشتاو شەش کەسیان کۆچەری و شەست و یەکیان لە ( أوس ) ی و ئەوانیتریان ( خزرج ) ی بوون . وەکەمێ ( أوس ) ی یەکان بەهۆی ئەوەوەوە بوو کە ماڵیان لەسەراوردی مەدینەوە بوو هەواڵەکایان نەزانیبوو وڵاخیان لە مـاڵانەبوو ، وەداوای خۆ ئامادەکردنەکەیش کوت‌وپڕی بوو ، پێغەمبەریش فەرمووی : « کەس لە

---

(١) جێگایەکە ٣٠تا ٤٠ میل لەخواروی ڕۆژئاوای مەدینەوەیە .

پاشان نه یەت بەشوێنمانا » وەکۆمەڵێك وتیان ولاخەکانمان والەوپشتەوە بوەستێن لەڕێمان تا ئەیان هێنینەوە . بەلام نەوەستاو ئەرە-ووی : نابێ وەخۆیان بۆجەنگ ئامادە نەکردبوو بەتەمای هەرا نەبوون تا بەرێك وپێکی بچن بۆی . ئەم سوپا بچکۆلەیە کەوتەڕێ بـەخێرایی هەتا کاروانەکە نێنەپەڕێو ئەوهەلەیـان لەکیس نەچێ ، وەهەر شوێنێ ئەچون هەواڵیـان ئەپرسی .

أبوسفیـان بیستبووی کەلە ڕۆیشتنیـانا محمد و یارەکانی هاتوونەتە ڕێیان و فریایان نەکەوتون ترســـا لە گەڕانەوەیا ڕێیان پێبگرن ، لەبەرئەمە کەوتە هەواڵ پرسین لە هەموولایەکەوە ، وە لە ئەنجاما بۆی دەرکەوت کە هاتونەتە ڕێگەی ، خۆ ئەویش سیچل کەسی لەگەلایە ، مانای وایە خۆی و کاروانەکەی و سامانەکەیان جێگای بیمەو تیـاـئەچن بەجارێ ، لەبەرئەمەمەـات ( أبوضمضم الغفـاری ) بەکرێ گرت و بەپەلە ناردی بۆ مەکە هەتا بکەن بەفریای ماڵو سامانەکەیان و هەواڵیان بداتێ کە محمد و هاوڕێکانی هاتونەتەڕێی . . کە ( أبوضمضم ) نزیك بوەوە هەردوو گوێی وشترەکەی بڕی و لوتی قرتان و زینەکەی پاش و پێش کردو بەسەریەوە وەستاو کراسەکەی دڕاندو هاواری کرد : ئەی جەماهیری قوڕەیش ئەی بەرەی (لوئە) ی کوڕی غالب کاروانەکەتـان ، فریای کەون محمدو هاوەڵەکانی هاتوونەتە ڕێی ، هەیهاوار ، بەخوا باوەڕ نـــاکەم بیگەنێ ، قوڕەیشەکانیش وەکو شتێ دڵیـان خەبەربدا هەرلە خۆیانەوە بێتاقەتییان ئەکردو گوێ قولاخ بوون بۆ هاتنی کاراونەکەیان ، کەئەمەیان بیست ئاگریان تێبەربوو ( أبوجهل ) کە بەمەیزانی کردی بەهەلاو کەوتە بانگ کردنی قوڕەیشەکانو هاندانیان .

هەندێ لەقورەیشەکان هەستیان ئەکرد بەوهەمو زۆرو ئازارەی قورەیش دەربارەی موسلمانەکان و بیری ئەو هەموو نارەوایی‌یانەیان ئەکردەوە و دوودڵ بوون : بڕۆن بۆ ڕزگارەکردنی کاروانەکەیان یاخود دانیشن و گوێ‌ی نەدەنێ ، وەلەلایەکی ترەوە بیریان لەوە کردەوە کە لەگەڵ (کینانە) دا دوژمنایەتی‌یان هەیە ، ئەترسان ئەگەر بڕۆنەسەر محمد بۆ ڕزگارکردنی کاروانەکە لە پشتەوە ( بنی بکری لە کینـــانە ) لێیاندەن وتیابچن وە لەوانە بوو ئەم ڕایە ســـەربکەوێ ئەگەر ( مالیك‌بن جعشم المدلجی ) نەهاتـایەو بڵێ : من پەنـاگیریتان ئەبم لەلایەن کینانەوە ، لێرەدا قسەی ( أبوجهل و عامر کوڕی الحضرمی و نضری کوڕی حارث و عقبەکوڕی ابی‌معیط . . . ) سەرکەوت ، وەکەسێ‌نەما کەتوانای جەنگی‌بێ‌و نەڕوات یایەکێ لە جێگـای خۆی نەنێرێ ، وەلە سـەرۆکەکانی قورەیش کەس نەما نەڕوات بێجگەلە ( أبولهب ) کە ( عاص کوڕی هشامی کوڕی مغیرة )ی بەکرێ گرت‌و ناردی ، وەدەسەڵاتدارەکان یارمەتی کەم دەستە کانیان ئەداو ئەیانخستنەڕێ ، (سهیل کوڕی عمرو) وتی‌ئەی بەرەی غالب ئایا ئێوە لە محمد و شێتەکانی هاوڕێ‌ی ئەگەڕێن ماڵ‌و کاروانەکەتان داگیربکەن ؟ کێ‌ماڵی ئەوێ ئەوە ماڵ و کێ هێزی ئەوێ ئەوەهێز . وە ( أمیەی کوڕی أبی سـلط ) بە هۆنراوەیەك سەنـای کرد ، وە ( نوفلی کوڕی موعاویەی دیلی ) چوبۆلای دەســـەڵات دارەکان تاســـوپاکە بەسامانیان ڕێك بخەن (عبدالله کوڕی أبی ربیعە ) وتی : ئەوە پێنج سەد دینار ، دوسەد سێ‌سەد دینارێکی لە(حویطبی کوڕی عبدالعزی) وەرکرت وە ( طعیمەکوڕی عدی ) بیســت وشـتری‌دا . ( عداس ) : بـەندە کاورەکەی لـە سـەفەری ( طائف ) دا بەخزمەتی پێغەمبەر گەیشت بوو

ویستی (شیبەو عتبەی کوڕی ربیعەو عاصی کوڕی متبیە) پەشیمان بکاتەوە لەڕۆیشتن ، وە ( أمیە کوڕی خلف یش بڕیاری دابوکە دانیشێ ، وە ( ضمضم ی کوڕی عمر و ) لە خەوادی شیوی مەکە لە سەرو خوارەوە پڕ بووە لە خوێن ، وە ( عاتیکەی کچی عبدالمطلب ) یش خەوێکی وای دیبو لەبەر ئەمە زۆر لەخاوەن ڕاکان ڕۆیشتنیان بەلاوە خراپ بوو ، بەلاَم ( أبوجهل و عقبە و نضر ) و هەندێ تـر ناچاریان کردن بەڕۆیشتن . أمیە پیاوێکی پیری ورگنی گەورەبوو (أبوجهل) کلو کلدانی بۆهێناو وتی : فەرموتۆ ژنی چاوت بڕێژە ، وە (عقبە) بوخوردانێکی بۆهێناو بوخوری تێ کردو وتی : فەرموو تۆ ئافرەتی قاچ بەم بوخوردانەدابکرە . أمیەش ڕقی داهات وتی : برۆن باشترین وشترم بۆ بکڕن ، بەم پێیە سوپای قورەیشی یەکان کەوتەڕێ . ژمارەیان نۆسەدو پەنجا کەس بوو ، سەد ئەسپیان پێ بوو بۆ جەنگ لەگەل حەوت سەد وشترا بۆ سواری ، وە ژنانیان هێنابوو بەدەف و دەهۆل لێ دان و گۆرانی وتنەوە کەوتنەڕێ

وە پێغەمبەر و موسلمانەکانیش لەم لاوە کەوتنەڕێ ئەیانویست هەواڵی کاروانەکە بزانن و ئاگایان لەم سوپا گەورەیەی قورەیش نیە . وەموسلمانەکان دوو ئەسپ و حەفتا وشتریان پێ بوو ، هەردوان و سیانیـان بەنۆرە سواری وشترێك ئەبوون ، ( أبولبابة وعلی کـوڕی أبی‌طالب و پێغەمبەری خـوا ) هاوەلی یەك بوون و پێیان وت ئێمە بەپێ ئەڕۆین و تۆ سوار بە . فەرموی: نەئێوە لەمن بەهێزو تەواناترن و نەمن لەئێوە لەپاداشتی خوا بێ ئاتاج ترم وە ( عبدالله ) ی کوڕی ( أم مکتوم ) ی کرد بەجـێ نشین لەمەدینەدا ، وەدوو ئالاَی ڕەشیان هەلکردبوو . هاتن تا گەیینە ( زفـیران ) ولەوێدا خستیان ، وەهەرلەویا هەواڵیان بۆهات کەقورەیشی یەکان هاتوون بەهاواری کاروانەکەیانەوە ، وەبەمـە ڕووی داستانەکە کـــۆڕا ، ئەوسا بەتەمای

کاروانێك بوون کەسی یا چل کەسی لەگەڵابێ ، ئێستە وا کەوتنە بەردەم سوپایەکی گەورەی قورەیش ، خۆئەگەر ئەمان کاروانەکەیش لەئەبوسفیان بسێنن . قورەیشەکان بەوسوپایانەوە پێیان ئەگەن‌و لێیان ئەسێننەوە !! یا هەردوولا تیا ئەچن . لێرەدا پێغەمبەر کەوتە ڕاوێژ لەگەڵ یارەکانیا ، چونکە ئەگەڕێتەوەو گوێ ناداتە کاروان‌و قورەیش ، لەلایەکەوە قورەیشەکان ئەکەونەوە ئازاردان‌و ڕێ پێ‌گرتن‌و چەوسانەوەیان لەهەرکوێ دەرکەون ، وەجوولەکەو بت پەرست‌و دوو ڕووەکانی مەدینەیشیان لێ ڕاست ئەبنەوە . پێغەمبەر فەرموی : « موسڵمانەکان خوا بەڵێنی داومێ کەیەکێ لەو دوانە مان دەس ئەخا : «کاروانەکە یا قورەیشەکان » ئەوانیش وتیان بۆچی باسی سوپای قورەیشت بۆنەکردین هەتا خۆمان بۆئامادە بکردایەو ئەو موسڵمانانە ئەیش لەمەدینە ماونەتەوە بهاتنایە ؟ وەپێیان خۆشبوو تووشی کاروانەکە بوونایە نەك سوپای قورەیش چونکو بەتەمای جەنگ نەهاتوون‌و نازانن پەنجەی قەدەر نەخشەیەکی تایبەتی‌یان بۆ ئەکێشی وەقورئان لەم باسەدا ئەفەرموێ : ( كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقاً مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ ، يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ وَهُمْ يَنْظُرُونَ ، وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ ، لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ) « الانفال » ٥ - ٨

ئنجا ( ابوبکر ) و ( عمر ) هەریەکە وتارێکی جوانیان داوپێغەمبەریش ( د . خ ) دوعای خێری بۆکردن ، پاشان ( مقداد ) ی کوڕی ( عمرو ) هەڵساو وتی : ( ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە بڕۆ کەخـــوا پیشانی داوی ئێمە لەگەڵتاین ، بەخوا ئێمە پێت ناڵێین وەکو بنی ( اسرائیل ) ی

کەوتیان بەموسا : بڕۆ خۆتو خواکەت جەنگ بکەنو ئێمە لێرەدا دانیشتوین ، بەڵام ئێمە ئەڵێین : پشت بەخوا جەنگ بکەو ئێمەیش لەگەڵتاین ، بەوخوایەی تۆی بەڕاستی بۆناردوین ئەگەر بمانبەیت بۆ(برك الغماد ) « شوێنێکە لەسەرووی یەمەنەوە » دێین لەگەڵتا بە هەرجۆرێ خۆی ئەگەیەنێ . پێغەمبەر دوعای خێری بۆ کردو فەرموی : جوانت وت . ئیتر خەڵکەکە بێدەنگ بوون . پێغەمبەر فەرمووی : ڕاوێژم بۆ بکەن ، مەبەستیشی یاریدەدەرەکان بوو چونکە ئەوان زوربەی خەڵکەکە بوونو لەکاتی خۆیا لە ( عقبە ) پەیمانیان دابووێە کەبیپارێزن وەکو ماڵو منداڵیان ولەپەیمانەکەدا ئەوەی تیا نەبوو کەلەدەرەوەی مەدینە جەنگی بۆ بکەن . کاتێ مەدینەیی‌یەکان زانیان مەبەستی ئەوانە (سعدی کوڕی معاذ) کەخاوەنی ئاڵاکەیان بوو لای کردەوە بەلای پێغەمبەرەوەو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەڵێی مەبەستت ئێمەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ . سعد وتی : ئێمە باوەڕمان پێ کردویت وبەڕاستت دائەنێین وشایەتیمان داوە کەهەرچیت هێناوە ڕاستە ، وەلەسەرئەوە پەیمانمان داوێتێ کەبیبیستینو گوێ ڕایەڵی بکەین . ئەی پێغەمبەری خوا بڕۆ بۆهەرکوێ ئەڕۆیت ئێمەت لەگەڵاین. بەوخوایەی تۆی کردوە بەپێغەمبەر ئەگەر بمان نێریتە ناو ئەو دەریایەوەو خۆت بخەیتە ناویەوە لەگەڵتا خۆئەخەینە ناویەوەو یەك کەسمان لێ دوا ناکەوێ ، وەئێمە پێمان ناخۆش نیە ئەگەر سبەینێ بمانگەیەنیتە دوژمن ئێمە زۆر بەئارامین لەکاتی جەنگاو ڕاستین لەکاتی بەیەك گەیشتنا ، هیوامان بەخوا وایە کەلەئێمەوە شتی وات پیشان بدا چاوتی پێ ڕۆشن بێتەوە ، ئنجا فەرمووی : « دەبا بڕۆین لەسەر بەرەکەتی خوا »

لەوانەبو سعد لەوتارەکەی نەبێتەوە پێغەمبەر ڕوی گەش بووەوەو

نیشانەی شادی لێوە ئەبینرا و فەرمووی : بڕۆن ، مژدەتـــان لێبێ خوا بەڵێنی داومێ بەیەکێ لـەودوانە . بەخوا ئەڵێێ چاوم والەشوێنی کەوتنی قورەیشەکانەوە . بەم فەرموودەیە خەڵکەکە لێیـــان ڕوون بوو تووشی جەنگ ئەبن و کاروانیان دەس ناکەوێ ، بەڵام سەرکەوتوو ئەبن ، بەخێرایی هەڵسان و کەتنەڕێ وە لەوکاتەوە پێغەمبەر ئاڵای هەڵکرد : ئاڵایەکی دایە دەس ( مصعب ) ی کوڕی ( عمیر ) وە دوئاڵای ڕەش یەکێکیـان بۆ ( علی ) و ئەوی تریان بۆ ( سعدی ) کوڕی ( معاذ ) وەچەکیان خستە دەر هەتا نزیکی بەدر (١) بونەوە ، لەوێدا خۆی بە سواری وشترەکەی ڕۆیی هەتاگەیشتە پیاوێکی عەرەب کەوتە پرسیـاری قورەیش و محمد و یارەکانی لێی ، وەبۆی دەرکەوت کـە کاروانی قورەیش نزیك بۆتەوە . خێراهاتەوە ناو هاوەڵەکانی ( علی ) کوڕی (أبی‌طالب ) و (زبیر) ی کوڕی ( عوام ) و ( ســعد ) کوڕی ( أبی وقاص ) ی لـەگەڵ چەند کەسێکا نارد بۆ سەر ئاوی بەدر هەتا هەواڵی بۆ بزانن ، زۆری پێنەچوو هاتنەوە و دووزەلامیان هێنا بوو ، لەوکاتەدا پێغەمبەر نوێژی‌ئەکرد ، لێیان‌پرسین ئێوەچین ؟ وتیان : بەندەی قورەیشین و ئاوکێشن ، لێیان دان وتیان : ئاوکێشی ( أبوسفیان ) ین ئنجا لێیان گەڕان پێغەمبەر لـە نوێژەکەی بوەوە و فەرمووی : کەڕاستیان ئەکرد لێتان‌دان و کە درۆیان ئەکرد لێیان گەڕان . ڕاست ئەکەن ئـاوکێشی قورەیشەکانن . ئینجـا کەوتە پرسیارکردن لێیان : قورەیشەکان وان لەکوێ ؟ وتیان : وان لەودیو ئەو تەپۆڵکەوە . فەرمووی : چەندن ؟ وتیان : نـازانین . فەرمووی : ڕۆژی

---

(١) بەدر شوێنێکە لەنێوان مەکەو مەدینەدا و زیاتر لە ( ١٦٠ ) کم لە مەدینەوە دورە .

چەند وشتر سەرئەبڕن ؟ وتیان دەیانۆ . زانی کە ژمارەیان لە (٩٠٠ تا ١٠٠٠ ) کەسە وەبۆی دەرکەوت کەھەموو سەرۆكو کەورەکانی قورەیشی تیایە . فەرمووی بەھـاوەڵەکانی : بزانن مـەکە بەتەواوی جگەری خۆی خستۆتە بەردەستیان . وەلەم کاتە دووکـەس لەموسڵمانەکان چـووبوون بۆ بەدر ولەتەپێکی نزیکی ئاوەکەوە وشتریان یخ دابو وئاویانھەڵکۆستبو لەم کاتەدا گوێیان لەدەنگی کەنـیزەکێ ئەبێ داوای قـــەرز ئەکا لـە کەنیزەکێکی ترو ئەویش ئەڵێ : بەیانی یا دووبـەیانی کاروانەکە ئەگاتە ئێرەو منیش ئیشیان بۆئەکەمو قەرزەکەت ئەدەمەوە . ئەوانیش کەھاتنەوە ئەم ھەواڵەیان دا بەپێغەمبەر . بەڵام ( أبوسفیان ) زۆری پێناچـێ کە لەپێش کاروانەکەوە خۆی دێت بۆھاڵو ھەواڵ زانـــین کەئەگاتە سەر ئاوەکە ئەبینێ ( مجد ) ی کوڕی ( عمرو ) ی لێیە پرسیاری لێئەکا ، ئەویش ئەڵێ : کەسی وام نەدیوە دوو سوار نەبێ لای ئەوتەپە دابەزینو ھاتن ئاویان برد . أبوسفیان کـورج چووە شوێنەکەیانو سەیری پشقـلی وشترەکانی کرد بینی ناوکی تیایە وتی : بەخوا ئەمە ئالفی مەدینەیەوزانی محمدو موسڵمانەکان ، بەخێرایی ڕای کردەوە بۆلای کاروانەکەو ڕێگاکەی گۆڕیو لەکوێرە ڕێیەکەوە لەقەراغی دەریادا بەپەلە تێی پەڕان ، ھەتا لەمەترسی دووری خستەوەو ڕزگاریان بوو .

( أبوسفیان ) کەزانی کاروانەکە ڕزگاری بووەو لەمەترسی دەرچووە، بیری کردەوە بۆچی جەنك بکەن ؟ ئەی باشتر وانیە بکەڕێنـەوە ؟ بەم بۆنەیەوە ناردی بۆلای قورەیشەکان کەپێیان بڵێ : ئێوە بۆئەوە ھـاتوون کاروانەکە دەربکەن ، خۆ واکاروان ڕزگاری بوو دەئێوەیش بکەڕێنەوە ، کۆمەڵێك لەقورەیشەکان ھاتنە سەر ڕاکەی أبوسفیان . بەڵام أبوجهل کە

ئەمەی بیست نەوەستاو هاواری کرد : بەخوا ناگەڕێینـەوە هەتا ئەچینە بەدرو لەوێدا سێ ڕۆژ ئەمێنینەوەو خۆراك دەرخواردی خەڵـك ئەدەینو وشتر سەر ئەبڕینو عەرەق ئەخۆینەوەو کەنیزەك سەماو ڕەقسمان بۆبکەن . ئەوکاتە هەموو عەرەب لێمان ئەترسنو باوەڕمان پێ ئەکەن .

بەدر یەکێکبوو لـە شوێنی بازرگانی قورەیش لەکاتی حەجدا تێی ئەهاتن و جێگای سـەیرانیـانبوو ، بەلای ( أبوجهل )ەوە وابوو کە کەڕانەوەی قورەیش بەبێ مانەوە لەبەدرا وائەگەیەنێ کەلە محمدو یارەکانی ترساون بەمە محمد دەسەلاتی زیـادئەکاو بانگەکەی بلاوئەبێتەوە ، بەلام ئەم شێوەیەی ئەو دایناوە ئەبێتە سپێر بۆیان و خەلکی مەترسیان لێ ئەکات

خەلکی دوودل بوون کە بەگوێی ئەم واتەیەی ( أبوجهل ) بکەن تاپێیـان نەلێن ترسنۆك ، یان بگەڕێنەوە خۆکاروانەکەیان بەبێ وەی دەرچوە ، ئیتر چ شەڕێك بکێرن . لەترسی تانەوتەشەری ( أبوجهل ) و هاوکارەکانی کەس نەگەڕایەوە بێجگە لە ( بنی زهرە ) کە هاوپەیمـانی ( أخنسی ) کوڕی ( شریقی سـقفی ) بـوونو گوێڕایەڵی و لە ژێر فەرمـانی ئەوا بوون ، ( أخنـسـە ) وتی : ئەی ( بنی زهرە ) خوا ماڵەکەتانی ڕزگارکردو هاوەڵەکەتان کە ( مخرمی کوڕی ( نوفل ) ە لە ناو کاروانەکەدابوو دەرچوە ، ئێوەش بۆ ڕزگارکردنی ئەوو ماڵەکەتان هاتوون ، ئیتر ئیشتان چی‌یە بەبێ کەڵكو سوود ئەڕۆن بۆ بەدر ، هەقتان بەسەر قـەی ئەوکابرایەوە نەبێ ( مەبەس أبوجهل ) بوو ، ( بنی‌زهرە ) یی‌یەکان گەڕانەوە بۆ مەکە . . . قوڕەیشەکان شوێنی ( أبوجهل ) کەوتن و ڕۆیشتن تـانزیکی بەدربوونەوە ، وە لـەودیوی بەدرەوە بەلای مەکەوە لەپشتی تەپۆلکەیەکی لمەوە هەلیاندا و خۆیان لەمەکۆدا .

پێغەمبەرو موسلمانەکان لەمدیوی بەدرەوە بەلای مەدینەوە هەڵیان دابوو خاکێکی وشكو ڕەق و دوور لەئاو بوو ، بەیانی کەهەڵسان هەندێ تینوو هەندێ ( ئیحتیلام ) یان بووبوو خوای گەورە بارانێکی بۆ ناردن هەتا لافاو هەڵساو شیوەکە پڕ بوو لە ئاو . گۆمیان لێدروست کرد بۆپێویستیان و زەویەکەی نەرم کردەوە بۆیان . لەهەمان کاتا ئەوبارانە بوو بەبار بۆ کافرەکان و جێگاکەیان بوو بەقوڕولیتە نەیان ئەتوانی هەنگاو هەڵبێننەوە، قورئان لێرەدا ئەفەرموێ : [ .. وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ] الأنفال [1] لەپاش ئەمە موسلمانەکان گوێزرایانەوە هەتا چون لە خواروی ئاوی بەدرەوە بەزین بە جۆرێك کە ئاوەکە لەقورەیشیەکانەوە نزیكتر بوو. لێرە ( حباب ) ی کوڕی ( المنذر ) ی مەدینەیی کە شارەزای شوێن و جێگاکەبوو هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم شوێنە بەفەرمانی خوا تیابەزیویت یان ڕاوجەنگ و فێڵە ؟ فەرموی : بەڵێ ڕاوجەنگو فێڵە، وتی : دەی کەوایە ئەم شوێنەباش نیە بفەرموو بابڕۆین هەتا ئەچینەسەر ئاوەکەو ئەکەوینە ناوەندی ئاوەکەو قورەیشەکان ، من ئەزانم ئاوەکە زۆرە وبیرو حەوزی خۆمانی لێ پڕ ئەکەین و ئەوان بەبێ ئاو پەکیان ئەکەوێ پێغەمبەر فەرمووی ڕاکەت زۆر جوانە ، فەرمانیدا چوونە سەر ئاوەکەو حەوزیان لێدروست کردو ئەوی تریان داپۆشی ، لەپاش ئەمە ( سعد ) ی کوڕی ( معـــاذ ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا با کەپرێکت لە پشتی خۆمانەوە بۆ دروست بکەین وولاخەکەت لەلات بێ و تولەوێدابە ، ئێمە ئەچین بۆسەر دوژمنەکان ، ئەگەر خواسەری خستین و زاڵ بووین بەسەریانا ئەوا ئاواتمان بەدی هاتووە ، وە ئەگەربەو بارا بوو تۆ سواری ولاخەکەت



(١) آیە : ١١

ئەبیتو ئەگەڕێتەوە بۆلای خزمە موسلمانەکانمان ، چونکو ئەی پێغەمبەری خوا موسلمانیوامان بەجێ هێشتوە کە لـە ئێمەزیاتر تۆیان خۆش ئەوێ و باشترگوێ ڕایەڵیت ئەکەن و ئامادەی غەزاو جەنگن ، وەئەگەر بیانزانیایە تۆ توشی جەنگ ئەبی کەسیان بەجێ نەئەمان و وایانزانی تەنیا کاروانێکە ، وەبەوانە خوا ئەتپارێزێ و سەرت ئەخاو ئەوان دڵسـۆزترین و جەنگ و جیهادت بۆئەکەن » پێغەمبەر فەرمووی : خواکاری لەوە باشترمان بۆئەکات . ئینجا کەپرە بچکۆلەیەکیان بۆ دروست کرد لەسەر تەپەکە و ئەیڕاوانی بەسەرجێگای جەنگەکەدا .

ئەوشەوە موسلمانەکان بەدڵنیایی خەوتن و دڵیان پڕبوو لەمتمانەوباوەڕ . پێغەمبەر ( عمار ) ی کوری (یاسر) و ( عبدالله ) ی کوڕی (مسعود) ی نارد بۆ ناو کافرەکان و گەڕان بەدەورو بەریانا و هاتنەوە وتیان : زۆر پەرێشانو ناڕەحەتنو بەبارانەکە زۆر زیانیان پێ گەیاندووە . وەلەوشەوەدا خوا لەخەواکافرەکانی پیشاندان کەکەم هێزو کەم دەسەڵات بوون ، قورئان ئەفەرموێ : « اذیغشیکم النعاس أمنةمنه . . . ) وە ئەفەرموێ « إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلاً وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيراً لَفَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَلَكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلاً وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْراً كَانَ مَفْعُولاً وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ »[1] وەقورەیشەکان ناردیان بۆ ناو موسلمانەکان تا هەواڵیان بزانن کە گەڕانەوە وتیان : دەوری سێسەد کەسێ ئەبن هیچ پێشەنگو کەمینیان نیە ، بەڵام سوپایەکن پاڵو پشتیان نیە بێجگە لەشمشێرو تیرەکانیان ، بەخوا کەسیان نامرێ تا چەن پیاوێ لەپێش خۆیەوە نەکوژێ ، لە بەیانیا قورەیشەکان خۆیان نوان پێغەمبەر چاوی پیـان کەوت و فەرمووی : خوایە ئەوە قورەیشە هاتوون



(١) - آیە : ٤٣ - ٤٤ - الأنفال ،

بە هەموو هێزو هەواو لووت بەرزی‌یەوە لــەگەڵ تــۆدا ئەجەنگێ و پێغەمبەرەکەت بەدرۆ ئەخاتەوە، خوایە ئەو سەرکەوتنەی بەڵێنت داومێ، خوایە لەناویان بەرە، وەکە ( عتبە ) ی بینی سواری وشترێکی سوورە فەرموی : ئەگەر خێریان تیابێ لای سواری وشترە سوورە ئەگەر بەگوێی بکەن ڕزگار ئەبن . وە لەبەرئەوەی هەمو پیاوەکانی قورەیش هاتبوون هەندێ لەژێرەکانیان بیریان کردەوە : ئەگەر ئەمانە لەم جەنگەدا بشکێن ئیتر قورەیش‌و مەککە نرخ‌و بەهایان نــامێنێ، بەڵام هەر لەوکاتەدا لەترسی بی‌ئابڕوویی ( أبوجهل ) نەیان‌توانی دەری‌بڕن تەنیا ( عتبە ) ی کوڕی ( ربیعە ) نەبێ لەناویانا هەڵساو وتی : « ئەی جەماهیری قورەیش بەخوا بەجەنگانن لەگەڵ محمدو یارەکانیا ئێوە هیچتان دەس نــاکەوێ، بەخوا پیاو هەرکەسێ بکوژێ یا ئامۆزای یاخاڵۆزای یاپیاوێکی تیرەکەی خۆیەتی، پیاوی‌چاك‌بن بگەڕێنەوە واز لە محمدو عەرەبەکانی تربهێنن، ئەگەر لە ناویان‌برد ئەوا بەئاواتی خۆتــان گەیون، وەئەگەر بەو بارابوو ئێوەش تووشی زیان نابن » وە یەتە سەر خوێنی ( عمری الحضرمی ) من کە هاوپەیمانیمی خوێنەکەی ئەدەم » کە ئەم وتارە گەیشتە ( أبوجهل ) لەداخا ئاگری تێچوو ناردی بۆلای ( عامر الحضرمی ) : ئەوە ( عتبە )ی هاوپەیمانتە ئەیەوێ سوپاکە بگێڕێتەوە کەتۆهەقی براکەت کەوتۆتەبەردست هەڵسە هــاوارکە بە کوشتنی ( عمر ) ی برات » ( عامر ) هەڵســـا و هاواری‌کرد عەمری برام ڕۆ خوێنی براکەم ئەوێ . ئیتر هیچ لادان لــە جەنگ نەماو جەنگ داگیرسا . لەم‌کاتە ( أسود ) ی (عبدالأسد المخزومی) کە پیاوێکی شــەڕانی و خراپ بوو هەڵســـاو ســوێندی خوارد : لە حەوزەکەیان‌ئاوئەخواتەوە ئەی‌ڕوخێنێ یان لەو ڕێ‌یەدا ئەبێ‌بمرێ، لەڕیزی

کافرەکان هاتەدەرەوە بۆ لای موسڵمانەکان بەپەلە ( حمزە ) ی کوڕی ( عبدالمطلب ) بۆی کشا ، کە بەیەك گەیشتن ( حمزە ) شمشێرێکی لێداو قاچی پەڕانو بەپشتا کەوت ، بەڵام ویستی بەوپێیەش بەکاکۆڵکێ خۆبگەیەنێتە حەوزەکە سوێندەکەی نەخات ، ( حمزە ) کەوتەسەری و نەیهێشت بگاتە حەوزەکە کوشتی . بێگومان دیمەن لەمە پڕ ناسۆرترنابێ کەپیاو بەشمشێری دوژمن بکوژرێو خوێنەکەی بەلەمیسکە بەستێ و کەسەکانیشی لەریزا وەستابن و سەیری بکەن .

هەرکە ( أسود ) کەوت دەس بەجێ لە سوپای کافرەکان ( عتبە )ی کوری ( ربیعە ) لەگەل ( شیبە ) ی برایاو ( ولید ) ی کوڕیا هاتنە دەرەوە بۆ مەیدانی جەنگ و داوای هاوسەریان کرد . وە لە ریزی موسڵمانەکان سێ کەسی مەدینەیی ( عوف ) و ( معوز ) ی کوڕی (حارث) لەگەل (عبدالله )ی کوڕی (روحە ) هاتن بۆبەرەنکاریانو وتیان : ئێوە کێن؟ وتیان : مەدینەیی ، وتیان : ئیشمان بەئێوەنیە . بانگیان کرد : ئەی محمد لە کەسەکانی خۆمانو هاوسەرمان بۆ بنێرە . پێغەمبەری خوا فەرموی: « هەلسە ئەی ( عبیدە ) ی کوڕی ( حارث ) ی کوڕی ( عبدالمطلب ) هەلسە ( حمزە ) هەلسە ( علی )». ئەم سێ پالەوانە ڕاست بوونەوەو چون بۆیان کەلێیان نزیك بونەوەو زانیان ئەوانن وتیان : زۆرباشە هاوشانی ئەواون ، ( عبیدە ) کە لە هەموویان پیر تربوو بەرەنکاری ( عتبە ) بوو حەمزەیش چوبۆ ( شیبە )و علی پەلاماری (ولید) ی دا ، ئەم دووسوپایە سەیری ئەم شەش پالەوانە ئەکەن دوو دوو لەیەك ئەدەن و دەستیان داوەتە یەخەی یەکتری و دیمەنێکی سامناکی دروست کرد ، ( حمزە) نەیهێشت ئەوەندەی پسێ بچێ ( شیبە ) ی کوشت ، وە ( علی ) ش ( ولید ) ی

کوشت ، بەڵام (عبیدە) و (عتبە) هەردووکیان یەکتریان کوێلەوار کردبوو، ( حمزە) و ( علی ) گەڕانەوە بۆ لای ( عبیدە ) و عتبەیان بە تەواوی کوشت و ( عبیدە ) یان هەڵگرت و هێنایانەوە بۆلای پێغەمبەر ، بەڵام برینەکەی واکاری کەربوو مۆخی قاچی ئەهاتەدەرەوە ، لەناو کەپرەکەی پێغەمبەرا پاڵیان دایەوە و پێغەمبەر قاچی پیرۆزی بۆڕاکێشاو سەری کردە سەری و کەوتە دڵدانەوەی و مژدەی شەهیدی دایەو پایەی بەرز لەبەهەشتاو ئینجا گیانی بەخاك سپارد ، خوالێی ڕازی بێ ، وە یووبەیەکەم شەهیدی جەنگ . هەرکە کافرەکان ئەم ڕوداوە نالەبارەیان دی چاویان پەڕی یە تەوقی سەریان و یەکسەر بەجارێ پەلاماریان داو لەگەل سوپای موسڵمانەکانا تێك ڕژان . ئەمەیش لەبەیانی ڕۆژی ( جمعە ) ( ١٧ ) ی مانگی ڕەمەزان بوو لە ساڵی دووەمی کۆچیدا .

پێش تێکڕژانی هەردوو سوپا پێغەمبەری خوا ( د . خ ) سوپاکەی ڕێکخست و کەوتە ئامۆژگاری کردن و بەڵێنی گەورەی دانێ بەبەرزامەندی خواو بەهەشتی بەرین و فەرمووی : « بەو کەسەقسەم گیانی منی بەدەستە هەرکەسێ ئەمرۆ لەگەل ئەمانەدا بجەنگێ و بکوژرێ وپشت هەڵنەکا خوای گەورە ئەیخاتە بەهەشتەوە و فەرموی « ئێوە پەلامار مەدەن هەتا هەڵمەتتان ئەدەنێ وە هەر کەلێتان کۆبونەوە بەتیر دوریان بخەنەوە . وە شمشێر هەڵمەکێشن هەتا نەیەنە سەرەتان » . وە زۆر ئایەت و فەرموودەی بۆ خوێندن و داوای ئارام و خۆگرتنی لێکردن و مژدەی گەورەی دانێ .

پێغەمبەر سەیری زۆریی قورەیشەکان و کەمی موسڵمانەکانی کرد

زۆر نارەحەت بوو ، ڕووی لاشەی کردە کەعبەو ڕووی دڵی کردە خواو دەستی بەرز کردەوە بۆئاسمان‌و کەوتە پاڕانەوەو داوای بەڵێنی لەخوا ئەکرد وفەرمووی : ( خوایە ئەو پەیمان‌و بەڵێنەی پێت داووم، خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناوبچێ ئیتر تۆ ناپەرسترێیت ) هەرهاوارو نزای ئەکرد عەباکەی لەشانی کەوتە خوارەوە . أبوبکر عەباکەی‌خستەوە سەرشانی‌و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا بەسە ئیتر نزا ، بەخوا خوا کـــیرای ئەکاو بەڵێنەکەی ئەباتە سەر . بەم پێیە مایەوە هەتا وەنەوزێکی داو یارمەتی خوای بینی ڕاستبووەوە بەدڵشادی‌و فەرمووی : أبوبکـر مژدەبێ یارمەتی خوا هات ، ئەوە ( جبرئیل ) ە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووەو کەیشتە بەرەوەو تـۆزی لەسەرەوە بەرز بۆتەوە . وەخوای گەورە فـریشتەی نارد بۆیارمەتی‌و دڵ قایم کردن‌و مژدە پێدانیان ، وەپێغەمبەر مشتێ لمو چەوی هەڵگـرت‌و کردی بەسەر کافـرەکاناو فەرمووی : ( شـاهت الوجـوه ) واتە ئەو ڕوانەڕەش‌و ڕیسوا بوون . موسڵمانەکان کەوتنە لێدان بەهەر چوارلاداو هەموو خۆیان لەبیرچووەوە هەر ( أحد أحد ) و ( الله اکبـر ) بوو ، تـۆز بەری ئاسمانی گرتبوو کردبووی بەتاریکەشەو بریسکەی شمشێری موسڵمانەکان بووبوو بەڕەعدو بەرق‌و ئەوناوەی ڕۆشن کردبووەوە ، ئەوەندە ئەزم‌ودڵیان پتەوو دامەزراوبوو ئەت وت شـــیرو تیر کاریان لێناکا ، وەجار بۆجار پێغەمبەر دڵی قایم‌تر ئەکردن وئەی فەرموو : پەلاماریان بدەن بیان‌کوژن بیان کرن . . .

( إبن اسحاق ) ئەڵێ پێغەمبەری خوا فەرمووی بەیارەکانی لە پێش جەنگەکەدا : من ئەزانم چەند پیاوێ لەبنی هـاشم‌و تیرەکانی‌تر هـاتوون بەڵام نایانەوێ جەنگمان لەگەڵا بکەن‌و بەزۆر هێناونیان ، هەرکەسێ‌پێیان

گەیشت نەیان کوژێ . هەرکەس گەیشت بەبەنی هاشمی نەی کوژێ ،
هەرکەس گەیشت بە ( ابوالبختری ) نەی کوژێ ، هەرکەس گەیشت بە
( عباسی ) کوڕی ( عبدالمطلب ) نەی کوژێ .

موسلمانەکان هەلمەتو هێزو پەلاماردانیان تا ئەهات پتر ئەبوو چونکو
باوەڕی ناودل چاودێرو هاندەریان بوو ، بەڵام هێزی کافرەکان بەرەوکزی
وڕوخانی ئەچوو ، چونکو شەیتان هاندەریان بوو ، خۆکەهێزی خوا دەر
کەوت شەیتان ئەکشێتە دواوە ، وەقورئان ئەفەرموێ : « وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ
أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ . . فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ
وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ إِنِّي أَرَى مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ »(١)

( بلال ) ی حەبەشی ( أمیە ) ی کوڕی ( خلف ) وکوڕەکەی بینی ،
ئەوأمیەیەی کەزۆر ئازاری دابوو لەمەکەدا ، بینی واهەندێ لەموسلمانەکان
( عبدالرحمن کوڕی عوف ) ئەوانەیان بەدیل کرتوون . بلال هاواری کرد
ئەوە ( أمیە ) یە سەرکردەی خوا نەناسەکانە . دەرنەچم ئەکەر بێلم
دەرچێ ، عبدالرحمن ئەلێ : وتم : دیلی منن ، وتی دەرنەچم ئەکەردەرچێ
ئەلێ وتم : کوڕی ڕەشەکە دیلی منن . هاواری کرد : کوڕە ئەوە أمیەو
سەرکردەی کوفرە ، دەورەیان داین بەحال خۆیشم دەرچوم ، هەردوکیان
کوشتن ومن قاچم بریندار بوو ، عبدالرحمن ئەلێ : کاتێ ئەهاتین و هێشتا
بلال پێی نەزانیبوین ( أمیە ) وتی : پێم بلێ ئەوە کێیە کەوا زرێ کەی
لەحاستی سنکی ئەلێی تووکی وشتر مرغی پێوەیە ؟ وتم : ئەوە (حمزە)ی
کوڕی ( عبدالمطلب ) ە . وتی : هەرچی پێمان کرا ئەوە پێی کردین .

موسلمانەکان کەوتنە کوشتنی پیاوە ناودارەکانی قورەیش ( أبوجهل )
کەزانی ڕووبەشکستن ویستی خۆی بسێنێتەوەو نەیەلێ بشکێن هاواری



(١) الانفال : ٤٨ »

ئەکرد « بەلات‌و عوزا ناگەڕێینـەوە هەتا لەکەژەکانا لەناویان نەبـەین ، مەیان کوژن ، بیان‌کرن ، بیان‌کرن » ئینجا دەستی ئەکـــرد بەسروود خوێندنەوەو کۆمەڵێ لەبت پەرستەکان دەورەیان دابوو ئەیان وت : (أبوالحکم) کەس دەسی نەی‌گاتێ . بەڵام ئەئەو وتـارانەو ئەئەو دەورە گرتنەو ئەئەو سرودو خۆهەڵنانەو دڵ قایم کردنە لەبەرامبەری ئەڕەی هەق‌و شیرەکانی خواوە سودێکیان نەبەخشی ، زۆری پێ‌نەچوو هێزی ئیسلام بڵاوەی پێ کردن‌و ( ابوجهل ) یان کـوشت . عبدالرحمن کـوڕی عوف ئەڵێ : لە ڕۆژی بەدر لەجەنگا بووم کاتێ ئەزانم کەوتومەتە ناوەندی دوو کـوڕی گەنجەوەو لێ‌یان دڵ‌نیا نەبـوم یەکەمیان بەدزی ئەویانەوە وتی : مامە ، ( أبوجهل ) م پیشاندە . وتم : کوڕی برام بـۆچیتە ؟ وتی : بیستوومە جوێنی بەپێغەمبەر داوە . قەسەم بەوەی گیانی مني بەدەستە ئەگەر بیبینم لێی جیا نابمەوە هەتا یا ئەیکوژم یا ئەم کوژێ ، وەئەوی تریشیان بەدزی ئەوی تریانەوە ئەوپرسیارو وەڵامەی لەگەڵا کردم ، زۆردڵم پێ‌یان شـاد بوو ، زۆری پێ‌نەچوو ( أبوجهل ) م دی هەڵ‌ئەسوڕێ لەناوخەڵکەکەدا : وتم : ئا ئەوەیە . وەکو جووتە هەڵۆ پەلاماریان داو بەشمشێرەکانیان دایان پاچی‌و بەحاڵ گیانی تیا مابوو بەجێ‌یان هێشت . ئەم دووکوڕە (عوف) و ( معوز ) ی کوڕی ( حارث ) یان ناوبوو بەڵام بەناوی دایکیـــانەوە ( عفراء ) بەناوبانگ بوون ، لەپاشان پێغەمبەری خوا ( د.خ ) فەرمووی : بزانن أبوجهل چی‌بەسەرهاتووە ؟ ئەگەر لەناوکوژراوەکانا لێتان تێک‌چوو سەیری ئەژنۆی بکەن جێگە برینێکی پێوەیە ، ڕۆژێک لەسەرنان‌خواردنی مالی (عبداللەی کوڕی جدعان) تێک چوین‌و من‌لەو گەورەتربووم پاڵێکم پێوەناو کەوت بەسەر ئەژنۆیاو برینـدار بوو ، ئێستەیش نیشـانەی ئەو

ڕبنەی پێوەیە » عبداللە کوڕی مسعود ئەڵێ : ڕۆیشتم کە ئەبینم بەحاڵ گیانی تیاماوە . چووم قاچم خستە ســەر ملی ، چاوێك لەمەكە خراپ ئازاری دابووم ئەوەم لەبیربوو وتم : ها دوژمنی خوا باشی بوو خوا خراپی پێكردی ، وتی بۆچی خراپی بۆكردووم ؟ ئایا پیاوی لەمن گەورەترتان كوشتووە ؟ تۆ پێم بڵێ : كێ زاڵ و سەركەوتووە ئەڵێ : وتم خواو پێغەمبەری خوا . پاشـان وتی : چوویتە شوێنێكی بەرز تۆ ئەوسـا شوا نۆڵكەی ئێمە نەبووی ؟ ئەڵێ : ئینجا سەریم بڕی و بردم بۆ بەردەمی پێغەمبەرو وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە ســەری دوژمنی خوا ( أبوجهل ) ە ئەویش سوپاسی خوای كردو فەرمووی : « اللّهُ الَّذِي لَاإِلَهَ غَيْرُهُ » . وەبەفەرمانی خوا كافرەكان شكان و شپرزەبوون ئەوەی كوژرا كوژرا ئەوی بەدیل گیرا گیرا و ئەوی تری ڕای كرد و هەموو مـاڵ و ســامانیان بەجێهێشت و موسڵمانەكان كەوتنە سەریان فڕاندنیان .

لە كافرەكانی مەكە حەفتایان لێ كوژرا ، لەوانە ( عتبە وشیبەی كوڕی ربیعە ، ولیدی كوڕی عتبە ، أبوبختری كوڕی هشام كەیەكێ لە موسڵمـانەكانی پێ گەیی و پـێی وت : پێغەمبەر فەرمویەتی نەتكوژین ، وەرەبابتبەم بۆلای ، بەڵام بەكوێی نەكردو پەلاماری دایە بیكوژی بەناچاری موسڵمـانەكە كوشتی ، وە ( جراح ) ی باوكی ( أبوعبیدە ) پەلامـاری ( أبوعبیدە ) ی دا بیكوژی بەڵام ( أبوعبیدە ) خۆی لێ لاداو ئامۆژگاری كرد كە موسڵمان بێ . بەڵام بێ سودبوو پەلاماری دایەو ئینجا ( أبوعبیدە) كوشتی ، وە ( أمیە ) كوڕی ( خلف ) و علیٰ كوڕی و حنظلەی كوڕی أبوسفیان و أبوجهل و نوفلی كوڕی خویلد پێغەمبەر فەرمووی : « كێ ئەزانێ نوفل چی بەسەرهات ؟ علي وتی : من كوشتم پێغەمبەر فەرموی :

سوپاس بۆ ئەو خوایەی پاڕانەوەکەی گیراکردم .

لە موسڵمانەکان ( ١٤ ) شەهیدکران ، ئەمانە بوون بەپۆستەی بەکەم لە شەهیدانی ڕێگـای خوا کیـانیـان بەخوا سپارد بۆ بەهەشـتی بەرین (ڕەزای خوا یانلێبێ) . شەشیان لەکۆچەری و هەشتیان لە یاریدەدەران لەوهەشتە شەشیان لە خەزرەج و دوانیان لە ئەوس بوون .

وە لەکاتی شکاندنو ڕاکردنی قوڕەیشەکانا هەندێ لە موسڵمانەکان کەوتنە سەریان و فڕانئیان ڕ هەندێ تریان لەسەر فەرمانی پێغەمبەر کەوتنە کۆکردنەوەی ماڵو تالآنەکەی پێیان بەجێ هێلآبون ، وەهەندێ تریش لە لە سپێرابون و پاریزکاری یـان ئەکردن . . . ئینجـا پێغەمبەری خوا ( د . خ )ـ وەکو خۆی لەگەڵ کوژراوانا هەموجـارێك فەرمانی‌دا ئەو هەمو کوژراوانەیان کۆکردەوە خستیـانە چاڵێکەوە ، لەبەر ڕێزکرتن لـە ئادەمیزاد باهەر باوەڕێکی‌بێ ، کاتی کە ( عتبە ) یان هێناو خستیانە ناو چاڵەکەوە پێغەمبەر سەیری (أبوحذیفە)ی کوڕی عتبەی کردو فەرمووی : هاأبوحذیفە ئەڵێی بۆ باوکت شتێ لە دڵتایە ؟ أبوحذیفە وتی : نەبەخوا ئەی پێغەمبەری‌خوا بەڵآم من ڕای پەسەندو ژیری و چاکەم لەباوکمانەدی و هیوام وابو کە ئەوانە ڕایکێشن بۆ ئیسلامەتی ، کە ئێستە بینیم وأبەو پێیەمرد خەفەتی پێ‌ئەخۆم ، پێغەمبەر دوعای خێری بۆکرد . کە هەمویان خستنە چاڵەکەوە پێغەمبەر هـاتەکوێ قەراغی چـاڵەکەو فەرمووی : ئەی خەڵکی چاڵەکە ، ئەی عتبەی کوڕی ربیعە . . . هەروەها بەم پێیە بە ناوی خۆیان و باوکیانەوە هەموویانی بانگ‌کرد : ئێمە ئەو بەڵێنەی خوای خۆمان دابوینێ بەڕاستی دەستمان‌کەوت ، ئایائێوەش بەڵێنی خوای خۆتان بەڕاستی دەس کەوت ؟ ئایا پێتان خۆش نەبوو ئەگەر گوێ‌ڕایەڵی خواو

پێغەمبەرتان بکردایە ؟ موسڵمانەکان وتیان : ئایا ئەی پێغەمبەری خوا بانگی ئەولاشەبۆگەن کردوانە ئەکەیت ؟ فەرمووی : ئێوە لەوان باشتر گوێتان لێ نیە ، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە . وەدوای جەنگەکە سێ ڕۆژ لەبەدرا مانەوە بۆ کۆکردنەوەی تاڵان و ناشتنی شەهیدەکان و گۆڕ کردنی کافرە کوژراوەکان و پشوو دانێك .

## مژدەدان بەمەدینە

بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەوەو پێش گەڕانەوەیان بۆمەدینە پێغەمبەری خــوا مژدەبەرێکی ناردەوە بـۆ مەدینـە و مژدەی ســەرکەوتنە نـاوازەکەیان دابە مەدینەیی یەکان أسـامەی کوڕی زید ئەڵێ : هەواڵی ئەم سەرکەوتنەمان پێ گەیی کاتێ کـە خەریك بووین خاتو ( رقیە ) ی کچی پێغەمبەرمان ئەسپەردەی خاك ئەکرد . لە کاتی ڕۆیشتنی پێغەمبەرو موسڵمانەکاندا خاتورقیە نەخۆش بوو ، پێغەمبەر(عثمان)ی کوڕی (عفان)ی بەدیاریەوە بەجێ هێشت کەمێردی بوو تا ئاگای لێ بێ و داو و دەرمانی بداتێ ، وەلەو ڕۆژەی هەواڵی ســەرکەوتنەدا کۆچی دوایی کردبوو ئەمان ناشت وە پـێغەمبەر بەشـی لە تاڵان بۆ عثمان دانـاو فەرمووی : هاوبەشە لە پاداشیشا چونکو بەفەرمانی پێغەمبەر دانیشتبوو .

## بەش کردنی تاڵانەکە :

دوابەدوای مژدەبەرەکان پێغەمبەرو یارەکانی کەوتنە ڕێ و گەڕانەوە بۆ مەدینە دیلەکانیان لەگەڵا بوو و دەسکەوتەکانیش لە ژێر چــاودێری ( عبداللە ) ی کوڕی ( کعب ) دا بوو ، تــاکەیشتنە تەنگەبەرایی ( سفراء ) لەوێدا پێغەمبەر کەوتەدابەش کردنی تاڵانەکە ، هەر لەبەیانی

ئەوڕۆژەوە نارێکی یەك لەناو موسڵمانەکانا پەیا بوو بوو . امام احمدو حاکم ڕیوایەتیان کردوە لە ( عبادە )ی کوڕی ( صامت )ە وە ئەڵێ : « لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ڕۆیشتین و هاو بەشیم کرد لە بەدرا ، سوپاکان بەیەك گەیشتن و خـوا دوژمنەکانی شـکان و کۆمەڵێ سەریـان کەوتن و کۆمەڵێ کیش کەوتنە تالاَنەکەو کۆیان کردەوە ، کۆمەڵێ تیش پاسەوانی پێغەمبەربون نەوەك بەدزی‌یەوە دوژمنەکان بێنەسـەری ئەوانەی تالاَنەکەیان کۆ کردبوەوە وتیان : ئێمە کۆمان کردوەتەوە و کەس بەشی تیانیە ووتیان : ئێمەزیاتر هەقمان هەیە پێوەی لە ئێوە ، ئێمە دوژمنمان شکاندوەو پێمان بەجێ‌هێشتوون ، پاسەوانەکانیش وتیان : ئێمەش بەشدارین ، چونکو پارێزکاری پێغەمبەرمان کردوە بەو هۆیەوە نەهاتووین بۆلای‌ئێوە ،

لێرەدا خوای گەورە بەم ئایەتە ناوبژی کردن و ئەفەرموێ : «يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ » . الانفال - ١

ئەم نارێکی‌یەیان هەمووی بەهۆی هەژاری‌و کەم دەستی‌یانەوە بوو . أبوداود وحـاکم ڕیوایەتیان کـردوە لەعبداللە کـوڕی عمرەوە ئەڵێ : « پێغەمبەر لەگەڵ سێ‌سەدو پانزە کەسا چوو بۆ بەدر کـە گەیشتنەجێ فەرمووی : خوایە ئەمانە برسین تێریان بکە ، خوایە پیادەن سواریان بکە ، خوایە ڕووتن پۆشتەیان بکەرەوە . خوا لە ڕوژی بەدرا سـەری‌خسـتن کاتێ کە گەڕانەوە پیاویان نەبووبارێ یـادوو باری پێ‌نەبێ ، وە پۆشتـە بوونەوە و تێربوون » .

ئەوئایەتەی قورئان دای لەدڵی موسڵمانەکانو ڕۆشنی کـردەوەو یەکی خستنەوەو کاروباری تالاَنەکەیان دایە دەس پێغەمبەری خوا کەچۆن‌فەرمانی

خوایە وای لێ بکا ، پێغەمبەریش - بەپێی فەرمانی خوا - وەکوو یەك دابەشی کرد بەسەریانا ، پیادە لەگەڵ پیادەو سوار لەگەڵ سوارا ، وە ئەوانەیش کەشەهید کرابوون بەشەکەیان دابەکەس و کاریان ، وە هەندێ لەوانەیش هاوبەشییان نەکردبوو پێغەمبەر فەرمانی تایبەتی دابوو بەسەریانا بەبۆنەی ئەوجەنگەوە بەشیان درایە .

دوای ئەم دابەش کردنە بەناوی خواوە کەوتنە ڕێ و بەخۆشی و سەر بەرزییەوە گەیشتنەوە شاری مەدینەو موسڵمانەکان پێیان شادبوونەوە ، وەلەخۆشییا دەنگی ( اللّٰه اکبر ) لەهەموو ماڵە موسڵمانێکەوە بەرزبووەوە . بەڵام نا موسڵمانەکان زۆر خەمبارو نارەحەت بوون هەتا یەکێ لەسەرۆکی جوولەکەکان ئەیوت : مادەم ئەوجوامێرانە ئەوپیاوە گەورانە ئەوپاشایانەی عەرەب تووشی کارەساتی واهاتن ئیتر ژێری زەوی و ناوخاك باشترەبۆپیاو.

## دیلەکانی بەدر

دوای گەڕانەوەی موسڵمانەکان و دیلەکان بۆشاری مەکە پێغەمبەری خوا ( د . خ ) دابەشی کردن بەسەر موسڵمانەکاناو فەرمانیدا کەبەشێوەیەکی شیرین و ڕێزەوە لەگەڵیانا بجوڵێنەوە ، وەکەوتە بیر کردنەوە کە چییان لە گەڵا بکات : بیان کوژێ و موسڵمانان لەخراپەیان ڕزگار بکاو چاوشکێنی تیرەو هۆزەکانیان پێ بکاو تۆڵەی کارەساتەکانی مەکەیان لێ بکاتەوە ، یا بە تۆڵە ( فِدیە ) لێ سەندنیان بەرەڵایان بکا ، بەڵکو دڵیان نەرم بێ و ببێتە هۆی ئەوەی ئیسلام لای ئەوان و لای خەڵکی تریش شیرین ببێ و لەئەنجاما بێنە موسڵمان و خوا پەرست ؟

لەم ڕووەوە ڕاوێژێکی بەربڵاوی کرد بەیارەکانی و داوای دەنگ دان و ڕادەربڕینی لێ کردن . أبوبکر فەرموی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە

گەس‌و کاری خۆتن‌و دووره‌کانیان نزیك‌و خزمن ، تۆ منەت باریان بکە خوای گەوره منەتی گەوره ئەکا بەسەرتا ، یان تۆڵەیان لێ‌بکـره بەڵکو لەپاشان بێنە سەر ڕێی ڕاست‌و لەتاگری دۆزەخ ڕزگازیان ببێ ، وەئەو تۆڵەیەیش هێزو توانایی لەموسڵمانانا پەیا ئەکات .

پێغەمبەری خوا ( د . خ ) بێ‌دەنگ بوو أبوبکریش لەووتارەکەی بۆوەوە ودانیشت ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی : ئەی‌کوری خطاب تۆڕات چی‌یە ؟ عمر هەڵساو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە دوژمنی خوای گەورەن .. تۆیان بەدرۆزن داناو ئازارو چەرمەسەریان دایت‌و دەریان کـــردی‌و لەگەڵتا جەنگان بۆکوشتن‌و لەناوبردنی خۆت‌و موسڵمانەکان ، من ڕام‌وایە فەرمان بدەی بیان‌کوژین ، ئەوکاتە بۆ هەموو کەس دەرئەکەوێ کە ئـێمە لەگەڵ کوفرا نەرمی‌و سۆزمان تیـا نیەو کافرەکان لێمان ئەترسن . بـەڵام، زوربەیان لەسەر ڕاکەی أبوبکر بوون ولایەنگیری نەرمی‌و بەزەیی‌یان ئەکرد .

یەکێ لەدیلەکان کەناوی ( أبوعزه ) ی ( عمری ) کوری (عبدالله) ی ( جمحی ) بوو شاعیرو هۆنەربوو ئەم کاتەی بەهەل زانی هات‌و داوای‌ڕزگار کردنی کردو وتی : پێنج کچم هەیەو کەس نیە بەخێویان بـکا ، ئەی محمد بم‌بەخشە پێ‌یان‌و پەیمانت ئەدەمێ ئیتر نەیەمەوە جەنگ لەگەڵتـاناو کەستان لێ‌هەل نەنێم‌و لێتان نەدووم . پێغەمبەر ( د . خ ) بەزەیی پیـا هاتەوەو بەخۆڕایی بەرەڵای کرد . وەتاقە دیلێ بوو کەبەبێ تۆڵە بەرەڵا کرا . بەڵام زۆری پێ‌نەچو پەیمانەکەی شکان‌و لەساڵی دواییدا بەشداری کرد لەجەنگی ( أحدا ) وبەدیل گیراو کوژرا .

وەلەئەنجامی ڕاوێژەکەدا ڕای ( أبوبکر ) سەرکەوت بەسـەر ڕای

( عمر ) دا کەبەتۆڵە لێ‌سەندن بەرەڵایان بکەن ، چونکە ڕای زیاتربوو دڵی پێغەمبەریش لەگەڵ ئەوەدا بوو ، وەئەوەیش بووە پارسەنگو ڕاکەی ئەبوبەکری قورستر کرد .

کاتێ قورەیشەکان گەڕانەوە مەکەو زانییان چی کوژراوەو چی بەدیل گیراوە کەەتنە شینو زاریو چەمەر گێران ، ژنانیان قژیانو لاولوی‌خۆیان ئەبڕی ، تەنیا (هیند) ی کچی (عتبە) نەبێ کەژنی ( أبوسفیان ) بوو ژنان چوونە لای ووتیان : ئەڵێی تۆناگریتو چەمەر ناگێڕی بۆباوکو براومامو کەسەکانت ؟ وتی : من بگریمو محمدو یارەکانی پێم خۆش بن ؟ نەبەخوا کاری وا ناکەم تا هەقی خۆمیان لێ‌نەسێنم ، وەهەتا لەگەڵیانا نەجەنگمو بەچاوی خۆم خزمو خۆشەویستیان بەکوژراوی نەبینم وە بەوپێیە مایەوە و نزیکی أبوسفیان نەکەوتەوە ، أبوسفیانیش سوێندی خوارد کە ئاو نەکەوێ لەلەشی تاالەگەڵ محمدا نەجەنگێ .

وەأبوسفیان سەرۆکەکانی قورەیشی کۆکردەوە،کریانو شیوەنیان هەڵگرت با محمد و یارەکانی پێیان خۆش‌نەبن ، وەبڕیاریان دا نەڕۆن بەدەم دیلەکانەوە باتۆڵەکەیان لەسەر گران نەکەن .

کە هەواڵی سەرکەوتن و زاڵبوونی پێغەمبەری خوا ـ درودی‌لەسەربێ ـ گەیشتە حەبەشە نەجاشی زۆری پێ‌خۆشبوو سوژدەی سوپاسی بۆ خوابرد ، دوایی ناردی بەشوێنی جەعفەرو موسڵمانەکانی‌ترا کە لە حەبەشەدابوون و بەدرێژی هەواڵەکەی بۆگێڕانەوە ، هەتا یەکە یەکە کوژراوو دیلەکانی بۆ بۆ باس‌کردن . وە لە دوای ئـەم سەرکەوتنە موسڵمانەکان لـە حەبەشەوە هاتن بۆ مەدینە .

## دیلەکان و تۆڵە سەندن

هەرچەند قورەیشەکان بڕیاریان‌دا کەنەچن بەسەر دەمی دیلەکانیانەوە، بەڵام ئەمەسەری نەگرت و هەرکە زانی‌یان پێغەمبەر بەتۆڵەدان بەدیلەکان بەرەڵائەکا ( مطلبی ) کوڕی ( أبی‌ودیعە ) ی ( سەهمی ) کە باوکی بە دیل گیرابوو بـەدزیەوە چوبۆ مەدینەو چوار هەزار درهەمی‌دا لـە تۆڵەی باوکیاو هێنایەوە . دوای ئەو قورەیشەکان تۆڵەیان نـارد بۆ دیلەکانیان و تۆڵەی هەریەکێ چوار هەزار درهەم بوو .

مایەوە ئەوانەی هەژارو کەم‌دەس بوون و نەیان‌بوو تۆڵە بدەن بەڵام خوێندەواربوون پێغەمبەر فەرمووی : هەریەکەتـــان دەمنال لە بەچکە موسڵمـانەکان فێری خوێندەویان بکەن کە بخوێننەوە و بنووسـن ئیتر بەرەڵاتان ئەکەم . ئەمە نموونەیەکی ڕادەی هەوڵ‌دان و ئارەزوی‌ زانیاری و زانستی پێغەمبەری خوامان پیشان ئەدا ، واتە هەرهەلێکی بۆ هەلکەوتبێ کەسوودی موسڵمانەکانی تیابووبێ بەکاری هێناوە .

ئەم کارەساتە گەورەیە و ئەو جوڵانەوە شیرینانەی پێغەمبەرو موسڵمانە کان‌پێ‌یان هەڵسان ئەبوایە پاڵ پێوەنەرێکی گەورەبوایە بۆ موسڵمان‌بوونی قورەیش یا بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵیانا . کەچی بـەپێچەوانەوە هەمیشە خەریکی خۆ ئامادەکردن بون بۆئەوەی ئەو مەقە بسێننەوە !!! .

## ڕەخنە لە تۆڵەسەندن :

پێغەمبەری خوا لـە بەرەڵاکـردنی دیلەکان بووەوە ، کەچی لێرەدا ئایەتی قورئان هـاتە خوارەوە و ڕەخنەیان لێ‌ئەگرێ و ئەفەرموێ :
( ماکان لنبی أن یکون لە أسری حـتی یثخن فی الأرض تریدون عرض

الدنيا وللہ يريد الآخرة واللہ عزيزحكيم ولو لا كتاب من الله سبق لمسكم فيما أخذتم عذاب عظيم ]

عمرى كوڕى ( شطاب ) خوا لێی ڕازی‌بێ - ئەڵێ « چووم بۆلای پێغەمبەری خوا ئەبینم لەگەڵ أبوبكرا ئەگریـان وتم : ئەی پێغەمبەری خوا تێم بگەیەنە بزانم بۆچی ئەگرین ؟ .. » فەرمووی : بۆئەوە ئەگریین ڕای هاوەڵەکانت وابوو بە تۆڵە سەندن دیلەکان بەربدەین ، وەســـزاتانم پیشاندرا بەنزیکتر لەم درختەتە - مەبەس درەختێکی نزیکیان بوو - وە خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە »

## هەرای ( بنی قینقاع ) :

هەرای بەدر - وەکوزانرا - مەکەیی‌یەکانی گەیاند بە ناخۆشترین ئەنجـام ، وەمەکەیی بەمەوە نەوەستانەوە بەڵکو کەوتنە خۆکۆکردنەوە و خۆئامادەکردن بۆ سەندنەوەی ئەم هەتە هەرکاتێ بۆیان ڕێ کەوت . وەهەر وەهاتینی ئەم کارەساتە بۆ سەربت پەرست و جوولەکەکانی مەدینە کەمتر نەبوو لەوی مەکەیی‌یەکان لە سەرەتاوە ئەیانویست بەدرۆی دابنێن هەتا بە دیار چاویانەوە تاڵانو دیلەکان هاتنە مەدینە ، ئەمجارمەترسی‌یان لێ‌نیشت و کەوتنە چەوچار .. ئەوەتە ڕۆژ بەڕۆژ موسڵمانەکان بەهێزتر ئەبن و پەرەئەسێنن ، ئەو کابرا بێگانەیە - مەبەس پێغەمبەری خوایە - دوو ساڵی تەواو نەکردوە بەڕاکردوویی هـاتۆوتە ئێرەوە کەچی خەریکە ئەبێ بە یەکەم کەس لە وڵاتا .

لەم‌کاتەدا زۆر لە بت‌پەرستەکان لەسـەر ئامۆژگاری ( عبداللہ ) ی کوڕی ( أبی ) چونە ناو ئیـسلامەوە ، واتە بەناو بۆیەی ئیـسلامی‌یان لەخۆیاندا بەناچاری‌و بەسەرزاری . وەکۆچەری‌و بیابان‌نشینەکانی دەوری

مەدینە (الأعراب) گوێیان لە کوفرو و ئیسلامەتی‌و ئایین و بێ‌ئایینی‌یەوە نەبوو تەنیا بەشوێنی نان‌پەیاکردن وتالآن کردنا ئەگەڕان و بەس ئەوەندە هەبوو بەهۆی تالآن و خراپکاری‌یانەوە دایان لەگەڵ بت پەرستەکانی نیوە دورگەدا بوو بەسەرکەوتنی موسلمانەکان دلگران بون لەبەرئەمە هاتن سوپایەکیان کۆکردەوە و ئەگەڕان بۆ دەسکەوتنی هەلێك مەدینەی تیا تالآن بکەن . بەلآم پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - چووبۆیان و تووانای کردن بێ‌ئەوەی تووشی ئازارێ یازیانێك بێت . ماوەتەوە جوولەکە کە هاوپەیمان بوون لەگەڵ پێغەمبەرا ( د . خ ) موسلمانەکان هەمیشە ئەیانویست ئەوپەیمانە بهێنێتەوەو هەتا هەتایە لەگەڵ جوولەکەدا لەنیوە دورگەدا بژین ، بەڵکو بەتەمابوون جوولەکە یارمەتی‌یان بدەن لەبلآو کردنەوەی باوەڕی ( خوا بەیەك دانان ) و لە کۆڕکردنی بت پەرستی‌دا

بەلآم ئەم هیوایانە بەهیچ گەڕان ، خۆ جوولەکە هەر جوولەکە‌یە لە هەرکوێ بێ . . جوولەکەکان کەوتنە فروفێڵ لە ژێرەوە - وەکو سروشتی خۆیانە وەزۆر شتی‌وایان ئەکرد ئەگەر موسلمانەکان دەستیان بەپەیمانەکەوە نەگرتایە ئەبوایە جەنگیان هەڵبگیرسانایە . بەتایبەتی دوای جەنگی بەدر کەوتنە ئاژاوەنانەوەو پیلان گێڕان . . لەژێرەوە خەلکیان لەموسلمانەکان هەڵ ئەناو بە دزی‌یەوە هۆنراوەیان لە دژیان ئەنارد بۆ مەکە وە بۆ ئەم لاولای ترو جۆرەها دەوری خراپیان ئەبینی . ئەمانەیش هیچیان لەپێغەمبەر کوم‌نەئەبوون‌و موسلمانەکان پێیان ئەزانین . ئەم جۆرە شتانە موسلمانەکانی خستە مەترسی و بیر کردنەوە وە ، لەم کاتەدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ ناردن : [ وإما تخافن من قوم خيانة فانبذ إليهم على سواء إن الله لايحب الخائنين ] واتە ئەگەر لە خیانەت کردنی کۆمەلێکی هاوپەیمانتان

ترسای ئەوە پەیمانەکەیان وەکوخۆی بۆ فڕێ بدەرەوە ـ واتە تێیان بگەیەنە کە پەیمانەکە لێرەدا کۆتایی پێ هات ـ خوا خائینانی خۆش ناوێ .

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ناردی بەشوێن سەرۆکەکانیاو هەندێ هات بەسەریاناو ترسانێی لە ئەنجامی هەڵوەشانەوەی پەیمانەکەو فەرمووی : پاداشی خراپە خراپە ئەبێ . کەچی لەوەڵاما وتیان : هاعەمد بەوە هەڵمەخەڵەتێ چەنگاویت لەگەڵ گەلێکا کە نازانن جەنگ چۆنە ، بەخوا لەگەڵ ئێمەدا بجەنگی تێ ئەگەیت کە ئێمەین پیاو .

## کوشتنی ( أبوعفك و عصماء )

تاجەنگی بەدر نەکرا بوو موسڵمانەکان لە هاونیشتمانییەکانی مەدینە ئەترسان ، هەتادەسیان ئەگێڕایەوە لەوانەیش کە دەس درێژییان ئەکردە سەر موسڵمانەکان ، کە لەبەدر گەڕانەوە ( سالمی کوڕی عمیر ) سوێندی خوارد کە ( أبوعفك ) بکوژێ ـ أبوعفك یەکێ بوو لـە جوولەکەکانی ( بنی عمر ) ی کوڕی ( عوف ) ـ لەسەرئەوەی هەڵبەستی ناڕەوای لە دژی پێغەمبەرو موسڵمـانەن ئەناردو بەملاولاداو قسـەی خراپی ئەوت و هانی کەسەکانی ئەدا کە هەڵسن لەدژی موسڵمانەکان . . شەوێك سالم چووبۆی بینی والەناو ماڵەکەیا نووستووە ئەویش شمشێرەکەی خستەسـەر جەرگی و کوشتی ، وە لە لایەکی ترەوە ( عصماء ) ی کچی ( مروان ) کە لە ( بنی أمیە ) ی کوڕی زیدبوو کاڵتەی بەموسـلمـانەکان ئەکرد و ئازاری پێغەمبەری ئەداو خەڵکێکی لێ هەڵ ئەنـاوبە هیچ جۆرێ وازی نەئەهێنا ، شەوێ ( عمیر ) ی کوڕی ( عوف ) چووبۆی بۆ ماڵەوە ئەبینێ کۆمەڵێ لەدەوری نووستوون و ئەویش خەریکە شیر ئەدا بە منداڵەکەیی و خەوی لێ کەوتووە ، ( عمیر ) نەختێ چـاوی کزبوو دەس ئەکەوتێ و

ئەیدۆزێتەوە و منداڵەکەی لێدور ئەخاتەوە و شمشێرێ ئەکا بە سنگیا لەپشتیەوە دەرئەچێ پاشان دێتە خزمەتی پێغەمبەرو هەواڵەکەی ئەداتێ ، کە ئەگەڕێتەوە ئەبینێ کوڕەکانی لەگەڵ کۆمەڵێکا ئەسپەردەی ئەکەن ، لەگەڵ ئەی‌بینن دێن بەرەو ڕوی و ئەڵێن : ( عمیر ) تۆکوشتت ؟ ئەڵێ : بەڵێ ، چیتان لەدەست دێت بیکەن بەوخوایەی گیانی منی بەدەستە هەرکامێکتان وەکو ئەو بجووڵێنەوە وەکوئەوی لێ‌ئەکەم هەتا هەمووتان ئەکوژم یالەوپێناودا ئەڕۆم . وەئەم کارە بووبەهۆی دەرکەوتنی ئیسلامەتی لەناو تیرەی ( بنی خـطمه ) دا ، چونکە مێردەکەی عصماءە یەکێ‌بوو لەو تیرەیە و موسڵمانەکانی خستە ڕوو ئەوانیش چونە پاڵیەك .

## داگیرساندنی جەنگ

ڕوودانی ئەوکارەساتانە ترس‌و بیمی جوولەکەی زۆر کرد وئیتر کەس ئەمین نەبوون ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا هەر وازیان لەکارو وتەی خراپ نەئەهێنا ، ڕۆژێ ژنێکی موسڵمان لەکۆمەڵی یاریدەدەرکان چوە بازاڕی ( بنی قینقاع ) پارچەیەك خشڵی پێ‌بوو بی‌فرۆشێ ، لەلای زەڕەنگەرێ دانیشت ، جووەلەکەکان لێی کۆبونەوەو ئەیان ویست ڕووی خۆی دەرخا بۆیان ، بەڵام ژنەکە گوێی نەدانێ ، یەکێ لەجوولەکەکان نەی هێشت ژنەکە پێی بزانێ لەدواوە جلەکانی بەستەوە بەشتێکەوە کاتێ ژنەکەهەڵسا لاشەی دەرکەوت‌و دانیشتوان دەستیان کرد بەقاقای پێکەنین ، ژنەیش هاواری کردو موسڵمانێ ئاگای لێ‌بوو هەڵمەتی برد جووە زەڕەنگەرەکەی کوشت ، جوولەکەکانیش دەوری موسڵمانەکەیان داو کوشتیان ، کەس‌و کاری موسڵمانەکە هاواریان کرد موسڵمانان کۆبوونەوەو جەنگ لەنێوانی موسڵمانان‌و جوولەکەی ( بنی قینقاع ) دا داگیرسا ئەمەیش ڕێکەوتی

ناوەڕاستی مانگی شەشەڵانی ساڵی دووەمی کۆچی بو . موسڵمانەکان چوونە سەر خێڵی ( بنی قینقاع )و بۆماوەی پانزە ڕۆژ ئابڵوقەیان دان ، لەم جەنگەدا ئاڵا بەدەس ( حمزه ) ی کوڕی ( عبدالمطلب ) ەوە بوو ، وە ( ابولبابه ) ی یاریدەدەر بەسەر مەدینەوە بەجێ هێلرا . موسلمانان لەیان هێشت لەوماوەیەدا کەس لەجوولەکە بێتە دەرەوە یاهیچیان بۆ بچێ هەتا ناچاربوون ڕازی بن بەفەرمانی خواو پێغەمبەری خوا وچییان لێ بکەن ڕازی بن‌و بەمل کەچی هاتنە دەرەوە ، وەپێغەمبەریش ( د . خ ) لە سەر ڕاوێژی موسڵمانە گەورەکان بڕیاری کوشتنی پیاوەکانیانیدا . لەپێش جەنگەکەدا ( عباده ) ی کوڕی ( صامت ) کەلەگەورەکانی خەرزەج وە هاوپەیمانی ( بنی قینقاع ) بوو - لەپەیمانیان دەرچووبوو لەسەر بەدخوویی یان بەڵام ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبی ) کەیەکێ تربوو لەخەرزەجی هەر هاوپەیمانی جوولەکەکان بوو ، کە بەم بڕیارەی زانی هاتە خزمەتی پێغەمبەرو وتی : محمد چاکە بکە لەگەڵ هاوپەیمانەکانما ، پێغەمبەر ( درودی لەسەربێ ) گوێی نەدایە . دووبارەی کردەوەو هەم گوێی نەدایە ئەمجار هات دەستی کرد بەباخەڵی زرێکەی پێغەمبەراو پێغەمبەر ڕەنگی تێك چوو و فەرمووی : بەرەمدە . عبدالله وتی : بەخوا بەرت نادەم هەتا چاکە لەگەڵ هاوپەیمانەکانما نەکەیت ، سێ‌سەد زرێ لەبەرو چوارسەد بێ‌زرێ کەلەڕەش‌و سوور پاراستوومیان ئەتەوێ بەچێشتەنگاوێ بییان بڕیتەوە ؟ من پیاوێکم لەوە ئەترسم کەدەور بگەڕێتەوە سەرم . (عبدالله) هەرچەند بەهاتنی ئیسلام کزبووبوو بەڵام هێشتا دەستەڵاتی لەناو (أوس)و ( خزرج ) دا مابوو .

لەم کۆڵ نەدانەی ( عبدالله ) دا پێغەمبەری خوا ( د . خ ) هەندێ

پێی کردەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی ( عبـــادە ) هاتو هەندێ باسی ( عبداللە ) ی بۆکرد وەوای بەچاکتر زانی ئەم جارەیش بـە لێبووردنو چاکە ( عبداللە ) وجوولەکەو بت پەرستەکان چاولەبەربکا ، بۆیە فەرموی: بەرم دە لەبەرتۆ نایان کوژم بەلاّم نابێ لەمەدینەدا دانیشنو نابێ دراوسێم بن . ( عبداللە ) ویستی بۆجاری دووەم بێتەوە لای و تکایان بۆبـکا بەلاّم موسلمانێ نەی هێشتو لەگەڵ ( عبداللە ) دا بەرەنگاری یەك بوونوسەری ( عبداللە ) ی شکاند جوولەکە کەئەوەیان دی وتیـان : مەچـۆرەوە لای بەخوا ئێمە لەجێگایەکا دانانیشین کەسەری کوڕی ( أبی ) ی تیا بشکێ وئەتوانین لەسەری بکەینەوە . لەم ڕووەوە ئەم ئایەتانە هاتە خـوارەوە :
(یاأیهاالذین آمَنُو لاتَتَّخِذُ والْیَهُوُدَ وَالنَّصاٰری أَوْلِیاٰءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِیاٰءُ بَعْضٍ وَمَنْ یَتَوَلَّهُمْ مِنْکُمْ فَاِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللهَ لاٰیَهْدِی الْقَوْمَ الظّاٰلِمِیْنَ ، فَتَرَیَ الَّذِینَ فِی قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ یُسٰارِعُونَ فِیهِمْ یَقُولُونَ : نَخْشٰی أَنْ تُصِیْبَنٰا دٰائِرَةٌ فَعَسَی اللهُ أَنْ یَأْتِیَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِنْ عِنْدِهِ فَیُصْبِحُوا عَلَیٰ مٰا أَسَرُّوا فِی أَنْفُسِهِمْ نٰادِمِینَ) . (١)

وە لەسەر ئەوە پێك هاتن کەماڵ و سامانیان بەجێ بێلن بۆموسلماکان و بەخۆیانو خاوو خێزانیانەوە بڕۆن بۆ ( أذرعـات ) (١) وە پێغەمبەری خوا ـ درودی لە سەربێ ـ ( عبادەی ) ی کوڕی ( صـامت ) ی کرد بەسەرپەرشتی کری بارکردنەکەیان ، ئەویش سێ ڕۆژ مۆڵەتی‌دان و لەو ماوەیەدا باریان کردو چونە ( أذرعات ) . وە بەوفەرمانی خوا ســـاڵ وەرنەچەرخایەوە بەسەریانا هەموویان مردن . پێغەمبەر سامانەکەیانی کرد بەپێنج کەرتەوە و بەپێی فەرمانی خوا دابەشی‌کرد .

---

(١) سورة ( المائدة ) ٥١ ـ ٥٢

(٢) شارێك‌بو لە وڵاتی شام

## جەنگی قاوت :

شتێکی سروشتییە کە ئەم دوورخستنەوەی جوولەکەیە مەترسی لە دڵی دوژمنەکانی تری ئیسلاما دروست بکات دەس بکێشنەوە لەو خراپکاری یانەی ئەیانویست پێی هەڵسن ، وە بۆ ماوەیەك خۆشیو ئاسایش لە مەدینەدا دابمەزرێنێ ـ ئەگەر أبوسفیان لاپەڕەیەکی نوێی هەڵ نەگێڕایەتەوە .

وەکو زانیمان أبوسوفیان لە جەنگی بەردا بەشـــدار نەبوو شەقەی ئەڵماسەی نەبیستبوو ، لەگەڵ ئەوەیشا کوڕێکی لەبەدرا کوژرابوو سوێندی خواردبوو تا لەگەڵ محمدا نەجەنگێ ســـەری نەشوات . جاپۆئەوەی سوێندەکەی نەکەوێ و لە لایەکیتریشەوە پیشانی خەڵکی بدات کە قورەیش هێزو دەســەڵاتی ماوە ، کارێکی وابکا مەدینەیی بترسێنێ و هەقیان لێ بکاتەوە . . بۆ ئەمانە ویستی لە ناکاوا بدا بەسەر مەدینەدا و زیانێکی گەورەیان لێ بدات ، هات دووسەد سـواری هێناو ڕووبە مەدینە بەدزییەوە کەوتەڕێ لەژێر تاریکایی شەوا هەتا خۆی گەیانە ناو خێڵێکی جوولەکەی ( بنی نضیر ) لەنزیکی مەدینە ، وە لە لای ( سلامی ) کوڕی ( مشیکم ) سەرۆکی جوولەکەکان میوان بوو ، بەجووتە کەوتنە دواندن لەدژی موسڵمانەکان و بۆ دۆزینەوەی پیلانێ کە بەهۆیەوە بتوانن ئازاری موسڵمانەکان بدەن لە کەوەی بەیانیدا دایـان بەسەر نـاوچەی ( عریض ) داو لەوێدا موسڵمانێك و هاوپەیمانێکیان بەردەسر. کەوت کوشتیان و دوو خانوو و چەند باخە خورمایەکیان سووتاند ئیتر ڕووەو مەکە ڕایان کردەوە کە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ بەمەی زانی یارەکانی بەخێرایی کۆکردەوەو دووسەد کەسی لەگەڵ خۆیا برد ، ( بشیر ) ی کوڕی ( عبدالمنذر ) ی دانا لەســـەر مەدینەو بەشوێنیانا ڕۆیشتن تا گەیشتنە

( قرقرة الكدر ) بەڵام پێیان نەگەیشتن چونکە زۆر بەپەلە ڕۆیی بوون وهەرچی کۆڵو باریان پێ بوو بەجێیان هێڵابوو تا سووکبارین و بەخێرایی دەرچن لەدەس موسلمانان ، وەلەوانەی لێیان بەجێ مابوو فەردەیەك قاوت بوو موسلمانەکان هەڵیان گرت ، وەلەبەرئەمەبوو ئەم جەنگە ناونرا ( جەنگی قاوت ) کە پێغەمبەر زانی نایان گەنێ گەڕانەوە بۆمەدینە ، هەرچەند أبوسفیان ئەمەی بەدەس وەشاندنێك دانا کەسەری قورەیش بەرز بکاتەوە بەڵام هەڵاتنیان و ڕاکردنی موسلمانەکان بە دوایانا ئەوەندەی تر قورەیشی شکاند لەولاتەکەدا . وەئەم ڕوداوە لەپێنجی مانگی قوربانی سالی دووەما بوو .

## ( سالی سێیەمی کۆچی )

## کوشتنی کەعبی کوڕی اشرف :

کەعبی کوڕی أشرف یەکێ بوو لەوانەی لەدژی ئیسلام ئەجوڵایەوە . . که هەوالی کوژراوەکانی قورەیشی لەبەدرا هات ووتی : « ئەوانە بوون گەورەو پاشایانی عەرەب ، ئەگەر محمد دابێتی لەوان ئیتر ژێری زەوی باشترە بۆ پیاو لەسەر زەوی » چوو بۆ مەکە بۆ هەڵ نسانی خەڵکی لە دژی ئیسلام و هەڵبەستی ئەخوێندەوە و کوژراوەکانی ئەلاواندەوە ، وە لە مەدینەدا ئەیویست هەڵبەستی ناشیرین بە ژنانی موسلمانانا بڵێ ، لەبەر ئەمانە بریاری کوشتنیان دا و پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ فەرمووی : کێ ئەچێ ( کعبی ) کوری ( اشرف ) مان لە کۆل ئەخات ؟ ئەوەتە ئازاری خواو پێغەمبەر ئەدات .

( محمد ) ی کوری ( مسیلمە ) ی یاریدەدەری أوس . وتی : ئەوە لەسەرمن بەڵام ڕێگام بدە کارێ بکەم بەهۆیەوە بتوانم بی کوژم ، فەرمووی :

باشە .

( محمد ) کوڕی ( مسیلمە ) لەگەڵ چوار لە خزمەکانی لە سەر پیلانێك پێك‌هاتن : محمد چوەلای (کعب) و دەستی کردە تانەو تەشەردان و نارەزایی لەو بارەی تیا ئەژیان و ئەی وت : هاتنی ئەم پیاوە بۆ ناومان بووبە بەڵاو ڕژا بەسەرمانا ، ئەوەتە عەرەب دوژمنایەتیمان ئەکەن‌و هەموو یەکیان کرتووە لەدژی ئێمەو ڕێی هاتوچۆمان لێ‌هاتۆتە وە یەك و خاو خێزان‌و گیانی خۆمان بۆتەملمان . بەم وتەو واتانە کعبی دڵنیاکرد و ئەبجار داوای هەندێ مالی لێ‌کرد بۆخۆی‌و خزمەکانی‌و لەسەر ئەوە ڕێ‌کەوتن کە زرێ‌کانیان لەبارمتەدا دابنێن لەلای ( کعب ) وکاتێ تربێن بۆ ماڵەکە . جێگاو ماڵی ( کعب ) لە دووری مەدینەوە بووشەوێ لە شەوان أبو نائلە بۆ بەجێ هێنانی پیلانەکە بانگی کعبی کرد و ئەویش هەلساو بەدەم دەنگەوە کەڕۆیی ، هەرچەند بووکەکەی مەترسی‌نایە بەری‌کە لەو کاتەدا نەچێتە دەرەوە گوێی نەدایە ، بەجووتە لە گەڵ ( أبونائلە )دا ڕۆیین تا گەیشتنە هاوەڵەکانی‌و ئەبجار هەموویان بەدەم وتو وێژونارەزایی دەربڕین لەوبارەی تیایا ئەژین تا لەماڵی ( کعب ) دوور کەوتنەوە ، ئەوانیش کەوتنە لێدانی هەتا کوشتیان و موسلمانانیان لە خراپەی ڕزگار کرد ، پاشان هاتەوەو هەواڵەکەیان دا بە پێغەمبەری خوا .

## ( جەنگی « غطفان » ) :

هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا - درووردی لەسەربێ - کەتیرەو کۆمەڵی ( غطفان وسلیم ) ئەیانەوێ دەس درێژی بکە نەسەرموسلمانەکان و بێنەسەرمەدینە ، پێغەمبەریش ویستی دەستی خۆی پێش‌بخاو لە شوێنە کەی خۆیانابدا بەسەریانا پێش ئەوەی ئەوان بکەونەڕێ ، وەخەڵکیان

پێ چاو ترسێن بکا .

لەبەر ئەمە کۆمەڵێکی دووسەد کەسی لەگەڵ خۆیا برد و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شوێنێ ناوی (قرقرة الكدر) بوو بۆئەوەی ڕێگایان لێ بگرن . بەڵام بێجگە لە شوێنی پێی وڵاخ هیچی تریان نەبینی ، چەند کەسێکی لە هاوەڵەکانی نارد بۆ سەرا وردی دۆڵەکەو خۆی لە خوارەوە مایەوە ، لەم کاتەدا بەندەیەکی بینی ناوی ( یسار ) بوو پرسیاری لێ کرد بۆی دەرکەوت کۆمەڵەکە سەرکەوتوون بۆ سەر ئاوەکە ، لەولایشەوە کۆمەڵەکە پێیان ئەزانن و ئیتر هچیان بۆ ناکرێ هەڵاتن و ، وە هەرچی یاری پێ بوو بەجێیان هێشت ، موسلمانەکان تالانەکەیان کۆکردەوە ، دوای جیاکردنەوەی پێنجیەکی بەپێی فەرمانی خوا دابەش کرد بەسەریانا ـ دیسان پێغەمبەری خوا ( د . خ ) زانی کە بەرەی ( ثعلبە ) و ( محارب ) ـ دووتیرەبوون بەسەرۆکایەتی پیاوێك بەناوی ( عثور ) وە لە ( ذی‌أمر ) دا کۆبونەوەو ئەیانەوێ لەلایەکەوە بدەن بەسەر مەدینەدا ، پێغەمبەر ویستی پێش ئەوەی ئەوان بێن ئەم بدا بەسەریاناو لە شوێنی خۆیانا کپیان بکاتەوە ، بۆ ئەمە چوارسەدو پەنجا کەسی هەڵگرت و عثمانی کوڕی عفانی لەسەر مەدینە داناو لە دوانزەی مانگی ( ربیع الاول ) دا کەوتنەڕێ .

لەڕێگا تووشی پیاوێکی تیرەی ( ثعلبە ) بوون پێغەمبەر هەواڵی پرسی و ئەویش جێگاکەی پێوت و وتی : ئەی محمد ئەگەر پێتان بزانن ڕائەکەن بۆسەر شاخەکانو دەستتان لێیان گیر نابێ ، من دێم لەگەڵتانا و ئەتبەمە سەر شوێنەکەیان . لەگەڵ ئەوەیشا کۆمەڵە کە پێیان زانین‌و ئیتر خۆیان پێ نەگیراو ڕایان کرد ، کاتێ موسلمانەکان بڵاوەیان کردبوو لەو بن دارانەدا خۆیان ئەحەوانەوە پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ جلەکانی

[illegible] ئەو بوو خەریك بووشكی ئەكردە وە و خۆی دابوە ژێر سـێبەری
[illegible] ، لەو كاتە دا (دعثور) چاوی كردو بەشمشێری ڕووتە بەســەری
[illegible]ەرەوە وەستاو وتی : محمد كێ لەدەسم ڕزگارت ئەكات ؟ پێغەمبەریش
[illegible]ەوەی بترسێ یا بشپرزێ ـ فەرمووی : خوا . هەربەو وتەیەترس و بیم
لە[illegible]را نیشت و شمشێرەكەی لەدەس كەوتە خوارەوە و پێغەمبەر هەڵی
گرت و فەرمووی بە (دعثور) : كێ لەدەس من ڕزگارت ئەكات ؟ ئەویش
وتی : بەخوا كەس نیە . بەڵام پێغەمبەر ( د . خ ) لێی بورد و بەرەڵای
كرد ، كابرایش موسڵمان بوو چوەناو خزمەكانی و كەوتە بانگ كردنیـان
بۆسەر ئیسلامەتی . بێ گومان كاریوەها شیرین ئەبێتە هۆ بۆ گۆڕینی دڵی
مرۆڤ لە بارێكەوە بۆ بارێكی تر ، وەنیشانەی بانگ كەری دڵسۆز ئەوەیە
كە هەموو ژیانی تەنیا بۆ بەرژەوەندی بانگەكەی بێ و كوێ نەداتە هەق
سەندن و تۆڵەكردنەوە . ئەوەیە بەڵێ بوردن لە تاوانی ناوانبارێكی وەها
بانگ كەرێكی دەس كەوت .

وەلە لایەكی ترەوە پێغەمبەری خوا بیستی : كۆمەڵێ لە (بنی‌سلیم)
ئەیانەوێ هێرش بهێننە سەر مەدینە ، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەربێ ـ
بەسێ سەد پیاوی جەنگاوەرەوە چوبۆیان و (عبدالله) ی كوڕی (أم‌مكتوم)
ی لەسەر مەدینە دانا . كاتێ لێیان نزیك بوونەوە ڕایان كردو دەستیـان
گیرانەبوو ، ئەمەیش لە شەشی مانگی ( جمادی الأولی ) دا بوو لە ساڵی
سێیەم دا .

بەم پێیە هەرتیرەیەك ئەی‌ویست پەلاماری مەدینە بداو كارێكی وابكەن
موسڵمانەكان ڕێگەی شام بەربەست نەكەن ، بەڵام پێغەمبەر پێش دەستی

ئەکردو ئەچووە سەریان و بلاوەی پێئەکردن و پەرتەوازەی ئەکردن .

## قورەیشی ڕێی شام ئەگۆڕێ :

ئەبێ لێرەدا هەڵوێستی قورەیش چی‌بێ ؟ چۆن کاروانی شام بکەن ؟ خۆمحمد ڕێگای لێ‌بردو نەبەست و مەکەیش بەبێ‌کاروان ناژین ئەی‌چۆن لەم گیرو گرفتە ڕزگاریان ببێ ؟ ! ! .

ڕۆژێ لەڕۆژان ( صفوان ) ی کوڕی ( أمیە ) لەناو قورەیشەکانا هەلسایە پێو وتی : وەکو ئەزانن محمد و یارەکانی ڕێی کاروانیان لێ بەستوین و نازانین چی‌یان لە کەلایکەین ، خۆئەوان کۆیێی دەریا بەجێنایەلن ، وەخەلکی ئەو ناوەیش بونەتە هاوپەیمانیو لەگەلیا ڕێکەوتوون ، ئەی ئێمە لەکوێ دانیشین ؟ خۆئەگەر لە مالادانیشین دەسمایەکەمان ئەخۆینو بەرگەناگرێ ، ئێمە ژیانمان وابەسەر کاروانەوەلە هاوینا بۆشام و لەزستانا بۆ حەبەشە .

( أسود ) ی کوڕی ( عبدالمطلب ) هەوالێ دایەو وتی : لە ڕێگای قەراخی دەریا لابدەو ڕێگای عێراق بکرە . وە ناونیشانی ( فراتی ) کوڕی ( حیانی ) بۆهەلدا کە ڕێگەکەیان پیشان بدات . چونەلای فراتو ئەویش دلنیای کردن کە کەس لەیارەکانی محمد بەڕێگای عێراقدا ناڕۆا و ئەو ڕێگەیەش بریتی‌یە لەزەویێکی وشکو برنگ و بێئاو .

بەو ڕێگا چۆلەی عێراقدا کاروانیان خستەڕێ و بایی سەد هەزار درهەم کەلو پەلیان برد ، وە ( صفوان ) و ( أبوسفیان ) و ( حویطبی ) کوڕی ( عبدالعزی ) و کەلێ پیاوی تری لەکەلاڕۆیی ، وە (صفوان) ی کوڕی ( أمیە ) سەرکاروان بوو ، لە کاتی ئەم ڕاوێژو وت و ویژەدا پیاوێکی مەدینەیی ( نعیم ) کوڕی ( مسعود ) ی ( أجشمی ) لە مەکەدا بوو

ئاگای لێبوو ، کەڕۆیشتەوە لـە کاتی ســەرخۆشیدا ئەم هەواڵەی بۆ موسڵمانێك کەناوی ( سلیطی ) کوڕی ( نعمان ) بوو بۆی گێڕایەوە ، ئـەویش چووە خزمەتی پێغەمبەری خـوا و بۆی گێڕایەوە ، پێغەمبەری خوایش - درودی لەسەربێ - بەکورجی (زید)ی کوڕی ( حارثەی ) ی بەسەد سوارەوە نادرە ڕێ‌ی‌یان ، کومەڵی زید لەسـەر ئاوێك لە ناچەی نەجد کەناوی ( قردە ) بوو بەبەرەنگاریان بوون و مەکەیی‌یەکان ڕایان کردو ئەوانیش کاروانو تالآنەکەیان گرت‌و ئەمە یەکەم تالآنێکی بەنرخ بوو کە دەسکەوتیان بوو وە ( فراتی ) کوڕی ( حیان ) بەدیل گیرا ، کە هاتنەوە مەدینە دوای پێنج‌یەك کاروانەکەیان بەسەرا دابەش‌کردن .

فراتیـان هێنـا بۆلای پێغەمبەری خوا - د . خ - ئەویش کەوتە ئامۆژکاری کردنی و بانگی کرد بۆسەر ئیسلام ، فرات موسڵمان بوو و پێغەمبەربەری‌دا ئەم ڕوداوەیش لە مانگی ( جمادی الآخرە ) دابوو ،

## بەشی هەشتەم

## جەنگی احد :

موسڵمانەکان بەوجۆرەی زانیمان تەنگیـان بەقورەیش هەڵچنی بوو لە داخ‌و و مەراقاخەو خۆراس‌و حەوانەیان لێ‌هەراسان بووبوو . . ئەوەبوو بێجگە لەبەد ناوبوون سەرۆك و گەورەکانیان لەناوچوون و قەدروڕێزیان لەناو عەرەبەکانا شکاو وەڕێکەی شامیان لێ‌قەدەغەکراوە ، هەرای قـاوت نەی‌توانی دەرمانی ئەو برینە گەورەیە بکا ، سریەکەی زیدی کوڕی‌حارثە سەرلەنوێ برینەکەی هێنایەوە سۆ . . . وە ژنانی مەکـە هەرخەریکی لاوانەوەی کوژراوەکانی بەدریان بوون نەیان بوو کوڕی یامێردی یابرای یاباوکی یاخزمی نەکوژرابێ و کۆتەڵی بۆنەکرابێ ،

لەکاتی جەنگی بەدرا کە ئەبووسوفیان هاتەوەو کاروانەکەی بەبێوەی هێنایەوە پیاوەگەورەکانی قورەیش فەرمانیان دا : کەکاروانەکەلای نادی یەکە ڕا بکیرێ و بفرۆشرێ و قـــازانجەکەی بەجیـادابنرێ بۆ ئامادەکردنی سوپا بۆ جەنگانن لـەگەڵ محمدو موسڵمـانەکان وە هەموخاوەن بەشەکانی کاروانەکە بەمەرازی بوون ، وە نزیکەی پەنجا هەزار لیرە قازانجی کرد .

لەسالی دوایی‌دا کەسالی سێیەمی کۆچی بوو کەوتنە خۆڕێکخستن بۆ سڕینەوەی ئەونەنگی‌و شورەیی‌یـە وبۆسەندنەوەی هەقی سالی بـەدر ، أبو سفیان بووبەفەرماندەی سوپاو نزیکەی سێ‌هەزار کەسی کۆکردەوە ، بێجگە لەقورەیش تیرەو خێڵەکانی ئەودەورو بەرەو عەرەبە کۆچەری‌یە هاوپەیمانە کانیشیان لەگەڵابوو ، وە ( أبوعمری ڕاهب ) ی ئەوسی مەدینەیی ـ کە لەڕقی پێغەمبەر مەدینەی بەجێ‌هێشتبوو هاتبووە ناوقورەیشەکان‌وپێغەمبەری خوا (درودی لەسەربێ ) ناوی نابو ( أبوعمری فاسق ) ـ لەگەڵیانابوو ، صفوانی کوڕی أمیە وتی بە ( أبوعزە ) ی شاعیر « تۆ هۆنەرو دەم‌لووسی ئەبێ بەهەڵبەست یاریدەمان بدەیت » وتی : من پەیمانم داوە بەمحمد کە لەدژی نەدووم ، ئەترسم ئەمجارە بکـەومەوە بەردەسـی‌و ڕزگارم نەبێ . وازی لێ‌نەهێنا تا لەگەڵیانا ڕۆیی .

## ژنانی قورەیش هاوبەشی ئەکەن

ژنانی قورەیش بەسەرۆکایەتی ( هیندی کچی عتبە کەژنی أبوسفیان ) بوو سووربوون لەسەرئەوە بچن لەگەڵیاناو هاوبەشی‌یان بکەن ، پیاوەکانیان لەم ڕووەوە کەوتنە مشتو مڕ . . هەندێکیان لەسەرئەوە بوون بیان بەن ، چونکە باش ئەتوانن هانیان بدەن‌و کوژراوەکانی بەدریان بـیر بخەنەوە ، خۆ ئێمە نامانەوێ بکەڕێینەوە هەتا هەقی خۆمان ئەسێنین یا لەو پێنـاوەدا

لەناوئەچین . هەندێ تریان ئەم ڕایەیان بەلاوە پەسەند نەبوو ئەیان وت : ئەی گەلی قورەیش ئێوە چۆن ژن‌و ناموسی خۆتان ئەخەنـــە بەردەســی دوژمن ؟ کێ ئەڵێ ئێوە ژیرناکەون ، ئەوسا بەهۆی ژنەکانتانەوە ئابڕوتان ئەچێ . لەم کاتەدا ( هیند ) هاتە زمان‌و قیژانی بەملیاناو وتی : ئێوە لە ڕۆژی بەدرا خۆتان دەرکردو هاتنەوە باخەڵی ژنەکانتان ، بەڵێ ئێمە یەین وکەس نامان گێڕێتەوە هەروەکوو لەجاری بەدرا لە ( حجفە ) ژنەکانتان گێڕایەوەو لەوێ کەس‌و کارەکانتان کوژران‌و چاویان پێیان نەکەوتەوە .

قورەیش بەسێ‌هەزار کەسەوە لەجەنگاوەرەکان کەوتنە ڕێ‌و ژنانیشیان لەگەڵ خۆیانا برد بەسەرۆکایەتی هیند ـ کە لەبەدرا باوک‌و براو خۆشەـ ویستی کـوژرابوو ـ وەدووسەد ئەسپ‌و سـێ‌هەزار وشتـرو حەوت سەد زرێی جەنگی‌یان پێ‌بوو ، وەسێ ئالآیان هەڵ کردبوو ئالآ گەورەکەیان بە دەس (طلحەی کوڕی أبی طلحە ) وەبوو .

لەکاتی ڕێ کەوتنی ئەم سوپایەی قورەیشا عباس کوڕی عبدالمطلب مامی پێغەمبەر هەرچەند هێشتا هاوئاینی قورەیش بوو موسڵمان نەبووبوو بەڵام بەسۆزی خزمایەتی‌و دەمارگیریتی ویستی محمدی برازای ـ درودی‌لەسەربێ‌ـ ئاگاداربکا لەئیشەکە ، بەم بۆنەیەوە نامەیەکی بۆناردو بـە ڕوشنی هەموو شتێکی بۆباس کردو دای بەپیاوێکی ( غفاری ) کە لەماوەی سـێ ڕۆژا بی‌گەیەنێتە محمد . کابراکە کەوتەڕێ‌و ڕووبەمەدینە ڕۆیی .

قورەیش کەوتنە ڕێ‌و گەییشتنە ( أبواء ) وبەلای گـۆڕی (آمینە) ی دایکی پێغەمبەر دا تێ‌پەڕین ، هەندێ لەنەفامەکانیان ویستیان گۆڕەکە هەڵ بدەنەوە ، بەڵام سەرۆک‌و ژیرەکانیان نەیان هێشت‌و وتیان : ئابڕوومان ئەچێ‌و ئەبێتە باو لەناوعەرەبەکانا ، پاشان ڕۆیین تا گەیینە ( عقیق ) و

لەلای هەندێ لەتەپۆلکەکانی کەژی ( أحد ) دا خستیان ـ کەپێنج میل لەمەدینەوە دوورە ـ وەکەنیزەکەکانیان گۆرانییان پیا ئەوتن‌و سروودیان پیا هەڵ ئەدان‌و تەپڵ‌و دەف‌و مۆسیقایان بۆلێ ئەدان .

لەم لایشەوە کابرای غفاری کەیشتە مەدینەو لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ( د . خ ) لە ( قباء ) بوو لە دەرگای مزگەوتا کەخەریـــك بوو سواری وڵاخەکەی ئەبوو ئەچووەوە بۆمەدینە پیاوەکەی بەخزمەت گەیی ونامەکەی دایە وە ( أبی ) ی کوڕی ( کعب ) بۆێ خوێندەوە . پێـغەمبەر ویستی جارێ کەس پێی نەزانێ ، کەچونەوە مەدینە چوو لای (سعد) ی کوڕی ( ربیع ) لەماڵەوەو رووداوەکەی بۆگێڕایەوەو فەرموویشی : با جارێ کەس نەزانێ ، بەڵام ژنی (سعد) گوێی لێبۆو کارەکە بەنهێنی نەمایەوە .

پێغەمبەر ( أنس‌و مۆنسی ) کوڕی ( فضالەی ) نارد بۆهەواڵ زانینی قورەیشەکان ، بینییان وانزیك بوونەتەوەو وڵاخ‌و وشترەکانیان بەرەڵا کردوە، بۆناو کشت‌و کاڵی مەدینە . وەبەدوای ئەوانا ( حبابی ) کوڕی (منذر)ی کوڕی ( جموحیش ) نارد ، هەمو هاتنەوەو هەواڵیان دایە وەکو ( عباس) نوسیبووی . پێغەمبەر ( د . خ ) کەوتە بیرکردنەوە لەئیشەکەدا (سلمە)ی کوڕی (سلامە) چووە دەری شارو بینی وا پێشەنـــگی سوپای قورەیش نزیك بووەتەوە لەمەدینەوەو خەریکە دێتە ناوشارەوە ، بەکورجی گەڕایەوە وهەواڵی‌دا بەخزمەکانی ، أوس‌و خزرجی‌و مەدینەیی بـە ڕوویەکی کشتی ترسان لەئەنجامی ئەم جەنگە کەوا قورەیش بە هەمـوو توانایانەوە خۆیان بۆئامادە کردووە ، تا وای لێهات پیاوە دلێرە موسڵمانەکان شەو بەچەکەوە لەمزگەوتا ئەمانەوە لەترسی پێغەمبەر ، وەبەتەواوی پاسەوانی مەدینـەیان ئەکـرد .

## ڕاوێژکردنی پێغەمبەرو موسڵمانان :

لە بەیانی یا پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ هەموو موشڵمانە خاوەن ڕاکانی کۆکردەوە و ناردی بە شوێنی دوو ڕووەو (منافقە) کانیشاو کەوتنە وت و وێژ و ڕاوێژ .. کە چۆنەوە لە کۆی بەرەنگاری سوپایەی قورەیش بکەن ؟

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ خۆی ڕای وابوو کە لـە ناو مەدینەدا بمێننەوەو شارەکە بکەن بەقەڵاو سپێرو لە قورەیش کەڕێن باله دەرەوە بمێنێتەوە ، ئەگەر هاتنە ناو شار ئەمان ئەتوانن بەرەنگاریان ببن و بیان فڕێنن و زاڵ بن بەسەریانا ، وە ئەگەر لەدەرەوەیش مانەوە کەیفی خۆیا ئەو ئاخری ناچاری گەڕانەوە ئەبن . وەپیاو ەکەورەکانیش لەکۆچەری و یاریدەدەر هەر لەسەر ئەم ڕایە بوون . سەرۆکی دووڕووەکانیش (عبدالله)ی کوڕی ( سلول ) هەر ئەم ڕایەی بوو و هەڵیدایەو وتی :

« ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەمەو بەر هەر لەناو شارا ئەجەنگاین لەگەل دوژمنانمانا ، وەژن و منالانمان لەڕێزدا دائەناو کۆمەڵەبەردیان لە لاخۆیان دائەنا ، وەخانوەکانمان ســـپێربوون ، ئەگەر دوژمن بهاتایەتە سەرمان ژن و منال بەرد بـارانیان ئەکرد و خۆیشمـان لە کوڵانەکانا بە شمشێرتێیان ئەکەوتین ، وە ئەم شارەمـــان ـ ئەی پێغەمبەر ـ هێشتـا ژێر دەس نەخراوە و هەر کاتێ دوژمن تیایا پەلاماری دابێن بەسەریازال بووین ، وە ڕووی نەداوە کـە چوبینە دەرەوە بـۆ ڕووبـەڕووی دوژمن و ژێر نەکەوتبین . ئەی پێغەمبەر تۆ واز لە وتەو واتەی ئەم و ئەو بێنەو بەگوێم بکـە ، من ئەم ڕایەم لەپیـاوە پێشینە گەورەکانی خزمی خۆم وەرگرتووە کە بەسەر هاتی زۆریان دیوە »

ئەمەلەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە گەنجە خوێن گەرمەکان و ئەوپیاوانەی

لە جەنگی بەدرا بەشدار نەبوو بوون و لەسەر شانی خۆیان هەڵ ئەپچڕی بۆ جەنگێ لە وێنەی بەدرا هەتا ئەو شەرەف و ناوەیان دەس بکەوێ کە دەس بەدری یەکان کەوتبوو ، وە زۆر لەوانەیش کـە بەشداری بەدربوو بوون و خوا ئەو ســەرکەوتن و زاڵ بوونەی دابونێو وایان ئەزانی ئیتر هێز نیە بتوانێ لەبەریانا خۆی بگرێ ئەمانە هەموویان ڕایان وابوو بچنە دەرەوەی شار بۆجەنگانێ ئەوەك وادابنرێ ئەمان لەترسا لەشارا ماونەتەوە وناوێرن بچنە دەرەوە ، لەکاتێکا کەئێستە ئەمان زۆرترو ئامادە ترن بـۆ جەنگ تا ئەوانەی لەبەدرا جەنگان .. وەنوێنەری ئەم ڕێرە ئەی وت :

« نامانەوێ قورەیشەکان بکەڕێنەوە بۆوڵاتی خۆیانو ملـێن : محمدمان ئابڵوقەدا لەناو خانوو کۆڵانەکانی مەدینەدا ، چونکە بەمە دەم سوورئەبن لیمان ، ئەوەتە باخ و ڕەزەکانمانیان شێلاوە ، ئەگەر لەناو زەوی وزارەکانمانا دەریان نەکەین کەڵکی کشت و کاڵیان پێوە نامێنێ . قورەیش کۆمەڵێکی گەورەیان لەعەرەب و لەهاوپەیمانەکانیان لەخۆیان کۆکردۆتەوەو هـاتونەتە سەرمانو تەنگیان پێ هەڵچنیوین ، ئایا لێیان گەڕێینو ئەوان بێـن لەناو خانوو ماڵەکانی خۆمانا بەندمان بکەن وئابڵوقەمان بدەنو پاشان بەبێ وەی بگەڕێنەوەو ئازارێکیان پێ نەکات ؟!! ئەگەر بێتو ئەمەمان کـرد ئەوان زیاتر تەماعمان تێ ئەکەن و پەلاماری تاڵانمان ئەدەنو ڕێگامان لێ ئەبەستن و پاسەوانمان بەسەرەوە دائەنێن کەنەتوانین بجووڵێینەوە »

وەبەم جۆرە ئەوانەی ڕای چونە دەرەوەیان بوو یـــەك لەدوای یەك کەوتنە ووتاردانو باشی چونە دەرەوەیان ئەخستە پێـش چاوو ڕوشنیـان ئەکردەوە ، وەهەموو ئەیان وت : ئەگەر خوا سەری خستن بەسەر دوژمنی ئیسلاما ئەوە هەموو ئاواتیانە ، وەخوای گەورەش بەڵێنی ڕاستی داوە بە

پێغەمبەرەکەی کەئایینی ئیسلام سەرئەخات ، وەئەگەر ئەمان شکان‌و کوژران ئەوا شەهید ئەبن وجێگایان بەهەشتی بەرینە .

لەکۆتایی ئەم ڕاوێژە ڕاستەقینە سەربەستەدا پێغەمبەری خوا (د . خ) بۆی دەرکەوت کەوا زوربەی ڕا لەگەل چوونە دەرەوەدایە ، وەلەبەر ئەمە ناچاربوو بەپێی یاسای ڕاوێژ ( ألمشورة ) لەسەر ڕای ئەوان بڕواو فەرمووی : « لەشکانتان ئەترسم » وە بەڕێ کەوت ئەوڕۆژەیش ڕۆژی هەینی بووو دەیەمینی مانگی شەشەلأنی سالی سێیەمی کۆچی بوو ، پێغەمبەر ( نوێژی هەینی ) بۆکردن‌و وتار ( خطبە ) ی جوان‌و پڕ لەتام‌و پال پێوەنەری بۆفیداکاری بۆخوێندن‌و داوای سەبرو ئارام‌و خۆگرتنی لێ کردن وە لەدوای نوێژی عەسر چووە مالەوە بۆژووری خاتوعایشەو خۆی کورج کردو زرێی کردە بەرو شمشێری کردە ملو هاتەوە بۆناویان‌و فەرمووی : « سەر ئەکەون بەمەرجێ سەبرو ئارامتان بێ » ئەوکاتەی پێغەمبەر چووە مالەوە موسلمانەکان وتیان : پێغەمبەر ( د . خ ) پێی ناخۆش بوو کەبچێتە دەرەوە ئێوە ناچارتان کرد ، وە مادەم ئەوناڕازی بێ سەرناکەون خراپتان کرد ڕاکەتان شکاند . ( أسید ) ی کوڕی ( حضیر ) و(سعدی) کوڕی ( معاذ ) کە ڕایان دانیشتن بوو لەناوشارا وتیان بەوانەی ڕایان لەسەر چوونە دەرەوەبوو : « هەموو ئەزانن کەپێغەمبەر حەزی ئەکرد لە ناوشارا بمێنێتەوە ، ئێوە ناچارتان کرد کەلەگەل پێ‌ناخۆشیدا بچێتە دەرەوە ، ئێستەیش ئێوە ئیشەکە بخەنە دەستی خۆی وچی فەرموو وابکەن وڕای لەسەر چێ‌بوو گوێ ڕایەلی بکەن » ئەوانیش دلیان نەرم بوو لە ئەنجامی کارەکە ترسان‌و پەشیمان بوونەوە ، کەپێغەمبەری خوا ( درودی لەسەربێ ) بەئامادەیی‌یەوە هاتە دەر وزرێ‌و شمشێری بەستبوو ، کۆمەلەکە

بەرەوزووی ڕۆیین‌و پێیان وت : « ئەی پێغەمبەری خوا ئـێمە نامانەوێ
پێچەوانەی ڕاو فەرمایش‌و فەرمانی تۆ بجولێینەوە ، تـۆخۆت چی بەباش
ئەزانی وەها بکە وئێمە گوێ ڕایەڵی ئەکەین ئیشەکە بەدەستی خواو بـە
دەستی تۆیە » .

پێغەمبەریش ( د٠خ ) فەرمووی : « ئەوسا من وام وت‌و ئێوە نەتان
بیست ، تازە تێ پەڕیوە ، کەپێغەمبەر چەکی هەڵگرت ئیتر بۆی ڕەوا نیە
دای بنێتەوە هەتا فەرمانی خۆی ئەباتە سەر لەگەڵ دوژمنەکانیا ، من چیم
پێوتن ئێوە ئەوە بکەن‌و بەگوێم بکەن ، ئـێوە سەرکەوتوو ئەبن ئەگەر
سەبرو ئارامتان ببێ »

پێغەمبەری خوا لێی ڕوون بوو ئەنجامی جەنگەکە چۆن ئەبێ وئەم
چوونە دەرەوەیە ئەبێتە هۆی شکاندنیان ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا ناچار بـوو
کەبەپێی یاسا بجولێتەوە ئەبێ پەیڕەوی یاساو بیرو باوەڕەکانی ئیسلام
بکا . ئەبێ پەروەرشی ئومەت بکاو لەسەر بەجێ هێنانی یاسا ڕامیان بێنێ
وە ڕاهێنانی هەرکۆمەڵێ بەراوردو کارەساتی گرانی ئەوێ‌و لەکاتی کارەسات‌و
تاقی کردنەوەدا ڕاست لەناڕاست وپاك لەپیس جیا ئەبێتەوەو مەردمەکان
پێ ئەگەن وئامادە ئەبن وپەند وەرئەگرن .

پێغەمبەری خوا ( د٠خ ) لەخەوا دی بووی کەوا « کەلێنێك بووەتە
شمشێرەکەی ، وەگایەك سەربڕاوە ، وەدەسی خستۆتە زرێیەکی مەحکەمەوە»
هۆی کەل بونی شمشێرەکەی بەکوشتنی پیاوێکی خزمی نزیکی لێك‌دابووە
وە ، وەسەربڕینی گاکەی بەکوشتنی کۆمەڵێ لەیارەکانی دانابوو ، وەزرێ
مەحکەمەکەی بەناوشاری مەدینە لێـك دابووەوە . کەچـــی لەگەڵ ئەم
زانینەیشا هەرلەسەر بەجێ هێـــنانی یاسای ڕاوێژ ڕۆیی‌و نەی ویست

پێچەوانەی بیروباوەڕێکی ئیسلام بڕوات هەرچەند زیانیشیان پێ ئەگات بۆئەوەی دەرسێکی عەمەلی بێ بۆموسڵمانان هەتا هەتایە .

## ڕێ کەوتنی سوپای ئیسلام

سوپای ئیسلام کۆبووەوەو کەوتە ڕێو ژمارەیان لە هەزار کەس تێ ئەپەڕی پێغەمبەری خوا ئالآی کۆچەری دایە دەستی ( مصعبی ) کوڕی ( عمیر ) وەئالآی خەزرەجی دایە دەس ( حبابی ) کوڕی ( منذر ) وە ئالآی ئەوسی دایە دەس ( أسیدی ) کوڕی ( حضیر ) کەکەیشتنە لای ( ثنیە ) کۆمەڵێکی بینی‌و پرسی : ئەوانە کێن ؟ وتیان : ئەوانە جوولەکەن وهاوپەیمانی (عبدالله) ی کوڕی (أبی) ن . فەرمووی : داوای یارمەتی ناکرێ لەکافر بۆسەر کافر ، یا بگەڕێنەوە یا موسڵمان بین . جوولەکەکان گەڕانەوە بۆمەدینە ، وەپێغەمبەر کەوتە ناو گەنجەکان‌و هەر کامی بەمنال بزانی‌یایەو پیا ڕانەبینی‌یایە کەلەجەنگا خۆی پێ بگیرێ ئەی گێڕایەوە . چەند کەسێکی لەبەر منالی گێڕایەوە .

شەو لەوێدامانەوە ، ( محمد ) ی کوڕی ( مسلیمە ) ی کرد بە سەرۆکی پاسەوانەکانی سوپا ( زکوانی ) کوڕی (قیسی) کرد بەپاسەوانی تایبەتێ خۆی . بەیانی کەوتنەڕێ تا کەیشتنە نێوانی ئوحود و مەدینە ، لەوێدا ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبی ) ی کوڕی ( سلول ) - سەرۆکی ناپاکەکان - لە خۆیەوە کەوتە بڕوبیانوو کرتن و ئەی‌وت : محمد بەگوێی ئێمەی نەکردو بەواتەی منال و نەفامەکان ناوشاری بە جێ‌هێشت ، بۆچی خۆمان بدەین بەکوشت ؟ ! ! . وەلەگەڵ سێ‌سەد کەس لە هاوباوەڕەکانی ( منافقەکان ) گەڕانەوە .

گەڕانەوەی دووڕوەکان خەریك‌بوو تین‌بکاتە سەر دوو کۆمەڵ لەموسڵمانەکان

و سەریان لێ بشێوێ : بەرەی ( حارثە ) لە خەزرەج و بەرەی (سلمە) لە ئەوس ، بەڵام باش بوو ڕەحمی خوا فریایـان کەوت و خوای گەورە پاراستنی . وە موسڵمانەکان دەربارەی ناپاکەکان بوون بەدوو بەشەوە : هەندێ ئەیانوت : بیانکوژین و هەندێ تریان ئەیان وت : لێیان بگەڕێن هەتا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی بۆ ناردن : (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا ؟ أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ؟ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً ) النساء: ٨٨

ئەمجار پێغەمبەرو موسڵمـانە ڕاستەقینەکان ڕۆیشتن هەتـا گەیشتنە ( أحد ) و پشتیان دا بەکەژەکەوە و ڕوویان کردە قورەیش ـ کە لەناو دۆڵێکا لای ( أحد ) بەزی بوون ـ وەشەو لەوێدامانەوە .

## دەس پێ کردنی جەنگ

هەردوو سوپاکە لێك نزیك بونەوە و وردەوردە هەرا دەس پێ کرا .. یەکەم کەسێ هەرای دامەزراند أبو( عامر ) ی ( فاسق ) بوو کەبەپانزە لە ئەوسی یەکانی خزمی یەوە هاتبووە ناو قورەیشەوە و بەڵێنی دابوونێ . کە أوسی یەکانی خزمی هەرپێیان زانی یەنەلای ئەم و لەڕانی ئەم دەرناچن و یارمەتی قورەیش ئەدەن ) . . . یەکەم کەسێ بوو لەڕیزی قورەیش هاتە دەرەوەو بـانگی کرد : ئـەی بەرەی اوس من أبوعامرم . أوسی یە موسڵمانەکان وەڵامیان دایەوە : دەك چاوت کوێربێ ئەی لەخوایاخی . وتی : وادیـــارە دوای من توشی خراپەبوون ، لەم کاتەدا ئیتر هەرا داگیرسـا . . بەندەکانی قوریش و ( عکرمە ) ی کـــوڕی ( أبوجهل ) ویستیان لەلای چەپەوە هەڵمەت بەرنەسەر موسڵمانەکان ، بەڵام موسڵمانەکان بەرد بارانیان کردن و گەڕانەوە .

لەم کاتەدا ( حمزە ) ی مامی پێغەمبەر ـ ڕەزای خوای لەسەربێ ـ نرکەیەکی لێداو وەکو هەوری بەهـــار گرمانی و دەنگی جەنگی بەرز کردەوەو فەرمووی : بکوژە بکوژە و خۆی هەڵدایەناو سوپای دوژمنەوە ، وەلەولاشەوە هەڵگری ئاڵای قورەیش ( طـلحە ) ی کوڕی ( أبوطلحە ) هاواری کرد : کێ یەتە مەیدانم ؟ علی کوری أبوطالب بۆی چوو لەناوەڕاستی مەیدانـا کـوشتی ، پێغەمبەر زۆری پێخۆشبوو فەرمووی : ( اللّٰه أکبر ) موسڵمانەکانیش وتیان : ( اللّٰه أکبر ) ، ئەمجـار عثمانی برای ئاڵاکەی هەڵگـرت و ( حمزە ) یش پەلاماری دایەو کوشتی ، دوای ئەو سـعدی برایان ئاڵاکەی هەڵگرت وسعدی کوڕی أبێ وقاص ـ یـاعلی کوری أبی‌طالب ـ هەڵمەتی بۆبرد و کوشتی . بەم پێیە یەك لەدوای یەك بەرەی ( عبدالدار ) ئاڵایان هەڵ ئەگرت و ئەکوژران هەتا نۆکەسیان لێ کوژرا ، وەدوا کەسیان ( صؤابی حبش ) بووکەبەندەی بەرەی ( عبدالدار ) بوو ئاڵاکەی هەڵگرت و ( قزمان ) شمشێرێکی داله دەستی ڕاسـتی شکانی بەدەستی چەپ گرتی ، ئەویشی شکان ، بەباسکەکانی و سنگی ئاڵاکەی گرت و خۆی بەسـەرا چەمـانەوە و ئەی وت ئەی بەرەی ( عبدالدار ) ئایا کلەییم لێ ئەکەن ؟ ئەمجـار قزمـــان ـ یـا ( ســـعد ) ی کوڕی ( أبی‌وقاص ) ـ لێی‌داو کوشتی .

( حمزە )ی کوڕی ( عبدالمطب ) لـەسەرەتای ئەم جەنگەدا وەکو شـێری بێشەلان پەلامـــاری ئەداو کافرەکانی شـەلو پەت ئەکـرد ، وەلـەم جەنگەدا — وەکـو جەنگی بەدر — شـــمشێری بوڕندەی خوابوو ، زۆری لەقورەیشەکان کوشت . . وەبەهەرکامیان ئەگەیی لەت و پەتی ئەکردو ڕووی ئەکردە هەرلایـەك لەترسا دریـان ئەدا . بەلام ـ

بەداخەوە ـ زۆری نەبرد کە (وحشی حبشی) رمێکی لێداو شەهیدی کرد .
وەهەروەها أبو دجانەیش یەکێ بوو لەوانەی بەهەڵمەتەوە خۆی کوتایە ناو قورەیشەوە و دەسەسرە سوورەکەی بەسەرەوەبوو شێمشێرەکەی پێغەمبەری خوای خستبووەکارەوە بە هەرکەس ئەگەیشت ئەی کوشت و ئەی بڕی هەتاسوپاکەیانی لەت کرد .. بینی یەکێ خەریکە بەناو کوژراو وبریندارا ئەگەرێو لەتیان ئەکا ، وەکو پلنگ بۆی کشاوهەڵی کوتایە سەری کەچاوی پێی کەوت قیژانی و هاواری کرد ، بینی ئەمەژنە و هێندی ژنی أبوسفیانە ، ئیتر گەڕایەوە و پێی ناخۆشبوو شمشێری پێغەمبەر بدالەژن سەرلەبەیانی سەرکەوتن ئەشی موسلمانەکان بوو . . خەفتایان لەگەورەکانی قورەیش کوشت و ئاڵای ئیسلام هەر پێش ئەکەوت و موسلمانان ـ بە کۆچەری و یاریدە دەرەوە لە مەیدانی شەرەف دا بەرەو پێش خۆیان ئەکوتا ، وە کاتێ ئاڵا هەڵگرەکانی قورەیش کوژران ئاڵاکەیان کەوتە زەوی ژێرپێ خراو سوپاکەیان شکاو پشتیان هەڵ کردو لەگەڵ ژنەکانیانا کەوتنە ڕاکردن بەرەو دواوە ، موسلمانەکان کەوتنە دوایان و گرمەی ( لاإله إلاالله ) و ( الله أكبر ) و بکوژە بکوژە ئاسمانی پڕ کرد بوو هەتا لە سوپاگاە دووریان خستنەوە ، لێرەدا ـ بەداخەوە ـ زۆر لە موسلمانەکان کەوتنە کوکردنەوی تاڵانو ئەم زاڵبوونە سەر خۆشی کردن . . .

## لەفەرمان دەرچون :

کاتێ ئیرئەندازەکانی سەر کەژەکە ـ ئەوانەی پێغەمبەر فەرمانی پیادان : بەهیچ کلۆجێ سەر کەژەکە بەجێ نەیەڵن و نەیەنە خوارەوە ـ بینییانوا کافرەکان شکان و موسلمانەکان کەوتنە سەر شکستەیان و خەریکن تاڵانەکەیان کۆ ئەکەنەوە لە ناوخۆیانا وتیان : » ئێمە بەخۆڕایی بەم

کـەژەوە چی بکەین ؟ ئەوەتە خوا دوژمنەکانی شکاندو وبراکانمان خەریکی کۆکردنەوەی تالآنەکەیانن‌و چوونەناو سوپـا کەیانەوە ، بابڕۆین لەگەڵیانا بەشداری تالآنەکەبین » .

هەندێکیان ناڕازی بوون و ووتیان : ئەی پێغەمبەرنەی فەرموو : لە جێگای خۆتانا بمێننەوە و بـەجێ مەیەڵن ئێمە شکاین یا شکانمان ؟ وتیان : مەبەســـ پێغەمبەر ئەوەنەبوو کە دوای تەواو بوونی جەنگیش ئێمە هەرلێرەدا بمێنینەوە . بەم‌پێیە لێ‌یان‌بوو بە مشت‌ومڕو سەرۆکەکەیان ( عبدالله ) ی کوڕی ( جبیر ) هەڵساو وتارێکی بۆ دان‌و داوای لێ‌کردن کەفەرمانەکەی پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ نەشکێنن‌و لە جێی خۆیانا بمێننەوە . بەڵام زوربەیان بەگوێ‌یـان نەکردو لە فەرمـانەکە دەرچوون و هاتنە خوارەوە ، وەبێجگە لەچەند کەسێ ـ کە لەدە کەس کەمتربوون ـ بەلای ( عبدالله ) وە نەمانەوە و هەموو هاتنە خوارەوە و خەریکی تالآن کۆکردنەوە بوون .

## گەڕانەوەی دەور بۆسەر موسڵمانەکان :

( خالد ) ی کوڕی ( ولید ) کە سەرکردەی سـوارەی قورەیـش بوو لەوماوەیەدا ئەگەڕا بۆشوێن‌و هەلێك تالێ‌یەوە بتوانێ پشتی موسڵمانەکان بگرێ و بیانخاتە ناوەوە ، بەڵام ڕێگای نەبوو و تیرئەندازەکان ماوەیان نەئەدا و هەر کە نزیك ئەبووەوە بەتیر ئەوانەی سەر کەژەکە شپرزەیان ئەکردن ، کە زانی وا تیرئەندازەکان کەژەکەیان بەجێ‌هێشت و ئاگایان لێی نەماوە ئیتر هەلی بۆ هەڵکەوت و بەخۆی و سوارەکانیەوە لـە پشتەوە هاتن و سەر کەژەکەیان داگیرکردو (عبدالله) و هاوەڵەکانیان شەهید کردو دوای ئەوە ( خالد ) ترکەیەکی لێداو لە دواوە دای لە موسڵمانەکان ،

قورەیشە شکاوەکان زانی‌یـان ئەوە ( خالد ) ە و پشتی لە موسلمـانەکان گرتووە گیانیان هاتەوەبەبەراو دەستیان دایەوە چەك‌و گەڕانەوە بۆ سـەر موسلمانەکان‌و ژنێکیان هات‌و سەری ئالاکەی لەناو قوڕو خاکا دەرهێناو بەرزی کردەوە ، وە لەهەمولایەکەوە دەوری موسلمانەکانیان گرت .

موسلمانەکان کەبەمەیان زانی سەرسام بوون ، هەرچی‌یان لە تالان کۆکردبووەوە فڕیان‌داو پەلاماری چەکیـان دا و هەلمەتیان بۆ بردنەوە . بەلام تازە چ سوود ؟ ئەوسا ئەجەنگان بەسەر گەرمی‌یەوە بۆ لەناو بردنی کوفرو زال‌بوون بەسەر کافرەکاناو ئێستە ئەجەنگن بۆ خۆڕزگار کردنیان لەدەس مردن !! ئەوسا ڕیزێکی ڕێکخراوبوون بەپێی پڕۆگرام‌و نەخشەیەکی شیرین‌و ئێستە شپرزەبوون و شیرازەی نەخشەکەیان پچڕاوەو هەریەکە کەوتۆتە لایەکەوەو فەرمان دەردیارنیەو هەریەکە ئەیەوێ خۆی دەربازبکا ، هەتاوایان لێهـات موسلمان ئەیدا لە موسلمـان بە دوژمنی ئەزانی . . کۆمەلێ لە موسلمانەکان پەلاماری ( یمانی ) باوکی ( حذیفه ) ی کوڕی ( یمانیـان ) داو ( حذیفه ) چاوی لی‌بوو هـاواری‌کرد : موسلمانەکان مەی‌کوژن ئەوە بـاوکمە ، بەلام گوێیان لێ‌نەبوو کوشتیـان.( حذیفه ) وتی : ئەی خوا لێتان خۆشبێ خۆ هاوارم لێ‌کردن . دوایی پێغەمبەری خوا ویستی خوێنەکەی بدابە (حذیفه)و (حذیفه ) یش ـ خوالێی‌ڕازی‌بێ ـ وەری‌نەگرت‌و وتی : خوێنەکەی خێربێ بۆ موسلمانـان . وە بەم کارە (حذیفه) زیاتر خۆشەویست‌بوو لای پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ

ئەوەی کەلە هەموو ناخۆشتر بوو پیاوێکی قورەیش ( إبن تمیئه ) ناو ( مصعبی ) کوڕی (عمر ) ی کوشت کەهەلگری ئالای موسلمانان بوو

( مصعب ) - خوا لیّ ڕازی بێ - ڕەنگو ڕووی زۆر لەپێغەمبەرئەچوو بۆیە بڵاوی کردەوە وهاواری کرد : ( محمد ) م کوشت . وەبەمە هاواری ( محمد کوژرا ) بڵاوبووەوە ، وەئەم هاوارە ئەزمی زۆری لە موسڵمانەکان شل‌کرد ، بوویان ئەی‌وت : ( محمد ) کوژرابێ ئیتـر ئێمە لەسەرچـی بجەنگین !! بابچینەوە ناوخزمەکانمان ئەوان ئەمان پارێزن ، وەکۆمەڵێکیان گەڕانەوە بۆمەدینە ، هەندێ‌تر لەوانەی وایانزانی پێغەمبەری خوا (د.خ) کوژراوە - وەکو أبوبکرو عمری کوڕی ( خطاب ) و ( طلحە )ی کوڕی ( عبیدالله ) و کەلێکی‌تر لەکۆچەری‌و یاریدەرەر - ڕوویان کردە کەژەکە وخۆیان دابەزەویداو هەناویان تیا نەمابوو ودەسیان دایە بەرئەژنۆیان (أنسی) کوڕی ( نضر ) دای بەلایاناو وتی : ئەوە بۆچـی دانیشتوون ؟ وتیان : پێغەمبەری خوا کوژراوەوتی‌جا ئێوە دوای ئەو ژیانتان بۆ چی‌یە ؟ هەڵسن بمرن لەسەرئەوەی کەئەوی لەسەر مردوە ، ئەمەی وت‌و ڕووی کـردە دوژمن‌و جەنگی پێش مەرگانەو فیداکارانەی کرد ، وەئەکوژرا هەتاحەفتا برینی لێ‌کرا بەڕم‌و شمشێرو تیر ، وەکەس نەی‌ناسی‌یەوە تەنیا خوشکێکی نەبێ کەبەپەنجەیا ناسی‌یەوە .

قورەیشەکان کەئەم هاوارەیان بیست بەجارێ هێرشیان بردە سەر ئەو ناوچەیە کەپێغەمبەری خوای لێبوو ، دیارە ئەیان ویست لەدرۆو ڕاستی هەواڵەکە تێ‌بگەن ، یاخۆ هەموو بەشداربن لەکوشتن‌و برینیاو ئەم‌بەشدار بوونەیشیان بیێتە جێگەی شانازی‌و پشتاو پشت بکەڕێتەوە . ئەمەیە ڕاو تێ‌گەییشتنی کوفرو نەفامیتی لەهەموو چەرخ‌و دەورێکا وهەوڵ ئەدا بۆبەشدار بوونی لەکوژانەوەی بانگی چارە سەرکردن‌و ڕزکاریداو خۆی بەبەختیـار ئەزانێ ئەگەر بەشی بێ لەلەناوبردنی بانگ کەرا !!! .

تا لەم کاتی تەنگانەو تەنگو چەڵەمەیەدا پێغەمبەری خوا ( د . خ )وەکو کەژی دامەزراو لەجێگای خۆیا مایەوەو لەوەو جوڵەی لێوە نەهات ، وە کەوتە تیر باران کردنی کافرەکان هەتا خەریك بوو تیرو کەوانەکەی بشکێ وەکۆمەڵێ لەیارەکانی لەدەوری مابوونەوە : لەوانە ( أبوطلحه ) ی یاریدە دەر کەپاریزگاری پێغەمبەری ئەکردو تیرئەندازێکی بلیمەتو دلێر بوو ، تیرەکانی هەڵ ڕشتە بەردەمی پێغەمبەری خوا ( د . خ ) ئەی‌وت : ڕووی من فیدای ڕووی تۆبێ . هەرموسڵمانێ لەوێوە بهاتایە پێغەمبەر ئەی‌فەرموو: تیرو کەوانەکەت بێنە بۆ ( أبوطلحه ) وەکەتیری ئەهـاویشت پێـغەمبەر ( د . خ ) خۆی هەڵ ئەبڕی تابزانێ کافرەکان چی‌ئەکەن‌و (أبوطلحه)یش ئەیوت : ئەی پێغەمبەری خوا دایكو باوکم فیدات‌بێ مەڕوانەنەوەك تیرێکی دوژمنت بەربکەوێ ، لاشەم لەپێش لاشەتەوەیە .

قورەیشەکان کەوتنە بەرد باران کردنی پێغەمبەر . (عتبه) ی کوڕی ( أبی‌وقاص ) بەردێکی کرتە پێغەمبەرو دانی پیرۆزی شکان ( حاطبی ) کوڕی ( أبی بلتعه ) کەوتە سەری وکـوشتی ، وە ( عبدالله ) ی کـوڕی ( شهابی ) (زەهری ) ڕووی شیرینی برینـدار کرد . وە ( ابن قحیئه ) ی چەپەڵ بەردێکی پیا ماڵی‌و ئەڵقەی زرێ کەی چوو بەڕوویاو هەردووکوڵمی پیرۆزی برینـدار بوو ( أبوعامر ) ی فاسق چەند چاڵیـکی هەڵ کەندبوو سەریانی داپۆشیبوو ، بۆئەوەی موسڵمانەکانی تێ‌بکەوێو ، پێغەمبوری‌خوا کەوتە یەکێ لەوچاڵانەوەو زۆر ئازاری پێ‌کەیی‌و هەردوو ئەژنۆی برینداربوون‌و لەسەر خۆ چوو ، (علی) کوڕی ( أبوطالب ) و (طلحه) ی کوڕی ( عبیدالله ) بەپەلە ڕایان کردو دەریان هێنایەوە ، وەبەم‌کومەڵەوە ئەیان ویست وردە وردە سەرکەون بۆسەر کەژەکە تا خۆیان ڕزگاربکەن‌و نەیەڵن

دووباره پشتیان لێ بکرنەوه ، وەبەهێزی بازووی تـیر ئەندازەکان توانی‌یان ئەوکافرانە بکێڕنەوه کەئەیان ویست بچنــە سەرکەژەکە ، وەموسڵمانە پەرتەوازەکان گەڕانەوەو ئەتوت لەخەو ڕاپەڕیوون .

قورەیش بەهەواڵی مردنی محمد زۆر شادمان بوون ( أبوسفیان ) لەناو کوژراوەکانا بۆی ئەگەڕا ، چونکە لەلایەن موسڵمانەکانەوە ئەوهەواڵە بـە درۆ ئەخرایەوه لەسەر فەرمانی پێغەمبەر خۆی ئەوەك بەجارێ هێرش‌بەرن ولەناوی بەرن ، بەڵام (کعبی) کوڕی (مالـك) ڕوو بە ( أبودجانە ) و هاوڕێکانی هات کەچاوی بەپێغەمبەر کەوت بەدەنگی بەرز بانگی کرد : موسڵمانەکان مژدەبێ ئەمە پێغەمبەری خوایە ، پێغەمبەر ( د . خ ) دەستی لێ‌هەڵ وەشان بێ‌دەنگ‌بە . ئەمجار پێغەمبەر لەگەڵ کۆمەڵـێکا ڕۆیین بۆ شیوێك لەودیو کەژەکەوه ، پێغەمبەر لەڕۆیشتنا خۆی ئەدا بەسەر شانی (سعد) ی کوڕی (أبی‌وقاص) و (سعد) ی کوڕی (عبادە) داو (أبوبکر) و (عمر) و (ئلی) و ( زبیر ) و (حارثی) کوڕی ( حسمە ) وگەلێکی تریشی لەگەڵا بوو .

بانگەکەی ( کعب ) دیارە تینی زۆری کردە سەر قورەیشەکان ، بەڵێ هەندێکیان باوەڕیان نەکردو وایان زانی بۆ زات نانە بەری موسڵمانەکانە بەڵام زۆریان بەڕاستیان دانا بۆیە ئەیان ویست بڕۆن بـەشوێنیانا ، وە لەوکاتەدا (عثمان) ی کوڕی ( عبدالله ) ی کوڕی (مغیرە) ڕووی‌تێ‌کردن وپێغەمبەری چاوکردو وتی : ئەوە (محمد) ە ، دەرنەچـم ئەگەر دەرچێ ئەوەی وت‌و وڵاخەکەی خستیە خوارەوەو کەوتە ناوچاڵێك ( حارث ) ی کوڕی حسمە چوبۆی‌و کوشتی ، وە (أبی) ی کوڕی (خلفیان) پێ‌ی‌گەیی وئەی‌وت : کوا محمد ؟ دەرنەچم ئەگەر دەرچێ ( أبی) بەسەر وڵاخێکی

چاکەوە بوو کەلەمەکەدا دای بەستبوو ئەی‌وت : (محمد) ی لەسەرئەکوژم کەپێغەمبەری خوا ( د . خ ) ئەوەی بیست فەرمووی : ئەگەر خوا حەزکا من ئەوئەکوژم . کەنزیك بووەوە پێغەمبەر ڕمەکەی حارثی گرت بە دەسەوەو ڕمێکی لێداو برینداوی کردو دیاربو جێگای کوشندەی گرتبوو بۆیە کورج گەڕایەوەو وەکو گا ئەی‌بۆڕانو لەڕێگادا کوشتی‌و خواستەکەی پێغەمبەر هاتە دی ، (خضیر) ی بەگ لەپەڕاوی ( نور الیقین ) دا ئەڵێ : « پێغەمبەری خوا ( د . خ ) بێجگە لە (أبی) کەسی‌تری نەکوشتوە نەلە أحدا ونەلەجەنگی ترا » .

کاتێ کەگەیشتنە دەمی شیوەکە (علی) چوو هەندێ ئاوی هێناو خاتو (فاطمە) دەم‌و چاوی پێغەمبەری ئەشۆری‌و ( علی ) ئاوی پیا ئەکرد ، خوێنەکەت نەئەوەستایەوە هەتا پارچە حەسیرێکیان سوتان‌و خۆڵەمێشەکەیان لێدا .

کاتێ چوونە سەر تەوقە سەری کەژەکە بەردێك هەبوو پێغەمبەرویستی بچێتە سەری بەڵام نەی‌توانی‌و بەکۆل سەریان خست . کەلەوێوە کافرەکانی بینی فەرمووی : نابێ سەرمان کەون ، خوایە هێزو پەنامان هەرلەتۆوەیە . ئا لەم کاتەدا سەیرئەکەن وا (خالد) بەتیپێ سوارەوە هەڵکەڕا بەکەژەکە بۆیان پێغەمبەر ( د . خ ) (عمر)و تاقمێکی بۆناردن‌و بەرەنگاریان بوون‌و گێڕانیانەوە ، وەموسڵمانەکان زیاتر سەرکەوتن بۆسەر لوتکەی کەژەکەو زۆر ماندوو شەکەتیش بووبوون هەتا پێغەمبەر لەبەر ماندویەتی‌و ئێشی برینەکانی بەدانیشتنەوە بەرنوێژی کرد بۆیان لەنوێژی نیوەڕۆداو ئەوانیش بەدانیشتنەوە نوێژیان لەدواوە کرد .

کەموسڵمانەکان لەدەوری پێغەمبەر کۆبونەوە هەرچەند زۆر ناڕەحەت

ومانده‌وو بووبوون به‌لاّم به‌چاو که‌وتنیـان به‌پێغه‌مبه‌ر حه‌ســـانه‌وه‌و دڵیان له‌ته‌په‌ ته‌پ که‌وت وسره‌وتن وهه‌موو خه‌ویان ئه‌هات‌و که‌وتنه‌ وه‌نه‌وزه‌ کوتن‌و هێنی وایان بو دانیشتبوو کاتێ به‌خۆی ئه‌زانی شمشێره‌که‌ی له‌ده‌س که‌وتووه‌ ڕانه‌په‌ری‌و خه‌به‌ری ئه‌بووه‌وه‌ .

قوره‌یش له‌ماندوبونیانا له‌موسڵمانه‌کان که‌متر نه‌بوون . . به‌تایبه‌تی له‌شکاننه‌که‌ی ســه‌ر له‌به‌یانیدا زۆر تێکچوبوون ، وه‌تاقی دوایی هه‌رچه‌ند سه‌رکه‌وتن به‌ئه‌ندازێك و موسڵمـانانیان شپرزه‌کرد به‌لاّم خۆگرتنه‌وه‌ی موسڵمانان به‌ره‌نگی بووزانی‌یان پێ‌یان ناوێرن و چاریان ناکه‌ن ، بۆیه‌به‌و ئه‌ندازه‌ سه‌رکه‌وتنه‌یان وازیان هێنا . ژنانی قوره‌یش به‌سه‌رۆکایه‌تی (هند) که‌تنه‌ ناو موسڵمانه‌ شه‌هید کراوه‌کان و ده‌ستیان کرده‌ ناشیرین کردنیان هه‌تا(هند) ملوێنکه‌یه‌کی له‌گوێ‌و لوتیان هۆنی بووه‌وه‌ ، وه‌کونی کرده‌ سکی ( حمزه‌ ) و جگه‌ری ده‌رهێناو که‌وته‌ خواردنی و هه‌رچی ئه‌کرد بۆی قوت نه‌ئه‌چوو .

که‌ قوره‌یش ویستیان بگه‌ڕێنه‌وه‌ ( أبوسفیان ) به‌رز بووه‌وه‌ بۆ سه‌ر که‌ژه‌که‌ و بانگی موسڵمانه‌کانی کرد : ئایا ( محمد ) تان له‌ناوایه‌ ؟ پێغه‌مبه‌ر ـ درودی له‌سه‌ربێ ـ فه‌رمووی : وه‌لاّمی مه‌ده‌نه‌وه‌ وتی : ئه‌ی کوڕی ( أبوقحافه‌ ) تان له‌ناوایه‌ ؟ فه‌رمووی : وه‌لاّمی مه‌ده‌نه‌وه‌ . وتی : ئه‌ی عمری کوڕی خطابتان له‌ ناوایه‌ ؟ وه‌لاّمیـان نه‌دانه‌وه‌ ئه‌مجار ڕوی کرده‌ کۆمه‌ڵه‌که‌ی خۆی‌و وتی : لـه‌ده‌س ئه‌م سیـانه‌یان ڕزگارتان بوو . لێره‌دا ( عمر ) خۆی پێ‌نه‌گـیرا وتی : بـه‌خوا ئه‌ی دوژمنی خـوا ئه‌وانه‌ هـه‌موزیندون و خوا به‌شـی به‌دبه‌خت کردنی تۆی هێشتۆته‌وه‌ . ئه‌ویش وتی : به‌خوا ( عمر ) من بـاوه‌ڕ به‌تۆ ئه‌که‌م هه‌تـا ( إبن قمیئة ) ، وه‌

ئەویش بزانن کەدەسکاری کوژراوە کانتان کراوەو من نەفەرمانم پێداوە و نە قەدەغەم کردوە و نەپێم خۆش بووە و نە پێم ناخۆشبووە ، پاشان بەهەموو هێزێ قیڕانی : باش بوو ، جەنگ بەنۆرەیە ئەم ڕۆژە بەڕۆژەکەی بەدر و وادەمان سالێکی ترو بەدربێ پێغەمبەر فەرمووی : بڵێن باشەو وادەمان بێو ڕۆژەکانمان وەکویەك نین . . کوژراوی ئێمە لەبەهەشتان و کوژراوی ئێوە لە ئاگری دۆزەخان . ئەبجار وتی : بوڵندبە ( هبل ) . پێغەمبەر ـ د . خ ـ فەرمووی بەعمر وەڵامی بدەرەوەو بڵێ : خواکەورەترو بوڵند ترە ، وتی : ئێمە ( عزی ) مان هەیەو ئێوە نیتانە . پێغەمبەر فەرموی : بڵێن : خوای کەورە پشتیوانی ئێمەیەو ئێوە پشتیوانتان نیە .

دوای ئەمانە قورەیش کوژراوی خویان کۆ کرد و کەڕانەوە ڕووبە مەکە . بەڵام موسڵمانەکان لەوە بیمیان بوو کەقورەیش بچنەسەر مەدینە بۆتاڵاڕ و یەخسیر کردن ، و بەوە زۆر نارەحەت بوون ، پێغەمبەر فەرموی بە( علی ) : بڕۆ شوێنی قورەیش بکەوەو بزانە چی ئەکەن ؟ ئەکەر سواری وشتر بووبوون و ئەسپەکانیان یەختەرمە کردبێ ئەوە بۆمەکە ئەکەڕێنەوە،وەئەکەر سواری ئەسپ بووبوون و وشترەکان لێخوڕن ئەوە بۆ مەدینە ئەچن ، قەسەم بەو کەسەی کیانی منی بەدەسە ئەکەر بۆ مەدینە بڕۆن ئەچم بۆیان و تاکیانم تیابێ لەکەڵیان ئەجەنکم . ( علی ) ئەڵێ : شوێنیان کەوتم ئەبینم سواری وشتر بوونو ئەسپەکانیان داوەتەبەر ڕووبەمەکە . پاشان پێغەمبەر ویارەکانی هاتنە خوارەوە بۆ ناو مەیدانەکە بۆ بەسەر کردنەوە و ئەسپەردە کردنی کوژراوەکانیان ، پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ئەکەڕا بەناو شەهیدەکاناو چاوی بە (حمزەی ) مامی کەوت کە بەو جۆرەی لێ کرابوو

زۆر پێی تێك چوو خەفەتباربوو فەرمووی : ( هیچ کاتێ کـۆستی وام ناکەوێو هێشتا شتی وام بەسەرا نەهاتووە کەئەوەندەم پێ ناخۆش بووبێ ) وەفەرمووی : ( ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان دەسم بەسەریانا ڕۆیی ئەبێ بـە جۆرێ لەگەل کوژراوەیانا بجولێمەوە هێشتا عەرەب نەی‌دی‌بێ ) لەمڕووەوە ئەم ئایەتەی بۆهاتە خوارەوە : ( لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْيُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ) واتە تۆ ئیشت بەدەس نیە وبەدەس خوایە لێیان ببورێ ئەگەر پەشیمان بوونەوە یا سزایان بدات چونکـــە ئەوانە زالمو تاوانبارن . ئیتر پێغەمبەر وازی لەوخەیالە هێناو دەسکاری کردنی مردوی قەدەغە کرد ، دوای ئەوە نوێژی لەسەر کـردو عەباکەی خۆی پیادا ، ئەبجار فەرمانی‌دا ( حمزه ) یان خستە ناوگۆڕەوەو دوای ئەو هەمـــوو شەهیدەکانیان ئەسپەردە کرد بەبەرکەکانی خۆیانەوە . دووانو سیان ئەیان خستنە گۆڕێکەوە ، چونکە لەبەر ماندوێتی نەیان توانی هەریەکە گۆڕێکی بۆهەل کەنن .

## هەرای حمراء الأسد

ڕۆژی شەممە پانزە هەمی مانگی شەشەڵانی سالی سـێ یەمی کـۆچی جەنگی أحد کرا ، وەلەدوای ئەسپەردە کـردنی شەهیدەکان پێغەمبـەرو موسلمانەکان بەودل برینداریو ماندوێتی‌یەوە گەڕانەوە بۆمەدینە ، جوولەکە وبت پەرستو دوو ڕووەکان کەوتنە دەربڕیـنی خۆشـیو شادمانی وهەر کە هەلێکیان دەس بکەوتایە ئەیان وت : ئەگەر بەدر نیشانەی پێغەمبەرێتی محمد بوو ئەی أحد نیشانەی چی‌یە ؟ پێغەمبەری خوا ( درودی‌لەسەربێ ) بیری کردەوە لەوە : ئەگەر کارێکی وا نەکەن هێزێ پیشان بدەنو دوژمن چاوترسێن بکەنو زات بخەنەوە دلی موسلمانەکان لەوانەیە دوژمن تەمایان

تێ بکەن‌و لەهەموو لایەکەوە هەڵ کوتنە سەریان . ئەمە لەلایەکەوە ، وەلە لایەکی ترەوە قورەیش لەناوخۆیانا لێیان بووە مشت‌و مــڕ کە بۆچــی گەڕانەوەو بەیەکجاری موسلمانەکانیان لەناو نەبرد .

( واقدی ) ئەگێڕێتەوە : ئەوشەوە پیاوە گەورەکانی مەدینە تا بەیانی لەدەورو بەری مالی پێغەمبەرا بوون پاسەوانی‌یان کردو بیمی ئەوەیان بو قورەیشەکان بگەڕێنەوە سەریان بۆمەدینە ، کەبەیانی داهـات‌و ( بلال ) بانگی‌دا ( عبداللهی کوڕی عمری مزنی ) هـات‌و هەوالی‌دا بـە پێغەمبەر ( د . خ ) کەلەناو خزمەکانیەوە هاتوە لە ( ملل ) «١» وقورەیش لەوێـدا بەزیوون وگوێیان لێ بووە لەناوخۆیانا ئەیان وت : هیچتـان نەکـرد ، هەلسـان چەند پیاوێکی دیارێتان لێ‌کوشتن‌و ئیتر لێیان گەڕان‌و بەتەواوی لەناوتان نەبردن‌و ئەوەندەیان ماوە کەبتوانن کۆبینەوە بۆتان ، بابگەڕێینە وەو لەڕیشەیان بێنین .

( صفوانی ) کوڕی ( أمیه ) بەمە قاییل نەبوو وتی : شتی وانەکەن چونکە تووڕەتان کردون‌و ئەترسم چی‌یان لەمەدینە ماوە لێتان کۆبێتەوە ئەمجارە ئێوە سەرکەوتن ، دوورنیە ئەگەر بچنەوە سەریان ئێوە ژێربکەون ، بگەڕێنەوە بۆمەکە .

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ فەرمووی : ( صفوان ) لەوان ڕاستتر ئەکا ، وەڕاستیش نیە ، بەوخـوایەی گیـانی منی بەدەسە ئەگەر بێنە سەرمان وەکو جاری پێشوویان بەسەردێ . کەلەنوێژی بەیانی بوونەوە پێغەمبەر فەرمووی بە (بلال) : بانگی جەنگ لێبدە ، وەهەرچی لە(أحد)ا لەگەلمان نەبووە نەیەت لەگەلمان . ئەم فەرمانەی‌دا هەتا تواناو دەستەلاتی

---

(١) شوێنێکە لەنزیکی مەدینە .

موسڵمانەکان دەرکەوێو گەورەیی پایەی هـاوبەشەکانی ( أحد ) بکـەوێتە ڕوو ، وەدوو ڕوەکان تێکڵاویان نەبن .

ڕۆژی یەك شەمە شانزەی مانگی شەشەڵان سوپای پێغەمبەر کەوتە ڕێ ( عبدالله) ی کوڕی ( أم مکتوم ) ی لەسەر مەدینـە دانا ، ئاڵای دایـە دەستی (علی) کوڕی ( أبی‌طالب ) سوپای موسڵمانەکان گەیشتە ( حمراء الأسدا ) ـ کەهەشت میل لەمەدینەوە دورە ـ وهێشتا قورەیشەکان لەمشت و مڕەکەیانا مابوونەوە کەئایا بێنەوە سەرمەدینە یا بڕۆنەوە ؟

( معبد ) ی ( خزاعی ) ـ کەهێشتا بت‌پەرست‌بوو ـ لەلای سوپای موسڵمـانەکانەوە هـاتو گەیشتە لای قورەیشەکانو لێ یـان پرسی : چی هەیە لەڕێکادا ؟ وتی : محمدو یارەکانی هاتوون بۆتان بەکۆمەڵێکی واوە کەهێشتا نەم دیوە ، هەرچی لەمەدینەدا بوو لەگەڵیا هـاتووە ڕق‌و قینیان لێ‌ئەچۆڕێ بۆتان‌و ئەیانەوێ تۆڵەتان لێ‌بکەنەوە .

لێرەدا ( أبوسفنان ) کەوتە بیرکردنەوە : ئەگەر ڕائەکاتەوە بۆمەکەو لەدەس موسڵمانەکان هەڵ دێ خەڵکی ئەڵێن : قورەیش دوای سەرکەوتنە کەیان شکان‌و ئیتر بایەخیان نامێنێ ، وەئەگەر ئەگەڕێـتەوە بۆ سەریان ئەترسێ ئەمجارە بەتەواوی شەقڵی قورەیش بشکێو لەناوبچن‌و سەرکەوتنە کەی دوێنێ‌یان بەهیچ بکەڕێ ، لەبەرئەمە کەوتە فڕوفێڵو لەگەڵ کاروانی ( عبدالقیس ) دا کەبۆمەدینە ئەڕۆیی پیاوی نارد کەمحمدو موسڵمانەکان بترسێنێ وبڵێ : قورەیش بڕیاریان داوە بگەڕێنەوە بۆمەدینەو موسڵمانەکان لەڕەگ‌و ڕیشە دەربێنن . بەڵام پێغەمبەرو موسڵمانەکان نەترسان‌و ئەزمیان شل نەبوو لەشوێنی خۆیانا وەکو کەژی دامەزراو مانەوەو بەشەو ئەهـاتن پێنج سەد ئاگریان ئەکردەوە کەلەهەموو لایەکەوە ئەبینـراو بەسوپـایەکی

گەورە ئەزانرا پێنج شەو بەم جـۆرە مانەوەو چاوەڕێی گـەڕانەوەی قورەیشیان ئەکرد ، بەلاّم قورەیش مەترسی یان لێ نیشتو گەڕانەوە بـۆ مەکە ، وەپێغەمبەرو موسلمانەکانیش بەسەربەرزی یەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە وبۆشەوی جومعە گەیشتنەوە ناوشار .

لەم ماوەیەدا أبوعزەی شـاعیر ـ ئەوەی لەبەدرا گیراو پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ بەزەیی پێداهاتەوە و بەخشی بەکچەکانی و بەبێ تۆلە بەری‌دا بەومەرجەی ئیتر نەجەنگێ و خراپ نەدوێ ، کەچی لە جەنگی ( أحد ) ا بەشـداری کردو چومەوە سـەر بەزمەکەی خۆی ـ کەوتە بەردەستی موسلمـانەکان و هێنـایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا بەگیراوی ، وتی : ئەی ( محمد ) ئەمجارەیش بمبەخشە بەکچەکانم و بەڵێنت ئەدەمێ جارێکی‌تر پەیمان نەشکێنم و ئیشی واتەکەم .

پێغەمبەری خوا ـ فەرمووی : نەأ بەخوا جارێکی‌تر ناچیتەوە ناو مەکەوە و دەستێ بێنی بەسمێلەکانتاو لە حجردا دابنیشی‌و بلێی : محمدم خەلەتان . ( زید ) بردی دای لەملی و کوشتی .

وەلە گەڕانەوەیانا بۆ مەدینە ( معـاویە ) ی کوری ( مغیرە ) ی کوڕی ( أبو العاص ) یان گرت (کە باپیرەی عبدالملکی کوڕی مروانە) وە بەفەرمانی پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ کوشتیان .

## ساڵی چوارەم

## پەشماوەکانی ( احد )

ساڵی چوارەمی کۆچی هەڵهات بەسەر موسلمانەکاناو هێشتا هیلاکی و ئیش‌و ئازاری ( أحد ) لـە جەستەیـان دەرنەچووبوو ، هەرچەند موسلمانەکان ویستیان بەبۆنەی هەرای (حمراء الأسدە) وە شوێن کەوتنیان

بۆ قورەیش سام و دەستەڵاتی خۆیان بگێڕنەوە ، لـەگەڵ ئەوەدا لە ناو مەدینەدا جوولەکە و بت پەرست و دووڕووەکان پێیـان خۆش ئەبوو و پلوتکیان لێ ئەدان ، وەتیرە عەرەبەکانی دەوروبەرو ڕێگـاو بانەکان ئەو ترس و بیمەیان لە موسلمـانەکان نەمـابوو ، بەڵکو هەندێکیـان لە بیری ئەوەدابوون هەرهەلیـان لێهەڵکەوت بدەن بەسـەر مەدینەدا . گـرانترین ئیش لەجیهانا بریتییە لەسەرۆکایەتیو فەرمانڕەوایی ئومەت لەدوای شکانو ژێرکەوتن ، سـەرپەرشتی کردن و بەرێوەبردنی بانگ لـە دوای توشی گیروگرفتهاتن . بەڵام ئیش هەرچەند گران بێ بەلای پیاوی هەڵکەوتوو قارەمانەوە بەسووك دائەنرێ . پێغەمبەری مەزن هەستی کرد بەوەترسییە گەورانەی چاوەڕێی مەدینەیان ئەکرد ، بۆیە زۆر بەدەربەسەوە بوو کە هەواڵـی عەرەبەکان بەگشتی و دەوروبەری مەدینە بەتایبەتی بزانێ ، بۆ ئەوە پێش ڕوودانی کارەسات چارەی بۆ بدۆزنەوە و سام و ترس بخاتەوە دڵی دوژمنەکان .

## سریەی أبوسلمە :

لە مانگی محرمی ســـاڵی چوارەما هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ کە ( طلیحە و سەلەمە ) ی کوڕی ( خویلد ) کە سەرۆکی بەرەی ( أسـد ) بوون خەریکن خزمەکانیان و ئەوانەی گوی ڕایەڵیـانن هەڵئەنێن و سوپـا کۆئەکەنـەوە و بەتەمای ئەوەن بێنەسـەر مەدینەو دەستێ بوە شێنن ، گوایە موسلمانەکان ( أحد ) لاوازی کردوون و ناتوانن بەرەنگاری یان بکەن .

پێغەمبەر بەخێرایی ( سـریە ) یەکی ڕێکخست و بەسـەرۆکایەتی ( أبوسلمە ) ناردی و ئاڵاکەی دایە دەس و فەرمانی پێدان کە بچنە

سەر بەرەی ( أســـد ) سریەکە سەدو پەنجـاکەس بوون . فەرمووی :
بەشەو برۆنو بەڕۆژ خۆتان لەمەکۆ بدەن با کەس پێتـان نەزانێ هەتـا
ئەدەن بەسەریانا .

( أبوسلمە ) وسریەکەی فەرمانەکەیان بەجێ هێنـاو لەبەیانی‌یـــەکا
شەبەیخونیان کردو دایان بەسەر بەرەی ( أسد ) ا وشپرزەیان کـردن و
خۆیان پێ ڕانەگیراو شکانو هەڵاتن ، ( أبوسلمە ) یش سوپاکەی کـرد
بەدوو برو برێکیانی ناردو کەوتنە سەرشکستەیان ، برەکەی تریان تالاڵنو
وشترو مەڕەکانیای کۆکردەوە پاشان کـۆبونەوەو لەتالاڵنەکە أبوسلمە پێنج
یەکی جیاکردەوەو ئەوی تریانی دابەش کـرد ، لەدوای دەڕۆژ بەسـەر
بەرزی‌یەوە هاتنەوە بۆمەدینە .

بەم کارە توانی‌یان تا ڕادەیەك بچنەوە جێی خۆیان وبیم بخەنەوە دڵی
دوژمنەکانیانەوە وەزۆری نەخایان ( أبوسلمە ) کـۆچی دوایی کـردو ،
برینێکی کەلە ( أحد ) ا لێی کرابو هاتەوە سۆو کوشتی وپلەی شەهیدی
وەرگرت .

# عبداللەی کوڕی أنیس

پێغەمبەری خوا ( د . خ ) بیستی کە (خالد) ی کوڕی ( سفیانی )
کوڕی ( نبیحی هزلی ) وا لە (نخلە) یالە (عرنە) وئەیەوێ لەشکر کۆبکا
تەوەو بێتە سەرپێغەمبەر ، پێغەمبەر (عبداللە) ی کوڕی ( أنیسی جوهنی )
نارد بۆکوشتنی (عبداللە) ئیزنی خواست کە بۆ پێك هێنـانی مەبەستەکەی
چاوو ڕاو بکا ، پێغەمبەریش ئیزنی داو فەرمووی : خـۆت بکـە بـە
(خزاعەیی) لەپێنجی محرما (عبداللە) کەوتە ڕێ کەگەیشتە ئەوێ (خالد)
لێی پرسی : لەچ تیرەیەکی ؟ وتی : لەخزاعەو بیستوومە ئەتەوێ لەشکر

کۆبکەیتەوەو بچیتە سەر (محمد) ومنیش هاتووم بۆلات ، (خالد)یش ئەی شاردەوەو وتی : بەڵێ خەریکی ئەوەم ( عبداللە ) هەرئەدواو خالد دوانئە کەی پێخۆش بوو هەتا هەل بۆهەلکەوت کوشتیی‌و دەربازبوو وهاتەوە بۆ مەدینەو هەواڵەکەی دابەپێغەمبەر - درودی لەسەربێ - وە (بنی‌لحیانی‌هزلی) وخزمەکانی خالد - دوای کوشتنی سەرۆکەکەیان بۆماوەیەك بێ‌دەنگ‌بوون پاشان کەوتنە فڕوفێڵ بۆتۆڵە سەندنی .

## ڕووداوی رجیع (١)

( بنی لحیانی هزلی ) زانی‌یان بەجەنگ‌و هەرا ناتوانن ئەم‌تۆڵەیەبسێننەوە لەبەرئەوە کەوتنە دۆزینەوەی فێلێکی شەیتانی :

کۆمەڵێکیان چونەلای تیرەی (عفل) وتیرەی ( قارە) - کەدووتیرە بوون لە ( بنی هونی ) کوری ( خزیمە ) ی کوری ( مدرکە ) وبەڵێنیان دانێ کە پارەو وشترێکیان بدەنێ ئەگەر ئەوان توانی‌یان بەهەرفێڵێ بووە کۆمەڵی لەیارەکانی (محمد) یان دەس بخەن . ئەوانیش حەوت کەسیان نارد بۆ مەدینەو ئیسلامەتی‌یان دەربڕی‌و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە دوو تیرەین‌و زۆرمان لێ‌موسلمان بووە ، کۆمەڵێ لەیارەکانت بنێرە بابەتەواوی فێری ئادابی ئاینمان بکەن‌و قورئانمان پێ‌بلێن‌و ئیسلامان تێ‌بگەیەنن . پێغەمبەریش - درودی لەسەربێ - ئەی ویست چاودێری‌کەر ( عیون ) بنێرێتە سەرقورەیش‌و تێ‌بگا چی‌ئەکەن ، کەئەمانە هاتن‌و داوای مامۆستاو کادیریان کرد ئەمەی بەهەل زانی‌و بەتەمابوو بەتیرێك دوونیشان بشکێنێ هەم تیرەکان فێری ئیسلام بکاو هەم هەواڵی قورەیش بزانێ . بێ‌گومان پێغەمبەری خوا هەمیشە پێش‌خستنی ئاینەکەی لەژوورووی هەموشتێکەوە

---

(١) ئاوێکی ( هزیلە ) لەنێوانی مەکەو (عسفانا ) .

داناوە،بۆیە هەرکەداوای مامۆستاو ڕێ پیشاندەری لێ بکرایە بۆهەرکوێ یەك بوایە ئەی نارد ، هەتا ئـاینەکـە بڵاوبێتەوە و بەرەوانی وەرگـیرێ ، ئەوەبوو لـە مەکەوە هەندێکی نـاردِ بۆ مەدینە بـۆ فێرکردنی ئیسـلام و قورئان .

وەبۆ ئەم داخوازی‌یەیش شەش یاری تێ‌گەیشتووی بە سەرۆکایەتی ( عاصمی ) کوڕی ( ثابت ) ی یاریدەدەری نارد . .

ئەمانە لەگەڵ حەوت کەسی‌ترا لە مانگی سەفەری ساڵی چوارەمـا گەیشتنە ( رجیع ) کە گەیشتنە ئەوێ لەژێرەوە هەواڵیان دا بە (هزلی)یە کان و ئەوانیش دوو سەد جەنگـاوەری چەك بەدەسیـان بۆناردن و کاتێ ئەمان بەخۆیان زانی لەشکرێ ڕژا بەسەریانا و بریسکەی شمشێر نەبێ هیچیان نەئەدی ، هەرچەند ئەمانیش دەسیان دایەشمشێرو پەلاماریان‌دانێ بەڵام شەش کەس بێ‌ئاکا لەگەڵ دووسەد جەنگاوەری پڕچەکا چی‌بۆئەکرێ؟ بەڵام (هزلی) یەکان بانگیان کردن : مەجەنگن و پەیمان‌بێ ناتان کوژین و ، بەس ئەتان دەینە دەس مەکەیی‌یەکان . موسڵمانەکانیش دیل کردن و بردنیان بۆ ژێردەسی دوژمن و بەخواری سەیرکردنیان بەلاوە لە کوشتن ناخۆشتربوو ، بێجگە لەوەیش دەستی مەکەیی کەوون ئەیان کوژن ، لەبەرئەمە خۆیان نەدا بەدەسەوە و کەوتنە جەنگ کردن . لـە ئەنجامـا ( عاصم )و ( مرثد ) شەهید کران و ( زید ) و ( حبیب ) و (عبدالله) دیل کران و بردنیان بۆ مەکە تایی‌یان فرۆشن بە قورەیشەکان .

لەڕێگادا لەلای ( زهران ) ( عبدالله ) خۆی لە دەسیان ڕاپسکاند و شمشێرەکەی گرت بەدەستەوە و ویستی دەربچێ ، بەڵام بێ‌سـوود بوو بەرد بارانیان کرد تا شەهیدکرا ، وە ( خبیب ) و ( زید ) یان برد و

فرۆشتنیان بەقورەیش : ( صفوان )( زید ) ی کوڕی تاڵەجیاتی (أمیە)ی باوکی بی کوژێتەوە و دایەدەسی ( نسناسی ) بەندەی کە بی کوژێ ، لەوکاتەدا ( أبوسوفیان ) بینی و وتی : ها (زید) توخوا پێت خۆش نەبوو ئـا ئێستە محمد لەجیاتی تۆ لـە دار بدرایەو تۆیش لە ناو ماڵ و منالی خۆتا بویتایە ؟ ( زید ) وتی : نەبەخوا پێم خۆش نیە من بەخۆشی لە ناو خێزانی خۆمابمو محمد درکێ بچێ بەجەستەیا ، (أبوسفیان) بەسەرسامی یەوە وتی : کەسم نەدیووە وەکو یارەکانی (محمد) سەرۆکی خۆیان خۆش بوێ ، ئنجا ( نسناس ) زیدی شەهیدکرد .

( عقبە ) ی کوڕی حارث ( خبیب )ی کوڕی تاڵەجیاتی باوکی بی کوژێتەوە ، کاتێ بردیان بۆسەر سێدارە ( خبیب ) وتی : ڕێگەم ئەدەن دووڕکات نوێژبکەم ؟ وتیان : بی کە . دووڕکات نوێژی جوانی کرد و دوایی ڕووی تێکردن و وتی : بەخوا لەبەر ئەوەنەبوایە واتـان بزانیبایە لەترسی کوشتن نوێژەکەم زیاتر نوێژم ئەکرد . کە بردیان و هەڵیانواسی ووتی : خوایە سپـاردەی پێغەمبەرەکەتمان گەیـاند ، خوایە ئەمڕۆ پێغەمبەر تێبگەیەنە کە چیمان بەسەرهات ، خوایە بەرتەوازەیـان بکەو لەناویان بەردو کەسیان مەیەڵەرەوە . ئەنجار هۆنراوەیەکی لەم مانایەدا خوێندەوەو ئینجا شەهیدیان کرد .

ئـەم هەواڵە کەیشتە مەدینەو پێغەمبەر ـ درودی لەسـەربێ ـ و موسڵمانەکان زۆریان پێناخۆشبوو دلگران بوون و تینی گەورەی تێکردن . وەپێغەمبەر ( عمر ) ی کوڕی ( أمیە ) ی ( ضمری ) لەگەل یەکێکی ترا نارد بۆ کوشتنی ( أبوسفیان ) لەمەکە ( عمر ) زۆر بەهەڵمەت بوو شارەزای مەکەیش بوو ، کە گەیشتنە مەکە ( طواف ) کرد . . حەوت

چار بەدەوری کەعبە دا سوڕایەوە ، بەناکاو پیاوێك پەیابوو عُمری ناسی و هاواری کرد : ئەمە عمرە . ئەوانیش بەناچاری ڕایان کردو هیچیان بۆ نەکرا .

## سریەی بیری معونە : (١)

زانیمان کە هوزەیلی و قورەیش بە پیلانی شەیتانی شەشیان لە موسلمانە بەڕێزەکان شەهید کردو پێغەمبەرو موسلمانەکانیش بەم کارەساتە زۆر دلگران بوون ، چونکە بێجگە لەوەی ئیسلام لەوکاتە ناسکەدا شەش پالەوانی زۆبر بەدەستی لەکیس چو ـ دەرگای پڕوپالانتە و پیلان گێڕی درایەوەو متمانەنەما . بێ گومان کاری واتێن ئەکاتەسەرپێشەواو ئیترمتمانەی نامێنێ تاکەس لە هەوالە کانی بنێرێ بەهیچ لایەکا تا بەتەواوی دلنیا نەبێ لە پاراستنیان .

گوایە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ئەبێ هەلوێستی چی بێ ؟ خۆ بلاوکردنەوەی بانگی ئیسلام داوای لێ ئەکا ـ بەلکو ناچاری ئەکا ـ هەرچەند تووشی زیان بێن ـ ئەو زیانانە قبول بکەن بۆخاتری بلاوکردنەوەی بانگەکە ، هەروەکو بازرگان زۆر جار لەبەر بەرز بوونەوەی پلەی بازرگانێتی خۆیان و سامانیان ئەخەنە مەترسیەوە . ئەمەبوو هۆی ئەوەکە پێغەمبەر ـ د . خ ـ بەوتەی ( أبوبراء ) کۆمەلێکی تری لە یارەکانی نارد و لە ئەنجاما شەهید کران .

---

(١) واله خۆر هەلاتی مەدینەو لە نێوانی خاکی بنی عامر و حرەی بنی سلیمدایە .

## چۆنێتی ڕوداوەکە :

لە مانگی سەفەری ساڵی چوارەما ( أبو براء : عامر ) ی کوڕی ( مالك ) کەبە ( ملاعب الأسینە ) بەناوبانگ بوو یەکێ بوو لە سەرۆکانی ( بنی عامر ) و باوەڕ پێکراو بوو لەناویانا ، هاتەلای پێغەمبەر بانگی کرد بۆ سەر ئیسلام ، ( أبوبراء ) موسڵمان نەبوو بەڵام دووڕوو ڕەقیش نەبوو ، وتی بەپێغەمبەر : ئەی ( محمد ) من ئەوڕێگەیەی تۆم بەلاوەجوانە ئەگەر تۆ چەندکەسێ لە یارەکانت بنێری بۆناو ئەهلی ( نجد ) و بانگیان بکەن بۆ سەر ئەم ڕێگەیەی تۆ لام وایە بێنە سەر ڕێگەکەت .

پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ ترسا لەوەی ( نجد ) ی یەکان ئازاری موسـڵمانەکان بدەن لەبەر ئەوە دانی پیادانەنا تا ( أبوبراء ) وتی : من پەناگیریان ئەبم و لێیان مەترسە و بێیان نێرە . ( ئەم پەنا گیرییە ـ وەکو لە پێشەوە زانرا ـ باوبوو لە ناو عەرەباو هیچ پەناگیراو و پەنا هێندەیەك تووشی ئازار نەئەکرا ) پێغەمبەر ئەمەی بەھەل زانی بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بۆیە فەرمانیدا بە ( منذر ) ی کوڕی ( عمر ) کە خۆی و حەفتاپیاو لە یارەقورئان خوێنەکانی ـ ئەوانەی قورئانیان لەبەربوو زاناو تێگەیشتووبە جەرگ و دڵسۆزبون ـ لەگە ( أبوبراء ) دا برۆن و هەڵسن بەو جیهاد وتێکۆشانەگەورەیە کە بانك کردنی مەردمە بۆ سەر ئایینی ئیسلام و بیروباوەڕی قورئان . ئەوانیش کەوتنەڕی تا گەیشتنە سەر بیری ( معونە ) لێرەدا ( حرامی ) کوڕی ( ملحان ) ی ـ کەبرای ( أم سلیم ) و خـالی ( أنسی ) کوڕی ( مالك ) بوو ـ بەنامەیەکی پێغەمبەرەوە نارد بۆلای ( عامر ) کوڕی ( طفیل ) کە برازای ( أبوبراء ) و سەۆکی تیرەی ( بنیعامر ) بوو ، ( عـامر ) بێ ئەوەی

سەیری نامەکە بکا پەلاماری ( حرامی ) دا و شەهیدی کرد وەداوای کرد لەتیرەکەی کە بڕۆن و موسڵمانەکان بکوژن ، بەڵام تیرەکەی بەگوێ یان نەکردو وتیان : پەنای أبوبراء ناشکێنین ، وە پەنای بۆ چەند تیرەیەکی تربردو ئەوان هاتن بەدەنگی یەوە : ( تیرەی بنی سلیم بەرعل و ذکوان و عصیە ) هاتن لەکەلیاو دەورەی موسڵمانەکانیان گرت .

کە یارە شیرینەکان بەمەیان زانی چارەیان نەما بێجگە لە دەسدانە شمشێرو جەنگاندن هەتا بەرووداو هەموویان شەهیدکران - خوالێیان ڕازی بێ - تەنیا عمری کوری أمیەی ضمری نەبێ کە لەوکاتەدا لەوێ نەبوو ، وە کعبی کوری زید کە بەزامداری لەناو شەهیدەکانا مابووەوە ، دوایی عمریان گرت و ویستیان بی کوژن بەڵام عامر نەی هێشتو بەرەڵای کرد بەبۆنەی ئەوە کە چاکەیەکی هەبوو بەسەر دایکی یەوە .

ئەم دوانە گەڕانەوە بۆ مەدینە لە ڕێگادا ( عمر ) کەیی بەدوو پیاو و وای زانی لەوتیرەو بەرانەن کەدەس درێژیان کردە سەریان ، هات خۆی خلافان لەگەڵیانا تاکردنیەخەو ، ئەمجار هەردووکیانی کوشت بەخەیاڵی تۆڵە سەندنەوە کەچی دوایی دەرکەوت ئەم دووانە خزمی ( أبوبراء ) و لە پەنای پێغەمبەرابون - یالە هۆزی بنی کلاب و پەنادرا و بوون - پێغەمبەر - درودی لەسەربێ - خوێنی هەردوکیانیدا .

( عمرو کعب ) هاتنەوە مەدینە و ئەم هەواڵە پڕلە ناسۆرەیان گێرایەوە بۆ پێغەمبەر و موسڵمانەکان . شتێکی سروشتی یە کە زۆر بەلایانەوە ناخۆشبوو ، هەتا ئەڵێن : پێغەمبەر بۆ هیچ کارەساتێ ئەوەندە دڵگران نەبووە ، وەتامانگێ ( قنوت ) ی لەنوێژا ئەخوێند و لە خوا ئەپاڕایەوە کە هەقیان لێ بسێنێ ، وەفەرمووی : ئەمەئیشی ( أبوبراء )

بوو ، ئەگینا من لەمە ئەترسام و نەم ئەکرد، (أبوبراء) کە زانی پەناکەی شکێنرا و پەنادراوەکانی کوژران و دوایی ئەم فەرموودەیەی پێغەری بیست زۆر ناڕەحەت بوو مەراقی کرد و کوشتی ، وە ( ربیعه ) ی کوڕی لەتۆڵەی باوکیا چوە سەر (عامر) و دایە بەر ڕم و زۆری نەبرد عامریش مرد .

## جەنگی بنی نضیر :

جوولەکەو دوو ڕووەکانی مەدینە بەهۆی کارەساتی ( رجیع ) و بیری ( معونه ) وەو لە پێش ئەوانە یشەوە زاڵبوونی قورەیش لە ( احد ) دا دلشـــاد بوون و کەوتنە پڕوپـاگەندە و پیلان گێڕان و ڕاوێژکردن بـۆ لەناوبردنی موسڵمانان ، پیسترین پیلان ئەوە بوو جوولەکەی ( بنی نضیر) ویستیان لە کاتێکی بێ ئاگـاییدا پێغەمبەری خوا بکوژن بەڵام خواهیشی خوای پەروەردگار بەجۆرێکی تربوو . . پێغەمبەرە شیرینەکەی خۆی پاراست و جوولەکەکان لە مەدینە دوور خرانەوە .

ئەمەیش لەکاتێکابوو کە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەر بێ ـ خەریك بوو خوێنی دووپیاوەکەی کۆ ئەکردەوە کـە ( عمر ) ی کوڕی ( أمیه ) بە نەزانی کوشتبوونی ، پێغەمبەر چووبۆ ناو جولەکەی ( بنی نضیر ) کە هاوپەیمان بوون لەگەڵیاو لە دەوروبەری مەدینەدا دائەنیشتن لـە نزیکی ( قبـــاء ) ەوە ، کاتێ گەیشتە ئەوێ لـە بنی دیوارێکا لـــە گەڵ سەرۆکەکانیانا دانیشت و باسی یارمەتی دانی بۆ ئەکردن ، ئەوانیش بەسەرزاری پێ خۆشحاڵی و ئامادەیی یان دەربڕی و کەوتنە دواندن لەگەڵیا ، وە لەولایشەوە کەوتنە ڕاوێژی کوشتنی و وتیان : هەلی لەمە باشترمان بۆ هەڵ ناکەوێ . . ئەوەتە بەتەنیاو بەبێ ترس هاتۆتە ناومان و لەوبن دیوارەدا بێ بـاکانە لێی دانیشتووە ، پیاوێکیـان کەناوی ( عَمر ) ی کوڕی

( جحاشی ) کوڕی ( کعب ) بوو وتی : ئێوە بیخڵافێنن من لە پشتەوە ئەچمە سەربانو بەردێکی گەورە لەگەڵ خۆما ئەبەم و ئەیدەم بەسەریاو ئەی کوژم . ( سلامی ) کوڕی ( مشیکم ) وتی : شتیوامەکەن ، ئەوە پەیمان شکاننەو بەخوا پێی ئەزانێ و لەدواییدا ئێوە زەرەری تیائەکەن . بەڵام گوێیان نەدایە و ویستیان هەڵسن بە پیلانەکە ، لەو کاتەدا کابرا ڕۆیی بچێ بۆ سەربانەکە خوای گەورە پێغەمبەری تیگەیاند . پێغەمبەر بەگورجی هەڵسا وەکو ئیشێکی زۆر پەلەی هەبێ گەڕایەوە بۆناو شار ، ئنجا جوولەکەکان لەناو خۆیانا کەوتنە مقۆمقۆ : ئایا محمد بۆچی وابەبێ قسەو بەخێرایی هەڵساو ڕۆیی ؟ ئایا بە پیلانەکەی زانیبێ ؟

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ هاتەوە ناو شـارو پیلانی جوولەکەکانی بۆ موسلمـانەکان گێڕاوە و ئەمەی بەپەیمـان شکانن دانا ، وەکەوتنە بیرکردنەوە لەوە کەهەتا دوژمنی ئاوەهالەبن دەسیانابێ ئەوان ناحەوێنەوە و ڕێگە لە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان یەننەوەپەلێو هیچ کاتێ ئەوانە جێگەی متمانە نین ، باشترین ڕێگە ئەوەیە ئەمانە لەم بن دەسەدا نەمێنن ، وە بۆ ئەمە ( محمد ) ی کوڕی ( مسلیە )ی ناردو فەرمووی : « پێیان بڵێ : پێغەمبەری خوا منی ناردووە بۆ لاتان کەتێتان بگەیەنم : ئێوە ویستووتانە پیلانێکی وەها بێکێڕن ، وەئەبێ ئێوە لێرەدا نەمێنن و بڕۆنو ئەم نـاوچەیە بەجێبێڵن و تازەمن لەگەڵتا نـاناژیم ، بۆ ئەمەیش دەڕۆژ ماوەتانبێ ، دوای ئەو ماوەیە هەرکەس ببینین ئەدەین لە ملی » .

کە ئەم هەواڵە گەیشت بەجوولەکەکان مەترسییان لێنیشت و سەرسامو بوون و هیچ وەڵامیان پێنەدرایەوە ئەوەنەبێ وتیان بە ( محمد ) ی کوڕی ( مسلمە ) ( کە لە تیرەی أوس بوو ئەوانیش هاوپەیمانی أوس بوون بۆ

بۆ جەنگاندن لەگەل خزرجدا ) واماں نەئەزانی کە پیاوێکی أوسی هەوالی وامان ئەداتێ · ئەویش هەرئەوەندی پێوتن : ئەوکاتە ڕۆیی و ئەو دلەگۆڕا .
جوولەکەکان لە پاشە ڕۆژی تـاریکتر ترسان و زانی یـان پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - لەســەر وتەی خۆی ئەڕوا ، لەبەرئەمە کەوتنە خۆ کۆکردنەوە و خۆئامادە کردن بۆ بارکردن . . ئالەم کاتەدا دوو پیاو لەلایەن ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبی ) کوڕی سلو لەوەهات و وتیان : مەڕۆن و بارەکەن و جێگاو ڕێگای خۆتان بەجێ مەهێلن و لە قەلاکانتانابن من دوو هەزار کەس لە خزم و دۆستەکانم لەگەلایەو یەینە ناوقەلاکانتانەوە و تادوا کەس لە ئێمە نەکوژرێ تێن ناکاتەئێوە .
جوولەکەکان کەوتنە ڕاوێژ لەم نێرراوەی ( عبدالله ) وزۆریان متمانەیان بەوتەی عبدالله نەبوو ، ئەوەبوو ( بێ‌قینقاعیشی ) بە گررکـان خواردوودا و درۆی لەگەلاکردن . بەلام ســەرەکەکەیان (حیی ) کوڕی ( أخطب ) وتی : ناڕۆین و ســەر لەخۆمان ناشێوێنین و ئەچینە ناو قەلاکانمـانەوە ، خۆ هەتا سالێ یەکمان لـەهیچ ئازوخەیەك نـاکەوێ و و بەردی زۆر ئەبەینە لای خۆمان و هەرکەهاتن بەرد بارانیان ئەکەین . وە ناردی بۆلای پێغەمبەر : بۆ هیچ کوێ ناڕۆین و چیت لە دەس یەت بیکە .
هەتا دە ڕۆژەکە تێپەری پێغەمبەرو موسلمانەکان گـوێیان نەدانێ ، ئەمجار چەکیان شان کردو (عبدالله) ی کوڕی ( أم مکتومی ) لەسەرمەدینە داناو ئالاکەی دایە دەس (علی) کوڕی ( أبی‌طالب ) ولەلەمانگی ( ربیع الأول ) دا کەوتنە ڕێ و چونە سەریان و چواردەوری خانوو قەلاکانیاندان ولەهەموو لایەکەوە ئابلوقەیان دان ، ئەمە پانـزە ڕۆژی خایان وهەر کە

لێیان نزیك ئەبوونەوە بەردیان تێ ئەگرتن ، دوایی پێغەمبەر - د.خ - فەرمانی دا کەباخە دارخورماکانیان ببڕن و بیسووتێنن ، هەتا جوولەکە شێ وایان نەمێنێ دڵیان پێوەی بەندبێ و لەپێناویا بجەنگن وخوێن بڕێژن .

کەجوولەکە بینییان واباخەکانیان ئەبڕن وئەیسوتێنن کەوتنە هاوار : تۆئەوسا شتی وەهات یاساغ ئەکردو داربڕین و زیان گەیاندنت قەدەغە ئەکرد ئێستە خۆت چۆن و بۆچی وائەکەی ؟ بەڵام بێ سوود بوو ، قورئان هاتە خوارەوە و ئەوکارەیانی پەسەند کردو فەرمووی : ( مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ) واتە هەرچی تان بڕیوە لەدارخورمای باخەکانیان یا بەپێوە هێشتونتانەوە ئەوە بەپێی ئیزن و ڕەزاو خواهیشی خوابووەو بۆئەوە کەپیاوخراپ و لەسنور دەرچووەکان توشی داخ و مەراق بێن .

جوولەکەی ( بنی نضیر ) هەرچەند دانیان بەخۆیانا گرت وچاوەڕێی سوپای ( عبدالله ) یان کرد بێ سوود بوو وکەس نەهات بەهاواریانەوە ، کە بەتەواوی بێ هیوابوون داوایان کرد لەپێغەمبەری خوا : کەرێگایان بۆ چۆڵ بکەن تابڕۆن و وڵات بەجێ بێڵن ، پێغەمبەری خوایش - د.خ - بۆئەوەی نەیەڵێ خوێن ڕێژی بکرێ ڕێ کەوت لەگەڵیانا : بەسێ کەس باری وشترێ کەل و پەل و ئازوخە ببەن بەڵام چەکی تیا نەبێ وبڕۆن و چەك بەجێ بێڵن . لەسەرئەمە پێك هاتن و جوولەکەکان بەناچاری چەکیان داناو چی یان بۆبرێیی بردیان و سەری خۆیان دەرکرد ، ئەهاتن بەدەسی خۆیان خانووەکانیان ئەڕوخان تا موسڵمانان تی یان نەچن ، وە (حیی) ی [illegible] ) و ( سلامی ) کوڕی ( أبی حقیق ) و هەندێ تر لەو سەرۆکانەیان چونە ( خیبر ) و [illegible] حون بۆ (أذرعات) لە شام

و تالآن و ماڵیان بەجێهێشت بۆ موسڵمانەکان ، وەلەناو هەموییانا دوانیان : [ یامینی کوڕی عمرو أبو سعدی کوڕی وهب ] موسڵان بوون و لەسەر ماڵ و ملکی خۆیان مانەوە .

پێغەمبەری خوا دابەشی کرد بەسەر هەژارە کۆچەرەکانا ، بەم پێیە جولەکەی بنی نضیر دوور خرانەوە لە مەدینە و خۆیان بەدەسی خۆیان ئاوایان کردبە خۆیان ، وە دوو ڕووەکانیش لاپەڕەیەکی تریـــان لەبنئابڕوویی هەڵدایەوە و ئیجکاری بوون بەجێگای پلوتکی ئەمو ئەو .

وە موسڵمانەکانیش بەم سەرکەوتن و دەسکەوتە پێزیان و ئـازارە دەسەڵاتێکیان پەیاکرد و مەترسی نـاو خۆییان شتێکی ئاوتۆی نامـاو دەسیان خالیبوو بۆ ژێر کردنی بیابان نشینەکان .

## جەنگی ذات الرقاع :

لە مانگی دووەمی ربیعی دروەمی ساڵی چوارەما واتە کەمتر لە مـانگێ دوای دوورخستنەوەی ( بنی نضیر ) هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - کەچەند تیرەیەك لە( نجد ) وەکو (بنومحارب) و ( بنوثعلبە ) ( وبنوأنمار ) خەریکن خۆیان ڕێك ئەخەن بۆجەنگ ، وە ( خطە ) ی پێغەمبەریش وابوو کـە زوو بەزوو لە کوتڕپڕا بدا بەسـەر دوژمنا ، لەبەرئەمە بەخێرایی لەگەڵ حەوت سەد ( یاچوارسەد ) کەسـا کەوتەڕێ و عوسمانی کوری عفانی دانا لەســەر مدینة ( وە هەندێك ئەڵێن : أبوذری غفاری ) ڕۆیشتن تـا گەیشتنە شوێنێك پێی ئەڵێن : (ذات الرقاع) کەدوژمن پێی زانین رای کردو ژنو ماڵو سامانی بەجێماو موسڵمانەکان دەسیان بەسەرا کرت ، وەموسڵمانەکان لەوناوەدا مانەوە وبیستیان

کۆمەڵێکیان بۆ کۆ بۆتەوە کەلە ناکادا بدەن بەسەریانـا و لێیان نزیك بوونەتەوە ، لەبەر ئەمە موسڵمانەکانیش کەوتنە وریایی‌و خۆ ئامادەکردن هەتا نوێژی ( عصر ) یان بەنوێژی مەترسی ـ صلاة الخوف ـ کرد ،

## دوائترین جەنگەکانی ـ بدر ـ

لە مانگی شعبانی سالی چوارەمدا پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ بە هەزارو پێنج‌سەد کەسەوە لەیارە مووسڵمانەکانی چوون بۆبەدر وەدەئەسپیان پێ‌بوو و عبداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی أبی کوڕی سلولی دانا لەسەر مدینە . . هۆی ئەیش ئەوەبوو سالی پێشوو لە جەنگی أحد أبوسفیان وتی : وادەمان سالێکی‌ترو ـ بدر ـ ، پێغەمبەریش فەرمووی : باشە . موسڵمانەکان ڕۆیشتن تاگەیشتنە بەدر و لەوێ خستیان ، وە چاوەڕوانی قورەیشەکان بوون ، وە لەوێشەوە قورەیشەکان کە سوپایەکی زیاتر لە دووهەزار کەس‌و پەنجا ئەسپیان پێ‌بوو ، بەسەرۆکایەتی أبوسوفیان هاتن ، تـاگەیشتنە نزیکەی ـ زهوان ـ لێرەدا أبوسفیان وای بەباش زانی بگەڕێتەوە و پیلانێك بۆترسـاندنی موسڵمانەکان دروسـت بکا ، بۆ ئەمە بانگەوازی کـرد بەناو قورەیشەکانا : کە ئەمسال وشکە سالەو بەکەڵکی دەرچوونتان نایەو سالێکی‌تر ئەڕۆین کە تەڕەسال بێ‌و لەوەری مەڕومالات و بەروبوم زۆربێ ، وە من ئەگەڕێمەوە و ئێوەش بـگەڕێنەوە بەم جۆرە قورەیشەکان گەڕانەوە و نەچوونە ـ بدر ـ وەهەر لەوێدا پیاوێ کە ناوی ( نعیم ) کوڕی ( مسـعود ) بوو کرتی بەکرێ‌و نـاردی بۆمەدینە کە پێیان بڵێ : ( أبوسفیان ) سوپایەکی زۆر گەورەی بۆ کۆکردوونەتەوە کە لە چـاری ئێوەدانییەو مەچن بۆیـان ، بۆ ئەوەی نەچنە ـ بەدر ـ بەڵێ کابرا ڕۆیی بەلام بێ‌سوود بوو ، پێغەمبەر فەرمووی : بەخوا کەسیش

نەیەت لەگەڵما بەتەنیا ئەچم ، لەمجۆرە هەڵوێستانەدایە کە خوای گەورە مدحی موسڵمـانەکان ئەکاو ئەفەرموێ : ( اَلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ : إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً ، وَقَالُوا : حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ (١)

## ساڵی پێنجەم : هەرای - دومة الجندل -

لەمانگی - ربیع الاول - ی ساڵی پێنجەما هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا - د . خ - کەکۆمەڵێ لەعربە بیابان نشینەکان کۆبوونەتەوە لەشوێنێکا کەناوی ( دومة الجندل ) ە وە پێنج رۆژ ڕێگەیە لە ( دمشق ) ە وەو(١١) ڕۆژ لەمەدینـەوە دورە لەناوەڕاستی ڕێـــگای دەریای سوورو کەنداوی عەربی‌دایە ، وەئەو ڕێگانەیان گرتووەو مەردم ڕوت ئەکەنەوە ، وەئەیانەوێ وردە وردە نزیکی مدینەش ببنەوە پێغەمبەریش فەرمانی داو هەزار چەك بەدەستی لەگەڵ خۆیا بردو (سباعی ) عقاری بەسەر مدینەوە داناو کەوتە ڕێ ، بەشەو ئەڕۆیشتن‌و بەڕۆژ خۆیان ئەشاردەوە ، پیاوێـکی شارەزا کەناوی ( مذکور ) بوو چاوساغیان بوو ، بەڵام هەرنزیکیان بوونەوە پێیان زانین‌و هەڵاتن‌و بڵاوەیان لێ‌کرد ، موسڵمانەکانیش کەوتنە کۆکردنەوەی ئاژاڵو تاڵانەکەیان ، کاتێ گەیشتنە سەر جێـــگاکانیان کەسیان دەست نەکەوت ، ئیتر چەند ڕۆژێ لەوێدا مانەوە سـریەیان بەم لاولادا ئەناردو کەسیان دەس نەکەوت ، لەپاشان بەسەرکەوتن‌و دەســکەوتێکی باشەوە گەڕانەوە بۆمدینە وەلەگەڕانەوەیاندا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ( عیینە ) ی کوڕی ( حصنی فزاریدا ) بەست‌و پارچە زەوی‌یەکی دایە کە ئاژاڵی تیا بلەوەڕێنێ .

(١) ال عمران ١٧٣

## پەردە ـ حجاب ـ

لەپێشەوە لەبەندی ( باری جیهان لەپێش ئیسلاما ) تێگەیشتین کە پەیوەندی پیاوان بەژنانەوە تەنیا لەڕووی ڕابواردنەوە بوو وبەس ، وە ژنان وەکو هۆیەکی ڕابواردن سەیر ئەکران‌و بەس ، بێ ئەوەی هیچ جێگاو پلەیەکی تریان بێ لەکۆمەڵدا ، وەیاسای خێزان‌و ژن‌و مێردی شێوەیەکی نارێك‌و شپرزەی هەبوو ، وەنرخی کۆمەڵایەتیان تەنها لەوەدا ئەبینرا کە بەباشترین شێوەو لەجوانترین کاڵاو نیگاردا خۆیان دەرخەن‌و بەرچاوی پیاوان بکەون ، کەئەمەیش زۆرجار ئەبوو بەهۆی بێ ئابروویی‌و شەرواڵ پیسی‌و تێکلاوبوونی نەژاد ، وەگەلێ ڕووداوی ناخۆش‌و گیرو گرفتی ناشایستەی لێ پەیدا ئەبوو .

خۆ ئیسلامیش هاتووەو یاسایەکی خواییەو ئەیەوێ لەهەمو ڕووەوە خراپەکانی مرۆڤایەتی چارە سەربکاو بیان باتەوە جێگە ڕاستەکەی خۆی، لەبەرئەوە سەیری ژنانی کرد بەچاوێکی ڕێزو گرنگ‌و بەرزی کردنەوە لەوە کەتەنها هۆی ڕابواردن بێ‌و بەس ، بەڵکو کردنی بەنیوەی کۆمەڵ‌و بەخوشك‌و هاوبەشی پیاوان لەژیانا ، وەپەیوەندی نێوانیانی دامەزراند لە سەر بنەڕەتێکی گونجاوی بەسوودو یاسای خێزانی ڕێکخست لەسەر بنەڕەتی خۆشەویستی خزمایەتی‌و دڵنیایی لەیەکتری . ئافرەتان بنکەی کۆمەڵن‌و کەیبانوو خانمی ماڵن دایك‌و مامۆستای پێگەیاندنی منداڵن‌و قوتابخانەی یەکەمی کۆمەڵن . ئەبێ پەروەردەکردنی ئافرەتان‌و ئامادە کردنیان بەشێوەیك بێ کە بتوانن کۆمەڵێکی ڕێك‌و پێك پێك بێنن ، ئەبێ ئافرەتان لەبەرگی حورمەت و ڕێزابن ، بۆ ئەوەی مرۆڤی بەدخووو نەفام نەتوانن یاری بەناموسیان بکەن ، ئەبێ بەرگی شەرم و کەرامەتیان

لەبەرابێ ، ئەبێ جێگەی حەزو تەماو ڕەخنەی خەڵکی نەبن ، ئەبێ دووربن لە داوێن پیسی و لە کاری ناڕەواو ناشیرینەوە ، ئەبێ شێوەی تێکلاوی‌و بەیەکابوونی ئافرەتان و پیاوان بەجۆرێ نەبێ گومان‌و نالەباری لە پەیوەندیان بکرێ لەسەر ئەم بنەڕەتە ئەمات یاسای (پەردەی) لە بەرگێکی نەزاکەت و شیرینا دانا کە ژنان‌و پیاوان سەیری یەکتر نەکەن تاخراپە لەناویانا ڕوونەدا .

## بەشی نۆیەم

لە جەنگی ( بنو المطلق ) ەوە هەتا ڕووداوی حدیبیە :

## جەنگی ( بنوالمصطلق )

هەواڵ گەیی بە پێغەمبەری خوا ( دروودی لەسەربێ ) کە تیرەی [بنوالمصطلق] ئەوانەی لە جەنگی ئوحددا یارمەتی قورەیشیاندا خەریکن بەسەرۆکایەتی ( حارث ) ی کوڕی ( ضرار ) ی سەرۆکیان سوپا کۆئەکەنەوە و خۆیان ئامادە ئەکەن بۆهێرش هێنانەسەر مەدینە ، وەئەمانە تیرەیەك بوون لە ( خوزاعە ) لە نزیك مكە دانیشتن . پێغەمبەریش بە پەلە کەوتە خۆبۆ ئەوەی هەر لەبێشکەدا ئاگرەکە بکوژێنێتەوە وبەخێرایی سوپایەکی گەورەی کۆکردەوەو ئاڵای کۆچەریەکانی دایە دەس ئەبوبکری صدیق و ئاڵای یاریدەرەکانیشی دایەدەس سەعدی کوڕی عوبادەوە ، زیدی کوڕی حاریسەی لەسەر مەدینە دانا . وە خاتو عائیشەی لەگەڵ خۆیابرد . وە بۆ یەکەم جار کۆمەڵێ لە دووڕووەکانی لەگەڵا ڕۆیین .

سوپای ئیسلام کەوتەڕێ لەمانگی شەعبانا لەساڵی (٥) کۆچیدا . لەڕێگادا گەیشتن بە جاسوسێکی ( بنوالمصطلق ) و کەوتنە پرسیار لێ کردنی ، هەرچی هەواڵیان لەگەڵا دا ڕاستی پێ نەوتن و پێغەمبەر

فەرمانیدا بەکوشتنی ، ئەمجار ڕۆیشتن تاگەیشتنە سەر ئاوێکە ناوی ( مریسع ) بوو ، کاتێ حاریسی سەرۆکیان زانی بەهاتنی سوپای ئیسلام و بەکرتنی جاسوسەکەی خۆیو کۆمەڵەکەی ترسیان لێنیشت و هەرچی یاریدەدەریان بوو بە جێیان هێشتین ، پێغەمبەر ( دروی لەسەربێ ) فەرموی بەعومەری کوڕی خەطاب بانگیان بکە بۆسەر ئیسلامەتی ئیمامی عومەریش بانگیکردن : ئەی هۆزی ( بنوالمصطلق ) بڵێن [ لاإله إلاالله ] و موسڵمان ببن ماڵو سامانو کیانی خۆتان لە مەترسی ڕزکار بکەن ئەوانیش گوێیان نەدایە ئەمجار لەسەر فەرمانی پێغەمبەر لەشکر ئامادەی جەنگ بوو لە هەردوو لاوە بەڕیز بەرابەری یەکتر وەستان وە پێغەمبەر فەرمانیدا هەڵمەتیان بردە سەریان و کەسیان لێدەرنەچوو . . . دەپیاویان لێ کوژراو ئەوانیتریان کە زیاتربوون لە حەوسەد پیاو ـ بەدیل گیران ، وەلە موسڵمانەکان تەنیا پیاوێك کوژرا .

## ڕووداوەکانی ئەم جەنگە :

ڕووداوی یەکەم :

کوڕێکی کۆچەری لە یەکێك لە یاریدە دەرەکان ( الانصار ) ، لەسەر ئاودانی وڵاخ لێیان بووبە هەرا ، یەکەمیان هاواری کرد لە کۆچەرییەکانو دووەمیان بانگیکرد لە یاریدە دەرەکان کە فریایان کەون ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبی ) ی کوڕی ( سـلول ) گوێی لەم بانگ و هاوارە بوو ، خۆی پێنەگیرا و وتی « . . سمن کلبك یأکلك ، أماوالله لئن رجعنا إلى المدينة ليخرجن الاعزمنها الاذل » .

( زید ) ی کوڕی ( ارقم ) ئەم جنێوەی (عبدالله) یەی گێرایەوە

بۆ پێغەمبەر ، ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) کـە لەوێدا بوو ، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەمر بەکوشتنی بکە ، پێغەمبەر فەرمووی شـتی وانابێ ، ئەگەر من بیکوژم خەڵك ئەڵێن محمد یارەکانی ئەکوژێ .

لەم کاتەدا پێغەمبەر ( د . خ ) فەرمـانیدا بەبارکردن ـ لەکاتێکا وەختی بـارکردن نەبوو ـ شەوڕۆژێکی تەواو ڕۆیشتن ، ئنجـا پێغەمبەر فەرمووی لێرەدا بخەن ، لەبەر هیلاکی هەموویـــان کورج خەویان لێ کەوت .

پێغەمبەر ( د ، خ ) مەبەسی لەم بارکردنە کتوپڕی‌یە ئەوە بوو کە خەڵکەکە نەکۆڵنەوە لە جنێوەکەی ( عبدالله ) ی کوڕی ( سلول ) . لەو کاتەدا کە (زید) ی کوڕی ئەرقەم جنێوەکەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ، (عبدالله) ی کوڕی ( سلول ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەم قسەیە ڕاست نی‌یە باوکم هەرگیز قسەی وا ناکاو (زید) درۆ ئەکا . لەپڕ ئـەم ئایەتە هاتە خوارەوە ( يَقُولُونَ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ، وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ ، وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ) المنافقين: ٨

کە پێغەمەر ( د.خ ) گەڕایەوە بۆ مەدینـە (عبدالله) ی کوڕی (عبدالله) کە موسلمانێکی ڕاسـتو ڕەوان بوو چوە لای پێغەمەر و وتی : ( ئەی پێغەمەری خوا بیستوومە تۆ کوڕی (أبی) ئەکوژی ، فەرمان بدە بە خۆم با سەرەکەیت بۆ بێنم چونکە من لەوە ئەترسم تۆ فەرمان بدەیت بـــە یەکێکی ترا بی کوژێو ومنیش دلم لێم نەگەڕێو سەیری بکەم لەنـاو خەڵکا بیکوژمەوە موسلمانێك بکوژم لەجیاتی کافرێك ) پێغەمەر (د.خ) فەرمووی : (نەء ئێمە نای کوژین بەڵکو بە جوانیو نەرمو نیان لەگەڵیا ئەجولێینەوە هەتا لەگەڵمانا ئەژی) کاتێ کە گەیشتـــە مەدینە عەبدولای

کوڕی عەبدوڵای (ئەبی) هەڵساو دەرکای شاری مەدینەی لە باوکی گرت و وتی : تۆ وتووتە : ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەسەڵاتدارمان بێ دەسەڵاتمان دەرئەکات بەخوا ئەبێ ئێستە تێ بگەی کە تۆ بە دەسەڵاتی یان پێغەمەری خوا ، بەخوا سێبەری مەدینەت ناکەوێتە سەرو تێی ناچیت هەتا خواو پێغەمەر ئیزنت نەدەن .

باوکیشی هاوازی کرد ئەی جەماوەری خەزرەج کوڕەکەم قەدەغەی شارو ماڵەکەم لێ ئەکات . ووتی : بێ سوودە بەبێ ئیزنی خواو پێغەمەر تێی ناچیت ، هەتا کۆمەڵێ هاتنە خزمەت پێغەمەرو ئەم هەواڵەیان دایە ئەویش فەرمووی بڕۆن پێی بڵێن ڕێی بکات با بچێتەوە شوێنی خۆی : کە هاتنەوە لای و ئەم فەرمانەیان دایەو وتی : ئێستە کەمادام فەرمانی پێغەمەری خوا هات باشە بابڕواتەوە وە لەم باسەدا سورەتی ( المنافقون ) هاتە خوارەوە

## ڕووداوی دووەم :-

هەڵ بەستنی درۆو بوختان بۆ خاتو (عایشە) لەگەڵ موسلمانێکی خاوێنی ڕاستەقینەدا (صفوان) ی کوڕی (معطل سلمی) کە یەکێك بوولە پاڵەوانەکانی (بدر) وە لە باسی ئەم ڕووداوەدا هەندێ لە فەرموودەیەك ئەهێنن کە (نجاری) لە خاتو (عایشە) وە ڕیوایەتی کردووە :

لە کاتی گەڕانەوەدا بۆ مەدینە شەوێك لە شوێنێکا ئەخەن ، خاتوو عایشە شەو بۆ چونە سەرئاو دوور ئەکەوێتەوەو لەوێدا ملوانکەکەی لێ ئەکەوێت ، کە پێی ئەزانێ ئەچێتەوە بۆیو لەوێدا ئەگەڕێ بۆی کە ئەی دۆزێتەوەو ئەگەڕێتەوە ئەبینێ سوپاکە باریان کردووەو کاتی هاتوون کەژاوەکەی عایشەیان ناوە لە وشترەکە ، عایشە ئەوەندە سووكو بێ گۆشت

بووه پێیان نەزانیوە کەلەناو کەژاوەکەدا نیە . ئەویش لەشوێنی خۆیدا خۆی ئەپێچێتەوەو ئەزانێ کەپێیان زانی دێنەوە بەشوێنیـا ، ( صفوان ) لەسوپاکە دوا ئەکەوێ بۆئەوەی بزانێ چی بەجێماوە کەلێی نزیك ئەبێتە وەو ئەی ناسێت ئەلێ : ( إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ) ئەوە بۆچـی بەجێ ماوی ؟ خێرا وشترەکەی خۆی دێنێو دوورئەکەوێتەوە تا سوارئەبێ ، ئنجا جلەوی ڕا ئەکێشێ وئەکەونە ڕێ بەدوای لەشکـــرا ، کەئەیان گەنێ ، لەشکرەکە خستوویەتی ، کەلەشکـر ئەم دیمەنە ئەبینـن وعایشە ئەناسن کۆمەڵی دوو ڕوو بەسـەرۆکایەتی (عبدالله) ی کوڕی (أبی) ئەکەونە تەنینی درۆو بوختانو بەناو سوپاو شارا بڵاوەی پێئەکەنو ئەی کەن بەڕازی ناو کۆمەڵو ئەگاتەوە بەپێغەمبەر ، ئەویش زۆر پێی ناخـۆش ئەبێ چونـکە هەرچەند ئەزانێ (عایشەو صفوان ) هیچیان لەوانە نـین کەهەڵسن بـە خیانەتی وەها ، بەڵام شەیتان نەمردووەو عایشەیش گەنجەو ئەمە دڵەڕاوکە وئاژاوەی دەروونی تیا پەیدا ئەکات ، وە ( أبوبکر ) و خێزانی ( دایکی عایشە ) هەواڵەکە ئەبیستنو زۆر دڵگران ئەبنو لەوانەیە گیانیان دەرچێ لەتاوانا بەڵام کەس نایدا ئەڕووی عایشە ، تەنیا ئەوەندە هەست پێئەکات کەپێغەمبەر سۆزەکەی جارانی نەماوە بۆی .

کەدێنەوە مەدینە عایشە نەخۆش ئەکەوێو نارەحەت ئەبێو بێسۆزیش لەپێغەمبەرەو هەست ئەکات ، داوای ئیزنی لێئەکات کەبچێتەوە ماڵی باوکی وئەویش ڕێی ئەداو ئەچێتەوە ماڵی ( أبوبکر ) ، پێغەمبەری خوا زۆر بێتاقەت ئەبێو ئەکەوێـتە ڕاوێژ لەگەڵ گەلێ لەیارەکانیدا کەئایا دەس بەرداری ببێ یانە ؟ لەوانە (أسامە ) و (عمر) ئەڵێن : وازی لێمەهێنە ، بەخوا بێجگە لـەچاکە هیچی لێنابینین ، ( علی ) ئەڵێ : ئەی پێغەمبەری

خوا هەرژن زۆرە بۆتۆ وپەکت لەژن ناکەوێ ، بەلام بنێرە بەشوێن ( بریدە ) ی کەنیزەکیا وپرسیاری لێبکە ، (بریدە) ئەڵێ : بەوخوایەی تۆی کردووە بەپێغەمبەر هیچم لێنەدیوە کەجێی گومان بێو بیکەم بە رەخنە لێی ، ئەوەندە هەیە منالو کەم تەرخەمە ، هەویر ئەشێلمو ئەلێم: ئاگات لێی بێ ، کوێی ناداتێ وئەخەوێ ئاژال هەویرەکە ئەخوات . وەلە ( زینب ) ی خێزانی ئەپرسێ ، ئەویش ئەلێت : خوا هەڵ ناگرێت بەخوا لەچاکە بەولاوە هیچم لێنەبیستووەو هیچم لێنەدیوە ، لەناو ژنەکانی پێغەمبەرا تەنیا ( زینب ) بوو هاوشانی عایشەبێ بەلام. لەخوا ترساو هیچی نەوت ، کەچی ( حمنە ) ی خوشکی لەبەر ( زینب ) کەوتە خراپەوەو هاوبەشی پیلانەکە بوو .

ئەخۆشی یەکەی عایشە نزیکەی مانگێ درێژەی کێشاو ئنجا تۆزێ باری لەشی سووك ئەبێ ، شەوێك لەگەڵ دایکی ( مسطح ) دا کەپووری ( أبوبکر ) بوو ئەچن بۆدەشت بۆبەجێهێنانی پێویستی ، دایکی (مسطح) قاچی ئەخلیسکێ وئەلێ : دەك مسطح داماوبێ . عایشە ئەڵێ : چۆن دەربارەی پیاوێکی موسلمانی کۆچەری کەهاوبەشی بەدری کردووە شتی وا ئەلێیت ؟ ئەویش ئەلێ : ئەی نەت زانیوە چی ووتووە ؟ لەنووکەوە هەواڵەکەی بۆئەگێرێتەوە ، ئیتر عایشە ئەگەرێتەوەو گریانو بێتاقەتی وای لێئەکات خەوو خۆراسو هەموو شتێکی لاهەڵ ئەگیرێت . ئەلێ بە بەدایکی تۆبۆچی بۆت نەگێراومەوە ؟ ئەلێ : کچم لەسەر خۆت بە ، بەخوا کەم رێئەکەوێ ژنێکی وەکو تۆ لای پیاوێکی باش بێو خۆشی بوێو هەوێ بێو ناوناتۆرەی لێنەنێن . ئیتر عایشە بەشەوو رۆژ پیشەی بوو بەگریان .

پێغەمبەر لەمزگەوتا وتارێك ئەداو ئەفەرموێ: موسلمانەکان بۆچی ئازارم ئەدەن لەخێزانەکانما ؟ بەخوا خراپەم لێ نەدیوون وهەستم بەهیچ نەکردووە . خەریك ئەبێ موسلمانەکان لەناوخۆیانا تێـــك بچـن بەلاّم پێغەمبەر نایەڵێو بێدەنگیان ئەکات . ئەبجار ئەچێ بۆمالی ( أبوبکر ) و دەس ئەکات بەئامۆژگاری کردنی عایشەو داوای لێ کرد تۆبە بکا ئەگەر شتی وا ڕووی داوە ، عایشەیش ئەڵێ : بەخوا تۆبە ناکەم وهیچیش نالێم بەلکو خوا بێت بەهاوارمەوەو ( فصبر جمیل ) : ئەڵێ : من ئەمزانی پاکم بەلاّم خۆم وانەئەزانی قورئان لێرەدا دێتە خوارەوەو بەتەمابووم بە خەو پێغەمبەر بۆی دەربکەوێ کەمن پاكو خاوێنم ، وەخێزانی أبوبـکر بەجۆرێ لەئازارابوون باوەڕ ناکەم کەس تا ئێستە تووشی کارەساتی وەهـا گران هاتبێ .

هەرلەوکاتەدا نیگا دێتە سەر پێغەمبەرو تووشی حالەتی وەرگرتنی نیگا دێت ، عایشە ئەڵێ : من دلشاد بووم بەهاتنی نیگاکە بەلاّم باوکم‌ودایکم خەریك بوون گیانیان دەرچێ وئەترسان قورئان باسی خراپی من بکات ، ئنجا پێغەمبەر فەرمووی : عایشە مژدەبێ خوا پاکێتی تۆی ناردە خوارەوە ئایەتەکانی خوێندەوە : ( إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ[1] ـ تائەکاتەـ والله یعلم وأنتم لاتعلمون («١» خێزانەکەمان گەش بوونەوەو دایکم وتی: هەلسە بۆلای پێغەمبەرو سوپاسی بکە . وتم : بەخـوا هەڵ ناسمو تەنیـا سوپاسی خوا ئەکەم . ئنجا پێغەمبەر چوو بۆمزگەوتو ئایەتەکانی خوێندەوە وموسلمانەکان دلشاد بوونو دوو ڕووەکان لوتیان ڕەق بوو شەرمەزاربوون، وەبەم بۆنەیەوە ئایەت بۆسزادانی بوختان کەر هاتو فەرمووی : ( والذين

(١) سوورەتی ( النور ) : ١١-٢٠ .

يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء فاجلدوهم ثمانين جلدة ولاتقبلوا لهم شهادة أبدا وأولئك هم الفاسقون ) (٢) وە بەپێی ئەم یاسایە هەشتا دار درا لە ( مسطح ) و (حسان) ی کوڕی ( ثابت ) و حمنە ) ی کچی ( جحش ) کە بەئاشکرا ئەمەیـان وتبوو ، بەڵام دوو ڕووەکان هەرچەند پاڵەوانێ بوختانە کە ئەجۆرێ نەیان وتبوو خەڵکی پێیان بزانی تاحەدیان لێ بدرێ بوون .

## جەنگی خەندەق

لەدوای ئەوە کە پێغەمەر ( د ، خ ) سەرکەوت بەسەر جوولەکەو خانووی کوفرو ئیلحادی تێکداو لایەنی کوفرکز بوو ، جوولەکەو قورەیش کەوتنە جووڵانەوە لەدژی ئیسلام ، جوولەکانی مەدینە لە گەڵ ئەوەدا کە ئەهلی ( کتاب ) بوون ، دوژمنترین کۆمەڵ بوون بەپێغەمەرو ئیسلام ، وە ئەستووری دوژمنایەتی یەکەیان ـ بێجگە لە پیسـی سروشتیـان ـ ئەوەبـوو پێش پەیـابوونی ئیسـلام ئەوان یەکـەم کۆمەڵی خـاوەن کتێبی ئاسمانی بوون ئەو زانیاری یەیـان بەکارئەهێنا بۆ ژێر بـارکردنی عەرەبەکان و زاڵبوون بەسەریانا ، بەڵام ئێستە هەموو شتێکیان لەدەس چوو خۆئەوەتە لەبەربەد ڕەفتاری یان لەشوێنی خۆیشیانا دەرکران سامانو ماڵو حاڵیان لێداگیرکرا .

لەبەرئەمە بیرکردنەوە لەیەك گرتنی کۆمۆڵەکان لەدژی پێغەمبەر و موسلمانەکان هەڵ قوڵاوی ناو دڵی جوولەکەکان بوو . . . کۆمەڵێ لە جولـەکەکانی بەنی نضیر بە خەیـاڵی یەك گرتن بە کۆمەڵەکان لەدژی موسلمانەکان چوون بۆ مەکە بۆ هەڵنـانی قورەیشەکان لە پێغەمبەرو

---

(١) سوورەتی ( النور )

موسڵمانەکان ، وە لەوێ کۆبونەوەیان کرد بەقورەیشیەکان و داوایان لێ کردن بۆ جەنگانی لەگەڵ موسڵمانەکاندا و وتیان : ئێمە یەکەیەکە چاریان ناکەین ، بەڵام ئەگەر بەجارێ هەموو لایەکمان یەك بگرین و بدەین بەسەریانا بەبێ زیانێکی ئەوتۆ لەناویان ئەبەین و پاکیان ئەکەینەوە ، قورەیش لە حذییبیان پرسی بۆ تیرەکەی ، وتی : وان لەناوەندی خەیبەر و مەدینەدا چاوەڕێی ئێوە ئەکەن کە لەگەڵیانا بڕۆن بۆ سەر محمد ، وتیان : ئەی قورەیزە ؟ وتی : بەڵێ لە مەدینەدا ماونەتەوە هەتا ئێوە ئەچن و پێکەوە بدەن بەسەر محمدا .

قورەیشەکان ئەختێ دوودڵییان هەبوو . چونکە ناڕێکی ئەوان لەگەڵ محمدا تەنیا لەسەر بانگەکەیەتی ، بەڵکو ئەو بانگەی ڕاستبێ ئەوەتە هەر زیاد ئەکاو بەرز ئەبێتەوە و پەرە ئەسێنێ لەبەرئەمە پرسیاریان کرد لە جولەکەکان ئێوە ئەهلی کتابن و شارەزان لە ناڕێکی ئێمەو محمدا ، ئایا ئێمە لەسەر ڕاستین یا محمد ؟ وە ئایا ئاینی ئێمە باشترە یاائاینەکەی محمد ؟ لێرەدا بەپێی نارەوایی خووپیسی دڵو سروشتیان کەئەیشیانزانی محمد پێغەمبەرەو ئاینەکەی خواییەو ڕاستە و قورەیش بت پەرستەو بەس وتیان : بەڵێ ئاینی ئێوە باشترە و ئێوە لەسەر ڕاستین . قورئان باسی ئەمەئەکاو ئەفەرموێ : أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيباً مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا : هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلاً ، أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللهُ وَمَنْ يَلْعَنِ اللهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ نَصِيراً ) . النساء . ٥١

قورەیش بەمە دڵشاد بوون و بڕیاندا کە بەسەرو ماڵەوە هەوڵ بدەن بۆ لەناوبردنی موسڵمانوکان و ێران کرنی مەدینە .

ئنجا جولەکەکان هاتن بۆ ناوتیرەی ( غطفان ) و ( بنی مرە ) و

( بنی فزاره ) و ( أشجع ) و ( شلیم ) و ( بنی سعد ) و ( أسد ) و تیرەکانی ترو بەدرۆو دەلەسەو هەڵنیان هەموویان هێنانەسەر ئەوە کە بە تێکرایی بدەن بەسەر مەدینەداو موسڵمانەکان لەناو بەرن . لەکاتی دیاری کراوا هەر تیرەیە لەلای خۆیەوە کەوتەڕێ و لەشوێنی ناوبراوا لە نزیکی مەدینەوە یەکیان کرت و ژمارەیان گەیشتەدە هەزار کەســـی جەنگی وە ئازوخەو چەك و وڵاخی زۆر و زەبەندەیان پێ بوو . ســـەرۆکایەتی گشتی دایە دەستی ( أبوسفیان ) هەتا ئەگەنە مەدینە ، وەلەوێدا هەرڕۆژە سەرەك خێڵێك بکرێت بە فەرماندە و سەرۆك .

ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا و موسڵمـانان ، وەزانیان کە سوپایەکی بێژمارەیان لێ کۆکراوەتەوە لـە هەموو تیرەیەکەوە ، وە لە ژمارەو لە چەك و ئامادەییدا زیاترن لە قورەیشەکانی ئوحود ، وە پێغەمبەر کەوتە راوێژ کردن لەگەڵ موسڵمانەکانا کە لەشارا دابنیشن یـا بچن بۆ ڕێگایان ، لە ئەنجاما بڕیاریاندا کە لە ناو شارا بمێننەوە ، (سلمانی فارسی) وتی : باله دەوری مەدینە چاڵ ( خەندەق ) هەڵبکەنین و ڕێگەیان نەدەین بێنە ناوشـار . وە ئەم ڕایە پەسندکرا و بە گورچی دەسیان کرد بەچاڵ هەڵکەندن لە سەراوردی مەودینەوە بەدرێژایی خۆر هەڵات خۆرئاوا ، کەلەم لایەوە دوژمن ئەهاتە سەریان وەلاکانی تری لەبەر خانوو باخی خورما ڕێگای هاتن و جەنگ نەبوو .

موسڵمانەکان دەسیان کرد بە هەڵکەندنی چاڵ هەریەکە لەلایەکەوە ، وە پێغەمبەریش لەگەڵیانـا وەکو یەکێ لـەوان ئیشی ئەکرد : چـاڵی هەڵ ئەکەندو بەبێڵو خاکەنازو بەکۆڵ خۆڵو بەردی فڕێ ئەداو وە هەموو سەرۆكو گەورە پیاوەکان کە پێغەمبەریان بینی دەستیان کرد بەئیش

کردن ، وەئەم ئیـــش کردنەی پێغەمبەر وەنەبێ وەکو ئیش کردنی سەرۆکەکانی ئێستەبێ کەلە ئاهەنگەکانا دەس ئەداتە شتێکی سـادەو لە لـەبەرگی ڕەمزا نەا وانەبوو ، بەلکو ئیش کردنەکەی وەکو کرێکارێکی لێهاتوو بەجارێ ئیشی ئەکرد .

بوخاری ئەگێڕێتەوە (لەبراء)ی کوڕی عازیب ئەڵێ : [ پێغەمبەری خوا گڵی فڕێ ئەدا لە ڕۆژی خەندەقا هەتـا لەگەڵ ئەو هەموو موودی بەسکیەوە بوو ئەوەندەی خۆل لەسـەر کۆبوو بۆوە لەبەرخۆل ورگیم نەئەدی» وە بۆ ئارام دان بەیارەکانی لەهەڵبەستی عەبدوڵای کوڕی ڕەواح پارچەیی بۆ ئەخوێندەوە بە ئاوازەوە وە ئیش کەرەکان کە ئەو ئاوازەیان ئەبیست مانئوەیتی‌یان تیانەئەماو ئەویش وشەی دوایی شیعرەکانی درێژئەکردەوە »

موسلمانەکان زۆر ئازاریان پی‌گەیی لەبەر سەرماو سـۆلەی زۆر سەخت و لەبەر هەژاری و کەم دەسی‌یان . . . بوخاری لە صحیحا ئەگێڕێتەوە لە جابرەوە ئەڵێ : [ لەڕۆژی خەندەقا چالیان هەڵئەکەند و تۆشی خاکێکی ڕەق‌و توند هاتین و هەرچیمـان کرد پاچ و بێل کاری لـێ‌نەئەکرد ، چوونە خزمەتی پێغەمبەر بۆیـان گێڕایەوە فەرمووی : « من ئەچمە خوارەوە بۆی ، هەڵساو ئەبینین سکی بەبەردێك بەستووە و دەسی‌دایە پاچێك و لێ‌ی دا ئەبینین ئەو خاکە ڕەقە بوو بە گڵێکی شی‌کراوە » . ابن اسحاق ڕیوایەتی کردوە . پێغەمبەری خوا خۆی هێلی خەندەقەکەی کێشاو هەر چل گەزی دانا بۆ دەکەس ، وە یاریدەدەر و کۆچەرەکان هەرلایەیان ئەی وت [ سەلمان لە ئێمەیە ـ سلمان پیاوێکی ئازاو بەهێز بوو ـ پێغە مبەریش فەرمووی : ( سەلمان لەئەهلی‌بەیتی ئێمەیە »

ئالەم کاتی تەنگ و چەلەمەدا موسلمانەکان بەشەوو بەڕۆژ خەریکن

## حەج کردنی أبوبکر بەموسڵمانان :

لە کۆتایی مانگی ( ناوجەژنان ) دا پێغەمبەری خوا ( د . خ ) أبوبکری نارد کە سەرۆکی حەجبێو حەج بکا بە موسڵمانان ، وە بیست وشتری دایە بۆ قوچ ، وە أبوبکر لەگەل سێ سەد کەسا ڕۆیشتن بەرەو مەکە ، وەأبوبکر پێنج وشتری خۆیشی برد . لەنێوان پێغەمبەرو تیرەعەرەبەکانا دوو جۆر پەیمان هەبو : پەیمانی گشتی : کە ڕێگەی کەس نەگیرێ لە حەجکردن و کەس ئازار نەدرێ و نەترسێنرێ لە مانگە حورمەت گیراوەکانا . وەپەیمانی تایبەتی : لەگەل گەلێ لەتیرەکانا وە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ساڵ لەدوای ساڵ بت پەرستەکان لەگەل موسڵمانەکانا پێکەوە حەج ئەکەن . خۆ بەگوێرەی پەیمانەکان ناکرێ قەدەغەیان لێبکەن یا ئازاریان بدەن ، وە لە ولایشەوە دووجۆرە پەرستش ئەکرێ کە زۆر لەیەکەوە دوورن و پێکەوە ناگونجێن : خوا پەرستیو بت پەرستی !! ، وە بت پەرستەکان بەڕووت و قووتی ئەگەڕان و حەجیان ئەکرد ، ئەیچۆن ئەمە ئەگونجێ ؟ خۆ بینینی لاشەی کەس دروست‌نیە ، وە لەولایشەوە پەیمان هەیە ، ئەڵبەتە ئەمە بارێکی گران بوو بەلای موسڵمانەکانەوە ، خۆ زۆر لەوبتانەی ئەمان ئەیان پەرستن ڕووخاون و لە ناوچون ، وە کەعبەو دەوروبەری پاك کراوەتەوە لە بت و لە پەرستراوی ئەو بت پەرستانە ، بەڕاستی ئیترکاتی ئەوپەیمانانە نەماوەو هەقی هەڵوەشاندەوەیان هەیە ، تاکەی ئەو خەڵکە لەنەفامیدابن ؟ ، وادیارە ئامۆژگاری و ترساندن و مشتو مڕو شت خستنە پێش‌چاو سوودی نیە بۆ ئەمانەو پەردە لەسەر چاویان لاناچێ هەتا زۆر نەبینن .

بۆ بەجێ‌هێنانی ئەم ئاواتانە ، وەبۆ بەسەرچوونی کاتی ئەو پەیمانە ،

عەرەبا ڕووی نەداوە ، هـــاتن لە شوێنی کۆبونەوەی لافاوەکانـا لەلای ڕۆمەوە بەزین و لەشکرەکەیان هەڵ دا وە [غطفان] و تیرەکانی [ نجد ] لەلای ئوحودەوە هەڵیان دا ، وە پێغەمبەرو موسڵمانەکانیش کە ژمارەیان سێ‌هەزار کەس بوو لەلای خۆر هەڵاتەوە هەڵیان داوپشتیان کردە سەلع ، [سلع کەژێکە ئەڕوانێ بەسەر مەدینەدا] وە چادرێکی سووریان بۆهەڵدا وئالای کۆچەریەکان درایە دەس زەیدی کوڕی حاریسەو ئالای یاریدەدەر درایە دەسی سەعدی کوڕی عوبادە ، وە خەندەق کـــەوتبوە ناوەنـدی کافرەکانو موسڵمانەکان .

ماوەیەك بەم پێیە مانەوە بێ ئەوەی بتوانن زیانێك بەمەدینە بکەیەنن ، لێرەدا قورەیشەکانو تیرەکانی تـری عەرەب چـی‌بکەم چی بکەمیـان پێ کەوتو بەتایبەتی زستانێکی سـاردو سەرمایەکی زۆرو باوگێژەلوکەی یە تەوژم بوو ، چی بکەن ؟ خۆ موسڵمانەکان باکیان نی‌یەو وان لەمـــاڵی خۆیاندا ، ئەمان هەرچەند لێرەدا بمێننەوە ڕێکـایان نیە بچن بـۆیان ، ئەی چی‌بکەن ؟ [ غطفان ] یش ئەبینن ناتوانن زاڵ بن بەسەر موسڵمانە کانا کەوابێ بەڵێـــنەکەیان دەست ناکەوێ ، ئەگەر ئەمان کەڕانـەوەو چوونەوە جێگاو ڕێـگای خۆیان ئەی ئەبێ جوولەکەی خەیبـەرو بەرەی ( بنوالنضیر ) چی‌بکەن ؟ تازە جارێکی‌تر لەشکری وایان بۆکۆناکرێتەوە کەواتە ئیتر تۆڵەی ئەوهەموو ناسۆرەیان بۆناسێنرێ .

کێ بلێ دوایی محمد نادا بەسەریاناو لەخەیبەردا لەناویان بەرێ ؟ لە ترسی ئەمانە حدیبەی کوڕی ئەختەب هەڵساو بەناو لەشکرەکەدا گەڕاو وتی : ئێستە ئەچمە ناوهۆزی ( قریظة ) وایان لێ‌ئەکەم کەپەیمانەکەی محمد هەڵوەشێننەوەو بدەنە پاڵ ئەمان ، کەئەوەیشیـان کـرد لەلایەکەوە

یارمەتی‌و پشتیوانی بۆ محمد نادێنێ‌و، لەلایەکی ترەوە ڕێگە نەکرێتەوە بۆ چوونە ناوشار . بەمە لەشکرەکەی دڵخۆش کـردو ڕۆی بۆناو جواڵەکەی بەنی ( قریظة ) وڕووی کردە قەڵاکەی کەعبی کوڕی ئەسەد کەخاوەنی پەیمانەکە بوو لەگەڵ پێغەمبەراو سەرۆکی خێڵەکە بوو . کەعبیش کەهاتنی ئەولەشکرەی زانیبوو دەرگای قەڵای لەخۆی داخستبوو، بڕیاری‌دابوو کە ئەوپەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەرا بەستویەتی هەڵی نەوەشێنێتەوەو یارمەتی‌هیچ دوژمنێکی نەدا ، بەڵام حوییەی هات‌و دای لەدەرگـاکە . کەعب پێی وت : دەرگات بۆناکەمەوە تۆ پیاوێکی خراپ‌و نالەباری‌و ئەتەوێ تووشی سەرکەردانیمان بکەیت ، من پەیمانم هەیە لەگەڵ محمداو بێجگە لەڕاستی وباشەو پیاوەتی هیچم لێ‌نەدیوەو هەڵی ناوەشێنم ، حودەییە وتی : تـۆ دەرگاکەم بۆبکەرەوە نەختێ لەگەڵتا ئەدووم ، وتی : بڕۆ وازم لێ بێنە ، نای‌کەمەوە . حدیبە وتی : بەخوا لەترسی ئەوە نانێکت نەخۆم نایکەیتەوە کەعب دەرگاکەی بۆکردەوە . حدیبە چوە ژوورەوەو وتی بەکعب : ماڵ وێران دونیام بۆڕانۆتە سەرمحمد ودەشت‌و دەرم لێ پڕ کردووە ( قورەیشم هێناوە بەهەموو سوپاو پیاوەکانیەوە و ( غطفان ) وهەموو تیرەکانی بیابانی ( نجد ) م کۆکردۆتەوە . وپەیمانیان داومەتێ هەتا محمدو هاوڕێکانی لە ڕیشە دەرنەیەن، لەشوێنی خۆیان نەبزوون . کەعب وتی بەخـــوا ئەمانە هیچیان تیا بەسەر نی‌یە لێم‌گەڕێ ، باڵەسەر پەیمانەکەی خۆم بم ، بەخوا لەچاکەو ڕاستی بەولاوە هیچم لەمحمد نەدیوە . خەڵکـی‌تر کەلەدەوریان کۆبوبووەوە هاتنە ناوقسەکەوەو بوونە پشتیـوانی حودەییە ، وەحودەییە لێیان نەگەڕا هەتا وای لێ‌کردن کەپەیمان نامەکەیان هێناو لەت‌و پەتیان کرد ، وەحودییە پەیمانی دانێ ئەگەر ئەم هەموو سوپایە گەڕایەوەو نەیان

توانی موسڵمانەکان لەناوبەرن ئەو بچێتە ناویانەوەو هاوبەشیان بێ لەهەمرو بەسەرهاتیانا .

کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر بەخێرایی سەعدی معاذی سەرۆکی ( أوس ) وسەعدی عوبادەی سەرۆکی ( خزرج ) لەگەڵ عبدوڵای رەواح وخەوواتی کوڕی جوبەیرا نارد تا بزانن ئەم دەنـــگو باسە چی‌یە . وە فەرمووی ئەگەر ڕاستبوو کەهاتنەوە ئاشکرای مەکەن با موسڵمانان وره بەر نەدەن ، کاتێ ئەم پیاوانە چوونە ناویان‌و سەیریان کردن ئەیینن خراپترین شێوەو دەمو زمانیان هەیە ، کاتێ ویستیان بیان گێڕنەوە بۆسەر پەیمانەکە وتیان : بەئێوەش برا ( بنوالنضير ) یەکانمان بێننەوە ، سەعد ( کەهـاو پەیمانیان بو لەپاسای خێلایەتیدا ) ویستی بیان ترسێـــنێ لەئاکامی ئەم کارەیان‌و ئەوانیش بەدەردی ( بنوالنضير ) ئەبرێن .

جووولەکەی بێ‌قەول کەوتنە هێرش بردنە سەر پێغەمبـەرو وتیان : پێغەمبەری چی‌و پەیمانی چی ؟ ئێمە پەیمانمان لەگەڵ ئەمدا نی‌یە .

موسڵمانەکان بەم کارە زۆر نارەحەت بوون‌و مەترسیان لێ‌نیشت ، ئەوە بەنی ( قريظة ) دەرگای شار ئەکەنەوەو ئەوسوپا گەورەیە برژێتە ناوشار لەڕیشەیان دێنن‌و ئەیان برێنێـتەوە ، وەسوپای دوژمنیـش بـەگەڕانەوەی حوییە دڵشاد بوون‌و کەوتنە خـۆ ئامادە کردن بۆجەنگ ، چونکە (قريظة ) وتبویان بەماوەی دە ڕۆژ ئێمە خۆمان کۆئەکەینەوەو ئەبێ ئێوە لەم ماوەدا بجەنگن ، وەدەس بەجێ کەوتنە خۆتوندکردنەوەو سێ تاقمیان ڕێکخست. تاقمی کوڕی ( أعور السلمی ) لەژووری شیوەوەو تاقمی ( عوینە ) لەلا قەدەوە وتاقمی ( ابوسفیان ) لەلای خەندەقەوە تێیان هەڵ کـردو ترس‌و بیم نیشت لەموسڵمانەکان‌و کەوتنە لەرزەو بەتەما بوون ئێستە یاتاوێکی‌تر

لەخەنەکەکە بکەنە ئەم بەرەوەو شار داگیر بـکەن ، لێرەدا دوو ڕووەکان کەوتنە پڕوپاڵاتەو مەترسیو خۆشاردنەوەو قسەی پڕو پوچ بڵاو کردنەوە هەتا ( معقب بن قشـی ) برای ( بنی عمر بن‌عـوف ) ئەی ووت : محمد پێی ئەوتین خەزێنەی کیسراو قەیسەر ئەخۆین . کەچی ئێستا کەسمان ناتوانێ بەبێ ترس بچێتە سەر ئاودەس ، وە ( أوس بن قیظی ) لە ( بنی حارس کوڕی حاریس ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا ماڵەکانمان دیارن لە دوژمنەوە ڕێمان بدە با بچینەوە ناوماڵی خۆمان چونکە لەدەری شـارن .

لێرەدا قـوڕئان لەم باسەدا ئەفەرموێ : ( إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا ، وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ) . الاحزاب: ١١ - ١٣

بەڵام پێغەمبەرو زۆر لەموسڵمانەکان بەباوەڕی پتەوەوە خۆیان گرتو خەندەقیان بەخێو ئەکردو نەیان ئەهێشت لێیەوە بپەڕنەوە . کەئابلوقەکە درێژەی کێشا بۆماوەی بیست ڕۆژ هەندێ لەپاڵەوانەکانی قورەیش بڕیاریان دا کەلەخەنەکەکە بکەنە ئەوبەرەوەو ڕۆریان کرد لەئەسپەکانیان بازیان‌دا ئەوبەرەوە ، لەوانە ( عمرو کوڕی عبدود ) و ( عکرومة کوڕی أبوجهل ) و ( ضیرار کوڕی خطاب ) بوو وەکۆمەڵێ لەموسڵمانەکان بەسەرۆکایەتی ( عەلی کوری ابی‌طالب ) هاتن بۆیان ، عەلی وتی بە (عەمری کوڕی‌عبدود) ـ کەپاڵەوانێـکی ناسراوبوو لەتەمەنی نەوەد ساڵیدابـوو ـ ئەی عەمر تۆ پەیمانت داوە بەخوا کەهەرکاتێ پیاوێکی قورەیش بانگی کردی بۆیەکێ

لەدوو شت تۆ یەکێکیانی لێوەرئەگری ؟ وتێ بەڵێ عەلی وتی : دە من داوات لێ ئەکەم کەباوەڕ بێنی بەخواو بەپێغەمبەری خواو بەئیسلام ، عەمر وتی : پێویستم بەمە نی‌یە . عەلی وتی : دەی‌بانگت ئەکەم بۆزۆران‌بازی عمرو وتی : بەخوا پێم خۆش نی‌یە منالێکی وەکو تۆ بکوژم . عەلی وتی بەخوا من حەزئەکەم بتکوژم . عەمر ڕقی داهاتو لەئەسپەکەی دابەزی‌و ڕووی کردە عەلی‌و پەلاماری یەکیان داو یەکتریان هێناو بردو لەئەنجاما خوا بۆی کرد عەلی عەمری کوشت . ابن‌اسحاق ئەڵێ : قورەیشەکان‌ناردیان بولای پێغەمبەری خوا ( د . خ ) کەلاشەکەی عەمرمان بدەنەوە بەدەهەزار لیرە . پێغەمبەر فەرمووی بڕۆن بی‌بەنەوە بەڵام ئێمە نرخی مردارەوەبوو ناخۆین .

وەکافرەکان کەوتنە هەڵپەکردن و لە هەموولاوە هێرشیان بۆ ئەبردن ، [محمدی کوڕی مسلیمة ] و زۆرتریان ئەڵێن . لەکاتی خەنەقدا شەو و ڕۆژمان یەکسان‌بوو . کافرەکان بەنۆبە سەرکردایەتیان ئەکرد و هەرڕۆژە یەکێکیان ئەهاتن هەتا بەڵاکە زۆر ئەستوور بوو خەڵکی زۆر مەترسیان پەیاکرد .

ڕۆژێکیان کافرەکان شەبەیخونیان کردەسەر موسلمانەکان‌و پێغەمبەریش یارەکانی ئامادەکرد ، ئەوڕۆژە تائێوارەو شەو داهات جەنگان‌و نەپێغەمبەرو نەموسلمانەکان نەیان‌توانی و بۆیان‌نەکرا نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوان و خەوتنان بکەن .

## فێڵ کردن لەجەنگاو شکاندنی دوژمن :

ئابلوقەدانی لە شکرەکە درێژەی‌کێشا و هیچیان دەس‌گیر نەبوو ، کاتەکەیش زستانە وەساردو سەرماکەی لەوەدانی‌یە پیاو خۆی لەبەرابگرێ

قورەیشەکان بێ تاقەت بوون و لەوزەیانا نەما ، خۆ جولەکەکانیش لەدرۆ و چاووڕاو زیاتر ئیترهیچ هەڵوێستێکیان نەبوو ، ( غطفان ) یش کەبەتەمای بەرووبوومی باخەکانی خەیبەر بوو ئەویش بەمەرجی سەرکەوتن بوو بەسەر محمدا ، کێ ئەڵێ ئەم سەرکەوتنە ئەبێ و کەی ئەبێ ؟ لەشکری دوژمن شپرزەبووو ، ئارامو توانای بەرگری نەما ، پێغەمبەریش هەستی بەمەکرد و هەوڵی بیانوو هەڵکەوتێك ئەدا کەبڵاوەیان پێ بکا . لەم کاتەدا (نعیم)ی کوڕی مسعودی غطفانی هاتە خزمەتی پێغەمبەر و موسڵمان بوو ، بەڵام هیچ کەس بەم ئیسلام بوونەی نەزانیبوو ، وە لەکاتی نەفامێتیدا دۆست و جێی باوەڕی جوولەکەی [ قریظه ] بوو ، وەهەروەها دۆست و باوەڕ پێ کراوی ناو قورەیش و تیرەکانی ( نجد ) یش بوو ، لێرەدا نعیم وتی : ئەی پێغەمبەر خزمەکانم بە ئیسلام بوونمیان نەزانیوە چ فرمانێکم پیائەدەیت تابیکەم ، پێغەمبەر فەرمووی : تۆ یەکێکیت لە ئێمە و لێرەدا هیچت پێ ناکرێ . بەڵام بڕۆ بۆ ناو کافرەکان و چۆنت بۆ ئەکری بیان خەڵەتێنە ، خۆ جەنگ بەفێڵ ئەکرێ ، بەڵام ئیسلام بوونەکەت دەرنەخەیت .

خێرا نعیم ڕۆیی بۆناو جوولەکەی [ قريظه ) کە بێ نیان هاتن بەدەمیەوە و ڕێزیان لێ گرت ، لە پاشا (نعیم) وتی : قسەیەکتان بۆئەکەم بەمەرجێ پەیمانم بەنێ لای کەس نەیڵێن ، وتیان پەیمان بێ وتی : ئێوە ئەزانن لەمەوپێش بەنی [ قینقاع ] و [ بنی النضیر ] چی یان بەسەرهات بەدەس ئەم پیاوە وە ، کارێکی وا مەکەن ئێوەیش تووشی ئەوە بین ، قورەیش و غطفان وەکو ئێوە نین و ئەوان دوورن و جێگایان قایمە و محمدیش دەستی پێیان ناکات . ئەگەر زاڵ بوون و تالانو مالیان دەس کەوت واباشە ، ئەگەر نەبوو ئەگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆیان و ئێوە بەجێ

یەڵێن لەژێر چەپۆکی ئەم کابرایەدا ، ئێوەیش بەتەنیا چاری ناکەن و تیائەچن ، جامن وای بەباش ئەزانم هەتا لە قورەیش و غطفان دڵنیانەبن کەبەجێتان نایەڵن و بەگورکان خۆاردوتان . نادەن نەچنە جەنگی ئەم پیاوەوە ، وە بەقسەی ڕووت باوەڕ مەکەن هەتا حەفتا پیاوی خانەدانتان نەدەنێ کەبارمتەبێ لاتان خۆتان تووشی بەڵا مەکەن . هەموو بەچارێ باوەڕیان پێ کردو ڕاکەیان بەلاوە پەسەند بوو .

پاشان هاتەناو قورەیشەکانو کۆبونەوەی کرد بەسەرۆکەکانیان و وتی قسەیەکتان بۆئەکەم زۆر نهێنی‌یە بەڵام مەرج ئەوەیە لای کەس نەی درکێنن ، ئەگەر باوەڕم پێ ئەکەن و بە دڵسۆزم ئەزانن ، وتیـان : بەڵێ دڵسۆز و ڕاستی و پەیمانت ئەدەینێ . وتی : وەکو بۆم ڕوون بۆتەوە [بنی قریظه] پەشیمان بوونەوە ، چونکە ئەترسن کەئێوە گەڕانەوە محمدبدا بەسەریاناو تووشی بەڵایان بکا . ئێستا پێک هاتوون لەگەڵیا بەو مەرجەی ئەمان کۆمەڵێکی گەورە لەسەرۆک و گەورەو خانەدانەکانی ئێوەیان بەفێڵ بۆ بگرن و بیدەنە دەسی و ئەویش ڕێگایدا بە جوولەکەی بەنی ( النضیر ) بێنەوە جێگای خۆیان ، جائێوەیش ئاگاتان لەخۆتان بێ جوولەکە تەڵەکەبازوو جادوگەرن و نەتان خەڵەتێنن . وە لە پاشان هاتە ناو غطفان و ئەم هەواڵەی دابـە ئەوانیش و مێشکی ئەوانیشی پڕ کرد .

زۆری پێ نەچوو ئەبوسفیان ناردیەلایان ئیتر تاکەی بوەستین و چاوەڕێی چی بین ؟ ئەبێ بەیانی دەس بکەن بەجەنگ ، ئەوانیش وتیان : ئێمە پێمانەوە نایەت لە شەممەدا جەنگ بکەین ( شەوی شەممەبوو کە ناردی‌یە لایان ) وە لەگەڵ ئەوەشا ناتوانین بـەشـ جەنگین لەگەڵ محمدا هەتـا ئێوە حەفتا پیاوی خانەدانتان نەنێرنە لامان و بارمتەبن ، ئەگەر ئێوە کشانەوە

ئێمە چی بکەین لێرەدا بەتەنیا . کـەئەم هەواڵە گەیشتەوە بەقورەیـش و غطفان وتیان : ئەها ئەوا قـەکەی ( نعیم ) هاتەدی ، لەبەرئەوە ناردیانە لای ( قریظة ) : بەخوا منالێکتان بەبارمتە نادەینێ کەئەم هەواڵە گەیشتە [ قریظه ] وتیان : بەڕاستی قسەکەی نعیم تەواوبوو ، ئەمانە ئەیانەوێ دەستێ بوەشێنن ئەگەر بۆیان ڕێ کەوت تالانی بەرن ئەگینـا بگەڕێنەوە . بۆ جێگای خۆیان .

بەم پێیە پیلانەکەی نعیم سەرکەت و نارێکی کەوتە ناوســوپای دوژمنەوە باوەڕیان بەیەك نەماو شپرزەیی کەوتە ناو ڕیزەکانیانەوە ، شەویش بەفەرمانی خوای گەورەو پەروەردگار کردی بەتۆفانێك ئەوسەری نەبێتەوە باوکێژەڵووکەی سەخت و ساردو بەتەوژم هەڵی کرد ، بەڕەنگی چـادری بەپێوە نەهێشت و ئاگری هەموو کوژانەوە ، باران وەکو یەکێ بـڵێ بە سەطل ئەیکەنە خوارەوە ئاوا ئەباری و کردی بە هەورەگرمەو چەخماخە وسکەو زاوردار زاوری ئەتۆقی ، سەرماکەیش لەوەدانەبوو ترس و بیم کەوتە دڵی لەشکری دوژمنەوە ، ئەترسان موسڵمانەکان ئەم کاتە بەهەل بزانن و لەخەندەق بپەڕنەوە و بدەن بەسەریاناو شپرزەیان بکەن . ( طلیحه )ی کوڕی ( خویلد ) هەڵساو هاواری کرد : محمد هات بۆتان ، خۆتان ڕزگارکەن ، وە ئەبوسفیان بانگی گەڕانەوەی لێدا .

( حذیفه ) ئەڵێ : پێغەمبەر کەمێ لەشەو ڕۆیی بوو لای کردەوە بەلامانەوە و فەرمووی چ پیاوێ هەڵ ئەســێ بچێ بزانێ ئەو کۆمەڵە چی ئەکەن و پاشان بگەڕێتەوە ، کەس هەڵنەسا لەبەر ترسو ســەرماو برسێتی ، ئنجا پێغەمبەر بانگی کردم و ئیتر ناچاربووم هەڵسـام چوومە خزمەتی فەرمووی (حذیفه بڕۆ بۆ ناو لەشکری دوژمن و بزانە چی ئەکەن

بەڵام هیچ نەکەیت تا ئەگەڕێتەوە ، منیش لەهەموو کەسێ زیاترم سەرما بوو زیاتریش ئەترسام ، دۆعای بۆکردم و لەخۆوە گەرم بوومەوە ئەتوت لە حەمامدا ئەڕۆم ، کەیشتمە ناویان و بینیم ئاگرێ تروسکەی دیارە رووم تێ کرد دیم پیاوێکی ڕەشی زلە دەسی پیائەگرێ و ئەی هێنێ بە سەر ئەژنۆو پێی گەرم ئەکاتەوە . ویستم بی کوژم بەڵام فەرموودەکەی پێغەمبەرم بیر کەوتەوە و دەسم گێڕایەوە ، بینیم باو سەرما کارێکی پێ کردون بەکەس نەکرابێ ، ئەچادریان بەپێوەماوە نەدیزەیان بەسەر ئاگرەوە ماوە و تەواو پەکیان کەوتووە ، کوتوپڕ ئەبوسوفیان هەڵسایە سەرپێ و قیڕانی : ئەی جەماهیری قورەیش بەخوا ناتوانن لەمە زیاتر بمێنینەوە ، ئەوەیە چی ووڵاخ و وشترمان بوو لەناوچوو وە بنو قرنطە درۆیان لەگەڵ کردین خێرا بارکەن ، ئەبجار هەڵساو پەلاماری ووڵاخەکەیدا و چووە سەری ، ئیتر قورەیش یەکسەر دایان بەیەکاو گەڕانەوە ، تیرەکانی تریش کە ئەمایان زانی ئەوانیش بەپەلە باریان کرد و گەڕانەوە و کەسی لە دوژمن تیانەما .

حذیفە ئەڵێ : کە هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر هەواڵم دایە فەرمووی : لاإله إلاالله وحده ، صدق وعده ، ونصرعبده ، وأعز جنده ، وهزم الاحزاب وحده ، ولاشيء بعده ) بەیانی کە ڕۆژ بوەوە ئەبینن چۆڵ و هۆڵ و کەسی تیانەماوە دڵنیایی و هێمنی گەڕایەوە دڵی موسڵمانان .

## جەنگی ( بنوقریظه )

کاتێ لەشکری یەککرتوو گەڕایەوە و موسڵمانەکان گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منال ، پێغەمبەری خوا ( د . خ ) گەڕایەوە بۆ ماڵ و چووە ژووری عائیشە یا [ أم سلمة ] وچەکی داناو ئەی ویست سەرو لاشەی بشۆرێ

لەو تۆزو خۆڵەی لە هەرای خەندەقا تێوەی چووبوو ، لەم کاتەدا جبرەئیل هـاتو وتی : ئەی پێغەمبەر خوای گەورە داوات لێ ئەکات برۆیتە سـەر بەنی قورەیزە ، ئەمجار پێغەمبەری خوا فەرمانی داو بانگەوازیـان کرد : هەرکەسێ ئەبیستێ و گوێ ڕایەڵی ئەکات نوێژی عەسر ناکات لەناو بەنی [ قریظە ]دا نەبێت ، پێغەمبەر ئاڵاکەی دایە دەس [ علی کوڕی ابی طالب ] و [ عبدالله کوڕی ام مکتوم ] ی لەسەر مەدینە دانا، وە نزیکی سێ هەزار پیاوی جەنگی کەوتنە ڕێ ٣٦ ئەسپی سواریان پێ بوو ، جێگای قریظە چەند میلێك دوور بوو لە مەدینەوە ، لە ڕێگا بوون نوێژی عەسر بوو : هەندێ لە موسڵمانەکان وتیان : مەبەسی پێغەمبەر ئەوەنەبوو کە نوێژەکانمان بفەوتێ ویستی بەپەلە برۆین . وە هەندێکیان وتیان ئەو فەرمووبە : لەناو بەنی قریظەدا نەبێ نەی کەن و لە ڕێگـادا بوون ڕۆژ ئاوابوو نوێژەکانیان ڕۆیی . کاتێ پێغەمبەر بەمەی زانی ڕەخنەی لـە هیچ لایەك نەگرت .

عەلی لەگەل کۆمەڵێ لە کۆچەری و یـاریدە دەرەکان لە پێشەوە گەیشتنە نێو بەنی [ قریظە ] و حوییەی ئەختەبیشی لەگەڵیان چوبووە ناو قەڵاکانیانەوە ، کە چاویان پێیان کەوت دەسیان کرد بەدەم درێژی کردن بۆ سەر پێغەمبەری خوا و بە ناشیرینی و بێ ئابڕوویی لە خۆی و خێزانی دەوان ، کە پێغەمبەر بەدوایانا هات عەلی پێی گەیشت و داوای لێ کرد : کە نزیکی قەڵاکانیان نەبێتەوە ، پێغەمبەریش فەرمووی بۆچی ؟ وا ئەزانم وتەی خراپت لێ بیستووەو ئەترسی ئـازارم پێ بگەیەنن ؟ وتی : بەڵێ فەرمووی : ئەگەر منیان دی ئەو وتانە نالێن .

وەکە لە قەڵاکانیان نزیك بووەوە بانگی کردن : برادەرانی مەیموون

ئایا خوا سەری لێ تێك‌دان و بەڵای بەسەرا ڕژن ؟ وتیان : ئەی [ ابو القاسم ] تۆ هیچ کاتێك پیاوێکی نەفامو نەزان نەبوویت ، وە بە رووودوا موسڵمانەکان هەموو هاتن هەتا لەوێدا هەموویان کۆبوونەوە و پێغەمبەر فەرمانی‌دا ئابڵوقەیان دان . ئەم ئابڵوقەیە درێژەی کێشا بۆ ماوەی بیست و پێنج ڕۆژ و لەم ماوەیەدا جەنگ و هەرایەکی ئەوتۆ رووی‌نەدا بێجگە لە هەندێ بەرد باران تیرهاویشتن ، لەم ماوەیەدا [ قریظه ] زانی ئەوەیان نەبوو چاریکیش بێنە دەرەوە ، کە بێزار بوون لەو ئابڵوقەیەو لەوزەیانا نەما سەرۆکەکەیان [ کعب کوری أسد ] پێی وتن :

« ئەی کۆمەڵی قریظه ئەبینین تووشی چ بەسەرهاتێك هاتوون ، وەئەم چەند شتەتا ئەخەمە پێش چاوو بە ئارەزووی خۆتان یەکێکیان هەڵبژێرن . وتیان : ئەوانە چین ؟ وتی : باشوێنی ئەم پیاوە بکەوین بەخوا هەموو بۆتان دەرکەوتووە کە پێغەمبەرو نێرراوە و ئەوەیە لەتەوراتا باسی ئەبینین ، وە ئیتر ئەمین ئەبن لە خوێن و ماڵو منال و ناموستان ، وتیان هیچ کاتێك واز لە فەرمان و ئایینی تەورات نایەنین و هیچ جۆرێك نای‌گۆڕین ، وتی : دەی ئەوەناکەن باپەلاماری ژنو منالانی خۆمان بدەین و هەموویان بکوژین و ئەمجار بەدڵێکی ڕەحەت شمشێر هەڵکێشین و و ڕووبکەینە محمد و یارەکانی هەتا بزانین خوا چیمان لەگەڵاتەکات ، ئەگەر لەناوچوین خەمی دوای خۆمانمان نابێ ، وە ئەگەر سەریش کەوتین هەر ژنو منال زۆرە . وتیان : چۆن ؟ ئەوهەژارە بێ‌گوناهانە بکوژین ؟ جاتر دوای ئەوان ژیانی ئێمە بۆچی چاکە ؟ وتی : کەئەوەیش ناکەن ئەم شەو شەممەیەو ڕەنگە محمد و هاوڕێکانی لەم شەوەدا لیمان ئەمین‌بن و

گوێیان نەدابێنێ بابۆیان دەرچین و دەسێکیان لێ بوەشێنین . وتیان : نابێ وتی : دەرازیبن بەحوکم و فەرمانی محمد وابزانن لەسەر برین بەولاوە نی‌یە ، وەهیچ پیاوێك لەئێوە هێشتا پیاوانە شەوێك رۆژی نەکردۆتەوە لێرەدا کەوتنە وتووێژوو راوێژ ، هەیان بوو ئەیوت : لە بنو [ النضیر ] خراپترمان لێ ناکەن و ئەوسی‌یەکانی هاوپەیمانمان یارمەتی‌مان ئەدەن .

لەسەر ئەم بڕیارە ناردیان بۆلای پێغەمبەر کە ئەچن بۆ ئەزروعات و هەرچی‌یان هەیە بەجێی یەلن . پێغەمبەر فەرمووی : ئەبێ رازی‌بن بەفەرمانی خوا ، ئنجا ناردیان بەشوێن ( أبولبابة ) ی یاریدەدەرا کە لە ئەوسی‌یە هاوپەیمانە کانیان بوو پێغەمبەریش ناردی بۆ ناویان ، ئەوانیش داوای رایان لێکرد کە بچنە سەر فەرمانی محمد ئەویش بەدەم وتی : بەلێ وە بەدەسیش دەسی برد بۆ قورگی ، ( یانی فەرمانەکەی ئەوەیە سەرتان ئەبڕین ) وە ئەویش ئەوەبوو گریان و هاوارو کورزانەوەی ژنو منال تیی لێکردو دلی نەرم کردو ئەوەی کرد ، وە کورج پەشیمان بوەوە و زانی خیانەتی کردوەو رووی نەهات بکەرێتەوە بۆلای پێغەمبەر و چوبۆ مزگەوت و خۆی بەستەوە بەکۆلەکەیەکەوە و سوێندی خوارد هەتا خوا تۆبەی لێوەرنەگرێ یاوەهانەمرێ نابێ لەم کۆلەکەیە بکرێتەوە . کە پێغەمبەریش پرسی چی‌کرد أبولبابە ؟ بۆیان گێرایەوە و فەرمووی : ئەگەر بهاتایەتە لامن داوای لێخۆشبوونم بۆ ئەکرد . بەلام کەوایە لێی ئەگەرێین بزانین فەرمانی خوا چۆنە ؟ وە لە ئەنجامدا خوا تۆبەی لێوەرگرت ، ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە [ وآخرون اعترفوا بذنوبهم خلطوا عملا صالحاً وآخرسيئاً عسى الله أن يتوب عليهم إن الله غفور رحيم ] .

لەدوای بیست و پێنج ڕۆژ بڕیاریان دا هێرش بکەنە سەریـان و قەڵاکانیان بگرن . عەلی هاواری کرد : ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بەخوا یائەبێ وەك حەمزەم لێ بێ یا قەڵاکانیان ئەگەمەوەو ئەیان گرم .

بەڵام جولەکەکان بەناچاری هاتنە سەر فەرمانی پێغەمبەرو ناردیانە لای ئەوســییەکانی هاوپەیمــانیان : خەزرەجیەکان چییان کرد بۆ هاوپەیمانەکانیان ئێوەیش واناکەن لەگەڵ ئێمەدا ؟ کۆمەڵێ لە ئەوسییەکان چوونەلای پێغەمبەرو کەوتنە تکاکردن بۆیانو تکاوەرگرتنی خەزرەجییەکانیان لە پێشوودا هێنایەوە بیری‌و پێغەمبەریش فەرمووی : باشە ئێوە ڕازی نابن پیاوێك لـە خۆتان حەکەم بێ لـەناوەندی من و ئەوانا ؟ وتیان : بـاشە بەمە ڕازی ئەبین . ئینجـا جوولەکەکان سـەعدی کوڕی ( معاذ ) یـان کرد بە حەکەم ، پێغەمەریش بەمەڕازای بوو ، وەناردی بەدوای سەعدا ئەویش هات ،

ئنجا سەعد وتی بە جوولەکەکان : « ئێوە ڕازین بە حەکەم و فەرمانی من » وتیان : بەڵێ .

ئنجا بەدەنگی بەرز سەعد بانگی کرد و (بەجۆرێك هەموو موسڵمانەکان و جوولەکەکان گوێیـان لێ بێ ) وتی : « ڕای من ئەوەیە پیاوەکانیـان بکوژرێ و ژن و منالیان بپێلرێتەوە .

- ئنجا هەموو پیاوەکانیان کوشتن ، بەڵام چواریان موسڵمان بوون و خۆیان ڕزگار کرد لەکوشتن و تالآن .

ئەم ڕووداوە لەکۆتایی مانگی شەشەڵان و سەرەتای مانگی نـــاو جەژنان بوو ، کەڕێکەوتی سالی پێنجەمی کۆچی بوو .

وە هەر لەم سالەدا حەج فەرز کرا و بووبە شیعـاری ئیسـلام .

له ســـالی شه‌شه‌می کۆچی‌دا جه‌نگی ( بنی لیحیان ) ڕووی‌دا ، هۆزی لیحیان ئه‌وانه بوون که‌به‌فێڵ و ته‌ڵه‌که عاسمی کوڕی(سابت) و هاوڕێکانیان شه‌هید کرد .

پێغه‌مبه‌ر چوو بۆیان به‌ڵام زانیان که پێغه‌مبه‌ر بۆیان چوه ڕایان کرد و خۆیان شارده‌وه و ، موسڵمانه‌کانیش له‌به‌ر گه‌رمای به‌تین گه‌ڕانه‌وه .

## جه‌نگی ذی‌قیره‌د یا ـ غابه ـ

هه‌ر له مانگی « ربیع الاول » دا دوای گه‌ڕانه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر به‌چه‌ند ڕۆژێك « عوه‌ینه‌ی فه‌زاری به‌چل ســـواره‌وه هات بۆ ده‌وری مه‌دینه و ده‌ستێ بوه شێنێ ، وه‌له ، ده‌ری شار ڕانه حوشترێك بوو ژماره‌یان بیســت حوشتربوو ، پیاوێك و ژنێك به‌لایه‌وه بوو عوه‌ینه په‌لاماری دایه پیاوه‌که‌و کوشتی‌و ژنه‌که‌و وشتره‌کانیان فڕان وگه‌ڕانه‌وه ، به‌خه‌یالی خۆیان ده‌رچوون به‌ڵام له‌وکاته‌دا سه‌له‌مه‌ی کوڕی عه‌مری ئه‌کوه‌عی ئه‌ســله‌می تیرو که‌وانی دابوو له‌شانی‌و ئه‌یویست بچێ بۆئه‌و شوێنه‌ی پێیان‌ئه‌وت(غابه)کاتێ گه‌یشته ئه‌ونزیکانه‌خه‌ڵکه‌که‌ی‌دی‌و حوشتره‌کانیان به‌رخۆداودو ژنه‌که‌یشیان هه‌ڵگرتوه ، هاواری کرد : « واصباحاه » که‌ئه‌م هـاواره بۆ فریاد ڕه‌سی بوو له‌نـاو عه‌ربه‌کانا وه به‌ده‌م هاواره‌وه ڕای‌کرد به‌شوێنیانا هه‌تا لێیان نزیك‌بووه‌وه دانیه به‌رتیر ، وه ئه‌م هاواره‌یش گه‌یشته پێغه‌مبه‌ر و ئه‌ویش هـــاواری کرد بۆ ناوشار به‌م ده‌نگه‌وه لـه‌هه‌موو لایه‌که‌وه سوار ڕایان کرد بـۆ خزمه‌تی و ئه‌ویش فه‌رمووی بڕۆن به‌ده‌م ئه‌و هاواره‌وه وه‌خۆیشی لـه‌گه‌ڵ هێزێکدا ڕۆیی به‌دوایانا ، هه‌تا گه‌یشتنه که‌ژی « ذی‌قرد » و له‌وێ دا خستیان وه عوه‌ینه‌و تاقمه‌که‌ی زۆر به‌په‌له هاتن بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌نه غه‌تفان و له‌جه‌نگی ئه‌مان ڕزگاریان بێ ، به‌ڵام ســـواره موسڵمانه‌کان گه‌یشتن

بەدوایینەکەیانا بەشی زۆر لەووشترەکەیان لێسەندنەوە ئەوەندە هەبوو پێشەنگەکەیان بەهەندێ لە ووشترەکانەوە دەرچووبوون ، وە ژنەدیلەکەیش بالی خۆی کردبووەوە و لەناکایەکا سواری وشترێکی پێغەمبەر بوو بووەوە بەسواری بۆی دەرچوو بوو هاتبووەوە بۆلای پێغەمبەرو موسلمانەکان ، وە هەوالیدا بە پێغەمبەر کەنەزرم کرد وە ئەگەر رزگارم بێ ئەم وشترە سەربڕم . پێغەمبەریش فەرموی : «بەڕاستی پاداشێکی خراپی ئەدەیتەوە . . ئەو تۆی ڕزکار کردووە و تۆ ئەو سەر ئەبڕی ! . نەزر لە گوناهو مالی خەلکا دانا مەزرێ . . ئەو وشترە مالی منە . . بڕۆرەوە بۆ ناو کەس و کارت لە پەنای خواوە » . وەلەم جەنگەدا موسلمانێك شەهیدکرا و چەند کەسیش لە کافرەکان ، وە لە کەژی قیرەدا نوێژی ترس «صلاة الخوف» یان کردو دوای پێنج ڕۆژ گەڕانەوە بۆ مەدینە .

## بەشی دەیەم : لەجەنگی ( حدیبیه ) وەتا گرتنی شاری مەکە

## جەنگ یان پەیمانی ( حدیبیه )

لەمانگی ناوجەژنان ( ذی‌القعده ) دابوو پێغەمبەر مژدەی دا بە موسلمانەکان کەئەیەوێ بچێ بۆحەج وعەمرە لەمەکەداو لەخەوا بینیویتی ! خۆی ویارەکانی ئەچنە مزگەوتی حەرام بەهێمنیو لەسەرخۆییو حەجو عەمر ئەکەن وسەریان ئەتاشنو لەکەس ناترسن . وەموسلمانەکان کە ئەمەیان بیست لەخۆشیانا دەنگی سوپاسی خوایان بەرزکردەوە ، وەناردی بۆلای هەمو تیرە عەرەبەکان بەموسلمانو ناموسلمانەوە کەبڕۆن بۆ مەکە ، بەلام بتپەرستو دووڕووەکان کەوتنە بڕوو بیانوو هێنانەوەو نەچوون ، وە هەزارو چوارسەد موسلمان ڕێ کەوتنو ئیحرامی عەمرەیان بەستو حەفتا

وشتری قوربانی‌یان پێش خـۆدا وئەمەیش نیشانەی جەنگ نەکـردن بوو شمشێریان خستبووە ناوکێلانەوە ، وەلەخێزانەکانیا (أم سلمه ) ی لەگەڵ خۆیا برد .

کەگەیشتنە ( ذوالحلیفه ) پیاوێکی خوزاعەیی کەناوی ( بشر ) ی کوڕی ( سفیان ) بوو ناردی تا هەواڵی مەکەیان بۆبێنێتەوە ، وەخۆیشیان ڕۆیشتن تاچوونە ( غدیر الاشطاط ) وکابرا هـــاتەوەو وتی : قورەیش سوپایەکی زۆری کۆکردۆتەوە بۆت‌و کۆمەڵی ( أحابیش ) یان هێناوە ( ئەحابیش لەهۆزی بەنی حارثی کوڕی عبدومەنافی کوڕی کینانەبوون‌و لەدەوری مەکەدا ئەژیان وتـیرئەندازو جەنـگاوەرو هاوپەیمانی قورەیش بوون ) لەگەڵتا ئەجەنگن‌و ڕێت‌نادەن بچیتە مەکەوە . پێغەمبەرفەرمووی : خەڵکینە ڕاتان چی‌یە ؟ ( أبوبکر ) وتی : ئەی پێغەمبەری‌خوا تۆهاتویت بۆحەجی کەعبەو ناتەوێ جەنگ بکەیت یا کەس بکوژیت ، بڕۆبەڕێتەوە، هەرکەس ڕێی لێ‌گرتین لەگەڵیا ئەجەنگین . فەرمووی : بڕۆن بەنـاوی خواوە . ئنجـا فەرمووی کێ لەڕێـیەکی ترەوە ئەمان بات وا قورەیش ئەم ڕێ‌یەیان بەستووە ؟ پیاوێکی ( بنی أسلم ) ی وتی : من ، بەڕێ‌یەکی سەخت‌و هەڵەت‌و دڕک‌و داڵاویدا بردنی تاگەیشتنە ( ثنیة المرار ) لیرەدا وشترەکەی پێغەمبەر خەوت‌و هەرچی تێ‌یان خوڕی هەڵ نەسا ، وتیـان : فێرە خوو بووە ، فەرمووی : نەء ، بەندکەری فیل بەندی کردووە ، بەخوا قورەیش داوای هەرچیم لێ‌بکەن کەڕێزی کەعبەی تیا بێـت ئەیاندەمێ ، لەپاشا خوڕی لەوشترەکەی هەڵساو ڕۆیشتن تاگەیشتنە (حدیبیه) ولەوێدا لەسەر تۆزە ئاوێك خـتیان‌و زۆری نەبرد ئاوەکە تەواوبوو کەوتنە هاوار بۆئاو ، ئەویش تیرێکی دەرهێناو فەرمووی : بیخەنە ناوچاڵەکەوەو بەفرمانی

خوا ئاو هاژەی کردە زۆر بوو . لەم کاتەدا بوو ( بدیلی ) کوڕی (ورقا)ی خوزاعەیی لەگەڵ چەند کەسێکا هاتن ، ( بدیل ) وتی : قورەیش وئەحابیش بەجارێ بەرگی پڵنگیان پۆشیوەو نایەڵن بچێتە مەکەوە ، پێغەمبەر فەرمووی ئێمە بۆجەنگ نەهاتوین و هاتووین عەمرە ئەکەین ، قورەیش جەنگ ماندووی کردوون ° بۆچی لێم ناگەڕێن بۆعەرەبەکان ؟ ئەگەر خوا سەری خستم ئەتوانن بەبێ وەی بێنە ناومان یا بحەسێنەوە ، وەئەگەر لەناوچووم واناواتیان بەدی یەت ، بەخوا قەسەم وازنایەنم تا لەناوئەچم یا خوا سەرم ئەخات . ( بدیل ) وتی : باشە من تێیان ئەگەیەنم ، کەهاتەوەو دووا لەگەڵ قورەیشا بەناشیرینی وەڵامیان دایەوە .

بۆجاری دووەم ( مکرز ) ی کوڕي (حفص) بەنی عامری وەبۆجاری سێیەم (حلیس) ی کوڕی (علقم) ی سەرۆکی ئەحابیشیان ناردوپێغەمبەر (درودی لەسەربێ ) تێی گەیاندن کەبۆ حەجو عەمرە هاتووەو جەنگ ناکات ، ئەوانیش کە ئەهاتنەوە وئەمەیان ئەوت قورەیش گاڵتەیان پێ ئەکردن ، تا وتیان بە (حلیس) بابە تۆکابرایەکی بیابانیت چی ئەزانیت ؟ ئەویش تووڕەبوو وتی : بەخوا ڕێیان نەدەن بێنە مەکەوە ئەحابیش دێنێ ویارمەتی محمد ئەدات .

ئنجا وتیان بە (عروه) ی کوڕی (مسعودی ثقفی) کە بچێ و قسەی لەگەڵا بکات ، عروه هات و کەوتە وتو ویژو وتی : محمد ئەوە چییە سوپایەکت لەههتیوو مەتیو هێناوەو ئەتەوێ هێلانەکەی خۆت بڕوخێنی و خزمەکانت لەناو بەریت ؟ بەخوا لەبەرچاومە هەرجەنگ رووی دا ئەمانە هەموو ڕائەکەن وتۆ بەجێ دێڵن ، خۆقورەیش گەورەترین سوپای کۆکردووە تەوە . (أبوبکر) فەرمووی : دەستت بەگونی (لات) ئێمە پێغەمبەر بەجێ

دێلێن !! وتی . ئەوە کێیە ؟ وتیان : أبوبکرە . وتی . بەخوا ئەگەر پیاوەتی بەسەرمەوە نەبوایە وەڵامم ئەدایەوە . (عروە) کەوتە دواندنو هەرکەقسەی ئەکرد دەسی ئەبرد بۆریشی پێغەمبەرو ( مغیرە ) ی کوڕی ( شعبـە ) کە بەسەر سەری پێغەمبەرەوە وەستا بوو قۆناغی شیرەکەی ئەدا لەدەسیو ئەیوت : دەست لابە ، عروە سەری بەرز کردەوەو وتی : ئەمە کێیە ؟ وتیان : ئەوە (مغیرە)یە ، وتی : ئەی ستەمکار خۆ دوێنێ من شوورەیی تۆم شۆری (١)

عروە دڵنیا بوو کەموسڵمانان جەنگیان ناوێو هاتوون بۆحەجو عەمرە وکەسیش لەحەج قەدەغە ناکرێو هاتەوە ناو قورەیشو وتی : خەڵکینە من چوومە لای (قیصر) ی ڕۆمو (کیسرا) ی فارس و (نجاش) ی حەبەشە ئەوەی یارەکانی محمد ئەیکەن بۆمحمد کەس بۆکەســـی ناکات ، پیاوی چاك بن لێیان گەڕێن باحەج بکەن وبگەڕێنەوە ، بەڵام هەرقاییل نەبوونو ویستیان ڕێیان نەدەن . ئنجا پێغەمبەر (خراش) ی کوڕی ( أمیە ) ی خوزاعەیی نارد بۆناویان ، ویستیان بیکوژن ئەحابیش نەیان هێشت ، بەڵام وشترەکەیان سەربڕی ، پێغەمبەر ویستی (عمر) ی کوڕی (خطاب ) بنێرێ (عمر) یش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا منوقورەیش ڕێك ناکەوین ، تۆ (عثمان) ی کوڕی (عفان) بنێرە ئەو خزمی زۆرە ئەی پارێزن ، عثمان چوو بۆناویانو لەپەنای خزمێکیا بوو ڕاسپاردەکەی گەیاندو تێی گەیاندن کەبۆجەنگ نەهاتوون ، بەڵام ڕازی نەبوونو وتیان تۆخۆت بچۆ (طواف ) بکە ئەویش وتی : بەخوا بەبێ پێغەمبەر ناچم ، وتیان : دە سوێندمان

---

«١» مغیرە لەپێش ئیسلام بوونیا سیانزە کەسی (ثقفی) ئەکوژێو (عروە) خوێنیان ئەدا تا جەنگ ڕوو نەدات ،

خواردووه نابێ بێنه مه‌که‌وه عثمان ، ماوه‌یه‌کی پێ چوو له‌مه‌که‌داو موسلمانه کان ترسان کوژرابێت .

مانه‌وه‌ی عوسمان له‌ناو قوره‌یشه‌کانا به‌م هۆیه‌وه بوو که‌عوسمان خۆی که‌یانبووه ئه‌وموسلمانه هه‌ژارانه‌ی که‌له‌مه‌که‌دا بوون وه‌توانای کۆچیان نه‌بوو مژده‌ی دانێ به‌نزیك بوونه‌وه‌ی داگیرکردنی شاری مه‌که ، قوره‌یش که‌به‌مه‌یان زانی وتیان : عوسمان له‌سنوری نێرراوی ده‌رچووه‌و به‌ندیان کرد ، یاخۆ له‌م ماوه‌یه‌دا سه‌رۆکه‌کان په‌یوه‌ندی‌یان پێوه ئه‌کرد ، وه « بنود » ی رێکه‌وتنیان دائه‌نا ، به‌لام هه‌وال هات بۆپێغه‌مبه‌ر که‌عوسمان کوژراوه ، پێغه‌مبه‌ر زۆر ناره‌حه‌ت بوو وفه‌رمووی : « که‌وای لێ هات نارۆین‌و له‌گه‌ل قوره‌یشا ئه‌جه‌نگین » .

پێغه‌مبه‌ری خوا - درودی له‌سه‌ربێ - موسلمانه‌کانی کۆکرده‌وه له‌ژێر دارێکاو په‌یمانی له‌گه‌لا تازه کردنه‌وه : یه‌که یه‌که په‌یمانیان له‌گه‌لا تازه‌کردنه‌وه : یه‌که‌یه‌که په‌یمانیان له‌گه‌ل ئه‌به‌ست له‌سه‌ر مردن ، له‌سه‌ر ئه‌وه رانه‌که‌ن ، یا مه‌که بگرن یا شه‌هیدبن ، وه ئه‌مه‌یش له تۆله‌ی کوشتنی عوسمانا ، که‌موسلمانه‌کان هه‌موو لێ بوونه‌وه ، پێغه‌مبه‌ر ده‌ستێکی خسته ناو ده‌سته‌که‌ی تری و فه‌رمووی . ئه‌مه‌یش په‌یمانی عوسمان بێ ، وه ئه‌م په‌یمانه ناونرا به‌په‌یمانی ره‌زامه‌ندی «بیعة الرضوان» وه خوا سه‌نای موسلمانه‌کانی له‌سه‌ر کردووه و ئه‌فه‌رموێ : «لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة فعلم ما في قلوبهم فأنزل السكينة عليهم وأثابهم فتحاً قريباً «١»

قوره‌یشه‌کان که ئه‌مه‌یان بیست مه‌ترسیان لێ نیشت و عوسمانیان

---

«١» سورة الفتح ( ١٨ ) .

ناردەوە پاش ئەوەی کە سێ ڕۆژی پێچوو . عوسمان هاتەوەو وتەی قورەیشی گەیاند بە پێغەمبەری خوا وەتێی گەیاند کە لەگەڵ ئەوەدا ئەزانین وە لێیان ڕوونە بۆجەنگ نەهاتووە وە بۆ حەج هاتووە بەڵام تازە ئەمساڵ ڕێیان نادەن بێنە مەکەوە ، وەئامادەن لەوە بەولاوە بۆ ڕێکەوتن . پێغەمبەریش - درودی خوای لەسەربێ - ئامادەیی بۆ ڕێکەوتن نیشاندا ، ئەگەرچی ئامادەیی جەنگیان ڕێکوپێك بوو ، بەڵام حەزی لەهەرا نەئەکرد ، لەسەر ئەم بناغەیە قورەیش (سهیل) کوڕی ( عمر ) یان ناردوو وتیان : بچۆ بۆلای محمد و ڕێکەوە لەگەڵیاو پەیمانی لەگەڵا ببەستە ، بەڵام ئەبێ ئەمساڵ بگەڕێتەوە و تەواف نەکا ، سهیل هاتەلای پێغەمبەرو کەوتنە وتو وێژ بۆ ڕێکەوتن وە زۆر جار هەردوولا لەڕێکەوتنەکە پاڵی پێوەئەنان بۆزاڵ بوون بەسەر گیروگرفتەکانیا هەتا لە ئەنجاما پێك هاتن .

موسڵمانەکان زۆر جار نارەحەت ئەبوون لەو هەموو نەرمو نیانی و خۆشل کردنەی پێغەمبەر ئەی کرد لە بنو دومەرجەکانا ، وەئەگەر متمانەو باوەڕی پتەویان بە پێغەمبەر نەبوایە ، ڕازی نەئەبوون ، وە هەڵیان ئەدایە و پەلاماریان ئەدا کە بە جەنگ و هەرا بچنە مەکەوە . بەتایبەتی کە لەم پەیمان بەستنەدا بە پێچەوانەی جارانی هیچ پرسو ڕایەکی نەئەکرد بە یارەکانی .

لە پاشان پێغەمبەر علی کوڕی أبی طالبی بانگ کرد و فەرمووی : بنوسە « بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ » سهیل وتی . هێواش ، ئەم وتەیە نازانم . بنوسە : بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ » پێغەمبەریش فەرمووی : بنوسە «باسمك اللهم » پاشان فەرموی : بنوسە : ئەمەئەو پەیمانەیە کە محمد پێغەمبەری

خواو سهیلی کوڕی عمر لەسەری پێکهاتن . سهیل وتی ئەگەر شایەتیم بدایە پێغەمبەری خوایت لە گەڵتا جەنگو هەرام نەئەکرد ، بەڵام نـاوی خۆتو باوکت بنوسە ، پێغەمبەریش فەرمووی ئەوە بکوژێنەرەوە و بنوسە : ئەمە ئەو پەیمانەیە کە محمدی کوڕی عبداللهو سهیلی کوڕی عمر لەسەری پێك هاتن . . پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە بۆ ماوەی دە ساڵ لەگەڵ یەکا نەجەنگن ، وە خەڵکی لەم ماوەیەدا ئەمین بن و زیانیان پێ نەکات وەهەچ کەس لە قوڕەیش بەبێ پرسی کەسوکاری هات بۆلای محمد بینێرنەوە بۆ مەکە ، وە هەرکەس لای محمدەوە چوو بۆمەکە نەینێرنەوە ، وە لەناوماندا دەس درێژی و خـراپەو دزیو تاڵان و خیـانەت نەبێ ، وەخێڵەکان بۆیان هەیە ئەگەر بیانەوێ - ببنە هاوپەیمان لەگەڵ محمدا یـان لەگەڵ قوڕیشا ، وە ئەمساڵ محمدو موسلمانەکان بەبێ ئەوەی حەج و عەمرەبکەن بگەڕێنەوە و ساڵێکیتر بێنەوە ، بەمەرجێ تەنیا چەکی کاروانیان پێ بێ ، دوای ئەوەی قوڕەیش لە مەکە دەرچوون بێنە ناو مەکەوە وە سـێ ڕۆژ تیا بمێننەوە » .

هەر لەم کاتەدا خێڵی ( خزاعە ) هێرشیان هێناو وتیان ئێمە ئەچینە پەیمانەوە لەگەڵ محمدا ، وە ( بنوبکر ) وتیان ئێمە ئەبین بە هاوپەیمانی قورەیش . . لێرەدا موسلمانەکان زۆریان بێتاقەتو نارەحەت بوون لەبەشی زۆری بنودەکانو وتیان : پەنا بەخوا چۆن ئێمە موسلمان بنێرینەوەو ئەوان ئازاری بدەن وەپەشیمانی بکەنەوە ، کەچی ئەوەی لەئیسلام وەربگەڕێتەوە ئەوان نەمان دەنەوە پێغەمبەر فەرمووی : بێتاقەتی مەکەن ، ئەوەی کـە موسلمانەو ئێمە بۆیان ئەنێرینەوە خوا گرێیان بۆئاسان ئەکاو فریایان ئەکەوێ ، وەئەوەی لەئیسلام وەرئەگەڕێتەوە ئێمە نامانەوێ ، خوا لەناوی

بەرێ . وەبۆئەوەی کەئەمسال بەبێ چوونە مەکەو حەج کردن بگەڕێنەوە، خۆ پێغەمبەریش فەرمووبووی پێیان لەخەوا دیویەتی کەحەج ئەکەن‌وسەریان ئەتاشن . بۆئەمە عمر هاتە جۆش‌و وتی بەأبوبکر : ئەی پێغەمبەر نەی فەرموو حەج ئەکەین‌و ئەچینە کەعبە بەئاسایش‌و بەبێ ترس‌و سەرمان ئەتاشین . أبوبکر وتی : جا فەرمووی : ئەمسال ؟ وەسالی دیاری کرد ؟ عمر وتی : نەء . أبوبکر وتی : دەی تاقەتت بێ ئەچین‌و خەوەکە یەتەدی، وەلەگەڵ پێغەمبەریشا ئەم وت‌و ویژەی هەربەم پێیە کرد .

وەلەپاش نوسینەوەی پەیمانەکە کۆمەڵێ لەموسڵمانەکان‌و کافرەکان ئیمزایان کرد ، لەوانە ابوبکرو عمرو عبدالرحمن‌ی کوڕی عوف و عبداللەی کوڕی سهیل‌و سعدی کوڕی ابی‌وقاص ومحمدی کوڕی مسلمەو علی کوڕی أبی‌طالب وسهیلی کوری عمربوو وەپەیمانەکە بەدوو وێنە نوسرایەوە یەکێکیان لای قورەیشەکان‌و ئەوی تریان لای موسلمانەکان مایەوە .

لەکاتی نوسینی ئەم پەیمانەدا ابوجندلی کوڕی سهیلی کوڕی عمر هات وپەنای هێنا بۆموسلمانەکان‌و وتی : موسلمانم‌و لای ئێوە ئەبم ، کەسهیل کوڕەکەی بینی هەڵسا بۆی‌و دەستی کرد بەلێدانی‌و ملی‌گرت‌و ڕووی کردە پێغەمبەری خواو وتی : ئەی محمد پێش هاتنی ئەم ڕێکەوتنەکەمان تەواو بوو بوو ، پێغەمبەریش ـ درودی خوای لەسەربێ ـ فەرمووی ڕاست ئەکەی ، سهیل ڕای کێشاو ئەی بردەوە بۆناو مەکە ، أبوجندل هاواری کرد : ئەی کۆمەڵی موسلمانان ئایا بم باتەوە بۆناو بت‌پەرستەکان‌و لەئایین لام بدەن ؟ موسلمانەکان بەمەیش زیاتر پەست‌و بێزار بوون ، بەلام پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ڕووی کردە أبوجندل وفەرمووی : « ئەی ابوجندل ئارامت‌بێ‌و بخایەنەو ڕازی‌بە بەکاری خوا ، بزانە خوای

گەورە دەرووی خۆشی لەتزیش‌و موسڵمانە بێدەسەڵاتەکانی تریش ئەکانەوەو ڕزگارتان ئەکا ، ئێمە پەیمانی ئاشتیمان لەگەڵ قورەیشا بەستووەو لەسەر ئەوە پەیمانی خوامان داوێ ، ئێمە ناتوانین ئەوپەیمانە بشکێنین .

کەلەم بەزمە لێبوونەوە سهیل گەڕایەوە ، ئنجا پێغەمبەری‌خوا (درودی لەسەربێ ) فەرمووی بەیارە موسڵمانە دل زامدارەکانی : هەڵسن قوربانی‌یەکان سەربڕن وسەرتان بتاشن . بەڵام کەس هەڵنەسا ، وەپێغەمبەر تاسێ جار ئەمەی فەرموو وکەس هەرهەڵنەسا ، کەئەمەی لێ بینین ، چوو بۆ ژووری چادرەکە بۆلای « أم سلمە » وەئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕایەوە أم سلمەیش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پێت خۆشە بڕۆ دەرەوەو لەگەل کەسا مەدووە هەتا وشترەکەت سەرئەبڕی‌و ، ئەبجار بانگی سەرتاش بکە سەرت بتاشێ ، پێغەمبەر هاتە دەرەوە بەبێ دەنك بەدەستی‌خۆی وشترەکەی سەربڕی‌و بانگی سەرتاشی کرد سەری تاشی ، کەیارەکانی ئەمەیان بینی یەکسەر هەڵسان‌و وشترەکانیان سەربڕی‌و کەوتنە سەرتاشینی یەکتری ، لەوانە بوو لەخەفەتا یەکتر سەربڕن .

موسڵمانەکان هێندێکیان سەریان تاشی‌و هەندێ تریان بەمەقەست هەڵیان پاچی ، لەپاشا پێغەمبەر فەرمووی : « رەحمەتی خوا لەوانەبێ سەریان تاشی » .

لەپاش ئەمە ئیتر ئیشیان نەما بەرەو مەدینە کەوتنەوە ڕێ بۆهاتنەوە زۆریان سەرسام بوون کەبۆچی ئەم پەیمانەیان بەست وە بۆچی گەڕانەوە بێ‌حەج کردن ؟ وەبەتەمای ساڵێکی ترەوە دلخۆشی خۆیان ئەدایەوە ، کەچی لەڕێگادا بوون خوای گەورە سورەتێکی قورئانی لەم ڕووەوە بۆ

ناردن ( سورەتی الفتح ) پێغەمبەر موسڵمانەکانی کۆکردەوەو سورەتەکەی بۆخوێندنەوە (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُبِيناً) (١) وە هەموو سورەتەکە مژدە دانە بەپێغەمبەرو موسڵمانان بەسەرکەوتن‌و بەرزبوونەوەو پەرەسەندنی ئاینی خواو سەرکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەربێ - هەروەها دڵنیایان ئەکات کەهەموو کاتێ سەرکەوتن بەشیانە ، وەئەو پەیمانەی کە موسڵمانەکان لێی بێتاقەت بوون خوا بە «فتح» واتە بەسەرکەوتن ناوی برد .

## سودەکانی پەیمانی حدیبیە

خوای گەورە ئەم ڕووداوەی حدیبیەی بەسەرکەوتن ناونا . بەڵێ سەرکەوتن بوو لەوپەڕی پلەی سەرکەوتندا . . سەرکەوتن بوو چونکە ئەوساکە لەهەرکوێیەك موسڵمان و بت پەرست بەیەك گەیشتن ، وت‌و وێژیان بریتی بوو لەجەنگ‌و هەراو لێکدان ، وەتەنها زمانی جەنگ لەناوا بوو ، بەڵام دوای ئەم پەیمانە زمانی وت‌و وێژو شت ڕوون کردنەوە هاتە کایەوە ، لەگەڵ هەرکەسا ئەدوان ئیسلامیان بۆشی ئەکردەوەو موسڵمان ئەبوو ، وەلەماوەی دووسالا « واتە لەبەستنی ئەم پەیمانەوە هەتا گرتنی شاری مەکە » زیاتر لەژمارەی موسڵمانەکانی ئەوکاتە مەردوم موسڵمانبوون. وەلەم ماوەیەدا بوو خالدی کوڕی والید موسڵمان بوو .

سەرکەتن بوو چونکە موسڵمانەکان ترسیان نەما لەشەڕو خراپەی قورەیش ، وە پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - دەستی خالی بوو و ڕووی کردە پاك کردنەوەی نیوە دورگەی عەرەب ، لە دەسەڵاتێ جوولەکە ، ئەوەبوو - وەکو لە دواوە باسی ئەکەین - قەڵای ( خیبر ) یان داگیر

(١) سورة الفتح (٢،١)

کردو لەدەس جوولەکەیان سەند ، دەستکەوتیان چی هەبوو پێغەمبەر دای بەوانەی کە هاوبەشی حدیبیە بوون و بەس . . سەرکەوتن بوو لە ڕووی هەڵوێستی قورەیش و بت پەرستەو کافرەکانی تری ئـەو دەورە ، ئەوەبوو قورەیش دانیان نـــابە پێغەمبەر و ئیسلام و قەوارەیانا ، وە بە هێز و دەسەڵاتی باوەڕ پێ کراویان دانا ، بەناچاری ملیـان بۆ کەچ کـرد ، وەهەموو تیرەو هۆزەکانی تریش ناچاری ئەو دان پیانانە بوون ، بەوە پشتی موسلمانان ئەستوور بوو ، وەخەڵکی بەکۆمەڵ ئەهاتن و موسلمان ئەبوون ، وەئەیان توانی (سریة) بنێرن بـۆنەجدو مونافیقەکانی مەدینـە ئەوەندەی تر کپ بوونەوەو دەنگیان نەدا ، وەزۆر تیرەو کۆمەڵ چوونە پال موسلمانەکان .

## جێ بەجێ کردنی پەیمانەکەو ڕوداوی أبوبصیر

دوای گەڕانەوەی موسلمانەکان بۆمەدینە ، زۆری پێ نەچوونەرمووده کەی پێغەمبەر هاتە دی . . أبوبصیر ( عتبە ) ی کوڕی ( أسید الثقفی ) کەهاوپەیمانی ( بنی زهرة ) بوو موسلمان بوو ، لە مـەکەوە بەبێ پرس کردن بەخاوەنی هات بۆمەدینە بۆلای پێغەمبەرو موسلمانەکان ، وە(أزهر)ی کوڕی (عوف) و (أخنسی) کوڕی (شریق) نامەیەکیان بۆ پێغەمبەر نووسی وبەپیاوێکی ( بنیعامر ) و بەندەیەکی خۆیانا ناردیان کە ( أبوبصیر ) لە سەر پەیمانەکە بنێرێتەوە ، پێغەمبەریش فەرمووی بە ( أبوبصیر ) :«وەکو ئەزانی ئێمە پەیمانمان داوە بەقورەیش وئێمە ئاینەکەمان ڕێکامان نـادا کەغەدرو دەست درێژی بکەین ، ئەبێ بچیتەوە بۆناو خزمەکانت »أبوبصیر وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەم نێریتەوە بۆلای بت پەرستەکان لەئایین لام بدەن ؟ پێغەمبەر فەرمووی : چارنیە ، هیوای دەرووی خواییم هەیەبۆتان .
( أبوبصیر ) چاری نەما ، لەگەڵ قورەیشی یەکان گەڕایەوە بۆمەکە ،

هەتا گەیشتنە ( ذوالحليفه ) لەوێدا بیری کـردەوە لەپاشـە ڕۆژو چارە نووسی خۆی ، ئەگەر بچێتەوە مەکەو ناو قـورەیشەکان باوەڕی ڕێ نادا کەردن کەچی بکا بۆکوفر ، لەوێدا وتی بەکابرای عامری : کامەیە ئەم شمشێرەی تۆ ؟ بەهەر فێڵی بوو لەدەستی وەرکرت لەگەڵ کەوتە دەستی بەرزی کردەوە وعامریەکەی کوشتو ئەوی تریان لەترسا ڕای کردەوە بۆ مەکە ، وەبەسەرهاتەکەی گێڕایەوە ،( أبوبصير ) یش چەکی خۆی لێ کردە شانو هاتەوە بۆمەدینە ، چووە خزمەتی پێغەمبەرو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا تۆپەیمانی خۆتت بەجـێ هێناو منت دایەوە دەستی قورەیش ، منیش ناییەنم ڕێی نەدام کەتوشی خراپەم بکەنو یاریم پێ بـکەن . . پێغەمبەر فەرمووی :دایك نەی‌بێنێ ، ئەمە ئەگەر هاوڕێی بووایە جەنـگی هەڵ ئەگیرسان ، وادیاربوو کەئیشەکەی پێ‌خۆش بوو .

( أبوبصير ) سەرنجی دا نابێ لە مەدینەدابێ ، خۆ لەمەکەیشا ناژی ، لەبەرئەوە ڕوو بەڕۆخی دەریا کەوتە ڕێ ، هەتا گەیشتە جێـگایەك ناوی ( العيصى ) بوو ، لەسەر ڕێگای شام ، وەپەیمان بـوو لەنێـوانی محمدو قورەیشا کە ئەمە ڕێگەی ئـازوخەیە لـەکەس نەگیرێ ، أبو بصير چووە سەر ئەو ڕێگەیە ، کە موسلمـانە هەژارەکانی مەکە پێیان زانی چوون بۆلای ، أبوجندل و زۆری تر هەتا ژمـارەیان گەیشتە حەفتـا پیاو ، ( أبو بصير ) بوو بە فەرماندەو سەرۆکیان ، وە ئەو ڕێگایەیـان بڕی لە قوڕەیش ، هەرکەسێکیان بدیایە ئەیان‌کوشت و هەر کاروانێکیان بڕۆشتایە تالآنیان ئەکرد .

قورەیش بەتەنگ هاتن ، وەزانیان ئەم بەندەیەیان ئەبێ بە زیانێکی گەورە ، وەتێ‌گەیشتن بە بەندکردنو ئـازاردان نـاتوانن کەس لەئیسلام

دووربخەنەوە ، لەبەرئەمە بەناچاری ناردیان بۆلای پێغەمبەرو کەوتنە تکاو پاڕانەوە کە ئەو بەندە لەپەیمانەکەدا بسڕێتەوە ، وە بنێری بەشوێنی ( أبوبصیر ) و تاقمەکەیا کە بچن بۆ مەدینە وە ڕێگەکە بەرەڵابکەن ، وە هەرکەسێ ئارەزووی هەیە ، ئەتوانێ لەمەکەوە بێ بۆ مەدینە ، ئیتر قەدەغەنابێ . پێغەمبەری خوا ( درودی لەسەربێ ) نامایەکی نارد بۆ ( أبوبصیر ) و موسڵمانەکانی تری هاوەڵیان کە بێنەوە و ئازاری کەس مەدەن ، وەئەو بەندەمان لە پەیمناکە کوژانەوە . کاتێ نامەکە گەیشتە دەس ( أبوبصیر ) لەسەرەمەرگا بوو ، پێش دواهەناسەی نامەکەی خستە سەردلی‌و دوا هەناسەی هەڵکێشاو کۆچی دوایی کرد ـ خوا لێی‌ڕازی‌بێت وە گیانی شیرین و شێرانەی بە بەهەشت شادبوو . أبوجندل شۆری و کفنی کردو ئەسپەردەیان کرد ، وەلای گۆڕەکەیا مزگەوتێکیان دروست کردو پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە ، وە ئەوەی مەکەی پێخۆش‌بوو چووەوە مەکە قورەیشیش لە مەترسی ڕزگاریان بوو ، خوایش گەورەترین دەرووی لە موسڵمانەکان کردەوە ، وەبەم پێیە فەرموودەکەی پێغەمبەر هاتە دی . وە أبوبکر ئەی‌فەرموو لەسەرکەوتنی حدیبە گەورەترمان نەبووە ، بەڵام خەڵکی لەشت تێ‌ناگەن‌و پەلە ئەکەن‌و ئیشی خوایش بەگوێرەی یاسایەکی تایبەتی‌و نەگۆڕاوە .

وەلەپێش ئەم ڕووداوەی أبوبصیرا « ام‌کلثوم‌کچی عقبە » و چەند ژنێکی‌تر کە موسڵمان بوون ، مەکەیان بەجێ هێشت و کۆچیان کرد بۆ مەدینە ، عمارة و ولیدی برای هاتن بەدوایانا ، داوایان کرد لە پێغەمبەر کەبە بەگوێرەی پەیمانەکە بیان‌داتەوە ، لێرەدا موسڵمانەکان زۆر نارەحەت بوون ، ترسان کە پێغەمبەر بیان نێرێتەوە بۆمەکە ، بەڵام

پێغەمبەی خوا نەیدانەوە و فەرمووی : پەیمـانی ئێمە تەنیا بۆ پیاوانە و نادرێ بەسەر ژنانا ، وە ژنی موسلمان نابێ لای پیاوی ناموسلمان بێ ، ئەبێ لێك جیابکرێتەوە » وە بۆ ئەمە ئەم ئایەتە هـاتە خوارەوە :
[ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ، اللهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ، لَاهُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَاهُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ . الممتحنة : ١٠

## نامەناردن بۆ پاشاو سەرۆکەکان

کاتێ کە موسلمـانەنەکان لە ( حدیبیە ) گەڕانەوە بەهۆی بەستنی پەیمانەکەوە مەترسیان لە قورەیش نەما ، پێغەمبەری خوا هەلی بۆخۆش بوو کە بەشێوەیەکی فراوان‌تر بانگەکەی بەجیهانا بلاو بکاتەوە ، وەبیری لەوە کردەوە کە نامە بنێرێ بۆ سەرۆك و پاشاکان ، وە بۆ ئەمە ڕاوێژی کرد بە یارەکانی و فەرمووی : « خەڵکینە خوا منی ناردوە کە ڕەحمەت بم بۆ هەموو جیهان ـ نەك تەنها بۆ عەرەب ـ ئێوە مەبن بە یارەکانی عیسا و لە ڕام دەرمەچن » ، وتیان : یارەکانی عیسا چۆن بوون ؟ فەرمووی : بانگی کردن بۆ ئەوەی من بانگی ئێوەی بۆ ئەکەم ، وە ناردنی بەم‌لاولادا ئەوانەی بۆنزیکی ناردن ڕازی‌بوون ، وەئەوانەی بۆ دووری ناردن سستی‌یان کردو پێیان ناخۆش‌بوو « ئەمجار بۆی بـاس‌کردن کە ئەیەوێ نامەبنێرێ بۆ سەرۆك‌و پاشاکان وبانگیـان بکا بۆسەر ئیسـلام ، یارەکانی هەموو ڕاکەیان پەسەند کردو بڕیاریان‌دا کەلە فەرمانی دەرنەچن ، وەیارەکانی پێیانوت : ـ ئەڵێن سەلـان بوو وتی ـ کەنامەی سەرۆك و پـاشـاکان ئەبێ مۆری پێوەبێ . پێغەمبەریش ناردی مۆرێکیان بۆهەڵکەند کە لەسێ دێڕ پێك‌هاتبوو ، بەم‌پێیە ، لەخوارەوە بۆسەرەوە : ١ ـ محمد ، ٢ ـ رسول

٣ ـ الله ، وە بەهەرسێ دێڕەکە ( محمد رسول الله ) ی دروست کردبوو ، وە ئەم مۆرە ئەنگوستیلەیەك بوو لە پەنجەی پێغەمبەرا ، پاشان لەپەنجەی ابوبکر ، ئەمجار عمر ، ئەمجار عثمـان ، وە لە کاتی جێ‌نشینی عثمانـا ، کەوتە ناو بیرەوە هەرچێ بۆی گەڕان نەدۆزرایاوە .

ئنجا پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ نامەیەکی نارد بۆ قەیسەر پاشای ڕۆم بە ( دحیە ) ی ( کلبی ) دا ، ئەویش دای‌بە فەرمـان ڕەوای ( بصری ) کە گەیشتە دەستی قەیسەر ( کەنـاوی هیرەقـل بوو ) خوێندیەوەو ناردی بەشوێنی ( دحیە ) دا و هەندێ دیاری دایەو وەهـای پیشان‌دا کە باوەڕی هەیەو ناردیەوە ، بەڵام پێغەمبەر فەرمووی : درۆئەکا وەنامەیەکی‌تری نارد بە ( حـــارث )ی‌کوڕی ( عمیر ) ی ئەزدی‌دا بۆ کاربەدەستی ( بصری ) لەڕێگا ( شرجیل ) ی کوڕی ( عمری غسانی ) بەرەنگـاری بوو کە زانی نێرراوە و نامەی‌پێیە کوشتی ، وە بێجگە لەم نێرراوی ترنەکوژراو ئازاری نەدرا .

وەنامەیەکی بە ( شجاع ) ی کوڕی ( وهبی أسدی ) دا نـارد بۆ ( حـارث ) ی کوڕی ( أبی شمری غسانی ) فەرمان ڕەوای دیمشق ، بەڵام خۆی تووڕە کردو هەڕەشەی کردو موسڵمان نەبوو . وەنامەیەکی نارد بۆ موقەوقیس پاشای میسر بە ( حاطب ) ی کوڕی (أبی‌بلطعە) دا لەکاتی هاتنی نامەکەدا لە ئەسکەندریە ئەبێ ، بەڕێزەوە نامەکە وەرئەگرێ دوایی وتو وێژێکی درێژ لەگەڵ ( حاطب ) ئەکا ، ئنجا نامەیەکی نووسی بـۆ پێغەمبەر ، هەرچەند موسڵمـان نەبوو بەڵام دیاری‌یەکی گەورەی بۆ پێغەمبەر نارد ، لەناو ئەو دیاری‌یەدا ( ماری‌یە ) ی کەنیزەکی تیـابوو کە پێغەمبەر دای‌نا بۆخۆی و دوایی ( ابراهیم ) ی بوو وەنامەیەکی

به ( عمرو ) کوڕی (أمیەی ضمری) دا نارد بۆنەجاشی پاشای حەبەشە ، دەس بەجێ نامەکەی ماچکردو نایە سەر چاوی‌و لە تەختەکەی هاتەخوارەوە و لەسەر زەوی دانیشت و موسڵمـان بوو وتی : ئەگەر بم‌توانیایە ئێستە ئەهاتم بۆلای ، وە نامەیەکی جوانی بۆ نووسی و ناردیە خزمەتی لەگەڵ چەند پیاوێکا .

وە نامەیەکی بە ( عبدالله ) ی کوڕی ( حذافەی سهمی ) دا نارد بۆکیسرا پاشای فارس دەس بەجێ نامەکەی دڕی‌و فڕێیدا ( کەپێغەمبەر ئەمەی بیست فەرمووی : (خوا موڵکەکەی لەت‌و پەت بکات ) وە ناردی بۆلای (بازان) کاربەدەستی یەمەن کەدووکەس بنێـرێت ئەو حیجازی‌یەی بۆبێنن ، ئەویش دووپیاوو نامەیەکی نارد بۆپێغەمبەر کەلەگەڵیانا بچێت بۆلای کیسرا ، کەچوونە لای‌و نامەو هەڕەشەکەیان کەیاند ، پێغەمبەر بە هێمنی فەرمووی : بڕۆن بەیانی وەرنەوە لام ، کەبەیانی هاتنەوە فەرمووی بڕۆن بەئاغاکەتان بڵێن : ئەمشەو خوای من پاشاکەی ئەوی کوشت لە سەعات حەوتا . خوا شێرۆیەی کوڕی زاڵ کرد بەسەریاو کوشتی . کە چوونەوەو ئەم هەواڵەیان دا بـەبازان‌و دوایی دەرکەوت ڕاستـە بازان و هاوەڵەکانی موسڵمان بوون ، وەپێغەمبەر کردی بەکاربەدەستی هەمووی یەمەن ، وەنامەیەکی بە (علاء حضرمی ) دا نارد بۆ (منذر ) ی کوڕی ( ساوی ) پاشای ( بحرین ) وئەویش لەگەڵ زوربەی گەلەکەیا موسڵمان بوون .

وەبە (عمرەی) کوڕی (عاص)دا نامەیەکی نارد بۆدووپاشاکەی (عمان) دووکوڕەکەی (جلندی) کەناویان : (جیفرو عبد) بوو ، ئەوانیش موسڵمان بوون ولەشوێنی خۆیانا مانەوە .

وەبە (سلیط) ی کوڕي ( عمروی عامری ) دا نامەیەکی نارد بۆ کار

بەدەستی (یمامە) (علی) کوڕی (هوذەی حنفی) ئەویش نامەیەکی ناردەوە بۆپێغەمبەرو داوای پایەو پلەی لێکرد ، پێغەمبەریش فەرمووی : کەوای لێهات بستێ زەوی نادەمێ .

وەنامەی بۆزۆری تر لەفەرمان ڕەوایانو سەرەك خێـــڵەکان نارد ، هەندێ موسڵمان ئەبوونو هەندێ لەسەر بیرو ڕای خۆیان ئەمانەوە ، وە هەرکەلو خێڵێ موسڵمان بوونایەو ئیسلامیان بەبەرنامە وەربگرتایە هەرلە خۆیان پیاوێکی زاناو ژیری ئەکرد بەکاربەدەستیان بۆبەڕێوە بردنی ئیسلام، نەك خزمێکی بنێرێتە سەریانو بیان ڕووتێنێتەوە وەکو لەم چەرخی ئاسمان دۆزی‌یەدا . وەبەهۆی ئەم نامەو نێرراوانەوە بانگی ئیسلام بەجیهانا بلاّو بووەوەو لەوە بەرزتر بووەوە کەقورەیش یا خێڵو تیرە عەرەبەکان بتـوانن تەمایان تێبکەن ، وەگەلێ کەس موسڵمان بوونو دەست کەوتی باشی بۆ ئیسلام دەست کەوتو مەترسی نەماوە یاکەم بوو .

## « ساڵی حەوتەم »

## جەنگی خیبر :

لەپاش بەستنی پەیمانی ئاشتی ( حدیبیە ) لەگەڵ قورەیشا ، لەبەردەمی پێغەمبەرا لە نێوە دوورگەی عەرەبا دوو کۆمەڵ دوژمن مایەوە : یەکەمیان ئەو عەرەبە بیابان نشینانەی ئەسوڕانەوە بەبیابانەکەدا ، هەرکە هەستیان بکردایە بە تالاّنێ پەلاماریان ئەداو بەشوێنیا ئەڕۆیشتن ئیتر بیرو باوەڕ نرخێکی ئەوتۆی نەبوو . دوەمیان جوولەکە کە ئەیانویست پێغەمبەریەتی تاپۆبێ لەســەریان و تێ‌نەپەڕێ بۆ لایەکی‌تر ، وەپێغەمبەریەتیو ئایین و هەموو شتێکیان تەنیا بۆ ئەوە ئەویســت کە خەڵکی پێ‌ژێر بـاربخەن و سوودی تایبەتی‌یان بۆ بەرهەم بێت .

وەلەم کاتە ناسکەدا کە پێغەمبەر نامەی ئەنارد بە هەموو لایەکا ، جوولەکەکان لەشاری خیبر کۆبوونەوە خۆیان و هەموو ئەملاولاشیان لـە لە قەلاکانی خیبر قایم کرد ، کێ ئەڵێ ئەم جوولەکە سـروشت پیسـانە نابنە چاوساغی هیرقلی ڕۆم یا کسرای‌ی فارس و سوپای‌تری بێ‌شوماریان ـ وەکو چارەکەی خندق ـ لێ‌کۆناکەنەوە ؟ کەوابێ باشترین چارە بۆ ئەم قۆناغی ئێستا لابردنی ئەم سپڵەی لاورك و ئەم سەرەتانە تەشەنەك داری جوولەکەی ( خیبر ) ە یە ، ( خیبر شوێنکی فراون و پڕ لەباخ و کێڵگەیە ، وە قەلای زۆر قایمیان هەبوو ، وەشوێنەکەی نەوەدو شەش میل لەمەدینەوە دوورە ، لەسەرووی خۆرئاوایەوە بۆلای شام ) جا لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا لەدوای گەڕانەوەی لە ( حدیبیە ) بەماوەیەك ، لـە مانگی محرمی سالی حەوتەمدا فەرمانی‌دا بەڕێخکستنی سوپا بۆ سـەر خیبر ، بۆلابردنی ئەم بەلاخراپە لەبن دەستیانا ، وە لە سوپایەکی هەزار و شەش سەد کەسی‌دا کەوتنەڕێ ، وەهەندێ ئافرەتیش لەگەڵیانا هات بۆ یارمەتی‌دان و دەرمـان کردنی زمدار و نەخۆش ، فەرمووی : هەرکەس لە ( حدیبیە ) دا لەگەڵمـــان بەشدار نەبوو نەیەت لەگەڵمانا بە تەمای تالان ، مەگەر تەنیا بـۆ غەزا کردن‌بێ ، چونکە دەسکەوتی ( خیبر ) تەنها بۆ هاوپەیمـانەکانی ( حدیبیە ) ئەبێ ، وە ( سباع ) ی کوڕی ( عرفطەی ) لەسەر مەدینە دانا ، وە ( أم‌سلمە ) لە خزمەتی‌دا ڕۆیشت ئەم سوپای باوەڕە کاتێ کەوتەڕێ ، کارێکی وای‌کرد لەو تیرە عەرەبانەی لەگەڵ جولەکەدا بوون وابزانن بۆسەر ئەوان ئەچن و لەترسا هەرکەسـە بچێتە شوێنی خۆی وە دەوری خۆی قـــایم بکا ، تاکەس نەتوانێ بێ‌بۆ یـــارمەتی جولەکەی ( خیبر ) ، بەڕادەیەك جولەکەکانی خیبر ئەوەندە

بێ ئاگا بوون کەسوپاکەی پێغەمبەر دابەزی بوو بەسەریانا وشەو لەدەوری قەڵاکانیان بەزی بوون ، بەیانی کرێکارو جوتیارو ئیش کەربان بەپاچو بێڵەوە هاتن بۆناو کێڵگەکانیان بۆئیش کردن برۆن ، کەئەم سوپایەیان بینی هاواریان کرد ئای محمدو سوپا . پێغەمبەریش کە ئەمەی بیست فەرمووی : « خیبرتان لەدەست ئێمەدایە کە دامان بەسەر شوێنێکا ئیتر کاریان خراپ ئەبێ » وە ڕایان کردەوە ناوقەڵاکان وکەوتنە خۆقایم کردن .

جولەکەکانی خیبر کەپێغەمبەرو سوپاکەیان بینی گورج ڕایان کردە ناوقەڵاکانیانو دەرکایان داخست ، ئەمجار لەناوخۆیانا کەوتنە ووتو وێژو ڕاوێژ ، وە (سلامی) کوڕی (مشکمی) سەرۆکیان ڕێگای بۆدانان : ماڵو منداڵو خێزانیان بخەنە قەڵای (وطیح وسلالم ) ەوە . ئازوخەیان بخەنە قەڵای ( ناعم ) ەوە ، جەنگاوەرەکانیان بچنە قەڵای ( النطاة ) ەوە ، وەسلام خۆیشی لەگەڵیان چووە قەڵاکەوە وهانی ئەدان بۆجەنگان .

پێغەمبەری خوا ( درودی لەسەربێ ) لەنزیکی قەڵای ( النطاة ) ەوە خستی ، ( حباب ) ی کوڕی (منذر) داوای لێ کرد کەلەوێدا بکۆڵێتەوە وتی : من شارەزاییم لەدانیشتوانی ئەم قەڵایە هەیە . کەس نیە وەکوئەمان تیرئەندازو نیشان شکێن بێ ، وەئێستا ئەوان وان بەژووری سەرمانەوە ، وە تیرەکانیان بەئاسانی ئەمان کەنێ ، دووریش نیە شەو لەڕەشایی دارخورما کانەوە بدەن بەسەرمانا . پێغەمبەریش ڕاکەی پێ جوان بوو ، فەرمانی دا دووربکەونەوە ، کەوتنە ناوەندی (خیبر) و ( غطفان) ەوە لەوێدا جێگا نوێژێکیان دروست کردو ئەوماوەیە نوێژیان کرد ، پاشان فەرمانی دا بە بڕینی هەندێ دارخورما کەبووبووە شەخەڵو ڕێگەی دەستو چاوی لێ بڕی بوونەوە ، وەهەم بۆترساندنی جوولەکەکان هەتاچوارسەد دارخورمایان

بری ، پاشان فەرمانیدا واز لەداربڕین بێنن . ئەوڕۆژە پێغەمبەر ئالاکەی دا بەدەست یەکێ لەمەدینەیەکانەوەو جەنگێکی زۆریان کرد ، وەژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا بریندار بوو ، لەموسلمانەکان محمود کوڕی مسیلمە شەهید بوو ، وە لەجولەکەکان سلام کوڕی مشکم مرد ، وەحارث کوڕی زینب بووبە سەرۆکی جولەکەکان ، بەڵام قەڵاکە نەگیرا .

بەم پێیە حەوت ڕۆژ جەنگان ، هەموو ڕۆژێ پێغەمبەری خـوا ( درودی لەسەربێ ) عثمان کـوڕی عفانی لەسەر سوپاکاکە دائەنا ، وە ڕۆژی پێنجەم ئالاکەی دایە دەست أبوبکـر ، وەلەڕۆژی شەشەمدا دایە دەست عمری کوڕی خطاب ، بەڵام هەرچییان کرد قەڵاکە نەگـیرا ، لە شەوی حەوتەما عمر پاسەوانی سوپاکە بوو ، جولەکەیەکی گـرتو هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ، کابرا ترسـی لێنیشتو وتی : ئەگەر دڵنیـام بکەن ئازارم نادەن شتێکتان پێئەڵێم بەهۆیـەوە سـەرکەون ، ئەوانیش دڵنیایان کرد ، ئەویش وتێ : دانیشتوانی ئەم قەڵایە بێزاربوون و لەوزەیانا نەماوە بەهێننەوە لەوە زیاتر ، کەمن هاتم خەریك بوون منالو شتەکانیان ئەگوێزایەوە بۆقەڵای ( الشق ) وەبەیانی دێنـــە دەرەوە بـۆتان ، ئەگەر توانیتان ئەم قەڵایەیان لەدەست بسێنن من ئەتان بەمە سەر قەڵای(صعب) لەژوورێکیا مەنجەنیقو زرێو شمشێرو چەکی جۆر بەجۆری زۆری تیایە بەهۆیانەوە ئەتوانن هەموو قەڵاکانی تر بگرن .

پاش ئەم هەواڵە پێغەمبەر بەمحمد کوڕی مسیلمەی فەرموو : بـەیانی ئالاکە ئەدەمە دەست پیاوێ ، خـواو پێغەمبەری خۆش ئەوێ ، خـواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش ئەوێ ( عمر کوڕی خطاب کەهیچ کاتێ حەزی لەسەرۆکی نەئەکرد ئەڵێ : ئاواتم ئەخواست کەئەوپیاوە من بووایەم کە

خواو پێغەمبەر خۆشیان ئەوێ ) وەخوێــنی براکەت ئەسێنێ ، بەیانی پێغەمبەر فەرمووی : لەکوێیە « علی کوڕی أبی‌طالب » علی‌هات بۆخزمەتی چاوی بەستبوو ، چونکە چاوی هەردووکیان داهاتبوون . پێغەمبەری خوا « دزودی لەسەربێ » ئاڵایەکی سپی بۆ هەڵ کـردو دایە دەستی‌و هەندێ تفی کردە چاوی‌و دەستی پیا هێنان ، چاوی علی چاك بووەوە بەڕەنگێ ئیتر چاوی دانەهاتەوە ، وەدوعای خێری بۆکردو فەرمووی :« خوایە لە گەرماو سەرما بی‌پارێزە» ئیتر علی نەگەرما وەنەسەرمای نەبوو ، هەتاکۆچی دوایی کرد . علی فەرمووی : لەگەڵیانا ئەجەنگم هەتا وەکو خۆمانیان لێ دێت . پێغەمبەر فەرمووی : لەسەرخۆ بڕۆ هەتا ئەچیتە ناومەیدانەکەیان ، ئەنجار بانگیان بکە بۆسەر ئیسلامەتی‌و تێیان بگەیەنە هەقی خوا چی یە لەسەریان ، بەخوا ئەگەر لەسەر دەستی تۆدا خوا یەکێ بخاتە سەررێگای ڕاستی ئیسلام بۆتۆ لەڕان‌و ڕەوگێکی زۆر زۆر باشترە » علی بەئاڵاکەیە وە ڕۆیی هەتا گەیشتە لای قەڵاکەو ئاڵاکەی لەبنکا چەقان . دانیشتوانی قەڵاکە یەکسەر هاتنە دەرەوەو پەلاماری علی‌یان دا ، یەکەم کەسێ کە هات بۆعلی فەرماندەی قەڵاکە حارث کوڕی زینب بوو بەئازایی‌وپاڵەوانی بەناوبانگ بوو ، خوا بۆی کرد علی کوشتی ، پیـاوێك دای لەعلی‌و کـڵاو خودەکەی پەڕی ، علی دەرگای قەڵاکەی کـرد بەسپێرو هـەربەدەستیەوە بوو هەتا قەڵاکەی گـــرت ، جوولەکە کە ئەو ئازایەتی‌یەیان دی لەعلی‌و هاوڕێکانی ڕایان کردەوە ناو قەڵاکەوە ، وە دروشم‌و بانگی موسڵمانەکان بکوژە ، بکوژە بوو ، بەوڕەنگە پەلاماریان دا هەتا قەڵاکەیان گـرت . وەعلی دەرگاکەی کرد بەپردو موسڵمانەکان لێیەوە پەڕینەوە بۆژوورەکانی ناوقەڵاکە وەدوای قەڵای « ناعم » موسڵمانەکان قەڵای « قموص » یان

کرت ، وەبەهۆی ئەوقەلاّنەوە ئازوخەی زۆریان دەست کەوت وەلەبرسیەتی ڕزگاریان بوو ، وەلەم کاتی سەرکەوتنەدا بوون مرحب کە پالّەوانێکی بلیمەت و جەنگاوەربوو ، هاتە دەرەوەو خۆی پڕچەك کـــردبوو ، کەوتە ڕاوێشکە لەمەیدانا ، داوای هاوسەرێکی ئەکرد لەگەلّیا بجەنگێ ، کەوتە سروود وتن و خۆهەلّ نان ، علی کوڕی أبی طالب وەکو پلنگ بۆی کشاو ئەویش دووبارە وەلاّمی سروودو خۆهەلّنانەکەی داوە وهاتن بەیەکا ، بەلاّم خوایارمەتی علی داو شمشێرێکی بۆ داهێناوە سـپێرو کلاّو خودو بەردی ژێر کلاّ و خودو هەردوو مێزەرەکەی بڕی ، لە ژێر ئەوانەیشەوە سـەری لەت کرد ، هەتا ئەلّێ شمشێرەکە گەیشتە ددانەکانی و کوشتی و ڕزگاریان بوو لە چنگی .

وەلەدوای مرحب یاسری برای هاتە مەیدانەوە . زبیری کوڕی عوام بۆی چوو ، صفیة کچی عبدالمطلب دایکی زبیر کە یەکێ بوو لەو ژنانەی هاتبوون لەگەلّیانا ترسی لێ نیشت کەکوڕەکەی بکوژرێ ، بەلاّم پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسـەربێ ـ دلّخۆشـیدایەوە و فەرمووی : کوڕەکەت ئەو ئەکوژی ئەگەر خوابیەوێ . خـوا بۆی کرد زبیر یاسری کوشت ، ئیتر جوولەکە پەتیان پچڕا و ناوکیان کەوت و خۆیان کوتایە قوژبنی قەلاّکانیان کە مابوون ، وە موسلّمانەکان هێرشیان بردە سـەریان و قەلاّ لەدوای قەلاّ لەدەستیان . ئەسەندن ، وەئەوان ئەچوونە قەلاّیەکی ترەوە ، پاشان لە قەلاّیەکا زۆر خۆیان گرت ، ئەمانیش ئابلّوقەیان دان بێ سوددبوو ، وە لەبەر ئەوەی ئاو و هەوای ( خیبر ) ناسازە و مەلاریـای زۆرە ، بەشی زۆری موسلّمانەکان نەخۆش کەوتن ، لە ئەنجاما یەکێ هەوالّی دا بەپێغەمبەر : کە جوولەکە گوێیان لەم ئابلّوقەیە نیە چونکە ئازوخەیان

پێ یەو لەژێرەوە جۆگەی ئاویشیان ڕاکێشاوە بۆ ناوقەڵاکە ، وە جۆگەکەی پیشاندان پێغەمبەریش فەرمانیدا جۆگە ئاوەکەیان لێ ببڕین بۆئەوەی یابکەونە جەنگەوە یاخۆبدەن بەدەستەوە ، ئەمجار بەناچاری جوولەکەکان دەرپەڕین و کەوتنە جەنگەوە لەگەڵ موسڵمانەکانا ، ئەو ڕۆژە ژمارەیەکیان لەموسڵمانەکان شەهیدکردو زۆریش لەوان کوژراو قەڵاکەیان لێ داگیر کرا،ئەنجا موسڵمانەکان پەلاماری زنجیرە قەڵایەکی تریاندا ، پێغەمبەر خۆی لەسەر قەڵایەك وەستاو جەنگێکی گەورەی تیاکرا ، پیاوێکی لێهاتەدەرەوە ناوی «عزول» بوو ، داوای هاوسەری کرد ، ( حباب ) کوڕی ( منزر ) بۆی ڕۆی و شمشێرێکی دا لەدەستی ، شکانیو شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە ڕای کرد حباب کەوتەسەری و کوشتی ، یەکی ترهات و موسڵمانێك بۆی چوو ، موسڵمانەکەی شەهید کرد ، پاشان أبودجانة وەکو شێر هەڵمەتی دایەو کوشتی ، وە بەسەرۆکایەتی ابودجانە هەڵمەتیان دایە سەر قەڵاکەو گرتیان ، وەهەندێ لەمانە ڕایان کرد لەگەڵ کۆمەڵێ قەڵایەکی ترا یەکیان گرت و کەوتنە تیرو بەرد هاویشتن بە مەنجەنیق هەتا پەنجەی پێغەمبەر برینداربوو ، لێرەیشا موسڵمانەکان پەلاماریان داو ئەمیشیان گرت ، پاشان موسڵمانەکان بڕیاریاندا چی قەڵاو شوێن ماوە بیدەنە بەر بەرد و ئاگر ، مەنجەنیقیان لێدابەستن ، ئیتر جوولەکە بێهیوا مان ، وەزانییان تازە هەموو شتێکیان لەدەست چووە ، داوای ڕێکەوتنیان کرد : کە بڕۆن لە ( خیبر ) خۆیانو و منالیانو قاتێ جل و ولاغێك دەرکەن و بڕۆن ، پێغەمبەریش فەرمووی : باشە ، بەڵام بەو مەرجە هیچیان لێپەنا نەدەنو نەشارنەوە ،

ئیتر سەریان بۆ پێغەمبەر شۆڕ کرد ، وەداوایان لێ کرد کە زەوی

( خیبر ) یان بداتێ بەنیوەیی بیکەن بەکشتوکاڵ .

پێغەمبەریش فەرمووی : باشە ، بەڵام هەر کاتێ ئارەزوومان نەبوو لێتان ئەسێنینەوە ، وەئەگەر ویستمان دەرتان ئەکەین لە ( خیبر ) دا « وەبەم پێیە زەوی‌و زاریان ئەکرد بەکشتوکاڵ بەنیوەیی هەتا کاتێ عمری کوڕی خطاب ، لەوکاتەدا بەپێی سروشت پیسی کەوتە تاوان و پیلان گێڕان ، ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) لەپاش ئەوە چاری نەما دەری‌کردن بۆ وڵاتی شام .

## دابەش کردنی تالان‌و گەڕانەوی کۆچەرەکانی حەبشە

موسلمانەکان تالانی‌یەکی زۆرو بەلێشاویان دەسکەوت کۆیان کردەوە و گەڕانەوە بۆ مەدینە ، لەم کاتەدا لە حبشەوە کۆچەریە موسلمانەکان هاتنەوە ، کە ( أم حبیبە ) و ( جعفر ) ی کوڕی ( أبوطالب ) یان لە گەڵابوو ماوەی دەسال لە حبشەدا مابوونەوە ، بەمە پێغەمبەر زۆر دلی گەشایەوەو دەستی کردە ملی جفرو فەرمووی : بەخوا نازانم بەکامیان دلم خۆشترە بەهاتنەوەی ( جعفر ) یان بەداگیر کردنی خیبر ، لەکاتی دابەش کردنی تالانی ( خیبر ) دا ئەمانیش بوون بە هاوبەش . وە پێغەمبەی خوا ( صفیە)ی کچی ( حیی ) سەرۆکی جوولەکەکانی مارەکرد .

## گۆشتی ژەهراوی‌یان دابە پێغەمبەر :

کاتێ ڕێکەوتن کەوتە نێوان پێغەمبەرو جولەکەکانەوە و دلنیابوون لەیەك ، وە ئاشتی ڕەگی دامەزرایەوە ، زینبی کچی حارث کەژنی سلامی کوری مشکم بوو مەڕێکی بە بوریانی نارد بۆ پێغەمبەری خوا وە ژەهری پێوەکردبوو بەتایبەتی بەشان و قۆلی‌یەوە . کە ئەیزانی ، پێغەمبەر ئالودەیەتی ، کاتێ پێغەمبەرو یارەکانی لێی کۆبوونەوە لەپێشەوە

پێغەمبەر دەستی برد بۆ باڵو شانەکەی و تیکەیەکی لێهەلگرت ، خستیە دەمی و خێرا پێیزانی و تفی کردەوەو فەرمووی : ئەم ئێسقانە پێم ئەڵێ : ژەهری پێوەکراوە ، وەلەگەڵ ئەوا ( بـشر ) ی کوڕی ( براء ) یش تیکەیەکی هەڵگرتبوو بەڵام قوتی دابوو ، وە لە ئەنجاما ( بشر ) بەو ژەهرە مرد . وە ناردیان بە شوێن ( زەینب ) دا ، ئەویش دانی پیانا و وتی : ئەوی ڕاستبێ ژەهرم پێوەکرد چونکە ئەوەي کە ئەیزانی کردت لەگەڵ کەسەکانما و منیش وتم : ئەگەر پاشایەکبێ تۆڵەی لێ ئەسێنم و ڕزگارمان ئەبێ لەدەستی ، وەئەگەر پێغەمبەریش بێ پێی ئەزانێو هەواڵی ئەدرێتێ . وە لێرەدا چەند ڕیوایەتێك هەیە . هەندێ ئەڵێن : موسلمان بوو پێغەمبەر لێیبورد . هەندێ ئەڵێن : کوشتی . وە ئەڵێن : لە پێشەوە لێی بورد بەڵام لەپاشان لەجیاتی بشر کوشتیان . وەهەرکامبێ ، بەمکارە دیسانەوە دەرکەوتەوە کە جوولەکە بەپێی سروشت جێي موتمانەنین .

## کوژراوەکانی خیبەر

وەلەم جەنگەی خیبەردا پانزە لە موسـلمانەن شەهیدکران ، وە نەوەدوسێ کەسیش لـە جوولەکەکان . وەئەم جەنگە لە مانگی (سفرر)ی سالی حەوتەما کرا .

## ڕێکەوتن لەگەڵ دانیشتوانی ( فدك ) دا :

( فدك شارێکی جوولەکەبوو لە نزیك خیبرا ، شەش ڕۆژە ڕێگا لە مەدینەوە دوورە . کاتێ گرتنی خیبر تەواو بوو ، پێغەمبەر نـاردی بۆ ( فدك ) و داوای لەخەڵکەکەی کرد : یا موسلمان بین یـان چییـان هەیە بیدەن بەموسلمانەکان ، ئەوانیش کە بەبەزمی خیبریان زانی ترسیان

لێ نیشت و وتیان : خۆمان مەکوژە ئیتر ماڵو سـامانو زەوی و زار بۆتۆ . لەسەر ئەمە ڕێکەوتن وە فدك ماڵی تایبەتی پێغەمبەر بوو چونکە بەبێ جەنگو هەرا گیرابوو پێغەمبەر هەموو ساڵێ بەرو بوومەکەی سەرف ئەکرد بۆ خۆیو ڕێبوارو داماوان و بۆ منـاڵو هەژارەکانی ( بنیهاشم ) ژنی بـۆ گەنجو بێژنەکانی پێ ئەهێنا . کاتێ پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەربێ ـ کۆچی دوایی کرد ، خاتو فاطمە داوای کرد لە أبوبکر کە ( فدك ) هەمووی یا نیوەی بداتبەو ، بەڵام أبوبکر نەیدایەو فەرمووی : ناتوانم چونکە پێغەمبەری خوا فەرموویە : ئێمە کە کۆمەڵی پێغەمبەرانین کەلەپورمان لێناگیرێ ئەوەی لـە دوامان بەجێما خێرە » وەلەسەر ئەوە خاتو فاطمە لە أبوبکر عاجزبوو قسەی لەگەڵا نەکرد .

کاتێ کە جوولەکەی ( تیماء ) زانیان بەحالی جوولەکەی خیبر و بەڕێکەوتنی جوولەکەی فدك ، ئەوانیش بەدەوری خۆیان ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەرا کە جیزیەو باجی خۆیان بدەن و بەهێمنی و بێوەیی لە شوێنی خۆیان دانیشتن .

## جەنگی وادی القری

وادی القری چەند دێیەکە لەنـاوەندی ( تیماء ) و ( خیبر ) دا لـەڕێگای شـام ، دانیشتوەکانی جوولـەکە بوون ، کاتێ پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسـەربێ ـ گەڕایەوە لە خیبر لای ئێوارە لەوێ بەزین و داوای کـەردن کەچی لـێ کردن ، ئەوانیـش نەهاتنە سـەر ڕێ ـ پێغەمبەریش فەرمـانیدا ئابلوقەیان دان بۆ ماوەی چوار ڕۆژ ، ئەمجار کەوتنە جەنگ لەگەڵیانا یانزە کەسیان لێ کوژراو داگیریانکرد ، تالان و کەلو پەلێکی زۆریان گرت ، پێغەمبەر بەپێی یاسای ئیسلام دابەشی کرد

بەسەر یارەکانیا ، زەوی‌و زارو باخەکانی هێشتەوە ، دوایی بـە نیوەکاری دایەوە بەجووەکەکان .

پێغەمبەر (عمر) ی کوڕی (سعید) ی کرد بەسەرکاری وادی القری‌و عبداللهی کوڕی رواحەی کرد بەسەرکاری خیبر ، وەهەموو ساڵێ خەملیان ئەکرد ، وەلەم ماوەیەدا (خالد) ی کوڕی (ولیـد) و (عمرو) ی کـوڕی (عاص) و (عثمان) ی کوڕی (طلحه) هاتن بۆمەدینەو موسلمان بوون .

## عەمرەی قەزا «عمرة القضاء»

ساڵێ تێپەڕبوو بەسەر پەیمانی ئاشتی (حدیبیه) داو لەمانگی نـاو جەژناندا (ذی‌القعدة) پێغەمبەری خوا بەخۆی‌و ئەوانەی لەساڵی پێشوودا ڕێگای عەمرەیان لێ‌گیرا کەوتنە خۆڕێك خستن بۆمەکە بۆبەجێ هێنـانی عەمرە ، ئەوەبوو لەپەیمانەکەیانا بڕیاریان دابوو کە ساڵێ‌تر بێنەوە عەمرە بکەن وقورەیش مەکە بەجێ بهێڵن ، ئەوان بۆ سـێ ڕۆژ بچنە مەکەوە . ئەڵبەتە ئەم سەفەرەو ئەم عەمرەیە زۆر خۆش‌و بەتین بوو بەسەردڵ‌ودەرون ومێشکی موسلمانەکانەوە .. چونکە ئەوە بوو چۆن بەدزی‌و پەلەپروزەوە لە مەکەوە کۆچیان کرد وشوێن‌و جێـگاو نیشتمانی خـۆیان‌و کەس‌و کاریان بەجێ هێلا ، وەئەوە حەوت ساڵە چاویان پێیان نەکەوتوە ، مەدینەیەکانیش هەموو ساڵێ بۆحەج ئەچوون وکاروانیان ئەکـرد بۆ مەکە . بەڵێ زۆر بە خۆشی‌و شادی‌یەوە کەوتنە ڕێ‌و ژمارەیان لەساڵی پێشو پتر بوو (بێجگە لەژن‌و منال) (أبوذری غفار) ی یان لەسەر مەدینە دانا ، وەچەك‌وچەك بەدەستی زۆریان لەگەل خۆیان هێنا .. چونکە پێغەمبەر فەرمانی‌دا سەد سواریان بەسەرۆکایەتی (محمد) ی کوڕی (مسیلمه) یا (بشیر) ی کوڕی (سعد) بەچەکی جەنگی‌یەوە ڕێکخـسـت و کردنیان بەپێشەنـگ ، بەڵام

بەمەرجێ نەچنە مەکەوە، وەئەم چەکانەی برد لەترسی ئەوە نەوەك قورەیش پیانوویان پێبکرن وەپیلانیان پێبکێرن ، چونکە کەلێیان پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا تـۆ چەکت بردوە خۆ لەمەرجی پەیمانەکەدایـە کە چەك نەبەیت ؟ فەرمووی : چەك نابەینە مەکەوە بەڵام با پێمان بێ ئەگەرتووشی نارێکی‌یەك بووین پەلاماری ئەدەین . حەفتا وشتریان پێش خۆیان داو ، پێغەمبەر بەسواری وشترە کوێ قلیشاوەکەیـەوە پێش‌کەوت وکەوتنـە رێ کەگەیشتنە ( مرالظهران ) کۆمەڵێ قورەیشیان پێگەیی‌و ئەوچەکانەیان بینی ترسان‌و چونەوە بۆمەکە وهەواڵیان دا ، ئەوانیش چەند کەسێـکیان ناردو وتیان : ئەی محمد ئێمە پەیمان شکاندنمان لەتۆوە نەدیوە نەبەگەورەیی‌و نە بەبچوکی وە ئێمەیش بەپێچەوانەوە نەجولاوینەوە ! پێغەمبەریش ـ درودی لەسەربێ ـ فەرمووی : مەترسن چەك نابەینە ناو حەرەمی مەکەوە . کە نزیکی مەکە بوونەوە فەرمانی دا چەکەکانیان لەشیوێکا داناو کۆمەڵێکیان کرد بەپاسەوانی‌و ئەنجار تەنیا بەچەکی کاروانی‌یەوە ـ کەشمشێرێـك بوو لەکێلانا ـ ڕوویان کردە ناوشـــاری مەکە . وەدانیشتوانی مەکە لەبەر ئەوەی چاویان بەرایی نەئەدا ئەم کۆمەڵە موسلمانە رێـك‌و پێـکە ببینن هەموویان یەکسەر هاتنە دەرەوەو شاری مەکەیان بەجێ هێشت ، وەلەسەر تەپ‌و یاڵەکانەوە بەزۆری لەلای ( دار النـدوە ) وە بەڕیز وەستا بوون و سەیریان ئەکردن .

کاتێ‌کە چوونە مەکەوە عبداللّٰهی کوڕی ( ڕواحە ) جڵەوی ووڵاخەکەی گرتبوو سرودی سەرکەوتنی ئەخوێندەوە و سوپاسی خوای ئەکرد ، ئەوانیش بۆیان ئەسەندەوە ، کەلەگەڵ مزگەوتیان بینی پێغەمبەرو موسڵمانەکان بەیەك دەنگ و بەئاوازی بەرز ئەیانووت : ( لَبَّيْكَ اَللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ ) ، وە پێغەمبەر

بەسواری دەستی کرد بەکەڕان بەدەوری کەعبەدا وە کەیشتە حاستی بەردە ڕەشەکە ( الحجر الاسود ) بە کۆچانەکەی دەستی بۆ ڕاکێشا ( إستلامی کرد ) وە خۆی کەوتە گورکە لۆقە و یارەکانیشی بەشۆێنیا ، وە بەم پێیە کەڕانیان لە چوار چێوەی هێزو تواناو دەسەلاتێکی فراوانا تەواو کرد ، دەنکی خوا پەرستی ئاسمانی کەڕ کردبوو و هەوایەکی سەیری دروست کردبوو ، بەڕادەیەك کەسەد ئەوەندەی جاران سامو بیمو ترسیان خستە دلی دوژمنەکانی خواوە ، وە کەڕانیان بەدەوری کەعبەدا تەواو کردو چوون بۆ ( صفاو ) و ( مروة ) ، لەویش کەڕانی حەوت جارەیان بەکورکە لۆقە تەواوکرد ، ئەمجار سەریان تاشیو بەهێمنیو دلنیایی حەوانەوە ، ووشترەکانیان سەربڕی ، بەم پێیە پێویستی عەمرەیان بەجێ هێنا ئەمجار پێغەمبەر فەرمانیدا : دووسەد کەسێ لەمان بچێ بۆسەر چەکەکان و ئەوانەی وان لەوێ بێن عەمرەکەیان بکەن . وە لە ڕۆژی دوایی دا پێغەمبەر - درودی لەسەربێ - هاتە کەعبەوە - کە پڕبوو لەبت - دەستی کردە خواپەرستی ، نیوەڕۆ فەرمانیدا بە ( بلال ) چووە سەربانی کەعبەو بانگێکی موسلمانانەی داو ئاوازەی ( لاإله إلاالله و محمد رسول الله والله اكبر ) ئەودەشتو دەرویالو دۆلو ئاسمانەی پڕ کرد ، نیشانەی ڕووخاندنی بت پەرستی دیاریدا ، ئەمجار پێغەمبەر بەرنوێژی کرد بۆ دووهەزار کەس ، پاش ئەوەی حەوت سال بوو قەدەغە کرابوو لەوشوێنە جێگای خوا پەرستی‌یەدا ، بەم شێوەیە موسلمانەکان سێ ڕۆژ لە مەکەدا مابوونەوە و کافرەکان مەکەیان بەجێ هێشتبوو .

## ساڵی هەشتەم :

ناردنی چەند سریەیەك بەم‌لاولادا :

کە لە عەمرەی قەزا هاتنەوە ئەو هەموو بەختیاری‌یەیان بینی ، پێغەمبەر بیری کردەوە کە هەرچی درك و داڵ وا لەودەوورە ، وە ڕێ نەگرێ لە بلاّوبوونەوەی ئیسلام لای‌بدا ، وە ڕێگا خۆش بکا بۆ کۆبوونەوەی خەڵکی بەبێ‌ترس لەدەوری بانگی ڕزگاری‌کەری ئیسلام وەبەم بۆنەیەوە چەند سریەیەکی نارد بەم‌لاولادا بۆ چاوشکێن کردنی پیاوە خراپەکان .

## جەنگی موءتە (١)

لە مانگی جمادی یەکەمی ساڵی هەشتەما پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ سوپایەکی سێ‌هەزار کەسی ڕێك‌خست و بەسەرۆکایەتی (زید) ی کوڕی ( حارثە ) ناردی بۆشام ، ئاڵایەکی سپی بەست و دای بە دەست زەیدەوە و فەرمووی : « ئەگەر ( زید ) تووشی شتێ‌هات (جعفر) ی کوڕی ( أبی‌طالب ) سەرۆك و ئاڵا بەدەست بێ ، ئەگەر (جعفر) یش تووشی هات ( عبدالله ) ی کوڕی ( رواحە ) ، وەئەگەر ئەویش تووشی هات موسڵمانەکان بۆخۆیان فەرمانداەیەك هەڵبژێرن » وەلە پاش ئەمە ووتارێکی جوان‌و پڕلە سودو بەرزی بۆدان‌و ئامۆژگاری کردن‌و فەرمووی : ئامۆژگاریتان ئەکەم بەترسان لەخواو خۆپاراستنتان ، وەبە باشی لەگەڵ یەکترا بجوڵێنەوە ، بجەنگن بەناوی خواوەو لەڕێگای خوادا لەگەڵ ئەوانەی کافرن‌و باوەڕی‌ڕاستیان‌بەخوانیە ، غەدرو خیانەت مەکەن ، دەست بەسەر ماڵی کەسامەگرن ، ژن‌ومناڵ‌وپیروپەك کەوتو مەکوژن، ئەوانەمەکوژن کەدوورەپەرێزن

(١) موءتە دێیەکە لە وولاّتی شام و نزیکە لە کەرکەوەو دوو قۆناغ لە قودسەوە دوورەو کەوتۆتە خوارووی خۆرهەلاّتی دەریایی مردووەوە .

و لەئەشکەوتەو کڵێسەکانا خۆیان شاردوەتەوە ، نزیکی باخ مەکەونەوە و داری بەردار مەبڕنو خانو و کۆشك مەڕوخێنن » وەپێغەمبەر تادەری شار لەگەڵیان رۆیشت و ئامۆژگاری ئەکردن و دوعای خێری بۆ ئەکردن ، خەڵکیش هەموو خوا حافیزی یان لێ ئەکردن ، وە بەناوی خواوە سوپا ڕووەو شام کەوتەڕێ . بۆ وولاتی شام ، زۆربەی مێژووناسو سیرەت نووسەکان لایان وایە پێغەمبەر ئەم سوپایەی نارد کەتۆڵە لە ( شرحبیل ) کوڕی ( عمر ) ی (غسانی) بسێنێ ، کە ئەوەبوو نیراوەکەی پێغەمبەر بۆ لای کاربەدەستی ( بصری ) ی کوشت کەناوی ( حارث کوڕی عمیری یزدی ) بوو . وە پێغەمبەر زۆر پێی دڵگران بوو ، وە هەندێ تر لایان وایە بۆ تۆڵەسەندنی کۆمەڵەکەی ( کعبی ) کوڕی ( عمیر ) لە ( ذات الأطلاح ) بووە . وە هەرکام لەمانە بووبێ لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە پێغەمبەر هەمیشە دڵی لە ولاتی شام بووە ، چونکە ژیانی نیوەدورگەی عەرەبی بەسەرەوەبوو ، تێکەڵاوی هاتوچۆیان بەسەریەکا بوو ، تیرەو هۆزی ئەوناوەو ئەوڕێگایەش ئازاری ڕێبواریان زۆر ئەداو ڕێگای بازرگانیان ئەبەست ئەبوایە چارە بکرانایە و ئەو ڕێگایە هێمن بکرایەتەوە ، سوپاکە بە سەرۆکایەتی زیدو بەناوی خواوە کەوتەڕێ ، هەرچەند فەرماندەکانی سوپاکە بیریان لەوە ئەکردەوە و هەوڵیان ئەدا کە وەکو پێغەمبەری خوا بکەن و نەیەڵن پێیان بزانرێ هەتا لەناکایەکا ئەدەن بەسەر دوژمنا ، بەڵام هەواڵەکە زوو گەیشتە شام ( شرحبیل ) کەکاربەدەستی ( هیرقل ) بوو لە شاما ، سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە ژمارەیان : هەندێ ئەڵێن سەد هەزار و هەندێ تر ئەڵێن دووسەد هەزار بوو ، سەد هەزاری ڕۆم و سەدهەزایش عەرەبە گاورەکان بوو ، وەئەڵێن : ( تویودۆر ) ی برای هیرقل فەرماندەی

گشتی سوپـاکه بوو . کاتێ لەشکری ئیسـلام گەیشتە ( معان ) هەواڵی ئەم سوپا گەورەیەیان زانی و لەوێدا دووشەو مانەوە ، کەوتنە ڕاوێژ لەناوخۆیانا : هەندێکیان ڕایان وابوو لە خۆوە بەرابەری کردن و جەنگانن لەگەڵ ئەو سوپا بێشومارەدا شتێکی ناڕاستە ، کەوایە بابنوسنە خزمەتی پێغەمبەری خواو ئەم هەواڵەی بدەنێ ، یایارمەتی دەریان بۆنەنێرێ ، یا فەرمانی هەرچۆن بێ وابکەن . خەریكبوو ئەم ڕایە ســــەربگرێ هەتا (عبدالله) ی کوڕي ( رواحه ) هاتە دواندن و وتی : خزمەکان بەخوا ئەو شتەی ئێستا پێتان نـاخۆشە ئەوەیە کە ئێوە هەوڵی بۆ ئەدەن : ئەویش شەهیدی‌یە ئێمە ناجەنگین لەگەڵ دوژمنا نەبەچەكونەبەهێزو نەبەژمارەو زۆری ، ئێمە تەنیا بەو باوەڕو ئـاینە ئەجەنگێین ، فەرموون ، ئێمە یەکێ لەو دوو خۆشی‌و چاکەمان دەست ئەکەوێ : یاسەرکەوتن ، وە یاشەهید بوون ، ( عبدالله ) لەگەڵ پتەوی باوەڕو ئازایەتی‌و چاونەترسـی‌دا شاعـیربوو ، قسەی زۆر تیژی ئەکردە سەر گوێ‌گرانی ، لەبەرئەوە بوو لەگەڵ دەربڕینی قسەکانیا گیانی ئازایەتی وفیداکاری هاتە بەرسوپاکەو بێوەستانو خۆگرتن وتیان : ڕاست ئەکا ، کەلەشکری دوژمن نزیك بووەوە موسڵمانەکان هاتنە ( موءته ) و لەوێدا خستیان ، ئەمجار جەنـگ دەستی پێ‌کـرد لەنێوانی دووسەد هەزار سوپای ڕۆم وسێ‌هەزار سوپای ئیسلاما هەرکەهەرا دەستی پێ‌کرد ( زید ) ی کوڕی (حارثه) ئاڵاکەی پێغەمبەری هەڵگرتو خۆی کوتا بۆناوجەرگەی دوژمن . زید جەنگێکی فیداکارانەی کرد هەتا شەهید بوو ، ئەمجار (جعفر) ی کوڕي (أبی‌طالب) ئاڵاکەی هەڵگرتو پەلاماری داو کەوتە سروود خوێندنەوەو وتی : چەند خۆشە بەهەشتو نزیكبوونەوە لەبەهەشت ، (جعفر) گەنجێك بوو لەتەمەنی سی‌وسێ ساڵی‌دابوو بەسواری

خۆی کوتایە ناوسوپای دوژمن‌و کەوتە شمشێر بازی هەتا دەوریان گرت‌و ئەسپەکەیان کوشت دابەزی‌و شمشێری لێ‌ڕادان‌و شمشێرەکەی وەکو تیر ئەڕۆیی ، وەئالاکەی بەدەستی ڕاستی گرتبوو دایان لەدەستی قرتانیان ، بەدەستی چەپی ئالاکەی گرت ، کەدەستی چەپیان قرتان بەقۆلەکانی گرتی هەتا بەتەواوی شەهیدیان کرد ، لەپاش (جعفر عبدالله) ی کوڕی (رواحە) ئالاکەی هەلگرت‌و بەسواری ئەسپەکەی خۆی کوتا بۆناو دوژمن ، وادیارە لەبینینی ئەودیمەنە سامناکەو لەکوشتنی دوو هاوەلەکەیەوە هەندێ دوو دلی بۆپەیدا ئەبێ بەلام کەیشتنی بەئامانجی ڕاستەقینە کەدەستکەوتنی شەهید بوونەو گەیشتنی بەدوو هاوەلەکەیەتی لەبەهەشتا دلی بەهێز کردو دەستی کرد بەسەرزەنشتی دەرونی خۆی . وەبەسروود ووتنەوە خۆی هەلدایە ناو کزڕی دوژمن ، ئەلێ : لەوکاتەدا ئامۆزایەکی پارچە گۆشتێکی بۆهێناو وتی : تۆ ئەمرۆ زۆر ماندوو بوویت‌و هیچت پێ نەخوراوە ، ئەم نەختە گۆشتە بخەرە بەردلت ، گۆشتەکەی وەرگرت‌و تیکەیەکی لێ‌داگرت‌و گوێی لەگرمەو هەرای دوژمن بوو لەبەردەمیەوە ، گۆشتەکەی فڕێ‌داو پەلاماری داو جەنگا هەتا شەهید کرا ( ثابق ) کوڕی ( أرقم ) لەتیرەی (بنی‌عجلان) ئالاکەی هەلگرت‌و وتی : ئەی جەماهیری موسلمان ڕێ بکەون لەناوخۆتانا ویەکێ بکەن بەفەرماندەتان . وتیان : تۆفەرماندەمان بە . وتی : من‌نایکەم ئەبجار بڕیاریان‌دا فەرماندەیان ( خالد ) ی کوڕی ( ولید ) بێ .

( خالد ) ی کوڕی (ولید) کەچەند مانگێ بوو موسلمان بوو بوو ، وە ئەمە یەکەم جەنگی ئیسلامی بوو کەتیایا بەشداربوو ، فەرماندەیی گرتە دەست‌و ئالاکەی هەلگرت لەکاتێکا سوپای موسلمانەکان لەق‌و لۆق بووبوو بەهۆی شەهید بوونی ئەوسێ سەرۆکەوە ، هەتا هەندێکیان ئەیان ویست

بگەڕێنەوە تا ( عقبە ) ی کوڕی (عامر) پێی وتن : برا پیاو لەڕوو بەڕوودا بکوژرێ چاکترە لەوەی لەپشت هەڵکردنا بکوژرێ . بەو پێیە پەشیمانی کردنەوە . بەڵێ ( خالد ) ئاڵاکەی هەڵگرتو کەوتە بیر کردنە وە لەڕزگارکردنی ئەم سوپا بچکۆلەیەی ئیسلام لەدەست ئەوهەموو جڕو جانەوەرەی ڕۆم ، ئەوڕۆژە تا ئێوارە چەنگێکی پاڵەوانانەیان کرد ، وە ئێوارە لەهەردوولاوە چەك دانرا بۆحەوانەوە ، لێرەدا (خالد) سوپاکەی کۆکردەوە وشێوەکەی گۆڕین ، چەپ بۆڕاستو پێشەنگ بودواوەو دواوە بۆپێشەوە ، بەم پێیە سازی کـــردن ، وەچەند تیپ سواری نارد کەلە بەیانیدا لەدوورەوە بێنو تۆز هەڵسێنن ، کە لەبەیانیدا ڕۆم ئەو تـۆزو دوکەڵەیان بینی وەبینییان ئەوانەی دوێنێ لەگەڵیان جەنگان ئەمانە نەبوون وایان زانی ئەمە سوپای تازەیەو یارمەتییان بۆهاتووە لەلایەن پێغەمبەری خواوە - درودی لەسەربێ - وەترسیان لێ نیشت ، هەتا دوێنێ بەو ژمارە کەمەوە ڕۆمیان شپرزە کردبوو ، ئەوهەمووەیان لێ کوشتن ، جا ئێستا سوپای تازەیان بۆهاتبێ ئەبێ چییان پێبکەن ؟! لەبەرئەمە سوپای ڕۆم خوا‌خوای بوو موسڵمانەکان هێرش نەبەنە سەریان ، وەخالدیش بەدەوری خۆی نەی ویست جەنگی تێڕژان بکا بەوشێوەیە شپرزەی کردن هەردەمێ لەلایەکەوە پەلاماری ئەدان ، بەم پێیە حەوت ڕۆژ مانەوە ، زیانی زۆر گەورەیان بەدوژمن گەیاند وخۆشیانی نەئەخستە مەترسییەوە ، وەبەڕادە-یەك نارەحەتیان کردبوون چەند کەرەتێ لەدوژمن لەشوێنی خۆی پەرێشان بوونو لەجێگای خۆیان هەڵکەنرانو ڕایان کرد .

بخاری لەخالدەوە ڕیوایەتی کردوە ئەڵێ : لەجەنگی موءتەدا ڕۆژێکیان نۆ شمشێر لەدەستما شـکا وە شمشێر نەبوو لەدەستما خۆی بگـرێ تەنیـا

تەنیا شمشێرێکی یەمانی نەبێ ، وەبەم شێوەیە خالد توانی ئەو سوپـایەی ئیسلام بپارێزێ و نەیەڵێ لەناوبچێ ، وەکارێکی بەسەر ڕۆم هێنا ئاواتیان ئەخواست کە ئەمان بگەڕێنەوە و ڕزگاریان بێ لەدەستیان . خـالدیش کەزانی دوژمنی وەرس کردوەو نایەن بەشوێنیانا ، لە شەوێکا گەڕانەوە و هاتنەوە بۆمەدینە ، موسلمانەکان لەدەس دوژمن ڕزگاریان بوو ، وەژمارەی شەهیدەکان لە دەکەس تێنەپەڕی ، بەڵام کوژراوی دوژمن زۆر بێ‌شمار بوو . وە لەشکری ڕۆم لەوەی ئەترسان ئەم گەڕانەوەیە فێڵ بێ ، بیانەوێ ڕایان کێشن بۆ دەشت و بیابان لەوێ لاوان ابێبڕنەوە ، لەبەرئەوە نەیان توانی شوێنیان کەون .

لەپێش هاتنی هەواڵی ئەم کارەساتەدا پێغەمبەری خوا هەواڵی‌دا بە موسلمانەکانی مەدینە . بخـاری لە صحیحا ڕیوایەتی کردوە لە أنس کوڕی مالکەوە : «پێغەمبەری خوا هەواڵی شەهیدبوونی سەرۆکەکانی‌دا پێش هاتنی هەواڵ و فەرمووی بە چاوی پڕ لە گریانەوە ـ زید ئاڵاکەی هەڵگرت و شەهیدکرا ، پاشان جعفر هەڵی‌گرت و شەهیدکرا ، پاش‌ئەوە عبداللّٰەی کوڕی رواحە هەڵی‌گرت ، ئەویش شەهید کرا ، ئەمجار شمشێرێ لە شمشێرەکانی خوا ئـاڵاکەی هەڵگرت و ڕزگاریـان بوو وەسـەرکەوتن لەم‌کاتەوە خالد ناونرا ( سیف اللّٰه ) واتە شمشێری خوا .

بەڵێ خالد سەرکەوت ، چونکە توانی ئەو سوپایە لەدەس ئەو هەموو دڕوندانەی ڕۆم ڕزگـار بکاوترس و بیم بخاتە دڵیانەوە ، وەبیان توقێنێ بۆیە کە سوپاکەی خالد گەڕایەوە هەندێ لەڕووی نەزانینەوە پێیانوتن : ئەی ڕاکردوەکان ئێوە ڕاتان کردوە لەدەس دژمن . پێغەمبەرفەرمووی : نەء ئەمان ڕایان نەکرد ، ئەمان هەڵمەتیان برد .

## جەنگی ذات السلاسل :

لەپاش گەڕانەوەی سوپـای موءتە بەچەچەند حەفتەیەك پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ویستی سامو هەیبەتی موسلمانەکان بگێڕێتەوە شوێنی خۆی لەسەرووی نیوەدورگەی عەرەبی‌یەوە ، بەتـایبەتی کەبیستی کۆمەلی تیرەی ( قوزاعە ) کۆبوونەتەوە لـە ( وادی القرای ) ئەیـانەوێ هێرشێ بێننە سـەر مەدینە ، بۆ بەربەستی ئەوەو بۆ چـاوشکاندنی تیرە و هێزەکانی ئەو ناوچەیە بەکشتی ، لە مانگی جمادی دوایی‌دا عمری کوڕی عاصی نارد.بەسێ‌سەد کەسەوە و سی سواریان لەکەلابوو ئالایەکی ڕەشی بەستو دایە دەستی عمرو ناردنی ، عمرو دایکی لەوتیرانە بوو ، بەوبۆنەیەوە ئەی‌توانی ژێردەستیان بکاو ڕایان بێنێ .

عمرو سەربازەکانی بەشەو ئەڕۆیشتن و ڕۆژ خۆیان ئەشاردەوە ، هەتا کەیشتنە سـەر ئاوی ( سـلاسل ) لە خاکی ( جزام ) لە پشتی ( وادی القری) وە ، عمرو بۆی دەرکەوت کە سوپای دوژمن زۆرە ، ترسی‌لێ‌نیشت و هەوالی نارد بۆپێغەمبەر کەیـــارمەتی دەری بۆ بنێری ، پێغەمبەریش ـ درودی‌لەسەربێ ـ أبوعبیدەی کوڕی جراحی بۆنارد لە کەل دووسـەد کەسا لەکۆچەری‌یە پێشینەکان ، لەوانە أبوبکرو عمریان تیابوو ، فەرمووی بە أبوعبیدە : « لەکەل عمرا نـارێك مەبن » کە کەیشتنە لای عمرو ، عمرو وتی بە أبوعبیدە : تۆبۆ یارمەتی من نێرراوی ، من خۆم فەرماندەی سوپـــام . أبوعبیدة فـەرمووی : مـن فەرمـاندەی خـۆم و تۆیـش فەرمـــاندەی کۆمەلـی خـۆت بـە . عمرو وتی نـەء فەرمـــاندەی کشتی هێنی منەوتۆ بەیارمەتی‌دەر نێرراوی‌أبوعبیدە پیاوێکی لەسەرخۆو نەرم ونیان بوو ، کوێی لەئیش وکاری جیهانی نەبوو وتی : پێغەمبەر فەرموویە :

نارێك مەبن . تۆ ئەگەر لێم یاخی نەبی من گوێ ڕایەڵیت ئەكەم ، فەرماندەیی كەوتە دەست عمرو ، شەو ویستیان ئاگربكەنەوە عمرو نەیهێشت عـمر ویستی توڕەببێ أبوبكر وتی عـمر پێغەمبەری خوا ئەمری كردوە بە سەرۆك چونكە لە فێڵی جەنگ ئەزانێ ، لەقسەی دەرمەچۆ ، عـمرگەردن كەچی كرد ، تیرە تیرە دەستی كرد بە ڕافڕاندنی دوژمن و كەوتە نـاو تیرەی ( بلی ) و ( عذرە ) و ( بلقین ) و (طی) ، وە ئەچوونە هەركۆزێ ئەیان ووت : كۆمەڵێ لێرەدا بوون كە بە ئێوەیان زانی هەڵاتن و خۆیان شاردەوە ، هەتا جارێكیان لەگەڵ كۆمەڵێكا بەجەنگ هـاتن و ئەوەندەی نەبرد دوژمنەكان شكان و ڕایان كرد ، ئەوانیش تالانەكەیان كۆكردەوە و ئەیان ویست سەر شكـتەكەیان بكەون ، عمرو نەیهێشت . بەم ڕێیە لە پەنای خواوە توانیان دوژمن لەو ناوچەدا چاوشكێن بكەن و ترس و بیم بخەنە ناو دڵی دانیشتوانی ناوچەكەوە و بەسەركەوتوویی گەڕانەوەبۆ مەدینە .

## بەشی یانزەهەم لەداگیر كردنی مەكەوە تاجەنگی(تبوك) داگیر كردنی شاری مەكە ( فتح مكە ) :

لەپێشەوە زانیمان كە لە پەیمانی ئاشتی حدیبیەدا بەندێكی بریتی‌بوو لەوە : هەركەس پێی خۆش‌بێ ببێتە هـاوپەیمان لەگەڵ پێغەمبەرا ، وە هەركەسیش ئەیەوێ بچێتە پەیمـانی قورەیشەوە ، وە زانیمان كە تیرەی خزاعە چوونە پەیـمانی پێغەمبەری خواوە ـ درودی لەسەربێ ـ وەتیرەی بنی بكر چوونە پەیمـانی قورەیشەوە ، وە لە كاتی خۆیدا دوژمنایەتی و خوێن ڕێژی لەناوی ئەم دووتیرەدابوو بوو ، بەڵام لەدوای ئەم پەیمـانە نەختێ دامردەوە كاتێ هەرای ( موءتە ) ڕوویدا و قورەیش وایزانی ئیتر

( محمد ) تیاچووەو دەسەلاتی نەماوە ، ئەلبەت لەم ڕووەوە زۆر دواون .
ئەم کارەسانە دای لەدلی ( بنی دئیل ) لە تیرەی ( بنی بکر ) کە هەلیان
بۆ هەلکەوتوە بۆ ئەوەی بدەن بەسەر ( خزاعە ) دا و تۆلەی سەد سالەیان
لێ بسێنن ، وە هەندێ لـە گەورەکانـی قورەیش وەکو (عکرمە) ی کوڕی
( أبی جهل ) و وینەی ئەو هانیاندان ،

لەناکاپەکا کە ( خزاعە ) ناگایان لەهیچ نەبوو شەوێك ( بنی بکر)
دایان بەسەریانا لە سەر ئاوێك پێی ئەڵێن - ( وتیر ) بیست یا بیست و
سێ کەسیان لێ کوشتن ، لە ناو ئەمانەدا بەدزیەوە کۆمەڵێ لە پیاوەکانی
قورەیش جەنگان ، ( خزاعە ) کە ئەمەیان بەسەر هات کۆمەڵێکیان
ڕێکخست بە سەرۆکایەتی ( عمر ) ی کوڕی ( سالمی خزاعە ) یی ،
ناردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - بۆ مەدینە ، کە
گەیشتە ئەوێ ( عمر ) بە سەر سەری پێغەمبەری خواوە وەستاو پارچە
هۆنراوەیەکی خوێندەوە ، باسی دەست درێژی ( بنوبکر ) و قورەیش و
بەسەرهاتە پڕ لەناسۆرەکەی کرد ، بەدلی گەرمەوە داوای یارمەتی‌و تۆلە
سەندنەوەی لێ کرد . پێغەمبەریش فەرمووی : یارمەتیت درا ئەی عمر .
یا فەرمووی : بەو خوایەی گیانی منی بەدەستەوەیە وەکو گیانی خۆم ئەتان
پارێزم . وە لەپاشان فەرمووی بە ( عمر ) و هـاوڕێکانی : ئێوە بڕۆن
خۆتان حەشاربدەن و لەو شیوو دۆلانەدا بـاکەس پێتان نەزانێ‌و هەقتان
نەبێ . وە بدیلیش لەگەل چەند کەسێکا هات‌و ئەویش گەڕایەوە بۆمەکە.

لەدوای ئەم ڕووداوە قورەیش لەخۆیەرە مەترسی لێ نیشت و کەوتە
دواندن لەم پەیمـــان شکاندن‌و دەست درێژی کردنە ، خۆ محمد ئەوەیە
دەسەلاتی لە سنوری نیوە دورگە دەرچووە ، هەتابێ پەرەئەسێنێ ، ئەبێ

چارەنووسی ئەمان چی‌و چۆن بێ ؟ . . وەلەم ڕووەوە وایان بەباش زانی
کە ( أبوسفیان ) بنێرن بۆ لای (محمد) بۆئەوەی پەیمانەکە پتەو بکاتەوەو
ماوەکەیش درێژتربکا . ( أبوسفیان) کەوتەڕێ‌و بەتەمابوو کەس لێ‌ی
پێش نەکوتبێ ، بێ‌ئاگابوو کەهەموو شتێ لێ‌بووەتەوە ، لەڕێگا لە (عصفا)
گەیشت بە ( بدیل ) و هاوڕێکانی و ترساکە لە لای محمدەوە هاتبنەوە و
ئیشەکەیان تێک‌دابێ ، بەڵام کە لێ‌ی‌پرسـین : لەکوێ بوون ؟ نەچوونە
ژێر ، وتیانَ لەناو خزاعەدا بووین . بەڵام کە سەیری پشکەڵی ووشترەکانی
کردن‌و وردی کردو بینی ناوکە خورمـای تیایە ، زانی لە لای محمدەوە
هاتوون وتی ئەمە لەوەڕی مەدینەیە .
( أبوسفیان ) لەترسی هاتنی ( بدیل ) بۆ مەدینەو یەکسـەر نەچوو
بۆلای پێغەمبەر ، وای بەباش زانی کەلەپێشەوە بچـێ سەر لەکچەکەی
بدات (أم حبیبە) خێزانی‌پێغەمبەر ، لەبەکەم هەنگاویا(ام حبیبە) شتێکی سەر
سوڕهێنەری بینی‌و لێ‌ی بێ‌هیوا بوو . ( أبوسفیان ) ویستی لەسەر جێگا
کەی پێغەمبەری خوا دابنیشێ ، بەڵام ( أم حبیبە ) پەلاماری جێگاکەی
داو هەڵی تەکاند ، نەی هێشت لەسەری دانیشێ ( أبوسفیان ) واقی‌وڕما
و وتی : ڕۆڵە ئەوە لەبەرمن جێگاکەت لابرد ، یان لەبەرجێگاکە بوو ؟
ئەویش بەبێ پەردە وتی : ئەوە جێگای پێـغەمبەری خـــوایە ـ درودی
لەسەربێ ـ پیرۆزەو تۆیش بت پەرستی‌و پـیسی وتم : با پیسی نەکات .
( أبوسفیان ) وتی : بەخوا کچم دوای من تۆیش توشی خراپی هاتووی.
وە ڕقی داهات‌و چووە دەرەوە ، چووە لای پێغەمبەرو لەگەڵیا دوا ، بەڵام
بەهیچ جۆرێ وەڵامی نەدایەوە ، دوای ئەوە چووە لای ( أبوبکر )ولەگەڵی
دوا هەتا لەگەڵ پێغەمبەرا بۆی بدوێ‌و تکای بۆ بـکا ، بەگوێ‌ی نەکـرد ،

ئەبجار چووە لای (عمر) و بەتەمای تکای ئەوبوو ، بەڵام (عمر) زۆر بە توندی وەڵامی دایەوەو ، ا أبوسفیان هاتەوە مەکەو زانی پێغەمبەر بەرابەری ئەم پەیمان شکاندنو دەستدرێژی کردنەی قورەیش بۆسەرهاوپەیمانەکانی تۆڵەیەك ئەسێنێو هەڵ ئەسێ بەکارێك ، بەڵام نەی ئەزانی کەئەکاتە داگیر کردنی مەکە بەسوكو ئاسانی ، وەبەسەرهاتەکەی خۆی گێرایەوە بـــۆ قورەیش . ئەوانیش وتیان : هەی هاوار کابرا وای لێهـاتوە کەکاڵتەی پێ کردویو ترۆی کردوی وەکەوتنە ڕاوێژ .

## پێغەمبەر خۆی ئامادە ئەکات بۆسەر مەکە

پێغەمبەری خوا کەوتە خۆ ڕێکخستن ، وەداوای کرد لەموسڵمانەکان کەهەموو خۆیان ئامادە بکەن بۆجەنگ ، بەڵام لەپێشەوە بەکەسی نەوت بۆکوێو بۆچی ئەچن ؟ هەتا گەورە ترین یارو نزیکترین باوەڕ پێ کراوی نەی ئەزانی بۆ چلایەك ئەڕۆن ، ئەڵێ : أبوبکر چوو بۆماڵی پێـغەمبەری خواو خاتو عائشە خەریکی کۆکردنەوەی ئازوخەو ڕێکخستنی تفاق بوو ، لێی پرسی : عائشە پێغەمبەری خوا بۆکوێ ئەچێ ؟ وتی : بەخوا نازانم ، بەس فەرموویە : تفاق ئامادە بکە اا ئەم نهێنیو پەنامەکی یە بەو ڕادەیە لەبەرئەوە بوو دوژمن نەزانێ ونەبیستێ ، وەبەخـۆیان نەزانن هەتا لەناو مەکەدا ئەدەن بەسەریانا ، بەڵکو بەم پێیە خوێن ڕێژی نەکرێو ناچار بن خۆبدەن بەدەستەوە ، لەپاش ماوەیەك ئەبجار کۆمەڵێك لەئەمینو باوەڕ پێ کراوانی کۆکردەوەو تێی گەیاندن کەخەیاڵی مەکەو سەر قـورەیشی هەیە ، ئەوانیش وتیان : ئەی پەیمانت نیە لەگەڵیان ؟ فەرمووی : بەڵێ ، بەڵام ئەوان لەپەیمان دەرچوونو شکاندیان ، وەداوای لێکردن ئەمقسەیە بڵاوە نەکاو نهێنی بێ . وەهەواڵی نارد بۆهەموو دانیشتوانی بیابانەکانو ئەو

دەورو بەرە : هەرکەس بڕوای بەخـــواو ڕۆژی دوایی هەیـە لەمانگی ڕەمەزاندا بێتە شاری مەدینە » وەلەخوایش پاڕایەوە کەئەم هەواڵە نەگاتە قورەیش وفەرمووی : « خوایە قورەیش کـوێرو کەڕ بکـە ، لەم ڕووەوە پێمان نەزانن هەتا ئەدەین بەسەریانا ) . بەڵێ هەموو کەوتنە خۆ ئامادە کردن ، کەچی لێرەدا شتێکی سەیر ڕووی دا .

## نامەی حاطبی کوڕی أبی بلتعه

( حاطبی ) کوڕی ( أبی بلتعه ) پیاوێکی ڕێك‌و ڕەوان بوو ، یەکێك بوو لەکۆچەرە پێشینەکان ، هاوبەشی جەنگی بەدربوو ، خۆی لەقورەیش نەبوو بەڵکو هاوپەیمانی (بنی أسد) ی یەکان بوو ، ماڵو منـاڵی لەمەکەدا مابووەوە ، پیاوێك بوو جێگای باوەڕو ڕاوێژی پێغەمبەر بـوو ، ئاگادار بوو کەپێغەمبەر ئەیەوێ بچێتە سەر مەکە ، نامەیەکی نوسـیو بەژنێـکا ناردی بۆقورەیش ـ ئەم ژنە بۆزانینی حاڵو هەواڵی پێغەمبەر نێررابوو ـ بۆئەمەی خزمەتێ بکا بەقورەیش ، هەتا ئەگەر واڕێکەوت قـورەیش زاڵ بوو بەسەرموسڵمانەکانا چاوپۆشی لەماڵو منالی بکرێت . . بەڵام بێ‌سودە خوا ئەیەوێ ئیشەکە بەجوانی بڕواو پێغەمبەریش دوعاو نزای کـردوە . خوا پێغەمبەری لەم کارە نالەبارەی ( حاطب ) تێ‌گەیاند .

بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردوە لە علی کوڕی أبی طالبەوە ئەڵێ : « پێغەمبەری خوا ـ درودی لەســـەربێ ـ نارد می لەگەڵ أبو مرثد و زبێری کوڕی‌عوام‌دا ، هەرسیانمان سوار بووین‌و فەرمووی : بڕۆن هەتائەگەنە (روضة خاخ) لەوی بەژنێکی بت پەرست ئەگەن ، نامەیەکی لە حاطبەوە بردوە بۆ بت پەرستەکانی قورەیش . ئێمەیش لەو شوێنەدا پێ‌ی‌گەیشتین بەسواری ووشترێکەوە ئەڕۆیی وەکو پێغەمبەر فەرمووی : وتمان : نامەیەکت

پێیە بماندەرێ وتی : نامەم پێنیە . هەرچی هەوڵماندا بێسوودبوو نەچوە ژێری ، وتمان پێغەمبەری خوا درۆی نەکردوە ، یا نامەکە دەربێنە، یا روتت ئەکەینەوە . کەزانی بەراستمانەو وازی لێناهێنین ، نامەکەی دەرهێناو دایە دەستمان ، ئێمەش نامەکەمان هێنایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا و ئەویش ناردی بەشوێن ( حاطب ) داو فەرمووی : چیپاڵیپێوەنای بۆ کردنی ئەم کارە ؟ ( حاطب ) وتی : بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕی پتەوم هەیە بەخواو پێغەمبەری خوا ، وەمن ویستم بەم کارە خزمەتێك بکەم بە قورەیشەکان هەتا بە هۆی ئەوەوە خوا پارێزکاری بکا لە ماڵ و منداڵەکەم ، وەکەس نیە لەم یارە موسڵمانانەی لای تۆ لەوێ خزم و خوێشیان نەبێ کە بەهۆی ئەوانەوە خوا پارێزکاری بکا لە ماڵ منداڵیان . پێغەمبەر فەرمووی : ڕاست ئەکا .

## ڕێکەوتنی سوپای پێغەمبەر :

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ سوپای کۆکردەوە و (عبدالله) ی کوڕی ( أم مکتوم ) ی لەسەر مەدینە دانا ، لە دەی مانگی رەمەزانی ساڵی هەشتەمدا بە سوپایەکی گەورەوە ڕووەو مەکە کەوتەڕێ ، وە لە هەموو تیرەکانیشەوە یارمەتی و هێزیان بۆهات ، و ژمارەی سوپا گەیشتە دەهەزار کەس . ئەم سوپا گەورەیە هەمووی بەبڕوای قاییم و بەدڵی پڕلە ئیسلامەتییەوە کەوتەڕێ ڕووەو ئەوشوێنەی کە خوا کردویەتی بەجێگای ئەمینی و ئاسایش ، ئاواتی پێغەمبەر هەرئەوە بوو خوێن ڕێژی تیانەکرێت ، بێگومان کەهاتن هەموو بە ڕۆژوو بوون ، بەڵام پێغەمبەر ڕۆژووەکەی شکاندو ئەوانیش هەموو شکاندیان ، وە بۆ ئەم سەفەرەی لە خێزانەکانی ( أم سلمەو میمونە ) لەگەڵیا هاتبوون . بەڵێ ئەمان بەم پێیە دەشت و

ڕێگایان دایەبەر ، تاگەیشتنە ( مرالظهران ) .

وە لەویشەوە بەگەڕانەوەی ( أبوسفیان ) بۆمەکە ترس و لەرز لەناو قورەیشـا پەیدابوو ، نەیـان ئەزانی چیبکەن و چۆن ئەبێو چی ڕوویان تێئەکا ؟ وە لەم سێو دووەدا بوون ( عباسی ) کوڕی ( عبدالمطلب ) بەجێی هێشتن بەخاو خێزانەوە هات بۆ مەدینە لەڕێگادا لە ( جحفە ) ( چواڕ قۆنـاغ دوورە لە مەکەوە ) گەیشتە پێغەمبەرو زووتر موسلمـان ببووبوو ، وەبێجگە لە ( عباس ) ( أبووسفیانی ) کوڕی (حارثی )کوڕی ( عبدالمطلب ) کە ئامۆزای پێغەمبەر بوو ، وە ( عبدالله ) ی کوڕی ( أمیە ) ی کوڕی ( مغیرة ) کە پورزای پێغەمبەرو برای ( أم سلمە ) بوو هاتن بۆ مەدینەو داوای ئیزنیان کرد بچنە خزمەتی پێغەمبەر ، بەڵام ئەم دوانە چونکە پیسترین دوژمنایەتیو جوڵانەوەیان کردبوو لەگەڵ خۆیو موسلمانەکانا ، پێغەمبەر زۆر لێیان تورە بوو ، فەرمروی بە ( أم سلمە) کە تکاکاریان بوو : ئیشم پێیـان نیە ، پاشان ( علی ) ڕێگایەکی بۆ دۆزینەوە ، بەوپێیە لێیان بورد موسلمان بوون .

عباسی مامی پێغەمبەر کەئەم سوپاو هێزە گەورەیەی دی زانی قورەیش بەرگەی ناگرێ ، پێی ناخۆشبوو قورەیش لەناوبچێ و خوێن ڕێژی لە مەکەدا بکرێ ، لەم ڕووەوە لەگەڵ پێغەمبەردا دوا ، پێغەمبەریش پێی خۆشبوو ڕێگایەك بدۆزێتەوە و بەوبۆنەیەوە بەبێ کوشتار دەست بەسەر مەکەدا بگرن ، وە داوای کرد لەمـامی : کە بگەڕێ بـەڵکو یەکێ بدۆزێتەوە و بینێرێ بۆ ناویان و بیانترسێنێ . عباسیش سواری هێسترە سـپیەکەی پێغەمبەر بوو هات بۆناوچەی ( أراك ) ، بەڵکو لەوێدا دارکێشێ یـا ڕێبوارێ بروا بۆ مەکە و ڕای سـپێرێ بۆناو قورەیش و

هێزو دەسەڵاتی موسڵمانەکانیان تێبکەیەنێ ، هەتا بەئاشتی بێن بەپیری یەوە پێش ئەوەی ئەم سوپا گەورەیە بڕژێتە ناو شارو خوێن ڕێژی تیا بکات .

لەولایشەوە قورەیش مەترسی گەورەیان لێ نیشتبوو ، هەرچەند خوا نەی هێشتبوو دەنگ و باسی لەشکری موسڵمانەکانیان بگاتێ ، بەڵام لەخۆیانەوە هەستیان ئەکرد بە ڕووداوێکی گەورە ، بۆیە ( أبوسفیان ) ی کوڕی ( حرب ) و ( بدیل ) کوڕی ( ورقا ) و ( حکیمی ) کوڕی ( حزامیان ) نارد بۆ دەرەوەی مەکە ، تا حاڵو هەواڵێ وەربگرن و لە دەوروبەری مەکە تێبگەن ، ( عباس ) کە بەسواری هێسترە سپی یەکەی پێغەمبەرەوە ئەڕۆیی گوێی لە ( أبوسفیان و بدیل) بوو پێکەوە ئەدوان : ( عباس ) : وتی بە (أبوسفیان) بەخوا ئەوە پێغەمبەری خوایە - درودی لەسەربێ - بەسوپایەکی بێشمارەوە هاتووە ، قوڕبەسەر قوڕەیش ئەگەر بڕژێتە ناوی . ( عباس ) وتی : لەدوای خۆمەوە سوارت ئەکەم وە لای پێغەمبەر تکات بۆئەکەم و ئەمانت بۆ ئەخوازم ، بەخوا ئەگەر پێت بزانن ئەت کوژن . ( بدیل و حکیمی ) بەم هەواڵەوە ناردەوە بۆ مەکە و ( أبوسفیانی ) لە پاش خۆیەوە سوارکرد و بەناو ئەم سوپایەدا تێ پەڕی بۆلای چادرەکەی پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - کە خەڵکی سەیریان ئەکرد ئەیانوت : مامی پێغەمبەر بەسەر هێسترەکەی پێغەمبەرەوەیە و دەستیان بۆ نەئەبرد ، هەتا گەیشتنە لای ئاگرەکەی ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) و سەری هەڵبڕی و ( أبوسفیانی ) ناسی و زانی ( عباس ) ئەمانی داوە ، بەخێرایی ڕای کرد بۆ چادرەکەی پێغەمبەر ، بەڵکو لەپێش أبوسفیانەوە بگاتە ئەوێ و ئەمانەکەی عباس هەڵوەشێنێتەوە و أبوسفیان بکوژێ ، بەلام ئەمان بەدوری خۆیان هەستیان بەمەترسی کردو کوتایانە

بێ دەست هێسترەکەو لەپێش عمردا گەیشتنە ژێر چادرەکەی پێغەمبەر .
عمرکە گەیشتە ژێر چادرەکە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە أبوسفیانی دوژمنی خوایە و بەبێ هیچ ئەمانو پەیمانێ خوا گەیاندویەتی ، لێم گەرێ بابدەم لە گەردنی ، عباس هەڵیدایەو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من پەنام داوە . پێغەمبەریش فەرمووی : وا پەنامانداوە ، دەبیبە لەگەڵ خۆتاو بەیانی بیهێنەرەوە ، عباس بەیانی هێنایەوە بۆ خزمەتی ، وە لەبەر چاوی گەورەکانی کوچەریو یاریدە دەرەکانا ئەم وت و وێژە ڕووی‌دا :

پێغەمبەر : هاوار بۆتۆ أبوسفیان هێستا کاتی ئەوەنەهاتووە کەتێ بگەی بێجگە لە خوای پەروەردگار خوایەکیتر نیە ؟

أبوسفیان : دایكو باوکم بەفیدات بێ چەند دڵسۆزو خاوەن بەزەیی و جوامێریت ، بەخوا ئەزانم ئەگەر جگە لە خوای پەروەردگار خوایەکی تربیوایە یارمەتیەکی منی ئەدا .

پێغەمبەر : ئەی کاتی ئەوە نەهـاتووە تێ بگەی کە من پێغەمبەر و نێرراوی خوام ؟. ابوسفیان : دایكو باوکم بەفیدات بێ تاالەمەدا ئێستەشتێ لەدڵمـابوو . لێرەدا عبـاس گۆرج هەڵیدایەو داوای کرد لە أبوسفیان موسڵمان بێ ، شایەتومان بێنێ بەخوای تاكو تەنیاو بە پێغەمبەریەتی محمد لەپێش ئەوەی بدرێ لە گەردنی . أبوسفیان بێجگە لە ئیســـلام بوون چارەیتری نەمـا . ئەمجار عباس ڕووی‌کردە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا أبوسفیان پیاوێکی وایە شانازی پێخۆشە ، شتێکی وای بدەرێ کەجێی شـانـازی‌بێ بۆی ، پێغەمبەریش فەرمووی : « بەڵێ ، هەرکەس بچێتە ماڵی أبوسفیان ئەمین‌بێو هەرکەس بچێتە مزگەوت ئەمین‌بێو هەرکەس بچێتە ماڵی‌خۆی و دەرگا لەسەرخۆی

داخا ئەمین‌بێ » . وە لەم ئەمینیو پەنادانە چەند کەسێکی جیاکردەوە و بڕیاری کوشتنی دان ، وەکو لەپاشان باسیان ئەکەین .

لەگەڵ ئەم ئیسلام بوونەی أبوسفیاندا پێغەمبەری‌خوا ویستی زیاتر ( إحتیـاط ) بکاو شتێکی وا پیشان بە أبوسفیان بدا ـ کە سـەرۆك و بەگوێ‌کراو بوو ـ خەیاڵی بەربەرەکانێو جەنگی تیانەمێنێ ، فەرمووی بە عباس : أبوسفیان بەرەو لە تەنگەبەراییەکا ڕای گرە ، تـــابە درێژی هەموو لەشکرەکە ئەبینێ ، ئەمجار بینێرەوە بۆلای قورەیش ، وە خۆیشی هەموو ئامادەییو ڕاوێژێکی تری بەکار هێنا ، ئەمەیە سروشت و پیشەی پێشەوای لێزانو دلسـۆز و کارامە ، بەڵێ راستە سەرکەوتنو یـارمەتی بەدەست خوایە ، بەڵام پیشەی خوا وایە نایدا بەکەسێ ئامادەیی نەبێ و ( إحتیاطی ) وەرنەگرتبێ و پەیرەوێ یاسای گێتی نەکردبێ ،

عباس ئەڵێ : أبوسفیانم هەڵگرتو بردم لە تەنگەبەرایی شیوەکەدا لە خوارووی کەژەکەوە بۆ ناومەکە ، وەکۆ پێغەمبەر فەرمووی ڕامگرت ، تیپ تیپ لەشکر ئەهاتو هەرتیرەو کۆمەڵێك ئەهـات لێی ئەپرسیم : عباس ئەمەکێن ؟ منیش ئەی‌وت : ئەمە سلیمە . ئەی‌ووت : چیمە بەسەر سلیمەوە ؟ یەکێ‌تر ئەهات و ئەم‌وت : ئەمە أسلمە . ئەی وت چی‌بکەم لە أسلم ؟ هەروەها بۆ جهینە و مزینە و . . . . هتد . . هەتا پێغەمبەری خوا لەگەڵ کۆمەڵێکی گەورە لە کۆچەر و یاریدە دەرەکان تێپەڕین ، هەموو زرێ و ئاسنیان پۆشی بوو تەنیا چاویانو ئاسنت ئەبینی . وتی : ئەبوالفضل ئەمانەکێن ؟ وتم : ئەمە پێغەمبەری خوایە لەناو کۆچەری و یاریدەدەرەکانا . وتی : بەخوا ئەمانە لەچارو دەسەڵاتی کەسانێن ، بەخوا ابوالفضل موڵکی برازاکەت گەورەبوو . ئەمجـار أبوسـفیان چووە مەکە و

بەپەرێشانیو سەرسوڕمانەوە هاواری کرد : ئەی جەماهیری قورەیش ، ئەوە محمد هات بۆ سەرتان بە لەشکرەکەیەوە کە بەرهەڵستی و ڕێ پێ گرتنی لەتوانای ئێوەو کەسی ترانیە ، وە بانگەوازی کرد : هەرکەسێ بچێتە مالی أبوسفیان ئەمین بێ ، هەرکەس بچێتە مزگەوت ئەمین بێو هەرکەس بچێتە مالەوە دەرگا لەسەر خۆی داخا ئەمین بێ ، وەچەند کەڕەت ئەمەی دووبارە ئەکردەوە و ئەی ترساندن لەوەی خەیالی جەنگو هەرایان بێو ئەیوت : سوپاکە لەوزەی ئێمەدانیە . وە خەلکی بلاوەیا لێ کرد .

سوپاکەو پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - ڕۆیشتن تا گەیشتنە ( ذی طوی ) وبینی قورەیش بەرگری ناکا ، بە سەر وولاخەکەیەوە هەلوێستێکی کردو سەری کڕنوش بردنی بۆخوا دانەواندو کەوتە سوپاسو ستایشی خوا کەبەبێ جەنگو هەراو خوێن ڕێژی ، بەبێ شکاندنی حورمەتی مەکەو کەعبە ، وەبەبێ زیان لێکەوتنو زیان کەیاندن ئەچێتەوە مەکەو ئەکەڕێ بەدەوری کەعبەدا ، وەسەرئەداتەوە لەوجێگایانەی تیایانا ژیاوەو نێگای بۆهاتووە تیایانا .

بەلێ سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەم گرتنو دەسکەوتە گەورەیە ، بەلام لەگەل ئەوەیشا کەوتە ڕاوێژو ( إحتياط ) کردن ، هاتوسوپاکەی کرد بەچوارکەرتەوە لەپێشەوە بەگشتی ئاموژگاری جوانی هەموویانی کرد وداوای لێ کردن کەنەجەنگن وکەس نەکوژن وخوێن نەڕێژن وزیان نەکەیەنن هەتا ناچاریان نەکەن ! زبێری کوڕی عوامی کرد بەسەرۆکی کەرتی چەپو داوای لێ کرد کەلەلای چەپەوە بڕژێتە ناو شارەوە ، وە خالدی کوڕی ولیدی کرد بەسەرۆکی کەرتی ڕاستو داوای لێ کرد کە لەخوارەوە هەلکەڕێن وبێنە ناوشارەوە ، سعدی کوڕی عبادەی کـرد بە

سەرۆکی مەدینەیی یەکانو داوای لێ کـود لەخۆرئاواوە بێنە ناوشارەوە ، وەأبوعبیدەی کرد بەسەرۆکی کۆچەری یەکان وخۆیشی لەگەڵیانا ڕۆیشت کەلەلای ژوورەوە لەبەرابەری کەژی هندەوە بچنە ناوشـارەوە . لەکاتی خۆ ڕێکخستنیانا سعدی کـوڕی عبادە سەرۆکی کەرتی مەدینەیی وتی : ئەمڕۆ ڕۆژی گوشت خستنە ، ئەمڕۆ حورمەت ناهێڵـرێ ، ئەمڕۆ کەعبە ڕیسوا ئەکرێ . ئەم وتەیەی گەیشتەوە پێغەمبەرو زۆری پێ نـاخۆش بوو فەرمووی : نەء ، بەڵـــکو ئەمڕۆ کەعبە ڕێزی زیاتر ئەبێ‌و ئەمڕۆ خوا قووەیش گەورە ئەکا . وەداوای کرد ئالاکەیان لەسعد سەندەوەو دایـانە دەست قیسی کوڕی ( سعد ) کەهێمن‌و لەسەرخۆ بوو ، نەوەك بەوخەیاڵەوە بڕواو خوێن ڕێژی‌و تۆڵە سەندن بدا لەدەماخی‌و هەرا هەڵگیرسێنێ .

پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ لەسەراوردەوە چووە ناوشاری‌مەکەوە، وەهەموو کەرتەکانی تریش هەریەکە لەلای خۆیانەوە ڕژانە ناو شـارەوە هیچیان تووشی هەرا نەهاتن ، بێجگە لە ( خالد ) ی کوڕی (ولید) کەلە پێینەوە تێ‌ی هەڵکردو لەولایەوە کـۆمەڵێك لە قورەیش زیاتر لەهەمووان داخ لەدل بوون بۆپێغەمبەر وەئەوانە بوون کەهانی بنی بکـریان دا بەسەر خزاعەو پەیمانەکەی پێغەمبەریان هەڵ وەشاندەوە . لەگەڵ ( بنی بکر ) و هەندێ لە ( هزیل ) ئەمانە پێیان ناخۆش بۆو کەردن کەچـی بکەن بـۆ پێغەمبەر ، بەوپێ‌یە سوپای ئیسلام شاری مەکە بکرێ ، وەگوێ یان نەدا بانگ‌و هەراکەی أبوسفیان وبەسەرۆکایەتەتی (عکرمە) ی کوڕی (أبوجهل) و (سهیل) کوڕی عمرو صفوانی کوڕی أمیە لە ( خەندەقدا ) کۆبوونەوە بۆبەرەنگاری کردنی ئەم لەشکرەو نەیان ئەویست خـۆ بدەن بەدەستەوە . کاتێ خالدو کەرتەکەی خۆیان کوتا بۆناوشار کەوتنە تیرباران کردنیان ،

بەلام زۆری نەخایاند، خالد بەپەلامارێك بڵاوەی پێ کردن ، وەلەئەنجاما بیست‌و چوار لەبنی بکرو چوار لەهزیلیەکان کـوژران ، وەلەکەرتەکەی خالد دوومسولمان شەهید بوون ، کەرێکەیان هەلە کردبوو . بێجگە لەم لایەوە ئیتر جەنـگ‌و هەراو کوشتار نەکـرا وبەئاشتی‌و ئاسایش مەکەیان داگیر کرت .

پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - لەسەراوردەوە هاتە ناوشاری مەکەوە ، لەبەر شەرم لەخواو بۆگەردن کەچی ئەوەند سەری دانەواندبوو خەریك بوو سەری بدا لەسەر زینی وولاخەکەی ، وە أسامەی کوڕی زید لەپشتیەوە سواربووبوو ، وەلە (حجون) لەسەر تەپۆلکە بچکۆلەیەك چادرێکی بۆهەلدرابوو لەنزیك گۆڕی أبوطالب‌و خدیجەوە ، چوو لەوێدا کەمێـك حەسایەوە . ئەمەیش لەڕۆژی هەینی بیستەمی مانگـی رەمەزاندا بـوو . لەپاشان ھەلساو أبوبکر لەشانیەوە بوو ، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کەعبە ، بەسواری تەوافی کردو بەدارەکەی دەستی ڕاکێشا بۆلای بەردە ڕەشەکەوە کەحەوت جار گەڕانی بەدەوری کەعبەدا تەواوکرد ، وەستاو بینی سێ‌سەدو شەست بت وا لەدەوری کەعبە ، بەدار بەربووە سەرو گوێ لاکیانو ئەی فەرموو : « وَقُلْ جَاءَ الحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً » .

## لێ بووردن لەکاتی دەسەلات دا

پێغەمبەری خوا کەعبەی پاك کـردەوە لەبت و بت پەرستی لەمەکەدا ئەمەیش مانای وایە دەوری بت پەرستی لەنیوە دورگەدا ڕۆیی ، وەفەرمانی دا ( بلال ) چووە سەربانی کەعبەو بانگی دا بۆ نوێژ کردن ، وەخەلکی پۆل پۆل ئەهاتن‌و موسلمان ئەبوون ، پێغەمبەر لەزەمزەم ئاوی خواردەوە ولەلای جێگای ئیبراهیم دوورکات نوێژی کرد .

خەلکەکە بەموسلمانەکانو قورەیشە بت پەرستەکانـەوە سەرنجی ئەم فەرمانەدە گەورەیەو ئەم پێغەمبەرە دڵسۆزە ئەدەن ، ئایا چ فەرمانێك بدات بەرابەری ئەوقورەیشییانەی نزیکەی بیست ساڵە بوونە کۆسپ لەرێی بڵاوبوونەوەی بانگی خوادا وئازاری خۆیو ئەوموسلمانە راستەقینانە ئەدەن وچییان بۆکرابێ پێی هەڵساونو ئێستە وان لەژێـر فەرمانی ئەوا بەبێ هیچ جۆرە تواناو دەسەڵاتێك ؟ ئایا فەرمان ئەدا بەکوشتنیان ؟ یان لێیان ئەبووریو ئازادیان ئەکات ؟

بەڵام محمد پێغەمبەرە ، ئیشی ئەوراکەیاندنی ئیسلامەو شەیدای خوێن رێژی نیە حەز لەتۆڵە سەندن ناکاتو ، ئەیەوێ سەرزەوی پاك بکانەوە لە بت پەرستیو لەیاسای دەسکرد ، بۆیە لەم کاتە ناسکەدا وتارێکی شـیرینی بۆدانو باسی خوا ناسیو خوا پەرستی بۆکـردن ، ئنجا رووی کردە قورەیشییەکان وفەرمووی : ئەی گرۆهی قورەیش لاتان وایە چیتان لەگەڵا ئەکەم ؟ هەموو بەجارێ وتیان : برایەکی چاكو برازایەکی چاك بەتەماین چاکەمان لەگەڵا بکەیت ، فەرمووی : ( بڕۆن وا ئازادم کردن ) .

## پەیمان بەستنی مەکەیی

لەپاشا پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ لەسەر تەپی ( صفا ) دانیشتو مەکەییەکان هاتنو پەیمانیان دا بەپێغەمبەری خـــوا لەسەر ئیسلامەتیو بیستنو گوێ رایەڵی کردنی خواو پێغەمبەری خوا ، وەدەستی ئەخستە ناودەستی پیاوەکان لەپەیمان بەستنەکەدا .

## ئەوانەی فەرمانی کوشتنیان دەرکرا بوو :

لەکاتی ئازادکردنی مەکەییو ئەمان پێدانیانا چەند کەسێك جیا کرانەوە و فەرمانی کوشتنیان درا ، چونکە ئەوانە دەوری پیاوخراپی و

نالەباری‌یان بەجۆرێکی وابوو شایانی لێبوردن نەبوون ، لەگەڵ ئەوەیشا لە ئەنجاما هەندێکیان بەخشران بەڵام هەندێکیان لێ کوژرا .
بەخشراوەکان : ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبی‌سرح ) و کەنیزەکێکی ( عبدالله ) ی کوڕی ( خطل ) و ( عکرمە ) ی کوڕی ( أبی جهل )و ( هبار ) ی کوڕی ( أسود ) ( کعبی ) کوڕی ( زهیر ) و ( حارث ) ی کوڕی ( هشام ) و ( زهیر ) ی کوڕی ( أمیە ) ی ( مخزومی ) و ( صفوان ) ی کوڕی ( أمیە ) و ( وحشی ) کە ( حمزە ) ی شەهید کرد و ( سارە ) کەنیزەکی ( بنی‌المطلب ) و (هند ) ی ژنی (أبوسفیان) بوون .

وەکوژراوەکانیان : ( عبدالله ) ی کوڕی ( خطل ) و یەکێ لە کەنیزەکەکانی و ( حویرث ) ، کوڕی ( نفید ) و ( مقیس ) ی کوڕی ( حبابە ) بوون (۱)

## خالد و بنی جذیمە :

لەم کاتەدا پێغەمبەر ( خالد ) ی کوڕی ( ولید ) ی بەسێ‌سەد و پەنجاکەسەوە نارد بۆ ناو ( بنی‌جذیمە ) کە بانگیان بکات بۆسەر ئیسلام کە خالد بینیی چەکیان پێیە لێی‌پرسین : ئێوەچین ؟ وتیان : موسڵمانین نوێژو خواپەرستی‌ئەکەین و مزگەوتمان هەیە وتی : ئەو چەکە چی‌یە پێتان ؟ وتیان‌لەگەڵ فلانتیرەدا دوژمنایەتیمان هەیە . (خالد) وتی : تازە هەموولایەك موسڵمانن و دوژمنایەتی نەماوە چەکەکانتان دانێن ، هەموو چەکیان‌دانا ، کەچی خالد وتی : باڵیان بەستن بەدیل کراوی بڵاوی کردنەوە بەناو لەشکرەکەیا ، بەیانی جارێکی‌رادا وەلەجارەکەدا وشەیەکی

(۱) لە پاشکۆی ژیاندا بەدرێژی باسیان ئەکەین .

تیابوو ، دەس ئەدا بەگەرم کردنەوەی دیلەکان و دەسیش ئەدا بەکوشتنیان، کۆمەڵی ( بنی‌سلیم ) دیلی خۆیانیان کوشت ، بەڵام کوچەرو یـاریدەدەر نەیان کوشتن ، کە پێغەمبەر ئەمەی زانی وتی ( خوایە من دوورم لـەم ئیشەی خالد ) وە (علی) بەماڵێکی زۆرەوە نارد لەوێ خوێنی کوژراوەکانی دا و تالانەکەی بۆ بژاردن و چی‌مایەوە بڵاوی‌کردەوە بەناویانا و دلنەوایی کردن .

## جەنگی حونین

دوای گرتنی شـاری مەکە موسلمـانەکان لەمەکەدا دانیشتبون بە شادمانی و دڵخۆشی ، نزیکەی دووحەفتە پشوویـان‌داو لەم کاتەدا هەوال گەیشتە پێغەمبەر کەوا (هوازن‌و ثقیف) سوپایان کۆکردۆتەوە و ئەیانەوێ بدەن بەسەریانا ، وە دیـارە هۆی ئەمەش ئەوەبوو کاتێ پێغەمبەری خوا شاری مەکەی گرت و نـاوچەکەی لەبت‌و بت پەرســـتی پاك کردەوە ، سەرۆکی تیرەی هوازن‌و ثقیف مەترسییان لێ‌نیشت کەبچێتە سەرئەوانیش لەبەرئەوە بریاریان‌دا کە ئەمان دەست پێش‌بخەن‌و بچنە سەر ئەوهەردوو تیرە کە کۆبونەوە سەرۆکایەتیان دایەدەست ( مالیکی ) کوری ( عوف ) ( نزری ) کە کورێکی لێ‌هاتووبوو ، تەمەنی سی‌سـال بو ، وەبێجگە لە ( کعب ) و ( کلاب ) کەس لە هوازن بەجێ‌نەمـــا ، هەروەها تیرەی ( نضرو جشم ، و ( بنی‌سعد ) کوری ( بکر ) ئەوانەی کە پێغەمبەر بەشیری ئەوان‌ولەناویانا گەورەبوو ، وەکەلێ تیرەی تریش وە بریاریان‌دا کە کە ( مالك ) راوێژبکا بە دوریدی کوری سـیمەی سەرۆکی جوشەم‌کە بـاڵەوان‌و ئازاو بلیمەت و لێزان‌بوو بەڵام پیربووبوو تەمەنی لە دەوری سەدو بیست سـالیدابوو کوێربووبوو تەنیا مەکەرِای لێ‌وەربگیرایە ، وە

( کنانه ) ی کوڕی عبدوبالەیلیش سەرۆکی سـەقیقی یەکان بوو بەڵام فەرماندەیی کشتی درا بەمالـك و ئەویش داوای کرد کەژن و منال و ئاژەلیـان هەموو لەکەل خۆیانا بینن و هیچ بەجێ نەیەڵن ، ئەم تیرانە کۆبونەوە بەخۆیانو ژنو مال و منال و ئاژالیانەوە ڕژانە دەشتی ئەوتاس ( ناوی جێکەیەکە لەناوچەی هەوازن ) کە دورید ، کوێی لەدەنگی ژنو کریانی منالو بارەباری مالیاتەوە و زەڕەی کەرو دەنگی وشـتەرەوە بوو پرسی لە مالێك بۆچی لەکەل جەنك ئاوەرەکانا ئەمانەت هێناوە ؟ مالك وتی : هەتـا جەنکاوەرەکان ئازابنو چەنکی سەرو مالی بکەن وەبزانن ئەکەر تیاچوون سەرومالو ناموسیان تیانەچێ و ئیتر فیداکارانە ئەجەنکن دورەید وتی : هەڵەیت لە ڕاکانتـاو خراپت کردووە ، ئەمە شکاندنی لەشکرت لێ ناکێڕێتەوە ئەکەر سەرکەوتن بەدەست تۆوەبێ تەنیا سوود لە شمشێر بەدەست و تیر لەشان وەرئەکرێت ، وەئەکەر بەدەست دووژمنەوەبێ ئابڕووت ئەچێ بۆمالو مندالەکەت . لەکەل مالیکا لەسەر ئەمەئێك چوون و مالك وتی : تۆ لـە پیریدا خەرەفاوی وە هۆشـت لای خۆت نەماوە و نایزانی ، ئینجا خەلکەکەیش دوای مالك کەوتن و کوێیان نەدایەڕاکەی دورید ، وە ژمارەی لەشکرەکەی مالك سی هەزار وەهەندی ئەڵێن بیست هەزار جەنکاوەر بوون . مالك فەرمانیدا کە ئەم سـوپا کەورەیە بڕۆنە سەر تەپۆلکەی حونین ، وە تەنکە بەرایی شـیوی حونین بکرن و دەنك نەکەن لەکەلیانا هەتا ئەکەونە ناویان ، ئەبجار یەك جار هەلمەتیان بدەنێ وەك هەلمەتی پیاوێك بەلکو بەئاسانی بتوانین لەناویان بەرن و ، سوپاکەی بەم پێیە ڕیز کرد لەپێشەوە جەنك کەرو لەدوای ئەوانەوە ژن و منالو ئەبجار ئـاژەل و مـــال بۆئەوەی کەس ڕانەکات . وە موسلمـانەکانیش

بەسەرۆکایەتی پێغەمبەر ڕۆژی شەممەی شەشی مانگی شەشەڵانی ساڵی هەشتەمی کۆچی کەوتنەڕێ ، ژمارەیان دوانزە هەزار کەس بوو ، دەهەزاریان ئەوانەبوون هاتن مەکەیان گرتو دووهەزاریشیان مەکەیی‌یەکان بوون وەهەندێکیان وەکو صفوانی کوڕی أمیە هێشتا موسڵمان نەبووبوون .

بەڵێ موسڵمانەکان بەم سوپا گەورەیەوە کەهێشتا لەوناوچەیەداسوپای وا کۆنەبۆتەوە کەوتنە ڕێ ولەپێشەوە وشتر بەبارە ئازوخەوە ئەڕۆشتو هەرتیرەیەك ئاڵای خۆی هەڵگرتبوو ، لەبەر زۆرییان نەختێ هەواو ئارەزو تێکەڵ بەمێشکیان بوو هەتا ئەیان وت : ئەمڕۆ لەبەرزۆریمان ژێرناکەوین وەوا دیاربوو کەلەدڵیانا بڕیاریاندا بۆسەرکەوتن یارمەتی خوایان پەرداپوو بۆیە خوا ژێری کردن وبردنی‌یەوە سەر باوەڕەکەی خۆیان .

أبوداود ڕیوایەتی کردوە : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خواو وتی: لەلای ئێوەوە رۆیشتمو چوومە سەرفلانو فیسار کەسو بینیم هەوازین بە یەکجار بەژنو منالو ئاژاڵو ماڵیانەوە هاتوون وەلەحونێن کۆبونەتەوە . . پێغەمبەر زەردەخەنەیەك گرتی فەرمووی : ئەوە سبەینێ ئەبێتە تاڵانو دەست کەوتی موسڵمانان ئەگەر خوا ئارەزووی لێ بێ .

## دەست پێ کردنی جەنگ

لەتاریکایی بەیانیدا سوپا کەوتە ڕێو لوتی ناپەشێوی حونێنەوەو ئاگای لەوە نی‌یە دوژمن بەئاگاداري بۆی دامەزراوە ، سەنگەری لێ گرتووە کاتێ بەخۆیان زانی وەکو مالك فەرمانی دابوو بەیەکجار وەلەهەموو لایەکەوە تیرباران کرانو داگیران هەروەکو تەرزەو باران ، تیرئەباری بەسەریانا وهێشتا هەرتاریکیشە ، کۆمەڵی سوارە کەلەپێشەوەن سەریان لێ تێك چوو نەیان ئەزانی چی بکەنو هەربەیەکا ئەهاتن لەپاشا بەناچاری شکانو

گەڕانەوە بۆدواوە ، وەمەکەیی‌کان دوایان کەوتن وسوپاکە پەرێشان بوو
شکاو پشتی هەڵکرد ، دوژمن ئەمەی بەهەل زانی‌و کردی بەهەراو سەریان
کەوتن‌و بەوشێوەیە شکان کەس لەڕاکردنا سەر باوک‌و برای نەئەپەرژا ،
کەسەرۆکەکانی مەکە ئەم شکاندن‌و شپرزەیی‌یەیان دی (کفرە) کۆنەکەیان
جوولاو دلشاد بوون‌و کەوتنە دەربڕینی پێخۆشحالی لەناوخۆیانا ، ئەبوسفیان
بەزەردەخەنەی شادمانی‌یەوە وتی : تازە هەتا سەر دەریا خۆیان ناگرنەوە .

لەشکر بەم پێیە شپرزەبوو شکاو پێغەمبەر - د . خ - والەدواوە کە
ئەم شکانەی بینی زۆر ناڕەحەت بوو هاواری کرد : کوڕە ڕامەکەن وەرن
بۆلای من خۆتان بگرن من پێغەمبەری خوام من محمدی کوڕی عبداللهم ،
وەئاوزەنگی ئەدا لەئێسترەکەی ڕووبەسوپای دوژمن ئەی‌کوتاو ئەی‌فەرموو:
من پێغەمبەرم‌و ڕاستم‌و درۆ نیم ، وەئەوانەی کەلەگەڵ پێغەمبەرا مابوونە
وەو ڕایان نەکردبوو خۆیانیان گرتبو وەشپرزە نەبووبوون چەند کەسێک
بوون لەکۆچەری‌یەکان‌و یاریدەدەرەکان کەژمارەیان نەئەگەیشتە سەد کەس ،
بەڵێ سوپاکەی پێغەمبەر بەهۆی هەندێ لەناکارامەکانەوە وە بەهۆی پالفتە
نەکراوەکانەوە بەوپێیە سەری لێ‌شێواو هەرچی پێغەمبەر بانگی ئەکردن
گوێیان لێ‌نەبوو ، هوازینش کەئەم سەرکەوتنەیان بینی لە جێگەی خۆیانەوە
هەڵسان‌و پیاوێکی بلیمەت بەسەر وشترێکی سوورەوە وبە ئالایەکی ڕەشەوە
کەوتۆتە پێشیانەوە ورمێکی درێژی وابەدەستەوە ئەگاتە هەر موسڵمانێک
تێی ئەسروێنێ سوپاکەش یەکسەر بەدوایەوە ئەکشێن ، پێغەمبەری خوا
کەئەم دیمەنەی دی ناڕەحەت بوو کوتایە بن‌دەست وولاخەکەی کەبچێتە
سەری بەلام‌عباسی‌مامی‌و فضل‌ئامۆزای تەنگەی ولاخەکەیان گرت‌و نەیان
هێشت جوولە بکا .

ئەنجا پێغەمبەر - د.خ - فەرمووی بەعباسی مامی کە پیـــاوێکی دەنگ گەورەبوو : ئادەی بەهەمو دەنگـتەوە بانگی موسلمانەکان بکە کە بێنەوەو بگەڕێنەوە عباسیش بانگی کرد : ئەی مسلمانەکان ئەی خاوەنەکانی پەیمانی ( عقبە ) ئەی پەیمان دەرەکانی داری ڕەزامەندی لەحودیبییـەدا بگەڕێنەوە بۆلای پێغەمبەری خوا - د.خ - دەنگی عباس دۆڵەکەی پڕ کردو هەمو موسلمانان بەیاریدە دەرو کۆچەری یەوە بیستیان‌و هەموو وتیان: لبیك ، هەموو گوێ ڕایەڵ‌و فەرمان بەری تۆیـن ئەی پێغەمبەری خوا وە هەموو کەگوێیان لەم بانگە بوو بەجارێ هۆشیان هاتەوە بەرخۆیان‌و بیریان کردەوە و شەرمەزار بوون بەیەك گەڕەت گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ( د . خ ) خوای گەورە هێمنی خستە دلیـانەوە و بەتەواوی هاتنەوەسەر خویان ، ئەنجار پێغەمبەر فەرمانیدا کە پەلامارێکی ڕاستیان لێبدەن موسلمانەکان بەباوەڕی پتەوەوە هەلگەڕانەوە سەر دوژمن ، پەلاماریان‌دانێ و جەنگ گەرم بوو ، عـلی و یاریدە دەرێك پەلاماری ئاڵابەدەستەکەیـان داو علی شێمشێرێکی‌دا لە قاچی وشترەکەی و خـتی ، یـــاریدەدەرەکەی لێیداو کوشتی ، پێغەمبەر فەرمووی ئێستە جەنگ گەرم بوو ، داوای کرد لەعباس‌و چنگێ وردە بەردی دایەو پژانی بەچڕوچاوی دوژمندا و فەرمووی ئێستە جەنگ گەرم بوو ، داوای کرد لە عباس و چنگی وردەبەردی‌دایە و پژانی بەچڕوچاوی دوژمنەوە فەرمووی : ئەوڕووانە ڕەش‌بون وشکان . لەپاش تێك‌ڕژانی گەورەو تاوسەندنی شەڕ لە نێوانیانـــا ، دوژمن پشتی هەلکرد و شکاو ڕای کرد ، بەڕەنگێ لە خۆیـــان پێ‌نەگیرایەوە و نەیان‌پەرژایە سەر ژن‌و منداڵ‌و ئاژاڵ و ماڵیان ، بەتەنهـا خۆیان بەسەلێ هەلاتن ، موسلمانەکان کەوتنەسەریان و فراندنیان کۆمەڵێکیان لەناوچەی

( ئەوتاسا ) خۆیـان پەنادابوو ، پێغەمبەر أبوعامیری أشعری نارد بۆیان ، وە لەگەڵیانا بەجەنگەهات هەتا شهید کرا ، پاشان أبو مووسـا پەلاماری دان هەتا ئەوی کوژراو ئەوی رای‌کرد رای‌کرد ، مالکی کوڕی عوف لەگەڵ هندێ لە پیاوەکانیا رای‌کرد بۆ تـائف ، وەپیاوێك سـەری کە کەژاوەیەکی لاداوایان زانی ژنە ، کەئەبینێ درەیدە دەست‌بەجێ کوشتیان ئەبجار موسلمانەکان کەوتنە کۆکردنەوەی تالآن‌و بەجێ‌ماوی دووژمنەکانیان بێجگە لە دیل شەش هەزار ژن‌و بیست و چوار هەزار ووشترو زیاتر لە چل هەزار سەر مەڕوو چوار هەزار هۆقە زیو و کەڵێ‌شتی‌تریش ، وەبەم شێوەیە وە لـە سـایەی یارمەتی خوای گەورەو خۆگرتن و دامەزراوی پێغەمبەرەوە موسلمانەکان سەرکەوتن و زال‌بوون ، ئەو هەموو تالآنی‌یەیان بەدەست هێنا ، لەم ڕووەوە ئەم ئایەنانەی خوارەوە یان بۆ هاتەخوارەوە [ لقد نصركم الله فى مواطن كثيرة و يوم حنين إذ أعجبتكم كثرتكم فلم تغن عنكم شيئاً و ضـاقت عليكم الأرض بمارحبت ثم‌وليتم مدبرين ثم‌أنزالله سكينة على رسوله وعلى المؤمنين وأنزل جنوداً لم‌تروها وغذب‌الذين كفروا وذالك جزاء الكافرين .

بەڵێ سوپاس بۆخوا موسلمـانەکان لەپاش سـەرلێ‌شێوانێکی کەم بەوپێیە سەرکەوتن و زال‌بوون ، وە بەم سەرکەوتنەش زیاتر جێگـای خۆیـان کردەوە لە ناوچە کەدا ، خەڵك بەزۆر یـابە خواهیشت وەیا لەترسان پەنایان ئەهێناو موسلمان ئەبوون ، بەڵێ موسلمانەکان زۆر دڵشاد بوون و بەتەمای ئەوەبوون کە تالآنی‌یەکە دابەش‌بکەن ، بەلآم پێغەمبەری خوا (د . خ) زیاتر لەوان قوڵتر بیری ئەکردەوە ، ئەیویست ئەم‌تالآنی‌یە ببێتە هۆی‌موسلمان‌بوونی ئەوتیرانە ، بۆیە تالآنی‌یەکەی بەش‌نەکردو فەرمانی‌دا

بچێتە سـەر طـایف ، چونکە سوپاکە لە طائفا خۆیان شـاردبووەوە

## ئابلۆقەی طائف

پێغەمبەری خوا ( د . خ ) فەرمانی دا سوپاکە کەوتنەڕێ بەرەو طائف کەلەشکری هوازین و ثقیف خۆیان شاردبووەوە ، خالید بەکۆمەڵێ سوارەوە لەپێشەوە ڕۆیشتن لەڕێکـادا بەلای قەڵای ( مالك ) ی کوڕی (عوفا) تێپەڕین فەرمانیدا بە ڕووخاندنی و ڕوخاندیان ، طایف شارێکی قایم‌بوو چواردەوری شوراپوو ، بێجگە لەچەند دەرکایەك ڕێگای‌تری‌نەبوو ، دانیشتووەکانی دەوڵەمەند بوون و قەڵاکەیان قایم کردبوو ، لـە جەنگ و ئابلۆقەدا شارەزاییان هەبوو ، موسڵمـانەکان گەیشتنە بەرەوە و ئەوانیش زانیانو چوونە ناو قەڵاکەیانەوە و خۆیان قایم کرد ، فەرمانی‌دا سوپای موسڵمان لەنزیك قەڵاکەوە هەڵی‌دا وەخاوەن ڕاوێژەکانی کوکردەوە بزانێ چی‌بکەن ؟ بەڵام طایفی‌یەکان سەرئەوەیـان نەهێشتن ، دەستیـان کرد بە تیرەبارانیان کومەڵێکیان لێ‌کوشتن و هەندێکیشیان لێ‌بریندارکردن ، لەوانە عبداللەی کوڕی ابوبکر بوو کە برینەکەی چاك نەبووەوە و ئەهاتەسـەو تادرێژەی کێشاو پێی‌مرد ، وە چاوێکی ابوسفیان کوێربوو ، وە لەجەنگی یەرموکا چاوە کەی تریش کوێربوو ، هانی موسڵمانەکانی ئەدا بۆجەنگاندن لەگەل ڕۆما ، وە کوژراوەکان چواردەکەس یازیاتربوون . موسڵمـانەکان چی‌بکەن ؟ خۆڕێکانی‌یە بچنە ناو قەڵاکانیانەوەو ، ئامێری واشیان پێ‌نی‌یە کە قەڵاکانیان پێ‌بڕوخێنن ، لەوانەشە ئەم ئابلۆقەیە درێژە بکێشێ ، کەوانە چاکتر وایە دوور بکەونەوە بەڕادەیەك تیریان نەگاتێ ، لەبەرئەمە پێغەمبەر فەرمانی‌دا سوپاکەیان دوورخستەوەو دووچادریان بۆ دووخێزانەکەی پێغەمبەر هەڵدا ، سوپاکایەکیان دروست کرد لەوشوێنەی کە لە پاشان

مزگەوتی طایفی تێدا دروست کرا ، موسلمـانەکان مانەوە لەوێـدا بزانن خوا چی لە چارەیان نوسیوە ، ماوەیەك بە بێ سوود لەوێ مانەوە ، لەپاشان پێغەمبەر ڕاوێژی کرد بە ( نوفلی ) کوڕی ( معاویە ) کەچی بـکات ؟ ( نوفل ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە وەکو ڕێوی چوونەتە کـونەوە ئەگەر بەدیاریانەوە بمێنیەوە ئەیانگرین ، وەئەگەروازیان لێ بـێنن زیانت پێناگەیەنن ، بەڵام پێغەمبـەری خوا ـ درودی لەسـەربێ ـ نەی وبست هەروا بەخۆڕایی بەجێیان بێڵێتو ، هیچیـان لێنەکا ، ( بنی‌دوس ) کە تیرەیەك بوون لەخواری مکەوە دائەنیشتن شارەزاییان هەبوو لەمەنجەنیق کاری و قەڵا ڕووخـاندندا ، یەکێ لەپیاوە گەورەکانیان کەناوی طفیل‌بوو وەلەکاتی جەنگی خەیبەردا لەگەڵ پێغەمبەردابوو ، پێغەمبەر ناردی بۆلای خزمەکانی کەبێن یارمەتیان بدەن ، ئەویش کۆمەڵێکی لێهێنان بەتفاقەوە ، موسلمانەکان مەنجەنیقو دەبابـەیان دابەست لەقەڵاکانو لەژێر دەبابەکانـا کۆمەڵێکیان ڕۆین کەقەڵاکان بڕوخێنن ، طایفی‌یەکان هەستیان بەمەترسی‌یە کرد وبۆئەمەش چارەیان ئەزانی ، هاتن چەند پارچە ئاسنی گەورەیان بەئاگر سوورکردەوە وەفڕێیان دانە سەر دەبابەکان سووتاندنیان وموسلمانە کان لەترسی ئاگرەکە ڕایان کردو ئەمەش سوودی نەبوو .

ڕۆژێ خالید بانگی کرد کەبێنـە دەرەوە بۆ زۆران بازیو مەیدان نانەوە ، عبدویالەیلی سەرۆکی ثقیف وەڵامی دایـەوە : کەسمان نایەینـە دەرەوە خۆراكو ئازوخەی چەند ساڵەمان هێناوەتە ژوورەوە ، ئەمجاپێغەمبەر فەرمانیدا پەبڕینی باخەکانیان بەخورماو مێوەوە ، موسلمانەکان کەوتنە بڕین وداپاچینیان ، ئەوانیش بانگیان کرد بیکەن بەخاتری خوا مەیان بڕن ، پێغەمبەریش فەرمووی : مەیـــان بڕن ، پاشـان پێغەمبەر فەرمـانیدا

بانگەوازیان کرد کەهەرکەس بێتە دەرەوە بۆناویان ئازادبێ ، نزیکەی بیست کەسیان هاتنە دەرەوەو ڕایان کرد بۆلایان ، ئنجا بەهۆی ئەمانەوەپێغەمبەر زانی کەئازوخەی زۆریان پێیەو ئەم ئابلوقەیەش درێـژە ئەکێشێ ، وەلە لایەکی ترەوە بەچاوی جوولەکەکان سەیری ئەمانی نەئەکرد ، بەتەما بوو کەڕۆژێ لەڕۆژان ئەمانە لەسەر داری شەیتـان بێنە خوارەوە وموسڵمان ببن ، وەهەستیشی ئەکرد زۆر لەسوپاکەی حەز لەگەڕانەوە ئەکەن ، وە هەروەها بێجگە لەمانەش مانگە قەدەغەکانیش هاتنیان نزیك بووبووەوە ، لەبەرئەمانە هەمووی پێغەمبەر فەرمانی دا بەبارکردنو بەجێهێڵانی طایف فەرمووی خوایە ڕێ نموویی ثقیف بکەو بەموسڵمانی بیان نێرە بۆلام . وە ئابلوقەکەیان ١٨ ڕۆژی خـــایاند ، لەپاشان زۆری نەبرد نوێنەریان نارده خزمەتی پێغەمبەرو ئیسلام بوونیان دەربڕیو نزاکەی گیرابوو .

## گەڕانەوەی سوپاو دابەش کردنی تالانی

لەسەرەتای مانگی ذی‌القعدەدابوو پێغەمبەرو سوپا گەورەکەی گەڕانەوە ، تازە موسڵمانەکانو بیابان نشینەکانو ئەوانەی کەهێشتا باوەڕی ئیسلامەتی دڵو دەرونی داگیر نەکردبوون بێ‌تاقەتی ماڵو تالانیان ئەکرد پێغەمبەریان پێچا بۆدابەش کردنی ، بەڵام پێغەمبەر بەدەوری خۆی هەرئەیویست دوای بخا ، بەلکو خاوەنەکانیان بێن بەشوێنیاو ئەوهاتنەیان ببێتە هۆی موسڵمان بوونیان ، بەڵام ئەمان تاقەتیان نەکرت ، ئنجا پێغەمبەر تالانەکەی دابەش کرد بەسەریانا ، لەم تالانی‌یەدا بەشـــی یاریدەدەرەکانی نەدا ئەوانیش کەوتنە گلەیی ، بەڵام پێغەمبەر بەحیکمەت ڕازی کردن .

ئەنجا دەستی کرد بەدابەش کردنی تالانی‌یەکەو لەپێشەوە دەستی کرد بەسەرۆکە قورەیشیەکانو بیابانی‌یەکان ، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر

بێ - ویستی بەخشێکی وایان بداتێ کەلەسەرموسڵمانێتی جێگیر بێ و دڵیان دابمەزرێ ، وەئەمانە ناوبران بە ( مؤلفة القلوب ) .

## نوێنەری هەوازین هاتن بۆلای پێغەمبەر :

لەدوای دابەش کردنی تالآن کۆمەڵێ هەوازین هاتن بۆلای پێغەمبەری خواو موسڵمان بوون ، پێغەمبەریش زۆر بەخۆشی یەوە چووبە دەمیانەوە و خۆش هـاتنێکی گەرمی لێ کردن ، لەپاشان زهێری کوڕی صرد کەوتە دواندن لە خزمەتیاووتی : ئەی پێغەمبەری خوا لەناو ئەو دیلانەدایە پوورو خزم و هەندێ لەوانەی کە بۆمـاوەیەك تۆیان لەبـاوەش گرتووەو بەخێویان کردویت ، وەئەگەر ئێمە شیرمان بدایە بە حاریسی کوڕی ( أبی شیمر ) یان بەنعمانی کوڕی منذروە لەپاشان وەکو تۆ دەستی برۆشتایە بەسەرمانا بەتەمای سۆزو لێبوردنی ئەبووین چەجای تۆ کەلە هەموو کەس بەزییت زیاترە و بەسۆزتر و چاکتری .

وە ئەم بیرخستنەوەو سۆز بزواندنە ڕاست بوو خزم و خوێشی پێغبەربوون بەهۆی شیرەوە . لەناو دیلەکانا ئافرەتێکی تیابوو سـەربازەکان وەکو یەکێ لـە دیلەکان لەگەڵیـا ئەجوڵانەوە ، ئەویش بەڕابینینیکەوە بەخۆیا وتی : بزانن کە من خوشکی شیری هاوڕێکەتانم ئەوانیش باوەڕیان پێ نەکردوو هێنایان بۆلای پێغەمبەر کە تەماشای کرد ئەمە شیمائەی کچی حـاریسەو خوشکێتی ، بانگی کردەلای خۆی و وە عەباکەی خۆی بۆداخست و داینا لەسەری و ڕێزی لێ گرت ، پێی فەرموو : بەئارەزووی خۆت پێت خۆشە بەڕێزەوە بتهێڵمەوە لای خۆم وە خزمەتت بکەم ، یائەتەوێ بتنێرمەوە شوێن و جێگـای خۆت ؟ ئەویش سوپـاسی کردو چوونەوەی لای خۆیـانی هەڵبژارد ، پێغەمبەریش بەڕێزەوە ناردی یەوە . کەزهێر ئەوقسانەی کرد

پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ بەپێخۆش بوونێکەوە فەرمووی : ئێوە ئەبینن چیم لـەگەڵایەو منیش قسـەی ڕاست و بێ پێچ‌وپەنام پێخۆشە ، ئایـا ئەتانەوێ ژن و منداڵەکانتان بدینەوە یـــان مال و سامانەکەتان ؟ وتیان هیچ شتی بەناموس نـاگۆڕینەوە ژن و منداڵەکانمـان بدەنەوە . پێغەمبەر فەرمووی : ئەوەی بەشی خۆم و بەشی بنی عبدالمطلب‌بێ بۆخۆتان ، وە بۆ ئەوانی‌تریش کە نوێژی نیوەڕۆمان کرد بەکۆمەڵ ئێوە هەڵســـن و ئەم داوایەتان بکەن . من ئەوی خۆمتـان ئەدەمەوە وە تکایشیتان بۆئەوانی‌تر بۆئەکەم .

بەڵێ کۆمەڵەکەی هوازین ئەم ڕاویژەیان بەجێ‌هێنا و لەکاتی نوێژدا وتیان : پێغەمبەری خوا ئەکەین بەتکاکار بۆلای موسلمانان وە موسلمانان بۆلای پێغەمبەر کە ژن‌و منداڵەکانمان بدەنەوە پێغەمبەریش هەڵساو فەرمووی : ئەوەی لای من‌و لای بنی عبدالمطلبە ئەوا دامنەوە وە ، ئەمجار ڕووی‌کردە موسلمانەکان و سوپاسی‌خوای کردوو فەرمووی : موسلمانەکان ئەم برایەتان بە پەشیمانی‌و بەموسلمانی هاتوون و داوای ژن‌و منداڵەکانیانتان لێ‌ئەکەن ، وەمنیش پێم‌خۆشە بیاندرێتەوە ، جا هەرکەس بەدڵ پێی‌خۆشە بیان‌داتەوە ، و هەرکەسیش حەزئەکات بەقەرز بیاندەن بەمن هەتا لەیەکەم دەسـت کەوتا من تۆڵەی بۆبکەمەوە . خێرا کۆچەری‌یەکان هەڵسـان و وتیـان : بەڵێ ئێمە بەدڵ پێمان خۆشەو ئەمجار ئەوانی‌تر هەرکەس ڕاست‌بووەوە و وتی : ئێمەش پێمـان خۆشە پێغەمبەر فەرمووی : بەوپێیە تێ‌نـاگەم کێ ڕازی‌یەو کێ‌ڕازی‌نی‌یە هەر کۆمەڵە لێ‌پرسـراوێکیان بێت‌و تێم‌بگەیەنێ خەڵکی هەموو چوونەوە جێگای خۆیـــان وەلێ‌پرسراوی هەرلایەك ڕای کۆمەڵی خۆی هێناو هاتنەوە خزمەتی پێغەمبەرو هەموڕازی‌بوون بەدانەوەیان

بێجگە لە قرعی کوڕی حابس وە عیینەی کوڕی جمین و عباس کوڕی مرداس ، ئەمانە نەیاندایەوە بەڵام کۆمەڵی بنی سلیم خزمەکانی عبـــاس کوێیان نەدایە عباسو دایــانەوە ، ئەوانی تریش پێغەمبەر بەقەرز لێیوەرگرتنەوە و هەموویـانی دایەوە بەکۆمەڵەکەی هوازین ، بەڵام خاو خێزانەکەی مالکی کوری عوف گلدایەوە . ئەوانیش وتیان جاخۆ ئەوانە گەورەو ســەرۆکـمـانن و چۆن بەبێ ئەوان ئێمە بڕۆینەوە . پێغەمبەر فەرمووی : شـــتیباشم ئەوێ بۆیان ، وەدانیە دەســـتی دایکی عبداللەی کوڕی ( أمیە ) کە پوریـانبوو ، پێغەمبەر هەواڵی مـالکی لێپرسین و ئەوانیش وتیان : لەوڕۆژەوە رای کردووە بۆ تـایف بۆ نـاو ثقفییەکان و فەرموی : پێی بڵێن : ئەگەر بەموسلمانی بێت بۆلام ماڵ و خێزانەکەی ئەدەمەوە سەد وشتریشی خەڵات ئەکەم ،کە مالك بەم بڵێنەی زانی بەدزییەوە قەڵای طـــایفی بەجێهێشت و هات بۆلای پێغەمبەرو موسلمان بوو ، پێغەمبەریش لەسەر بەڵێنەکەی خۆی خاو خێزانەکەی دایەوەو سەدوشتریشی بەخشیش دایە وەکردی بەسەرۆکی موسلمانەکانی هوازین .

## عومرە کردن و گەڕانەوە بۆ مەدینە :

پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ لەگەل موسلمانەکان بە بۆنەی ئیش و کارەوە سیانزە ڕۆژ لە جیعرانە مانەوە کە لێبونەوە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە ، وەلەپێش گەڕانەوەیاندا ویستی بچێ عومرەیەك بکا لەمەکەدا وەلە جیعرانەوە ئیحرامی عومرەی بەســـت و چووە مەکەوە و بەدەوری کەعبەدا گەڕا و ئادابی عومرەی بەجێهێنا و هاتەوە بۆ جیعرانەو وە پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ معـازی کوڕی جبلی دانا لەمەکـە فێری ئیسلامەتییـان بکات و ( عتـابی ) کوڕی ( أسیدیش ) ی کرد بە کار

بەدەستی مەکە .

ئەمجار پێغەمبەری خوا فەرمانیدا باریان کردو هاتنەوە بۆ مدینە بەدلشادی و خۆشی‌وشادمانی‌یەوە لە مانگی ذی‌القعدە سێ‌ڕۆژی مابوو گەیشتنەوە مدینە .

## ئەنجامی ئەم جەنگانە

پێغەمبەرو موسلمانەکان پاش داگیرکردنی شاری ( مکە ) و جەنگی ( حنین ) لەگەڵ ( هوازین و طائف ) دا هاتنەوە بۆ شاری مدینە ئەم سەفەرە پڕ لە سوودەیان بوو بەهۆی ڕووخاندنی قەڵای کفرو شکاندنی پەیکەری بت‌پەرستی‌و بڵاوکردنەوەی بانگی پیرۆزی ئیسلامەتی بەبێ‌ترس‌و بەرهەڵستی لە نیەدورگەی عەرەب و دەوروبەریا . ناوچەکە ڕوون‌بووەوەیە چرای بیروباوەڕەکانی ئیسلام ، پێغەمبەری خوا - د . خ - ئەم‌هەلکەوتەی بەهەل‌زانی و کەوتە ناردنی سەربەو بانگ‌کەران بەم‌لاولادا هەروەکو نوێنەری تیرەو خێڵەکان ووردەووردە ئەهاتن بۆ خزمەتی‌و ئیسلام ئەبوون و گەردن کچی‌یان دەر ئەبڕی ، وە لەم جەنگانەدا شێوەی بانگردن گۆڕاو کەوتە پەل‌هاویشتن .

وسریەو نوێنەر ناردن بەم‌لاولادا

کەپێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - هاتەوە مەدینە ( قیس ) ی کوڕی ( عبادە ) ی لەگەڵ چوار سوارا نارد بۆناوچەی یەمەن بۆ بانگ کردنی تیرەی (صداء ) بۆسەر ئیسلام ، وە بەهۆی ( زیاد ) ی کوڕی ( حارث ) ەوە کەهاتە خزمەتی پێغەمبەرو دەسەبەربوو کەخزمەکانی بانگ بکا بۆسەر ئیسلام هەموویان موسڵمان بوون وکەلێکیان هاتن بۆخزمەتی پێغەمبەر .

هەواڵ هات بۆ پێغەمبەر کە ( بنوتیم ) ئاژاڵی زەکاتی هۆزی (خزاعە) یان بەتاڵانی بردووە ، ئەمیش ( عیینە ) ی کوڕی (حصنی فزاری) لەگەڵ پەنجا سواری بیابانی‌دا نارد بۆیان ، لەناکاوا دایان بەسەریانا ئاژاڵەکەیان هێناوە لەگەڵ بەدیل گرتنی پانزە پیاوو بیست‌و یەك ژن‌و مناڵدا وهاتنەوە بۆ مەدینە .

ئنجا ( بنوتیم ) ی ناچار بوون حەفتا یا هەشتا کەسیان هاتن بەشوێن دیلەکانا . وەلەدەوری ماڵی پێغەمبەرا بەزین‌و چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەیان ئەکرد ، دوای ئەختێك بەدەنگی بەرز کەوتنە بانگ کردنی پێغەمبەری خوا ، پێغەمبەریش ئەم شێوازەی بەلاوە ناشیرین بوو هاتە دەرەوەو کەوتنە دوانەن لەگەڵیانا وبەهونەر و هۆنراوەو شانازی ئەدوان ، دوایی پێغەمبەر بانگی‌کردن بۆئیسلام‌و موسڵمان بوون وماوەیەك هێشتنیەوە تا فێری ئیسلام وقورئان بن‌و دیلەکانی دانەوە . ئنجا لەم ڕووەوە ئەم ئایەتانە هـــاتنە خوارەوە : ( إن الذين ينادونك من وراء الحجرات أكثرهم لايعقلون ، ولو أنهم صبروا حتى تخرج إليهم والله غفوررحيم ) . وە (ولید ) ی کوڕی (عقبە) ی نارد بۆوەرگرتنی زەکاتی ( بنوالمصطلق ) ئەوانیش هاتن بەپێش وازی نێرراوی پێغەمبەرەوە ، (ولیـد ) یش لەبەر ناحەزی‌یەکی کۆنی لەگەڵیانا وای زانی بۆکوشتنی هـاتوون ، بۆیە گەڕایەوەو وتی : پەشیمان بوونەوە لەئیسلام‌و زەکات نادەن پێغەمبەر ـ درودی لەسەربێ ـ (خالد)ی ناردە سەریان‌و ئەویش بەنهێنی چوو دەوری گرتن ، کەچی ئەبینێ بەیانی بانگیان‌داو نوێژیان کرد و چووە ناویان و زۆر موسڵمان‌و خاوێن بوون ، خالد ئەم هەواڵەی دایەوەپێغەمبەر و ئەویش (عبادە ) ی کوڕی (بشر)ی نارد و زەکاتەکەی لێ‌وەرگرتن و باشتر فێری ئیسلامەتی کردن . وە لەم

بارەیەشەوە ئەم ئایەتەیان بۆهات : [ ياأيهاالذين آمنوا إن جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا أن تصيبوا قوما بجهالة فتصبحوا على مافعلتم نادمين ] .

وەلەم ماوەیەدا (زینب)ی کچی پێغەمبەر کۆچی‌دوایی کرد لەئەنجامی ئێش‌و ئازارێکەوە کە لەرێی کۆچ‌کردنا تووشی هات و درێژەی کێشا هەتا کوشتی .وەلەم ماوەیەدا خوا کوڕێکی پێ‌بەخشی .

## لە دایك بوونی ابراهیم

لەپێشەوە زانیمان کە ـ مقوقس ـ گەورەی رۆم لەناو دیاری‌یەکەدا کەنیزەکێکی تێدابوو ناوی ماریەبوو موسلمان‌بوو پێغەمبەر مارەی کرد . بەلام ژووری دانیشتنی تـایبەتی نەبوو وەکو خێزانەکانی تری بەلکو لەسـەراووردی شاری مدینەوە لەلای باخەرەزێکا لەگەل کەنیزەکەکانی ترادای‌نابوو، جاربەجار سەری لێ‌ئەدا . ( ماریە ) سکی پڕبوو وەلەم‌کاتە دلناڕەحەتیەی پێغەمبەردا بەهۆی مردنی زینبەوە خوای گەورە دلشـادی کرد بەخەلاتێکی گەورەو شیرین ئەویش ئەوەبوو کە ( ماریە ) کوڕێکی بوو لە کۆتـایی سـالی هەشتەمـا ، پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ زۆر پێ‌خۆشحال بووکە نیزەکێکی بەبەخشیش‌دا بە(أبورافع) کە ئەم مژدەیەی دایە و فەرمووی : پەیابونی منـال ئەبێتە هۆی ئازادبوونی دایکەکەی لە رۆژی حەوتەمیا سەریان تاشی و تووکەکەیان هەلکیشـا بەزیوداو بەخشیانەوە بە هەژاران‌داو خەتەنەیان کرد و بەرانێکیان کرد بە حەوتەم بۆی ، لەخۆشی باپیرەگەورەیەوە ناویان‌نا إبراهیم .

## ( سالی نۆیەم ) سریەی علی کوڕی (ابی‌طالب)

لەمانگی ربيع‌الأول سالی نۆیەمی کۆچی پێغەمبەری خوا ـ د.خ ـ ( علی ) کوڕی ( أبوطالب ) ی نارد لەگەل سـەدوپەنجا کەساو سەد

وشترو پەنجا ئەسپیان پێبوو تالآیەکی سپی و بەیداخێکی رەشیان هەلگرت و چون بۆ روخـاندن و شکاندنی ـ قلس ـ کە بتی تیرەی ( طی ) بوو شەبەیخونیان بۆکردوو دایان بەسەریانا و شکاندنیان و بتەکەیان سووتان و تیرەی ( طی ) شکان ، ئەمانیش ئاژاڵو پاتاڵەکانیان هێنـــاو کەلێ ژن و منداڵیشیان لێبەدیل گرتن و هاتنەوە بۆ مدینە ، کە هاتنەوە مدینە لەناو دیلەکانا کچێکی حاتەمی طی بەناوبانگ یان تیابوو ناوی ( سیفانە ) بوو پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ لەسەربێ بەلایاناتێپەری و ( سیفانە ) بانگی کردو ناونیشانی خۆیی بۆ هەڵداو داوای لێ بوردنی لێکرد پێغەمبەریش ئازادی کرد ، ئنجا سیفانە وتی : تیرەکەم ئازاد نەکەی منیش ئـازادی قبول ناکەم ، پێغەمبەریش ( د . خ ) هەموو دیلەکانی خزمی ئازادکرد و سیفانەش موسلمان بوو ، پێغەمبەریش نـــاردنیەوە بۆ ولآتی خۆیان ، ئنجا تیرەی ( طی ) هەموو هاتن و موسلمان بوون .

## گەرانەوەی ) عدی ) و موسلمان بوونی :

عەدی کوری حاتەمی طائی گاوور بوو زۆر رقی لەپێغەمبەر بوو ، کاتێ کە علی هات و بتەکەی ( طی ) روخاندو تالآنی کردن بەخۆیو مـاڵ و منداڵییەوە هەلات و رای کرد و چو بۆ شام کە خوشکەکەی گـیرا و پاشان پێغەمبەر ـ د . خ ـ بەرەلای کردو بەرێزەوە ناردیەوە بۆ شـام ( سیفانە ) چووەلای عدی برایو سەرگوزەشتەکەی بۆ گێرایەوە وە زۆر سەنای پێغەمبەری بۆکرد ، وتی : باشە تۆ رات چییە ؟ سیفانە وتی : من راموایە تۆ بەخێرایی برۆیت بۆلای ئەگەر پێغەمبەربێ هەتا زووبچیت بۆلای باشترە وەئەگەر پاشایش بێ تۆخۆت لەنـاو تیرەکەی خۆتـا بەرێز ئەژیت ، عدی کەوتە رێ بۆمدینە کە گەیشتە ئەوێ پێغەمبەر پێیگەیی

والێی پرسی : تۆ کێیت ؟ ئەویش وتی عدی کوڕی حـــاتەمی طائی ، پێغەمبەر دەستی گرت و بردیەوە بۆ مـالی خۆیان لە ڕێگادا پێکەوە پیرەژنێکیان پێگەیشت و پێغەمبەری وەستان و بەدرێژی بـاسی ئیش و کاری خۆی بۆ کرد ، پێغەمبەریش گوێی بۆگرت و ، لەپاشان پیرەژنەکە ڕۆیی‌و ( عدی ) لیرەدا وتی : بەخوا ئەمە ئیشی پاشایان نی‌یە ، ئەمجار ڕۆیشتن تا چوونە مالەوە پارچە ژێرە خەرێــك بوو کەپێغەمبەر خۆی لەسەری دائەنیشت دای بەعدی لەسەری دانیشێ عـدی وتی نەء . خۆت لەسەری دانیشە بەلاّم وەری نەگرت وهەردای بەعدی کەلەسەری دانیشێ ئەمجار فەرمووی : ئەی عدی موسلمان بیە لەهەموو شتێ پارێزراو ئەبی وەبەشێوەیەکی وردو جوان لەگەلّیا دواو باسی ئیسلامی بۆکرد وەقورئانی بۆخوێندەوە ڕاستی تێگەیاندو ئنجا عدی موسلمان بوو .

## ئالۆزی ناو خێزانی پێغەمبەر

لەسالی نۆیەمی کۆچی‌دا ئاژاوەیەکی ئابووری کەوتە نێوانی خێزانەکەی پێغەمبەرەوە ، خێزانەکانی پێغەمبەر زانی‌یان پێغەمبەر دەست کەوتی زۆر بووەو ؛ هەموو نیودورگەی عەرەبی بۆنەخت بووەو ، ژیانیش پێویستە بەو پێیە بگۆڕێ‌و ؛ لەم دونیایەدا تۆزێك یەباشی ڕابوێرن . ئەمەش ئاشکرایە ئەمانەش بەشەرن ولەنەوەی ئادەمیزادن‌و حەز بەڕابواردنی جیهانی‌ئەکەن.

لەبەرئەوە داوایان کرد لەپێغەمبەر کەشێوەی ژیانیان بگۆڕێ‌و کەم‌و کوڕی‌یان لەناوا نەهێلێ . چونکە پێغەمبەر ئێستا بێجگە لەپلەی پێغەمبەرا یەتی پایەیەکی جیهـانی دەس‌کەوتووەو دەسەلاّتی دونیـایی زۆر بووەو ، ئەتوانێ باری ژیانی ئەمان بەرەو چاکی‌و بەختیاری بگۆڕێ .

پێغەمبەر ( درودی خوای لێبێ ) بەرامبەر بەم داوایە عەقـل‌و هۆشی

بەکار هێناو پەنای نەبردە بەر زۆرو لێ دانو چەوساندنەوەیان ، پێغەمبەر ( د . خ ) ئەیزانی بەختیاریو کامەرانی ئەوەیە یەکەم جار ئینسان خوا لەخۆی ڕازی بکاو جێگای نەبڕاوەو ئەبەدی ئەودونیا بۆخۆی ئامادە بکا ، دووەم ئەبێ هەموو گەورەیەك ئەبێ لەگەڵ نەتەوەکەی خۆیدا بەیەك سانی بژیو خۆی بەزل تر نەزانێ وخۆی لەهەژارەکانی نەتەوەکەی جیانەکاتەوە .

ئاشکرایە ئەگەر پێغەمبەر (درودی لەسەربێ ) کەپێشـەوای میللەتو ڕابەری کۆمەڵی ئادەمـیزادە ئەگەر وەکو ژنەکانی ئەیان وت ژیانی خۆی بگۆڕیایە ، ئەوکاتە میللەتەکەشی چاویان لەوئەکردو ، دونیایان لەبەرچاو شیرین ئەبوو ، وەباوەشیان ئەکرد بەدونیاداو لەئەنجاما دەس کەوتی دینو دونیایان لەدەس دەرئەچوو .

پێغەمبەر ( درودی لەسەربێ ) نەی ئەویســـت لەژیانو ڕابواردنی دونیایی‌دا خۆی لەفەقیرو بێ‌دەس جیا بکاتەوە ، بۆیە هەمیشە - چ لەپێش پێغەمبەرایەتی‌و چ لەماوەی پێغەمبەرایەتیا - ئەی فەرموو : خوایـە لەگەڵ فەقیرو هەژارا بم ژیێنەو بم کوژە . . لەبەرئەمانە نەی‌ویـست ژیانی خۆی بگۆڕێو سەروەتو سامان کۆبکاتەوەو باوەش بـکا بەدونیادا . هەرچەند ماڵی دونیا خوا حەرامی نەکردووە ، وەخواش ئەرزی نەکردووە کەئیسلام ئەبێ فەقیرو هەژاربێو گوێ نەدا بەدونیا ، بەڵام پێغەمبەر لەوباوەڕەدا بوو گەورەی فەقیر باش‌تر ئەچێتە دڵی میللەتەوە ، وەهەروەهاش خـوا ناس‌تر ئەبێ . نەك وەکو گەورەکانی ئەمڕۆمان . . سامانی دونیایی کۆئەکەنەوەو کۆشكو تەلار بەرزئەکەنەوەو فەقیرو هەژار لەبیر خۆیان ئەبەنەوە .

ئاژاوەی ژنەکان درێژەی کێشاو ، پێغەمبەریش ( د . خ ) سـوێندی خوارد بۆماوەی یەك مانگ نەچێتە لایان ، لەناوبازارو شارا وا بڵاوبووەوە

کەپێغەمبەر ژنەکانی تەڵاق داوە ( أبوبکر ) و ( عمر ) وئەوانەی کە بە خزمایەتی ئەکەیشتن بەخێزانەکانی پێغەمبەر بۆ ( صلح ) کردنی هەولیان داو ویستیان لیان دەن ، بەڵام پێغەمبەر ( د.خ ) نەیهێشت .

لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە : ( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ : إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ، فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً ، وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ ، فَإِنَّ اللهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً ) . الاحزاب:٢٩

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵێ بەژنەکانت : ئەگەر ئارەزووی خۆشی و ژیانی جیهانی ئەکەن ؟ وەرنە پێشەوە چیتان ئەوێ ئەتان دەمێ و بەشێوەیەکی جوان دەست بەردارتان ئەبم ، وەئەگەر خواو پێغەمبەر و خۆشی ئەوجیهانتان ئەوێ ئەوکاتە خوا بەباشی پاداشتان ئەداتەوە .

ئنجا بەم ئایەتە ئاژاوەکە کۆتایی پێهات ، وەهەموو ژنەکان پێغەمبەریان ویست ورازی بوون بەو ژیانە و تەڵاقیان وەرنەگرت .

## « بەشی دوانزەهەم » لەشەڕی تەبوکەوە هەتاکۆچی دوایی پێغەمبەر

## جەنگی تەبوك

لەدوای داگیرکردنی مکەو جەنگی حونێن نیوەدوورگەی عەرەبی ساغ بووەوە بۆ ئیسلام ، ئەڵبەتە دەسەڵات وولات هەرچەندە فراوان بێ ئەوەندەزیادە خەریك بوون و کاروبارڕێکخستنی پێویستە ، وەلەم ماوەیەدا هەرچەند ژەنگ و ژارو ئاڵۆزی ناومال و خێزان ڕوویدا بۆ پێغەمبەری خوا بەڵام بێگومان دەروێن و مێشکی پێغەمبەر گەورەترو بەرزتربوو لەوە

سەری لێ تێك بچێ ، وەلەم مـاوەیەدا هەمیشە خەریکی تەکتیك و ڕێك خستنی کارو باری وڵات و موسڵمانان بوو ، بیری لەوە ئەکردەوە چۆن وە بە چ ڕێگایەکا ئەم ڕۆشنـــایی‌یەی ئیسلام بگەیەنێ بە هەموو مرۆڤ ، وە شتێکی سروشتی‌یە کە چاودێرو سەرپەرشتی‌کەری بە هەمووﻻیەکا بڵاو کردبێتەوە ، وەلەمانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەما بوو لەڕێگەی چاودێرەکانەوە هەواڵی پێ‌کەیی کەوا ڕۆم سوپایەکی هێجگار زۆری کۆکودۆتەوە و تیرەی لەخەم و عامیلەو غسان و کەڵێ‌تریش لە تیرەکانی عەرەبی ئەو ناوچەیەی دەنگ‌داوەو ئازوخەی ساڵێکی داونێ‌و ئەیەوێ لەشاری مەدینەدا بدا بەسەر پێغەمبەرو موسڵمانەکان‌دا و یەختە ساریان بکەن ، وە سەرەتای سوپـاکە گەیشتۆتە ( بلقاء ) کە نیمە شارێکە لە ناوەندی ( شامو وادی القرا )دا وەلەو لاشەوە ئایەتی قورئانیان بۆهات و ئەفەرموێ (قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ) التوبة: ٢٩

بەڵێ ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتـانەی کەدێن بەدوایا لـە باسەکەدا شێوەی دامەزراندنی شەڕی تەبوك پێش چاوئەخەن وە ئایەتەکە بەڕوونی هۆی پێویستی شەڕو بەکۆشا چونی ئەوانی دەرخستووە ، بەجۆرێك کەهیچ ماوە نەمێنێ لە وەستاندا و ، بیانووی شەڕ نەکردنی هیچ نەهێڵاوە ، چونکە هێنانی ئایەتەکە بەشێوەیەکە : یەکەم ئەڵێ ئەوان باوەڕیان نی‌یە بەخواو ڕۆژی دوایی ، دووەم ئەوەی کە خوا حەرامی‌کردوە ئەوان بەحەرامی‌نازانن وگوێ یان لە وتەی پێغەمبەرنی‌یە لەبارەی حەرامو حەڵاڵەوە . سێیەم‌ئەوان باوەڕی ڕاستەقینەیان نی‌یە بەخواو هەر هەوەس‌کاری‌یە ، جارێ هیچ کەس ناپەرستن‌و جـارێ خوابەخوا دائێن ، ئەوان ئەیانەوێ بڵێسەی ڕووناکی

ئایینی خوا بکوژێننەوە . لەبەرئەم هـۆیانە خوای گەورە فەرمانی داوە کە شەڕیان لەگەڵا بکەن هەتا مل کەچیان ئەکەن بۆسەرانەدان وەڕایان دێنن بەخۆ بەنزم زانین لەعاستی بیرو باوەڕی پاکی ئیسلامیدا .

لەبەرئەمە پێغەمبەری خوا ناچاربوو کەسوپایەکی گەورە رێك بخات بچێتە سەر ڕۆم‌و دەرسێکیان بدات پێی ژێر ببن ، بەڵێ سروشتی‌یە بۆ بیرو باوەڕێکی ڕزگارکەری وەکو ئیسلام کەرێگا ئاسان بـکا بۆ بانـگ کەرەکانی کەبڕۆن‌و بکەڕێن‌و دەنگ‌و بانگەکەیان بگـەیننە مرۆڤ ، جا ئەگەر هەرکەسێ پێی خۆش بێ وەری ئەگرێ ، وەهەرکەسیش ئێی‌نەگا یا شتێکی نەفامی بدات لەدڵی وەری ناگرێ لێی بگەڕێن بەپێی قاعدەی ( لَاإِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ) خۆ ڕۆمەکان لەگەڵ ئەوەدا کە گاورو ئەهلی کتـابن ـ بەناو ـ نایەڵن یەکێ لەبانگ کەرانی ئیسلام پێ‌بنێتە ناو خاکیانەوە ، لێرەدا ئیسلام ناچارە بەزۆر ئەم قەڵایە بڕوخێنێ‌و ڕێگە خۆش بکا .

کاتی ئەمشەڕەش کاتێکی ناخۆشەو لەناوەندی کۆتایی هاوین‌و سەرەتای پاییزدایە ، وەساڵەکەش ساڵێکی وشك‌و بێ‌باران‌و گـرانی بوو ، ئازوخـەو تفاق‌و وشکە دان نەبوو خەریك بوو میوە دەمی ئەداو پێ‌ئەگەیی ، وەکاتی ئەوەبوو کەئەوخەڵکە دانیشتایـە بەدیاری ئەومیـــوە جوان‌و نایابانەوەو خزمەتیان بکردنایە ، وەبەهیـچ لایەکا نەڕۆیشتنایـە ، سـەرەڕای ئەوەش ڕێگای ناوەندی مدینەو شام وشك‌و بێ‌ئاوو دوورو ناهەموارەو کاتـەکەش گەرم‌و نالەبارە ، لەبەرئەمانە پێغەمبەری خـــوا ـ د . خ ـ بەپێچەوانەی جەنگەکانی تر بەئاشکراو بێ‌پێـچو پەنا فەرمووی پێیان : ئەچـین بۆسەر ڕۆم خۆتان ئامادە بکەن‌و تفاق‌و پێویستی پەیا بکەن ، وەهەرلەبەرئەوەش بوو ئەم سوپایە ناونرا بەسوپای سەغلەتی ، جەنگـانێ لەگەڵ ڕۆما وەکو

جەنگی تیرەیەك یا ناوچەیەك یاشاریك نی‌یە ، بەڵکـــو جەنگـە لەگەڵ دەوڵەتێکی گەورەدا کەچەند کەرتی لەسەرزەوی داگیر کردووە ، جەنگە لەگەڵ ئیمپراتورییەتێکی گەورەدا . بێ‌گومان جەنگی وا گەورە سوپای‌گەورە وئامادەیی تەواو ئازوخەی زۆرو باوەڕی پتەوی ئەوێ ، وەئەوانەی خاوەنی بیرو باوەڕی ڕاستەو خاوەنـن چاویان لەکەم‌و زۆری دووژمنەوە نی‌یـە و گوێیان لەدووری‌و ناخۆشی ڕێگاوە نی‌یە ، چونکـــە یا ئەبێ فیدا کاری بکەن یا ئەبێ بیروباوەڕەکەیان بتوێتەوەو لەناوبچێ ، لـێرەدا مونافقەکان‌و ئەوانەی بۆتەماع یا لەترسا ئیسلامەتیان دەربڕی بوو لەلایـەکەوە سەیری کات‌و شوێنی دوژمنیان ئەکردو بەپێی باوەڕی کاڵ‌و کرچ‌و ناڕاستیان وایان ئەزانی جەنگ لەگەڵ ڕۆما ناکرێ ، وەلەلایەکی ترەوە بـە هەلیان زانی بۆپشت بەردان لەمحمدو موسڵمانەکان بەڵکو لەناوبچن‌و ئەمان ڕزگاریـان بێ ، بۆئەمە کەوتنە هەڵسان بەکاری ناڕەواو ناڕاست . . هەندێـکیان داوای ئیزنیان لێ‌ئەکرد کەوازیان لێ‌بێنێ ونەیان بات ، وەبۆئەمەش برو بیانووی پڕوپوچیان ئەهێنایەوە : وەهەندێ تریان خەڵکیان سارد ئەکردەوە وئەیان وت : بەم گەرماو نارەحەتی‌یە مەڕۆن ناتوانن . . وەئایەت هات‌و فەرموی ( فرح المخلفون بمقعدهم خلاف رسول‌الله ـ هەتا ئەگاتە ـ فاقعدوا مع القاعدين ) پێغەمبەری خوا لێرەدا نەیویست بەنەرمی وەکو جارەکانی تر لەگەڵیان بجولێتەوە وەویستی تەمێیان بکات بیستی کۆمەڵێ لەمونافقەکان لەماڵی سوەیلمی جوولەکەدا کۆبونەتەوەو ئەیانەوێ خەڵکی پەشیمان بکەنەوە ئەویش ( طلحه ) ی کوڕی ( عبیدالله ) ی لەگەڵ کۆمەڵێـــکا بۆ ناردن فەرمانی پیادان خانووەکەیان بەسەرا بسوتێنن کەئاگریان تێ‌بەردا ضحاکی کوڕی خلیفە لەبانەوە بازی داو قاچی شکاو ئەوانی تریان بەناوئاگرەکەدا

دەرچوون ئیتر بیرای بیر شتی وابکەن وە (ضحاك) پەشیمان بـووەوە وە هەندێکیان بگرە زۆریان ئەیان وت : ئایا وائەزانن جەنگاوەرەکانی بەنی أصفر ـ مەبەستیان ڕۆمەکانە ـ وەکو عەرەبەکان وان ؟ بەخوا ئەڵێن لەبەر چاومانە کاتێ ئەگەنە بەردەست دوژمن بەماندویی‌و پەرێشانی بەیەك‌هەڵمەت ئەتان پێچنەوە وریزتان ئەکەن لەزەنجیراو بەدیل ئەتان گرن .

لەگەڵ ئەمانەیشا پێغەمبەری خوا ـ د.خ ـ.کەوتە هەوڵدان‌و ئامادە کردن : ناردی بۆ (مکە) بۆ ناوتیرەکانی عەرەب‌و هانی خاوەن دەسەڵاتە-کانی ئەدا بۆبەخت کردنی ماڵ لەڕێی ڕێك خستنی ئەم سوپای سەختەتی یەدا ، وەبەڕاستی موسڵمانە ڕاستەقینەکانیش دەوری‌ـکی باڵایان بیـنی لەم ڕووەوە . . لەوانە عثمانی کوڕی عفان دەهەزار دینارو سێ سەد وشترو پەنجا ئەسپی بەهەموو کەلوپەلەوە بەخشی ، پێغەمبەر ـ د.خ ـ فەرموی: [ دوای ئەمە عثمان هەرچی بکا هیچی لەسەر نی‌یە . خوایە من ڕازیم لەعثمان تۆیش لێی ڕازی‌بە ] وەأبوبکر هەرچی سامانی بوو کەبریتی بوو لەچل هەزار درەم هێنای پێغەمبەر فەرمووی : چیت هێلاوەتەوە بۆمنداڵ‌و خێزانت ؟ وتی خواو پێغەمبەرم بۆهێلاونەتەوە ، وەعمری کوڕی خطـاب نیوەی سامانەکەی هێناو پێغەمبەر فەرموی چیت گلداوەتەوە ؟ وتی نیوەیم گلداوەتەوە ، وە عبدالرحمن کوڕی عوف چوار هەزار درەم یان (دووسەد حوقە زیو ) ی هێناو ووتی : هەشت هـەزار درەمم هەیـە ئەمە نیوەیی‌و نیوەشی بۆخاو خێزان ، پێغەمبەر فەرموی : خوا پەرە بدات بەوەی گلت داوەتەوەو بەوەی کەهێناوتە ، وە عباس‌و طلحە ماڵێـــکی زۆریان هێناو عاصمی کوڕی عدی حەفتا بار خورمای هێناو ، وەژنان بەهەرچی خشڵ‌و توانایانەوەبوو یارمەتیان داو هاوبەشی‌یان تیا کرد ، وەکۆمەڵێ لەموسڵمانە

راسته‌کان که‌هه‌ژه‌زاو بێ‌ده‌ست بوون هاتنه خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خواو و داوایان لێ کرد که وولاّخ و پێویستیان بداتێ تابچن بۆ جه‌نگ له‌که‌لیانا و ژماره‌یان حه‌وت که‌س بون پێغه‌مبه‌ر فه‌رموی : به‌خوا هیچ وولاّخ و وشترم نی‌یه بتان ده‌مێ و ناتوانم بتان خه‌مه‌ڕێ ئه‌وانیش به‌نـــاهومێدی گه‌ڕانه‌وه و ده‌ستیان کرده گریان له‌داخی ئه‌وه‌ی ناتوانن هاوبه‌شی بکه‌ن له‌م جه‌نگه‌که‌وره‌یه‌دا ، ئه‌مانه ناوبران به‌گریاوه‌کان و قورآن ده‌رباره‌یان هات و فه‌رمووی [ لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ ـ هه‌تا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنْفِقُونَ ]

موسلمانه‌کان زۆر به‌ئاواتی سامانه‌وه بوون که بۆ ئه‌م جه‌نگه بیده‌ن له‌ڕێی خوادا ، هه‌رکامیان نه‌یبوایه بێتاقه‌تی ئه‌کرد .

پاش ئاماده‌بوونیان پێغبه‌ری خوابه ۳۰ هه‌زار که‌سه‌وه که‌وته‌ڕێ ، ده‌هه‌زار ریان ئه‌سپ سوار بوون ، مسلمه‌ی له‌سه‌رمدینه داناو علی کوڕی ئه‌بێ طالبی به‌سه‌ر مال‌و منداله‌که‌یه‌وه به‌جێ هێشت ، أبوبکری دانابه‌سه‌ر سوپاکه‌وه له‌کاتی سه‌ر جه‌نجالی خویا نوێژیان بۆ بکا و ئالاّیه‌کی که‌وره‌ی دابه‌ده‌سته‌وه . به‌یداخه‌کانی بلاّوکرده‌وه : به‌یداخی کۆچه‌ری دابه‌زبید و به‌یداخی أوسی دابه أسیدی کوڕی خضیر و به‌یداخی خزرجی دابه‌حبابی کوڕی منذر ، وه‌تیره‌کانی‌تر به‌یداخی هه‌ریه‌که‌یانی دابه‌یه‌کێکی دیارییان .

علی کوڕی أبی طالب هاته خزمه‌تی و وتی : تۆمن بێ‌به‌ش ئه‌که‌ی له جه‌نگێکی وه‌ها که‌وره‌داو له ڕیزی ژن و منالاّ دام‌ئه‌نێی . پێغه‌مبه‌ر دلخۆشـــی‌دایه‌وه و فه‌رمووی : تۆم کردووه به‌جێ‌نشینی خۆم به‌ســه‌ر خاوخێزانی خۆم و خۆت وه‌ئایا ئه‌ی علی تۆڕازی نابی که‌له‌که‌ل مناوه‌کو هارون وابی بۆموسی ، به‌لاّم دوای من پێغه‌مبه‌رێتی نی‌یه ؟ علی به‌دل‌نیایی‌وه گه‌ڕایه‌وه بۆسه‌رمال و منداله‌کان .

عبداللهی کوڕی أوبی - سەرۆکی مونافقەکان - لەگەڵ کۆمەڵێ بە دوودڵی‌یەوە ئەیان ویست بێن و هاوبەشی بکەن ، بەڵام پێغەمبەرئەیناسین و موتمانەی پێ‌نەکردن و گەڕانەوە . وەژمارەی دانیشتوان و بڕوبیانووی درۆهێنەرەوە لەهەشتاکەس پتربوون .

لەشکری گەورەی ئیسلام بەسەرۆکایەتی فەرماندەی گەورە پێغەمبەری خواوە کەوتەڕێی دووڕووەکان خۆیان دواکرت و لەمدینەدا مانەوە ، ولە موسڵمانەڕاستەقینەکانیش چەند کەسێ مانەوە .

سوپای ئیسلام بەناوی خواوە کەوتە ڕێ لەڕێکادا یەکێ بەجێ ئەماو یەکێ دوا ئەکەوت خێرا بەپێغەمبەری خوایان ئەوت ئەویش ئەی فەرموو: لێی‌گەڕێن ئەگەر خێری تێدابێ پێتان ئەکا . ئەگەرنەهات ڕزکارتان‌ئەبێ لەدەستی . لەڕێکادا وشتری أبوذڕی غفاری بەجێ‌ماو نەڕۆیی هەرچی لەگەڵا کرد بێ‌سودبو ، وترا بەپێغەمبەری خوا : أبوذر بەجێ‌ما ئەویش ئەو فەرمودەیەی فەرمو ، أبوذر ناچاربو کەلوپەلی لەووشتر کرتەوەو نای لە کۆلی بەپێ کەوتە شوێنیان ، کاتێ لەشکر بەزی بوو لە جێکایەکا وتیان : ئەوە پیاوێکە بەپێ‌و بەتەنیا یەت پێغەمبەر فەرموی : خوا بەزەیی بێتەوە بەأبوذڕا بەتەنیا ئەڕوا بەتەنیا ئەمرێ بەتەنیا زیندو ئەکرێتەوە .

بەڵێ سوپای باوەڕی ئیسلام شاری مدینەیان خستە پشت خۆیانەوەو ڕوو بەشام ئەڕۆین دەنگی پێی وولاخ‌و حیلەی ئەسپ‌و تۆزی پێی ئەم لەشکرە بەرزبووەوەو بەری ئاسمانی گرتبوو ، ژنانی مدینەیی هاتبوونە سەر بانەکان‌و سەیری ئەم لەشکرەیان ئەکرد کەهێشتا مێژووی ئەم وولاتە سوپای وای نەدیوە .

چەندە جوانە مرۆڤ سەیری هەرشتێکی کرد کات‌و ڕووداوو کارەکانی

بێنێتە پێش چاوی خۆی و وادابنێ تیـا ئەژی ، ئەگەر کەسێ چـــووە بەندیخانەو سەری لەبەندکراوەکان داو ژووری ئەشکەنجەو سێدارەی بینی ڕاست وایە حالەتێکی پڕلەداخو ترسو ناڕەزایی هەبێ نەك دەمی بەپێ کەنینو زەردەخەنەو گۆرانی ووتنەوەبێ . ئەڵێن پێغەمبەری خوا بەبەبەرگە کەی خۆی سەری داپۆشیو دەمو چاوو لوتی خـۆی گـــرت تا ئەوبۆنو بەرامەیە نەیەت بەسەر دەمو لوتیاو ئەو دیمەنە ڕق لێگیراوە نەبینێ . ئەو موسڵمانانەی کەلەلەشکـرەکەدا بونو ناوچەکەیان بیـنی تینوو ناڕەحەت بووبوون ، خستیانو کەڕان بیریان دۆزیەوە هەتا پێغەمبەر هاتو بانگەوازی کردو وفەرمووی : لەئاوی ئەوبیرانە مەخۆنەوەو دەست نوێژی لێمەشۆن ، وەهەرکەس هەویری پێشێلاوە هەویرەکە بدابەووڵاخەکەی ، وەووڵاخەکانتان توندببەستنەوە و کەستان شەو بەتەنیـا نەچێتەدەرەوە هەرکەس چوو هاوڕێ یەکی لەگەڵابێ . وەتێی کەیاندن شوێنەکە چۆڵەو زۆر جار باوکێژەلوکەی ئەوتەوهەڵ ئەکاو کەژی لێدروست ئەکا . بەڕێکەوت دووکەس ئامۆژکاری یەکەیان لەبیرئەچێ و شـەو بەتەنیـا یەنەدەرەوە : یەکێکیان لەچادرەکان ئەترازێو ئەکەوێ و قاچی ئەشکێ ، ئەویتریان کێژەلوکە هەڵیئەگرێ و ئەیبا بۆ کەژی ( بیطی ) ، بەیـانی کە پێغەمبەر زانی فەرمووی : ئەی پێم نەووتن بەتەنیا نەچنەدەرەوە ؟ دووعای کرد بۆ قاچ شکاو خواقـاچی چاككردەوە ، ئەویتریان دوای گەڕانەوەیان هۆزی (طی) هێنایانەوەبۆلایان

بەڵێ ئەوشەوە باو کێژەلوکەیەك هەڵیکرد ئەتووت ئێستە جیهـــان کاول ئەکا ، بەیانی کەلـان ئەبینن شێوەی زەویەکە گۆڕاوە و چەند کەژوتەپی لێ پەیابووە و هەموبیرەکان کوێربونەتەوە و بوون بەژێر لمەوە ، موسڵمانەکان زۆر ناڕەحەتبون و بەتەنگ هـاتن : چلەبەر گەرمـــاو چ

لەبەر ناخۆشی ڕێگاو چۆلەبەر بێئاوی ، ئاوایان لێهات ووشتریان سەر ئەبڕی و ناوسکەکەیان ئەگوشی ئاووتەڕی یەکەیان هەل ئەمژی .

إبن كثير لە تەفسیرەکەیا ئەڵێ : مجاهدو کەلێکی تر ووتویانە : سوپای ئیسلام لەکاتێکی سەختیا چوون بۆتەبوك . سـالێکی ووشك و گرانیبوو ، کاتەکەی زۆرگەرم بوو ، ئاوو ئازۆخەیان نەبو . قتادە ئەڵێ : کەچوون بۆ تەبوك لەکاتی بلێسەی گەرمادا بوو کەمەگەر هەر خوا ئەندازەکەی بزانێ ، ماوە لەکاتی نەبوونی و بێئازۆخەییدا بوو بەڕەنگێ بەتەنگ هاتن ـ وەك بیستومانە ـ دووپیاو دەنکێ خورمایان لەت ئەکرد وەچەندکەسێ لە دەنکە خورمایەك کۆئەبونەوە و ئەیان مژی .

بەمپێیە بەو هەموو سەختڵەتیو نارەحەتی‌یەوە سوپای گەورەی ئیسلام گەیشتە تەبوك (١) . تەبوك لەوکاتەدا زەمینێکی چۆل بوو خانو و ماڵی تێدانەبو ، پێغەمبەر فەرمووی بەمعاذ ئەگەر تەمەنت درێژبێت ئەبینێ ئیتر پڕبووە لەباخ و ئاوەدانی ، وەوا دەرچوو بووبەو شارە کە ئێستە هەیە . پێش ئەوە سوپای ئیسلام بگاتە تەبوك ڕۆمەکان پێیان زانین وەزانیان چەندە گەورەو بەدەستەلاتە ئەلبەتە بە چەترسێنی جاری پێشوویش بوون کەچۆن بەدەست سوپـا بچکولەکەی مؤتەوە بەگیر هاتبوون ، لەبەرئەمە وایان بەباش زانی کە بلاوەی لێبکەن و لەناوولاتەکەی خۆیاندا خۆیان بشارنەوە بابەدەسـت ئەوسوپاگەورەی ئیسلام لەناو نەچن . پێغبەریش ـ د . خ ـ کەوای زانی نەیویست بڕژێتە ناو ولاتەکەیانەوە و بکەڕێ

---

(١) تبوك شوێنێکە لە ناوەندی وادی القرى و شـاما چواردە قۆناغ لە مەدینەوە دوورە ویانزە قۆناغی ئەمێنێ بۆ دمشق .

بۆیان ، بیست ڕۆژ لە تەبووکامانەوەو نوێژی کرت کراوەیان تیاداکرد ، ئەم ماوەیە ویستی لەسەر سنوور بمێنێتەوە بزانێ کێ دڵی لێ ئەدلو ئەیەوێ لەگەڵیانا بجنگێ ؟ وەیا کێ دەستی دۆستایەتیان بۆ دریژ ئەکا ، وەبێجگە لەمانەش سروشتی یە ترس و بیمێکی گەورە ئەخاتە ڕۆم و تیرەعەرەبەکانی ئەوناوچەیەوە ، سنوورەکەش وامەحکەم ئەکا کەئیتر دوژمن نەتوانێ بیرلە شکانی بکاتەوە ، سەرەڕای ئەمانەش سوپاکەی حەسایەوە و پشوویان داو ناڕەحەتی یەکانیان لەبیر چووەوە .

## هاتن بولای پێغەمبەری خواو پەیمانی ئاشتی بەستن لەگەڵ تیرەعەرەبەکانا

وەلەم ماوەیەدا نوێنەری هەموو تیرە عەرەبەکان لەو ناوچەیەدا هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا وەپەیمانی ئاشتیو ڕێکەوتنیان لەگەڵ کردو بەست .

## گەڕانەوە بۆ مەدینە :

نزیکەی بیست ڕۆژ پێغەمبەر و موسـلمانەکان لە تبوکدا مانەوە ، ئنجا کەوتنەڕێو گەڕانەوە ، لەم ماوەیەدا پێغەمبەری خوا ئەو موسلمانە ڕاستەقینانەی لەبیر نەچووبوو کەئامادەی هاتن بوون ، بەڵام لەبەر نەدارایی بۆیان نەکرابوو هاوبەشیان بکەن . أنس کوڕی مالك ئەڵی : کاتێ لەتبوك گەڕانەوەو نزیك بزینەوە لە مەدینە پێغەمبەری خوا فەرمووی : لەمدینەدا کۆمەڵێك هەن لەهەموو هەنگاوێكو لەڕۆیشتنو بڕینی هەموشوێنێکانەواتتان لەگەڵابوون ، ووتیان : خۆئەوان لەمدینەدان ! فەرمووی : ئەوان لەمەدینەدان و بێدەسەڵاتی گیری داوون (۱) . سوپا نزیك بووەوە لـە مەدینەو مژدەی هاتنەوەیان گەیشت ، خەڵکی زۆر بەشەوقو ئارەزۆوە هاتن بە پیریانەوەو

(۱) بخاری لە صحیحا ڕیوایەتی کردوە

سروودی پڕ بەدڵیان پیاهەڵدانو بەخێرهاتنەوەیان لێ ئەکردن ، لەملاشەوە پێغەمەرو موسڵمانەکان هەرکەنیشان کردی مەدینەیان لێ دەرکەوت گەشانەوە.. پێغەمبەری خوا فەرمووی : ئەوە (طابەیە) واتەمەدینەی خاوێنە ، ئەوە (أحد)ە خۆشمان ئەوێ و خۆشی ئەوین ، کەگەیشتنەوە مەدینە سەرەتای مانگی ڕەمەزانی سالی نۆیەم بوو .

## دواکەوتووەکان

کە دەنگو باسی گەڕانەوەی سوپاهات دواکەوتووەکان چەو چاریان پێکەوتو خەمیان لێهات و مەترسیان لێ نیشت .. چی بکەن ؟ چی بلێن ؟ چۆن خۆیان بپەڕێننەوە ؟ پێغەمبەر - د خ - پیشەیوابوو لەهەرکوێ ئەهاتەوە لەپێشەوە ئەچووە مزگەوت نوێژی ئەکرد ، ئەمجار لەگەل خەلکەکە دائەنیشت و ئەکەوتە گفتوگۆ ، لەم کاتەدا دووڕووەکان هاتن و کەوتنە بڕوبیانوو هێنانەوە و سوێندی درۆخواردن ، پێغەمبەریش ڕواڵەتەکەی لێوەرگرتن و نهێنی یەکەیانی دایەدەست خواو پەیمانی لەگەلا بەستن و داوای لێخۆش بوونی بۆکردن ، بەلام زۆری نەخایاند خوای گەورە نهێنی و پیسیو دووڕووەکانی دەرخست و ئایەتی ناردەخوارەوە .

## ڕووخاندنی مزگەوتی ضرار :

( إبن کثیر ) لەتەفسیرەکەیا ئەلێ : لەپێش هاتنی پێغەمبەرا بۆمەدینە پیاوێکی خەزرەجی هەبوو پێیان ئەوت ( أبوعامر ) ی ( ڕاهیب ) ، کە لە دەوری نەفامێتی دا بووبوو بەکاور و پەڕاوی ئەهلی کتابی ئەخوێندەوە ، لەناو خەزرەجا پایەیەکی بەرزی هەبوو ، کە پێغەمبەری خوا کۆچی کرد بۆ مەدینە و موسڵمانان لێی کۆبونەوەو لە بەدرا سەرکەوتن و دەنگی ئیسلام بەرزبووەوە ، ئەم ئاگری تێچوو ، بەئاشکرا دەستی کرد بەدوژمنایەتی

پێغەمبەرو ئیسلام و ڕایکرد بۆناو بت پەرستەکانی قورەیش لە مەکە و هەڵی ئەدان بۆ دوژمنایەتی پێغەمبەر ـ ئەوەبوو لە جەنگی أحد هەندێکی لێدواین ـ وەلەپێش ڕاکردنەکەیا پێغەمبەر زۆر ئامۆژکاری کرد ، بەڵام بێسوود بوو هەریاخیتر ئەبوو . ئەمجار پێغەمبەر دوعای لێکرد کە بە ئاوارەیێو لە دووز ولاتابمرێ ، کاتێ لەجەنگی أحد بوونەوە بینی ئیشی پێغەمبەر لەسەرکەوتنایەو ڕۆیشت بۆلای هیرەقل پاشـــای ڕۆم ، داوای یارمەتیکرد بۆسەر پێغەمبەر . ئەویش بەڵێنیدایەو لایمایەوە . نامەیەکی نووسی بۆ منافقەکانی مەدینە ، کە بەسوپایەکی گەورەوە دێت پێغەمبەرو موســڵمانەکان لەناوئەبـــا ، وەبەڵێنی گەورەشی دابوو بەوان و داوای لێکردبوون کەبنکەیەك بکەنەوە بۆئەوەی هەرکەس هات بۆلایان لەوێدا پێیان بکات و ئەو بنکەیە ببێتە جێگای پیلان و فڕوفێڵ دروستکردن ، ئەوانیش لەنزیك مزگەوتی (قوباء) موە لەشوێنێکاپێی ئەڵێن : ( ذیأوان) سەعاتێ لـە مەدینەوە دوورە ، دەسیان کرد بەدروستکردنی مزگەوتێ ، پێش ئەوەی پێغەمبەریخوا بڕوا بۆ تەبوك دروستیان کردو هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خواو داوایـان لێکرد کەبێتە ناویان و کلـبلی مزگەوتەکەیان هەڵگرێو بۆ پیرۆزی نوێژی تیابکا ، تـابەم نوێژ کردنەوە ناوی مزگەوتی بکەوێتەسەر و ئیتر بەبێترس تیاکۆببنەوەو بکەونە خراپەکاری و کۆڕینی قورئانو ئیسلام ، بەڵام خوا پێغەمبەری پـــاراست و فەرمووی : ئێستە ئێمە لەسەر ڕێکاین و ئەڕۆین ، ئەگەر خواویستی بابگەڕێینەوە کاتێ لە تبوك گەڕانەوو نزیکی مەدینەبوونەوە ، ( جبرائیـل ) هات و ئـایەتی بۆ هێناو باسی مزگەوتی ( ضراری ) بەڕۆشنی بۆکرد ، پێغەمبەریخوا (د خ) چەندکەسێکی لەیارەکانی ناردو ڕووخانیانۆ بەسەر خەڵکەکەیاو سووتانیان

پاشان فەرمانیدا کردیان بەجێگای سەلوێنك . وەئەمەش ئەوئایەتەیە کە باســی مزگەوتەکە ئەکاو ئەفەرموێ : « والذين أتخذوا مسجداً ضراراً وكفراً وتفريقاً بين المؤمنين وإرصاداً لمن حارب الله ورسوله من قبل

بەسووتاندنی ئەم مزگەوتەو بەتوندو تیژی کـردنی پێغەمبەر لەگەڵ دوڕووەکانا مەترسی گەورەیان لێنیشت و کەوتنە پەلەقاژەکردن کەس نەما پەنای پێبەرن بێجگە لە (عبدالله) ی کوڕی ( سلول ) ، بەڵام زۆری نەبرد عبدالله مرد لە مانگی ( ذیالقعدە ) ی سالی نۆهەمدا .

## نوێنەری سەقیف

بەگەڕانەوەی پێغەمبەرو موسڵمانەکان لە تەبوك سـامی ئەم دەوڵەتە نوێیەی ئیسلام چووە دڵی هەمووتیرەو هۆزەعەرەبەکان ، چۆن وانەبێ ؟ خۆتیرە یاشار یـا وڵات نیە ئەم ڕووی تێبکاو ئەوخۆی بـۆ بکێرێ ؟ . ئەوەتە ڕۆم بە هەموو دەسەڵاتیەوە کە تا ئەوسا بوو یاری بەهەموو لایەك ئەکرد ئێستا هەرکەبیستی سوپای ئیسلام هات کونیە خۆی تیابشارێتەوە ! ئەمەشتێکی ســـروشتیە چونکو دەوڵەت و سوپای ئیـسلام ڕاستەقینە و حەقیقەتە لەسەر بنەڕەتی باوەڕ بەرپابووە و هەڵقوڵیوە ، وەئەندامانی تەنیا مەبەستیان ســـەرخستنی بیرو باوەڕەکەیـــانە بابەخوێن ڕشتنی خۆیان و و ئازیزیان بووە ، ئەلبەتە عەرەبەکان بیریان لەمە کردەوەو ئەمڕاستیەیان بۆ دەرکەوت ، بۆیە بەگەڕانەوەی پێغەمبەر لەتەبوك پۆل پۆل ئەهـاتن و موسڵمان ئەبوون و خۆیان ئەخستە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامەوە لەوانە تیرەی سەقیف بوو هاتن . .

لەکاتی ئابلوقەدانی ( طائف ) داو دوای جەنگی ( حنین ) عروەی کوڕی مسعود کەیەکێبو لە ســـەرەکەکانی سەقیف لەیەمەن بوو کە

کەڕایەوە بۆ طائف و بەسەرهاتەکاتی زانی و بەتایبەتی جەنگی تەبوکیشی بیست ، ئیتر بەلایەوە وابوو خۆکێل کردن و دان نەنان بەپێغەمبەریەتی محمدو بەڕاستی ئیسلام دا مانای تیانیەو ئەوپەڕی نەفامیو سەر لێشێوانە خۆ عروە باش محمد ئەناسێ و هیچی لێ‌گوم نیە و یەکێك بوو لەوانەی وتو وێژیان لەگەلا کرد لەپەیمانی ( حدیبیە ) دا . لەبەرئەمانە هەڵساو ڕۆیی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ( د . خ ) و ئیسلام بوو ، وەداوای لەپێغەمبەکرد ئیزنی بداو بگەڕێتەوە بۆناو خزمەکانی و بانگیان بکا بۆسەر ئیسلام ، بەلام پێغەمبەر فەرمووی : ئەوانە نەفامنو زۆر ڕەقن لەسەربت پەرستی و ئەتکوژن . وتی : من لەناویانا بەڕێزم و لەچاوی خۆنیان خۆشتریان ئەوێم ، عروە گەڕایەوە بۆناو تیرەی سەقیف و بانگی‌کردن بۆسەر ئیسلام بەلام ئەوان لەجیاتی وەلامدانەوە لێی کۆبونەوەو لەهەمو لایەکەوە تیر بارانیاکرد هەتا شەهیدکرا ، خزمەکانی بەپەرۆشەوە لێی کۆبونەوە پێش کیان دەرچونی . ئەویش لەوکاتەدا وتی : قەی‌ناکا کەرامەت و شەرەفی شەهیدیم دەست‌کەوت .

بەلێ خوێنی عروە هەروا بەخۆڕایی‌نەڕۆیی ، چونکو تیرەکانی دەوروبەریان هەموموسلمان بووبوون و ئەم‌کارەیان بەدەس درێژی‌کردن بۆسەر ئەوان دائەناو هەموو بڕیاریان‌دا تۆلەی بسێنن ، سەقیف ئەبینێ وەکو کەو کراوەتە قەفەس و هەرکەسێکی بڕوا بەهەر لایەکا بەتەمای گەڕانەوەنیە ، وەچاریان نەماوە ئەبێ ئاشتەواییەك پەیمانێك لەگەل موسلمانەکان ببەستن ئەگینا ژیانیان تال‌بووە ، بۆئەمە کەوتنە کۆبونەوەو ڕاوێژکردن . (عمرو)ی کوڕی ( أمیە ) چووەلای ( عبدویالیل ) کوڕی ( عەمر ) وپێی‌وت : ئەبینی چیمان بەسەرهاتووە ، وەئێشی ئەو پیاوە لەوەدانەما عەرەب یەکسەر

باوەری پێ هێناوە و موسڵمان بووەو ئێمەش توانای جەنگمان لەگەڵ ئەو هەموو مرۆڤانەدانیە ، بیرێ لەباری خۆتان بکەنەوە . لەئەنجاما بڕیاریان هاتەسەر ئەوە : نوێنەریان بنێرن بۆلای و هەرچۆنێ بووە ڕێکەوتنێ دەس بخەن ، نوێنەرەکەیان کۆمەڵێك بوو لەهوو بەرەبابێکی تیابوو بەرەومەدینە بەڕێ کەوتن .

لەڕێکا ( مغیرە ) کوڕی ( شعبە ) یان پێ گەیی و پێکەوە ڕۆیشتن لەڕێکادا ئامۆژگاری زۆری کردن و ڕێو شوێنی جوانی نیشاندان ، وە ابوبکر مژدەی ئەم کۆمەڵەی دابەپێغەمبەر . بەڵێ نوێنەر هاتن وچادرێکی تایبەتی یان لە گۆشەی مزگەوتەوە بۆ هەڵدرا هەتا زۆر قورئان ببیـن و موسڵمانەکان بلین لەکاتی نوێژو خواپەرستیو پەندو ئامۆژگاری یـــا ، وە ( خـالد ) ی کوڕی ( سعید ) ی کوڕی ( عـاص ) پەیامبەری نێوانی ئەوان و پێغەمبەربوو ، هەتـــا کە خواردنی بۆ ئەناردن ( خالد ) لێی نەخواردایە لێیان نەئەخوارد .

لە پاشـــا بەدرێژی وت وێژیـــان کرد لـەگەڵ پێغەمبەرا لەگەڵ پیشاندانی ئامادەیی یان بۆ ئیسلام ئەیانویســـت « لات » کەبتە گەورەکەیان بوو نەشکێت و بمێنێتەوە ، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) کەخوا ناردوویە بۆلابردنی بت پەرستی ـ لەهەر بەرگێکا و بەهەر ناوێکەوە بێو هەرکەس و هەرشتێ بێ ـ وەبۆ ڕاگرتنی ئادەمیزادو ڕاهێنانیان لەسەر پەرستنی خوا بەتاك و تەنیـایی ، چۆن ڕێکە ئەدابەسەقیف لـەگەڵ خوا پەرستیدا بتیان هەبێ ؟ بێ گومان شتیوانابێ ، وتیان : تا سێ ســـال ، پاشان : دووسال ، سالێ مانگێ بمێنێتەوە . بەڵام پێغەمبەر بەهیچ جۆرێ ڕێی نەداو فەرمووی : نابێ ئەجا وتیان : دەی خۆمان نایڕوخێنین خۆت

بنێرە بۆ ڕوخاندنی ، فەرمووی : بـــاشـە ، پێغەمبەریش ئەم مەرجەی وەرگرت ، چونکە ئەوەی گرنگە نەهێڵانیەتی ، ئیتر بەهەردەستێ بڕوخێ گرنگ نیە ، پاشان داوایان کرد کەنوێژیان نەدا بەسەرا ، بەڵام پێغەمبەر فەرموی : نابێ چ سوودێ هەیە لەئاینێکا نوێژی تیانەبێ ؟ بەڵێ . پاش ئەمانە نوێنەرەکانیان موسلمـان بوون و هەموو مەرجەکانیـان وەرگرت .
وە پێغەمبەر عثمانی کوڕی ( أبی العاص ) ی کرد بە کاربەدەســـیان وەنوێنەرەکان تەواوی مانگی ڕەمەزان مانەوەلای پێغەمبەر و لەگەڵیان بەڕۆژووئەبوون و ئێـوارەو پارشێوخواردنی بۆ ئەنـاردن کەگەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان ، ( مغیرە ) ی کوڕی ( شعبە ) و ( أبوسوفیان ) ی کوڕی ( حرب ) ی لەگەڵاناردن بۆ شکاندندنی ( لات ) ی بتەگەورەکەیـان . کە ژنـانی سەقیف بینیـان وا ئەم دوانە خوا گەورەکەیان ئەڕوخێنن ، بەسەری ڕووتو پێخاوسی بەشین و چەپۆڕ هاتن و هاواریان ئەکرد ، بەڵام چ سوود تازە دەوری بت پەرستی ڕۆیی و باری کرد ، ئیتر نۆرەی خوای تاك و تەنیا پەرستنە .
بەم پێیە لەکۆتایی ساڵی نۆیەما ( طائف ) یش موسلمـان بوو و هاتە ژێر ئاڵای ئیسـلامەوە ، وە بە ئیسلام بوونی طائف تەواوی وڵاتی حیجاز ساغ بووەوە بۆ ئیسلام . وە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلام لەسەرەوە لە وڵاتی ڕۆم و لەخوارەوە وڵاتی‌یەمەن و حەزرەمەوتی گرتەوە ، وەئەو تیرانەی لە خوارووی نیودورگەدا مابوون یەك لەدوای یەك نوێنەریان ئەهاتو موسلمان ئەبوونو گەردنیان کەچ کرد بۆبیرو باوەڕە پیرۆزەکانی ئیسلام ، وەکو قورئان ئەمە ڕۆشن ئەکاتەوەو ئەفەرموێ : « إذاجاء نصرالله والفتح ، ورأیت الناس یدخلون فی دین‌الله أفواجاً . . . » .

و هیچ ئسراحەتیان نەبوو ، دووڕووەکان کەوتنە خۆدزینەوە و خۆشاردنەوە و گوێ نەدان بەئیش و خۆ نەڕەنجان و بەبێ پرســـی پێغەمبـەر ئەڕۆیشتنەوە بۆناو ماڵو خێزانیان ، بەڵام موسڵمانەکان ئەگەر ئیشێکی یان ببوایە ئەهاتنە لای پێغەمبەر و بۆیـان باس ئەکرد و کە ئیزنی بدانانە ئەوسا ئەڕۆیشتن ، کە لێ بونـایەوە خێرا ئەهاتنەوە ، لێرەدا خوا ئەم ئایەتانەی بۆناردن [ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَىٰ أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّىٰ يَسْتَأْذِنُوهُ ، إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ » وەڕووبە دووڕووەکان ئەفەرموێ : لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ[2] كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا . قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ » . النور ، ٦٢ - ٦٣

بە خەریك بونێکی ســەروەری و بێ وچـان لە ماوەی شەش ڕۆژا خەنەق هەڵکەنرا ، وەهەر لەم ماوەیەدا دیواری ماڵەکانی ڕووبەڕوی دوژمن مەحکەم کران ، ئەمجار ئەو ماڵانەی لە دیوی دەرەوەی خەنەقەکەوە بوون چۆڵ کران ، وە ژنان و منال و بێدەســەڵاتان خرانە ناو قەڵاو خانووە قایمەکانەوە وە لەسەر لێوی خەندەقەکە لەقەراخی لای مەدینەوە بەردی گەورە دانرا بۆئەوەی لەکاتی جەنگا تیریان لەپشتەوە بهاوێژێو سەنگەربن .

کاتێ ئەمان لەکار قایمیی خۆیان بوونەوە قوڕەیش هات بە سوپایەکی گەورەوەو بینی وا خەندەق لێ دراوەو بۆتە شوراو ڕێی شارەکەی بڕیوە و ئەو بەتەما بوو وەکو جارەکانی تر لە ڕێگادا بگابە موسڵمانەکانو ئیستە کەوت بەسەر ئەم خەنـدەقەدا پێیان ســەیر بوو ، چونکە شتی وا لەناو

(٢) بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ : راست

خوای گەرە سەرەتای سوورەتی ( براءتی ) لەقورئانی پیرۆزنارد لە کاتێکا کەابوبکرو حاجی یەکان لەمدینە کەوتبوونەڕێ ، وە پێغەمەری خوافەرمووی : ئەبێ خزمێکی نزیکی خۆم ئەم سوورەتە بخوێنێتەوەو پەیمانەکان بداتەوە بە خاوەنیان .

وە بۆ ئەم مەبەستە علی کوڕی (ابوطالب) ی ناردو سواری وشترەکەی خۆی کردو فەرمووی : لەکاتی کۆبونەوەی مەردمەکان لـەمینادا بـانگەواز بکەن و ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوەو پێیان بڵێ : (ئەوەی کافربێ و موسلمان نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە ، وەلەم ساڵ بەولاوە ئیتر بت پەرست حەج ناکات ، وەنابێ ڕووت بگەڕێ بەدەوری کەعبەدا و ، هەرکەس پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا هەیە لەسەری بروا تاماوەکەی تەواو ئەبێ ) .

علی کەوتەڕێ و لەڕێگـادا گەیشت بە ابوبکر ، کە ابوبکر بینی لێی پرسی : بەکاربەدەست نێراوی یان بەفەرماندەی پیادراوە ؟ علی ووتی : بەکاربەدەست نەنێرراوم و هاتووم هەندێ قورئان ئەخوێنمەوە بەســەر خەڵکا لەمینادا ، ئەمجار ڕۆیشتن و علی لەم سەفەرەدا تاهاتنەوە لە دوای ابوبکرەوە نوێژی ئەکرد . موسلمانەکان بەسەرۆکایەتی ابوبکر دەستیـان کرد بەبەجێهێنانی کاروباری حەج وەپەرستنی خوای تاکو تەنیاو بەبەرگی تایبەتی إحرامەوە بوون ، وەشان بەشانی ئەوان لەسەر پەیمانەکانیان بت پەرستەکان بەڕووتو قووتی و بێ ئابڕوویی یەوە دەستیان کرد بەبت پەرستی ، وە لەکاتی کۆبونەوەی قەڵەبالغەکە لەمینادا دوای ڕۆژی جەژن علی ڕاوەستا و دەستی کرد بەخوێندنەوەی سوورەتی ( التوبة ) لەسەرەتاوە هەتا ئایەتی سی وشەش ، پاشان تۆزێ هەڵوێستاو ئەمجار وتی : [ئەی مرۆڤەکان ئەوەی کافربێ و موسلمان نەبێ نـاچێتە بەهەشتەوە ، وەبێجگە لەم ساڵ نابێ بت

پەرستـت حەج بکاو ، نابێ کەس بەڕووتی بەدەوری کەعبەدا بگەڕێ ، وە هەرکەسێ پەیمانی نی یە چوارمـانگ مۆلەت ئەدرێ ] . وە أبوبکر چەند جارچەرێکی بلاوکردەوە بەناو کۆمەڵەکەداو وتەکانی علی یان دووبارە ئەکردەوە وەلەڕاستی دایەکەیا ئەم بانگ و بانگەوازە سوودێکی گەورەی هەبوو تینێکی باشی کرد ، چونکو بت پەرستەکانی خستە لەرزەوە وزانی یان ئیتر ژیانیان نامێنێ و، ئەبێ چارێکی خۆیان بکەن ، وەئیتر پۆل پۆلو کۆمەڵ کۆمەڵ ئەهاتن و موسلمان ئەبوون و ئەچوونە ژێر ئالاو سایەی ئاینی ئیسلامەوە .

وەهەر لەم سالەدابوو ئوموکەلسومی کچی پێغەمبەری خواو خێزانی عثمانی کوڕی عفان کۆچی دوایی کرد .

## ( سـالی دەیەم )

## « سریەی خالدی کوڕی ولید »

لە مانگی ڕەبیعی یەکەم ( یادووەم ) دا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەربێ ـ خالیدی کوڕی ولیدی لەگەڵ چوارسەد کەسا نارد بۆ سەر بەنی(حارس)ی کوڕی کعب لە نەجوان (١) وە فەرمانی پیادا کەپێش ئەوە لەگەڵیانا بجەنگێن تا سێ جار بانگیان بکەن بۆسەر ئیسلام ، ئەگەر هەربێ سوودبوو گوێ یان نەئەدا لەگەڵیان بجەنگێن . کاتێ گەیشتنە ناویان خالد سواری بلاوکردەوە بەهەموو لایەکاو بانگی خەڵکەکەیان ئەکرد بۆ ئیسلام بوون وەئەیان وت : ئیسلام بێ تووشی هیچ جۆرە زیانێك نایەن ، وە ئەو تیرەیە گاوربوون ، کاتێ ئەم سوارانە بانگیان کردن هاتن بەدەمیانەوەو موسلمان بوون و هاتنە ژێر ئالای ئیسلامەوە ، ئەوانیش لێ یان وەرگرتن

---

(١) شوێنێکە لەنیوان یەمەن و نەجدا

و خالد لێی دانیشت ـ لەسەر ئامۆژگاری پێغەمبەر ـ دەستی کرد بە فێرکردنیان بۆ ئیســلام ، قورئانی پێئەووتن وە مبادیئەکانی ئیسـلامی تێئەگەیاند ، وەنامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەربێ ـ نـارد و ، ڕووداوەکەی بۆ ڕۆشن کردەوە ، پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ نامەکەی بۆناردەوە کەلەگەڵ کۆمەڵێکیانا بێنەوە بۆ مدینە ، کە هاتن و چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ یەکێ لەوشتانەی لێیپرسین : بۆچی ئێوە لەدەوری نەفامێتیتانا زاڵئەبوون بەسەر دوژمنتانا لە جەنگا ؟ وتیان : هەمیشەیەك بووین و جیاوازیو پەرتەوازیمان نەبوو ، وەلەپێشەوە دەستمان نەئەکرد بەزوڵم و ئازاردانی کەس ، فەرمووی : ڕاست ئەکەن وە ( زەیدی ) کوڕی ( حصین ) کرد بە کاربەدەستیان .

## مردنی ابراهیم :

وەلە ساڵی دەیەمەوە لەتەمەنی شانزە (یا کەمتر یازیاتر وەکوئەڵێن) مـانگیدا إبراهیمی کوڕی پێغەمبەر نەخۆشکەوت وە نەخۆشییەکەی تا ئەهات گران ئەبوو ، وە لە مردنی ترسان ، بۆیە بردیانەوە لای ماریەی دایکی لەلای ئەو جێگـایەی پێیئەڵێن « مشربة أم ابراهیم » دایکی و سیرینی پوری بەدیاریەوەبوون و خزمەتیان ئەکـرد ، کاتێ نەخۆشییەکەی گران بوو ، هەواڵیاندا بەپێغەمبەری خوا ئەویش دەستی (عبدالرحمن) ی کوڕی ( عوف ) گرت و هێزی ئەدایەسەر ئەووچوون بۆلای هەتاگەیشتنە ناوباخە خورماکەی لای جێگاکەیان ، کەبینی ابراهیم لەباوەشی دایکیایەو خەریکە گیان ئەدات ، هەڵیگرتو لەسەر کۆشی خۆی دایناو دڵی قرچەی پێکەوتو چاوی بەخوڕ ئاوی پیائەهاتە خوارەوەو فەرمووی : ئەی ابراهیم ئەگەر ئەمە فەرمانێکی ڕاست و بەڵێنێکی ڕاستی خوایی نەبوایە هەوەڵو

ئاخرمان بەیەك نەگەیشتایە زیاتر لەمە بۆت نارەحەت ئەبووین وە فەرمووی : ابراهیم بەخوا دەسەلاتی هیچمان نیەلای خوا بۆت بکەین ، ئنجـالەگەل ئەم فەرموودەیەدا فرمێسك بەخوڕ ئەهاتە خوارەوە منالەکەیش کیانی ئەدا و دایکیو پوری ئەگریان و هاواریان ئەکرد قەدەغەی نەکردن ، کاتێ کە ابراهیم کۆچی دوایی کردو کیانی نیانەما بێتاقەتی پێغەمبەر زیادی کرد و قرچەی جەرگی ئەبیستراو فەرمووی : چـاو ئەگری و دل نارەحەتەو خەفەت ئەخوا بەلام شتێ نالێین کەخوا لێی نارازی بێ ، بەخوا إبراهیم خەفەتبارین بۆت . کاتێ موسلمانەکان ئەم بێتاقەتیەیان بە پێغەمبەرەوەدی ژیرەکانیان ویستیان بـاری لەشی سووك و بکەن وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا توقەدەغەی ئیمەت ئەکرد لەم هەلوێستانەداو هەندێ فەرمایشی خۆیان بۆباس کرد،ئەویش فەرمووی:من قەدەغەی کریانوخەفەت خواردنم لێ نەکردوون ئەمە بەزەیی‌یەو هەرکەس بەزەیی نەبێ کەس بەزەیی بۆ ئەویش نابێ ، من هـــاوارو لەخۆدانم قەدەغەئەکردو ئیمە نایکەین ، ئەمجار فەرمانیدا شۆردیانو خۆی نوێژی لەسەر کردو لەبقیعا بە فەرمانی خۆی ئەسپەردەیان کرد ، ئاویان رژان بەسەر گۆرەکەیاو خۆی بە دەســـتی پیرۆزی خۆی رێكو پێکی ئەکردو نیشان کردی بۆدانا (وەك ئەوکێلانە ئیستادائەنرێت) وەفەرموی : ئەمە نەزیانی هەیەو نەسود ، بەلام زیندووەکان پێیان خۆشەو فەرمووی : مرۆڤ ئیشێکی کرد باشو پوخت بیکا خواپێیخۆشە .

بەرێکەوت لەرۆژی مردنی ابراهیمدا رۆژگیرا ، موسولمانە سادەکان ئەمەیـان بەمعجزە زانیو وتیان : لەبەر مردنی ابراهیم رۆژگیرا ، کە پێغەمبەری خوا بەمەی زانی نەیهێشت ئەم هەلەیە بەخۆرایی بروات ، وەئەمەی کرد بەدەرسێك بۆ موسلمانان و بۆلابردن و نەهێلانی خەرافات

وشتی پرو پووچ . چووه سەرمنبەرو موسلمانەکانی کۆکردەوەو ئامۆژکاری یەکی بەرزی کردن وفەرمووی : ڕۆژو مانگ دوونیشانو دەسکــــردی خوان بۆمردنو ژیانی کەس ناگیرێن ، کەبینیتان گیران لەگوناه پەشیمان ببنەوەو بکەڕێنەوە بۆلای خواو ناوی خوا بەرنو لێی بپاڕێنەوەو نوێژی بۆبکەن . وەبەم پێیە ئەم ڕاستی یەی خستە ناو موسلمانەکانەوە .

## حەجی ماڵ ئاوایی « حجة الوداع »

لەساڵی دەیەما پێغەمبەری خوا چوو بۆحەجو بەسەرۆکایەتی ئەو گەورەترین حەج کرا کەهەموو موسلمانانی تیا بەشداربنو بتپەرستی تیا نەبێت ، لەساڵی پێشوودا پێی ڕاگەیاندن کەئیتر بت پەرستو ناموسلمان نابێ حەج بکا ، وەئەم حەجە پێی ئەڵێن : حەجی ماڵ ئاوایی ، چونکە دواحەجی پێغەمبەربووە ، وەلەم حەجەدا خواحافیزی کرد لەمەکەوکەعبەو موسلمانان .

لەمانگی ناوجەژنانی ساڵی دەیەما پێغەمبەر دەری بڕی کەئەیــەوێ بچێ بۆحەج وەخۆی سەرۆکایەتی حاجی یەکان ئەکا وئەی زانی کەمردن نزیك بۆتەوە ، ویستی بۆئاخرجار ئەوووڵاتو جێگاو ڕێکـایانە ببینێو ، بەکۆمەڵ چاوی بەمسلمانەکان بکەوێ ، وەئەوەی پێـویست بێ لەئادابو ئەحکامی حەجا لەگەڵ تعلیماتو بـیرو باوەڕە بەرزەکانی ئیسلام پێیان ڕابگەیەنێ . موسلمانان لەهەمولایەکەوە بەدەم ئەم هەواڵە پیرۆزەوە هاتن وکەوتنە ڕێ بۆبەجێ هێنانی ئەم حەجە گەورەیـە وئەم سەفەرە بـەفەڕە ، پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەربێ ـ ئەبودوجانەی لەسەر مەدینە داناو هەموو خێزانەکانی وخاتوفاطمەی کچی بردو لەبیـستو پێنجی‌مانگی ناوجەژنانا کەوتنـە ڕێ ، ژمارەی موسلمانەکان نەوەد هەزار کەس ، وە

هەندێ ئەڵێن سەدو چواردە هەزار کەس بوون ، ئەمانە لەگەڵ پێغەمبەرا ڕۆیشتن ، بێجگە لەموسڵمانەکانی مکەو دەورو بەری وبێجگە لەو موسڵمانانەی کەلەلای یمنەوە هاتن بۆحەج .

ڕۆیشتنو شەو لە ( ذوالحلیفە) مانەوە ، بەیانی هەڵسانو إحرامیان بەستو هەموو چوونە جۆرە بەرگێکی تایبەتی یەوە ، بەمە جوانترین شێوەی یەکسانی یان پیشانی جیهاندا پێغەمبەرو مسڵمانەکان بەیەکجار کەوتنە وتنی ئەم بانگە تایبەتی یەی حەج :

[ لَبَّيْكَ اَللّٰهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاشَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ اِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاشَرِيكَ لَكَ ] وە لەگەڵ وتنەکەی ئەواندا کەژوو کۆسارو بیابانو دۆڵەکان ئاوازەکەیان دووبارە ئەکردەوە دەنگی خواپەرستی جیهانی کەڕ کردبوو . وەبەوپێیە ڕێگایان دایەبەرو ڕۆیشتن هەتا لەکاتی چێشتەنگاودا گەیشتنە مکە ، وەلە « ثنية العليا » وەرژانەمکە ، کەکعبەی لێ دەرکەوت فەرمووی : « اللهم زده تشريفاً وتعظيماً ومهابة وبراً » . پاشان تەوافی کعبەی کرد (حەوت جار بەدەوریا گەڕا) و بەردە ڕەشەکە (الحجرالاسود) ی ماچ کرد ، دوورکعات نوێژی لەشوێنی ابراهیما کرد ، ئەمجار لەئاوی زەمزەمی خواردەوە ، لەدوایدا ( بۆ هاتوچوی نێوانی سەفاو مەرواوە )حەوت جار هاتوچۆی کرد بەسواری ، کە بەرز ئەبووەوە بۆ سەر صفا ئەیفەرموو [ لاإِلٰهَ اِلَّا اللّٰه ، اللّٰه اكبر لاإِلٰهَ إِلَّا اللّٰه وَحْدَهُ ، أَنْجَزَ وَعْدَه نَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ ] .

وە لە هەشتی مانگا چوو بۆ میناو شەوی تیاکردەوە ، وە لە ڕۆژی نۆیەمی مانگا چوو بۆ عرفە و لەوێدا لە ناو ئەو هەموو مرۆڤە زۆرەدا وتارێکی بەرزو شیرین و پڕلەتۆێکڵی ئەوتۆی فەرموو ، کەبەبوودو ... و

باوەڕەکانی اسلامی تیا ڕۆشن کردوە وەبەم وتارە بەنرخە ئەوتری وتاری خواحافیزی « خطبة الوداع » چونکە دوا وتاربوو کە بەشێوەی وتاربێ ، وەلە کاتی فەرموودەکەیا ربیعەی کوڕی أمیەی کوڕی خلف وتارەکەی دووبارە ئەکردەوە تاهەمرو بی‌بیستن (١)

وەهەر لەو ڕۆژەدابوو خوا ئەم ئایەتەی بۆ ناردەخوارەوە « الیوم اکملت لکم دینکم واتممت علیکم نعمتی ورضیت لکم الاسلام دینا » کە عمر ( یا أبوبکر ) بیستی دەستی کردەگریان ، وتیان بۆچی ئەگریت ؟ وتی دوای تەواربوون بەرەو کەم بوونەوەیە ، وە تێگەیی کە نیشـــانەی کۆچی‌دوایی پێغەمبەری خوایە ، وەبێجگە لەم ئایەتە چەند فەرمودەیەکی تری خۆی بوو نیشانەیان ئەکەیان وەکو خۆنازانم ڕەنگە سالێکی ترمن نەیبینمەوە لەمشوێنەدا ، وەلەدوای ئەمەهەموو ئادابەکانی حەجی بەجێ هێنا .. لەبەردباران کردن و قوربانی کردن و سەرتاشین و گەران بەدەوری کعبە وەخۆی ( ٦٢ ) سەری لەو سەد وشترەی کەی هێنابووی بۆ قوربانی سەری بڕی ، هەروشترە لە جیاتی سالێ لەتەمەنی وە علی‌ش و حەوتەکەشی تری ئەوسەربڕی و ،لەپاش مانەوەی دەرۆژ لە ( مکە ) دا بەرەو ( مدینە ) کەتنەرێو هاتنەوە ، کاتێ مدینەی بینی سێ‌جار (اللّٰه‌اکبر) ی کردوو فەرمووی « لَاإِلَٰهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَاشَرِيكَ لَهُ لَكَ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ ، صَدَقَ اللّٰهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ

---

(١) داخی گرانم نەمانتوانی لەبەر کەمی‌دەسەلاتی وتارەکەی پێغەمبەر ( د ، خ ) بنووسین لەم ژیانە بەپشتیینی خوای گەورە لە(پاشکۆ) ی ژیان بەچاپی ئەگەنم .

عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ » ،

، لەم ساڵی دەیەمەدا وەکو ساڵی پێشوو نوێنەری تیرەعەرەبەکان لە هەموو لایەکەوە پۆل‌پۆل ئەهاتن بۆ ( مدینەو ) ئەهاتنە ژێر سایەی ئیسلام لەوانە کەموسڵمان بوون تیرەی نەجران بوونو ئیسلامەتی‌یان ئاشکراکرد .

## ساڵی یانزەهەم : پێغەمبەری درۆینە

لەناوتیرەی ( بنی حنیفه ) دا ( مسیلمه ) ی درۆزن کەوتە داواکردنی پێغەمبەرێتی ، وەلەگەڵ نوێنەراکانی ( بنی‌حنیفه ) دا هات بۆلای پێغەمبەر و ئەی‌وت : محمد لە دوای خۆی کاربەدەستی بدابەمن شوێنی ئەکەووم ، پێغەمبەر گەڵایەکی بە دەستەوە بوو فەرمووی : ئەم گەڵایەت نادەمێ . لەناو خزمەکانیا هەندێ بە نەفامیو دەمارگیری شوێنی کەوتن ، وەنامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا نووسی و بەدووپیاوا بۆی نارد و ئەڵێ : (لەمسیلمەی پێغەمبەرەوە بۆمحمدی پێغەمبەر ئەم خـــاکە زۆرە نیوەی بۆمن و نیوەی بۆتۆ ) . پێغەمبەر فەرمانی‌دا نامەیەکیان بەم جۆرە بۆ بنووسێ : ( بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبـــان . لە محمد پێغەمبەری خواوە بۆ مسیلمەی درۆزن و ســاختەچی ئەم خاکو جیهانە هینی خوایە ئەیدا بەهەر کەسێ مەیلی‌بێ ، سەلام لەشوێن کەوتووانی ڕێگای خوابێت ) .

وەلەدواییدا لەجەنگی پاش‌کەزبووەکانا ( خالد ) شکانیو کوشتی .

( أسود ) ی ( عنسی ) : لە یەمەنا ( أسود ) ی ( عنســـی ) بەداوای پێغەمبەرێتی وە لەگەڵ هەندێ لە شوێن کەوتووە درۆزنەکانیـا چوو بۆ ( نجران ) و لەوێ کاربەدەستی ئیسلامی کوشت و ژنەکەی برد بۆخۆی ، وە پێغەمبەر هەواڵی نـارد کەبیکوژن ، وەژنی کاربەدەســـتە موسڵمانەکە هەلی بۆهەڵکەوت و لە تۆڵەی مێردەکەیا کوشتی .

## ڕێکخستنی سوپای ( أسامه )

گاورو جووله‌که که ( أهل کتاب ) ی ئاسمانی بوون ئه‌بوایه به‌بێ خۆگرتن موسلمان بونایه ، چونکه کتێبه پیرۆزه‌که‌یان مژده‌ی داوه به‌هاتنی پێغه‌مبه‌ری ئیسـلام و داوای شوێن که‌وتنی لی کـردن ، که‌چی‌زیاترله بت په‌رسته‌کان به‌رهه‌ڵستی بڵاوبوونه‌وه‌ی ئیسلامیان کرد و ئازاری پێغه‌مبه‌رو موسلمانه‌کانیان ئه‌دا و له‌پیلان ڕێك‌خـستن نه‌ئه‌وه‌ستان ، ئه‌وه‌بوو هه‌ندێ له‌ده‌وری جووله‌که‌مان باس‌کرد ، ئه‌ی گاوره‌کانی ڕۆم که‌دراوسێی ولاتی ئیسـلامین .. ئه‌وه‌ته هه‌موو جارێ ئازاری موسلمـانه‌کان ئه‌ده‌ن و بوونه کۆسپ و ڕێگایه به بڵاوکردنه‌وه‌ی ئیسلام ئه‌کرن ، خۆئیسلام هاتووه بۆ هه‌موو مرۆڤێك‌و ئه‌بێ بکرێت به به‌رنامه‌ی ته‌واوی سه‌رزه‌وی و له‌سنوری عه‌ره‌ب‌و نیوه دورگه‌دا نه‌وه‌ستێته‌وه‌و به ته‌واوی سه‌رزه‌وی ڕۆشن بکاته‌وه

بۆیه پێغه‌مبه‌ری خوا ـ به‌هه‌زاران درووردو ستایشی له‌سه‌ربێ ـ له‌پێش هه‌موو لایه‌کا بیری له « ڕۆم » کردۆوه ویستی له‌ڕۆمـه‌وه ده‌ست پێ بـکا ئه‌وه‌بوو زۆری پێ‌نه‌چوو له‌مکه‌وه هاتنه‌وه بۆمدینه‌وفه‌رمانی‌دا به‌ڕێك‌خستنی سوپایه‌کی گه‌وره بۆسه‌ر ولاتی ڕۆم بۆشام‌و ( فلسطین ) ، له‌(٢٤) ی مانگی (صفری) ساڵی یانزه‌دا وه‌له‌ناوسوپاکه‌دا کـــوچه‌ریه پێشوه‌کانی له‌وێنه‌ی « أبوبکرو عمر » ی تیابوو وه ( أسامه ) ی کوری ( زید ) ی کرد به فه‌رمان ده‌ری سوپاکه‌و وفه‌رمانی پیادا که‌بڕوا بۆئه‌وشوێنه‌ی زیدی باوکی تیا شه‌هیدکراوه ، فه‌رمووی : له‌به‌یانیا شه‌به‌یخون‌و هێرش بکه‌ره سه‌ردوژمن وبه‌کوشتن‌و به‌سووتاندن کۆیان لێ مه‌که ، وه‌کارێکی وابـکه ده‌سیان لێ بوه‌شێنرێ پێش‌ئه‌وه‌ی هه‌واڵ بڵاوبێته‌وه‌و دوژمنی زۆرتان لێ‌کۆبێته‌وه ، وه ئه‌گه‌ر خوا سه‌ری خستن زۆر مه‌مێننه‌وه وچاودێرو شاره‌زا به‌هه‌موو لایه‌کا

وبلاۆبکەرەوە ، وەفەرمووی : غەزا بکەن بەناوی خواو لەڕێگەی خوادا و بجەنگە لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیان نیە بەخوا .

وەلەبەرئەوەی ( أسامە ) گەنج بوو تەمەنی لەهەژدە تێنەپەڕیبوو هەندێ لەساویلکەکان ئەم فەرمانەیان پێناخۆش بوو ، ئەیان وت چۆن منالێکی وا ئەکرێ بەفەرماندەی سوپایەکی ئەوتۆ هەموو گەورەی کۆچەری و یاریدەدەرەکانی تیابێ ! کەئەم رەخنەیە گەیشتەوە بەپێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ عاجزبوو فەرمووی : ( خەڵکینە ئەوە چی یە ئەیبیستم وتوتانە لەباسی فەرماندەیی أسامەدا ؟ ئەگەر تانە لەفەرماندەیی أسامە ئەدەن ئەبێ تانە لە فەرماندەیی باوکیشی بدەن لەپێش خۆیا ، بەخوا (زید) شایانی فەرماندەیی بوو ، کوڕەکەیشی شایانە بۆفەرماندەیی وەمن خۆشم ئەوێ وەهیوای هەموو خێرو چاکەیەکی لێ ئەکرێ ، بەجوانی لەگەڵیا بجولێنەوەو لەپیاوە چاکەکانتانە). وەئەم جار بەبێ ملەجەڕە هەموو چونە ڕیزی سوپاکەیەوەو سوپاکە ڕێك کەوت هەتا گەیشتە لای «جرف (١)» وخەریکی ڕێك کەوتن بوون بەڵام نەخۆش کەوتنی پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ وەستاندنی و نەیان توانی پێغەمبەری خوا بەجێ بێلن .

## بەشی سیانزەهەم
## نەخۆش کەوتنی پێغەمبەری خوا

پێغەمبەری خواو ڕزگارکەری کۆمەڵی مرۆڤایەتی بەڵکو ڕزگار کەری گێتی بەڕوویەکی گشتی لەئاسۆی ڕزگاری کەری یەوە هەڵهات و سەرزەوی ڕۆشن کردەوەو بیرو بارەڕێکی ڕێك و پێك و هەتا هەتایی هێنا و دای ـ

---

(١) شوێنێکە لەنزیکی مدینەوە

مەزراندو ، کۆمەڵی بۆدروست کردو ، دەوڵەتی لەسەر بەرپا کردو ڕێو شوێنەکانی بەتەواوی دیاریو ئاشکرا کردو چی پێویـستی پێبێ بۆژیانو بۆ بەڕێوە بردنی مرۆڤو بۆئاوەدانکردنەوەی سەرزەویو گیتی هەموو بەرۆشنی هێناو دەری بڕیو ئیتر ئیشی لەسەر زەویدا نەماو شاگردەکانو قوتابیەـ کانی ئەتوانن هەڵسن بەکەیاندنو بەخێوکردنو پاراستنی ، ئیتر ئەم بڕوا بۆژیانی ڕاستەقینەو بۆلای خوای پەروەردگار .

ماوەیەك بوو فەرمایشی وای ئەفەرموو ئەوەی ئەکەیاند نزیك بووەتەوە کۆچ کردنی لەجیهانو ڕۆیشتنی بۆ لای خوای پەروەردگار ، بۆیـە سوپـا گەورەکەی أسامه لە (جۆرف) وەستانو قاچیان هێـزی ڕۆیشتنی نەبـوو کە زانیان پێغەمبەری خوا تووشی نەخۆشی یەکی مەترسی ائ کراو بوە چۆن بتوانن بڕۆن ؟ خۆزنزیکە خۆشەویـستترین کەس لەبەرچاویان ون بێ و ئیتر چاویان پێی نەکەوێت ! وە هاتنەوە بۆناوشار بەم دەنگ و باسەوە .

لەکۆتایی مانگی سەفەری ساڵی یانزەهەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ـ بەهەزارن درروودی لەسەربێ ـ نەخۆش کەوت ، بەڵام نەخۆشی یەکی گران ( تاو سەرئێشە ) ، بەڵام نەك ئەوەی ئێمە ئەیزانین . کاتێ یارەکانی باسی گرانی تاو گەرمی یەکەیان ئەکرد فەرموی «بەڵێ من تائەگرم دووئەوەندەی تای ئێوە گەرمو نارەحەتە » .

پێغەمبەری خوا نەخۆشی داگیری کردو لـەگەڵ ئەوەدا هەر بەسەر ژنە بەڕێزەکانی یەوە ئەگەڕا هاتەلای خاتوعائشە و سەری ئەیەشـا وتی : ئای سەرم ، پێغەمبەری خوا کەهەستی بەنەخۆشی یە گەورەکەی خۆی ئەکرد فەرمووی پێی « ئای سەرم مـن ئای سـەرم » . لەگەڵ ئەو ئێش و نەخۆشی یەیا ئەیویست هەر بەخۆشی و شۆخی لەگەڵ خێزانە کەیا بدوێ

و فەرمووی بەعایشە کەهاواری سەری ئەکرد «عـــایشە چی ئەبێ ئەگەر لەپێش منا بمریو ، من هەڵسم بەدەستی خۆم کفنت بکەم و نوێژت لەسەربکەم و ئەسپەردەی خاکت بکەم » ئەم وتە شیرینە غیرەتی لە دڵی عائیشەدا جولاًن و نۆزێ چاکتر بوو ، بەوحاڵەتەوە هەر بەنۆرە بەســەر خێزانەکانیا ئەگەڕا هەتـا ئێش و ئـازار لەوزەی خست و تەوانای ئەمـاو پێویستی بە ئیسراحەت و خزمەت کردن بوو ، نـاردی هەموو خێزانەکانی هاتن و داوای ئیزنی لێ کردن کەبچێ لەماڵی عایشەدا بخەوێ ، ئەوانیش کە حـاڵەکەیان بینی هەموو ڕاز بوون ، ئەمجار سـەری بەست و لەسەر شانی « علی ابوطالب » و فضلی کوڕی عباس (یا عبادە کوڕی عبدالمطلب) هات بۆ ماڵی عایشەو بەهەزار حاڵ قاچی هەڵی ئەگرت . لەگەڵ ئەو نەخۆشی‌یەدا هەموو جارێ بۆ نوێژەکانی ئەچوو بـۆ مزگەوت و بەرنوێژی بۆموسڵمانەکان ئەکرد بەڵام نەی ئەتوانی دابنیشێ و فەرمایشیان بۆ بکا ، ڕۆژێکیان تاکەی زۆری لێ‌سەند بەڕادەیەك گەرم بوو کەس نەی‌ئەتوانی لەســەر بەرگەکەیەوە دەستی لێ بکا ، ئەویش ویستی نەختێ ئەو گەرمایەی بشـکێنێ بچێتە نـاو یارەکانی دوا وتـاریان پێ ڕابگەیەنێ ، فەرمووی : بەخێزانەکانی کە هەموو ڕۆژێ و بگرە هەمیشە هەموویـــان ئەچوون بۆ دیاری و بەچاو بێ کەوتنی دڵیان فێنك ئەبوەوە . فەرمووی : حەفت کوپە ئاوی جیاواز لەبیرەکان بێنن بیکەن بەسەرما ، عایشە ئەڵێ : هێنامان لەتەشتێکی حەفصەدا دامان ناو ئاومان کرد بەسەریا هەتا فەرمووی بەسـە بەسـە ئینجا خۆی پۆشتە کردەوە و سەری بەستەوە و بانگی « فضلی کوڕی عباس » ی‌مامی کرد دەستی گرت‌و چوون بۆ مزگەوت ، موسڵمانەکان بەبینی گەشانەوە و بانگ درا هەموو کۆبونەوە ئەویش لەسەر منبەرەکە

دانیشت‌و دەستی کردە سوپاس‌و ستایشی خواو پاشان دەستی کردە دوعای خێر بۆ جەنگاوەرانی « أحد » و ئەمجار فەرمووی :

[ موسلمانەکان بیستوومە ئەترسن لەمردنی پێغەمبەرەکەتان ! ئایا هیــچ پێغەمبەرێکی‌تر لەمەوپێش ماوەتەوە هەتا من بمێنمــەوە لەناوتانا ؟ بزانن من ئەڕۆم بۆخزمەتی خواو ئێوەیش دێن بۆلای من‌و پێم ئەگەن ، وەسیەت‌و ئامۆژگاریتان ئەکەم کەبەباشی بجوولێنەوە لەگەڵ کۆچەریە پێشینەکانا ، وە ئامۆژگاری کۆچەری‌یەکانیش ئەکەم باش بن لەناوخۆیانا . خوا ئەفەرموێ : [ والعصر ان الانسان لفی خسر الا الذین آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر ] وەئیش‌و کار بەپێی ئیزنی خوا ئەڕوا ، درەنگ هاتنی شتێ نەتانخاتە پەلەکردن لێی ، چونکە خوا لەبەر پەلە کـردنی کەس پەلە ناکات ، وەهەرکەسێ بیـەوێ زاڵ بێ بەسەر فەرمانی خـوادا خوا ژێری ئەخا ، وەهەرکەسێ بیـەوێ خوا بخەڵەتێنێ خوا بـەگـوێرەی خەڵەتاننەکەی خۆی لەگەڵیا ئەڕوا [ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ] (١) وە ئامۆژگاریتان ئەکەم بەچاکە کـردن لەگەڵ یاریدە دەرەکانی (مدینە) کەئەوان یارمەتی ئێوەیان داو بەخۆیـان گرتن ، ئایا نەیان کردن بەهاوبەش لەماڵا ؟ لەسامانا ؟ ئایا خۆیان لەبیر نەچوو لەبەرئێوە ؟ هەرکەسێ کاربەدەستی درایە کەفەرمان ڕەوایی بکا لەنێوانی دووکەسا چاکە لەچاکە کەیان وەربگرێ ولەخراپە کەریان ببوورێ ، خۆتان هەڵنەنێن بەسەریانا ، وەبزانن من پێشڕەوی ئێوەم‌و ئێوەش پێـم ئەگەن ، وەجێگامان بۆبەیەك گەیشتن سەرحەوزەکەیـــە ، وە هەرکەسێ ئەیەوێ لەوێدا لەپاشە ڕۆژا بگا بەمن ئەبێ دەس‌و زمانی بگرێ بەگوێرەی

---

(١) سورة محمد : ٢٢

پێویست نەبێ .

ئەمجار ویستی لەڕووی دادپەروەریەوە بدوێ وبەدەرسێکی کردەوەیی بۆیان ڕۆشن بکاتەوە فەرمووی : ( موسلمانەکان هەرکەسێ دارێکم لێداوە ئەوە پشتم دارەکەی لێبداتەوە ، وەهەرکەسێ جنێوێکم پێداوە جنێوەکەم پێبداتەوە ، وەرق و قین سروشتی من نیە ، وەخۆشەویستتان لای من ئەوەیە کەهەقی خۆی وەربگرێ یان ئازادم بکا ، من ئەمەوێ بەخزمەتی خوابگەم وهیچم لەدلا نەبێ وەوا ئەزانم ئەمە بەس نیە هەتا چەند جار پێتان ڕا ئەگەیەنم ) فضل ئەلێ : ئەمجار دابەزی نوێژی نیوەڕۆی کردو پاشان چووەوە سەر مینبەرو دەستی کردەوە بەفەرموودەکەی پێشووی وەشتی تریش ، پیاوێك ڕاست بووەوە وتی : ئەی پێغەمبــەری خوا سێ درهەمم لەلاتە پێغەمبەر ـ دروودی لەسەربێ ـ فەرمووی : فضل بیدەرەوە . پاشان فەرمووی: مرۆڤەکان هەرکەسێ هەرشتێکی لایە بیدانەوە ، نەلێ ئابڕو چوونی جیهانی یە ئابڕوچوونی جیهانی ئاسانترە لەشەرمەزاری پاشە ڕۆژ ،

دوای ئەم وتارو ووتوویژە بەکەلکە هاتەوە بۆماڵە بچکۆلەکەی هەتا نەختێ لەسەرجێکاکەی ڕاکشێ وماندوویی یەکی دەرچێ یا تۆزێ باری لەشی سووك بێ وەهەرکاتێ بەلاشەیا ڕابینیایـە ئەچــوە مزگەوت وئامۆژکاری یارەکانی ئەکردو چاوێکی ئەگێڕا بەیارە موسلمانەکانو خوا پەرستەکانیا . هەتا پێی ئەچـوو باری لەشی قـورس‌تر ئەبوو ، ئێش‌و ئازاری پـەرەی ئەسەند ، وەلەبەرئەوەی تاکەی توندو زۆرگەرم بوو قاپێ ئاوی سـاردیان لادانابوو هەمو جارێ دەستی تێ‌ئەخستو ئەی‌هێنا بەسەرو رووی خۆیا تا نەختێ فێنکی بکاتەوە ، وە زۆرجار لەسەرخۆی ئەچـوو پاشان ئەهـاتەوە سەرخۆی ، هەتا ڕۆژێکیان لەبەر زۆر ناڕەحەتی یەکەی خاتوفاطمە دەستی

کرده گریان‌و وتی : هاوار بۆباوکم . ئه‌ویش چاوی کرده‌وه وفه‌رمووی : له‌م ڕۆ زیاتر هاوار بۆباوکت نیه .

أسامه ئه‌ڵێ : که‌زانیمان به‌وڕاده‌یه باری له‌شـــی پێغه‌مبه‌ری خـوا ـ د . خ ـ گران بوه دابه‌زیم وسوپاکه‌یش له‌گه‌ڵما دابه‌زین‌و هاتینـه‌وه بۆناوشار ، که‌چوینه خزمه‌تی ئه‌بینم بێده‌نگه‌و قسه ناکات ، که‌منی بیـنی ده‌ستی هه‌ڵبڕی بۆئاسمان‌و له‌سه‌رمن داینا‌و زانیم بۆمن ئه‌پاڕێته‌وه .

ڕۆژێ له‌کاتی بێهۆشی‌یه‌که‌یا خاوو خێزانه‌که‌ی هاوارو بێتاقه‌تی‌یـان کرد ، کاتێ هاته‌وه سه‌ر هۆش پێی ناخۆشبوو قه‌ده‌غه‌ی لێکـردن . که نه‌خۆشی‌یه‌که‌ی به‌وپێ‌یه زۆری لێ‌سه‌ندو نه‌ی‌توانی بچێ بۆمزگه‌وت بۆبه‌ر نوێژی کردن فه‌رمووی : بڵێن به‌أبوبکر به‌رنوێژی بکا بۆموسڵمانان . به‌ڵام خاتوعایشه له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌لایه‌که‌وه حه‌زی ئه‌کرد پێغه‌مبه‌ر خۆی بچێ بۆ مزگه‌وت تابێته هۆی له‌ش سووك بوونی ، وه‌له‌لایه‌کی تره‌وه ئه‌ترسـا که خه‌ڵکی پێ‌یان ناخۆش بێ أبوبکر بچێته جێگاکه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، بۆیه وتی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، أبوبکر پیاوێکی دڵ‌نه‌رمه‌و ناتوانێ له‌جێگای تۆدا ڕاوه‌ستێ . فه‌رمووی : بڵێن به‌أبوبکر : به‌رنوێژی بکا بۆموسڵمانان. عایشه دووباره بیانووه‌که‌ی پیشان دایه‌وه . پێغـه‌مبه‌ری خوا ـ د . خ ـ توڕه‌بوو فه‌رمووی : ئێوه ژنه‌کانی لای یوسفن ( إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ ) بڵێن به‌أبوبکر : با به‌رنوێژی بکا بۆموسڵمانان . أبوبکر له‌حه‌ڤده نوێژا به‌ر نوێژی کرد . له‌نوێژی خه‌وتنانی هه‌ینی‌یـه‌وه هه‌تـا نوێژی به‌یانی ڕۆژی دووشه‌مه . وه‌له‌م ڕۆژانه‌ی که‌نه‌چوو بۆمزگه‌وت باری له‌شی زیاتر گران بوو ، ئه‌ی‌فه‌رموو : تـاو نه‌خۆشـی من ئه‌وه‌نده‌ی تاو نه‌خۆشیی دوان لـه ئێوه گرانتره .

لەم کاتی نارەحەتی و بێتاقەتی‌یەدا جارێکیان زۆر لە یارەکانی لـە خزمەتیابون فەرمووی : « بادەی پێنوس‌و تیاسم بۆ بێنن تا نوسراوێکتان بۆ بەجێ بێلم کەئیتر هەرگیز رێتان لێتێك نەچێ » ئیتر دیسان لەهۆش خۆی چوو ، موسلمانەکان کەوتنە وت‌وێژ . . هەندێکیان ـ ئەڵێن عمر لەمانەدا بوو ـ وتیان : ئەوەتە پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ زۆر زۆر نارەحەتە ئازاری مەدەن ، ئێمە قورئانمان لەبەر دەستایە و بەسمانە و زیاترمان ناوێ . هەندێ تریان وتیان : بی‌یان هێنن با بۆمان بنوسێ ، هەتا دوایی سەرمان لێتێك نەچێ . کـە پێغەمبەر سەری بەرزکردەوە و ئەم نارێکی‌یانەی بینی فەرمووی : هەڵسن ، نابێ لەلای پێغەمبەر نارێکی بکرێ ئیتر وازی لەنووسین هێنا .

عبداللّٰهی کوری (کعب)ی کورێ مالك ئەگێرێتەوە لە عبداللّٰهی کوری عباس‌ەوە : کە علی کوری أبی‌طالب هاتەدەرەوە لە لای پێغەمبەری خوا لەو نەخۆشی‌یەی پیایا رۆیی ، مەردمەکان لێیان پرسی : أبوحسن ئێستا پێغەمەری خوا چۆنە ؟ ووتی : سوپاس بۆخوا ئێستا باشە . عباس کوری عبدالمطلب دەستي کرت و وتی : ئایا ئەزانی تۆدوای سێ رۆژی تر ئەبیتە کوتەك ؟ من وائەبینم پێغەمبەری خوا بەم نەخۆشی‌یە کۆچی دوایی‌ئەکات ، من‌دەم‌و چاوی بەرەی عبدالمناف ئەناسم ، لەم‌کاتی مردنەدا ... برۆ بۆلای پێغەمبەرو لێی پرسە ، بزانە دوای ئەو ئیش‌و کار بۆکێ‌ئەبێ ؟ ئەگەر بۆ خۆمان ئەبێ تێ‌ئەگەین ، وەئەگەر بۆیەکێ‌ترئەبێ با ئامۆژگاری باشەی بکابۆمان . علی وتی : بەخوا ئەگەر لێمان پرسـی و نەی‌داینێ دوای ئەو ئیترکەس‌نامان داتێ ، بەخوا هەرگیز داوای شتی‌وەها لەپێغەمبەر ناکەم .

لەم کاتانەدا پێغەمبەر ـ د . خ ـ هەرخەمی موسلمانەکان و مبادئەکانی

ئیسلامی بوو ئەی‌ویست هەمیشە بیریان بخاتەوە ئەترسا کە لەدوای خۆی ـ وەکو میللەتە پێشینەکان ـ بکەونە شوێن شتی پڕوپوچ و خەرافیات . بۆیە جارێکیان کۆمەڵێکی کەورەی لەلا بوو، کاتێ لەبێ‌هۆشی هاتەوە سەرخۆی و فەرمووی : « نەفرین (لعنت) ی خوا لەسەر ئەو جوولەکەو گاوورانە کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردوە بەمزگەوت . بەمەلەکردەوەکانیان ئەی‌ترسانن .

وە زۆر بەدەربەس بوو بۆ نوێژو بەسەر پەرشتی‌کردنی ژنو منداڵ و پێوەند ، زۆر ئامۆژکاری لەم بابەتەوە فەرموو .

## کۆچی یەکجاری

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ ماوەی سێانزە ڕۆژ بەو نەخۆشی‌یە گرانەوە مایەوە ، هەتا لەڕۆژەکانی دواییدا لەوزەی خست و توانای نەما بچێتە مزگەوت و بەرنوێژی بکا ، أبوبکری لە جێی خۆی نارد بۆ بەرنوێژی هەتا ئەوشەوەی کە لە ڕۆژەکەیا پەردەی یەکجاری ، دادرایەوە بەسەرڕووی شیرینو پیرۆزیاو ڕۆیی بۆخزمەتی خوای پەروەردگار ئەوشەوە هەندێ تاکەی سووك بوو و کەمێ باری لەشی هێواش بووەوە ، لەکاتی نوێژی بەیانیدا سەری پێچاو ، لەسەر شانی علی و فضل چوو بۆ مزگەت ، لەوکاتەدا أبوبکر بەرنوێژی بۆ موسلمانان ئەکرد ، کە بینی‌یان پێغەمبەری خوا هات بۆمزگەوت خەریك‌بوون لەخۆشی‌یا نوێژەکەیان ببڕن ، بەڵام ئەو دەستی پیرۆزی لێ‌ڕاوەشاندن کە بەردەوام‌بن و نوێژەکەتان مەبڕن ، أبوبکرویستی جێگاکەی بۆچۆل بکاو پێغەمبەر خۆی بەرنوێژی‌یەکە بکا ، پێغەمبەر دەستی نابە پشتیاو فەرمووی نوێژەکەیان بۆ بکە . خۆیشی لەلای ڕاستی أبوبکرەوە بەدانیشتنەوە نوێژەکەی کرد ، کە لێ‌بوونەوە پێغەمبەر ڕووی تێ‌کردن و فەرمووی بەدەنگێکی‌وا کە ئەوانەی

لە دەرەوەی مزگەوتیش بوون بیستیان :

« موسڵمانەکان ئاگر هەڵگیرساوە و فیتنەو پەشێوی وەکو تاریکایی تاریکەشەو ڕووی کردوەو وابەڕێوە ، بەخوا من بیانووم بۆکەس نەهێڵاوە کە دەستی پێ بگرێ ، وەبەخوا هەرچی قورئان حەلاڵی نەکردبێ بەحەلاڵم دانەناوە و هەرچی قورئان حەرمی نەکردبێ بەحەرامم دانەناوە ، نەفرین « لعنت » ی خوا لەوانە بێ کە گۆڕەکان ئەکەن بەمزگەوت »

بەم لەش سووك بوونەی پێغەمبەر یارە موسڵمانەکان زۆر دڵشادمان بوون ، بەتەمای ئەوەبوون کەچاك بوبێ و نەخۆشی بەری دابێو ئەو سەرۆکە بەڕێزەو ئەو گەورە لێ هاتووەو ئەو پێشەوا ڕاســتە قینە دڵسۆزەیان ئەمجارەش لەدەس دەرنەچێ . هەتا ( أسامە ) ئەویست داوای ئیزنی لێ بکا کە بەسوپاکەیەوە بڕوا بۆشام ، وە ( أبوبکر )و عمرو علیو یارەکانی تریش چوون بەلای ئیشو کاریانەوە و بڵاوەیان لێ کردو دڵخۆش بوون بەچـاك بونەوەی پێغەمبەری خوا .

بەڵێ یارە شیرینەکان بەتەمای چاك بوونەوەی پێغەمبەری خوابوون و هەریەکەیان چووبەلایەکاو دەوریان چۆڵ کرد . بەڵام ئەوچاك بوونەی ئەوان هەستیان پی کرد بریق بوو لەوماوە لەش سووکی یەی کە پێش ڕەوی مەرگ بوو .

خاتوو عایشە ئەڵێ : پێغەمبەری خوا هاتەوە ژوورەکەی من ولاشەی قورس بوو داگیرساو ســەری کردە سەر کۆشم و ڕاکشـا ، بەوپێیە پێغەمبەری خوا سەری لەباوەشی منابوو گیانی شیرینی بەخوا ســپارد ، منیش لەگەڵ ژنانا دەستم کرد بەشین و زاریو گریان و لەخۆدان ...

## بێ‌تاقەتی موسلمانان :

رۆژی دووشەممە دوازەی مانگی ( ربیع الأول ) سالی سیانزەهەمی کۆچی بەری کەوتی ( ٦٣٣/٦/٨ ) زاینی لە تەمەنی شەست و سێ سالی پێغەمبەری خوا و ڕزگارکەری گرۆی مرۆڤایەتی و تەواوی بوو نەوەر عەتامەتایە کۆچی‌دوایی کرد و ولزی لەم ژیانەو لەم جیهانە هێنا و ڕۆیی بۆخزمەتی خوای پەروەردکاری بێ‌وێنە .

کاتێ ئەم هەواڵە پڕ لە داخ و ناسـۆرە بڵاو بووە وە گەورەیی کارەساتەکە تینی کردە سەر دل و مێشك و هەست و جەستەی یارە شیرینەکانی و ، خەریك بووشپرزەیان بکا : عثمان لال بوو دەمی کۆی‌نەئەکرد علی دانیشتەو جولەی لێبرا ، عبدللەی کوری أنیس نەخۆش کەت و ئەو نەخۆشی‌یەی درێژەی کێشا تا کۆچی دوایی پێ‌کرد ، عمری کوری خطاب جۆرە تێك‌چونێك ڕووی تێ‌کرد .. چو بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا - درروودی لەسەربێ - باوەری بەهەواڵی مردنەکەی نەبوو بینی ناجولێتەوەو نیشانەی زیندویەتی پێوەنیەو وتی : لە سەرخۆی‌چووەو دوای ماوەیەك دێتەوە سەرخۆی ، ( مغیرە ) ویستی تێی‌ی بگەیەنێ کە کارە ساتەکە ڕاستە ، بێ‌سودبوو وتی : درۆئەکەیت ، بەیەکەوە چوون بۆ مزگەوت و لەوێ کردی بەوهەراو ئەیوت : کۆمەڵێ لە دوو ڕووەکان ( منـافقەکان ) وائەزانن پێغەمبەری خوا مردووە ، بەخوا نەمردووە و چووە بۆ خزمەتی خوای خۆی ، وەکو ( موسی‌ی کوری عمران ) کەچل شەو لەکەلەکەی دوور کەوتەوەو هەموو وتیان : مردووە ، ئەیش مردبوو هاتەوە نـاویان ، بەخوا پێغەمبەری خوایش دێتەوەو دەس و قاچی ئەوانە ئەبڕێتەوە کەوا ئەزانن مردووە . لەڕیوایەتێکا ئەلێ عمر شمشێری گرت

بە دەستەوە و وتی : خەڵکینە زمانی خۆتان بگرن دەربارەی پێغەمبەر ، پێغەمبەر نەمردووە ، بەخوا بیبەم هەرکەسێ بڵێ : مردووە بەم شمشێرە ئەدەم بەتەوقی سەریا .

موسـلمانەکانی تریش هەریەکە بەجۆرێ ئەم کارەساتە بێ تاقەتی کردبوون و لەنێوانی باوەڕ کردن و باوەڕ نەکردنابوون بەڕووداوی ڕووداوەکە وەتێکرا بارێکی لەوزەدانەبوو ناڕەحەتی کردبوون و ،سەرزەوی یان لێ هاتبووەوە یەلکو ڕۆژی ڕووناکیان لێ بووبوو بەشەوە زەنگ .

موسلمانەکان لەم کاتەدا بوون و هەوال گەیی بە أبوبکر لەسەراوردی مەدینەوە ، ئەویش بەپەلە هات و بینی مزگەوت جەنجاڵەو پڕە لە غەوغا ، گوێی نەدایێ و چوو بۆژوورەکەی عایشەو بینی لاشە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا - درودی لەسەربێ - ڕاکشـاوە و قوماشێکی یەمانی دراوە بەسـەر ڕووی شیرینیا ، أبوبکر بەهێواشی قومـاشەکەی لەسەر ڕووی لاداو بینی ڕاستە جیهانی بەجێ هێشتووە ، مـاچی کردو وتی بەڕاستی ئەومردنەی لە سـەرت دانرابوو چەشتت ئیتر مردنی ترنابینی ، دایك و باوكم فیدات بێ بەپاکی ژیایت و بەپاکیش مردی . هەڵسـاو هات بۆ مزگەوت و بینی عمر هەر ئەدوێ و ئەیەوێ بەخەڵکەکەی بسەلمێنێ کە پێغەمەر نەمردووە ، خەڵکەکە لەگەڵ أبوبکریان دی ڕیان بۆداو ئەویش هاتەپێشەوە وتی : عمر لەسەرخۆت بە بەلاّم عمر گڕی گرتبوو دانەئەمرکایەوە . أبوبکر سوپاس و ستایشی خوای کردو وتی :

« موسلمانەکان هەرکەس محمدی ئەپەرست محمد مرد ، وەهەرکەس خوای پەروەردکار ئەپەرستێ خوا زیندووە نامرێ . ئینجـا ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ( إنك ميت وإنهم ميتون ) ( وَمَا مُحَمَّدٌ إلاّ رَسُولٌ قَدخَلَتْ

مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَـــاتَ أَوْقُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللهَ شَيْئاً وَسَيَجْزِي اللهُ الشَّاكِرِينَ )[1] عمر كەگوێی لەأبوبكر بوو هۆشی هـاتەوە بەرخۆیو زانی مردنەكە ڕاستەو تێگەیی ، لیـرەدا خەریك بوو لەجوولە بكەوێ . لەدواییدا ئەیوت : بەخوا ئەتوت تائەو كاتە ئەو ئایەتەم نەبیستبوو ،

بەم پێیە أبوبكر ـ خوا لێی ڕازی بێ ـ بەئازایی‌و دان بەخۆداگرتن وئارام توانی زاڵ بێ بەسەرسۆزی دەروونیاو توانی موسڵمانەكان بگێڕێتەوە . ئەگەر أبوبكر ئەوهەڵوێستە ( ایجابی ) یەی نەبوایە ئەبوایە هەرلەودەمەدا ئیسلامەتی وپەیامەكەی پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ بكـوژایەتەوەو لەناو بچوایە ، خۆئەوەبوو هەربەبڵاوبوونەوەی هەواڵەكە زوربەی تیرە عەرەبەكان لەئیسلام وەرگەڕانەوە . بەڵام پاڵەوانی‌و دوربینی‌و ئارام وبلیمەتی أبوبكر بووبەهۆی زاڵ‌بوون بەسەر تەنـگو چەڵەمەكەداو توانی موسڵمـانەكان دابمركێنێ وهێواشیان بكاتەوە .

## دانانی جێ نشین

پێغەمبەری خوا ـ درودی لەسەربێ ـ كۆچی دوایی كـرد بێ‌ئەوەی جێ‌نشینێ بەجێ‌بێڵێ ویەكێ دیاری بكا ، هەتا ئەوجێگایە نەبێتە كەلەپور وچێنێ یابەرەبابێ دەستی بەسەرا نەگرێ‌و ئەمە نەبێتە یاسا لەناوموسڵمانانا ـ ئەگەرچی بەداخەوە زۆری نەخایان وای لێ‌هات ـ .

كاتێ موسڵمانەكان زانی‌یان ڕاستە پێغەمبەری خوا بەجـێ‌ی هێشتوون بەپێویستیان زانی كەلەپێش ئەوەی ( تەرمە ) موقەرگەكەی ئەسپەردەی خاك بكەن . پێش ئەمە جێ‌نشین بۆخۆیان دیاری بكـەن ، هەتا ئیش‌و كارەكان بگرێتە دەس وموسڵمانەكان لەلایا كۆببنەوە ، نەوەك دوژمن ئەم‌كاتە



(١) آل عمران : ١٤٤

بەعەل بزانێو پەلاماریان بدەو ئەوانیش پەرتەوازەو بێ سەرکەورەو فەرمانبەدە بن .

## جێنشینی أبوبكر

ئەم پێویستییە کەوردو گرانە بالی نا بەموسلمانانەوە بۆ دیاری کردنی جێنشین ، ئەوانیش کۆمەل کۆمەل لێی وەستانەوە . کۆمەلێ لەیاریدەدەرانی مەدینە چوون بۆ ( ثقیفەی بنی ساعدە ) بۆلای (سعدی ) کوری ( عبادە ) بەتەمای ئەوەبوون جێنشین لەوان دابنرێ ، وەکۆمەلی (بەرەی هاشم) لەدەوری تەرمە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا ـ د . خ ـ کۆبووبوونەوەو بەرێکخستنییەوە خەریك بوون و ئەمانیش خۆیان لەهەموو کەس بە شایانتر دائەنا ، وەزوربەی کۆچەرییەکان بە ( أسید ) ی کوری (حضیری بنی عبدالأشهلە ) وە لەدەوری ( أبوبكر ) بوون ، لەم کاتەدا هەوال هات بۆ ( أبوبكروعمر ) کەیاریدەدەرەکان دەوریان لە ( سعد ) ی کوری ( عبادە ) داوەو ئەیانەوێ بیکەن بەجێنشین ، ئەگەر ئەتانەوێ سەر لە موسلمانەکان تێك نەچێ لەپێش لەدەس چوونیا فریا کەوون . (عمر) ووتی بە ( أبوبكر ) یابچین بۆلای برا یاریدەدەرەکانمان بزانین بەچی ئەکات ؟ کە چوون بۆلایان بینییان واکۆبوونەتەوە پیاوێ خۆی داپۆشیوە ( عمر ) پرسی : ئەمەکێیە ؟ ووتیان : ( سعدی ) کوری ( عبادە )یەو تۆزێ نەخۆشە .

دوای کۆبوونەوەی کۆچەرییەکان نوێنەری یاریدەدەرەکان هەلساو سوپاس و ستایشی خوای کردو ئەنجار کەوتەباسی خزمەتی خۆیان بۆئیسلام و یاریدەدەرەکانیان بۆپێغەمبەرو پشتگیری کردنیان لەبانگە خوایی یەکە ، ئەنجار گەیییە ئەوە : کەئێمە شایانین بۆ ئەو جێنشینییە و ئێوەیش ـ

کۆچەرییەکان ـ بەشێکن لە ئێمە . دوای ئەو ( عمر ) ویستی هەڵسێو لەم ڕووەوە ووتاربدا ، بەڵام ( أبوبکر ) لەتوندی (عمر) ترساوفەرمووی : تۆ دانیشە ،( أبوبکر ) خۆی هەڵساو وتارێکی شیرینیدا . . لە وتارەکەیا باسی گەورەیی و خزمەت و پشتگیری و دڵسۆزی و دان بە خۆداگرتنی یاریدەدەرەکانی کرد و لەگەڵ ئەوەدا باسی پێش کەوتنی کۆچەرییەکانو فیداکارییان و شارەزاییان لە قورئاناو پێش کەوتنیانی لە هەموو ڕوویە کەوەکرد و وتی : ئەگەر ئەم ئیشە لەدەسی ئێوەدابێ لاموایە کەس لە عەرەب ڕازی نابێ ، وەپێغەمبەر فەرموویە : «ئەبێ پێشەوا لەقورەیش بێ» جا بۆئەوە ئیشەکەمان سەربگرێ باجێنشین لە ئێمەبێ و وەزیر لەئێوەبێ .

پاشان یاریدەدەرەکان وتیان : با کاربەدەسێ لە ئێمەو یەکێ لە ئێوەبێ ، ئەویش وەرنەگیراو وتیان : جێنشین ئەبێ هەر لە قورەیش بێ . ( أبوبکر ) وتی : باکاربەدەست لەئێمەو وەزیرو خاوەن ڕاوێژ لەئێوەبێو من ڕازیم کە یەکێ لەم دووانە هەڵبژێرن و بیکەن بەجێنشین بۆخۆتان : ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) یا ( أبوعبیدە ) ی کوڕی ( جراح ) ، لە پاش بێنەو بەرە و وت وێژێکی درێژ بڕیار درا کە ( أبوبکر ) بکرێ بەجێنشین . چونکە خۆشەویست و باوەڕ پێکراو و یارو هاودەمی سەرو مڕی پێغەمبەر بوو ، کردبووی بە بەرنوێژی گەر لەجێگای خۆیا لەکاتی نەخۆشییەکەیاو پیاوێکی لێهاتوو دڵسۆزو تاقیکراوەی گشتیبوو . (عمر) بەدەنگیبەرز وتی : ( أبوبکر ) دەست بێنە با پەیمانت بدەینێ ، ئەویش دەستی درێژکردو (عمر) وتی : تۆ پێغەمبەری خوا کردوویتی بەپێشەوامان لە نوێژا ، وائێمەیش تۆمان کرد بەجێنشینی پێغەمبەرو بەکاربەدەســـتی ناومـان . لەدوای ( عمر ) ( أبوعبیدە )و ئەمجار دانیشتووەکانی(ثقیفە) بە

کۆچەری‌و یاریدە دەرەوە پەیمانیان دایە ؛ وەبەمە هەڵبژاردنێکی بچوك و سەرەتایی بۆ أبوبکر تەواو بوو .

لە بەیانیدا ( أبوبکر ) چووەسـەر دووانگە ( مینبر ) دانیشت و ( عمر ) هەڵساو ( أبوبکر ) ی پێش‌کەش کردو هەندێ لە چاکەی‌دوا ، دوایی داوای لەموسلمان کرد کەهەموان ڕاوپەیمانی بدەنێ . موسلمانەکانیش هەمویان ڕازی‌بوون و پەیمانیان دایە بەمە پەیمانی کشتی درایە (أبوبکر) و هەڵبژاردنەکەی بوو بە بەکشتی .

ئەمجار ( أبوبکر ) هەڵساو یەکەم وتاری دا ولەدوای سـوپاس‌و ستایشی خوای گەورەو داوای درووود بۆ گیانی خاوێنی پێغەمبەری خوا - درودی لەسەر بێ - وتی :« موسلمانە کان من کرام بە کاربەدەستان ، ئەمەیش مانـای وانیە کەمن لە ئێوە چاکترم ، جا ئەگەر پەراستی و جوانی جوولامەوە ئێوە یـارمەتیم بدەن ، وەئەگەر لامداو خوار ڕۆیشتم ڕاستم بکەنەوە و بم گێڕنەوە ، ڕاستێتی سـپاردەو ئەمانەتە درۆ کردن نـاپاکی و خیـانەتە ، بێدەسـەڵاتتان بەلامەوە دەسەڵاتدارە هەتـا هەقەکەی بۆ ئەسێنم .وە لەم ڕووەوە زۆرتری فەرموو .

## ئەسپەردە کردن

ئایا لاشەپیرۆزە مەفەڕکەکەی پێغەمبەری خوا - بەهەزاران درودی لەسەربێ - لەچخاکێکی بەفەڕا ئەسپەردە بکرێ ؟ . . لەمەکەدا کە جێ و ڕێ و نیشتمانی خۆیی و باوو باپیرانیتی ؟ یالە قودس کەمەڵبەندی پێغەمبەرانە ؟ یالە مەدینە کە جێگەی کۆچیەتی و بارەگاو بنکەی بانگە کەیەتی و لێی ڕازی بووە و تیایا ئەئامانج گەیبوە ؟ ئەگەر لەمەدینەدا

بوو لە چ شوێنێکیابێ ؟ لەمزگەوتا یا لە ( بقیع ) دا یالەماڵی خۆیاو لە ژوورەکەی خاتوعایشەدابێ ؟ بۆ هەریەکە لەمانە چەند ڕایەك هەبوو ، بەڵام (أبوبکر) هەموو ڕاکانی بەرپەرچ دایەوە بە گێڕانەوەی فەرمودەیەکی پێغەمبەر کە فەرموویە « پێغەمبەرەکان لەهەرکوێیەکا کۆچی دوایی‌یان کرد لەوێدا ئەنێژرێن » لەسەر ئەم فەرمودەیە بڕیاردرا کە ژوورەکەی خاتوعـایشە بکرێ بە بەهەشتی گۆڕستـان و لـەوێدا لاشەپیرۆزەکەی ئەسپەردە بکرێ .

خزمەنزیکەکانی پێغەمبەر کەوتنە شوێنی لاشەکەی . علی لاشەکەی لەناوکراسەکەیا ئەشۆری و عباس و فضل و ( قثم ) ی کوڕی عبـاس یارمەتی‌یان ئەدا وأسامەو ( شقرانی ) ئازاد کراوی پێغەمبەر ئاویـان ئەکرد بەدەسیا ، بۆن خۆشی لاشە پیرۆزکەی هەموویانی کاس کردبوو ، پاشان کفنیان کرد لە سێ بەرگدا بێجگە لەکراس و مێزەر ، ئەمجار تەرمە پیرۆزەکەیان داناو پۆل پۆل موسـڵمانەکان ئەچون بەیەکە یەکە نوێژیان ئەکردو بۆ دواکەڕەت سەیریان ئەکرد و خواحافیظی ئێجگاریان لێ کرد .

جێگاکەیان هەڵ‌ئەکان و لە ژێریا گۆڕهەڵ کەنی مەدینە (أبوطلحه ) زیدی کوڕی سهل) یاریدەدەر گۆڕەکەی هەڵ‌کەندو ئەلحەدی بۆ ڕێکخست. عبـاس و فضل و قثم چونە ناو گۆڕەکەیەوە و وەریـان گرت و بلال ئاوڕشێنی گۆڕەکەی کرد و ئەسپەردەیان کرد ، بستێ لەسەر زەوی‌یەوە بەرزیان کردەوە . لەڕۆژی چوارشەممە چواردەی مانگی ( ربیع الاول )دا لاشەشیرینە بێ‌گەردەکەی لەناو بەهەشتی گۆڕستانا ئەسپەردەکرا . بەهەزاران هەزار درووددوستایشی خوای پەروەردگاری لەسەربێ .

لەپێش ئەسپەردە کردنەکەی‌دا بلال بانگی‌دا کە گەیشتە أشهدان محمدا

رسول الله ] دای لەهاڕەی گریان و موسڵمانەکانیش یەکسەر هاواریـان لێبەرزبووە وە و دەنگی گریان مزگەتی گرت بەکوڵەوە ، ئیتر بلالوازی لەبانگ دان هێناهەتا ئەو بانگەی بۆتەواو نەکرا . عـایشە لە ژوورەکەی خۆیا لەخزمەتی گۆڕەکەیا مـایەوە . دوای ئەمانە أبو بکر ســـوپاکەی أسامەی ڕێخست و نـاردی ، بەڵام تکای لە أوسامەکرد کە عمری بۆ ئیزن بدا کە بۆ ئیش‌وکار بمێنێتەوە و یارمەتی بدا .

بەمجۆرە ئەو پێغەمبەرە مەزنە ـ درودی لەســـەربێ ـ بەدرێژایی بیست‌و سێ‌سال هەوڵی‌دا و تێکۆشاو خەباتی‌کرد و توانی ئایینی ئیسلام‌و بەرنامەی مرۆڤەکان بەبێ کەم‌وکوڕی دابمەزرێنێ و ڕچەوڕێبازو نیشان کردەکانی دیاری‌بکا ، ئیترئیشی لەسەر زەویدانەماو وبستی‌بڕوا بۆخزمەتی خوای پەروەردگارو بۆ بەهەشتی بەرین . درووودی لەسەربێ .

## تەواوبو

# لاپەڕەی دوایی

سوپاس بۆخوای گەورە توانیم ئەمچەند لاپەڕەیە لەژیانی ئەوپێغەمبەرە مەزنەدا بنووسمەوەبە زمانی شیرینی کوردی ، تا خوێنەرە کوردە هاونەتەوە کانم هەندێ لەوژیانە پڕلەحیکمەتو پەندە تێبگەن وبیکەن بەمامۆستای خۆیان وپەیڕەوی بکەن .

من نالێم ژیانی پێغەمبەرم نووسی ، چونکە ئەوە دەریایەکی بێپەیەو بەیەك‌و دوو نانووسرێتەوە ، بەلاّم ئەڵێم نەختێـــکی لێدوام ، وەلەکاتی نووسینەکەدا لەهەندێ شوێنا لێدواندن‌و پەراوێزم دانابوو ، بەلاّم لەکاتی چاپ کردنا ئەبینم لەبەرگێکا جێگای نابێتەوە ، وەبیش کرایە بەدوو بەرگ هەم نەئەکرا وەهەم خەمی ساغ بوونەوەشیم بوو ، بۆیـــە نەختێ کورتم کردەوەو نیـازم وایە ـ ئەگەر خوا یارمەتی بدات ـ بـەناوی پاشکـۆی ژیانەوە ئەویش لەفرسەتێکا بخەمە بازارەوە . ئیتر لەگەڵ خوێنەرە کوردە کانا دەس لەدەس‌و توانایی لەخوای پەروەردگار .

دە خوای گەورە تۆیش لێم وەربگرە . وصلی‌الله علی محمدوآله وسلم .

( عبدالعزیز ) کوڕی ( شێخ أمین ) ی
پارەزانی

# بەناوی خوای پەروەردگارەوە

مامۆستای بەرێزو ئایین پەرستو ئەدەب پەروەر نیشتمان دۆست شێخ عبدالعزیزی شێخ ئەمینی پارەزانی بۆیەکەم جار بەکوردی‌یەکی جوان وبە شێوەیەکی ئەدەبیـانە ژیانی پڕلەخەباتو تێکـــۆشانی حـەزرەتی محمدی ( دروودی لێبێ ) خستە سەرکاغەزو ، لەکوردستانی خۆشەویستو بە ناو کوردە دڵو دەروون پاکەکانا بڵاوی کردەوە ، خوا بەکەورەیی‌و مێهرەبانی خۆی لێ‌ی وەربگرێو بەچاکە پاداشی بداتەوە .

بەڵام بەداخەوە ، ئەم کتێبە وەکو لەلایەن نووسەری بەرێزەوە ئامادە کرابوو نەخـرایە ژێر چاپەوە ، ئەمەش دیارە لەبـەر کەم دارایی‌و دەس کورتی بوو .

دەمێکە نووسەر شەیدای ئەم‌جۆرە نووسینەیەو ، هەمیشە ویستوویەتی‌و، ئەیەوێ ئاییني ئیسلامی پیرۆز بەوجۆرەو بەشێوەیە کەخوا پێ‌ی خۆشەو ، پێغەمبەر پێ‌ی ڕازی‌یە بەکـوردی ڕوونی بکاتەوەو بیخاتە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی گەلی کوردی موسڵمانەوە ، لەم ڕووەوە زۆر هەوڵی داوەو گەلێ ڕەنجی کێشاوە . ساخوا لەجیـاتی ئێمەی کوردی موسڵمان پاداشی بـە چاکە بداتەوە ، دیارە ئەمەش بۆخوا گران نی‌یە .

نووسەری بەرێز وەکو ئەم کتێبەی ئامادە کرد بۆ چاپ ، لێکمان دایەوە دووهەزار دینار زیاتری ئەوێ بۆچاپ کردنی ، وەئەویش خاوەنی ئەودەسەڵاتە نەبوو ، ناچاربوو ڕووی ئاواتی کردە قاپی چەند پیـاوێکی گەورەی پلەبەرزی کورد ، لەئەنجاما لەپاش تێکۆشانێکی پڕلەئازار ، چەند کەسێکی خاوەن سۆزو هەستی ئاییني ، بەدڵێکی پڕلەخۆشەویستی یارمەتي

ماڵی‌یان داو کتێبەکە کەوتە بەردەستی خوێنەرانی کورد زمان .

با ئەوەش بخەینە پێش چاو : نووسەر ئەم کتێبەی برد بۆ ( مدیریتی دراسەی کوردی ) بۆئەوەی دەبێتی یارمەتی بۆدرێژ بکا ، ئەوانیش لە رەفەی لەبیرچوونەوەدا بۆماوەیەکی زۆر دایان ناوهیچ جۆرە یارمەتی‌یەکیان نەدا !! لەبەرچی‌و بۆچی . ؟ نازانم .

منیش بەهەستێکی ئایینی‌و ، بەتینی خۆشەویستی‌و برایەتی کە ساڵەهای ساڵە لەدڵی هەردووکمانا رەگی داکوتاوە ، دەستم دایەو ، سەرپەرشتی چاپەکەیم کرد ، بەڵام هەتا چاپ کراو لەچاپخانە دەرچوو ، بەدەیان کۆسپی گرانو قورتی نالەباری ئەهاتە رێ ، جگە لەخەفەت خواردنو پێچ خواردن بەوئازارەوە هیچ دەسەڵاتێکی ترمان نەمابوو . کەس نازانێ ئێش‌و ئازاری چاپ کردن چی‌یە هەتا کتێبێك نەخاتە ژێر چاپەوە .

هەزار سڵاوم بۆمامۆستای نووسەرو بۆئەوکەسانەی کەدەستی یارمەتی‌یان بۆدرێژ کردین ، لەئێمە دۆعاو پارانەوە ، لەخواش وەرگرتن‌و بەدی‌هێنانی ئاواتی ئەوکەسانەش کەیارمەتی‌یان داین . ناوەکانیان نانووسم ، با لەلاپەڕەی رەحم و بەزەیی خوا بنووسرێن باشترە .

**ئاردەڵانی**

( محمد امین حبیب سعید )

## سەرچـاوە گرنگەکان :


| بەرهەم | نووسەر |
| --- | --- |
| قورئانی پیرۆز | |
| فەرمودەی پێغەمبەر | |
| حیاة محمد | دکتور حسین هیکل |
| محمدا الغزالی | محمد الغزالی |
| فقه السیرة | محمد رضا |
| محمد رسول الله | محمد خضری بگ |
| محمد رسول الله | إبنتین دینیة و سلیمان ابراهیم الجزائری |
| في ظلال القرئان | سید قطب |
| حەڵەبی | |
| دەحلانی | سید احمدی دەحلانی |
| إبن هشـام | إبن هشام |
| إحیاء علوم الدین | ئیمامی غەزالی (فەیلەسووفی ئیسلام) |
| الوحی المحمدی | محمد رشید رضا |
| رسالة التوحید | شێخ محمد عەبدە |
| العدالة الاجتماعیة من الاسلام | سید قطب |
| تەفسیری خال | شێخ محمدی خال |
| وەگەڵ سەرچاوەی تر | |

## ئـاگاداری :

خوێنەری بەڕێز بەداخەوە ئەڵێم هەندێ کەموکووڕی لە پەڕاوەکەدا هەیە چ لە باسەکانیاو چ لەڕووی هەڵەی چاپەوە ئەوەیش بەشی زۆری ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو کورت کردنەوەیەی لەپێشەوە زانیت لەوانە

١ ـ لە لاپەڕە ( ١٤٠ ) دا ئەڵێت عـایشە موسلمان بوو ئەمە هەڵەیە چونکە عایشە لەوکاتەدا هێشتا لەدایك نەبووە

٢ ـ بت پەرستی لەهیند لە لاپەڕە ( ١٢١ ) دا ئەبوایە لابیرایەو بەسەهوو باسکراوە

٣ ـ لاپەڕە ( ٣٢٤) باسی دانانی تیرئەندازەکان بە سەرۆکایەتی (عبدالله)ی کوڕی ( جبیر ) لەسـەر کردی پشت لەشکرگاکەوە ئامۆژگاری کردنیان بەوە کەلەشوێنی خۆیانا بمێننەوەو نەبزوون ، ئەمان هەرچی باسـ... بەسەرهات ئەم باسە بەسە هوو لابراوە

٤ ـ هەڵەی چاپیش زۆرە جاوا هەندێکی ڕاست ئەکەینەوە و ئەوی تری ڕووباری بەخوێنەری بەڕێز ئەکەینەوە ، کە بە زانایی خۆی ڕاستی بکاتەوە

# ناوەرۆك

# ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد درودی خوای لەسەربێ

نوسینی

شێخ عەبدوڵڵە زێبیارەزانی

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشـــەکی : بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان .

ســوپاسی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار کـە یارمـەتی دام ، هەندێ لەمێژووی ژیانو خەباتو تێکۆشانی پێغەمبەری خوا (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی قورەیشیم نووسی و ، بەناوی ( ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد ـ دروودی خوای لەسەربێ ) خستمە بەردەستی خوێندەوارە کوردەکان .

کاتێ دەستم کرد بەنووسینی ، پەنام بردە بەرگەلێ سەرچاوەی باوەڕپێکراو و زۆر کتێبی کۆن و تازەم ئەم دیوو ئەو دیوکرد ، ســوپاس بۆخوای گەورە کتێبێکی گەورە و چاك و پڕ لەبابەت و مەبەستی شیرین دەرچوو . ئەمیش وەنەبێ لەئازایی منەوەبێ ، بەڵکو ئەو ژیانە ناوازەیە بە هەزاران زانای گەورە پێنووسیان تیا باداوە و سەر چاوەی گرنگیان بۆ بەجێ هێشتوین ، وە دەستێکێ نهێنی لـە هەموو کاتێکا لەگەڵ خاوەنی ژیان بووە و ئیش و کارەکانی بەپێی نەخشەی خوایی بەجێ هێناوەو هەمیشە فریشتە مامۆستایی کردووە ، بۆیە ژیانی وەك بوونەوەر وایەو هەر ڕۆژە بەشێکی دەردەکەوێ ، وە مرۆڤایەتی تێدا سەرسامەو کەس نەگەیوەتە قوڵاییەکەی .

کاتێ لەپاك نووســـی بوومەوە ئەبینم زۆر گەورەیەو بــۆ دوو بەرگیش قەبەیە ، ئەمەیش قەی ناکات ئەگەر بتوانین هەڵسین بەچاپ و بڵاوکردنەوەی !!! بۆیە کەوتمە بیرکردنەوە . . ئەبێ کێ ئەرکی

چاپی بگرێتە ئەستۆی خۆی ؟ خۆ ئەوە لە توانای منو وێنەی مندا نیە ، ئەم سکالاّیەم بردە لای پیاوە باش و باوەڕ پێ کراوان ، وە بەڵێنی هەندێ قەرزم وەرگــرت و خستمانە ژێر چاپەوە ، سەیر ئەکەین ئەو ئەندازە پارەیەی پیاوە باشەکان بەڵێنــیان داوە بە قەرز بمان دەنێ بەشی نیوەیشی ناکات ، ئەی بۆ ئەوی تری بۆ کوێ بچم ؟ وە لەلایەکی ترەوە ئەبێ بۆ کەی بفرۆشرێ و ڕوو زەردی خاوەن قەرزەکان نەبم خۆ مەگەر نرخێکی گرانی لەسەر دانرێت ؟!!!

لەبەر ئەمانەو لەســەر ڕاوێژی هەندێ لە دۆســت و برادەرە ڕاستەقینەکانم بڕیارمان دا کە کتێبەکە کورت بکەینەوە ، وە بــۆ بەجێ هێنانی ئەم بڕیارە خوا حەقە ئەو برادەرانەم گەلێ یاریدەیان دام بە تایبەتی کاکی بە ڕێز مامۆستا ( محمد أمین حبیب ئاردەلاّنی ) کە سەرپەرشتی چاپ کردنی گرتنە ئەستۆی خۆی و بە جوانیش پێی هەڵسا ، خوا یارمەتی یان بداو بە چاکە پاداشیان بداتەوە .

وە لە کورت کردنەوەکەدا لە هەندێ شوێنا باسێکمان بەتەواوی لائەبرد ، وە لە هەندێ شوێنی ترا ئەمان گۆری و بەکورتی دامان ئەنا وە لە هەندێ لای ترا ئەمان گوشی ... بێ گومان ئەمە سەری کێشا بۆ دروست بوونی گەلێ کەم و کووڕی لە کتێبەکەدا و بۆ نارێکی لە نێوان هەندێ لـە باسەکانیا ، ئەمەیش شتێکی سروشتی یە خۆ خەرمان کە شەقڵی شکا بە ئاســانی جێی خــۆی ناگرێتەوە لە کۆتایی کتێبەکەدا هاوارێکم بۆ ئەمەکردو پەنجەم بــۆ هەندێ لە خاڵەکانی ڕاکێشا ، بەلاّم بەوە تەواو نابێ پێشینیان وتوویانە ( بۆبە نەڕژاوە نەپژێ )

وه بـه تەمای خوێنەرانم خۆیان ڕاستیان بکەنەوه وه ئەوەی لێرەدا بیخەمە بەرچاو دوو خاڵە : یەکەم لەباسی ( ئیسماعیل ) دا بە تەرتیب نەڕۆیشتووم و هەندێ پێش‌و پاش تیا بەدی ئەکرێت٠ هۆی ئەمەیش ئەوە بۆزۆربەی باسەکە فەرموودەیەکم هێناوەکە (بخاری) دای ڕشتبوو نەم ویسـت فەرموودەکـه تێك بدەم تاکۆتایی هات: ئەنجا هاتمەوە سـەر باسەکە :

دووەم :له لاپەره (٥٥) دا ئەڵی: غەسـاسـینەکان له (حیرە) دا وه راسـتی یەکەی ئەمەیە: غەسـاسینەکان له بوسرا (بصری) دا لەگەڵ ئەمانەیشدا سوپاس بۆ (خوا) جوانو بەکەڵك و ڕێك‌و پێك دەرچوو گەلێ له زانا گەورەکان بـه دەم و به نووسین وەسف و سەنایان کرد ومنیش پێی دڵشـاد بووم ، وا ئیـستا بۆ نموونه بەشێك له نامەکەی زانای گەورەو پایه بەرز مامۆستا (شێخ‌محمدی خاڵ) که لەم ڕووەوە بـۆی نووسـی بـووم لێرەدا دا ئـەنێم:

«سلێمانـی ١٠/٢/١٩٧٤ ٠

زانای دڵسـۆز ، دانـای بـه هۆش ، شێخ عزیز پارەزانی بەرێز٠، دوای سـلاوێکی موسڵمانانه و پرسـیارێکی برایانه ، دیاری‌یه بەرزه به نرخەکەتان گەیشت ، سەرو چاوو دڵمی ڕووناك کردەوه ، نازانم به چ زمانێك سـوپاسی نووسـینی ئـەم کتێبەت بکەم؟!! وه بـه چ قەڵەمێك ستایشت بنووسم؟!! به ڕاسـتی کتێبەکـەت زۆر پیاوانەو مەردانـەیه ، ڕووی دێت بچێته ناو کتێبه گەورەکانی پێشینانەوه ، وه به شانازی‌یەوه بڵێت !منیش هەم ، بەڵکو شایستەیه بۆ ئەوەی شان له شانی ئەو / کتێبانه/ بدات که ساڵەهای ساڵه له ژیانی پێغەمبەرا

نووسـراون ، وه به شتێکی زۆر جوان و بەرزیان ئەزانین ، هەزار درووود بۆ گیانی پاکی ئەو شاعیرەی کە وتوویەتی :

قل لمن لا يـرى للمعاصـر شيئاً ويـرى للاوائل التقديما

إن هذا القـديم كـان حديثا و سيبقى الحديث قديما

. . . . . »

وه لەکاتی خۆیا لەکۆتایی کتێبەکەدا بەڵێنم دا بە خوێنەران کە هەندێ لەو باسانەی لامان بردوون لە بەرگێکی نوێ دا بخەمەوە بەردەستیان، وەهەندێ لە کەم و کوورِی‌یەکان بەسەر بگرمەوە . ئەوا پشت بەخوا هەندێکیانم هێناو لە شێـوەی کتێبێکی مـام ناوەندی‌دا بەناوی (بەرگی دووەم لە ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد ـ درووودی خوای لەسەر بێت) ئاڕاستەی باوەشی خوێنەرانو نامەخانەی‌کوردیم کـرد ، هیوام وایە لەگەڵ ژیاندا دابنرێت ئیتر بەتەمای یارمەتی‌وپاداشتی‌خوای‌گەورەم.

نووسەر

# بەشـــی یەکەم

# نیگـــا ( وحـــی )

نیگا ڕاستی‌یەکی گرنگــێ و بڕبڕەی پشتی ئایین و پەیــامی پێغەمبەرانە ، چونکە ڕاستی پێغەمبەریەتی و جیاوازی‌یە لە نێـوان پێغەمبەرو وەرگرتنی پەیام لەخواوەو گەیاندنی بەمەردمەکان ، لەگەڵ ئەو کەسـەی خۆی بیر ئەکاتەوەو بە ژیـری و بیرکردنەوە ڕێگای چارەسەرکردنی باری کۆمەڵ دائەنێت . ئەم ڕاسـتی و جیاوازی‌یە بەستراوە بە بوونی نیگا لە خواوە بۆ پێغەمبەرو نەبوونی بۆ کابرای خاوەن بیروڕا . واتە پێغەمبەر هەموو ئیش و کارو ووتــاری لە خواوەیەو بەس ( وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحي یوحی ) ، بەڵام ئەوی تر هەمـوو ڕاو ئیش و ڕێبازێکی لە مێشــکی خۆیەوە هەڵ دەقوڵێت ، لەبەر ئەمەیە لە کۆن و تازەدا دوژمنانی ئیسلام لە دەرو ناوەوە ئەم بابەتەیان زۆر بەگرنگ گرتووە ، وەزۆر هەوڵیان داوە کە گومان لە ڕاستی نیگادا دروست بکەن : جا ئەگەر بۆیان چووە سەرو نیگایان لە جێگای خۆی لادا ئیتر ـ بەخەیاڵی خۆیان ـ پردی ئیسلامیان داوە بە ئاوداو داریان بەسەر بەردە وە نەهێشتووە چونکە نیگا بەردی بنچینەی ئیسلامە ، ئەگەر بناغە ڕووخا خانوویش خۆی ناگرێتەوە ، وە بۆبەدی هاتنی ئەم ئاواتە ناپاکەیان پەلەقاژەی زۆریان کردووە کە نیگا لە شـوێنی خۆی لابدەن ، واتە ددان بە نیگادا نەنێن و پەیامی ئیسلام بگێڕنەوە سەرشتی تر ( لەگەڵ ئەوەی کە چەندەها ئایەتی قورئان و فەرمووده باسی نیگامان بۆ دەکات و مێژوویش بە دەیان لاپەڕەی پێوە ڕازاندۆتەوە ) وە هەر یەکەیان بە جۆرێکی سەر سوڕێنەر نیگای لێك داوەتەوە ، کە زیاتر لە ووتەی

منالّی نەفام یا وڕاوەی تادار دەچێت ، وەکو ئەوە : (محمد) بێزاربوو لە بت پەرستی و لە باری نالەباری کۆمەڵ و کەوتە بیرکردنەوەیەکی درێژ بۆچارەسەرکردنی ، تا لەئەنجاما بڕواوبەرنامەیەکی چارەسەری هات بە بیریا کە بتوانێت ئەو خزمەتە بکات .

یان ئەوە : کە (محمد) قورئان و ئیسلامی لە(بوحیرا) ی ڕاهیبەوە وەرگرت . یان ئەوە : (محمد) پیاوێکی تووڕەو ڕق ئەستورو فێڵدار بوو . یا ... یا ... جا منیش هەرچەندە لە پەڕاوی (ژیان) دا لە لاپەڕە ( ١٣٠ - ١٣٦ ) هەندێك لەم ڕووەوە دووام ، پێم خۆشە لەم پاشکۆیەشدا هەندێکی تری لەسەر بڕۆم ، تا بە تەواوی خوێنەرانی کوردی، موسڵمان تێ بگەن چۆن دوژمنانمان هەمیشە لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدا بوون ڕێگای ڕاستمان لێ بشارنەوەو دەستمان بگرن ، بەرەو ڕێگای خوارو خێچ و تاریك ، بەرەو چاڵی گومڕایی و سەر لێ تێك چوون ، بەرەو دۆزەخ ڕامان کێشن ( إن الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدواً إنما تدعو حزبه ليكونوا من أصحاب السعير ). بەڵکو ئیتر بیرێك بکەینەوە هیچ کاتێك باوەڕ بە شەتیان و شاگردەکانی نەکەین ، بە درۆو چاوڕویان هەڵ نەخەڵەتێین ، بە شوێن دەستی ژاراویاندا نەڕوێین و لە شاڕێگەی ئیسلام لانەدەین . خاتوو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت «١»: ( لەسەرەتاوە ڕێگای پێغەمبەر بە خەو دەستی پێ کرد ، وە هەر خەوێکی ئەدی وەکو سپێدەی بەیانی ڕاست دەردەچوو ، ئەنجا پێغەمبەر تەنیایی و گۆشەنشینی بە لایەوە خۆشتر بوو ، ئەچوو بەتەنیا لەئەشکەوتی حەرادا خواپەرستی ئەکردو چەند شەوێك ئەمایەوە بۆ ئەم ماوەیە توێشووی لەگەڵ خۆیا دەبرد ، کە توێشووەکەی ئەبڕایەوە ، ئەهاتەوە هەندێکی تری

---

١ ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە : سەیری (فقه السیرە) بکە

ئەبردو ئەڕۆیشتەوە ، تا هەق و ڕاستیەتی و پێغەمبەریەتی بۆ هات ، فریشتەیەك هاتە لای ( لە ئەشکەوتەکەدا ) و پێی وت : بخوێنە ، وتی : من خوێنـــدەوار نیم ، پێغەمبەر ـ دروودی لەســەر بێ ـ ئەفەرموێ گوشیمی بەخۆیەوە تا ناڕەحەت بووم‌و ئێشم پێ گەیشت ، پاشان بەری دام و وتی : بخوێنە ، وتم : خوێنـــدەوار نیم ، بۆ جاری دووەم گوشیمی یەوە بە خۆیەوە زۆرتر ئێشم پێ‌گەیشت و بەرەڵای کردمەوەو ووتی : بخوێنە ، وتمەوە : ئاخر من خوێندەوار نیم ، بۆ جاری سێ‌یەم گوشیمی‌یەوەو زۆر تر لەجاران ئێشم پێ گەیشت‌و بەرەڵای کردمەوەو وتی : بخوێنەو ئەم ئایەتەی خوێند (إقرأ بأسم ربك الذي خلق ، خلق الانسان من علق ، إقرأ وربك الاكرم الذي علم بالقلم ، علم الانسان ما لم يعلـــم ) پێغەمبەریش دووبارەی کردەوە .

پێغەمبەر ترساو دڵە تەپەی پێ کەوت‌و (ئەشکەوتی بە جێ‌هێشت) گـەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوە بـۆلای خاتـوو خەدیجەی خێزانـی و وتـی ( دام پۆشن ) تۆزێك ئارامی گرت‌و ترس‌و بیمەکەی لە دڵ دەرچوو ئەمجا فەرمووی : (خەدیجە من تووشی چی هاتووم ؟) ڕوو داوەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی : لە خۆم ئەترسم ـ واتە لە دەست وەشاندنی جنۆکەو بوون ئەترسم ـ خەدیجە وتی : مەترسە بە خوا هیچ کاتێ خوا تۆ تووشی خراپە ناکات ، چونکە تۆ یارمەتی خزم‌و کەس‌و کارت دەدەیت‌و سەریان لێ دەدەیت ، وەبە هاواری پەك کەوتووانەوە دەچیت و دەستی لێ قەوماوان دەگریت و کۆمەکی نەبووەکان دەکەیت‌و میوانداری دەکەیت و پشت گیری لە هەق دەکەیت ئەمجا خەدیجە بردی بۆلای (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) ی ئامۆزای ، کە پیاوێکی پیربوو ، کوێر

بوو بوو ، لەکاتی خۆیدا بوو بوو بەگاور ، شارەزای ئینجیلی عیسا پێغەمبەر بوو ، خەدیجە پێی وت : ئامۆزای بەڕێزم گوێ بگرە لەم برازایەت بزانە بەسەرهاتی چی یە ؟ (وەرقەیش) وتی: ئادەی برازای خۆم بزانم چیت دیوە؟ پێغەمبەریش ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە ، وەرەقە وتی : ئەو پیاوەی دیوتە ئەوە پەیکی پێغەمبەرانە و مژدەی پێغەمەرێتی ، بۆ هێناویت خۆزگا بمامایەو گەنج بوومایە کاتێ خزمەکانت دەریان ئەکردی یارمەتیم بدایتایە پێغەمبەر فەرمووی بۆ چی دەرم ئەکەن ؟ وتی: بەڵێ هیچ پیاوێك نەبو پێغەمبەرێتی هێنابێ و دوژمنایەتی لەگەڵا نەکرا بێت ، ئەگەر بکەومە ئەو ڕۆژە یارمەتیەکی باشت دەدەم ، پاشان زۆری نەخایاند وەرەقە مردو نیگاش وەستا . (زهری) لەم فەرموودەیەدا دەڵێت . بە وەستاندنی نیگا پێغەمەر زۆر نارەحەت وبێ تاقەت بو ، هەتا زۆر جار ئەی‌ویست بچێتە سەر لوتکەی شاخەکانو لەوێوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە ، هەرکاتێ ئەچووە سەرشاخێك بۆ خستنە خوارەوە جبرەئیل خۆی پیشان ئەداو ئەیوت : ئەی محمد تۆ پێغەمبەری ڕاستەقینەی خـوای ، ئیتر دڵـی هێواش دەبووەوە دەگـەڕایەوە) بـوخـاری‌و موسلیم ئەم‌فەرمودەیەیان ڕیوایەت کردووە . لەکاتی‌تێ‌بینی ولێکدانەوەی حیکمەت و وردەکاری ئەم فەرموودەو ڕووداوەدا کەبوو بە سەرەتای پەیامی پێغەمبەری خوا(محمد) ــ بەهەزاران دروودی خوای لەسەر بێت چەند پرسیارێك سنگ دەردەپەڕێنێت:ـ بۆچی لەیەکەمجاردا پێغەمبەر بەچاوی خۆی جبرەئیلی بینی‌و نیگا لەپشتی پەردەوە نەبوو؟ بۆچی خوا ئەو هەموو ترس وبیمەی‌خستە دلیەوەو کەوتە دڵەتەپەو گومانی لە وەرگرتنی ڕاستی‌یەکە پەیداکرد ؟ خۆ بەزەیی وخۆشەویستی خوا بۆی داخوازی ئەوەیە کە تـرس‌و دڵەتەپـە نەبـوایەو دڵـی دابــمەزرایە بۆچــی ترسا کەئەوکەسەی لەئەشکەوتەکەدا هاتەلای جنۆکە بوو‌بێت وبەوێ

دەستی لێ بوەشێنێت و تووشی شێتی بێت ، وە دڵنیا نەبو لەوەی کەوا فریشتەیەکی ئەمین بێت و لەلایەن خواوە نێررابێت ؟

بۆچی لـە سەرەتاوە ماوەیەکی درێژ نیگای بـۆ نەهات تا وای لێهات پێغەمبەر بێزارو بێئارام بوو ئەیویست بچێت لە سـەر لوتکەی شاخێکەوە خۆی بخاتە خوارەوە ؟

بەم پـێیە لە دەست پێکردنی نیگاوە لەسەرەتایی هاتنی پەیامی پێغەمبەرێتی (محمد) دا ئەم پرسیارانە ڕاست دەبنەوە ، کاتێك کە بە وردی سەرنج لە ڕووداوەکە دەدەین و بۆ وەڵامەکان دەگەڕێین ، ڕێگەمان لە گەلێك حیکمەت و وردەکاری دەکەوێت ، وە بە بـێ خۆ ماندو کردن وەڵامی گومان و پڕوپاگەندەکانی دوژمنانی ئیسلامو پێغەمبەرمان ئەخاتـە دەست و تێ ئەگەین ئەوانەی ئەوان هەموو چاو و ڕاوە بۆ سەر لێشێواندنی خەڵکی :ـ

کاتێك پێغەمبەر لە ئەشـکەوتی حەرادا بوو لە ناکاو جبـرەئیل هاتە بەردەمی و بە دوو چاوی سەر بینیو لەگەڵیا دواو پێـی وت : بخوێنە ، تا بـۆ هەموو کەس دەربکەوێت کە نیگاشێکی خۆیـی (محمد) نیـەو لە لێکدانەوەی دڵو دەروونو لەبیرکردنەوەیەوە هەڵ نەقوڵیـوە ، بەڵکو وەرگرتنێکی ڕاست و ڕەوابێ پێچو پەنایە لە خوای پەروەردگارەوە بە هۆی فریشتەی ئەمینی پـەیکی پێغەمبەرانەوە، وە بە هـیچ کلۆجێك پەیوەندی بە دڵو دەروونو بـیری (محمد)ەوە نیە.هەروەها بەخۆوەگوشینی فریشتەوبەردانی سێ جارەکەیو داوای خوێندن لێکردنی لە هەموو جارێکیانا ، بۆپـەوکردنی ئەم باوەڕەو بۆ دڵنیا کردن بوو لەسەر ڕاستی نیگاکەو لەسەر ئەوەکە شتێکی خۆییو خەیاڵی نیە :

پێغەمبەری خوا .. دروودی لە سـەربێ .. لەم کارەساتو بینینو

بیستنەوە ترس‌و بیمی لێ نیشت‌و کەوتە دڵەتەپە بەرادەیەکی‌وا کەوازی لە گۆشەنشینی‌یەکەی هێناو بە پەلە گەڕایەوە بۆماڵ‌و دڵی دەلەرزی ، ئەمە بە ئاشـکرا تێـمان دەگەیەنێت کەپێغەمبەر چاوەڕوانی‌ی ئەم پێغەمبەرێتی‌و هەڵ گرتنی ئـەو بارە گرانەی نەکردوە، وەئەو نیگایە شتێك نەبووە کـە ئاوات‌و داخوازیی ناو دڵ‌و دەروونی بێنێتەدی، یان بەدڵیا هـاتبێت ، یـا بەرێگـەی بیرکردنەوە یەکی وردو لـە سەرخـۆ بۆی دەر کەوتبێت ، تا بووبێتە بڕوایەك‌و باوەڕی هێنابێت بەبانگ بۆکردن‌و بلاوکردنەوەی بەناو مەردما هیچ کام لەمانە نەبوو ، بەڵکو شتێکي کوت و پڕی بوو هات بەسەریاو یەخـەی پێ گرت بەبێ ئاوات‌و چاوەڕێ کردنی .

وەهەروەها هیچ کام لەبیر کردنـەوەو وتەی ناو دەروون‌و لێکدانەوەو ڕچەو بەرنامە دۆزینەوە نابێتە هۆی ترس‌و بیم‌و دڵەتەپەو ڕەنگك تێك چـوون‌و شپرزە بـوون ، ئەگینا دەبـوایە زۆربەی فەیلەسوف‌وبیر تیژەکان‌و ئەوانەی هەمیشە لەبیرکردنەوەی کارو باری جیهان و مرۆڤ دان ، دەبوایە هەمیـشە ئەمانە لەژێر لافاوی ترس‌و بیم‌و دڵەتەپەدا بونایەو جاربۆجار باری شانیان گرانتربوایە.

پێغەمبەر پتر لەمانەیش مەترسي کردنی لەوەی کە لەمشکەوتەکەدا بینی : ئەوە جنۆکـە وێت‌و دەستی لێ بـوە شێنێت ، ئەوە بوو دوای گەڕانەوەی هەواڵەکەی بەخاتو خەدیجەدا و فەرمووی (لەخۆم دەترسم) وەخاتو خەدیجە دڵنیای کرد کەلەبەر ئەو شتە بەرزانەت خوا نایەڵێت تووشی خراپەببیت‌و ڕێگای جنۆکەو شەیتان نادات ئازارت پێ بگەیەنن .

ئەمەیش بەئاشکرا دەی گەیەنێت کەوا هاتنی نیگا شتێکی کوت‌و پڕی بوو ، وە لەلایەن خواوە بوو ـ وە بەهیچ جۆرێ پەیوەندی بە دڵ‌و بیری خۆیەوە نەبوو دیسان ئەمانەی پێشەوە بەتێك ڕایی بەلگەن

که قورئانو نیگاو ئیسلام لەخواوە یەو (محمد) لەهیچ مرۆڤێکی وەر نەگرتووەو پەیوەندی بە هیچ ئادەمی‌یەکەوەنیە ، خوای پەروەردگار دەی توانی (محمد) دڵنیاو دڵ دامەزراو بکات لەسەر ئەوە کە ئەوەی هات بۆلای فریشتەیەکی ئەمینی خوایەو بۆئەوە هاتووە مژدەی پێغەمبەرێتی بداتێ ، بەڵام خواهیشی وردی بڕ لە حیکمەت ، حیکمەتی وابوو دەری بخات کە جیاوازی‌یەکی فراوان هەیە لە نێوان شەخسیەتی (محمد) لە پێش پێغەمبەرێتی‌دا ،لەگەڵ شەخصیەتی لەدوای پێغەمەرێتی کە هیچ کام لەپایەکانی باوەڕی ئیسلامو لە یاساوبەرنامەکانی ئیسلام هەڵ قوڵاوی دڵو دەروون‌ومێشکی (محمد) نین .

وە لە لایەکی ترەوە ئەوەی خوا نایە دڵی خەدیجە کە پێغەمبەر ببات بۆ لای وەرقەی کوڕی نەوفەل و باس‌و دواندنەکەیان بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوە کە نیگا ڕاستەوخۆ لە خواوەیە ، ئەمەیش شێوەی ئیشی خوا بووە لەگەڵ هەموو پێغەمبەران دا هەروەکو دڵنیاکەری پێغەمبەر بوو لەسەر ڕاستی‌ی پەیامەکەی‌و دوور خستنەوەی ترس و بیم لێ‌ی .

هەر وەها پچڕاندنی نیگا کەبۆ ماوەیەکی درێژ بەڵگەیەکی ترە لە سەر ئەم ڕاستی‌یەو لەسەر دەم کوت‌کردنی هەموو ئەوانەی ئەیانەوێ نیگا لابدەن و بیگۆڕن ، خوای گەورە خواهیشی وابوو کە ئەو فریشتە یەی لە ئەشکەوتەکەدا هات بۆلای ( محمد ) بۆ ماوەیەك خۆی لێ گووم بکات، وە بەو پێیە (محمد) بێ تاقەت ببێت وپاشان بێ تاقەتی‌یەکەی ببێتە ترس لەوەکە ڕەنگە خوا لێ‌ی ڕەنجابێت و وازی لێ هێنابێت ، دوای ئەوەی خەڵاتی پیرۆزی پێغەمبەرێتی دا بەشانیا خۆ ڕەنگە ئەمەیش لەخراپەیەکی ئەمەوە بووبێت ، تا وای لێ‌هات دنیای ڕوناکی لێ بوو بەشەوەزەنگ وە ئەی‌ویست بچێتە

ەر شاخێك‌و خۆی فڕی بداتە خوارەوە . کەچی کە سەری هەڵ دەبڕی فریشتەکەی دەبینی‌و دیسانەوە دڵنیای دەکردو دەی‌وت : ئەی (محمد) تۆ پێغەمبەری خــوایت ، ئەویش دەگــەڕایەوە. بەم باس‌و شی‌کردنەوەیە تێ‌گەیشتین کە ئەو حاڵەی بەسەر پێغەمبەردا هات لە سەرەتای هاتنی نیگاوە کارێکی وا دەکات کەبیرکردنەوە لەوە : نیگا بە ئەنجامی بیرکردنەوەی (محمد) دانان و گێڕانەوە بۆ لای دڵ‌و دەروون و مێشکی (محمد)، یابیرکردنەوە لەوە کە (محمد) ئەم ئیسلام‌و قورئانە لـە فلانو فیسارەوە فێربووە بیرکــرنەوە لەمانە بەشێکە لە شێتی‌و شتی‌وا بە دڵی مروڤی ژیری خاوەن بیردا نایـەت . کەواتە شێوەی هاتنی نیگا بۆ یەکەم جار بەم‌شێوەیە بۆ ئەوەبوو دەم کوتی هەموو ئەو کەسانە بکات کە بیانەوێ ڕووی گەش‌و ڕاستی‌ی پێغەمبەربەتی (محمد) درودی لەسەر بێت بە دەستەسڕی شڕی چەپەڵی‌خۆیان بشارنەوەو دای پۆشن گوایە بە خەیاڵی خۆیان بەم بۆنەیەوە ئیسلام بە ئەفسانەو ناڕاست دەربکەن ، وەبۆ ئەوە بـوو ڕێگا لـە درۆو دەلەسـەو چاوڕاوی ئەم‌و ئەو ببەستێت وجێگا بۆ گومان نەهێڵێتەوە (وکان‌الله‌علیما حکیما)وە بیجگە لەمەیش بەڵگە بۆ ڕاستی نیگاو بۆڕاستێتـی پێغەمبەرێتی (محمد) زۆر ترە لەوەی لەپەڕاوێك داجێگای ببێتەوە، وەهەر (محمد)خۆی بەسە بۆ بەڵگە لە سەر ڕاستی پەیامەکەی‌و لەسەر ئەوە کەقورئان لە لایەن خواوە نێرراوە وە بۆ ئەوە کە گوایە (محمد) قورئانی لە بو حەیرای ڕاهیب وەرگرتبێ و بە ناوی خواوە بڵاوی کردبێتەوە . ئەمە ڕەخنەو بیرێکی لاوازەو تەنیا بە فوویەك ئەڕووخێت : کتێبە مێژوویی‌بەکان بەکۆن‌و تازەوە ـ ئەوانەی کەددان بە ڕووداوەکە ئەنێن ـ ئەڵێن : کاتێ (محمد) لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا بوو لەگەڵ (أبوطالب) ی مامی چوو بۆ شام ، وەلە ڕێگا بوحەیرایان بینی ، کاتێ بو حەیرا سەرنجی

(محمد)ی دا زانی ئەمەیە ئەبێتە پێغەمبەر ، بۆیە لەم ڕووەوە ئامۆژگاری مامی کرد کەئاگاداری بکات نەوەك جولەکەکان تووشی دەردێکی بکەن . ئەم بینینە لەم جارەو لە ماوەیەکی کەم تێنەپەڕی ، دەی ئایا ئەگونجێ منالێــکی دوازدە ساڵان لە دانیشتنێکی کـەمدا ئەم هەموو یاساو فەرمانو دەستوورو شەریعەتو بەرنامە فراوانەی ئیسلامی لە کابرایەکی غەیرە عەرەبی وەرگرتبێ‌و کەس پێی نەزانیبێ ؟!! وە پاش تێپەڕبوونی (٢٨) ساڵ بە سەر ڕووداوەکەدا دەست بکات بە بانگەواز بۆی‌و بلاوی بکاتەوە ، وەلەو ماوە درێژەیەشدا لەو ڕووەوە هیچی لێ نەبیسترابێت؟!!! یا بوحەیرا هەواڵی پێشیناتی لەکوێوە ئەزانی ، خۆ لە کتێبە کۆنەکانی ئەوانا نەبوون ، یان بەو شێوەیە بە فراوانی نەبوون ؟!!! دیسان بوحەیرا عەرەب نەبوو ، چۆن توانی بە زمانێکی بێگانە وتارو پەخشانی وادابنێ کەبە هەموو عەرەبەڕەوانبێژەکان نەتوانن بەوێنەی سوورەتە بچکۆلەیەکی سێ ئایەتی بلێن؟!! ئەی ئەو هەواڵانەی پاشە ڕۆژی لەکوێ هێنا کە وەك سپێدەی بەیانی ڕاست دەرئەچوون ؟ !!! دیسان قورئان بە یەکجار نەهاتووە زۆر لە ئایەتەکانی بەش بەش‌و بەگوێرەی ڕووداوو لەکاتی پێویستدا ئەهاتنە خوارەوە ، ئەمەچۆن لەو کاتەدا ڕێك خراوون ؟!!! ئەی چۆن یارەکانی باسیان نەکردوە کە ڕوو داوی بچووکیش نیە باسیان نەکردبێ ؟ یان دوژمنەکانی کە بۆبچووکترین شت ئەگەڕان بیکەن بەبەڵگە بۆ بەدرۆخستنەوەی ، بۆ ئەمەیان نەهێناو دنیایان پێ پڕنەکردووە ؟!!!

بێجگە لە مانەیش من گومانم لە ڕووداوەکەدا بەو شێوەیە هەیە چونکە ئەگەر (محمد) لە کۆنەوە شتی وای بیستایە چارەڕێی ئەکردو لە کاتی بینینی فریشتەکەدا لە خۆی نەئەترساو ئەیزانی ئەمە ئەوەیە کە بەتەمای بوو !!! یان ( أبــوطالب ) ئەبوایە بەکەم کەس ئەو

موسلمان ببوایه !!!

وه بۆ ئەوه (محمد) ڕق ئەستور ،یان فێ دار بوبێت وەکاتێ له فێکەی هۆشیار ئەبـۆوه وای ئەزانی فـریشته نیگای بۆ هێناوه ، ئەمـــه لەوانی تـر هیچو پوچترەو دووره لـه ڕاستیبەوه ، چونکه دۆستو دوژمنی (محمد) تێکـڕا بەیەك دەم ئەڵێن : (محمد) زۆر لەسەر خۆو بەئارامو هێمنو بەحیلمو لێبووردە بووه ، بەڕەنگـــێ هیچ کاتێ بۆ خۆی تـووڕە نەبورەو ڕق ئەستووری لێ نەبینراوه ...

دیسان هەرکەسێ ئەوەندەی تۆزێ تێگەیشتنی بێ ئەزانێ که قورئان بەرزتره لـه ڕادەی مێشكو ژیـری هەموو مرۆڤایەتی ، چۆن شتی وا بە قسەی شێت یان فێدار دائەنرێت ؟!! وه هەموو کەسیش ئەزانی که (محمد) دوور بووه له هەموو دەردو نەخۆشییەك وه هیچ کەم و کووڕییەکی تیا نەبوو ، بێجگه لەمانەیش مرۆڤی فێدار که هاتەوه سەر خۆی هیچی لەبیر نامێنێ و نازانێ چی بەسەرهاتوه ...

وه لەلایەکی ترەوه بۆ دەرخستنی ئەوه که قورئان فەرموودەی خوایەو زادەی بیرو دڵ و مێشکی ( محمد )وهیچ ئادەمییەکی ترنیه ، ئەبینین له چەند جارێکدا دوا بە دوای ڕووداوێك که (محمد ) ـ بەهەزاران دروودی له سەربێت ـــ بە گوێرەی ڕای مرۆڤی خۆی دەی کردن ، ئایەتی قورئان ئەهاته خوارەوه ڕەخنەی لێئەگرت و سەرزەنشتی ئەکرد ، وەکو له ســـەرەتای سوورەتی ( عیســـی ) دا یا وەکـو له دوای بەرەڵاکردنی دیلەکانی بەدرو ...

ئەگەر قورئان زادەی بیـری خۆی یا مرۆڤی تر بـــوو ، چۆن بەو پێیەی ئەکرد ؟ یـــان چـــۆن وا ڕەخنەی له خـــۆی ئەگرت و سەرزەنشتی خۆی ئەکرد ؟!!!

زانای پایه بەرز مامۆستا شێـخ محمد ی خاڵ له (تەفسیریخاڵ) دا

بەجۆرێکی وردو زانیاری باسی (ئیعجازی قورئان) دەکات وەچەندەها بەڵگەی بەهێزو پتەوی خستووەتە ڕوو لەسەر ئەوە کە قورئانو نیگا هەڵ قوڵاوی دڵومێشکی (محمد) وهیچ ئادەمی‌یەکی ترنیە، بەڵکو بەرز ترو باڵاترە لە توانای ئادەمی لەدرێژایی مێژوودا ، وە بەرنامەیەکی خوایی‌یەو بە هۆی جبرەئیلی فریشتەوە ناردی بۆ بەرێزترین ئادەمی ، بۆ (محمد) ی کوڕی (عبدالله)ی قورەیشی ـ هەزاران دروودی لەسەر بێت وەئەویش بە خاوێنی گەیانی بە ئادەمی‌یەکان •

جا لە بەر ئەوە پێم خۆشە لێرەدا هەندێکی لێ بێنمو بیخەمەوە بەر دەستی خوێنەرە کوردە دڵسۆزەکان :ـ

## ئیعجازی قورئان

مەبەست لە ئیعجاز : دەستەو ستانو داماو کردنی کەسێکە لە کارێکا. ئیعجازی قورئان لە گەلێ ڕووەوەیە :

یەکەم : لە وێژەکەیایەتی ، واتە وێژەکەی شتێکی تیایە وەك وەزنی شیعر کە مەردومی خوێندواری ڕەوان بێژ هەستی پێ ئەکات بەڵام ناتوانێ باسی لێ بکات ، یا وەك جوانی وایە کە هەر خاوەن دڵ تێی ئەگات ، بەڵام ناتوانێ یەکێکی تر تێ بگەیەنێ ئاهەنگو شێوەی قورئان لە هەموو ئاهەنگو شێوەیەك جیاوازە یەکێك تۆزێ شارەزای وێژەی عەرەبی بێ ئەزانێ هۆنراوەیەکی زۆر جوانوڕەوان ، لەگەڵ پەخشا نیکا چەند لەیەك جیان ، ئاهەنگی قورئانیش لەگەڵ هەموو ئاهەنگێکی عەرەبی‌دا بەهۆنراوەو پەخشانی‌یەوە ئەوەندە لەیەك جیان (طه حسینیش ئەڵێ): قورئان نەپەخشانەونەهۆنراوەیە بەڵکو هەرقورئانەو ناگونجێ هیچی تری پێ بڵێیت • هۆنراوە نیە چونکە وەك شعیر ئایەتەکانی بەقەد یەك نین ، وە وەزنی هونراوەی نیە •

پەخشانیش نیە چونکە هەندێك شتی تیایە دەرمیان کراوە کە لە پەخشانا نەکراوە ، وەك قافیەکانی بێ ۰

لەمەوە دەرئەکەوێ کە قورئان وتەی ئادەمی نیە ئەگینا لە وتاری ئەوان ئەچوو ، هەمو زاناو ڕەوان بێژێك ئەمە ئەزانێ ،هەر وەك ڕەوان بێژەکانی کاتی پێغەمبەر لەمە گەیشتوون ، بۆیە نەیان توانیوە سورەتێکی بچکۆلانەی سێ ئایەتی بڵێن ۰

دووەم :لێرەدا شتێکی زۆر گرنگك هەیە که پێویستە بەرچاو بخرێت ، ئەویش ئەوەیە کە وێژەی قورئان لە وێژەی فەرمودە ( حديث )ەکانی پێغەمبەریش ناچێ ، نە لە ئاهەنگك‌و نە لەسەرباسا، هەروەك هەست ئەکرێ لەودیو وتارەکانی پێغەمبەرەوە بە خۆیەتی ( شخصية ) یەتێکی ئادەمی ، وە بەکەسێك کە هەندێ جار زەبوونی رووی تێبکات ، بەڵام لەو دیو وتارەکانی قورئانەوە خۆیەتی‌یەکی بە هێزی ، دەست داری ، بە دەسەڵاتی ، بێ باکی ، ئاگاداری ، دادپرسی ، دانا ۰۰۰۰ دەرئەکەوێ !! وە لەم خۆیەتی‌یەدا زەبوونی تیا هەست ناکرێ لە هیچ ڕوویەکەوە ، تەنانەت لەو شوێنانەشا کە جێی دڵ نەرمین ۰

لە مەوە دەرئەکەوێ کە قورئان ئەگەر فەرموودەی پێغەمبەر بوایە لەگەڵ فەرموودەکانی‌خۆیا جیاوازی نە ئەبوو، چونکە ئاشکرایە کە هەموو نووسەرێك یەك شێوەو ئاهەنگی هەیە لە نووسینا ، وە کەس ناتوانێ بە دوو شێوە بنووسێ بە جۆرێك کە لە یەك نەچن ، کە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان سروشتی خوایە نەك وتەی ئادەمی ۰

سێیەم: شتێکی‌زۆر گرنگك هەیە لەقورئانا کەزۆرجار لە یەك مەبەست لە سێ‌چوارلاوە بەسێ‌چوارڕەنگك بۆت باس ئەکات، کە یەك لەیەك

جوانترو ڕەوانترو بە هێزترن ، وە هیچیان لە هیچیان ناچن ، کە ئەمە هەر لە قورئانا هەیە ، وە هەر لە دەسەڵاتی ئەوایە ٠

چوارم : شتێکی تر لەمانە لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە هەموو وتەیەکی قورئان جۆرە دەنگێکی مۆسیقی هەیە لە گوێچکەدا ، بە ڕەنگێك ئەگەر وتەیەك لا ببەیت ، وە وتەیەکی تری بەو وەزنو مەعنایە لەجێ دابنێیت،وەزنەکەی ئەگۆڕێ‌وڕەوانی‌یەکەی تێك‌ئەچێ٠

پێنجەم : ئەو تین‌و تەوژمەی کە لە قورئانا هەیە لە هیچ شتێکی ترا لیە ، هەر کەسێك گوێی بۆ بگرێ و دڵی بۆ بکاتەوە تەزووی پیا دێ ، با موسلمانیش نەبێ ، لەبەر ئەوە خوا قورئان ناو ئەبات بە دوو شت ، یەکەم بەگیان ، دووەم بە ڕووناکی ٠

لە ئایەتی ( وكذلك أوحينا اليك روحاً من أمرنا ماكنت تدري ما آلكتاب ولا الايمان ولكن جعلناه نوراً نهدى به من شاء من عبادنا وانك لتهدى الى صراط مستقيم ) شورى/٥٢

واتە: ئاوا سروشتمان بۆ ناردیت بەگیانێك لەلای خۆمانەوە کە قورئانە لە کاتێکا کەنەت ئەزانی نامەو بڕوا چین ، بەڵام گێڕامان ( ئەو قورئانە ) بە ڕووناکی‌یەك کەڕێ نمونی پێ ئەکەین بۆ کەسێك کە بمانەوێ لە بەندەکانی خۆمان ، وەتۆ ڕێ نمونی ئەکەیت بۆ ڕێی ڕاست٠

خوا قورئان ناو ئەبات بە گیان چونکە وەك گیان دڵی مردوو زیندو ئەکاتەوە ، وە بە ڕووناکی چونکە وەك ڕۆژ جیهان ڕووناك ئەکاتەوە ، ئایا هەر ئەم قورئانە کە دوا کەوتووترین ونادانترین گەلی گەیاند بە چڵە پۆپەی ژیانو بەرزترین پلەی زانیاری، لەکاتێکا کە جیهان لە دەریای نادانی‌دا نوقوم‌بووبوو٠

شەشەم : پاکی قورئان لە هەموو هەڵەو دژایەتی ( تناقض ) یەك بە پێچەوانەی نووسینی ئادەمی ، ئێمە کە تەماشا ئەکەین هەرچی زانا گەورەکان هەیە لە جیهانا کە کتێبێك دا ئەنێین ، لە پێشەوە

بیری لێ ئەکەنەوە ئەنجا ئەی نووسن ، پاش ئەوە چاوی پیا ئەخشێنن ، وە جار ودوو جارو دە جار بژاری ئەکەن ،وە هەرچی هەڵەیەکی تیابێ ڕاستی ئەکەنەوە ، ئەنجا سەر لەنوێ ئەیخەنەوەسەر کاغەزو قەڵەمی تێ ئەبەن ، ئەنجا لە چاپی ئەدەن بڵاوی ئەکەنەوە ، کەچی کە لیی ورد ئەبیتەوە هێشتا گەلێك هەڵەو ساتمەو پاش‌و پێشی تیایە (١) ، نەخوازەلا نووسراوێك کە ماوەیەکی زۆری بەسەرا تێ پەڕێ ،کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین وا ( ١٤٠٠ ) ساڵی بەسەرا تێ پەڕی کەچی ڕۆژ بە ڕۆژ جوانی‌و ڕەوانی‌و ڕاستی‌و دروستی دەرئەکەوێ ، وە لەگەڵ هەموو کاتێکا ڕێك وپێك دەر ئەچێ، وەك قورئان خۆی ئەفەرموێ «ولو کان من‌عندغیرالله لوجدوا فیه إختلافاً کثیراً » نساء / ٨٢ • واتە :ئەگەر قورئان لە خواوە نەبووایە دژایەتی زۆری تیا دەرئەکەوت •

حەوتەم :قورئان لە زۆر ئایەتا باسی ئاسمان‌و زەوی‌و ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەو هەورو باوو باران‌و دارو درەخت‌و ئادەمی‌و گیان لەبەران‌و گەلێ شتی تر ئەکات وە ئەمە ( ١٤٠٠ ) ساڵی بەسەرا تێپەڕی ، وە زانین وزانیاری لەم ماوەیەدا هەزاران پلە سەرکەوت بێ ئەوەی قسەیەکی قورئان بە هەڵە دەرچێ •

هەشتەم: قورئان پڕە لە هەواڵی غەیبی کە لەدوای هاتنە خوارەوەی بە دەساڵ ، یا سەد ساڵ ، یا هەزار ساڵ ، یا هەزارو چوار سەد ساڵ هاتونەتە دی ، ئەبێ هی‌واش بیێ کە لەمەولا بێتە دی •

نۆیەم : زۆر معجزەی عیامی هەیە لە قورئانا کە لەکاتی خۆیا نەزانراون،

---

(١) لەچاپی دووەم وسێیەمیا خاوەنەکەی دەس کاری ئەکات‌و ئەڵێ ئەم چاپە باڵاترە لە نوسخەکانی پێشوو چونکە گەلێ وردبینیی تیا کراوە •

— ئاردەلانی —

وەکەس تێی نەگەیشتوون ، بەڵکو دوای هاتنە خوارەوەی قورئان بە هەزارو دوو سەد یا سێ سەد ، یا چوار سەد ساڵ دۆزراونەتەوە لە لایەن زانایانەوە ، وەك ئەمانەی کە لەمەولا بە کورتی باسیان ئەکەین:

پەیدابوونی بوونەوەر :

زانای ئاسمانی ( سێر جیمس جنیز ) ئەڵێ : (بوونەوەر لە بنیات دا غازێکی بڵاو بووە لەم بۆشایی ئاسمانەدا ، وە ئەم ئەستێرانە لەو غازە دروست بوون ) • قورئانیش ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمەوپێش ئەفەرموێ ( ثم استوى الى السماء وهي دخان فقال لها وللارض ائتيا طوعاً أو كرهاً ، قالتا :أتينا طائعين ) فصلت /١١ • یەکبەتی بوونەوەر :

زانایانی بوونەوەر بەلایانەوە وایە : کە هەزاران ملیون ساڵ لەمەوپێش بۆشایی بوونەوەر پڕ بووە لە غاز ، وە ئەو غازە لەیەك پچراوە ، وە ئەم ئەستێرە وەکاکەشانەی لێ پەیدا بووە • قورئانیش ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمە پێش ئەفەرموێ : ( أو لم يرالذين كفروا أن السموات والارض كانتا رتقاً ففتقناهما ) أنبياء / ٣٠

درێژ بوونی شەووڕۆژ لە چوار سەعاتەوە بۆ بیست‌وچوار سەعات :

زەوی دوای ئەوەی کە لەڕۆژ پچراو توێکڵێکی پەیدا کرد لە هەموو چوار سەعاتێکدا جارێك بە دەوری خۆیا ئەسووڕایەوە ، وەشەووڕۆژ چوار سەعات بوو • بەڵام کە مانگ لە زەوی جیا بووەوە وە زەوی کەوتە نێوان هێزی کێشەندەی ڕۆژ و مانگەوە بەرە بەرە خێرایی سووڕانەکەی کەم بووەوە هەتا هاتە سەر بیست و چوار سەعات وەك زانای ئاسمانی ( سێر جورج دارون ) وە ( سێر جێنز ) ئەڵێن • کاتێکیش کە لە قورئان ورد ئەبینەوە ئەبینین

---

(١) بۆ تەواو تێ گەیشتنی سەیری تەفسیری خاڵ ( ج ١ ل ٧٣ ــ ٧٥ ) بکە

نیشـانه بۆ ئەم باســە ئەکات بەم ڕەنگە لە پێش پچڕانی مانگك لە بارەی زەوی‌یەوە ئەفەرموێ (یغشي اللیل النهار یطلبه حثیثاً) أعـراف پچرانی مانگك لە زەوی :

زانایانی ئاسمانی ( سێر جورج داروِن و سێر جینیز ) ئەڵێن : ( هەر وەك زەوی‌کاتی خۆی لـە ڕۆژ پچڕاوە ، مانگیش لە زەوی پچراوە ، چونکە زەوی پێش ئەوەی مانگی لێ جیا بێتەوە زۆر بە خێرایی بەدەوری خۆیا سووڕاوەتەوە ، بەچوار سەعات چەرخەیەکی تەواو کردووە ، ئینجـا لە بەر ئەوەو لە بەر هێزی کێشندەی ڕۆژ لە سـەر زەوی لە عاسـتی دەریای هادی‌و هیندی‌و ئەتلەسـی زەوی هەڵتۆقیوە و پچراوە ، ئەو پارچە گەورەیە لە زەوی جیا بووەتەوە ، بە دەوری خۆیا سووڕاوەتەوە هەروەك بەدەوری زەویشا سوراوەتەوە) .

وەك قورئان نیشانەی بۆ ئەکات ، ئەفەرموێ : ( أو لم یروا أنا نأتی الارض ننقصها من اطرافها ) رعد /٤١ .

فراوان بوونی بوونەوەر :

زانای ئاسمانی دکتور ( هابـل ) ئەڵێ : ( قەبارەی بوونەوەر دەم بە دەم گەورەتر ئەبێت ، بەم ڕەنگە ئەم هەموو کاکەشـانەی کە بە ئاسمانەوەن هەناسە بە هەناسە لە یەك دوور ئەکەونەوە ، وە لە تاریکستانی نەبون ( عدم ) بەرە بەرە ڕووناك ئەکەنەوە ، واتە قەبارەی ڕووناکی ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر ئەبـێ ) .

سێرجینز ئەڵێ : ( قەبارەی بوونەوەر لە یەکەم ڕۆژی دروست بوونیا چەند بوونیا چەند بووە ئەمڕۆ دە ئەوەندەیە ). کە تەماشای قورئان ئەکەین (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش ئیشارەت بۆ ئەم مەسـەلەیە ئەکات ئەفەرموێ :

( والسـماء بنیناها بأید وأنا لموسعون ) ذاریات / ٢٧ .

خڕی زەوی :

قورئان ئیشارەت ئەکات بۆ خڕی زەوی بە ئایەتی :

( یكور اللیل علی‌النهار ویكور النهار علی اللیل ) زمر / ٥ .

واته:خوا تاریکی شەو بە کورەوی ئەهێنێ بە سەر ڕووناکی ڕۆژدا ، وە ڕووناکی ڕۆژ بەکورەوی ئەهێنێ بەسەر تاریکی شەودا . واتە: تیشکی ڕۆژ بەکورەوی ئەکەوێتە سەر زەوی ، هەر وەك بەکورەوی ئەکەوێتە سەرمانگ .

سووڕانەوەی زەوی بە دەوری ڕۆژدا :

ئێستایش خوێندەوارە کۆنەکان هەروا ئەزانن کە زەوی وەستاوەو ڕۆژ بە دەوریا ئەسووڕێتەوە . هەر چەند لە چەرخی شانزەهەما زانای پۆڵۆنی ( کۆپرنیك ) دەری خست : کە زەوی بە دەوری ڕۆژا ئەسوڕێتەوە .

کەچی قورئان هەزار ساڵ لە پێش ئەوا فەرمویەتی :

( وتری الجبال تحسبها جامدة و هي تمر مر السحاب ، صنع الله الذی أتقن كل شیء ) نمل / ٨٨

واتە : تۆ شاخەکان ئەبینی وا ئەزانی وشك وەستاوون و جوولە ناکەن ، کەچی لەم حەوایەدا وەکو هەور ئەڕۆن .

وردکردنی ئەتۆم ( ذرة ) :

تا سەدەی نۆزدەهەم زانایان وایان ئەزانی کە ئەتۆم نابێ بە دوو کەرتەوە . لە ساڵی ١٨٩٧ زانای ئینگلیزی ( سێر تۆمسۆن ) ( ذرة ) ی لەت کرد چونکە تەماشای کرد هەموو ( ذرة ) یەك لە سێ شت دروست کراوە :

١ ـ پرۆتۆن ٢ ـ نیوترۆن ٣ ـ ئەلکترۆن .

کە تەماشای قورئان ئەکەین ( ١٤٠٠ ) ساڵ لە مەو پێش ئیشارەت

ئەكات بۆ ئەوەی کە لە (ذرة) بچوکتر هەیە ، وە هەموو ( ذرة)یەك لە ئاسمانو زەویدا لەو سێ شتە دروست کراوە ، ئەفەرموێ :
( و ما یعزب عن ربك من مثقال ذرة في الارض ولا في السماء ولا أصغر من ذلك ولا أكبر إلا في كتاب مبين ) يونس / ١١
نێرو مێ لە هەموو شتێکا :
جاران ئەوەندە ئەزانرا کە نێرو مێ لـــە ناو ئادەمی و گیـان لەبەرانا هەیە ، وە ئەمە نەزانراوە کە هەرچی دارو درەختو گوڵو گیا هەیە هەموو نێرو مێیان هەیە ، وە با متوربەی مێ لـــە تۆوی لێر ئەکات ، کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمەو پێش ئەفەرموێ : ( ومن كـل الثمرات جعل فيها زوجين أثنين ) رعـــد / ٣ .
لە پاشان زانایان بۆیان دەرکەوت کە کارەبا نێرو مێی هەیە وە بە یەك گرتنی ئەم دووانە تەوژمو تەکانی کارەبا پەیدا ئەبێ . کەچی کە تەماشای قورئان ئەکەین ئەبینین لە پێش ئەم زانایانەدا بە (١٣٠٠) ساڵ ئەفەرموێ : ( ومن كل شيء خلقنا زوجين) ذاريات / ٤٩.
بەڵکو ( ذرة ) - کە بچوکترین شتە - دەرکەوتووە کە دوو دڵی زۆر بچوکی هەیە یەکێکیان پێی ئەڵێن ( پرۆتۆن ) وە کارەبای گەرمی تیایە وە ئەوی تریان پێی ئەڵێن ( نیوترۆن ) وە کارەبای ساردی تیایە وە بە دەوریا چەند شتێکی زۆر ورد ئەسووڕێنەوە کە پێی ئەڵێن ( ئەلکترون ) وە لە چاو لێکدانێکا سەدەها میل ئەبڕێ کە ئەلکترونانە کارەبای ساردیان تیایە ، بە ڕاستی هەر خوایـە کە ئەم کارە جوان جوانانە ئەکات وەکو ئەفەرموێ : ( سبحان الذي خلق الازواج كلها مما تنبت الارض ومن أنفسهم ومما لايعلمون ) يس ٪ ٣٧ .

متوربەکردنی هەور :

زانای بە ناوبانگ ( فەرەنگلین ) لە ساڵی ١٧٥٢ دا دۆزی‌یەوە کە هەور کارەبای تیایە ، یا سارد ، یا گەرم ، هەورێك کە هەر کارەبای سارد یا هەر کارەبای گەرمی تیا بێ جگە لەوە کە نابارێنێ ئەش‌ڕەوێتەوە بەڵام کە خوا ویستی ببارێنێ بە هۆی باوە ئەو پارچە هەورانەی کە کارەبای ساردو گەرمیان تیایە نزیکیان ئەخاتەوە لە یەك تا تێکەڵیان ئەکات وە کارەباکانیان متوربە ئەبن ، ئەو حەلە ئەنجا دەست ئەکات بە بارین ، وەك قورئان ئەفەرموێ (وارسلنا الرياح لواقع ، فانزلنا من السماء ماء فاسقيناكموه) حجر/٢٢ تا بەرەوژوور ببێتەوە ئۆکسجین کەمتر ئەبێتەوە ،

جاران کەس نەی ئەزانی کە تا لە زەوی بەرزتر ببیتەوە ڕووەو ئاسمان ئۆکسجین هەوا کەمتر ئەبێتەوە ، وە هەناسەت بەگرانتر بۆ ئەدرێ ، بەڵام لە پاش پەیدابوونی فڕۆکەو باڵۆن ئەمە زانرا کەچی قورئان ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمە پێش ئیشارەت بۆ ئەمە ئەکات ئەفەرموێ : ( فمن يرد الله أن يهديه يشرح صدره للاسلام ومن يرد أن يضله يجعل صدره ضيقاً حرجاً كأنما يصعد في السماء ) انعام ـ ١٢٥

واتە : هەر کەسێك خوا بیەوێ ڕێ نمونی بکات سنگ‌و دڵی گوشاد ئەکات بۆ ئیسلامی‌یەت ، وە هەر کەسێکیشی بوێ گومڕای بکات سنگی قورس ئەکات ، وەك بە تەکان سەرکەوێ بە ئاسمانا . ئینجا ئەگەر ئەمە سروشی خوا نیە محمدێکی نەخوێندەوار ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمەو پێش ئەمەی لە کوێ زانی ؟! دەرچوون لە هێزی کێشندەی زەوی‌و ئەستێرەکان :

لەمانە لە هەمووی سەیر تر ئەم ئایەتەیە کە ئیشارەت ئەکات بۆ ئەوەی کە ئەگونجێ لەمەولا ئادەمی لە هێزی کێشندەی زەوی یا ئەستێرەکان

دەرچن ، ئەفەرموێ : ( یـا معشر الجن والانس ان استطعتم أن تنفذوا من أقطار السموات والارض فانفذوا لا تنفذون الا بسلطان) الرحمان / ٣٢ .

بەڵێ مەعنای ئەم ئایەتە لە ساڵی ١٩٦١دا هاتە دی ، وە دەوڵەتی ڕووس یەکەمجار ( گا گارین ) ی دەرکرد لە هێزی کێشـــندەی زەوی بۆ شـــوێنێك کە قورسایی شـــتی تیـا نامێنێ ، وە دووری خستەوە لێ ی بە جۆرێك کە بە گردی زەوی‌دا بسووڕێتەوە ، دوای ئەو ئنجا ئەمەریکا ناردی .

تو خوا ئەمە لەوانەیە ( ١٤٠٠ ) ساڵ لەمەو پێش بە بیری کەسا بێ ، چ جای محمدێکی نەخوێندەوار ، ئەمە ئەگەر سروشتی خوا نەبێ چی ترە .

ئەمانە هەندێکن لە معجزاتی قورئان ، کە سەد ئەوەندەی تری ماوە ، وە هەر یەکەی لە شوێنی خۆی باسی ئەکەین خوا یاربێ .

کەوا بوو ئیعجازی قورئان هەر لەڕووی وێژەکەیەوە نیە ، کە لە کاتی هاتنە خوارەوەیا ، ڕەوان بێژانی عەرەب هەستیان پێ کردووە، بەڵکو لە گەلێ لای ترەوەیە ، کە تـا جیهان پێش بکەوێو زانین ســـەربکەوێ ، بەرە بەرە ئەوانیش دەرئەکەون ، کە ئەمە هەر لە توانای خوادایە بۆیە قورئان ئەفەرموێ : ( قل لئن اجتمعت الجن والانس على أن یاتوا بمثل هذا القرآن ، لا یاتون بمثلـه ولو کان بعضهم لبعض ظهراً ) الاسراء / ٩٠ .

واتە : بڵێ ـ ئەی محمد ـ ئەگەر هەرچی ئادەمیو پەری هەیە کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ، وێنەی ناهێنن ، بـا هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیان بن . (١)

---

(١) بە دەستکاری‌یەوە لە تەفسیری خاڵ ج١ چاپی یەکەم ١٩٦٩ لاپەڕە (٦٩ ـ ٨٣) وەرگیراوە .

## بەشی دووەم
## خەبات کردن (جهاد) لە ئیسلام دا

دوژمنانی ئیسلام بە خۆرهەڵات و خۆرئاوابی‌یەکان وە لە دەرەوە ، وە بە دەست‌و پێوەندو دار دەست‌و شوێن کەوتووەکانیانەوە ، لە ناوەوە ، دەڵێن : ( ئیسلام ئاینێکی سامناك‌و ترسێنەرە ، شەیدایی کوشتن‌و برین‌و خوێن ڕێژی‌یە بە زۆری ڕم‌و شیرو تیر بڵاوکراوەتەوە، لە سەر لاکی مەردم بنیات نراوە ) .

ئەمە لە لایەکەوە ، وە لە لایەکی ترەوە زانا دڵسۆزە ساویلکەکانی ئیسلام‌و ئەوانەی بە زانیاری خۆرئاوا مێشکیان ئاخنراوە ، لە کاتی بەرگری کردندا لە ئیسلام ، وە بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو ڕەخنە ناڕەوایانە ، دێنن جەنگ‌و هەراکانی ئیسلام بە تێکڕایی دەگێڕنەوە بۆ سەر جەنگی بەرگری ( الحرب الدفاعی ) ، وە لەم ڕێگایەدا زۆر خۆیان ئەرەنجێنن‌و ئەڵێن : ( هیچ کاتێ ئیسلام جەنگی دانەگیرساندووە وەنەی ویستووە بجەنگێت ، بەڵام دوژمن جەنگی پێ فرۆشتووە و هاتووەتە سەری‌و ئەمیش ناچار بووە وەڵامی داوەتەوە.

وە لە بەر ئەوەی ئەم ڕەخنەیەو وەڵامەکەشی ڕاست نیە ولەگەڵ سروشتی ئیسلام دا ناگونجێ ، وە سەر دەکێشێت بۆ داخستنی دەرگای خەبات کردن (جهاد) ، کە پایەیەکی گەورەو گرنگە لە ئیسلامدا ، وە گەلێك ئایەتی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەر - درودی خوای لە سەر بێت - لەم بابەتەن وەهانی موسڵمانان دەدەن بۆی ، هەتا پێغەمبەر دەفەرموێت : ( هەر کەس مرد و خەبات‌و غەزای نەکردو بوو ، لە دڵی خۆیشیا بە تەما نەبوو بیکات ، ئەو کەسە بە بەشێك لە مونافەقێتی‌یەوە مردووە ) (١) ، وە دەفەرموێت :

---

(١) مسلم ڕێوایەتی کردووە .

( هەر کاتێ پەیمانتاندا بە قەرز و دەستان گرت بە کلکی گای خۆتانەوە ، وە خۆتان بە کشتوکاڵەوە خەریک کرد و وازتان لە خەبات کردن بۆ ئیسلام هێنا ، خوا زەلیلی و ڕیسوایی دەدا بە سەرتانا ، وە لە سەرتان لانابا تا نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینەکەتان )(١).

وە لە بەر ئەمانە دەمەوێ بە شێوەیەکی ڕێك و ڕەوان لە سەر ئەم باسە بڕۆم و ڕاستیەکەی بخەمە ڕوو بە پێی توانایخۆم :

لە کاتێکا ئادەمی‌یەکان لە ناسکترین پلەی ژیانا بوون ، بەڵکو خەریك بوو بە جارێ لە ناو بچن و ڕێزو تامی مرۆڤایەتی‌یان لە ناو نەمابوو ، وە زۆر ئاتاجی‌یان هەبوو بە پێشەوایەکی ڕزگارکەرو بە بەرنامەیەکی ڕێك و ڕەوان و بێ‌پێچو پەنا ، کە چارەی هەموو گۆشەو ڕوویەکی ژیانیان بکات . ئا لەم‌کاتەدا خوای پەروەردگار دەرگای بەزەیی و سۆزی جۆشاو ئایین و بەرنامەی پڕ لە داد و ڕزگارکەری ئیسلامی بە پێغەمبەری مەزن ( محمد ) ی کوڕی (عبدالله) دا بۆ ناردن ، ناردی بۆ هەموو مرۆڤێ لە هەر شوێنێکی ئەم سەرزەوی‌یەدا بژی ، وە بە هەر زمانێك بدوێ ، وە هەر ڕەنگ و شێوەیەکی هەبێ ، ناردی کە تاقانە بەرنامەبێ و هەتا هەتایە مرۆڤەکان لەسەری بڕۆن ، وە بە پێی ئەو بەرنامەیە کار و بارەکانیان جێ بەجێ بکەن ، ناردی تا یاساو نەریت و دەستووری نەواوی کۆمەڵ بێ ، بەبێ جیاوازی لەنێوانی کاربەدەست و ژێردەستو شاری و لادێی و هەژارو دەوڵەمەندو پیاوو ژنو گەورەو منال دا ، ناردی بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە هەموو شێوەیەکی جەوروستەمو داگیرکردن ، بە هەر ناوو لە ژێر هەر بەرگێکدا بێت . . ناردی بۆ ڕزگارکردنی ئادەمی لە کۆیلەیی و بەندایەتی بۆ کاربەدەستو مرۆڤی ترو ماددەو بەش و پارچەکانی گێتی و بوونەوەر ، وە بۆ

---

(١) ئیمام ئەحمەدو ابو داود ڕیوایەتیان کردووە .

ئەوەی هەموویان بەیەکەوە بەندەی خوای پەروەردگاربن ، وە هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی گێڕایەوە بۆلای خوا ، وە هەموو ئیش و کارەکانی ئەمان و ئەوان هەر بەدەســـت ئەو خواگەورەیەیە .. وە بۆ ڕزگار کردنیان لە بەندایەتی هـــەواو هەوەس و ئارەزوو وە بـــۆ رزگار کردنیان لە خەرافات و ئەفسانە و شتی پڕو پووچ و درۆ و دەلەسە، وە لە ژێر بەرنامەی ئیسلامدا مرۆڤەکان یەکـەر ئازادو سەربەستن و بێجگە لە خوا کڕنووش بۆ کەس نابەن وەگەردن بۆ کەس کەچ ناکەن ، هەموویان بەندەی خوان و کەســـیان لە کەســـیان زیاترو گەورەتر نیە ، تەنها بەتەقواو خوا ناسی و چاکە کردن نەبێت .

ئەبێ ئیســـلام تاقانە بەرنامە و دەســـتووری کۆمەڵ و یاســـای مرۆڤەکان بێت ، بێجگە لە ئیسلام بەرنامەیەکە تر لە نـاو مرۆڤدا نەبێت ، وە هەموو شتێکیان هەر لە ئیسلامەوە وەربگرن . کەواتە مافی هەموو ئادەمی و کۆمەڵ و ناوچەیەکی ئەم بانگەی پێ بگات و لەم بەرنامە پڕ لـە سوودە تێبگات و شارەزای ببێ - وەنابێ هیچ کەسێ یا کۆمەڵێ لەڕێگەی ئەم بانگەدا بوەســـتێ و ڕێگە لە بڵاو بوونەوەی ببەستێت و بەرهەڵـستی بکات ، وە دیســـان مافی ڕەوای هەموو مرۆڤێکە - کە دوای تێگەیشتن لەم بانگە - سەربەست بێت وە لە هیچ کەس نەترسێت بۆ وەرگرتن و پەیڕەوی کردنی ، وە ئەگەر یەکێ یـان کۆمەڵێ وەریـان نەگرت نـابێ ڕێگا لە بانگ و بانگ کەران بگرن ، وە نەیەڵن بگاتـــە مەردمەکان ، بەڵکو بـــە پێچەوانەوە ئەبێ ڕێگا چۆڵ بکرێت وە سەربەستی بدرێت بە بانگ کەرانی ئیســـلام کە ئەم بانگە بە ســـەربەســـتی بەنـاو خەڵکا بڵاو بکەنەوە ، وە ئەو کەسەی وەری گرت ئەبێ سەربەست بێ و زۆری لێ نەکرێت و نەچەوسێتەوە .

وه لەم لایشەوە ئەرکی سەرشانی موسڵمانانەو بانگ کەرەکانی کە پشت گیری لە هەموو موسڵمانێك بکەن و ڕێگا لەبەر دەمی خۆیانا چۆڵ بکەن و هەر کۆسپ و گرێ و تۆرتێك هاتە ڕێیان لای‌بەرن و دووری بخەنەوە لە ڕێگاکەدا ، تا باوەڕەکە سەربەست بێت و باوەڕکەرەکان ئەمین بن ، وە بەرنامەی خوا لە سەر زەوی دا بە هێمنی و ئاسایشی دابمەزرێت و مەردمەکان لە خێرو بێری بەشداربن .

کەواتە هەر کۆمەڵ و هێزێ هاتە ئەم ڕێگەیە و بەرهەڵستی بڵاو کردنەوەی کرد ، یا مەترسی نایە بەر ، یا خەڵکی ئەترساند لە وەرگرتنی ، یا ئاژاوەی ئەنایەوەو سەری لە موسڵمانان تێك ئەدا... ئەبێ موسڵمانان لەناوی بەرن و بیخەنە ژێر پێ و تۆزی بەرن بە حەوادا ، تا کەس نەتوانێ جارێکی تر ئەو ڕێگایە بگرێ و موسڵمانان توشی ئازار بکات ، وە تا گەردن بەتەنیا هەر بۆ خوای پەروەردگار کەچ بکرێت ( ویکون الدین کله لله ) البقرة / . ئەمەیش نەك بەزۆر موسڵمان کردن چونکە لە ئیسلامدا هەموو کەس سەربەست و ئازادە لە باوەڕدا ، قورئان ئەفەرموێ : ( لا إکراه فی الدین ) البقرة / یانی زۆرکردن نیە لە ئایین وەرگرتندا . بەڵکو ئەبێ بەرنامەی خوا دەستوورو یاسای وڵات بێت ، ئیتر هەر کەسە بە ئارەزووی خۆیەتی موسڵمان دەبێت یان لەسەر ئاینەکەی خۆی دەمێنێتەوە .

وێنەی ئەم بابەتەی ئێمە : ئەگەر ناوچەیەك کرا بەکشت و کاڵ و تینووی بوو ، پێویستی بەوە بوو کە جۆگەی بۆ هەڵبگیرێت و ئاو بدرێت ، بێ گومان لە هەندێ شوێنا ئاوەکە بۆ خۆی دەڕوات و ڕەنج کێشانی ناوێ ، وە لە هەندێ لادا دڕك و داڵ دێنە ڕێگای و

بە اووتە دارێك لا دەدرێت ئەی ئەگەر بەردێك یا کۆسپێکی گەورە هاتە ڕێگای‌و بەری ئاوەکەی بەست چار چی‌یە؟ ئایا وازی لێ بهێنرێت و کشت و کاڵەکە وشك ببێ و ئاو نەدرێت؟ نەء، بەڵکو ئەبێ بەهێزی شان و باهو و هەندێ جار بەتۆپ و باریە بەردەکە بشکێنرێت و کۆسپەکە بڕوخێنرێت‌و ئاوەکە بگاتە کشت و کاڵەکە وپێی ئاو بدرێت، جائیتر ئەگەر هەندێکی ئاوەکەی وەر نەگرت، یان دای بەبژار چارنیە. هەر بەو پێیە ئەبێ ئیسلام بگاتە مرۆڤ و ڕزگاریان بکات، وە هەر هێزێك هاتە ڕێگا لێی دەدرێت و لەناو دەبرێت تا ئاینەکە بە مەردمەکان بگات و هەموو کەس بتوانێت بە بێ ترس و بیم وەری بگرێت. وەجیهادو خەبات لە ئیسلام دا لەسەر ئەم بناغەیە و بۆ ئەم مەبەستە پێویست کراوە و بەرپا بووە.

هەر وەك خەبات‌و تێکۆشان بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام پێویستە، دیسان بۆ پاراستنی یاساو فەرمانەکانی پێویستی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە. پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەربێت ـ فەرموویەتی:

(هەرکام لە ئێوە شتێکی ناڕەواو گووناهی بینی ئەبێ بیگۆڕێ بەدەست و باهوی، ئەگەر بۆی نەکرا بەدەم و زمان، وە ئەگەر ئەمەیشی بۆ نەکرا ئەبێ بەدڵ و دەروونی بیگۆڕێت)(١) گوێ بگرە لە بولبولی نەغمە خوانی باخچەی بەرینی ئیسلام مامۆستا مەولەوی چەند بەشیرینی ئەمەمان بۆ دەڵێت.(٢)

• لە لیباس نەهی لە مونکەر

ئەمر بەمەعروف چاك بکە لەبەر

---

(١) مسلم ڕیوایەتی کردووە. (٢) عقیدەی مرضیەی مەولەوی.

کەچاوت پێ کەوت مونکەرێکی کرد
یەکێ ، دەفعی کە لە گەورە تا ورد

بە دەســـت بەزمان یاخۆ بە جەنان
وهـــذا الأخیر أضعف الإیمان

نعـــوذ باللہ جـــەزای نـــەوێنی
ئەو حاڵەی مونکەر تۆنەی بوغزێنی

أضعف الإیمـــان کە بورێتەوە
هـەر کوفرە دیتر بەســـەر رێتـەوە

پەنـا بەوخوا لـەوە کە نەدوێ
نەیشی بوغزێنێ‌و کەیفی پێ بجوێ »

ئاینی ئیسلام یەکەم بانگێ بوو بەرز بووەوە بـۆ رزگار کردنی مرۆڤ بە تەواوی ، لە مەککەوە دەستی پێ کرد ، لە پێشەوە بەداوای خوێنـــدن و فێربوون ، ئەنجا داوای کرد لـــە پێغەمبەر کەخزم و کەسـەکانی خۆی با گ بکات و بیان ترسێنێ و مژدەیان بداتێ ، دوای ئەوە بانگ کردن‌و ترساندنی قورەیش‌و مەککەیی‌و عەرەبەکانی تری ئەو دەورو بەرە ، پاشان هەموو عەرەب و هـە،وو ئادەمی‌یەك بە تەواوی ، تا ســـیانزە سـاڵ لە مەککە دا دەوری رام هێنان و پێ گەیاندن و تێ گەیاندن و ئامادەکردن بوو ، ئنجا ئیزنی کۆچ کردن دراو دوای ئەمەیش ئیزنی جەنگاندن درا ، دوایی داواکرا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی ئەچن بەگژیاناو دێنە سەریان ، وەئەم جۆرە جەنگانە جەنگی بەرگری بوون ، بە بەدر دەســـتی پێ کردو بـە خەندەق کۆتایی هات ، دووای ئەمانە داوایان لێ کرا بجەنگن لە گەڵ هەموو

بت پەرستو خوانەناسێکدا ، مەشخەڵی ئازادی هەڵبگرنو سەر زەوی ئازاد و ڕزگار بکەن و کارێکی وابکەن کە گەردن کەچی هەر بۆ خوا بکرێت بە تەنیاو بەس .

ئەبێ موسڵمانان ئاینی ئیسلام بەسەر زەوی دا بڵاو بکەنەوەو بیکەنە بەرنامەی مرۆڤ ، ئەمەیش بەوە پێك نایەت کە کاربەدەستانی وڵات لە پیاوانی ئاینی بێت ، وەکو پیاوانی ئاینی کەنشتەی ئەوروپا لایان وابوو ، بەڵکو ئەبێ شەریعەتی ئیسلامو بەرنامەکەی خوا دەستوورو یاساو ڕژێمی وڵات بێتو کاربەدەستانی وڵات بەجێیان بێنن ، ئیتر ئەندامی کۆمەڵ موسڵمان یان گاور یان جولەکە یان ئاگر پەرست بن قەی ناکات و گوێیان نادرێتێ ، هەر کاتێ موسڵمانان ئەم کارەیان بەم پێیە بەجێ هێنا ئەوە پێویستی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوە خوایان لە خۆیان ڕازی کردوە ، وە ئەوەیان لە سەر ماوە بەخێوی بکەنو بیپارێزن ، وە ئەگەر وایان نەکرد هەموو گوناهبارن .

ئەمەیە جیهاد لە ئیسلاما ، وە بۆ ئەم مەبەستە جەنگ ئەکرێت ، وە ئەبێ بەم پێیە لە جەنگی ئیسلامی تێبگەین .

ئیسلام ئاشتیو ئاسایش بەبنکەی همیشەیی بانگەکەی دادەنێت ، وە جەنگو هەرا بە شتێکی ناچاری لە بنکە دەرچوون ( شذوذ ) دادەنێت ، چونکە ئیسلام بۆ داگیر کردنو چەوساندنەوەو جەورو ستەمو ئازاردان نەهاتووە ، بەڵکو بەرنامەیەکی خوایە بۆ ڕزگار کردنو ئازاد کردنی مرۆڤ ، لە سەر بناغەی خۆشەویستی و بەزەیی سۆز دامەزراوە ، مرۆڤ بە خاوەن ڕێزو جێنشینی خوا دادەنێت ، وەلارەجلەوی و خراپەکاری و ڕێگا گرتنی هەندێ لە ئیسلام ناچار ئەکات بەجەنگ کردن . ئیسلام هەوڵ دەدات بۆ

ڕیشەکێش کردنو لەبن هێنانی ئەو هۆیانەی جەنگ‌و هەراو پشێوی لە ناو کۆمەڵدا دروست دەکەن .

ڕەگ و ڕیشـــەی جەنگ و هەرای دەمارگیری‌و نەتەوەو هۆز پەرستی لەبن دەردێنێ ، بەوە کە مرۆڤەکان بە تێکڕایی ئەگێڕێتەوە بۆ یەك سەرچاوە ، بۆ ڕۆڵەی پیاو و ژنێك :

( یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر و انثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا إن اکرمکم عندالله أتقاکم ) الحجرات / .

وە جەنگی دەمارگیری ئایینی لـەناو دەردەکات بەوە کە ددان بە ئایینەکانی تـرا دەنێت‌و زۆر لـە کەس ناکات کە واز لە ئایینی خۆی بێنێ ، هەموو کەس ئەتوانێ بەگوێرەی ئایینەکەی پەرســتنی بەجێ بێنێ وە ڕێگە لە کەس ناگرێت لە پێویستی ئایینی‌دا .

وە هەروەها ئیسلام ڕیشەی ئەو جەنگانە لە بن دێنێ کە تەماع‌و چاو چنۆکی‌و کەڵك‌و سوود هەڵیان دەگیرسێنێت ، جەنگی ئیمپریالیستی و داگیر کردن و گەڕان بە شوێن بازاڕ و ماددەی خاودا و ، وە بـۆ چنگ خستنی هۆیەکانی دەرامەت و بەرو بووم ، ئیسلام مرۆڤەکان بە کۆمەڵێکی هاوکار دائەنێت ، داوای هاریکاری و یارمەتی دانی یەکتریان لێ دەکات : ( وتعاونوا علی البر والتقوی ولا تعاونوا علی الاثم والعدوان ) المائده / ، یانی یارمـەتی یەکتر بـدەن لە ســەر چاکەو خواپەرستی ، وە یارمەتي یەکتر مەدەن لەخراپکاری‌و دەست درێژی کردنا .

دیسان ئیسلام ئەو جەنگانە لە بن دەردێنێ کە بە هۆی هەوڵدان بـــۆ گەورەیی و پلەو پایەی پڕو پووچەوە دادەگیرســێن ، وەکو جەنگاندن بۆ پاشایەتی و سەرۆکایەتی و بە کەلەپوور دانانی ئەمجۆرە پلانە لە باوکەوە بۆ کوڕو . . . هتد .

( پیاوێ هاتەلای پێغەمبەری خوا ، وتی : پیاوی واهەیە جەنگ ئەکا بۆ تالآن و هی‌وا هەیە بۆ ناو و ناوبانگ و هەیە ئەجەنگێ تا خەڵکی جێگا دەستی ببینێ ، ئەمانە کامیان لە ڕێی خوادایە ؟
پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەربێت ـ فەرمووی : تەنیا ئەو جەنگە لەڕێی خوادایە کە بۆ ئەوە بکرێت‌و شەو فەرمانی خوا بەرزبێتەوە )(١) .

وشەو فەرمانی خوایش بریتی‌یە لەقورئان ، لە ئایین‌و بەرنامەی ئیسلام ، بریتی‌یە لە ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌و لە جێ نشینێی خوای گەورە ، کەواتە جەنگك تەنیا بۆ بلآو کردنەوەی ئیسلام و بۆ پاراستنی ئیسلام و موسلمانان دەکرێت و بەس ، وە ئەبێ ئیسلام بگاتە ناو دڵ‌و گوێی هەموو کەس ، وە هەمو کەس سەربەست بێت لە وەرگرتن و پەیڕەوی کردنیا ، وە هەرکەسێ یا کۆمەڵێ لەم ڕێگایەدا وەستا ئەبێ دوور بخرێتەوە و لا ببرێت ، بەهەر نرخێ بووە : (وقاتلوهم حتى لاتكون فتنه ويكون الدين كله لله )الانفال یانی : بجەنگن لەگەڵیانا تا فیتنەو خراپکاری نەمێنێ وئایین وگەردن کەچی تەنیا بۆ خوابێت .

جەنگی ئیسلام بەم ڕێیەو بۆ ئەم مەبەستەیەو هەروەهاش بووە ، بۆیە لە هەمو جەنگەکانا داوایان ئەکرد لە دوژمن : موسلمان بن ، ئیتر وەك ئێمە دەبن و لە جێگاو ڕێگای خۆتان ئەمێننەوە ، ئەگەر موسلمان نابن وەرنە ژێر ڕکێف و دروشمی ئیسلامەوە ، باجێکی سالآنە بدەن بە دەوڵەتی ئیسلام بۆ پارێزگاری کردنتان ، ئەگەر ئەمەیشیان نەکردایە ئەنجا لەگەڵیانا ئەجەنگان .

وە هەر جەنگێ بەم شێوە یا بۆ ئەم مەبەستە نەکرابێت ، ئەوە

---

(١) أصحابی سنن ڕیوایەتیان کردووە .

جەنگی ئیـلامی نەبووە و جەنگاوەرەکانی گوناهبارن ٠

## رەخنەگرەکانو جەنگ :

ئەمە بەکورتی باسی جەنگی ئیسلام بوو، بەلاّم ئەوانەی ئیسـلام بە ئایینی شـیرو تیر دائەنێنو ئەڵێن : ئیسـلام حەز لە خوێن ڕێژی دەکاو بە زۆر مەردم موسڵمان دەکات ٠٠٠ ئەوانە بۆچی بیرێك لە خۆیان ناکەنەوە ؟ ٠٠

بۆچی جوولەکەکان باسـی دوڕندایەتی خـۆیان ناکەن کە لـە درێژایی مێژوویانـا خەریکی ئاژاوەو خراپکاریی بوون ، وە بـە خوێنی مەردم نەخشەی پڕ لە فیتنەو گێژاویان بۆ خۆیان کێشاوە ؟! ڕەنگە نەیانەوێ دداں بەوەدا بنێن کە جەنگی جیهانی یەکەمو دووەم کە ئەو هەموو قوربانیەی تیا دراو ئەو هەموو بێ تاوانەی تیا لـە ناوچوو ، بەبێ هیچ هۆیەکی ئەوتۆ کە داخوازی هەراو بچکۆلەیەك بکات ، بێجگە لە چڵێسـی و تەماعی داگیر کردن و هەڵووشـینی ماڵ و سامان و دارایی خەڵکی ، ڕەنگە دداں بەوەدا نەنێن کە ئەو جەنگانە بە پیلانی پیسی ئەوانو بە پەنجەی ژەهراوی ژێر بەژێریان داگیرسان ؟!! خۆ لە ( پرۆتۆکۆڵی حوکەمای سەهیۆن ) دا دەڵێت :

هەموو جەنگ و هەراو پشێوی و ناکۆکیەکی سەر زەوی بـە پەنجەی پیسی جوولەکە پەیدا ئەبێت . وە جەنگەکانی ئەم دواییەی جوولەکەو عەرەب و کارەسـاتی دێرياسين بەسە بۆ گەواهي ئەم مەبەستەمان .

یان گاورەکان بۆچی پەرۆیەك لە خۆیان دانادڕن؟ بۆچی ئاوڕێك بەلای مێژووی پڕ لـە پەشـێوی خۆیان نادەنـەوە ؟ خـۆ ئـەوان لـە بـەرواری پەیابوونیانەوە تائێستا بە دەورێکی پڕ لە دوڕندایەتی دا

ڕۆیشتون ، چاوگێرانێك بە چەرخەکانی ناوەڕاست و بەدەوری پیاوانی کەنشتەوە بە نۆ ملیۆن قوربانی دادگای پشکنینی پیاوانی کەنشـــتە ، وە بەگیرهاتنی زانایان و پاشاو سەرۆکەکانیان بە دەستیانەوە ، بەسە بۆ ئەوەی ڕوویان نەیەت لە ئیسلام بدوێن !! ئەی بەرپا کردنی جەنگی خاچیەکان ( الحرب الصليبية ) کە ماوەی دوو سەد ساڵ زیاتری خایاندو قوربانی و کوشـــتاری ڕەنـگە بگاتە ملیۆنێـك مرۆڤ ؟ ! (جود فری) کە فەرماندەیەکی سوپای خاچی بوو نامەیەکی بۆ (پاپا) ناردو مژدەی دایە کە سەرکەوتوون و ئەڵێ : ئەی (پا پای) بەڕێزو پیرۆز ولاخەکانمان تا ئەژنۆیان بە خوێنی خۆر هەلاتیەکانا ئەڕواتە خوارەوە لە هەیـوان و پەرســـتگای ســـلیمان‌دا . وە هەمان جەنگیان لەگەڵ گاورەکانی ( ألبيى )و ( واللدونى )و (لوثرو پرۆتستانت و أرثـوذکس ) ە کانـــدا بەرپاکردو لە یەك شـــەودا ســـەد هـەزار پرۆتستانیتان لەیەك شاردا سەربڕی .

ئەی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهـانی کەپاڵەوانەکانی دەوڵەتە گاورەکان ، یان بڵێن : هەڵگری ئالای شارستانی ماددی تازەبوون ، بۆچی بەیەك زرمەو لە یەك هەناسەدا زیاتر لە سێ‌سەد هەزار کەسیان لە دوورگەی هیرۆشیمادا لەگیان کرد ، یان بۆچی فەرماندەی سوپای دەوڵەتە پەیماندارەکان (دول الحلفاء) (اللورد النبي) کاتێ دەستی بەسەر فەلەستین دا کێشاو چووە (بيت المقدس) ووتی : ئـائێـستـا جـەنگی خاچی کۆتای پێ‌هات ؟ ئەمانە هەموو بۆ خوێن ڕێژیو داگیر کردن نین و ئەوانەی ئیسلام بۆ ئەوە بوون ؟ !!سەیرە !! بانێکەو دووهەوا !! لەپاشا بینیم کە زانای بەرزی هیندی مامۆستا (أبوالحسن الندوى) لە سەرچاوە باوەڕ پێکراوە جیهـانیەکـانەوە وەری گـرتووە کـە : (ژمـارەی کوژراوەکانی جەنگە ئیسلامیەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا ، واتە لە

سالی دووەمی کۆچی یەوە تا سالی نۆیەم لە هەزار و هەژدە کەس تێ نەپەڕی ، دووسەدو پەنجاو نۆ موسلمانو حەوت سەدو پەنجاو نۆ لە کافرەکان . بەلام لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا حەوت ملیون کوژراو چوارده ملیون بریندار بوون .

وە لە جەنگی جیهانی دووەم دا (٥٠٬٠٠٠٬٠٠٠) پەنجا ملیۆن بەرکەوت ، لەوانە (٨٬٥٤٣٬٥١٥) کوژراو ئەوانی کە بریندار بوون .

وە کوشتنی هەریەکەیان لە جەنگی یەکەمدا دەهەزار جونەیهی تێ چوو ، وە جەنگی دووەم بۆ یەك سەعات یەك ملیون جونەیهی پێویست بوو«١» . جا وا بزانم هەرکەس سەیری ئەم ڕووداوە بکات و بەرابەرێتی لە نێوانی جەنگە ئیسلامی یەکانو جەنگە جیهانی یەکاندا بکات ، ئیتر ڕووی نایەت بلێ: ئیسلام حەزی لە خوێن ڕێژی بوو ، یان بە زۆرو بە شمشێر ئیسلام بلاو کرایەوە (١) .

وە ئەوەی جێگای داخە لەم دواییەدا ئێمەی موسلمان ئیسلامەمان لە بیر چووەوە ، لەترسی تانەو تەشەری ژەهراوی دوژمن کەوتینە پەلە قاژێ بۆ لابردنی جەنگ و هەرا ، بەلکوو خەبات و تێکوشان لە ئیسلامدا ، وە جەنگەکانی پێشووی ئیسلامەمان هەموویان گێڕایەوە بۆ لای جەنگی بەرگری و بەس ، وامان دایە قەلەم کە ئیسلام هەر پەرستی و بەندایەتی کردن و هەندێ دروشمی تایبەتی یەو بەس . ئیتر ئێمەو جەنگ و هەرا ، ئێمەو شیرو تیر و تۆپ و تەیارە ، ئێمە و کاربەدەستی و فەرمان ڕەوایی ؟ ! خوانەخواستە ئێمە قەت شتی وا نالێین و نایکەین ! ئێمە لەبەر خاتری چاوی کالی ئێوە جەنگ و تێکوشانمان لە ئیسلامدا لابردووە و یاساخمان کردووەو لە ئیسلامەمان سڕیوەتەوە !!! بۆیە ئەگەر یەکێ یان کۆمەلێ وتی :

---

(١) ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ب٢ ل٢٥

ئیـلام ئایین و بەرنامە و بەندایەتی و فەرمان ڕەوابیو قەڵەم و شمشێرە ،پێویستیموسڵمانانە گەیاندنوبڵاوکردنەوەو دووبارەکردنەوەی ئەم بانگی خوایە وە هەرکەسێ یاهەر لایە هاتە ڕێگەی ئەبێ لیی دەنو زاڵ ببـن بەسـەریا ، بـا هەموویان لەو ڕێگایەدا لەناو بچن ، خێرا خۆمان لـەپێش دوژمـنەکانمـانەوە دەکـەوینە پەلەقاژە بۆ دەم کوت کردنی بەهەر جۆر بووە ، کە هیچ نەبێ بە هەزاران ناوو ناتۆرەی نـاڕەوای بۆ دەدۆزینەوە .

## بەشـــی ســـی⁷یەم

## پەندەکانی جەنگی ئوحود

جەنگی ئوحود (أحد) دەرسێکی گەورەو پڕ لە پەندو ئامۆژگاری گرنگ بوو ، پڕ بوو لەکەڵك و سود بۆ موسڵمانەکانی ئەو دەمـە وە بۆ هەتاهەتایە جێگای کەڵكو پەندو ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو مرۆڤ و کـۆمەڵ و ئـومەتێك . لـەبەر ئەوە حەز دەکەم هەمووـان بەوردی ماوەیەك لەگەڵ ئەم جەنگەدا بژین و بەوردی تێ بینی تێدا بکەین.

قورئانی پیرۆز لـە جزمی چوارەم لە سوورەتی (آل عمران) دا بە کۆمەڵەیەکی گەورە لە ئایەتەکانی لەم جەنگە دەدوێت ،بەڵام نەك لە شێوەی چیرۆك یا گێڕانەوەی داستاندا، بەڵکو لەبەرگی پەنـدو ئامۆژگاریو فەلسەفە دەرخستنو نهێنی پیشان دانا ، وە پێغەمبـەری مەزنیش ـ درووودی لەسەربێ زۆر تینی لەم جەنگەوە پێ گەیشتبوو ، بۆیە تاکۆتایی تەمەنی پیرۆزی هەر باسی ئەکرد ، کەبیری شەهیدەکانی دەکردەوە دەی فەرموو : (ئوحود کەژێکە خۆشی ئەوێینو خۆشمان ئەوێ) وائێمەیش هەندێ لەو پەندانە لێرەدا دەخەینە بەر چاو ودڵی خوێنەرە تێ گەیشتووەکان : (١)

١ ـ جەنـگی ئوحـود سـەنگی مەحەك بوو ، پاكو پیسو ڕاسـتو ناڕاستی لێك جـیاکردەوە .موسـڵمانەکان تـالەمەککەدا بـوونو لـە سەرەتای ژیانی مەدینەیش دا هەموویان پاكو خاوێن و بێ لەکە بوون هەرکەس موسڵمان ئەبوو بەڕاستی موسڵمان ئەبوو ، پێچ و پـەنای

---

(١) بۆ زیاتر تێ گەیشتن سەیری (في ظلال القران) جزمی چوارەم‌ل ٤٦-١٦٩بکە.

نەبوو ، ئەی ویســـت گیانو ماڵی لە ڕێی خوادا بەخت بکات و خۆی تووشی گیروگرفتی گەورە ئەکردو موسڵمان بوونەکەی بریتی بوو لە فیداکاری ، چونکە دوژمنی ئیســـلام زۆر بـە دەســـەڵات بوون ، ئازاری موسڵمانەکانیان ئەداو ئەیان چەوسالدنەوە ، گیانو ماڵیان لە مەترسیدا بوو ، لە بەر ئەمە زۆریان ئەی ویسـت خەڵکی بە موســـڵمان بوونەکەی نەزانێ . کەواتە لەم دەورە دا بێجگە لـە موسڵمانی ڕاستیو لە سوپای باوەڕی پڕ بەدڵ کەس خۆی بەموسڵمان نەئەدایە قەڵەم .

بەڵام دوای دامەزراندنی دام و دەزگای دەوڵەت لە مەدینەدا ، وە دوای ئەوەی موسڵمانەکان بوون بەهێزێکی ترسێنەر لەناوچەکەدا، وە دوای ئەوەی جەنگی بەدری گەورە کراو ئەو هەموو مـــاڵ و تاڵانەو ئەو سەرکەوتنە گەورەیە بوو بە دەسکەوتی ئیسلامو موسڵمانان، ئـا لێرەدا ئاڵ و گۆڕێکی گەورە ڕووی دا ، زۆر لـــە کافرو بێ باوەڕەکان ـ بەناچاری ـ ئیسلام بوونێکی سەرزارییان نیشاندا ، بەڵام لەقووڵایی دڵیانا هەر کافرو بت پەرستو بێ باوەڕ بوون ئەوە بوو لە دوایی دا قورئان ئەم نهێنییەی دەرخست و ئەوانەی بە دوو ڕوو ( منافق ) ناوبرد .

ئەمەیش سـروشتییە بۆ هەموو بانگ و بیر و باوەڕێك هەر کە ســـەرکەوتن و تەماعێك ، یان بیم و مەترسییەکی تیا بەدی کرا ، مەردم کۆمەڵ کۆمەڵ بەڕاسـت و بەدرۆ لە دەوری خـڕ دەبنەوە و تێی دەهروژێن و ڕاست و ناڕاستیان تێکەڵ دەبن ، بەڵام هەر کە شـــەقامی لێهاتـەوە یەك و مەترسییەك ڕووی دا ناڕاســـت خـۆیان دەکێشنەوە و تەنـیـا خاوێنەکانی لە دەور دەمێننەوە ، ئەمە شـــتێکی ئاشکرایە و لە هەموانەوە دیارە .

خۆ ئایینی ئیسلام خاوێنەو خاوێنی ئەوێت ، هەل پەرستو ناڕاستی ناوێ ، لە بەر ئەمە خوای گەورەو ئاگادار ـ کە هەر خۆی خاوەنی ئیسلامە ـ ویستی ئەم جەنگەی ئوحود بکات بەسەنگی مەحەك و موسڵمانانی پێ پاك بکاتەوە لە هەموو دووڕووو ناڕاستو پۆخڵێك، وە بە وێنەی ئاڵتونی تێزاب بیان ڕازێنێتەوەو لە بژار پاکیان بکاتەوە .

ئەوە بوو پێش دەست پێ کردنی جەنگ ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبي ) بە کۆمەڵێکی سێ سەد کەسیەوە گەڕایەوەو لە ڕیزی موسڵمان دەرچوون ، لە کاتێکا کە ناسکترین کات بوو ، وە لای وابوو بەگەڕانەوەی ئەوان دەوری پێغەمبەر چۆڵ ئەبێت و ئیسلام ژێر ئەکەوێ و لە ناو ئەچێت ، ئەمەیش پیسترین سیفەت و ڕەوشتی دوو ڕووەکانە لە هەموو کات و دەورێکدا ، کەچی بە فەرمانی خوا ئەمەیان بۆ بوو بەمایەی سەر شۆڕیو لەناو مەردمدا پێی دەرکەوتن لە پێش هاتنی نیگای ئاسمانی دا ، قورئان لێرە دا ئەفەرمووێ :

( ما كان الله ليذر المؤمنين على ما أنتم عليه حتى يميز الخبيث من الطيب ، وما كان الله ليطلعكم على الغيب ، ولكن الله يجتبى من رسله من يشاء ، فآمنوا بالله ورسله ، وإن تؤمنوا وتتقوا فلكم أجر عظيم ) آل عمران / .

یانی : لەگەڵ ئیشە ڕێك و پێکەکانی خوا دا ناگونجێ بەو پێیە بە شڵەو بڵەو بۆرو زۆری بهێڵێتەوەو پاك و پیس و ڕاست و درۆزنیان لێ جیا نەکاتەوە ، تا دوو ڕووەکان هەر بەو شێوە لە ژێر ئەو داوا درۆینەدا خۆیان بشارنەوە لە ناویاندا ، خۆ خوا ئەیەوێ موسڵمانان لە زەوی دا دەورێکی گەورەو دیاری بگێڕن ، بەرنامەی خوا بەسەر زەویدا بڵاو بکەنەوەو ، بیگەیەنن بەمەردم ،

وه ژیان له سەر دەستوور یاسای ئیسلام دابمەزرێنن‌و شارستانیەکی تەواووکارامه بێنه دی . بێ‌گومان کاری واگرنگ پیاوی بلیمەت‌و ڕێك و پێك و خاوێن و ڕاست و بێ گەردی ئەوێت ، ئەبێ بە تەواوی پاك و پیس لێك جیا بکرێتەوە ، وه لەگەڵ پیشەی خودا ڕێك ناکەوێت که شته نهێنی‌یەکانتان بۆ دیاری بکات و خۆتان ڕاست و ناڕاست بناسن ، چونکه زانینی نهێنی‌یەکان هەر بۆ خوا باشەو ئادەمی بەرگەیان ناگرێت ، وه خوا له ناو پێغەمبەرەکانیا ئەوی مەیلی بێت هەڵی ئەبژێرێت‌و له ڕێگای ئەوانەوە چاك‌و خراپ دەناسن ئێوه باوەڕی پتەو بێنن به خوا و به پێغەمبەرەکانی ، وه ئەگەر باوەڕی ڕاستتان بێت و خۆتان له خراپەو گوناهەکان بپارێزن پاداشتی گەورەو دیارتان دەسگیر ئەبێت .

٢ ـ ئەو بێزاننەوەو گێژ و تەتەڵە کردنه هەر وەك پاك و پیس لێك جیا ئەکاتەوە ، دیسان مرۆڤ و کار به دەست له ئەندازەو توانای خۆی حاڵی دەکات و خۆیی و لێ هاتنی ئەزانێ ، وه ئەمەیش شتێکی پێویست‌و بنچینەیی‌یه بۆ هەر کەس‌و کۆمەڵێك بیەوێ هەڵسێ بەکارێکی گرنگ ، دیـانەوە ئەگەر لەم کاتانەدا ئەندامە ڕاستەکانی کۆمەڵ هۆشیار نەبن لەوانەیە لەکاتی ڕوودانی مەترسی‌یەکەدا ـ که ئەبێتە سەنگی مەحەکی کۆمەڵ ـ ئەزمیان شل بێ و هێزیان سست بێ و دایان بنێته سەر زەوی .

ئەوە بوو لەکاتی گەڕانەوەی دوو ڕووەکاندا خەریك بوو شڵ‌و شێواوی ڕوو بکاته مرسڵمانەکان ، خۆ ئەگەر یارمەتی خوا نەبوایە، دوو کۆمەڵ : بەرەی ( حارثه ) و بەرەی ( سلمه ) سەریان لێ تێك دەچوو و دەگەڕانەوە .

قورئـان لێرەیشـــا دەفەرموێـت : ( وإذ غدوت تبوىء المؤمنين مقاعد للقتال والله سميع عليم ، إذ همت طائفتان منكم أن تفشلا والله وليهما وعلى الله فليتوكل المؤمنون ) آل عمران / .

جا لەبەر ئەمە پێویستە لەســەر هەموو ئەندامێکی کۆمەڵ کـە هەمیشە وریا و ئاگادار بێ ، وە ئەگەر بیرو باوەڕەکەی خۆی بـە ڕاست بزانێ نابێ هیچ ڕوودا و هیچ کەسێك تینی تێ بکاو مێشکی تێك بدا و سستی بکـا و باوەڕەکەی لەق و لۆق بکا .

وە پێویستی سەرۆكو پێشەوایە کە هەمیشە ئاگای لەژێر دەستەو کۆمەڵەکەی بێت و سـەرپەرشتییان بکات و لێیان بێ ئاگا نەبێ ، نەوەك شتێکی ناڕەوا ، یان پیاوی بەد نیهاد تینیان تێبکات .

٣ ـ مرۆڤ هەر چەنـدە ئازا و بەجەرگ و بلیمەت و هۆشـــیاربێ هەر چەنـدە ئاگادار و شارەزای بەرنامە و بیرو باوەڕەکەی بێت ، دوور نیە لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا ، یا بـەبیستنی دەنگ و باسی ناخۆش ، بە تایبەتی بە بیستنی لە ناو چوونی پێشەواکەی ، دوور نیە لەم کاتانەدا مێشکی تێك بچێت و ئەزمی شل بێت و لە ئیش و کار بکەوێت و دەست بدتە بەر ئەژنۆی .

ئەوەبوو گەلێك لە یارە ناوازەکانی پێغەمبەر لەکاتی دەنگی (محمد کوژرا ) چوو بە گوێیانا ، تێك چوون و لێی دانیشتن و دەستیان دایە بەر ئەژنۆ ، کە ( أنس ) ی کوڕی ( نضـــر ) ی یاریدەدەر دای بە لایانا سەر زەنشتی کردنو وتی : بڕۆن بمرن لەسەر ئەوەی ( محمد ) ی لە سەر مرد .

وە ئەگەر خۆگرتنی پێغەمبـەر و هۆشیاری و ئاگاداری زۆربەی یارەکانی نەبوایە ، موسڵمانەکان بەو هەڵەیە ژێر ئەکەوتن و لە نـاو

ئەچوون و ڕۆشنایی ئیسلام ئەکوژایەوە قورئان بۆ ئەمە ئاگادارمان ئەکات و ئامۆژگاری جوانمان دەکات و تێمان دەگەیەنێ : کە کوشتن و مردنی پێشەواو فەرمانده نابێتە هۆ بۆ لەناو چوونی بانگ و بیرو باوەڕەکە ، مادەم بەرنامەو دەستوور و بیرو باوەڕ زیندووە و لەبەر دەستایە ، ئیتر بانگ کەرو پێشەوا لەناویش بچێت تین ناکاتە سەری ، ئەبێ مەردمەکان دەوری چۆڵ نەکەن و دەستی لێ بەرنەدەن و لێی پەشیمان نەبنەوە : ( وما محمد إلاّ رسول قد خلت من قبله الرسل أفان مات أو قتل انقلبتم على أعقابكم ؟ ومن ينقلب على عقبيه فلن يضر الله شيئا وسيجزى الله الشاكرين ، وما كان لنفس أن تموت إلا باذن الله كتاباً مؤجلاً ، ومن يرد ثواب الدنيا نؤته منها ومن يرد ثواب الآخرة نؤته منها وسنجزى الشاكرين ) آل عمران / .

٤ ـ ئادەمی لە دوو کاتا تاقی ئەکرێتەوە : یەکەم لەکاتی سەختی و سەغڵەتی دا ، دووەم لە کاتی سەرکەوتن و زاڵ بوون و تەماعدا .

زۆر کەس لە کاتی سەغڵەتیدا دەتوانێ ددان بەخۆدا بگرێ و لە تاقی کردنەوە دەرچێت ، بەڵام لە کاتی خۆشی و لە دەمی پەیدا بوونی تەماع و دەستکەوتدا زۆر کەس مەست ئەبێ و بەر چاوی ئەگیرێ و لێکدانەوەی نامێنێ .

کاتێك موسڵمانەکان لە دەمی بەیانی دا کافرەکانیان شکاند و لەشکرگایان پێ بەجێ هێڵان ، ئەم سەرکەوتنە مەستی کردن و لەخۆ بایی بوون و کەوتنە ئەو باوەڕە کە تازە ئیتر کافرو بێ باوەڕەکان ناتوانن ڕووی چەکیان تێ بکەن ، بۆیە ئاگایان لە دوژمن نەماو تیر ئەندازەکان کەژەکەیان بەجێ هێشت و پشتی لەشکریان چۆڵ کرد، بەم پێیە دوژمن هەلی بۆ هەڵکەوت و لێیان کۆبوونەوە و زیان و

ئازاری زۆریان پێ گەیاندن و شپرزەیان کردن .

قورئانی پیرۆز ئەم مانایەی بە باقەیەك لە ئایەتەکانی هێناوە ، ئامۆژگاری و ڕەخنەی تێکەڵاو کردووە ، وەسوچی ڕوو داوەکەی کردۆتە مل خۆیان ، بۆ ئەوەی موسڵمانان هەمیشە سوودی لێ وەربگرن و ئەمە لە بەر چاوی خۆیان دابنێن و جارێکی تر نەکەونە هەڵەوە .

٥ ـ ئەم جەنگەی ئوحود یاسایەکی بنچینەیی و بیرو باوەڕێکی گەورەی ئیسلامیمان ئەخاتە بەردەست ، بەڕۆشنی تێمان ئەگەیەنێ ، یاسایەکی ئەوتۆ کە زۆر لە موسڵمانان نایزانن ، یان لە بیرخۆیانی ئەبەنەوە ، وە بەو بۆنەیەوە تووشی هەڵەی گەورە دێن ، ئەو یاسایەش ئەمەیە :

ئاینی ئیسلام بەرنامەی ژیانی ئادەمی‌یە لە هەردوو جیهانا ، وە ئەم بەرنامەیە بە ئەندازەی تێ کۆشان و خەبات کردنی موسڵمانان لە ڕێیا ڕاست دەبێتەوە و سەر بەرز دەکاتەوە ، وە بەرز بوونەوەو نزم بوونەوەو داگیرساندنو کوژاندنەوەی تەنیا بەگوێرەی هەوڵدانو دانیشتن و ڕاستی و ناڕاستی شوێن کەوتووەکانێتی و بەس ، وە هەر ئەوان بەر پرسیار و لێپرسراون لە دادگای خواو لە لای مێژوو و ئادەمیزاد .

ئەمە حەقیقەتێکە و پڕ بە پڕی سروشتی ئیسلامە ، ئەگەر چی زۆر کەس خۆ لەم ڕاستی‌یە لائەدەن و ئەیانەوێ بەشێوەیەکی تر لە ئیسلام ورد بنەوە ، بۆیە لەوانەن لەم ڕووەوە چەند پرسیارێك ئاڕاستەی ئیسلام و بانگ کەرانی بکەن :

ئایا ئیسلام ئایینی خوانیەو لای خواوە نەهاتووە ؟ ئایا خوا بە

تواناو دەسەڵاتی بێ سنوور نیە ؟ ئەی بۆچی ئایینەکەی خۆی سەر ناخات ؟ یان چۆن ، وە بۆچی ئەبێ بەپێی تێکۆشانی موسڵمانان سەرکەوێت ؟ خۆ ئیسلام ئایینێکی ڕاستە ، ئەی بۆچی هەمیشە سەر ناکەوێو شوێن کەوتووەکانی سەرناکەون ؟ وە بۆچی بانگی کوفرو بێ ئایینی سەر ئەکەوێ و ئەم سەرناکەوێت ؟ ... و ... هتد .

لە ڕاستی دا ئەم پرسیارانەو ئەو باوەڕەی ئەم پرسیارانەی لێوە هەڵقوڵیوە هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆ : تێنەگەیشتن لە سروشتی ئیسلام ، یا خو لێ گێل کردنی .

بەڵێ ئیسلام ئاینێکەو خوا هەڵیبژاردووە کە دوایین ئایینی سەر زەوی بێت ، وەببێتە بەرنامەی هەتا هەتایی ئادەمیزادەکان ، بەڕەنگێ کە قەدەغەیە لە هەموو ئادەمی بێجگە لە ئیسلام شوێنی بەرنامەیەکی تر بکەون ، یا هەر ئایینێکی تر بۆ خۆیان هەڵبژێرن ، وە لەو لایەشەوە زانین و خواهیش و دەسەڵاتی خوای گەورە سنووریان نیەو لە برانەوە نایەن وە خوای گەورە ـ بەپێی حیکمەتی خۆی ـ ئادەمیزادی وەها درووست کردووە کەبتوانن چاکەو خراپە بکەن و هەردوولایان لێ دێت ، وە ئایین و بەرنامەی بەشێوەیەك ناردووە کە لە سنووری ئیش و کارو ڕاستێنی ئادەمیزاد دا ئیش بکات و گەشە بکات ، وە بە پێی لێهاتن و خەریك بوون و پەیڕەوی کردنیان بۆ بنکە و یاساکانی ئایینەکە و لە سەر ڕۆینیان سەر بەرز ئەکاتەوەو شکۆفە لێ ئەدات و پەل و پۆ ئەهاوێژێ .

ئەمە حەقیقەت و ڕاستیەکەو ، ئەبێ موسڵمانان بە جوانی لێی تێ بگەن ، وە بزانن کە ئیسلام بە معجزە سەرناکەێو بڵاو نابێتەوە، وە چاو قونچان و مل بادان و تەزبیح و هۆنراوە و وتار و گۆشە

گیری و ... و ... و هتد تەنیا ئەمانە ئیسلام سەرناخات و ڕاستی ناکاتەوە !! بەڵێ ڕاستە هەموو شتێ هەر بە دەست خوایە ، بەڵام ئەمەیش یاسای خوایە لە سەر زەوی‌دا ( ولن تجد لسنة الله تبديلاً ) ، خوای گەورە پێویستی کردووە لە سەرمان کە هەڵسین و خۆ بڕەنجێنین ، بەبێ وچانو وەڕس بوون هەوڵ بدەین بۆ لابردنی هەموو بەش و پارچەکانی نەفامی ، بۆ خستنە ئیشی هەموو یاساو بەندەکانی ئیسلام ، وەلێمان قبوڵ ناکات بەبێ خەبات و تێکۆشان دانیشین و سستی بمان گرێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە تەمای ئەوە بین فریشتە لە ئاسمانەوە بێن کوفر لەناو ببەن ، کافرو بێ ئایینمان بۆ بڕوخێنن ، وەکلیلی زەوی بدەنە دەستمان ، نەء شتی وا نابێ ، پێچەوانەی سروشتی ئیسلامەو پێچەوانەی یاوی خوایە لە زەوی دا .

بۆیە خوای گەورە ویستی موسڵمانان لەم یاسایە تێ بگەن و ئەم ڕاستی‌یەیان بۆ ڕوون بکاتەوە لە جەنگی ئوحود دا ... سەیریکە لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو موسڵمانی ڕاستە قینە بوون و پێغەمبەری پێشەوایش هاوبەشیان بوو ، چونکە لەم جەنگەدا دوو جار لە یاسای ئیسلام دەرچوون ، یان دووشتی پێچەوانەی سروشتی ئیسلام و یاسای ئیسلامیان کرد - با بە خیانەتیش نەبووبێت - ئەنجامەکەی ژێرکەوتن و شپرزە بوون بوو ، وە زیانی گەورەیان لێ کەوت ... یەکەم بە پێچەوانەی ڕای پێغەمبەر و پیاوە گەورە دنیا دیدەکان شاریان بەجێ‌هێشت و ڕوو بەڕووی دوژمن ڕۆیین ، وە بە پێی یاسای ڕاوێژ ( شوری ) - هەرچەندە پێغەمبەر بەڕاستی نەزانی - چونکە بەشی زۆری ڕایان لە سەر ئەمە بوو ، چووە سەر ڕاکەیان و هاتنە دەرەوە و لە ئوحود دا جەنگیان کرد .

دووەم ئەوە بوو تیر ئەندازەکان فەرمانی پێغەمبەریان شکاند و

کەژەکەیان چۆڵ کرد ، دوژمن کە ئەمەیان زانی هاتنە سەر تەپەکەو دەوری موسڵمانانیان دا .

بەهۆی ئەم دوو هەڵەیەوە توشیاری ئەوشکاندنو زیانە گەورەیە بوون ، قورئانی گەورەیش لێرەدا ئەفـەرموێ : ( أو لما أصابتكم مصيبة قد أصبتم مثليها قلتم : أنى هذا ؟ قل هو من عند أنفسكم ان الله على كل شيء قدير ) آل‌عمران / .

یانی کاتێ تووشـــی قۆرت و زیان هاتن ـ کە پێش ئەوە دوو چەندانی ئەوە دەســتکەوتتان بوو بوو ، چ لـە بەدرا ، وە چ لـە بەرەبەیانی ئوحود دا ـ ئەڵێن : ئەوە لە چی‌یەوە بوو تووشی ئەم زیانە گەورەیە هاتین ؟ ( خۆ ئێمە موســڵمانین و بۆ ڕەزای خواو بــۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی ئەو ئەجەنگین و گیانبازی ئەکەین ، لەگەڵ ئەو دوژمنانەی ڕێگای بڵاوبوونەوەی ئەبەستن !! ) تۆیش پێ‌یان بڵێ :

ئەمە لـە لایەن خۆتانەوە بوو ، دەرچونتان لە یاســاو ، گوێ نەدانتان بەفەرمانی خواو پێغەمبەر ئاوای لێ‌کردنو خوایش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

موسڵمانە پێشینەکان بەجوانی لەمە تێ‌گەیشتنو چەقی بووە دڵیانو ئەیان زانی ئەمە سروشتی ئایینو یاسای خوایە لە زەوی‌دا هەتا هەتایە، بۆیە هەمیشە بە ئەندازەی تێکۆشانو پەیڕەوی‌یان بۆ یاساکانی ئیسلام بە تەمای سەرکەوتن ئەبوون ، بۆ نموونە :

عمری کوڕی خطاب کاتێ ســـوپای بـەڕێ ئەکرد ئامۆژگاری سەرۆکو فەرماندەکانی ئەکردو ئەی‌فەرموو : ( فەرمانت پیا ئەدەم بە خۆت و هاوەڵە سەربازەکانت بە « تەقوی » و لە خوا ترسان و خوا پەرستی ڕاسنەقینە لە هەموو کاتو حەڵەتێکا ، چونکە لە خوا

ترســان و خوا پەرستی گەورەترین چەك و باشترین هۆیە بۆ زاڵ بوون و سەركەوتنتان بەسەر دوژمنـا ، داواتان لێ ئەكەم كە زیاتر لە دوژمنتان ئاگاداری خۆتان بكەن ، چونكە گوناهی سوپا سامناكترە بۆیان لە دوژمنیان ، وە لە خــوا یاخی بوونی دوژمن ئەبێتە هۆی سەركەوتنی موسڵمانان بەسەریانا ، ئەگینا خۆ ئێمە نە لە هێزو نە لە چەك و نە لە ژمارە دا ناگەین بەوان ، ئەگەر ئێمەیش بكەوینە گوناه كردن ئیتر چاری ئەوان ناكەین و بەخوا پەرستی نەبێ بە ســەریانا زاڵ نابین ، ئەوەیش بزانین كە لەم ڕۆیشــتنەنانا فریشتەی خواتان لەگەڵەو ئاگاداری كردەوەكانتانن ، دە ئێوەش شەرم بتان گرێ‌و خۆ مەخەنە نـاو گوناهەوە ، ئێوە لە ڕێگای خوادان .

ئەڵێن : دوژمنەكانمان لە ئێمە خراپترن ، كەواتە هــەر ئێمە ســەر ئەكەوین ، چوونكە زۆر جار كە كۆمەڵ كەوتە خراپكاری لە خۆیان خراپتر بەسەریانا زاڵ ئەبێت ، ئەوە بوو بەنی ئیســرائیلی كاتێ لە ڕاستی لایان داو تێكەڵاوی گوناهو خراپە بوون ، خــوا ئاگر پەرستەكانی ســەرخـست بەسەریانا . وە لە خوا بپاڕێنەوە كە سەرتان خات بەسەر دەروونی خۆتانا هەر چۆن كە داوای لێ ئەكەن سەرتان خات بە سەر دووژمنا (١) .

أبو داود و ترمزی و نسائی ڕیوایەتیان كردووە لە ( أبوعمران ) خوا لێی ڕازی بێ ئەڵێ : ( لەكاتی هەرای « قسطنطنیة » دا پیاوێكی كۆچەری پەلاماری سوپای دوژمنی داو لەتی كرد ، خەڵكەكە وتیان بە دەستی خۆی خۆی خستە مەترسیەوە ) . أبو أیوبی یاریدەدەر وتی:

ئێمە باشتر لەو ئایەتە تێ‌ئەگەین ، چونكە ئـەو ئایەتە لە ئێمە دا هاتە خوارەوە .. ئێمەی یاریدەدەری مەدینەیی هاوڕێ‌یەتی پێغەمبەری

---

(١) إتمام الوفاء فی سیدة الخلفاء ل ٧٣-٧٥

خوامان کرد ، له هەموو جەنگ و هەراکانا له گەڵیا بووین ، کاتێ ئیسلام سەرکەوت و بڵاو بووه و دەرکەوت ، ئێمەی یاریدەدەر کۆبووینەوه ، وتمان :

خوا ڕێزی لێ گرتین به هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەیو زاڵ بوون ، تائیسلام بڵاو بووەو سەرکەوت و خەڵکی له دەوری کۆبوونەوه ، وه ئێمه تا ئێستا لەبەر ئیسلامو پێغەمبەر لایەنیماڵو منداڵو خێزانمان بەرداوه ، ئێستا وا جەنگ نەماو ئاسایش پەیدابوو ، با بچینەوه بۆ دەوری منداڵ و خێزانو هەندێ لایان بحەوێینەوه ، لەم کاتەدا ئەم ئایەتەمان بۆ هاته خوارەوه : (وأنفقوا في سبيل الله ولاتلقوا بأيديكم الى التهلكه وأحسنوا إن الله يحب المحسنين) البقر / .

کەواته خۆ له ناوبردن و خۆخستنه مەترسی له دانیشتنایه له ناو ماڵ و منداڵا و له وازهێنانابه له جیهاد و تێکۆشان ) (١) .

یان ئەگێڕنەوه : له جەنگێکدا لەگەڵ فارسەکان ، موسڵمانەکان هەرچی‌یان ئەکرد سەر نەئەکەوتن ، وه سەریان سوڕمابوو بۆچی وایه ؟ تا پیاوه گەورەکانیان کۆبوونەوەیەکیان کرد بۆ دۆزینەوەی هۆی ئەم سەرنەکەوتنەیان ، وتیان : ئەبێ ئێمه له ڕەوشت و ڕێگای پێغەمبەر لامان دابێ بۆیه وا سەرناکەوین دوایی یەکێکیان وتی :

من ئەزانم ئەو لادانەمان چی‌یه ؟ ئێمه وازمان له سیواك کردن هێناوه و سیواکیش سونەتێکی گەورەی پێغەمبەره .

ئینجا فەرمانیان دەرکرد بۆ سوپا : که هەر یەکەتان چڵەدارێ بکرن و سیواکی پێ بکەن .

سوپا به یەکجار پەلاماری دارو دەوەنیان دا و کەوتنه بڕین و

---

(١) حياة الصحابه ج ١ ل ٤٨٢

کوتاندن وبردن به دەما ، لەم کاتەدا سـیخوڕ و جاسوسی دوژمن هاتە ناویان ، ئەمەی بینی ، بە پەلە گەڕایەوە ناو لەشکرو وتی :

قوڕتان بەسـەر ڕاکەن ، هەڵێن ، وا لـەوێ دار و دەوەنیان نەهێشـت ، هەموویان دەرهێنا و خواردیان ، وا دیارە ئازوخەیان نەماوە ، ئێستا بێنە وێزەتان هەر ئەتان خۆن . لەشکر دەرباز بوو ولاتی بەجێ هێشت و ئەمە بوو بە هۆی سەرکەوتنیان .

جا با ئێمەیش بیر لەم حەقیقـەتـە بکەینەوە و هەر کەسـەمان پەشـیمان ببینەوە و لە بەینی خۆمان و خوادا تۆبە بکەین ، وە بـۆ ڕاست کردنەوەی ئاڵای ئیسلام هەوڵێك بدەین ، بە ڕێگا ڕاستەکەی پێغەمبەری خوادا بڕۆین ـ بەهەزاران دروودی لەسەر بێت ـ .

٦ ـ لەم جەنگەی ئوحود دا شێوەی دڵسۆزی و پێشەوایەتی پێغەمبەر ـ درودی لە سەربێ ـ دەرئەکەوێت، کە ئەبێ سەرۆك و پێشەوایان بیکەنە پیشەی خۆیان و سەر مەشقی بۆ ژیانی خۆیانێ وەربگرن .. لەباسەکەدا زانیمان کە سوپاکە لەم جەنگەدا گەلێ بێ گوێی و لادانیان کرد :

لەسەرەتاوە ڕای پێغەمبەریان پەسەند نەکرد و لەشار دەرچون ، لە ڕێگادا سێ سەد کەسیان گەڕایەوەو پێغەمبەریان بەجێ هێشـت ، لە جەنگەکەدا تیر ئەندازەکان سەر کەژەکەیان چۆڵ کرد و هاتنـە خوارەوە ، جەنگاوەرەکان لەکاتی شـکاندنی سـوپای دوژمندا بە کۆکردنەوەی تاڵانەوە خەریك بوون و هۆشیان لای دوژمن نەما ، وە کاتێ دەنـگی کوژرانی پێغەمبەر بـڵاو بووەوە زۆریـان سست بوون و پەکیان کەوت و دەستیان دایە بەر ئەژنۆ .. هتد .

لەگەڵ ئەمانەدا ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ، ئەو پێشەوا ڕاستەقینە ، ئەو فەرماندە ناوازەیە ـ بە هەزاران درودی لە سەربێ ـ خوا نەکات

تووڕە بوونێك ، یا ناڕەزاییەك ، یا ڕوو گرژییەكی بەكار هێنابێ ، بەڵكو هەتا پێی ئەچوو زیاتر سۆزو خۆشەویستی و دڵسۆزی دەرئەبڕی ، بە وتەی شیرین و بە بەڵێنی ڕاستی خوایی دڵخۆشی دەدانەوە و ماندوویەتی لە لەش و گیان دەردەكردن و زانی ئەنایە بەریان . لێرەدا قورئان هات و پتر لەسەر ئەو خووانەی دای دەمەزراند و ڕامی ئەهێنا : ( فبما رحمة من الله لنت لهم ، ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك ، فاعف عنهم واستغفر لهم وشاورهم في الأمر ، فإذا عزمت فتوكل على الله إن الله يحب المحسنين ) آل عمران / .

یانی : بەهۆی سۆزو بەزەیی خوا بۆتان ، تۆ دڵت نەرمە لەگەڵیان ( هەر چەندە بە پچەوانەت بجوولێنەوە ، یا زۆر زیانیشت پێبگات لێیان زیزو زویر نابیت ) ، وە ئەگەر تۆ توندو دڵڕەق بوویتایە لە گەڵیان ئەوان لێت دور دەكەونەوە و پەرەوازە دەبوون ، تۆ لێیان ببورە و داوای لێبووردنیان بۆ بكەو لە ئیش و كارەكانا ڕاوێژیان پێ بكە ، كاتێ لە ڕاوێژدا ڕایەكتان هەڵبژارد ئیتر بەبێ دوو دڵی تیا كردن لە سەری برۆ و پشت بە خوا ببەستە ، خوایش خۆشی دێت لەوانەی پشتی پێ دەبەستن .

٧ ـ ئالێرەدا شتێكی سەرنج ڕاكێش دێتە پێشەوە و سنگ دەر دەپەڕێنێ .. ئەویش ئەوەیە : كە لە ئەنجامی ڕاوێژەوە تووشی ئەو زیانە گەورەیە هاتن ، ئایەتەكە داوایان لێ ئەكات كە هەر بەردەوام بن لەسەر ڕاوێژ ، چونكە ڕاوێژ یاسایەكی ئیسلامەو بەهیچ نرخێك ناگۆڕرێ و لانابرێت ، وە موسڵمانان بە هیچ كلۆجێ ناتوانن هیچ كام لە یاساكانی ئیسلام لابەن ، یان بیگۆڕن ، یان گوێی نەدەنێ ،

وه له لایه‌کی تره‌وه پیشـــانمان ئه‌دات که ئیســـلام هه‌ر به‌وه وار ناهێنێ که ( نظریات ) دا بنێ و بـه‌س ، به‌ڵکو له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شـــدا هه‌وڵ ئه‌دات بۆ دامه‌زراندن و ئه‌ودی هێنانی و موسـڵمانانی له‌سـه‌ر ڕام دێنێ ، ئه‌وه‌تا یاسای ڕاوێژیان له سه‌ره‌تاوه به‌کار هێنا ، پێغه‌مبه‌ر ئه‌ی توانی له‌سه‌ر ڕای خۆی له مه‌دینه‌دا بمایه‌ته‌وه و گوێی به‌که‌س نه‌دایه ، ڕه‌نگه بـــه‌م کاره له‌و زیانانه‌یش دوور بکه‌وتنایه‌وه ، به تایبه‌تی خه‌ویشی دیبوو ، ده‌ی زانی خه‌وه‌که‌ی وا ده‌گه‌یه‌نێ به‌چوونه ده‌ره‌وه‌یان تووشی قورتی گه‌وره دێن ، به‌ڵام ئه‌وه بوو به‌پێی یاسای ڕاوێژ جووڵانه‌وه و تروشی ئه‌و نوشوستی‌یانه هاتن ، که‌چی ئه‌وه‌ته قورئان داوایان لێ ئه‌کات که بـه هۆی ئه‌و زیانه‌وه واز له ڕاوێژ نه‌هێنن و هه‌ر له‌سه‌ری بڕۆن ، خۆ ڕاوێژ یاســـای ئیســلامه‌و ئه‌بێ ئیشی پێ بکرێت .

٨ ـ ڕووداوه‌کانی ئـــه‌م جه‌نگه‌و لێدوانـــدنی قورئان ڕاستی‌یه‌کی گه‌وره‌ی ترمان بۆ ده‌رئه‌خات : که نابێ له ئیسلامدا سه‌یری مرۆڤ بکه‌ین ، یان مرۆڤ بکه‌ین به به‌ڵگه له‌سه‌ر ڕاستی یان ناڕاستی بیرو باوه‌ڕه‌که‌ی ، که به به‌رزی ئه‌م به‌رزی ئه‌و و به‌نزمی ئه‌م نزمی ئه‌و ئه‌و بڕیار بده‌ین ، ئه‌بێ ئه‌وه بزانین که ئیسـلام بریتی‌یه له ئاینن و به‌رنامه‌یه‌کی خوایی ڕێك و پێك و ڕاست ، پڕه له یاساو ده‌ستوور و نه‌ریتی ناوازه و پڕسـوود بۆ ژیانی ئاده‌میزاد ، لـه هه‌ر کاتێکا وه له هه‌ر کوێیه‌کا بژین ، وه ده‌ســـتور و یاســـا و ڕژێمی ئیسـلام دامه‌زراوو نه‌گۆڕه‌و پێویستی به ده‌ستکاری مه‌ردم نیه ، وه مێژووی ئیسلام شـتێکه‌و مێژووی موسـڵمانان شتێکی تره ، خراپی و لادانی خه‌ڵکی له ئیسلام زیان به ئیسلام ناگه‌یه‌نێ ، هه‌ر وه‌کو زۆرده‌سته‌یی و

نەفامی و کۆبلەیی موسڵمانان نابێتە بەڵگە لەســەر ئیسلام و لە پلەو پایەی کەم ناکاتەوە ، ئیســلام هەر ئیسلامەو خەڵکی موســڵمانی ڕاستە قینە نین وەکو ( رصافی ) دەڵێ :

فإن كان ذنب المســلم اليوم جهله

فماذا على الاسلام من جهل مسلم ؟ !

# بەشی چوارەم

## زەیدو زەینەب

دەوری خەرافەو پرو پوچ :-

شاراوە نیە لە زانایان ، کاتێك کە ئیسلام هات یەکێك لە ئیشە گرنگەکانی ئەوە بوو کە بچێت بەگژی خەرافەتو شتی پروپوچداو قەلاچۆی بکات ، وە هەموو ئیش و کارەکانی سەر زەوی و بوونەوەر بگێڕێتەوە بۆ لای یاساو دەستووری خوایی ، ترازووی ئاسمانیان بۆ دابنێت ، وە لە مەدا بەباشی سەرکەوت ، ئەوەتا ئیسلام بە چاوی زانیاری سەیری هەموو شت دەکات و لێکی دەداتەوە ، وە هەموو ئیش و کاری گێڕاوەتەوە بۆ لای ئەو یاسا نەگۆڕەی کە خوا بۆ گێتی داناوەو بە موو کەم و زیادی تێدانیە، وە داوا لە مرۆڤ ئەکا کە تێبینی بکەن و بە وردی سەرنج بدەنە پەڕاوی گەورەی بوونەوەر ، ئایەتەکانی قورئان لەم ڕووەوە داخوازی زۆریان کردووە ، کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر مرد بە ڕێکەوت ڕۆژ گیرا ، هەندێ لە موسڵمانە ساویلکەکان وتیان : لەبەر ئیبراهیم ڕۆژ گیرا ، بەڵام پێغەمبەر - دروودی خوای لە سەربێت - نەی ویست ئەم هەلە لە دەست بدات ، چووە سەر دوانگە ( منبر )و وانەیەکی گرنگی زانیاری دا بە جیهان و فەرمووی . ( مانگ‌و ڕۆژ دوو نیشانەو دەستکردی خوای گەورەن ، بەگوێرەی پرۆگرامێکی تایبەتی دێن و دەڕۆن ، بۆ مردن‌و ژیانی کەس ناگیرێن ) .

بەم پێیە ئیسلام هات و دامەزرا و چووە ناو دڵ و دەروونە بێ گەردو کراوەکانەوە ، تۆوی خەرافەو پڕ و پوچی لە ناو

موسڵمانەکانا نەهێشت و لە ناوی برد ، وە بە ڕووناکی زانیاری و هەق بینی سەر زەوی پاك کردەوە ، وە ئێستایش هەر بەم بۆنەیەوە ئەبینین و ئەبیستین زۆر و زەبەندە زانای گەورە بەهۆی تێبینی لـــە گێتی و لەپرۆگرام و یاسا نەگۆڕەکانی خۆیان بە ناچار ئەزانن کە بێنە ناو دەشتی فراوانی خواناسی یەوە و ئەبینین ئیسلام تاقە ڕێگای ڕاستی و زانیاری و خوا ناسی‌یە ، بۆیە پۆل پۆل دێن و موســڵمان دەبن و بە شانازی‌یەوە ئیسلام بوونی خۆیان دەردەبڕن و بۆ جیهانی بڵاو ئەکەنەوە . (١)

کاتێك ئیسلام کەوتە پەرەسەندن و ڕۆژ بەرەو ڕۆژ پێش‌کەوتن دەڕۆیی و باشـتر جێی خۆی دەکردەوە و قەڵاچۆی بت پەرســتی و خەرافاتی دەکرد ، جوولەکە و گاور و ئاگر پەرستەکان زانیان بـە جەنگ‌و هەراو زۆر و بە درۆ و چاو و ڕاو ناتوانن ڕێگا لە ئیسلام بگرن ، ئیســـلام حەقەو حەقیش ڕۆشـــنە وڕێی لێ ناگیرێت و لـە چارنایەت هاتن کەوتنە دۆزینەوەی پیلان و فڕو فێڵ بۆ پێك هێنانی ئەم مەبەستە پیسە ، هەندێکیان بەدرۆ و ناپاکی بەرگی ئیسـلامەتی‌یان لەبەر کرد ، بۆ ئەوەی ـ نیازی خۆیان ـ ڕووی گەشی ئیســلام پۆخڵ و ناشیرین بکەن ، وە لەم ڕووەوە بتوانن زیانی پێ بگەیەنن‌و لە ناوی بەرن ، لەوساوە تائێستە و لەمەو دوایش هەتا دنیا دنیابێت ئەمە پیشـــەی دوژمنی ئیـلامە و هەمیشــە هەوڵیان بۆ لە ناوبردنی ئیسلامە و بەس ، لەم ساڵانەی دوایی دا کاتێ کۆمەڵی مژدەدەر بە ئایینی عیسا ( جماعه التبشير بدين المسيح ) کۆبوونەوەیەکی ساڵانەیان گرت ، نوێنەری هەموو وڵاتێك هەڵساون ناڕەزایی خۆی پیشان دا کە نەیانتوانیوە بەچکە موسڵمانەکان بکەن بە ( گاور ) .

---

(١) سەرێك لە هەرسێ بەرگەکەی ( رجال‌و نساء اسلموا ) بدە .

له ئەنجامدا قەشە ( زووەیمیر ) کە سەرۆکی کۆبوونەوەکە بوو وتی : ئێوە هەمووتان بەهەڵەدا چوون ، ئێمە زۆر پێشکەوتووین لە ئامانجەکەمانا ، چونکە ئامانجی ئێمە بە گاورکردن نیە ، بەڵکو ئامانجمان لە ئیسلام لادانە ، وە لەمەدا زۆر سەرکەوتووین .

پێغەمبەری ئیسلام زۆر جار لەم ڕووەوە بیری کردۆتەوە و موسڵمانەکانی دەترسان لەوە کە ئاگایان لە پیلانی دوژمن بێت ، شوێن قسە و باس و وتەو واتەی ئەم و ئەو نەکەن ، تەنیا سەیری قورئان بکەن و بە ڕێگای خۆیدا بڕۆن ، لە وتاری ماڵ ئاوایی دا فەرمووی :

( من دووشت لە ناوتانا بەجێ دێڵم ، هەتا لەسەر ئەوانە بڕۆن سەرتان لێ ناشێوێت : قورئانی خواو ڕێگاو ڕەوشتی من ).

( إمامی « أحمد » لە « عبدالله »ی کوڕی « ثابت » ەوە ئەگێڕێتەوە :

« عمری کوڕی خطاب » وتی بە پێغەمبەری خوا : لە یەکێ لە جوولەکەکانی « بنی قریضە »م داوا کرد ، هەندێکی لە تەورات بۆ نووسیمەوە ، ئایا بۆت بخوێنمەوە ؟ لێرەدا پێغەمبەر ڕەنگی گۆڕا و منیش وتم بە عمر : نابینی چۆن ڕەنگی پێغەمبەر گۆڕا ؟ عمر وتی :

ڕازیم بە خوایەتی خواو بە ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرێتی محمد ، ئنجا ڕەنگی هاتەوە سەرخۆ و فەرمووی : سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر موسا بێتە ناوتان ، ئێوە شوێنی ئەو بکەن و واز لەمن بێنن ، گومڕا و سەر لێ شێواو دەبن ، ئێوە بەشی منن لە ناو ئوممەتەکانا و منیش بەشی ئێوەم لە ناو

پێغەمبەرەکانا ) .

( أبو يعلى ) ئەگێڕێتەوە لە ( جابر )ی کوڕی ( عبدالله )وە کە :

( پێغەمبەری خوا فەرمووی : بۆ هیچ شتێك پرسیار لە جوولەکە « أهل الكتاب » مەکەن ، چونکە ئەوان خۆیان گومڕان و ئێـوە شارەزا ناکەنو ناتانبەن بۆ ڕاستی ، دەبێ ئێوە یا ڕاست بەناڕاست ، وە یا ناڕاست بە ڕاست دابنێن ، بشزانن ، بە خوا ئەگەر موسایش زیندو بووایە بێجگە لەشوێن کەوتنی من هیچی تری بۆ دروســت نەدەبوو ) .

لە ڕیوایەتێکی ترا دەڵێت : ( ئەگەر مووساو عیسا زیندو بوونایە ئەبووایە شوێن من بکەوتنایەو بەس ) .

بوخاری ڕیوایەتی کردووە ( کە « إبن عباس » فەرمووی بـە کۆمەڵێك لە موسڵمانان : ئەی کۆمەڵی موسڵمانان چۆن ئێوە پرسیار لە « أهل کتاب » ئەکەن ؟ خۆ کتێبەکەی هات بۆ سەر پێغەمبەرەکەی خۆتان کە « قورئانە » لە هەموو کتێبەکان تازە ترو خاوێنترە ، بێ ئەوەی دەسی تێ خرابێ وا لە بەر دەستـانا ، دەی خوێنەوە ، وە خوا فەرمووبەتی پێنان : « أهل کتاب » کتێبەکانی خۆیان گۆڕیوەو دەستیان لێ داوە ، خۆیان بە دەستی خۆیان دەی نووسن و دەڵێن : ئەمە لای خواوە هاتووە ، بۆ دەستکەوتنی نرخێکی کەم ، ئایا ئەم زانینەتان ناتان گێڕێتەوە لە پرسیار لێ کردنیان ؟ خۆ نەمان دیـوە ئەوان پرسیارتان لێ بکەن لەوەی بۆتان هاتووەتە خوارەوە !!! ) .

وە قورئانیش لە گەلێ ئایەتدا دەمان ترسێنێ لە شوێن کەوتن و بەگوێ کردنی گاورو جوولەکەکانو تێمان دەگەیەنێت کە هەمیشە ئەوان ئەیانەوێت کافرمان بکەنو لە ئیسلام لامان بدەن ، بۆ نموونە

دەفەرموویّت :

( يا أيها الذين آمنوا إن تطيعوا فريقاً من الـذين أتوا الكتاب ، يردوكم بعد إيمانكم كافرين ، وكيف تكفرون وأنتـم تتـلى عليكم آيات الله وفيكم رســوله ، ومن يعتصم بالله فقد هدى الى صراط مستقيم ) آل عمران / .

( ولئن اتبعت أهواءهم بعد الذي جاءك من العلم ما لك من الله من ولي ولانصير ) البقرة / . و ... هتد .

بـەم پێیـە زۆر ئایەتی قورئان داوامان لێ دەکەن کە تەنهـا لە قورئانەوە شت وەرگرین ، هەر تەنها قورئان سەرچاوەی زانیاریمان بێت .

فەرموودەکانی پێغەمبەریش ـ درودی لە سەربێت ـ بەڵێ ، هەر تەفسیر و لێکدانەوەی قورئانن ، وە لە خۆیەوە نەدواوە و دوانـدنی نیگا بووە :

( وما ينطق عن الهوى ، هو إلا وحي يوحى ) النجم / ٣ ، ٤ ، بەڵام دەبێ بە چاوێکی وردبین و پڕ لە سەرنج سەیریان بکەین ، نەك لەبەر ئەوە ـ خوانەخواستە ـ باوەڕمان بە فەرموودە نەبێت ، نەء ، بەڵکو لەبەر ئـەوە کە فەرمـوودە وەك قورئان بەدەســت نەزەدەیی نەماوەتەوە ، دوژمنانی ئیسلام نەیان توانیوە و نایش توانن بـە هیچ کلۆجێك دەســت بخەنە قورئانەوە ، ئاڵو گۆڕ و زیادو کەمی تیا بکەن چونکە خوا بەڵێنی پاراستنی داوە : ( إنا نحن نزلنا الـذكر وإنا له لحافظون ) الحجر / ، بەڵام فەرموودە دەسـتکاری زۆری تێدا کراوە ، گەلێك وتـە دانراوە و ناوی فەرموودەی پێغەمبەریان لێنراوە ، زۆر قسە بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبستراوە ، زۆر و زەبەندە

شـــتی پڕو پووچ و ئیسـرائیلیاتیان هێناوەو ئاخنیویانەتە ناو کتێبە ئاینییەکانەوە ، بەناو کۆمەڵدا بڵاویان کردۆتەوە ، لەسـەر زمانی گەلێك لە خوێنەوارە ئاینییە ســاویلکەکان ، ئەمانەیش لە پێناوی ناشیرین کردنی ڕووی گەشی ئیسلام و تێکدانیدا ، هەتا لە ئەنجامدا زاڵ بین و هەقی کۆنی خۆیان بسێنن .

هەیان بوو ، بە ناو موســـڵمان بوو ، بەڵام لە ژێرەوە پیلانی ڕێك دەخست و کاتی بۆ دیاری دەکرد و دەهات و دەیوت : لە کتێبی ( مقدس ) دا دیومە فلان شت وا دەبێت ، بۆ نموونە :

یەکێك لەوانەی کە ڕێکەوتبوون و بڕیاری کوشتنی عمر کوڕی خطابیان دابوو لەکاتی نوێژی بەیانیدا ، هاتە لای عمر و پێیوت : لە کتێبی ( مقدس ) دا دیومە تـــۆ لـــە کاتی نوێژی بەیانیـــدا ، دەکوژرێیت ، یان ( عبدالله ) ی کوڕی ( سبأ ) بە ناو مووسڵمان بوو ، کەچی لەکاتی جێ نشـــینی ( علی ) دا داوای خوایەتی بـۆ ( علی ) دەکرد .

لـە دەوری ئـەهواز جوولەکەیەکیان گرت و بردیانـە بـەردەمی خەلیفەی ئیســـلام ، لە ســـەر ئەوە کە درۆی بە دەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستبوو ، کە فەرمانی لە داردانی دەرکرا ، وتی : با بمکوژن ، بەخوا تا ئێستە شەش هەزار قسەم بە ناوی ( محمد )ەوە هەڵبەستووە ، هەتا هەتایـە خەڵك بـە فەرموودەیان دادەنێن ، ئەمەیش بـۆ ئەوەی گومان بخەمە ئاینەکەیانەوە .

زۆری تریش لەم بابەتە ڕووی داوە ، بۆیـــە هەر لـە کۆنەوە زانایانی ئیســـلام هەوڵیان داوەو خـۆیان مانـدوو کردووە لـە ڕێی پاراستنی ئیسلامدا لە هەموو لاو هەموو گۆشـــەیەکەوە ، بەتایبەتی کۆمەڵێك لە زانا تێگەیشتوو و دڵســـۆزەکان قۆڵیـان هەڵکردووەو

کەوتنە پاڵفتە کردن و پاك کردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر لە درۆ و هەڵبەستراوەکان ، وە گەلێ ڕێساو یاسایان بۆ ناسینی فەرموودە دانا ، وە لەم ڕووەوە تا ڕادەیەکی گەورە سەرکەوتن و توانییان چەند پەڕاوێکی گەورە لە فەرموودەی پاڵفتە دابنێن ..

لەوانە ( صحیح ) ی بوخاری و ( صحیح ) ی موسلیم و ( سنن ) ی ( أبو داود و ، ترمذی و نسائی و إبن ماجه ) و .. بوخاری ـ یان ئیمامی أحمد ـ بیستی فەرموودەیەك لای پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هەیە ، چوو بۆ لای ، لە ڕێگا زۆر ماندوو بوو و ئازاری چەشت ، بە ڕێکەوت لەو کاتەدا ئەم گەیشتە بەرەوە پیاوەکە وشترەکەی بەربوو بوو ، بۆ خەڵەتاندنی وشترەکەی چاکی عەباکەی گرت بە جۆرێك وەکو خواردنی تیابێت ، وە وشترەکەی بانگ کرد .

بوخاری کەزانی عەباکەی خاڵی‌یە ، فەرموودەکەی لێ وەرنەگرت و پێی وت : تۆ بتوانیت درۆ لەگەڵ بێ زمانێکدا بکەیت ، دەتوانی لەگەڵ ئادەمی‌یەکیشدا درۆ بکەیت ، لەبەر ئەمە جێگای بڕوا و متمانەی من نیت .

وە هەر لەسەر ئەم بناغەیە بوو ـ واتە هەر لەڕووی ئەوەوە کە بۆ شتە نهێنی و داشاراوەکان ئەبێ تەنها قورئان و فەرموودە پاڵفتەکان سەرچاوەی موسڵمان بن ـ کاتێ داوای مانای ئەم ئایەتە ( الرحمن علی العرش استوی ) لە پێشەوا ( مالك ) ی کوڕی ( أنس ) کرا ، لە وەڵامدا وتی :

( إستواء ) ئاشکرایە ، بەڵام چۆنێتی‌یەکەی نادیاری‌یە ، پرسیار لێ کردنی نابەجێ‌یە و وەڵام دانەوەی ناڕەوایە .

وە ئێستەیش زۆر لە زاناو نووسەرە ڕاستەکان هەر لەسەر ئەمە دەڕۆن ، خۆیان لە ئیسرائیلیات و لە تەءویلی نابەجێ لادەدەن ، تەنیا

لەسەر قورئان و فەرموودەی پاڵتنە دەڕۆن .

بەڵام بەداخەوە زۆری تر لەزانا دڵ ساف و دڵ فەقیرەکان لە گەلێك ڕووەوە ، پەڕاویان داناوە و پڕیان کردوە لە ئیسرائیلیات و خەرافات و داستانی بێ سەروبن و چیرۆکی هیچ و پووچ ، بەبێ هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەك ، وە بەبێ بەراورد و هەڵسەنگاندن ، وە شتی وایان لە تەفسیری قورئان و باسی هاتنە خوارەوەی ئایەت و بە ناوی فەرموودەوە نووسیوە ، کە تەنها هەر لە قووتووی عەتارەکانی دژ بە ئیسلام دا نەبێ لە هیچ لایەکی تر دەست ناکەون .

بە مەرجێ ئیشێکی گرنگی پێغەمبەر بەرهەڵستی ئەم لافاوە زیان بەخشە بووە ، کەچی شتی وا لە زمانی زانایانەوە ئەبینین و ئەبیستین کە زۆر جێگای سەر سوڕمانە !! بۆ نموونە :

پەڕاوی ( خازن ) کە یەکێکە لە تەفسیرەکانی قورئان ، لە تەفسیری سوورەتی ( هود ) دا ، دەڵێت : ( کە پیسایی لە ناو کەشتییەکەی « نوح » دا زۆر بوو ، خوا نیگای بۆ « نوح » نارد : کلکی فیل بگوشە ، کاتێ گوشی ، یەکانە و ماڵوسێلی لە « بەراز » لێ هاتە دەرەوە ، ئینجا دەستی هێنا بەسەر بەرازەکانا ، مشکیان لێ هاتە دەرەوە وە پیساییەکەیان خوارد ، کە مشکەکان کەوتنە خراپە کردن و کون کردن و پەت قرتاندن ، نیگا هات بۆ « نوح » بدات بەناو چاوی شێرا ، کە دای بەناو چاوی شێرا پشیلەی نێرو مێی لێ هاتە دەرەوە و مشکەکانیان خوارد ) .

ئایا زانایەکی باڵا دەست ئەبێ چۆن باوەڕ بەشتی وا بکات ، چ جای نووسینی لە تەفسیری قورئاندا ؟! .. کاشکی هەر ئەمە بووایە !! ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە ئێستایش لەم دەمی

بزوتنەوەی زانیاری‌یە دا ، زۆر لە زاناکانمان دەستیان گرتووە بە خەرافات و پڕو پوچی ئەو کتێبانە دا و لێ‌یان لانادەن ، ئەگەر تۆ هاتیت و ڕوو بە یەکێکیان وتت : ئەمە وا نیە ، خێرا لێت تووڕە دەبێت و مەترسی کوفر و بێ ئایینی دەخاتە بەر چاوت ، دوور نیە بۆ دەم کوت کردنت لە بەر چاوی خەڵکا کتێبێك بێنێ و چەندەها شتی لەو بابەتەت بۆ بخوێنێتەوەو هەندێکیش باسی گەورەیی خۆیی و بزمی تۆ بکات ، ئەگەر تۆ کۆڵت نەداو فیدایی‌یانە لەسەر ڕاستی‌یەکەی خۆت ڕۆیشتیت ئەوە سوور ئەبێتەوە و ڕەگی مـلی هەڵ دەسێت ، وەکو خەتای خانەدانت کردبێت ، ئەرز و ئاسمانت لێ پڕ دەکات و کوشتنت لە حەفتا کافری جەنگی بەخێرتر دادەنێت ، وە ئەگەر تۆ باســی کتێبێکی رانیاری تـازە هات بـە دەمتا ، ئەوە ئیتر نەفرین ( لعنت ) بۆ خۆت و باب و باپیرت و دانەری کتێبەکە بە سەبەتە دێتە خوارەوە .

نازانم تاکەی ئەو تاریکایی‌یە لەسەر چاو و دڵی ئێمە لاناچێت؟ وە تاکەی بۆ درۆ ، وەکو بۆ ڕاست ئێمە شوێن کەوتووی خەڵك دەبین ؟ وەتاکەی بیر ناکەینەوە و ناگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی ئایینە پوختەکەمان ؟ ! ! بــۆ قورئان و فەرموودەی بێ‌گەردی پێغەمبەر ، بۆ سەر فەرمایشی زانا بەرز و دیاری‌یەکانمان کە بە هەزاران کتێبی بە نرخ و پاڵفتەکراویان بۆ داناوین ؟ ( خوا پاداشتیان بداتەوە ) ، یان تاکەی ئەبێ ئێمە خەرافی بین ؟ ! ! ...

ئەمە باری چینی کۆنمانە ، وە زۆربەی تازەکانیشمان وەنەبێ لە کۆنەکانمان هۆشــیار تربن ، ئەمانەیش خۆر ئاوا و زانیاری خۆر ئاوایان کردووە بە ڕووگە ، وە ئەیانەوێ ئێمەی موسڵمان لە هەموو ئیش و کارمانـا ، لە کارو باری ئایین و ژیانمانا ، هەتـا لــە

تێگەیشتنمانا لە قورئان و فەرموودە و لێکۆڵینەوەی ژیانی پێغەمبەرو ... و ... هتد دا تەنیا شوێن خۆر هەڵات ناس و شاگردەکانیان بکەوین ، لەوانەوە فێری قورئانو فەرموودەو ئیسلام ببین ، فەلسەفەو حیکمەتی مرۆڤ و ژیانو بوونەوەر لەوانەوە وەربگرین ، ئەبێ ویلی ناو ماڵ ، یاسای خێزان ، پەیوەندی کۆمەلایەتی و بناغەی خوو و ڕەوشتمان لە سەرچاوەی شارستانێتی ماددی تازەی خۆر ئاوا وەربگرین ، ئەگینا ئێمە نەفامو کۆنەپەرستین ، شارستانیو پێشکەوتوو نین ، ئیتر بێ ئەوەی ئەم ڕاو باوەڕ و تێگەیشتنەیان لە قورئان و ئیسلامەوە وەرگرتبێت ، بەس شوێن کەوتن و بە شوێن دەستا ڕۆیشتنە ؟!! سا خوا یارمەتی هەر لە تۆوەیە .

## ترازووی ئاسمانی :

لە پێش ئیسلامدا یاسای دەمارگیری و ڕەگەز پەرستی لە پلەی هەرە بەرزی دا بوو ، هەر تیرەیەك خۆی بەگەورە و نەجیب و تیرەکانی تری بە بچرك و ژێر دەست دا دەنا ، بە تایبەتی هۆزی قورەیش ، خۆی بە سەرۆك و بەرزترین تیرەی عەرەب دا دەنا ، وە بەهۆی پاسەوانی‌یان بۆ کەعبەو خزمەتگوزاری‌یان بۆ حاجی و زیدەوانی‌یانەوە تیرەکانی تر ئەمەیان لێ سەلماندبوون و ددانیان پیا نابوو ، وە ترزووی گەورەیی و بچووکی و بەرزی و نزمی ترازویەکی سەر زەمینی دەستکردی مرۆڤ بوو ، بۆیە گەورەیی بەپێی تیرە و نەژاد و سامان دادەنرا ، با کابرا هەر جۆرە عەقڵ و خو و ڕەوشتی ببوایە و هەر چۆن بجوولایەتەوە .

ئیسلام لەم کاتەدا هات بۆ ڕاست کردنەوەی هەموو جۆرە لادان و کەم و کووڕی و خوار و خێچی‌یەکی کۆمەڵی مرۆڤ خۆ

ئیسلام ئایینێکی خوایی و گشتییە ، یەکەم چارەی بەوە کرد :

ترازووی ناو کۆمەڵی گۆڕی ، لە ترازووی دەستکردی مرۆڤەوە بۆ دەستکردی خوای پەروەردگار ، وەبانگی یەکسانی بەناو مرۆڤدا بڵاو کردەوە ، هەموو مرۆڤی کرد بە یەك بەرەباب و ڕۆڵەی پیاو و ژنێك ، وە گەورە و بچووکی گێڕایەوە بۆ سەر ( کردەوە ) بەبێ گوێ دانە هۆز و تیرە و نەژاد و ڕەنگ و ڕوو و زمان : ( یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا إن اکرمکم عندالله أتقاکم ) الحجرات / . کەواتە گەورە و بەرێز ئەوەیە خوا ناسینی زیاتر بێت و ، باشتر یاساکانی ئیسلام بەجێ بێنێت و ، وە خزمەتی مەردم بکات .

دیسان لەسەردەمی نەفامی دا یاسای بە کوڕ کردن ( التبني ) باو بوو ، ئەمەیش بەوڕێیە دەبوو ، هەچ کەس بەندەیەکی خۆی بە دڵا بچوایە دەی کردە کوڕی خۆی ، ئیتر بە کوڕی ئەو پیاوە دادەنرا لە هەموو ڕوویەکەوە ، دەبووە مەحرەم و کەلەپوری لێ دەبرد ، بەبێ جیاوازی لە گەڵ کوڕی تری پیاوەکەدا .

کوڕێك کەناوی زەیدی کوڕی حارثە لە تیرەی کەلبی عەرەب بوو ، لە دەوری نەفامێتی دا بە دیل گیرابوو ، لە کاتی فرۆشتنیانا ( حکیم )ی کوڕی ( خزام ) کڕی بۆ ( خدیجە )ی پوری . کە خەدیجە بوو بە خێزانی پێغەمبەر ، زەیدی پێ بەخشی ، پاش ماوەیەك پێغەمبەر ئازادی کرد ، بەڵام زەید پێغەمبەری جێ نەهێشت و لە لای مایەوە ، پاشان خزمەکانی هاتن و داوایان کرد لە پێغەمبەر کە بیان داتەوە ، پێغەمبەریش ڕای خستە دەستی خۆی کە لای بمێنێتەوە یان ئەڕواتەوە ، زەید مانەوەی هەڵبژارد و لەگەڵ خزمەکانیا نەڕۆیشتەوە ، لە دوایی دا بە پێی یاسای ئەو سەردەمە ،

پێغەمبەر زەیدی کرد بە کوڕی خۆی ، ئیتر بە زەیدی کوڕی محمد دەناسرا ، وەکاتێ پێغەمبەرێتی بۆ هات ، لە پێشەنگی باوەڕ کەرو موسڵمانانەوە بوو .

## پێغەمبەر یەکەم کەس بوو لە بەجێ هێنانی یاسادا :

لە چەرخی تازەی شـــارستانێتی دا ، کە بە چەرخی زانیاری و پێشکەوتن دا دەنرێت ، ئەگەر لە وڵاتێکدا یاسایەکی نوێ دانرا ، یان یاسایەکی کۆن گۆڕرا ، ئەو یاســایە بەســەر کاربەدەستەکانا جێبەجێ ناکرێت ئەگەر ناڕەحەتی‌یەکی تیابێت ، بەڵکو ئەوان لـە دەرەوەی کەوانەوە دادەنرێن ، بەڵام لە ئیسلامدا پێغەمبەری خـوا پێشەنگی جێبەجێ کردنی یاسا بووە ، ئاسان بووبێت یان گران ، بەڵکو ئەو یاسایانەی کە ناڕەحەت بوونایە،پێغەمبەر سەرمەشق بوو ، موسڵمانەکانیش بە شوێنیا دەچوون : ( ولکم في رسول‌الله أســوة حسنه ) .

بەڵێ ، بەپێی ترازووی ئاسمانی و یاسای ئیسلام ... کە گەورەیی بەتیرەو نەژادو ڕەنگ و ڕوو نیەو بە پێی خوا ناسی و بەجێ هێنانی ئیسلامە . بە پێی ئەمە پێغەمبەری خوا هات و خوازبێنی ( زەینەب )ی کچی ( جحش ) ی کرد بۆ ( زەید ) ی کوڕی ( حارثـه ) کە موسڵمانێکی ڕاستەقینەو لێ هاتوو بوو بۆ ئەوەی ڕەگی دەمارگیری پێ دەر بهێنێ ، چونکە زەیـــد کۆنـە بەندەی پێغەمبەر بـوو ، وە زەینەب کچی پیاوێکی نـاوداری قورەیشـــە وە دایکیشـــی پـوری پێغەمبەرە . لە بەر ئەمە باشترین ڕێگا بوو بۆ هێنانەدی یەکسانی و لە ناو بردنی چینایەتی و گۆڕینی ترازووی مرۆڤ بە ترازووی خوا .

بەلاّم ( زەینەب ) و ( عبدالله ) ی برای ڕازی نەبوون ، چونکە تا ئەو کاتە شتی وا بە سروکیو نزمی سەیر کراوە ـ بەپێی ترازووی زەوی ـ بەلاّم پێغەمبەر لە سەر ڕاکەی خۆی سوور بوو وە فەرمووی بە زەینەب شـووی پێ بکە . ئەویش کە پێغەمبەری بەو شـێوەیە بینی ، داوای مۆڵەتی لێ کرد ، وتی : با بیر بکەمەوە ، تا لـەم کاتەدا ئایەتی قورئان هات و فەرمووی : ( وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمراً أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ، ومن يعصى الله ورسوله فقد ضل ضلالاً مبيناً ) الأحزاب / .

یانی : کە خـوا و پێغەمبەری خوا بڕیاری ئیش و کارێکیان دا ئیتر پیاو و ژنی موسڵمان ڕێی بیر لێ کردنەوە و دوو دڵیان نیە ، وە هەر کەس لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر یاخی بێت گومڕا و سەر لێ شێواوێکی ئاشکرایە . کە پێغەمبەر ئایەتەکەی خوێندەوە ، زەینەب وتی : باشە تۆ ڕازیت شووی پێ بکەم . فەرمووی : بەڵێ . وتی : کەوابێ لە فەرمانی خـوا و پێغەمبەر دەرناچم . بەم پێیە زەینەب شـووی کرد بە زەیـد و پێغەمبەر مارەبییەکەی بـۆ داو بـۆی گوێزایەوە .

## هەڵوەشـانەوەی یاسـای « بەکوڕ کردن »

دامەزراندنی خێزانو ڕێكو پێك کردنو پاراستنی لە ناڕەوایی و تێکەڵاوی ئامانجێکە کەئیسـلام ئەیەوێ، جاکەواتە چەندڕاسنە ئەگەر یاسای « بە کوڕ کردن » لا ببا ، ئیتر هەر کەس بە کوڕی باوکی خۆی بناسرێت ، خۆ قسـەی ڕووت هیچ نیەو قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە ، بەقسـەی کەس نابێت بە کوڕی کەس ، بۆیە لێرە دا

ئایەتی قورئان هات و ئەو یاسا ناڕاستەی هەڵوەشاندەوە :

( وما جعل الله أدعياءكم أبناءكم ، ذلكم قولكم بافواهكم ، والله يقول الحق وهو يهدى السبيل . أدعوهم لآبائهم ، هو أقسط عندالله ، فأن لم تعلموا آباءهم فاخوانكم في الدين ومواليكم ، وليس عليكم جناح فيما أخطأتم بــه ولكن ماتعمدت قلوبكم ، وكان الله غفوراً رحيماً ) الأحزاب / .

ئەمەیش مانای ئەوەیە ئەوەی بــە کوڕ دادەنـرا ، پەیوەنـدی خزمایەتی و مەحرەمێتی بەو خێزانەوە نیە ، دەست نوێژی لە ژنیـان دەشکێت ، ژنەکەی نابێتە بووکی خاوەن ماڵ ، ژن و کچی خاوەن ماڵیش دایك و خوشکی ئـەو نین ، وە بـە بێگانـە دادەنرێت لــە ناویانا .

وە بێجگـە لــە هاتن و خوێندنەوەی ئایەتەکە ، دەبێ پێغەمبەر خۆی یەکەم کەس بێت کە هەڵـبێت بە بەجێ هێنانی ئەو یاسـایەو یەکەم کەس بێت ئەو باوە کۆنە ناڕەوایە هەڵوەشێنێتەوە ، بۆ ئەوەی ئیش پێ کردنی لە سەرشانی موسڵمانان سووك بێت و لە تەحا تەحای خەڵکی نەترسن تیایا .

زەید زەینەب تەڵاق دەدات و پێغەمبەر مارەی دەکات زەینـەب کە بوو بە هاوسەری زەید ، تەنیا لە بەر گوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بوو کە ڕووی ڕەزامەندی نیشان دا ، ئەگینا لە ناو دڵیا پێی ناڕازی بوو ، وە ئەوەی پێویست بوو لە یاسای خێزانا کە ژن ئەبێ گوێ ڕایەڵی پیاو بکات نەی دەکرد . لەو لایشەوە زەید بە پێی یاسـای یەکسـانی و بـە گوێرەی ترازووی خوایی خۆی بەوە دەزانی کە کەم و کووڕی تێدا نیە بـۆ ئەوەی مێردی زەینەب بێت ، بـۆیــە

داوای بەجێ هێنانی فەرمانی ناو خێزان و ژن و مێردی لێ دەکرد ، بەڵام دیارە زەینەب لەگەڵ ئەوەدا کە موسڵمانێکی ڕاست بوو ، ماوەی کۆن لە دڵیا هەر مابووەوە بۆیە گوێ ڕایەڵی زەیدی نەئەکرد . لەبەر ئەمە ژیانی ناو خێزانیان بەختیارانە نەبوو ، زەید هەموو جارێ ئەهاتە خزمەتی پێغەمبەر و شکاتی لە دەست زەینەب دەکرد و دەی وت :

ناچارم کە دەستی لێ هەڵبگرم ، لەو لایشەوە خوا پێغەمبەری تێ گەیاندبوو : کە زەید زەینەب تەڵاق دەدات و دەبێ تۆ مارەی بکەیت بۆ خۆت .

جا با ئێمە لێرە دا بیرێك لەو حاڵەتەی پێغەمبەر بکەینەوە .. لە لایەکەوە خوا دەیەوێت لێی زەینەب مارە بکات ـ لەبەر ئەو حیکمەتانەی کە دەیان زانێت کە یەکێکیان هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسای بەکوڕ کردنە لە لایەکی ترەوە دوژمنانی خوا و پێغەمبەر هەمیشە دوور بینیان لە چاو کردبوو ، بۆ ئەوەی ناڕێکی‌یەك لە پێغەمبەر بدۆزنەوە ، ئێستە ئەگەر بێت زەینەب مارەبکات ، دەکەونە تەقەو چەپڵە لێدان و سەر زەوی لێ پڕدەکەن ، بەمە ( کە محمد بووکی خۆی مارە کرد ) خەڵکی لە ئیسلام سارد ئەکەنەوە .

ئەبێ لێرە دا چی بکات و چ هەڵوێستێك بگرێت ، دوور نیە بەتەما بوو بێت خوا لێی ببوورێت و ئەم بارە گرانەی نەدا بە سەردا ، یا بە لایەوە وا بوو بێت ئەگەر زەید زەینەب تەڵاق دا ، ئەم پێویستێتی ، بەڵام ئەگەر تەڵاقی نەدا خۆ ئەمە ناکرێت ، بۆیە هەر کاتێ زەید ئەهات ناڕەزایی لە زەینەب دەر دەبڕی و تەڵاق دانی دەخستە ڕوو ، پێغەمبەر ئەی ویست دەست بەرداری نەبێت و دەی

فەرموو : ( دەست بەسەر ژن و خێزانی خۆتا بگرەو دەست بەرداری مەبەو لـە خوا بترسە ) وە هیچی تری دەر نەئەبڕی ، بەڵام ئیشەکە لە خواوەیەو ئەبێ بچێتە سەر ، زەید زەینەبی تەڵاق داو نەی توانی لەگەڵیا بژی ، وە لە دوای تەواو بوونی ( عدده )ی شەرعی ، بە پێی فەرمانی خوای پەروەردگار ، پێغەمبەر زەینەبی مارە کرد ، وە بوو بە یەکێك لە دایکانی موسڵمانان ، وە لەڕێگای زەیدی کۆنە مێردیەوە خوازبێنی و ڕێکەوتنەکەیان تەواو بوو .

( أنس ) دەڵێت : ( کاتێ ماوە « عدده »ی زەینەب تەواو بوو ، پێغەمبەر فەرمووی بە زەیدی کوڕی حارثە : بچۆ داوای زەینەب بکە بۆم ، زەیدیش چوو بۆ لای خەریکی هەویر شێلان بوو ، زەید دەڵێت : لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ئەوەی فەرموو بوو ، کە چاوم پێی کەوت ، ئەوەندە لە بەر چاوم گەورە بوو ، نەم توانی بۆی بڕوانم ، بۆیە پشتم تێکرد و وتم : مژدەبێت پێغەمبەری خوا داوای کردوویت ، ئەویش وتی : بە بێ ئیزنی خوا هیچ ئیشێك ناکەم ئیتر هەڵسا و چووە مزگەوتەکەی خۆی و دەستی کردە قورئان خوێندن ، پاشان پێغەمبەر چوو بۆ ماڵیان و ڕێ کەوتن ) . (١)

( بخاری ) لە ( أنس )ەوە ڕیوایەتی کردووە : ( زەینەب شانازی دەکرد بە سەر ژنەکانی تری پێغەمبەر دا و دەی وت : ئێوە کەس و کارتان مارەی بڕیوون لە پێغەمبەر ، من خوای گەورە لە پشتی ئاسمانەوە مارەی بڕیووم لێی ) .

قورئان بۆ ئەم باسە دەفەرموێت : ( وإذ تقول للذی أنعم الله علیه وأنعمت علیه : أمسك علیك زوجك واتق الله ، وتخفي في

---

(١) إمامی أحمدو مسلم نسائی ڕوایەتیان کردووە .

نفسك ما الله مبدية وتخشى الناس ـ والله أحق أن تخشاه ـ فلما قضى زيد منها وطراً زوجناكها ، لكيلا يكون على المؤمنين حرج في أزواج أدعيائهم إذا قضوا منهن وطراً وكان أمر الله مفعولا ) الأحزاب / .

## دوژمنی ئیسلام دەست هەڵناگرن

لەگەڵ ئاشكراو ڕۆشنی ڕووداوەكەو لەگەڵ ئەو هەموو ترس‌و لێكدانەوە و خۆگرتنەی پێغەمبەر لە مارە كردنی زەینەب دا ، كە گەیشتە ڕادەیەك قورئان هات و ڕەخنەی لێ گرت ـ وەكو لەپێشەوە خوێندتەوە ـ لەگەڵ ئەمەیشا دوژمنانی ئیسلام واز نایەنن و دەست هەڵناگرن ، ئەمەیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی ـ بە خەیاڵی خاوی خۆیان ـ زیان بە ئیسلام بگەیەنن‌و شێوەی شیرینی پێغەمبەر بگۆڕن ، بۆیە دەستیان كرد بە بڵاو كردنەوەی درۆ و دەلەسەو شتی پڕ و پوچ و خەرافات لەم هەڵكەوتەدا ، چۆن دەست هەڵ دەگرن ، خۆ ئەوان لە نەتاشراو ئەتاشن ، چ جای ئەوەی لێرە دا بیانویەكیان دەست كەوتووە ؟ ! ! .

ئەمە سروشتی دوژمنی ئیسلام بووە بە درێژایی مێژوو ، وە هەتا هەتایە هەر وایش دەبێت ، وە هەمیشە دەیانەوێت بە درۆ و پڕ و پاڵاتە و بەشتی ناڕاست و ناڕەوا ڕووی بانگ و بانگ كەرانی ڕێگای خوا ناشیرین بكەن و لەم ڕووەوە ئیسلام لە كۆمەڵ لابدەن .

لێرە دا دوژمنانی ئیسلام . . دوو ڕوو و ناپاكەكان كەوتنە

چپه چپ و تانەو تەشەر ، محمد بووکی خۆی مارە کرد ، محمد پیاوێکی مێ بازەو هەر ژنێکی جوانی دەست کەوێت بێ سنوور مارەی دەکات ، ئیتر بەبێ ئەوەی نەختێك چاو بدرنەوەو سەیری واقیعی پێ بکەن ، تا ڕاستی ڕوو داوەکەیان بۆ دەرکەوێ وە بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوە کە خوا یاسای ( بە کوڕ کردن ) ی گۆڕی و ئەم کردەوەی پێغەمبەر بۆ دامەزراندنی ئەو یاسا تازەیە بوو ، تا موسڵمانان سەری لێ نەکەنەوە ، وە بەبێ ئەوەی چاوێك بە ئایەتەکانی قورئان دا بگێڕن ، ئەوەتە بێجگە لە ئایەتەکانی پێشوو ، هەر لە سوورەتەکەدا دەفەرمووێ : ( ما كان على النبي من حرج فيما فرض الله له ، سنة الله في الذين خلوا من قبل ، وكان أمر الله قدراً مقدوراً ، الذين يبلغون رسالات الله ولا يخشون أحداً إلا الله ، وكفى بالله حسيباً ، ما كان محمد أبا أحد من رجالكم ، ولكن رسول الله وخاتم النبيين ، وكان الله بكل شيء عليماً ) الأحزاب / .

سەیر ئەوەیە خۆرهەڵات ناس و مزدە دەرانی گاورێتی ( المستشرقون والمبشرون ) کە لای خۆیان زانا و ڕۆشنبیرن ، ئەوانیش بەشوێن ئەو خەیاڵە پڕ و پوچەدا ڕۆیشتوون و درۆ و ئەفسانەکەی ئەوانیان بڵاو کردوەتەوەو ڕووداوەکەیان بە شێوەی ئەوین و شەیدا بوون و حەزلێ کردن وێنە کێشاوە ، وە لەمەیش سەیر تر ئەوەی جێگەی داخ و سەر سووڕمانەو ڕێگای بۆ ئەمانە خۆش کردووە ئەوەیە : لە ناو پەڕاوە ئیسلامی‌یەکانا و بە پەنجەی زانا ساویلکەکانی خۆمان ـ ئەوانەی کە زۆر ئارەزووری خەرافاتیان بووە ، بەبێ لێکۆڵینەوەو لێکدانەو پەلیان کوتاوە لە تاریکایی شەودا هەرچی‌یان دەست کەوتبێت بێ سەیر کردن پەڕاوەکانیان لێ پڕ کردووە ، بۆیە شتی وایان نووسیوە بۆ نەخوێندەواریش دەست نادات و زۆر

دووره له گیانی خاوێنی ئیسلامەوە ـ ئەم ڕوو داوە بەشێوەیەکی زۆر درۆ و دوور له سروشتی پێغەمبەرەوە نووسراوەو دەڵێن :

جارێکیان پێغەمبەر چوو بۆ ماڵی زەیدو دەرگاکەیانی کردەوە، لەو کاتەدا زەید لە ماڵ نەبوو زەینەبی بینی بە نیمچە ڕووتی‌یەوە.. قژی داهێنا بوو ، بەسەر سینەو مەمکی ڕووتا ڕژابوونە خوارەوە ، لێرە دا پێغەمبەر کەبینی شەیدای بوو و وتی :

پاك و خاوێنی هەر بۆ خوایە کە ئاڵ و گۆڕ بە دڵەکان ئەکات .

ئیتر گەڕایەوە و نەچووە ژوورەوە ، کە زەید گەڕایەوە زەینەب باسەکەی بۆ گێڕایەوە و زانی‌یان کە پێغەمبەر حەزی لە زەینەب کردووە ، بۆیە زەید هاتە لای پێغەمبەر و زەینەبی بۆ تەڵاق دا ....

ئەم ڕووداوە (یان ئەم ئەفسانەیە) بێجگە لەوە کە لە دەرهێنان و پاڵفنەکردنی فەرموودە دا فرێ دراون ، لە بەرئەوەی ئاشکرایە هەڵبەستراوە ، نووسەری پەڕاوەکان نەیان کردووە هەندێك بیر بکەنەوە ، کەشتی وا چۆن بۆ پێغەمبەرێك دەست دەدات ؟ وە ئایا زەینەب پورزای پێغەمبەر نەبوو ؟ وە لە منالی‌یەوە لە بەردەست خۆیا گەورە نەبوو بوو ، خۆ هەتا ماوەیەك لەوە بەر کە هێشتا ئایەتی پەردە نەهاتبوو ، هەموو ڕۆژێك چەند جار ئەی بینی‌و باش ئەی ناسی ، وە پێغەمبەر خۆی خوازبێنی کرد بۆ زەید ، وە لەم ڕووەوە زۆر لە گەڵیا دووا ، گوایە چۆن و بۆچی لەو ماوە درێژەدا نەی ناسی‌و نەی بینی‌و حەزی لێ نەکرد؟ کەچی لەو چوار ڕۆژەی لای زەید شەیدای بوو ! دیسان لە مێژووی ژیانی پێغەمبەردا نەبیستراوە و نەبینراوە کە پێغەمبەر ئەوین و شەیدای بۆ هیچ ژنێك بوو بێت ، ئەوە بوو لەکاتی گەنجی‌و سەرەتای لاوێتی‌دا نزیکەی

سی ساڵ لەگەڵ ژنێکی بە ســاڵاچوو دا ژیا ، بەبێ ئەوەی بیر لە ژن و ژن هێنان بکاتەوە ، وە دوای مردنی خەدیجەش ئەو ژنانەی کە هێنانی ، لە هەموویانا تەنیا بەرژەوەندی بانگەکەی سەیر کردو هەر یەکەیان بۆ سوودێکی تایبەتی بڵاو کردنەوەی ئیســلام بوو و بەس ، ئیتر ئەبێ چۆن لە گرێی شەشەمی تەمەنیا ، وە بە تەنیا بۆ زەینەب ئەوبن و شەیدا بوونی بۆ پەیدا بووبێت ؟!! وا بزانم قسەی وا هەر بیســتنی - بێ خۆماندوو کردن - هەموو کەس دەڵێت : بە خوا ئەمە درۆیەو زۆر دوورە لە مێژووی ژیانی پێغەمبەرەوە .

دیسان ئایەتی قورئان لە وێڵی دیدەنی دا دەفەرموێت :

مەچنە هیچ ماڵێکەوە تائیزننان نەدەن وەسەلام نەکەن لەخاوەنی، وە ئەگەر لە ماڵ نەبوون ، یان ئیزنیان نەدان بگەڕێنەوە و مەچنـە ژوورەوە . هەر کەس بێ ئیزن وەرگرتن و سەلام کردن بهانایەتە ماڵی پێغەمبەر ، ئەیناردە دەرەوە ئەبوایە سەلامی بکردایە و داوای ئیزنی بکردایە و ئەمجار بهانایە ژوورەوە .

ئەی چۆن ئەبێ پێغەمبەر خۆی بەبێ ئیزن خواســتن و ســەلام کردن ، وە لــە کاتێکا کە زەیــد لــە ماڵ نەبووبێت ، دەرگای کردبێتەوەو چووبێتە ژووریو زەینەبی بەو بێ تفاقی‌یە دیبێت ؟!! .

وە هەروەها پێغەمبەری خوا - درووودی لە ســەربێت - قەدەغەیە کردووە کە لە دەرگاوە ســەیری حەوشەو مــاڵی کەس بکرێت ، ئەبێ خۆی چۆن لە دەرگاوە سەیری ماڵی زەیدی کردبێت ؟!! .

بەم جۆرە بۆمان ساغ بووە کە ڕاستی ڕووداوەکە چۆن بووە ،
وە تێگەیشتین کە دوژمنانی ئیسلام هەمیشە وان لە پارێزدا بۆ ئەوەی
ڕەخنە لە ئیسلام بگرن ، وە زانیمان کە لە هەموو دەمێکدا زانا
سادەکانی ئیسلام بە ساویلکەیی داریان داوەتە دەستی دوژمن و
بەڵگەی بێ جێ‌یان بۆ پێك دێنن .

# بەشی پێنجەم

## دوواکەوتووەکانی جەنگی تەبووك

لە پەراوی (ژیان ..) دا زانیمان کە لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا بە بانگی ئاشکرا فەرمووی بە موسڵمانەکان : خۆتان ڕێك بخەن و هەموو شتێك ئامادە بکەن دەچین بۆ تەبووك . ئەم سەفەرە لەکاتی گەرما دا بوو ، ڕێگاکەش وشك و بێ ئاو بوو ، دوورو تۆزو خۆڵاویو زۆر دژوار بوو ، هەر لەبەر ئەمەیش بوو پێغەمبەر بە بێ پێچ و پەنا باسی شوێنەکەی بۆ کردن .

لەم سەفەرە دا گەلێك خۆیان دواگرت و خۆیان لێ دزییەوە و بەشداریان نەکرد ، ئەمانە نزیکەی هەشتا کەسیان لە دوو ڕووەکان بوون ، کە پێغەمبەری خوا گەڕایەوە لە مزگەوت دانیشتبوو ، هاتنە لای و دەستیان کرد بە سوێندی درۆ خواردن کە بۆیان نەکراوە بڕۆن ، پێغەمبەریش ڕواڵەتی لێ وەرگرتن و نهێنییەکەیانی دایە دەست خوا ، لە ئەنجاما ئایەتی قورئان هاتە خوارەوە پیسی و نهێنییەکەی خستە ڕوو ، بۆ هەموو کەس دەرکەوت کە ئەوانە دوو ڕوو و ناپاکن .

بەڵام لە ناو دواکەوتووەکاندا سێ موسڵمانی خاوێنی ڕاستەقینە هەبوو ، ڕووداوی ئەمانە جۆرێ تربوو ، جا ئێستە ئەچین بۆ لای خۆیان گوێ ئەگرین لە (کعب) ی کوڕی (مالك) خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ( لە هیچ جەنگ و غەزابەکدا لەپێغەمبەری خوا دوا نەکەوتووم بێجگە لە تەبووك ، بەڵێ هاو بەشی بەدرم نەکردبوو ، بەڵام کەس لە سەر دواکەوتن لە بەدر ڕەخنەی لێ

نەگیرا ، چونکە پێغەمبەر بە تەمای کاروانی قورەیش ڕۆیشــت ، خوا لەگەڵ دوژمنـدا بەرەنگاری کردن ، وە جەنگەکە لـە ســەر بڕیاری پێشــوو نەبوو ، وە لە شــەوی پەیمانی عـەقەبەدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووم ، کە پەیمانمان بەست لەســەر ئیسلام ، وە ئـەم حازر بوونەم ناگۆڕمەوە بە بەدر ، ئەگەر چی ناوبانگی بەدر لەناو مەردما زیاترە ، وە هەواڵی دوا کەوتنەکەی تەبووکم : هیچ کاتێ ئەوەندەی ئەو کاتەی دوا کەوتم لەو جەنگە توانایی و دەســەڵاتم نەبووە ، بەخوا هیچ کاتێکی لەوە پێشم دوو وڵاخی سواریم نەبووە کە لـەو کاتەدا بووم ، وە لــە هەموو جەنگەکانی تردا پێغەمبەر ـ دروودی لە سەربێت ـ شوێنەکەی ناو نەدەبرد و بە ئاشکرا باسی نەدەکرد ، بەڵام لەم کاتەدا کاتەکە کاتی گەرما بوو ، ڕێگا کەش دوور و چۆڵ و بێ ئاو و ئاوەدانی بوو ، بۆیە بە ئاشـکرا باســی کرد و فەرمووی : دەچین بۆ تەبووك ، تاموسڵمانان بە باشی خۆیان ئامادە بکەن و هەموو پێویستی و ئازووخەیەك پەیدا بکەن .

ژمارەی سەربازەکانی ئەم جەنگە زۆر بوون ، لەگەڵ ئەوەشدا لە هیچ پەڕاوێکدا تۆمار نەکرابوون و ناو نووســیان نەبوو ، هەر کەس نەهاتایەو وای ئەزانی ئەگەر نیگا لەو بارەیەوە لەلای خواوە نەیەت گوم دەبێت و پێ نازانرێت . وە کاتی ئــەم غەزایە کاتی سێبەر خۆشی و میوە ڕەسان بوو ، منیش زۆر ئارەزووی سێبەرم دەکرد ، پێغەمبەر و موســڵمانەکان کەوتنە خۆ ڕێکخستن ، منیش خەریك بوو دەست پێ بکەم ، کەچی گەڕامەوە و دەستم لە هیچ نەدا ، لە دڵی خۆمدا دەم وت : من ئامادەم توانایيم هەیە ، دەست بەهەر شتێ حازرە ، بەم پێیە خۆم خەڵافان هەتا هەروو لە خۆ ڕێکخستن بوونەوە و پێغەمبەر و موسڵمانان کەوتنە ڕێ و من هێشتا

دەستم لە هیچ نەدابوو ، هەر ئەچوومە ماڵ و هەر لە خۆمەوە ئەگەڕامەوە و هیچم نەدەکرد ، کە سوپا کەوتە ڕێ و دوور کەتەوە ویستم بەدوایانا بڕۆم و پێیان بگەم ـ خۆزگە بڕۆیشتمایە ـ بەڵام بۆم نەنووسرابوو ، دوای ئەوان کە ئەچمە ناو خەڵك دەبینم ئەوانەی نەڕۆیشتوون و بەجێ ماوون یا دوو ڕوون یان هەژارو بێ نەواکان بەمە ناڕەحەت و غەمبار دەبووم .

پێغەمبەر باسی من ناکات تا لە تەبووك لە ناو مەردمەکانا دادەنیشت و دەفەرمووێت :

ئەوە کەعب چی کرد ؟ پیاوێك لە تیرەی ( بنی سلیمە ) دەڵێت : فیز و هەوا و دەوڵەمەندی ڕێی نەدابێت ، ( معاذ ) ی کوڕی ( جبل ) دەڵێت : خراپت وت ، بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا لە چاکە بەولاوە هیچمان لێ نەدیوە ، پێغەمبەر بێ دەنگ دەبێت ، لەو کاتەدا پیاوێکی بەرگ سپی دەبینێ لە دەشتەوە دێت ، دەفەرمووێت : ( أبوخیثمە ) یە کە دێتە پێشەوە ئەو دەبێت .

کاتێ بیستم وا پێغەمبەری خوا گەڕایەوە خەم و خەفەت دای گرتم ، دەستم کرد بەدرۆ ڕێکخستن و دەم وت : بەچی خۆم بپەڕێنمەوە و لێم تووڕە نەبێت ، وە داوای ڕام لە هەموو خزمە ژیرە کانم دەکرد ، کە وتیان : پێغەمبەر هاتەوە ، هەموو درۆ و پڕ و پوچێکم لابرد ، زانیم بە هیچ لەوانە ڕزگارم نابێت ، بڕیارم دا بەڕاستی باسەکەی بۆ بکەم ، پێغەمبەر گەیشتە ناو شار ، پیشەی وابوو لە هەر لایەك بگەڕایەتەوە دەچووە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی دەکرد ، ئەنجا لە ناو خەڵکا دادەنیشت ، کە ئەمەی کردو دواکەوتووەکان چوونە لای ، کەوتنە بڕو بیانوو هێنانەوە و سوێند خواردن ، ئەمانە هەشتا پیاو زیاتر بوون ، ئەویش ئەم ئاشکرایی‌یەی

لێ وەرگرتن و نهێنی یانی دابە دەست خوا ، پەیمانی لێ سەندون و داوای لێ بوردنی بۆ دەکردن ، کە من چووم و سەلامم کرد ، زەردە خەنەیەکی توورەیی کرد و فەرمووی : بۆچی دواکەوتیت ؟ ئەی تۆ ولآخت نەکڕی بۆ جەنگ ، منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، بەخوا ئەگەر بێجگە لە تۆ لە لای هەر پیاوێکی دنیایی بووایەم ، دەم توانی بە بیانوو هێنانەوە خۆم ڕزگار بکەم ، چونکە من لە وتار و ڕەوان گۆیی دا بەهرەوەرم ، بەڵام ئەزانم ئەگەر بە درۆیەك تۆ ڕازی بکەم ، نزیکە خوا توڕەت بکات لێم ، بەڵام ئەگەر ڕاستت لا بڵێم و تۆ ئێستە لێم توورە ببیت ، بە هیوای لێ بوردنی خواهەم ، بە خوا ئەی پێغەمبەر هیچ بیانووم نەبوو ، هیچ کاتێ تواناو دەسەڵاتم ئەوەندەی ئەو کاتە نەبووە ، کە بەجێ ماوم و دواکەوتم لێتان .

پێغەمبەر فەرمووی : ئەمە ڕاست دەکات ، هەڵسە تابزانین فەرمانی خوا چۆن دەبێت . کۆمەڵێ لەپیاوانی ( بنی سلیمة ) هەڵسان و شوێنم کەوتن و وتیان : بەخوا گومان ناکەین لە پێش ئەمەوە گوناهت کردبێت ، بۆ نەت توانی بیانوویەك بێنیتەوە وەکو دواکەوتووەکانی تر ؟ ئەو داوای لێ بوردنەی پێغەمبەرت بەس بوو بۆ ئەم گوناهەت . بەخوا وازیان لێ نەهێنام و سەرزەنشتیان دەکردم ، تا ڕادەیەك ویستم بچمەوە لای پێغەمبەر و خۆم بەدرۆبخەمەوە ، پاشان وتم : کەسی تر وەکو منی نەکردووە ؟ وتیان : با ، دوو پیاوی تر وەکو تۆیان وت و وەکو تۆیان پێ وترا ، وتم : کێن ؟ وتیان : ( مرارة ) ی کوڕی ( ربیعی عمری ) و ( هلال ) ی کوڕی ( أمیەی واقفی ) ، ئەبینم دوو پیاوی چاکن ، هاوبەشی بەدریان کردووە ، ئیتر ڕۆیشتم و گوێم بە کەس نەدا .

لەناو هەموو دواکەوتووەکاندا پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەر بێت ـ قەدەغەی قسە کردنی کرد لەگەڵ ئەم سیانەمانا ، ئیتر خەڵك لێمان دوور کەوتنەوە ، هەتا دنیا لە بەر چاوم تاریك بوو زەوی ئەو زەوی‌یە نەبوو کە لە سـەری ژیابووم ، پەنجا ڕۆژی ڕەبەق بەم پێ‌یەماینەوە ، دوو هاوڕێکەم دامان و لە ماڵا دانیشتن و هەر دەگریان ، بەڵام من گەنج و بە توانابووم ، ئەهاتمە دەرەوە ، لەگەڵ موسڵمانانا ئەچووم بۆ نوێژ ، لە بازاڕا ئەسووڕامەوە ، کەس نەی دەدوانم ، ئەهاتمە لای پێغەمبەر و سەلامم لێ دەکرد کە لە دوای نوێژ دادەنیشت ، لە دڵێ خۆما دەم وت : ئایا لێوی جوڵانەوە بە وەڵامی سەلامەکە ؟ لە نزیکیەوە نوێـژم دەکرد و بە دزی‌یەوە بۆم دەڕوانی ، کە خـەریکی نوێژ دەبووم بـۆمی دەڕوانی ، کـە لام دەکردەوە ڕووی وەرگێڕا لێم ، کە ئەم حاڵە درێژەی کێشا ، بە تەواوی بەگیر هاتین ، جیهانمان لێ تـەنگەڵان بـوو ، ڕۆژێکیان ڕۆیشتم تا چوومە سەر دیواری حەوشەی ( أبو قتادە ) کە ئامۆزام بوو ، لە هەموو کەسم خۆشتر دەویست ، سـەلامم لێ کرد ، بە خوا سەلامەکەی نەسەندەوە ، وتم : ( أبو قتادة ) سوێندت دەدەم بەخوا ، ئایا ئەزانیت کە من خواو پێغەمبەرم خۆش دەوێت ، بێ‌دەنگ بوو ، دووبارەم کردەوە ، هەم بێ‌دەنگ بوو ، بۆ جاری سێ‌یەم وتی : خوا و پێغەمبەر باشتر دەزانن ، چاوم پڕ بوو لە ئاو و پشتم هەڵ کردو ڕۆیشتم ، کاتێ لە بازاڕا دەگەڕام ، سەیرم کرد یەکێ لە جوتیارەکانی شام کە هاتبوون بۆ مەدینە بۆ دەغڵ و دان فرۆشتن دەڵێت : کێ کەعبی کوڕی مالکم پیشان دەدات ، خەڵکیش پەنجەیان بۆ من ڕاکێشا ، کابرا هات و نامەیەکی پاشای غەساسینەی دامێ ، کە خوێندمەوە ئەبینم نووســیویەتی : بیستومە هاوڕێکەت ئازاری

داوی ، تۆ خوا نەی کردوویت بە جێگەی ڕیسوایی‌و چەوساندنەوە ، وەرە بۆلای ئێمە ڕێزت لێ دەگرین ، وتم :

ئەمەیش نەگبەتی یەکی ترە ، پێچامەوە و فڕێم دایە تەنوورێك‌و سووتانم .

بەم پێ‌یە ماینەوە تا چل پەنجا ڕۆژە کە ڕۆیی ، ئەبینم پیاوێ لای پێغەمبەرەوە هاتە لام ، دەڵێت : پێغەمبەری خـوا فەرمانت پیا دەدات کە لە ژنەکەت جیا ببیتەوە ، وتم : تەڵاقی بدەم یا چی‌بکەم ، وتی : نـەء ، تەڵاقی مەدە ، بەس نـزیکی نەبینەوە ، وە هەمـان فەرمانی نارد بۆ دوو هاودەردەکەم ، وتم بەژنەکەم : بچۆرەوە ناو کەس‌و کارت ، تا بزانین فەرمانی خوا چۆن دەبێت ؟ ژنی ( هلال ) چوو بووە لای پێغەمبەر و وتبووی : ئەی پێغەمبەری خوا ( هلال ) پیاوێکی پیرو پەك کەوتەیەو کەسی نیە خزمەتی بکات ، ئایا پێت ناخۆشە من خزمەتی بکەم ؟ دەفەرمووێت :

نـەء ، بەڵام نزیکت نەبێتەوە ، دەڵێت : بەخوا جووڵەی لێ‌بڕاوەو لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەر دەگری . هەندێ لە کەسـەکانم وتیان :

بـۆچی تـۆیش داوای ئیـزن لـە پێغەمبەر ناکەیت تاژنەکەت لا بمێنێتەوە ؟ ئەوەتە ئیزنی ژني ( هلال )ی داوە کە خزمەتی بکات ، وتم : بە خوا داوای ئیزنی لێ ناکەم ، چونکە ئەگەر داوای ئیزنم لێ کرد ، کێ ئەزانێ چی ئەفـەرمووێت ؟ منیش پیاوێکی گەنج و بەهێزم .

بەم جۆرەیش دە ڕۆژمان بردە سەر ، لە کاتێ قەدەغەی قسـە لەگەڵ کردنەوە پەنجا ڕۆژمان تەواو کرد ، لە بەیانی پەنجا هەمـا

لەســەر بانەکەی خۆمان نوێژی بەیانیم کرد بەو حاڵەتەوە کە خوا دەفەرموێت دەربارەمان دانیشتبووم ، لە گیانی خۆم وەڕس بوو بووم ، زەوی بەو فراوانی یەوە لێم هاتبووە یەك ، گوێم لە دەنگی پیاوێك بوو چوو بووە سەر تەپۆلکەی سەلع - کەژێکە لە مەدینە ، پیاوەکەش أبوبکر بوو - بە دەنگی بەرز هاواری کرد : مژدەبێ ئەی کەعبی کوڕی مالك ، منیش خێرا سەجدەی سوپاسم برد بۆ خوا و زانیم دەروومان لێ کراوەتەوە لە کاتی نوێژی بەیانی دا پێغەمبەری خـوا هەواڵی دابوو بە موسڵمانەکان کە خـوا تەوبەی لێ وەرگرتووین و لێمان خۆش بووە ، خەڵکی ڕایان کرد بۆ لامان بەم مژدەیەوە ، کۆمەڵێ چووبوون بۆ لای دوو هاوەڵەکەم و پیاوێکیش هـاتـە لای من و مژدەکەی دامێ ، منیش دوو بەرگم لە بەردا بوو ، هــەر دووکیانم داکەندو پێم بەخشی ، بە خوا هیچ بەرگی ترم نەبوو ، دوو بەرگم خواست و چووم بۆ لای پێغەمبەر ، لە ڕێگا پۆل پۆل تووشی موسڵمانان ئەهاتم و پیرۆز بایی یان لێ دەکردم ، تا گەیشتمە مزگەوت ، پێغەمبەر دانیشتبوو ، کۆمەڵێ خەڵکی لە دەور بـوو ، ( طلحە )ی کوڕی ( عبیداللە ) هەڵساو بەرەو ڕووم هات و تەوقەی لــەگەڵ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم ، بێجگە لـەو کەســە لــە کۆچەری یەکان هەڵنەسا ، وەقەت ئەوەی ( طلحە )م لە بیر ناچێت ، پاش ئەوە سەلامم لە پێغەمبەر کرد و بینیم ڕووی لە گەشی دا برقە دەدات و فەرمووی : مژدەبێت بە چاکترین ڕۆژێك بە ســەرتا تێ دەپەڕێت لەوەتی لە دایك بوویت . وتم : لە تۆوەیە ئەی پێغەمبەر یا لە خواوەیە ؟ فەرمووی : لە لای خوای گەورەوەیە ، وە پێغەمبەر هەر کە خۆشی یەکی بە ســەرا بهاتایە ڕووی شیرینی وەکو مانگی چواردە ئەدرەوشایەوە و هەموو ئەمەیان لێوە ئەزانی ، کە لەبـەر

دەستیا دانیشتم وتم : ئەی پێغەمبەری خوا با لە نیشانەی ئەم تەوبەو لێ خۆش بوونەم ئەوە بێت هەرچی ماڵم هەیە خێربێت بـۆ خوا و پێغەمبەر ، فەرمووی : باشتر وایـە هەندێکی بهێڵیتەوە بۆ خۆت ، وتم : باشـە بەشەکەی خەیبەرم ئەهێڵمەوە ، وە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە بە هۆی ڕاستگۆییمەوە ڕزگاری کردم ، منیش پەیمان بێت تا ماووم ڕاستگۆ بم و هیچ درۆیەك نەکەم . وە لـەم بەسەرهاتەدا خوا ئەم ئایەتانەی ناردبووە خوارەوە :

( لقد تاب الله على النبي والمهاجرين والانصار الذين اتبعوه في ساعة العسرة من بعد ما كاد يزيغ قلوب فريق منهم ثـم تاب عليهم إنه بهم رؤف رحيم ، وعـلى الثلاثة الذين خلفوا حتى إذا ضاقت عليهم الأرض بما رحبت وضاقت عليهم أنفسهم وظنوا أن لا ملجأ من الله إلا إليه ثم تاب عليهم ليتوبوا إن الله هو التواب الرحيم ) التوبه / ١١٧ ، ١١٨ .

کەعب دەی وت : بەخوا بێجگە لە ئیسلام بوونم نازو نیعمەت نیە لەلام ئەوەندەی ئەو ڕاسـت کردنە لەلام گەورە بێت ، بەس نەبوو درۆم لای پێغەمبەر نەکردو دوایی تووشی ڕقی خوا ببوومایە لەگەڵ ئەوانەی تووش هاتن و خـوا قورئانی لـە بارەیانەوە نارد و فەرمووی :

( سيحلفون بالله لكم إذا انقلبتم اليهم لتعرضوا عنهم ، فأعرضوا عنهم إنهم رجس ومأواهم جهنم جزاء بما كانوا يكسبون ، يحلفون لكم لترضوا عنهم ، فأن ترضوا عنهم فأن الله لايرضى عن القـوم الفـاسـقين ) التوبه / ٩٥ ، ٩٦ . بخـاری و مسـلم ڕیوایەتیـان کردووە .

ئەو سوودانەی کە ئێمەی موسڵمان لە جەنگی تەبووك دا بۆمان دەردەکەوێت زۆر و بە لێشاوون ، بەڵام هەندێکیان بۆ بیرخستنەوە دەخەینە پێش چاو :

١ ـ کاتێ کە بیر بکەینەوە لـــە پێغەمبەر و موسڵمانەکان لەو کاتی گەرماو ســـەخڵەتی‌یە ! چۆن خۆیان خستە بەر ناڕەحەتی گەرما و ماندوو بوون و برسێتی و تینوێتی و تەپ و تۆزەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە بێزاری و بێ تاقەت بوونێك دەربڕن ، یاخـــود منەت بکەن بەسەر خوا و پێغەمبەر دا ، وە هەموو کاتێ لە خوا ئەپاڕانەوە لێیان ببوورێت ، وە هەموویـان وا ســـەیری خـۆیان دەکرد کە کـەم و کووڕی‌یان هەیەو لە ڕقی خوا دەترسان ، بەو پێ‌یە لەڕێی خوادا، بۆ بەرز کردنەوە و بڵاو کردنەوەی ئیـــسلام گیان و ماڵی خۆیـان بەخت ئەکرد ، خوایش یارمەتی ئەدان و سەری دەخستن .

ئەمە باری ئەوان ، ئەمەیش ئێمەین ، دەبینین دوژمنانی ئیـسلام بێجگە لەوەی بەشی زۆری وڵاتانی ئیسلامیان داگیر کردووەو بەرەو داگیر کردنی هەمووی دەڕۆن ، بێجگە لەمە دەبینین لە ناو ماڵ و خێزانی خـۆمانا غەزویان کردووین ! بیـرو باوەڕی گەلێکیان تێك داوین و کردووینیان بە پیاو و شوێن کەوتووی خۆیان ، هەر بـــە خۆمان ئیسلامیان پێ لابردووین لـە نـاو دڵو مێشکمانا ، لەســـەر زمان و لە گفتوگۆمانا ، لە بیر کردنەوە و لێ کۆڵینەوەمانا ، لە نـاو خێزان و کۆمەڵمانا ، لە خو و باو و پیشە و ڕێڵ و شێوازمانا ، لە بەرنامەی قوتابخانە و زانکۆ و خوێندگاکانمانا ، لە حوکم و فەرمان ڕەوایی و لە بەرنامە و پرۆگرامی ژیانمانا ـ ...

کەچی ئێمەش مێشێك میوانمان نیە ، بیرێك ناکەینەوە ، لەرزەیەك

به دەروونمانا نایەت ، وەکو بەر پرسیار نەبین و خوا موحاسەبەمان نەکات وایە . هێشتا بەمەیش ڕازی نابین ، بەڵکو ئەگەر یەکێك یا کۆمەڵێك هەڵسێ و هانمان بدا بۆ ڕاپەڕین و بەرزکردنەوەی ئیسلام بەسەر کوفر و کافرانا ، خێرا دەکەوینە پەلەو پەلەقاژە بۆ دەم کوت کردن و لەناو بردنی ، دەست دەکەین بە درۆ و دەلەسە هەڵبەستن و ناو و ناتۆرە پیاوتن و ناشیرین کردنی وە دڵمان ناحەوێتەوە تا ئەو دەنگە لە ناو نەچێت کپ نەبێتەوە .

ئیتر ناترسین و لامان وانیە کە هیچ هەڵسەو کەوتێکمان لەسەر پێویستە . کەچی دەبینین لە جەنگی تەبووك دا ئەوانەی بەشداری یان نەکردبوو تێکرا ئایەتی قورئانیان دەرباره هات ، ئەوانەی دوو ڕوو بوون خوا هەڕەشەی سەختی لێ کردنو لە جیهانا ئابڕوویان چوو ، ئەوانەی کە موسڵمانی ڕاست بوون ، هاو بەشی پەیمانی عەقەبە و جەنگی بەدرو جەنگەکانی تر بوون ، بەو پێیە زانیمان کە سزا دران و تاقی کردنەوەیەکی سەختی پڕ لە نا سۆری پەنجا شەوی یان بەسەرا تێ پەڕی ئەنجا خوا لێیان بوورد .

سەیر ئەوەیە ئەوەمان نوێژێ ، ڕۆژوویە ، زەکاتێ یا حەجێکی هەبێ خۆی لەیارە پیرۆزەکانی پێغەمەر بە کەمتر نازانێ و بە تەمای هاوڕێیەتی ئەوانە لە بەهەشتا ! ! !

٢ ـ دووڕووەکان : سروشتیان و مەترسی یان بۆ سەر ئیسلام :

خوای پەروەردگار لە سەرەتای سوورەتی ( البقرە ) دا تێمان دەگەیەنێت کە هەمیشە کۆمەڵ بریتی یە لە سێ بەش : موسڵمانی ڕاست و ڕاستەقینە ، کافری ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا ، دوو ڕوو و ناپاك . ئەم بەشی سێیەمەیان زۆر پیس و ناپاکن ، هەمیشە جێگای

بیم و مەترسیی بوون ، چونکە ئەمانە خۆیان بە موسـلمان پیشـان دەدەن و تێکەڵاوی موسـلمانان دەکەن و ئاگایان لە هەموو نهێنی و ئاشکرایی یەکەیانە ، لەگەڵ ئەوەدا لەناو دلاّ کافر و ناموسلمانن ، هەمیشە بە دزی‌یەوە هەوڵ و تەقەلا و ئاواتیان لەناو چوونی ئیسلام‌و موسلمانانە ، نهێنی‌یەکانیان ئاشکرا دەکەن ، چۆنیان بۆ بکرێت لە دژیان دەدوێن .

بۆیە قورئان لە زۆر شوێنا باسیان دەکات‌و مرسلمانان دەترسێنی لـە خراپە و دوژمنایەتی‌یان ، تـا موسلمانان تێ بگەن و ئاگادار و هۆشیاربن ، هەمیشـــە بیان ناسـن و چاودێری‌یان بکەن و نەیەڵن سەریان لێ تێك بدەن و دەست بخەنە ناو ئیش و کاریانەوە .

بە بۆنەی ئەم جەنگی تەبوو کەوە بێجگە لە ئایەتەکانی سـەرەوە گەلێ ئایەتی تر دەربارەی پیسی‌یان هات و باسی دەورە خراپەکانیان دەکات . ئەوەتە لەلایەکەوە دەفەرموێت :

ئەو ناپاکانە دلخۆشـــن بـە دواکەوتنیان لـە پێغەمبەر و نایانەوێ بجەنگن لەڕێی خوادا بەخەلکیش دەلێن : لەم گەرمایەدا نەچن بـۆ جەنگ و ... ( فرح المخلفون بمقعدهم خلاف رسول الله وكرهوا أن يجاهدوا باموالهم وأنفسهم في ســبيل الله وقالوا : لا تنفروا في الحر . قل : نارُ جهنم أشدحراً لوكانوا يفقهون ، فليضحكوا قليلاً وليبكوا كثراً جزاءً بما كانوا يكسبون،فأن رجعك الله الى طائفة منهم فاستأذنوك للخروج ، فقل : لن تخرجوا معي أبداً ، ولن تقاتلوا معي عـدواً ، إنكم رضيتم بـالعقود أول مـرة فاقعدوا مع الخالفين ) التوبه / ٨١ ـ ٨٣ .

وە لە لایەکی ترەوە هەر لەم سوورەتەدا ، زۆر بەگرنگ لـە هاڵ و هەواڵ و پیلان و ناپاکی دوو ڕووەکان دەدوێت‌و موسلمانیان

لێ دەترسێنێ کە : هیچ کاتێ لێیان دڵنیـا نەبن ، چونکە هەرچی بەسەر موسڵمانانیدا هاتووەو هەرچی‌یان بەسەرا دێت لە خراپەو بەڵاو نەگبەتی ، هەموو لە ڕێگەی ئەو درو ڕووانەوە بووە کە بەموسڵمان خۆیان دەدەنە قەڵەم ، لەگەڵ ئەوەیشـا مەترسـی ئەخەنە ناو دڵی موسـڵمانانەوە کۆمەڵیان تێك دەدەن ، پشێوی و ئاڵۆزی‌یان لە ناوا دروست دەکەن .

( لوخرجوا فيكم ما زادوكم إلا خبالاً ولأوضعوا خلالكم ، يبغونكم الفتنة ، وفيكم سـماعون لهم ، والله عليم بالظالمين ) التوبة / ٤٧ .

ئەوەی کە زیاتر جێگای مەترسی‌یە و پێویسـتە موسڵمانان زیاتر وریایی و ئاگاداری بکەن ئەوەیە کە ئەو ناپاکانە بە ناوی ئیسلامەوە دەچن بەگژی ئیسـلامدا ، هـەر بە چەکی خـۆی لێی دەدەن ، یاری بە یاساو مافەکانی دەکەن ، وە بـەو ناونیشـانەی برقەدارەوە وەکو چارەسـەری و نەرم و نیانی و سەربەستی و .... خەڵکی لە خشتە دەبەن ، چەند بەیان و فەتوای ساختە هەڵ دەبەستن و جورلانەوەی ئیسلامی دەم کوت دەکەن ، بەمانە لەگەڵ ئیسـلامـدا ئەجەنگن و گوایە بە لەناو چوونی ئیسلام اکی دڵیان ساڕێژ دەکەن ، ئاوانیان ئەهێننەدی و خۆیشـیان لای ئاغـاو ڕۆژی دەرەکانیان دەبـەنـە پێشـەوە .

جا لەبەر ئەمانە با موسڵمانان لە هەموو دەم و چەرخێکدا دەرس و پەند لەمەوە وەربگرن ، جارێك لە دوژمنی دەرەوە بترسن و هەزار جار لە دوژمنی ناو خۆیان ، وە لە پێشا بچن بەگژی ئەو دوژمنانەدا کە لە ناوەوە پشێوی و ئاژاوە دەنێنەوە .

ئەنجا با سەرنجێك لەوە بدەین کە پێغەمبەری خـوا جوولانەوەی لەگەڵ درو ڕووەکاندا زۆر نەرم ونیان بووە ، کەچی لەگەڵ سێ موسلمانە ڕاستەقینەکەدا ئەو هەموو توندو تیژی‌یەی بەکار هێنا !!!

هۆی ئەمەیش ئەوەیە توندو تیژی لێرەدا سـەرەتاو پێشـەکی خۆشی و ڕێز بوو ، ئەوەبوو بەو جوولانەوەیە تۆڵەو سزایان تەواو بوو ، چەند ئایەت لەشانیاندا هاتە خوارەوە باسی تەوبەو لێبووردنی کردن ، بەڵام خراو پێغەمبەر ئەم بەهرەو باشی‌یە بۆ ناپاکەکان ڕەوا نابینن ، بەڵکو درا ئەخرێن هەتا کاتێك کە گیردەخۆن و دەربازیان نیە ، جا لە بەر ئەمە باموسلمانەکان لە هەموو کاتێکدا ئاگاداربن و هەر کاتێ گوناهو خراپەیەکیان کردو تووشی ناخۆشی هاتن ، ئەوە خواهیشی خوا لەگەڵیاندا بە بەزەیی‌یە ، وە ئەگەر پێی هـەڵگران و خواری نەهاتە ڕێیان ئەوە لە ڕقو خەشمی خوا بترسن و پەشیمان ببنەوە تا توشیاری باری خراپ نەهاتوون .

وە لە لایەکی ترەوە سەیرکردنی هەڵوێـتی کەعبو هاوەڵەکانی لە ماوەی پەنجا ڕۆژدا با سەرمەشقی ژیان بێت بۆ هەموو موسلمانێك و پەندو ئامۆژگاری‌یان لێوە وەربگرن .

## بەشی شەشەم

### وتاری ماڵ ئاوابی
### ( خطبة الوداع )

لە پەڕاوی ( ژیان ) دا باسمان کرد : کە لە ساڵی دەیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا دوایین حەجی کرد ، کە بە حەجی ماڵ ئاوابی دا دەنرێت ، لەم حەجەدا کۆمەڵ و جەماوەرێکی گەورەی لە دەور کۆبووەوە ، بێجگە لە موسڵمانەکانی مەکەو دەورو بەری و یەمەن نەوەد ( یان سەدو چواردە ) هەزار موسڵمانی لەگەڵ بوو ، بە پیاو و ژنەوە ، لە ڕۆژی عەرەفە ( نۆیەمی مانگی ذي‌الحجة ) لە کەژی عەرەفە پێغەمبەری مەزن ـ دروودی خوای لەسەربێت ـ وتارێکی بەرزی پڕ لە کاکڵە و فەلسەفەی بۆ خوێندنەوە ، پیاوە دەنگ بەرزەکان دووبارەیان ئەکردەوە تا هەموو گوێیان لێ بێت .

لە بەر ئەوەی لە ( ژیان ) دا نەکرا بڵاوی بکەینەوە ، پشت بەخوا لەگەڵ هەندێ وردەکاری دا لێرەدا ئەیخەینە پێش چاو : پێغەمبەر ڕووی کردە جەماوەرەکە و فەرمووی :

( مرۆڤەکان : وتەکانم ببیستن و وەریان بگرن ، چونکە نازانم ، لەوانەیە لەم ساڵ بەدواوە ئیتر هەرگیز لەم شوێنەدا پێتان نەگەم ئەی خەڵکینە : بزانن خوێنتان ، ماڵتان لەیەکتری حەرامە ، وەك حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتانا لەم شارەتانا هەموو شتەکانی دەوری نەفامێتی لە ژێر پێمایە ، خوێنی دەوری نەفامێتی ڕۆیشتووەو ـ تۆڵەی ناسنرێت ـ یەکەم خوێنێ کە بە ڕۆیشتووی دابنێم خوێنی ( ربیعة )ی کوڕی ( حارثە ) یە ، سووکاری نەفامێتی بەناڵە

ـ سووەکەی ناسێنرێت ـ یەکەم سوویەك کە بەتاڵی دابنێم سووی ( عباس )ی کوڕی ( عبدالمطلب )ە .

مرۆڤەکان : شەیتان تازە بێ هیوا بووە لەوەی کە لەم وڵاتانەدا بپەرسترێت ، بەڵام ئەگەر لەو کردەوانەتانا کە بە سووك و بێ بایەخ سەیریان ئەکەن پەیڕەوی بکەن ڕازی دەبێت ، لێی بترسن دەربارەی ئایینەکەتان .

خەڵکینە : دواخستن و پێش و پاش خستن و ئاڵوگۆڕ کردن لە کات و مانگدا و دەست کاری کردنی ئیش و کار ( النسيء ) زیادە ڕەوی‌یە لە کوفرا و کافرەکانی پێ گومڕا دەبن ، ساڵێك بە حەڵاڵ و ساڵێك بە حەرامی دادەنێن ، تاڕێکی ئەخەن لەگەڵ ئەو مانگانەدا خوا بە حەرامی داناوون ، ئەوان حەڵاڵی خوا بە حەرام و حەرامی بە حەڵاڵ دادەنێن ، کات و چەرخ بەشێوەیەکی نەگۆڕا و دەگەڕێت لەوەتی خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ، ساڵ دوانزە مانگە ، چواریان حەرامن ، لەم چوارە سیانیان پێکەوەن : ( ذی القعدة و ذی الحجة و محرم ) ئەوی تریان ( رجب )ە کە بە تەنهایە موسڵمانەکان لەخوا بترسن دەربارەی ژنان ، بە ئەمانەتی خوا دەستان کەوتوون ، بە فەرموودەی خوا حەورەتیانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ کردووە ، ئێوە مافتان هەیە بە سەریانەوە ئەوانیش مافیان هەیە بەسەر ئێوەوە ، مافی ئێوە لە سەریان ئەوەیە : بێ پرس و ئیزنی ئێوە ڕێگا نەدەن بەرانەی پێتان خۆش‌نیە بێنە جێگا و ماڵتان ، ئەگەر ئەوەیان کرد لێ‌یان بدەن بە جۆرێك زیانیان پێ‌نەگات ، وە مافی ئەوان بەسەر ئێوەوە ئەوەیە : بە شێوەیەکی شیرین ڕزق و ڕۆژی‌یان بدەن و بەرگیان بۆ بکەن .

مرۆڤەکان : وتەکانم وەرگرن ، وا من گەیاندم بە ئێوە ، من

شتی واتان بۆ بەجێ ئەهێڵم ، هەتا ئێوە دەستی پێوە بگرن ( واتە پەیڕەوی بکەن ) هەتا هەتایە سەرتان لێ تێك ناچێت و تووشی خراپە نایەن ، ئەوەیش بریتیە لە : قورئان ـ کە فەرموودەی خوایە ـ و ڕەوشت و ڕێگای پێغەمبەری خوایە .

مرۆڤەکان : ببیستن و گوێ ڕایەڵی بکەن با بەندەیەکی حەبەشی بەلوت براویش بکرێنەکار بە دەستان ، مادەم بە گوێرەی فەرمانی خـوا فەرمانتان لە ناو بکات .

بەندەکانی ژێر دەســـتان ، بەندەی ژێر دەســـتانن لە خۆاردنی خۆتانیان بدەنێ ، لە بەرگی خۆتانیان بۆ بکەن ، ئەگەر تاوانێکیان کرد ـ نەنان ویست لێیان خۆش بین ـ بیان فرۆشـن ، ئەوانیش بەندەی خوان لێیان مەدەن و سزایان مەدەن .

مرۆڤەکان : وتەکەم ببیســـتن و وەری بگرن ، ئەویش بـزانن موسڵمان برای موسڵمانە ، موسڵمانەکان برای یەکن ، ماڵی کەس بۆ کەس حەڵاڵ نیە بە ڕەزامەندی دڵی خۆی نەبێت ، کەواتە زوڵم لە خۆتان مەکەن ، خوایە ئایا گەیاندم ؟ وە لە پاشەڕۆژدا ئەگەن بە خزمەت خوای خۆتان ، نەکەن دوای من بگەڕێنەوە بـۆ سـەر لێ شێواوی ، هەندێکیان بدات لە گەردنی هەندێکیان !!! بائەوانەی لێرە حازرە بی گەیێنێت بەوانەی لێرەنین ، خۆزیکە هەنـدێ بەوانەی لێرە نین باشتر لێی تێی بگات لەوانەی لێرەن ، ئێوە دەربارەی من پرسـیارتان لێدەکرێت، ئایا چۆن وەڵام دەدەنەوە؟وتیان:شایەتی دەدەین کە تۆ گەیاندت و ئامۆژگاریت کردو پێویستی سەرشانت بەجێهێنا .

پەنجەی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و پاشان بۆ خەڵکەکەو فەرمووی خوایە بە شایەت بە( سێ جار ) (١)

---

(١) مسلم صحیحدا لە جابرەوە ڕیوایەتی کردووە .

پێغەمبەری خوا - دروودی لە سەربێت - لە ڕێی ڕزگار کردنی هەموو ئادەمی‌یەکانا ، بۆ بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلام - بەرنامەی ژیانی ئادەمی‌یەکان - بۆ دامەزراندنی ڕژێمی پڕ لە سوودی خوایی ماوەی بیست و سێ ساڵی ڕەبەق هەڵسایە سەرپێ‌و هەوڵی دا ، بێ‌وچان تێکۆشـان و هەموو جۆرە سـزاو ئازارو سەرماو گەرماو دەردی سەری‌یەکی چەشت ، بێ‌ئەوەی کول‌بێ یان کۆڵ بدات ، تا بەیارمەتی خوا ، توانی یاسـاو بەرنامەیەکی خوا بە مەردم ڕابگەیەنێت ، وە ڕژێمێکی ڕێك‌و پێك دابمەزرێنێت‌و کۆمەڵێکی گەورەی ڕاستەقینەی خاوەن بیرو باوەڕ دروست بکات ، وە مەشخەڵی ئازادی‌یان بداتە دەست ، هەموو ڕێ و شـوێنێکیان پیشـان بدات ، چەند جارێك پەراوەیان پێ‌بکات ( اليوم اكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا ) المائده / .

لێرەدا تێ‌گەیشت کە گەڕانەوەی بۆلای خوای پەروەردگار نزیك بووەتەوە و ئیشی لەسەر زەوی‌دا نەماوە ، بۆیە ویستی بۆ دواین جار ڕوو بە ڕوو لەگەڵ بەشی زۆری یارو شوێن کەوتووەکانی بدوێت ، لەم کاتەدا بیریان بخاتەوە کە ئەوانە کێن ؟ ئەرکی سەرشانیان چی‌یە ؟ تا هەندێ لە یاسا بنچینەیی‌یەکانیان بیر بخاتەوەو بیان کات بەشایەت لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی ، کاتێ بۆ ئەم کۆمەڵە دەدوا ، سەیری دەکردن‌و لە پشتی ئەمانەوە بەرەو کۆمەڵەکانی دوایی دەبینی ، لەگەڵ هەموو موسڵمانێکدا ، بەڵکو لەگەڵ هەموو ئادەمی‌یەك دەدواو خاڵەکانی بۆ دیاری دەکردن‌و پەنجەی بۆ ڕادەکێشان ، وە ئەم وتارە ناونرا وتاری ماڵ ئاوایی .

لە بەندی یەکەمی وتارەکەدا وە لە بەشی دواییشیا ئەوەی ڕوون کردەوە کە موسڵمانان برای یەکن - بانەتەوەو وڵات‌و زمان‌و ڕەنگ‌و

نەژادیشیان جیاوازبێت ـ خوێن و ماڵی یەکتریان لێ حەرامە ، مەگەر بە ڕەزامەندی دڵی خاوەنی بدرێت . ئەگەر موسڵمانەکان ـ بەڵکو مرۆڤەکان ـ بەڕاستی تەنیا پەیڕەوی ئەم بەندە بچکۆلەیان بکردایە ، دەیان توانی لەم جیهانەدا بەهەشتێکی پڕ لە خۆشی و کامەرانی دروست بکەن ، بەهێمنی و بەختیارانە تێیدا بژین ، وە هەرگیز خراپەو ناڕەوایی و پشێوی و ترس و بیم ڕووی تێنەکردن ، وە ئەم گێژاو و تەم و غەم و تاریکایی یەی ئێستە ، لەم کاتی شارستانێتی ماددی ڕۆژئاوایە کەجیهانی یەکسەر داگیر کردووەو مرۆڤەکانی پێچاوەتەوە ، ئەمانە هیچیان ڕوویان نەدەدا ، وە گورگ و مەڕ بە برایانە پێکەوە ئاویان دەخواردەوە .

ئەگەر هەموو کەس بەچاوی برایەتی و یەکسانی سەیری ئادەمی یەکان بکات ، دڵسۆزیان بێت ، وەکو برای خۆی هەوڵی خۆشی و بەختیاری یان بۆ بدات ، هاریکاریان لەگەڵدا بکات ، لەبەر زمان ، یا ماڵ ، یا نەژاد یا زانیاری ، یا پلەو پایەی کۆمەڵایەتی خۆی لە کەس بە گەورەتر نەگرێت ، ئەگەر کەس تەماع نەکاتە ماڵ و ناموس و خوێن و لاشەی کەس ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ـ بە پێی یاسای برایەتی ـ هەوڵی سەرکەوتن و پاراستنیان بدات ، ئەبێ شەڕ و هەراو پشێوی و ئاژاوەو ترس و بیم و ناخۆشی و ئاڵۆزی و نیگەرانی لە سەرچی و لە کام لاوە و بە چ ڕێگایەکدا بێتە ناو کۆمەڵەوە ؟!!

بەڵێ ئەگەر ئێمە موسڵمان بووینایەو پەیڕەوی بەرنامەو یاساکانی ئیسلامان بکردایە کۆمەڵێکی نموونەیی بەختیارو پێشکەوتوو و پڕلە تام و مەزەو خۆشی و هێمنی دەبووین و لە پێشەنگی کاروانی شارستانێتی یەوە سەرمەشق دەبووین بۆ هەموو کۆمەڵەکانی جیهان .

بەڵام ـ بەدبەختەوە ـ لە زووەوە ئەم یاسایەی ئیسلامەمان ـ وەکو زۆر لە یاساکانی تری ـ خستووەتە پشت گوێو پەخەمان لێ هەڵ تەکاندووە ، بۆیە ـ وەکو دەبینین ـ هەرچی خۆشیو هێمنیو بەختیاری‌یە لە ناومانا هەڵگیراوەو سەرمان لێ شێواوەو هەر ڕۆژ تووشی بەزمێکی تازەو بەندێکی ئاڵۆزاوی نوێ دەبین ، هەر دەمەی لاپەڕەیەکی ڕەشتر لە جاران لە ژیانماندا هەڵدەدرێتەوەو جیهانی بەرینمان لێ هاتۆتەوەیەك ، ڕۆژی ڕووناکمان لێ بووە بەشەوە زەنگو ماناو تامی مرۆڤایەتیمان تێدا نەماوە ، هەر ساتەی سەد جار ئاوات بە مردن دەخوازین !!!...

ئاشکرایە بۆ ڕزگار بوونمان لەم بارە نالەبارە ، پەلە قاژەکردن بەملاولادا ، سەرکردن بەکۆشی ئەمو ئەودا ، هانا بردن بۆ خۆرهەڵاتو خۆر ئاوا دادمان نادات و تیماری برینمان ناکات و ئەو بۆشایی‌یە گەورەیەمان بۆ پڕ ناکاتەوە ، چونکە ڕێگەی ڕزگاریمان تەنیا ئیسلامە ، تەنیا گەڕانەوەیە بۆ سەر بەرنامەکەی خوای گەورە ، بۆ سەر ڕێگاو ڕەچەو ڕەوشتی شرینی پێغەمبەر ـ بە هەزاران دروودی لە سەر بێت ـ کە دەیزانی ئێمە لە ڕێگاکەی لا دەدەین و تووشی هەزار ئازارو ئەشکەنجە دێین ، بۆیە جار لە دوای جار دەی فەرموو : ( ئایا گەیاندم ؟ ) بەڵێ بەخوا ئەی پێغەمبەر تۆ بە تەواوی گەیاندت ، بەڵام ئێمەی سەر لێ شێواو گوێمان نەدایەو لامان دا لێی و ئا بەم جۆرە بەگیر هاتین .

وە لە بەندی دووەمدا بە باگی بەرز گەیاندی بە جیهان و بە تەواوی مرۆڤایەتیدا کە ئەو خوو ڕەوشت و پیشە نالەبارانەی لە سەردەمی نافامێتی ـ کە مەردم شانازی‌یان پێوە دەکردن ـ وەکو یاسای دەمار گیری‌و نەتەوە یان ( تیرە ) پەرستی و فاشێتی و نازێتی‌و خۆ هەڵکێشین بەسەر مەردما بە هۆی جیاوازی زمانو نەژادو ڕەنگەوە ،

یا وەکو دەست گرتن بەسەر خاکو ئاو و ولاتو ماڵ و سامانی خەڵکدا بە هۆی زوڵمو زۆر یا سوو کاری‌یەوە ... ئەمانە هەموویان دەوریان بەسەر چوو و ڕۆیینو باویان نەما ، ئێستە کە دەوری ئیسلامەوە ، دەوری یاساو بەرنامەی خوایی‌یە ، دەوری مرۆڤایەتی ڕاستەقینەیە ، جێگەی ئەوانە تازە ناوسکی زەوی‌و ژێر پێی موسڵمانەو گوڕ کراوون ، « هەموو شتێکی نەفامی لە ژێر پێمدایە ... خوێنی دەوری نەفامی ڕۆیشتووە ... سووکاری نەفامێنی بەتاڵە » .

هەر کەس بگەڕێتەوە بۆ سەریان زەوی گۆڕستان هەڵبداتەوەو دەریان بێنێتو بیان کاتەوە بە باوی ناو کۆمەڵ ـ وەکو لەم دەوری شارستانێتی ماددی‌یەی خۆر ئاوادا کراوە بە باوی سەر زەوی ـ ئەوە نەفام و کۆنەپەرستەو بۆ دواوە دەگەڕێتەوە ، هەر چەند بەناوی شارستانێتی‌و مرۆڤایەتی‌و پێشکەوتنەوە بیکات . دیسان ئەو کەسە ( یان ئەو کۆمەڵە ) موسڵمان نیەو لە نیشتەجێکانی دۆزەخ دەبێت ، با نوێژ بکاتو ڕۆژوو بگرێتو خۆی بە موسڵمان دابنێت . وەکو لە فەرموودەدایە(۱) .

وە لە بەندی سێیەمدا دەری‌خست کە کاتو چەرخ شتێکی دامەزراو و نەگۆڕە ، وە ئەوەتەی خوا ئەم بوونەوەرەی دروست کردووەو زەوی جیا کردووەتەوە تا ئێستە وەهەتا هەتایە گەڕانی زەوی‌و دروست کردنی شەو و ڕۆژ و ساڵ و مانگ بە شێوەیەکی ڕێكو پێكو نەگۆڕاوە ، ساڵ دوانزە مانگ و هەر مانگەیش لە شوێنی خۆی‌دایە ، نابێ ئاڵو گۆڕو پاشو پێشیان تێدا بکرێت ... ئەمە یاساو فەرمانی خوای گەورەیە ، وە دانانی بەرنامەو نەریت و یاساو ڕژێم تەنیا هەر بۆ ئەوەو بۆ کەسی تر ڕەوانیە دەستیان تێ

(۱) سەرنێك لە کتێبی ( لە دەروازەی ئیسلامەوە ) بلە ل ۱۳۰ ـ ۱۷۰ .

بخات ، هەر کەس سەرپێچی لەمە کردو دەستی کرد بە ئاڵو گۆڕ کردنی یاساو بەرنامەی خوا ، یان سەربەخۆ خۆی یاسا و بەرنامەی داناو نەریتی ڕێك خست ، ئەوە خۆی بەخوا داناوە و دەستی خستوەتە ئیشی خواوەو لە ڕاستی لای‌داوە ، بۆیە بەوە دەبێتە کافر ، وە ئەگەر لە لایەکی ترەوە کافر بووبێت بەمە زیادی دەکات و کوفر دەخاتە سەر کوفر ، هەر کەسیش باوەڕی پێ‌بکات‌و ئیشەکەی بەڕاست دابنێت ، ئەوە بت پەرستەو هاوەڵی بۆ خوا داناوە .

زانایان دەڵێن : بت پەرستەکان هەر ساڵە لە مانگێکدا حەجیان دەکرد ، بەڵام ئەو ساڵەی کە پێغەمبەر حەجی کرد لە مانگی ( ذي الحجة )دا بوو ، کە شوێنی حەجە ، لێرە دا پێغەمبەر ویستی تێیان بگەیەنێت کە کات‌و مانگ‌و چەرخ شتێکی دامەزراوە ، ئاڵو گۆڕی تێدا ناکرێت ، ئەبێ حەج هەر لەم مانگەدا بێت کە مانگی ( ذي الحجة ) یە ، وە ساڵ دوانزە مانگە ، چواریان حەرامن و حورمەت گیراون و جەنگ‌و هەرایان تیادا هەڵناگیرسێنرێت : ، ( ذي القعدة و ذي الحجة ومحرم ) بە شوێن یەکەوەن ، وە (رجب) تاکە کەوتۆتە نێوان (جماى الآخر) و (شعبان) ەوە ، ئەم مانگانە نابێ بگۆڕێن و بخرێنە شوێنی یەکترەوە بت پەرستەکان بە گوێرەی ئیش‌وکاریان مانگەکانیان دەگۆڕێ ، هەرکاتێ بیان ویستایە سەرۆکێکیان ئەی‌وت : ئەمساڵ (محرم صفرو صفر محرم) بێت ، یان (رجب شعبان و شعبان رجب) بێت ، بۆ ئەوەی جەنگ لە مانگە یاساخەکانا بکەن . جا لێرەدا پێغەمبەر دەری خست کە ئەم جۆرە ئیشانە دەستکاری کردنە لە ئیشی خوادا ومرۆڤی پێ کافر دەبێت‌و کوفر دەچێتە سەر کوفر . وە ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە دانانی بەرنامەو فەرمان‌و یاساو نەریت لە خۆوە و بێ ئەوەی لە

بەرنامەی ئیسلامەوە وەرگیرا بێت کوفرەو دانەری پێ کافر دەبێت، وە شوێن کەوتووەو باوەڕ پێ هێنەرەکانی کافرن . بەکافر دادەنرێن لە کاتی هاتنی ئیسلامدا ژنان لە پلەیەکی بێ نرخو بەهاو بێ بایەخدا دەژیان ، بگرە هەر بەئادەمی دانەئەنران ، وە لە هەرچی مافی مرۆڤایەتی هەیە بێ بەش بوونو لە هەموو ڕوویەکەوە زوڵمو زۆریان لێ دەکرا . بەڵام ئاینی ئیسلام ژنی بردەوە شوێنە ڕاستەقینەکەی خۆی : کە نیوەی کۆمەڵن ، خوشکی پیاو ، خانمی ماڵەو ، لەلەی منداڵو ، مامۆستای یەکەمی کۆمەڵنو ، جێگای ڕێزو بەزەییو حورمەتن ، وە هەموو جۆرە هەقو مافێکی بۆ بڕیار دان ، شان بەشانی پیاو کردنی بەلێ پرسراوەو سەرپەرشتی کەری کۆمەڵ . یان دەڵێن : لە نێوانی خنکاندنو زیندە بە چاڵ کردنی نەفامێتی پێشوو و بەرەڵا کردنی نەفامێتی نوێدا ، لە نێوانی ئەم دووانەدا لە شەرێنی مافو ڕێزدا ، ژنانی بەڕێزەوە دانا ، وە لەم ڕووەوە گەلێك یاساو فەرمانی دەرکرد ، جا لەبەر ئەوەی موسڵمانەکان تازە لەو یاسا ستەمکاریانە ڕزگاریان بوو بوو لە بەندی چوارەمی وتارەکەیدا بیری خستنەوە کە باری ژنان بە گرنگ بگرن ، وە ژنان مافی ڕەوای خۆیان هەیە ، هەر وەکو ئەرکیان لەسەر شانە ، جا پێویستە ئەم خەڵە بە گرنگ بگیرێت ، مافیان لێ زەوت نەکرێت ، ئازارو سزا نەدرێن هەتا ئەوان بە ڕێگەی ڕاستا بڕۆن ، وە لەولایشەوە نابێ بەرەڵا بکرێنو گوێیان نەدرێتێ ، تا بە ئارەزووی خۆیان بەرگ بپۆشن ، بۆ ئەملاو ئەولا بچن ، هاوڕێیی ئەمو ئەو بکەن ، وە بێ پەردەبن لە ئیشو کاریانا ، ئەبێ پیاوو ژن هەریەکەیان لە سنووری دیاری کراوی خۆیاندابن کەسیان دەست درێژی نەکاتە سەر ئەوی تریان (١) .

---

(١) سەیری ( لە دەروازەی ئیسلامەوە ، وەختێزانی بەختیار ) بکە .

وه له بەندی پێنجەمدا ڕۆشنی کردەوه : که مرۆڤەکان تا لەسەر بەرنامەو بیرو باوەڕی ئیسلام بڕۆن و لێی لا نەدەن و به تەواوی یاساو فەرمانەکانی ببەن بەڕێوه ، تووشی سەرشێوان و گیروگرفت و کۆسپ و گرێی ژیان نایەن ، وه هەرچی سەر شێوان و تەنگ و چەڵەمەی ژیانه تەنها به هۆی لادانی کۆمەڵه له ئیسلام و لەسەرچاوه ڕاست و ڕوونەکەی ئیسلام ، که قورئان سوننەتی پێغەمبەره .

ئەگەر ئێمه به وردی بیرێك له ڕابردوو و ئێستای خۆمان و کۆمەڵەکەمان بکەینەوەو سەرنجێکی ئەو پێ گیران و گیروگرفتانه بدەین کەوا جیهان بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی پێوەیان گیرۆده بوون ، وه ئەم بارەیش لەگەڵ یاساو فەرمانەکانی ئیسلام بەرابەری پێ بکەین و به ترازووی ئیسلام بیان کێشین ، بەئاشکرا تێ ئەگەین که هەرچی هاتووەته ڕێمان هەمووی بەهۆی لادانمانەوەیه له قورئان و سوننەتی پێغەمبەر .

وه ئەگەر چەند هەنگاوێك بگەڕێینەووه دواوەو چاوێك به مێژووی ئیسلام و موسڵماناندا بگێڕین ، تێ ئەگەین که له ماوەی فەرمانڕەوایی ڕاستی ئیسلامدا سەر زەوی وەکو بەهەشت وابوو ، ژیان ئاسوودەو هێمن و لەسەر خۆ بوو ... زوڵم و زۆر و کوشتن و بڕین و لێدان و داگیر کردن و دزی و درۆزنی و خیانەت و ترساندن و بێ ئابڕووی ... هتد نەبوو .

مرۆڤەکان له حاستی یەك دڵپاك و سینه ساف بوون ، دڵسۆز و برای یەکتر بوون ، گیانی خۆشەویستی و بەتەنگ یەکەوه هاتنیان ... هتد سەر زەوی داگیر کردبوو ، مرۆڤ هەموو بەئیش و کارو بەرژەوەندی خۆیان و کومەڵەوه خەریك بوون ، پلەی کۆمەڵ لەهەموو ڕوویەکەوه

لە بەرژەوەندیدا بوو موسڵمانەکان لە پەرەسەندنا بوو ، ئاسایش‌و بەختیارو خۆشی باڵی سەوزی بەسەر زەویدا کێشابوو ، هەر دڵەی هەزار دڵ شەیدای دەبوو . بێ‌گومان دوژمنانی ئیسلام‌و داگیرکەران بەمە دڵگران ئەبوون ، نەیان ئەویست ئەم خۆشی‌و کامەرانی‌یە ببێتە کاڵای باڵای موسڵمانانو ئەوان بەو پێ‌یە لە تاریکایی‌و بێ دەسەڵاتی‌دا بژین ، بۆیە هەوڵیان دا لەکاتی بێ‌ئاگایی‌و نوستنی موسڵمانەکاندا ، لەکاتی دانیشتن‌و کەمتەرخەمی زاناو پێشەواکانا هەلیان بۆ هەڵکەوت ، وردە وردە کەوتنە کەنە کردن لە ئیسلام ، بەناشیرین کردنی لە بەرچاوی ڕۆڵەکانی ، بەپیلان ڕێکخستن بۆ دوور خستنەوەی موسڵمانەکان لە ئیسلام‌و قورئان ، تا توانی‌یان سەریان لێ بشێوێنن ، ئەوساکە بە ئاسانی داگیریان کردن‌و سواری تەوقی سەریان بوون ، وە ئەوەی کە بەنرخ بێت لە ماددەی خاوو دەرامەت‌و بەرو بووم بردیان بۆ خۆیان‌و ئەمانیش زەقەی چاویان دێت ، وە بۆ ئەوەی نەوەك ڕۆژێ لە ڕۆژان بیر بکەنەوە ، لە خەوی بێ‌ئاگایی ڕاچەنێن‌و بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان ، بۆ سەر شەقامی پان‌و بەرینی ئیسلام چەندەها جۆر دەردو نەخۆشینی ژەهراوی‌و کوشندەیی بیری‌و ڕەوشتی‌و دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌یان لە ناوا بڵاو کردوونەوە کە هەتا هەتایە ڕزگاریان نەبێت لێ‌یان‌و سەر ئەمانیان نەپەرژێت ، قورئانیش دەفەرموێت :

( إن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم ) الرعد / وانە : تا نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئیسلام خوا باریان ناگۆڕێت .

کەواتە دەرمانی دەردیان تەنیا ئیسلامە ، هەزاران درودو سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر کە دەفەرموێت : ( شتێکتان لە ناوا بەجێ دێڵم ئەگەر پەیڕەوی بکەن هەتا هەتایە سەرتان لێ تێك ناچێت ،

قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ) واتە بیرو باوەڕو بەرنامەی ئیسلام .

وە لە بەندی شەشەمدا پەیوەندی نێوانی گەلو کاربەدەستی دیاری کرد لەگەڵ مەرجی کاربەدەستا ، پێویستە لە سەر ئەندامانی گەل بیستنو گوێ ڕایەڵی کردن ، با فەرمانڕەوا لە هەر بەرەبابو نەژادێك بێت ، بە مەرجێك فەرمانەکانی بە گوێرەی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر بێت .

ئەبێ کاربەدەستی ئیسلام بە ڕەزامەندی زۆربەی موسڵمانان کرابێت بە کار بەدەست . وە ئەبێ یەکێك بێت لە موسڵمانەکانو پایەو ئەرکەکانی ئیسلام بەجێ بێنێت ، وە ئەبێ لە مەیدانی کاربەدەستی دا شوێن کەوتووی ئیسلام بێتو یاساو فەرمانەکانی بە پێی بەرنامەی ئیسلام بنو لێیان لانەدات . تا لەم کاتەدا پێویستە لەسەر موسڵمانان و ئەندامەکانی گەل لە دەوری کۆببنەوەو یارمەتی بدەنو گوێ ڕایەڵی هەموو فەرمانەکانی بکەن ، وە ئەگەر یەکێك ( یان کۆمەڵێك ) لایداو لە فەرمانی دەرچوو و گوێ ڕایەڵی نەکرد ، ئەوە لە فەرمانی دەوڵەتی ئیسلامو لە فەرمانی خوا دەرچووەو بە یاخی بوو ئەناسرێت ، پێویستە بهێنرێتەوە سەر ڕێگاو بەر فەرمان بکرێت ، با جەنگیشی لە سەر هەڵگیرسێت ، وە ئەگەر کار بەدەست ئەو مەرجانەی تیا نەهاتبوونە دی ، یان لە فەرمانەکانیا لە ئیسلام لایدا ، ئەوە کاربەدەستی موسڵمانان نیە ، نابێ گوێ ڕایەڵی بکرێت ، وە نابێ لە دەوری کۆببنەوە ، بەڵکو گێڕانەوەی بۆ سەر شەقامی پاكو پۆڕی ئیسلام پێویستە ، ئەگەر ئەمە نەکرا لە ناو بردنیو دانانی کار بەدەستێکی ئیسلامی ئەبێتە ئەرکی موسڵمانان (١) .

---

(١) سەرێك لە ( دەروازەی ئیسلام ) بدە ل ١٢٧ — ١٣٢ .

وه له بەندی حەوتەم و کۆتایی‌دا فەرمووی : ( با ئەوەی بیستی بیگەیەنێت بەوانەی نەیان بیست .... ئێوه دەربارەی من پرسیارتان لێ دەکرێت ، ئایا چۆن وەڵام دەدەنەوه ؟ ) وتیان ( شایەتی ئەدەین که تۆ گەیاندت ) سێ جار فەرمووی : ( خوایه به شایەت به ) .

بەمه قورسایی باری سەر شانی زانایان و کار به دەستانمان دێنه دەست ، ئەوەیه خواو پێغەمبەر و مرۆڤەکان هەموو ئەیانزانی که پێغەمبەر بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ هەوڵی داو بانگەوازی کردو بانگی خوای به مەردم ڕاگەیاند به بێ سستی‌و کول بوونو کۆڵدان ، وه نەی دەهێشت هیچ جۆره هەلێکی له کیس بچێت‌و ئامۆژگاری بەجێی تیا نەکات ، کەچی لەگەڵ ئەمەدا له خۆی ئەترسا کەم و کووڕی بووبێت ، یـا کەمتەرخەمی کردبێت لـه بانگ کردن و ئامۆژگاری‌دا ، یان ویستی پەندی مرۆڤایەتی دابدات ، ئەوەته ئەو جەماوەره دەکات بەشایەت‌و ڕوو دەکاتـه خوای پەروەردگار و دەفەرمووێت : ( خوایه به شایەت به ) .

خۆ ئاشکرایه زانایانو کار بەدەستان جێ‌نشینی پێغەمبەرن ، ئەبێ شوێن پێغەمبەر بکەون له بانگ کردنو بانگەوازی خوادا ، ئـەبێ نەترسن ، به حیکمەت‌و وردی‌و ژانی ئایینی ئیـسلام هەموو کاتێ به مەردم ڕابگەیەنن ، لەم ڕێگەیەدا تەنها سەیری بەرژەوەندی ئیسلام بکەن ، وەخەڵکی به تەواوی له بەرنامەو یاساو نەریتەکانی ئیسـلام حاڵی بکەن .

جا با زانایان بیرێك له ژیانی پێغەمبەرو له دەوری خۆیان بکەنەوه با ئەگەر کەمو کووڕی‌یان بوو تەوبەی لێ بکەن ، تا له دەستیان نەچووه بێنه مەیدانی بانگ کردنو خەبات‌و خۆ ڕەنجاندنو شوێن کەوتنی پێغەمبەرەوه ، وه با له کۆتایی‌دا سەرنجێك لەم ئایەته گەورەیه

بدەن بە تەأویل تیاکردن خۆیان نەخەڵەتێنن : ( إِن الذين يكتمونه ما أنزلنا من بينـــات والهدى مـن بعد مـا بيناه للناس في كتاب ، أولئك يلعنهم الله ويلعنهم اللاعنوان ، إلا الذين تابوا ، وأصلحوا ، وبينوا ، فأولئك أتوب عليهم ، وأنا التواب الرحيم ) البقرة / .

# بەشـــی حەوتەم بریتی‌یە لـە دوو بەنـــد

بەندی یەکەم :

## شـــێوەو ڕەوشـــتی پێغەمبەر

شێوەی شیرینی پێغەمبەری خوا ( محمد ) ی کوڕی ( عبدالله ) ـ بە هەزاران درورودی لە سەربێت ـ وەکو لەکتێبی مێژوو و ســـیرەدا باس کراوە :

پێغەمبەری خـــوا میانە پیاو بووە ، نـــە کورت‌و نە درێـــژ ، بەلای درێژی‌دا زیاتر بووە ، سنگ پان‌و ئێسك‌و جومگە ئەستوور بووە ناو چاوی پان بووە ، سەری گەورە نەك زۆر گەورە ، برۆی ڕەش‌و قەیتانی بووە ، بۆشایی‌یەکی کەم لەناوەندی برۆکانیا بووە ، چاوەکانی ڕەش و گەش بوون ، لە سپێنەی چاویا هێڵی سوور بووە ، برژانگی ڕەش‌و تیژبووە ، لوتی درێژو باریك‌و تۆزێ چەماوەبێ بووە ، ڕوو و کولمی ڕێك‌و خڕو بێ چاڵ‌و چرچ‌و بەرزی‌و نزمی بووە ، ددانەکانی وردو سپی‌و کەمێ شاش بوون ، لێوی قەیتانی بووە ، مووی ڕەش‌و پڕ بووە ، ڕەنگی سپی بووە ، زەردی‌یان سووری تیا دیار نەبووەو زۆریش سپی نەبووە ، سنگی لەگەڵ ورگیا ڕێك بووە ، هێڵی مووی جوان لە سنگی‌یەوە تا ناوکی کشاوە ، دەستی درێژ بووە ، ژێرپێی ڕێـــك بووە ، مووی ســەری درێژ دەبوو تا دەگەیشتە نەرمایی گوێی ئەنجا دەی تاشی ، سمێڵی دەقرتاندو ڕیشی بەر ئەدایەوە ، گەردن و ملی نەکورت نە درێژ بوو ،

ئـەت وت : زێڕو زیوەو هەنـاو ائێی داوە ، لــە بەژنو باڵاو شێوەو ڕەنگتو ڕوویا جوانترین وێنەو شیرینترین شێوەی بووە ...
کابرای بت پەرستی دەشتەکی ئەهانە لای کە چـاوی پێی دەکەوت ئەی وت : بەخوا ئەمە ڕووی درۆزن نیە ، زۆر لە یارەکانی لێی دوواونو هەرچییان کردووە نەیان توانیوە باسی تەواوی بکەن ،..
( براء ) ی کوڕی ( عازب ) ئەڵێ : لە پێغەمبەری خوا جوانترو شۆختترم نەدیوە . ( أبو هريرة ) ئەڵێ جوانی وەکو پێغەمبەرم نەبینبوە ، ئەت وت : ڕۆژ لە ڕووی ئەو هەڵدێت ، کە پێ ئەکەنی ئەتوت : مرواری لە دەم هەڵدەوەرێت . ( إبن ابي هاله ) ئەڵێ : ددمو چاوی ئەدرەوشایەوە ، وەکو مانگی شەوی چواردە پرشەی لێ ئەدا .

( علی ) کوڕی ( أبو طالب ) ئەڵێ : هەر کەس لە ڕێوە ئەی بینی لێی ئەترسا ، بەڵام کە لەگەڵی ڕائەهات شەیدای ئەبوو .

خاتوو ( عائشە ) ئەڵێ : شـــەوێك بە بێ چرا لە ژوورەکەی خۆما بووم ، دەرزی یەکم گووم کردبوو ، نەم ئەدۆزی یەوە ، پێغەمبەری خوا - درودی لە سەربێت - هات بەماڵا ، ژوورەکەی ڕووناك کردەوەو دەرزی یەکەم دۆزی یەوە ، وتم خاوێنی هەر بۆ خوایە ، نامەخوا چەند شیرینو جوانیت .

فەرمووی : هاوار بۆ ئەو کەسەی لە ڕۆژی دوایی دا نام بینێت ، وتم گوایە کێ نات بینێت ؟ فەرمووی : لای هەر کەس ناوم براو دروودم لە سەر نەدا ، ئەوە نام بینێت .

بە هیچ کاتژێ بۆنی ناخۆشو شتی پۆخڵو قیزەوون لە جەستەو لەشو لاریا نەبووە ، بۆنی عارەقی لە بۆنی گوڵاو خۆشتر بووە ، ( أنس ) ئەڵێ : نە عەنبەرو نەمیسكو نە هیچ شتێکی ترم بۆن نەکردووە

که لە بۆنی پێغەمبەر خۆشتر بووبێت .

بوخاری ڕیوایەتی کردووە : پێغەمبەری خـــوا بە هەر ڕێیەکا ڕۆیشتبێ لە بەر بـــۆن خۆشی ڕێگاکە ئەزانرا کە پێغەمبەری پیا ڕۆیشتووە .

وە لە ڕووی عەقڵو ژیریو ڕەوان بێژیو تێگەیشتن لە ئیشو کاردا لە سەرا وردی پلەدا بووەو وێنەی نەبووە ، لە کاتی دواندنو وتار داندا لەســەر خۆ بووە بە ڕادەیەك دەتوانرا وتەکانی بژمێرێن یا بنوسرێن ، هەمیشە ڕوو خۆشو دەم بە زەردە خەنە بووە ، لە ڕووی خەڵکا پێئەکەنیو پێکەنینی زەردە خەنە بوو و جارجاریش ددانەکانی دەرئەکەوتن ، بەڵام قاقای نەبووە ، لە ڕۆیشتنا هەنگاوی کورتو خێرابی ئەناو کەس پێی نەئەگەیشت ، وەکو زەوی بـــۆ بێتەوە یەك .

## ڕەوشتی بەرزو شیرینی :

پێغەمبەری خوا - دروودی لە سەربێت - بە هەمیشەیی دڵی لەگەڵ خوای پەروەردگارا بووە ، هەتا لە کاتی خەوتنیشا ، وە هەمیشە لـە خوا ئەپاڕایەوەو ئەی ئەرمرو : (خوایە شێوەو ڕەوشتم جوان و شیرین بکە ، خوایە لـە ڕەوشتی پـیسو خراپ دوورم بخەرەوە ) بێ گومان خوای گەورە نـزاکەی گیراکردووەو هــەموو جـۆرە ڕەوشتو خویەکی جوانو شیرینی پێ بەخشیوە ، قورئان شـــایەتی ڕەوشت بەرزی بۆ داوەو ئەفەرموێت : ( وإنك لعلى خلق عظيم ) یانی بەڕاستی تۆ - ئەی پێغەمبەری خوا - لە ســەر ڕەوشتو خوی گەورەو بڵندیت . وە بەڕاستی ڕەوشـــتی پێغەمبەر بریتی بـووە لـە

قورئان .

( سعدی ) ی کوڕی ( هشام ) ئەڵێ : ( چوومە لای خاتوو عائیشەو هەواڵی ڕەوشتی پێغەمبەرم لێ پرسی . وتی قورئانت خوێندووە ؟ وتم : بەڵێ خوێندوومە ، وتی : دە ڕەوشتی بریتی بووە لە قورئان ) مسلم ڕیوایەتی کردووە .

جارێکی تر خاتوو ( عائیشـــە ) لە وەڵامی ڕەوشتی پێغەمبەردا دەڵێت : ( ئەگەر ڕەوشتی جوان کۆببێنەوەو لاشەیەکی لێ پەیدا ببێت ، پێغەمبەری خوا دەبێت ) .

پێغەمبەر ـ درودی لە سەربێت ـ ئەی فەرموو : ( پەروەردگارم پەروەردەی کردم ، بە جوانی پەروەردەی کردم ) وە ئەی فەرموو :

( بۆ ئەوە نێراوم کە ڕەوشتی بەرزو جوان تەواو بکەم ) ( خوا ڕقێتی لە ڕەوشتی ناشیرین و ڕەوشتی جوانی پێ خۆشە ) .

( أنس ) ئەڵێ : ( هیچ کردەوەو ڕەوشتو شێوەیەکی پەسەندو جوان نیە کە پێغەمبەری خوا بانگی بۆ نەکردبێتو هانی خەڵکی بۆ نەدابێت ، وە هیچ شتێکی خراپو نەنگو ناشیرین نیە کە خەڵکی لێ دوور نەخستبێتەوەو قەدەغەو یاساخی نەکردبێت لێمان .

لەو ڕەوشتو کردەوە بەرزانەی کە پێغەمبەری خوا لە سەریان بووە : لێ بووردن ، ئازاد کردن ، بەخشندەیی ، داد پەروەری ، چاکە کردن لەگەڵ هەموو کەسا ، سەردان لە خزم و کەسو کارو دراوسێو دۆست ، یارمەتی دان ، دەست گرۆیی کردن ، چاوپۆشی ، بەزەیی ، سەخاوەت ، نان‌دان ، جوولانەوەی شیرین ، بەزەیی دڵسۆزی ، خۆشەویستیو سۆز ، نەرمنیانی ، ڕوو خۆشی ، بەتەنگەوە بون ، خۆنەویستن ، چاکە کردن ، سەلامو مەرحەبایيو هەواڵ پرسین ،

بێ‌فیزو هەوایی ، ئامۆژگاری‌و ڕێنموبی ، لەخراپە لادان ، سەردان لەنەخۆشی ، لەگەڵ مـردو ڕۆیشتن ، دڵخۆشی دانەوەی دڵشکاو ، ڕێزگرتن لەگەورەو دڵنەوایی کردنی بچووك ، سادەبی لەژیان و کاروبارا ، ئاسان کردنی ئیش‌و کار ، ڕێکخستنی کاروباری مەردم ، وەڵام دانەوە ، بەدەمەوە چوون ، دوعای‌خێر بـۆکردن ، دڵو دەم‌و دەست‌و داوێن پاکی ، بێ‌کینەبی‌و ڕق‌خواردنەوەو لێ وردن ... هتد

بە وشەیەکی کورت سەیری قورئانی پیرۆز بکەو بە وردی لێی بکۆڵەرەوە ، هەر کردەوەو ڕەوشتێکت بینی کە پەسەند کرابوو ، بزانە ئەوە کاڵای باڵای پێغەمبەر بووە ، بەڕاستی‌و بە جوانی لـە پێغەمبەردا هاتووەتە دی ، وە هەر کارو ڕەوشتێکت بینی کە قورئان بە ناشیرینی داناوە ، پێغەمبەر لێی دوور بووەو مەردمیشی لێ دوور خستووەتەوە .

( معاذ ) ی کوڕی ( جبل ) ئەڵێ . ( پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەربێت ـ فەرمووی : ئەی ( معاذ ) ئامۆژگاریت ئەکەم بە خۆلادان لەو شتانەی کە خوا لێیان ناڕازی‌یە ، وە بە وتەی جوانو ڕاست ، بە وەفاو ئەمینی‌و خیانەت نەکردن ، بە ئاگاداری دەرو دراوسێ ، بە بەزەیی هاتنەوە بە هەتیوو بێ دالدەدا ، بە وتەی نەرم‌و شیرین بە سەلام کردن و کردەوەی جوان ، بە هەتەر نەبوون و خۆخەریك نەکردن بە ڕابواردنی جیهانی‌یەوە ، بـە پەیڕەوی کردنی بەش و پارچەکانی باوەڕ ، بە خۆ شارەزاکردن لە قورئاندا ، بە هەوڵدان بۆ سـەر فرازی ڕۆژی دوایی ، بە ترسان لەبەر پرسیاری ڕۆژی قیامەت ، بە نەرم‌و نیانی‌و لەسـەر خۆیی ، وە خۆت بپارێزە لـە قسە وتن بە زانایانو لە بەدرۆخستنەوەی پیاو باشانو ڕاست گۆیانو

له پەیڕەوی کردنی پیاو خراپان و له بێ گوێپی کردنی کاربەدەستی دادپەروەر و له وێران کردنی زەوی‌وزار ، داوات لێ ئەکەم که لەگەڵ هەموو بەردو دارو خۆڵێکا ئاگات له‌خوابێت و ترسی خوات له دڵا دەر نەچێ ، وه بۆ هەموو گوناهێك پەشیمانی‌یەك ـ واتــه تەوبەیەکی ـ بۆ بکه ، نهێنی بۆ نهێنی‌و ئاشکرا بۆ ئاشکرا ) .

ئیمام ( محمد ) ی غەزالی ـ خوا لێی خۆش بێت ـ له پەڕاوی ( إحیاء علوم الدین ) دا دەڵێت : پێغەمبەری خوا ـ دروودی لەسەر بێت ـ له هەموو ئادەمی‌یەکان ـ بەگشتی ـ له سەرخۆو هێمن ترو ئازاترو بەدادترو ، دەست‌و دڵ‌و دەم‌و داوێن پاکتر بووه ، هیچ کاتێ دەستی له ژنی بێگانه نەکەوتووه ، له هەموو کەس سەخی ترو دەست‌و دڵ گوشاو تر بووه ، نەبووه درهەمێك یا دینارێکی بووبێت ، هەزارێکی پەیدا نەکردبێت‌و نەی‌دابێتێ ، خۆی پێڵاوو بەرگی خۆی پینه ئەکرد ، لەگەڵ خێزانه‌کانیا ئیشی ئەکرد و گۆشتی ئەجنی ، له هەموو کەس شەرم‌و ئابڕووی زیاتر بوو ، ڕووی نه ئەهات زۆر بۆ کەس بڕوانێت ، هەمیشه ئەچوو بە دەم هەموو کەسەوە ، به بەندەو ئازادەوە ، دیاری وەرئەگرت ئەگەر قومێك شیریش بوایەو پاداشی لەسەر ئەدایەوە له زەکات‌و خێری نەدەخوارد ، له وەڵامی پیرێژنو بێ نەوایاندا لـوت بەرزی نه ئەکرد ، بـۆ خۆی ڕقی دا نەئەهات‌و بۆ خوا زۆر ڕق ئەستوور بوو ، له سەر حەق ئەڕۆیشت‌و بەجێی خۆی ئەگەیاند ، با خۆی‌و یارەکانیشی تووشی زیان بوونایه له ڕێیا ، هەرچی ببوایـه ئەی خوارد ، گەلێ جاریش له برســانا بەردی ئەبەست بە ســەر سکی‌یەوە ، خواردنێکی به دڵ بووایه ئەی‌خواردو بـه دڵی نەبوایـه نەی ئەخواردو قسەی پێ نەئەوت ، خورمای ئەخوارد ، نانی ئەخوارد گەنم بووایه یا جۆ ، گۆشتی پەلاوە خۆش بوو و ئەی فەرموو :

ئەگەر داوام بکردایە لە خوا بۆ هەموو ڕۆژێك دەی دامێ ، میوەی ئەخوارد ، هیچ کاتێك سێ ڕۆژ بەسەر یەکەوە تێری لە نانی گەنم نەخواردووە تا چووە خزمەتی خوا .

ئەمەیش وە نەبێ لە بەر هەر هەژاری یا چروکی بووبێت ، بەڵکو ئەی ویست لە ڕیزی هەژاراندا بێت‌و لە بەر بێ فیزی بووە .

چوون بۆ سەر شایی پێ خۆش بوو ، سەری لە نەخۆش ئەداو لەگەڵ تەرمی مردودا ئەڕۆیشت بۆ گۆڕستان ، بە تەنیاو بەبێ پاسەوان‌و پاساووڵ بەناو دوژمندا ئەگەڕاو لە کەس نـە دەترسـا ، بێ هەواو فیز بوو ، خۆی بە گەورە تر نیشان نە ئەدا ، ڕوو خۆش‌و دەم بـە زەردە خەنە بوو ، گوێی لـە ژیانی نەبوو ، هەر جۆرە بەرگێکی دەست بکەوتایە ئەی پۆشی ، ئەنگوسـتیلەی زیوی ئەکردە پەنجـە تووتەی ڕاسـتی‌و چەپی ، بە تەنیا سواری وڵاغ دەبوو ، نۆکەرو غوڵامی لە دوای خۆیەوە سوار دەکرد ، هەر وڵاغێك بوایە سواری ئەبوو ، بە پیادەیش ئەڕۆیی ، بە پێڵاو و بە پێ خاوسی ، بە مێزەرەوەو بە بێ مێزەرو کڵاو ئەچوو بۆ ئەوپەڕی مەدینە بۆ سەردان لە نەخۆش ، حەزی لە بۆنی خۆش ئەکرد ، ڕقی لە بۆنی ناخۆش بوو ، لەگەڵ هەژارا دائەنیشت‌و نانی ئەخوارد ، ڕێزی لە گەورە دەگرت‌و دڵنەوایی نەجیب زادەکانی دەکرد ، سەری لە خزم‌و خوێشەکانی دەداو چاکەی لەگەڵا ئەکردن ، بەڵام پایەی بەسەر موسڵمانانندا بەرز نە ئەکردنەوە ، لەگەڵ هیچ کەسـا توندو تیژی نەدەکرد ، بیانوو ( عذر ) ی لە مەردم وەر ئەگرت ، شۆخی دەکرد ، بەڵام هەر ڕاستی دەوت ، پێ ئەکەنی بەبێ قاقا ، یاری ڕەوای ئەدی‌و دەنگی نەئەکرد ، یاری‌و نەبەردی لەگەڵ خێزانەکانیا ئەکرد ، قڕەو هەرای لە لا دەکراو ئارامی ئەگرت ، لە خواردن‌و پۆشاك‌و لە جێگاو ڕێگادا خۆی لە غوڵام‌و

کەنیزەکانی جیا نەئەکردەوە ، کاتێ نەبوو کە بەندایەتی خوای تیا نەکا ، یا چارە سەری کارێك نەکات ، بە چاوی سووك سەیری هەژارو لێ قەوماوی نەئەکرد ، لە دەسەڵاتی خاوەن زۆر نەدەترسا ، دەسەڵات دارو بێ دەسەڵاتی وەك یەك بانگ ئەکرد بۆ لای خوا ، خوای پەروەردگار هەموو شێوەو ڕەوشتێکی جوانی پێ بەخشی بوو ، لەگەڵ رامیاری ( سیاسەت ) یەکی قوڵی بێ وێنەدا .

خۆی نەخوێندەوار بوو نووسین‌و خوێندنەوەی نەبوو ، لە وڵاتی نەخوێندەواری و بیابانی وشکدا بە هەژاری‌و هەتیوی گەورە بوو ، کەچی خوا هەموو جۆرە خوو ڕەوشتێکی شیرین‌و شێوازی پێ بەخشی بوو ، لەگەڵ زانینی هەواڵی پێشینان‌و ئەوانەی لەمەولا ڕوو دەدەن ، وە ڕچەو ڕێبازی ڕزگاری‌و سەرفەرازی هەردوو جیهانی دابووە دەست ...

قسەی ناخۆشی بە هەر کەس بوتایە دوایی تۆڵەی دەدایەوە ، نەفرینی لە کەس نەکردووە ، لە جەنگێکدا پێیان وت : نەفرین لە دوژمن بکات ، فەرمووی : من بە ڕەحمەت نێرراوم ، بە نەفرین کەر نەنێرراوم . کە داوای لێ بکرایە : دوعا لەیەکێك بکات دوعای بۆ دەکرد ، تۆڵەی هیچ شتێکی نە سەندووە کە لە گەڵی کرابێت ، مەگەر هەتکی حورمەتی خوای تیا بووبێت . هەر کاتێ لە ناوەندی دوو شتا بووبێت ئاسانەکەیانی هەڵبژاردووە مەگەر گوناهێك یا نارەواییەکی تێدا بووبێت ، ئەو کاتە دوور ترین کەس دەبوو لێی .

هەر کەس ـ ئاغا ، نۆکەر ، پیاو ، ژن ـ بهاتایەتە لای بۆ ئیشێك ئیشەکەی بۆ جێ بەجێ دەکرد ، ( أنس ) دەڵێت : سوێندم بەخوا

ڕووی نەداوە لە هەر شتێکا کە پێی ناخۆش بووبێت پێم بڵێت بۆچی کردووتە؟ وە لە سەر هیچ کارو هیچ لە بیر چوونێك سەر زەنشتی نەکردووم، وە دەی فەرموو : لێی گەڕێن ئارەزووی خوا وابووە، قەت گلەیی لە جێگاو بان نەدەکرد، بۆیان ڕابخستایە ڕادەکشا، وە ئەگەرنا لەسەر زەوی ڕادەکشا ...

بە هەر کەس دەگەیشت ئەو لە پێشەوە سەلامی لێ دەکرد، لە ڕێگادا هەر کەس بهاتایە ڕێی بۆ هەر ئیشێك نا نەڕۆیشتایە ئەم بەجێی نەدەهێشت، هەر کەس دەستی بگرتایە، بەری نەئەدا، تا ئەو کەسە بەری دەدا، بە هەر هاوەڵێکی بگەیشتایە تەوقەی لـەگەڵ ئەکرد، هەموو ئیش‌و کارو جووڵەیەکی بـە ناوی خواوە بوو، بـە زۆری لە دانیشتن دا قاچەکانی هەڵئەناو بە دەســـت دەی گرتن، لە ناو یارەکانیا جێگای دیاری نەبوو، هەر کوێدا خاڵی بووایە دادەنیشت، ڕێزی لە هەموو کەس دەگرت، زۆر جار جلی ژێر خۆی دادەنا بۆ میوان، ئەگەر وەری نەگرتایە زۆری لێ دەکرد، هەموو کەس وای دەزانی ئەمی لە هەمووان خۆشتر دەوێت، لە دانیشتن‌و دواندنا ڕووی دەکردە هەمووان و لە گەڵیان دەدوا، مجلیسی جێگای شەرم‌و گەردن کەچی‌و ئەمینی بوو، هەموو کەسی بە ناوی شیرینەوە ـ باوکی فلان، دایکی فلان ـ بانگ دەکردو ناو دەبرد، زۆر لە سەرخۆ بوو، درەنگ ڕقی دادەهات، مەگەر شتەکە گوناهو ناڕەوا بووایە، زوویش دڵی ئەهاتەوە جێ، لە هەموو کەس بە ڕەحم ترو دڵـسۆز ترو ئاکا چاکتر بوو ....(١)

ئەمە پرژەیەك بوو لە دەریای بێ پەیی‌و شێوەو ڕەوشتی پێغەمبەری

(١) احیاء علوم الدین ب٢ ل ٣٥٣

خوا ـ درودی لە سەر بێت ـ ئەگینا باسی بەرزی و گەورەیی و میرنـاسی کەسێك کە ڕەوشتی بریتی بێ لە قورئان و ، قورئان گەواهی بەرزی بێت ، چۆن لێرەدا جێگای دەبێتەوە ؟ وە کەسێك زیاتر لەمەی ئەوێت ، با بڕوات بۆ لای ( إحياء علوم الدين ) یا ( زاد المعـاد ) یا تەفسیری ( في ظلال القرآن ) یا کتێبە بـە نرخەکانی تر ، وە لەوێدا خۆی تێراو بکات و مێشك و دڵی زاخاو بدات .

بەندی دووەم :

## شـارسـتانێتی لە ژێر ئاڵای ئیـسـلامدا

نامەوێ لێرەدا بە درێژی باسـی شارستانێتی سەردەمی ئیسلامی بکەمو لەگەڵ شارستانێتی ماددی خۆرئاوادا بەرابەری بکەم ، چونکە ئەوە کاتێکی درێژو هەوڵێکی زۆری دەوێو لەم پاشکۆیەدا جێی نابێتەوە ، بەڵکو ئەمەوێ ئەوە بخەمەڕوو کە شارستانێتی ئیسلام لە بەرزترین پلەدایەو دەتوانێت بەختیاری ڕاستەقینە بکاتە بەر هەموو مرۆڤ ، وە هەندێ لە بنکەو هۆیەکانی باس ئەکەم .

### شارستانێتی خۆرئاوا :

شارستانیەتی ماددی تازەی خۆرئاوا ناتوانێت بەختیاریو ئاسایش بدات بە مرۆڤەکانو بیان خاتە ناو ژیانی هێمنیو لە سەر خۆییو بیان حەوێنێتەوە ...

بە سەیر کردنێکی لە باری ئێستەی گێتی ، کە مرۆڤایەتی - بەبێ جیاوازی - لە گێژاوی پشێویو ناڵەباریو شەڕو شۆڕدایە ، بە جۆرێك ئەتوانین بڵێین : لە هیچ گۆشەو قوژبنێکی سەر زەویدا ئاسایشو ئارام نەماوەو باری کردووە ، وە مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە وەکو مرۆڤایەتی پێش هاتنی ئیسلام چووەتە گوێ قەراغی بیری لەناو چوون و نەمان ، ئێستە بکەوێتە ناوی یان ناوێکی تر ، ئەمەیش لەسایەی چەکی

ئەتۆم‌و زەڕەو هایدرۆجینەوە بێجگە لەو هەموو دەردو نەخۆشینە ، دەرونی‌و مێشکی‌و کۆمەڵایەتی‌یانەی کە خەڵکی بە خۆکوشتن‌و خۆسوتاندن لە دەستیان خۆ دەرباز دەکەن ، کە لە وڵاتە ـ بەناو ـ پێشکەوتووەکانا تا پێی دەچێت زۆر دەبێت‌و پەرە دەسێنێت ، ڕۆژ نیە کە چەندەها کارەساتی سەرسام کەر ڕوونەدات .

ئەمانەیش لە کاتێکدا زانیاری ـ لە هەموو ڕوویەکەوە ـ گەیشتووەتە چڵە پۆپە ، ڕۆژ نیە موعجزەیەکی تازە بابەت‌و ناوازە نەهێنێنەکایەوە ، وە هۆو ڕێبازەکانی ژیان بە ڕادەیەك ئاسان بووە ، کە پیاو لەوانەیە باوەڕی پێ نەکات بەخەوی بزانێ .

لەم بەیەکادانی ئەم بارەو ئەو حاڵەوە ، دەر ئەکەوێت کە ئەم شارستانێتی‌یەو ئەو بەرنامەیەی کە لە سەری پێك هاتووە ناتوانێت مرۆڤ بەرەو ئاسایش و کامەرانی ببات بە ڕێوە و سەرپەرشتی بکات .

ئەمەیش تەنیا لە بەر ئەوەیە کە ئەو شتە بناغەیی‌یانەی هەوێنی دامەزراندنی کۆمەڵ‌و دامرکاندنی دڵ‌و دەروونی مرۆڤە کە بریتی‌یە لە ڕووی گیانی ( الجانب الروحي ) ، وە لە سەر ئەوەیش ڕووی ڕەوشتی ( الجانب الخلقي ) پەیدا دەبێت ، ئەو شتە لەم شارستانێتی‌یە ماددی‌یە تازەیەی خۆر ئاوادا نیە ، وە لە نەبوونی ئەم ڕووەوە هەموو ڕووە بەڕێزو بەرزەکانی مرۆڤایەتی وەکو ڕێزو زۆر و دڵسۆزی خۆشەویستی‌و برایەتی‌و بەزەیی‌و دەستەبەری کۆمەڵایەتی‌و هاریکاری‌و . . هتد نەمان . وە نەمانی ئەمانەیش بووە هۆی پەیدا بوونی پێچەوانەیان‌و ئەم بارە نالەبارەو ئەو هەموو خراپەو ناڕەوایی‌و ناخۆشی‌یانە ڕوویان دا ، مرۆڤ بەتەواوی وەڕس‌و هەراسان بوون .

وە هۆی بنە ڕەتی بۆ نەبوونی ڕووی گیانیو اقو پۆپەکانی ، یان هۆی نەبوونی ئایینو باوەڕ بە خواو بە ڕۆژی پاداشتو سزای پاشە ڕۆژ ، وە کەوتنە ناو شەپۆلی کوشندەی بێ باوەڕی .. هۆی ئەمە ـ لە ژێر باڵی شارستانێتی خۆر ئاوادا ـ دەگەڕێتەوە بۆ خراپەو خراپکار پیاوانی کەنشتە لە ئایینی مەسیحی دا لە ئەورووپا ـ بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ـ چونکە لە کاتی خۆیدا ئایینی مەسیحی لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە پەڕیەوە بۆ بەری ئەورووپا ، ئەورووپا لەو کاتەدا پڕبوو لە فەلسەفەی بت پەرستی ، جا لەبەر ئەوەو لەبەر گوێ نەدانی پیاوانی کەنشتە ئایینەکە تێکەڵ بەوفەلسەفانە بوو و پێکەوە شێلران ، وە لە کۆتایی دا پاشا ( قوستەنتین ) بۆیەی ئایینی لە خۆی داو دەستی بەسەرا گرت .

پیاوە ئایینیە ڕاستەکان هەرچیان کردو کۆشان بۆ پاك کردنەوەی ئایینەکە لەم فەلسەفانە بێ بەرهەم و بێ هوودە بوو ، وە نەیان توانی بەرهەڵستی ئەم ناڕەواییە بکەن ، بەڵکو تا ئەهات زیاتر پەرەی ئەسەندو زیاتر لادان و گۆڕینیان تیا دەکرد ، تا لە ئەنجاما وای لێهات لەئایینە خاوێنەکەی حەزرەتی عیسا پێغەمبەر بۆ دەرمانیش نەماو پیاوە ئایینیە ڕاستەکانیش توانەوە ، ئیتر هەل خۆش بوو بۆ پاپاو قەشە ناڕاستەکان ، ئەوانەی بۆ ژیانیان دەستیان لە ئایینەکەیان هەڵگرت ، وە کەوتنە ڕاکێشانو ، بادانی ئایینەکەیان بە گوێرەی کەیف و بەرژەوەندی خۆیان .

تا لێرەدا کۆمەڵی پیاوانی ئایینی ـ یان پیاوانی کەنشتە ـ پەیدابوو وە لە سەر شانۆوە خۆی نواند ، ئەمانە وردە وردە دەسەڵاتیان پەیدا کردو بوونە یەکەم هێز لە ئەورووپا و لەو وڵاتانەی سەر بە

ئەوروپا بوون ، کەوتنە کوشتن و برین و بەرزکردنەوەی ئەمو دانەواندنی ئەو ، وە دوور خستنەوەو دانان لە شوێنە دیاری‌یەکانی کۆمەڵایەتی دا بەڕادەیەك کە هیچ فەرمانێك بەبێ ئەوان بەجێ لەدەهات .

ئەمانە لەبەر ئەوەی ئایینەکەی گرتبوویان بە دەستەوە ، ئایینە خوایی‌یەکەی حەزرەتی عیسا پێغەمبەر نەبوو - درووودی لە سەربێت - وە خۆیشیان کۆمەڵێکی دوڕندەی پیاو خراپو چاو چنۆکو خۆپەرست بوون ، ئەم دەسەڵاتەیان لە خزمەتی مرۆڤو بەرزکردنەوەی بارو ڕاژەی کۆمەڵو ئاوەدان کردنەوەی وڵاتو لە پیاوەتی‌و جوامێری‌دا بەکار نەهێنا ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ( بە ناوی خواو وشەی ئاسمانەوە ) سوار بۆ تەقەی ملی مرۆڤەکان بوون و کەوتنە ئازاردانی گەل و میری‌یەکان ، پێچاندنەوەو بادانی پاشاو سەرۆکەکان ، دژی هەمەرو بەرز بوونەوەو خوێندن و زانیاری و ئاوەدان کردنەوەو ئازادی و سەربەستی‌یەك وەستان ، وە بەرابەری هەموو ڕاچەنینو هۆشیاری‌یەکیان کرد .

کاتێك کە ئەوروپا لە سایەی وڵاتی ئیسلامی‌یەوە ڕووناکی خوێندنو زانیاری تێ‌کەوتو تامی سەربەستی و ئازادی چەشت ، وردە وردە مێشكو دەروونی ڕۆڵەکانی کرایەوە ، ڕاچەنینو ڕەخنە گرتنو لێ‌دوان پەیدا بوو ، پیاوانی کەنشتە مەترسیان لێ‌نیشت ، بۆیە هەڵسان بە بینینی دەوری فیرعەونی‌و چەندەها ڕێبازی شەیتانی‌یان دۆزی‌یەوە ...

کەوتنە کوشتنو برینو سوتاندنو چەوسانەوەو دەربەدەر کردنی زانایانو ڕۆشنبیران ، دادگای پشکنینیان داناو بەو بۆنەیەوە بەدەیانی

هەزاران مەردمیان لەناو برد ، بەڵام شتی پڕو پوچ تەمەنی کورتە ، بۆیە لە ئەنجامدا ئەمان ڕوخانو ژێرکەوتنو زانیاری زاڵ بوو بە سەریانا ، بەتایبەتی لە کاتی شۆڕشی فەرەنسەدا .

بەڵێ زانیاری سەرکەوت بەسەر دامو دەزگای پڕو پوچی پیاوانی کەنشتەدا ، بەڵام بەداخەوە ئەمیش خۆی پێنەگیرا و لە سنوورا نەوەستا ، ناوەڕاستی بەجێ هێشتو یەکسەر چووە ئەو پەڕەوە ، لە داخی پیاوە ناڕاستەکانی کەنشتە یەکسەر خۆی کرد بە دژی ئایین ، باوەڕی بە خوای پەروەردگار نەما ، هەموو ئایینێکی لابردو لە دژی ئایین دووا .

بەم پێیە ئەوروپایی ـ لە دوای ئەوان ئەمەریکایی و شوێن کەوتووەکانیان ـ لە ژێر ئایین دەرچوون ، باوەڕیان بەخواو زیندو بوونەوەو ڕۆژی دوایی نەما ، وە لە جیاتی خواو ئایین باوەڕیان بەزانیاری هێناو بوونە بەلدەو شوێن کەوتووی ، هەموو شتێکیان لەوەوە ئەبینی و وەر دەگرت ، وە بەم بۆنەیەوە بەشی گیانیو بەشی ڕەوشتی ـ کە ئەم دووبەشە بڕبڕەی پشتی زانیاری ڕاستەقینەن ـ لە شارستانێتییەکەیا نەماو بوو بە شارستانێتییەکی ماددی ڕووت ، بۆیە هەرچی دەکات لە باری مرۆڤەوە هەر بۆ دواوە دێتو چارەسەری گیروگرفتەکانی بۆ ناکرێت (١) .

## شارستانێتی ئیسلام :

ئایینی ئیسلام ـ بە پێچەوانەی مەسیحی ـ لە سەردەمی پێغەمبەردا تەواو

(١) بۆ ئەم باسە سەرێك لە ( الدين والدولة في الاسلام ) و ( هذا الدين ) و ( مستقبل لهذا الدين ) بدە .

بوو و کەمو کو ڕی تیا نەما ، ئەوەتە قورئان بەڕۆشنی ئەممان تێ دەگەیەنێت و دەفەرموویت : ( اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام ديناً ) . المائدة / .

وە ئیسلام بەشێوە ڕاستەکەی بەبێ دەستکاری مەردم بە سەر زەویدا بڵاو بووەوە ، کەس نەی توانی و ـ ناش توانێت ـ وشەیەك یان ڕستەیەك لە قورئان بگۆڕێت ، یا زیادوکەمی تیا بکات ، چونکە خوا بەڵێنی پاراستنی داوە : ( إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون ) . الحجر /

لە ئیسلامدا پیاوانی ئایینی نیەو نابێت ، کەس لە کەس زیاتر و لە پێش ترو گەورە تر نیە ، تەنیا بە زیادە خوا ناسینو کەڵك و خزمەت نەبێت : ( إن أكرمكم عندالله أتقاكم ) الحجرات / ، هیچ کەس ناتوانێ ئیسلام بکات بە کەلەپورو ماڵ بۆ خۆی ، چەکی لێخۆش بوونو کلیلی دۆزەخو بەهەشت بە دەست کەسەوە نیە بێجگە لە خوای پەروەردگار ، بۆ کەس ڕەوا نیە بکەوێتە نێوان خواو بەندەکانی‌یەوە ، موسڵمانان یەکسەر پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاری خۆیان دەبەستن ، لێی دەپاڕێنەوە و وتــو وێــژی لەگەڵ دەکەن ، دەیپەرســتن و بەندایەتی بۆ دەکەن ، موسڵمانان خۆیان سەربەخۆ لە قورئانو فەرموودە تێدەگەن ، دەستوورو بەرنامەی لێ وەردەگرنو پەیڕەوی دەکەن :

( وإذا سـألك عبادي عني فأني قريب ، أجيب دعوة الداعي إذا دعاني ، فليستجيبوا لى وليؤمنوا بي لعلهم يرشدون ) البقرة / ٠

( إياك نعبد وإياك نستعين ) الفاتحة / .

شارستانێتی ئیسلام لەسەر دوو پایەی داڕێژراو بەرپا بووە : گیانو

مادده ، وه هەر یەکە لەم دووانە دەوری تایبەتی خۆی دەبینێت و جێگای دیاری هەیە تیایا ، وه لە شارستانێتی ئیسلاما چەند شتێك هەیە لە شارستانێتی خۆر ئاوادا نین ، یان بەو پێیە نین :ـ

١ ـ شارستانێتی ئیسلام لەسەر باوەڕی ڕاستەقینە بەخوای پەروەردگار بەرپا بووه ، خوایەکی تاكو تەنهاو بێ وێنەو هاوەڵو زاناو بە دەسەڵات .

( وإلهكم إله واحد لاإله إلا هو الرحمن الرحيم ) البقره ، ( قل هو الله أحد ، الله الصمد ، لم يلد ولم يولد ، ولم يكن له كفواً أحد ) ، ئیسلام دروست بوونی بوونەوەر و هەموو ئیش و کارەکان بە تێکڕایی دەگێڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە ، وه لەم ڕووەوە باوەڕێکی پتەو لە ناو دڵی موسڵمانەکانا دەڕوێنێت و چاودێری تایبەتی لەناو هەموو دڵو دەرونێکدا دادەنێت ، کە خاوەن دڵ نەتوانێت بە پێچەوانەوە بجووڵێتەوە لە هیچ کارو هیچ کارو بارێکدا .

ئەم باوەڕە پتەوە لە لایەکەوە سەری مرۆڤ بەرز دەکاتەوە ، لە بەرابەری هەموو مرۆڤ و بەش و پارچەکانی بوونەوەر ، ئیتر بێجگە لە خوای گەورە بەندەیی بۆ کەس ناکات و سەر بۆ کەس دانەنەوێنێت ، ئازادو سەربەست دەبێت و ڕیسوایی و ژێر دەستەیی بە شایانی خۆی نابینێت و کۆیلەیی بۆ کەس ناکات ، بەم باوەڕە ڕزگاری ڕاستەقینەیی دەستی ئادەمی دەخات و دەیانکاتە ئادەمی تەواو و پایە بەرز .

وه لە لایەکی ترەوە ئەو باوەڕە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت و دنەی دەدات بۆ هەستان بە کردەوەی چاك و سوودبەخش بە کۆمەڵ ،

وه لە هەموو کارێکی زیان بەخش و ناشیرینکەرو نەنگی دەیانگێڕێتەوە ، ئەو باوەڕە مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ ئاوەدان کردنەوەی سەرزەوی ، بۆ یارمەتی دانی هەژارو لێ قەوماوان ، بۆ بەرپاکردنی کۆمەڵێکی مرۆڤایەتی بەرێز لە سنوورێکی فراوان و لە بەرگێکی بە نەزاکەت و بە تامو هێمنو ئاسایشدا ، وە دووری دەخاتەوە لە هەموو شێوەو جۆری خراپەو ئازاردان و جەورو ستەمو وێران کردن و ناشیرین کەر ...... (١)

٢ ـ لە شارستانێتی ئیسلامدا سروشتی هەموو جۆرە پەیوەندیەکانو سنوورەکانیان دیاری کراوە نیگارو نەخشەی ڕۆشنو دیارییان بۆ کێشراوە : (٢)

پەیوەندی ئادەمیزادو بەشەکانی تری بوونەوەر بە خوای پەروەردگارەوە ، پەیوەندی مرۆڤ بە دڵو دەرونو لاشەی خۆیەوە ، بە دایكو باوكو ژنو منداڵو دەستو پێوەندیەوە ، بە براو خوشكو خزمو کەسو کارو دراوسێو هاو وڵاتو هاو نەژادو هاو ئایینیەوە ، پەیوەندی تاك بەکۆمەڵو کۆمەڵ بەتاكو کۆمەڵ بەکۆمەڵو گەل بە دەوڵەتو دەوڵەت بە گەلەوە ، پەیوەندی نێوانی کۆمەڵەکان و دەوڵەتەکان ، و پەیوەندی لەگەڵ بوونەوەر ... هتد

ئەمانە لە ئیسلامدا بە ڕادەیەك دیارو ئاشکران ، هەر کەس بیەوێت بە ئاسانی لێیان تێدەگاتو فێریان دەبێت ، هەر وەکو

(١) سەیری (شبهات حول الاسلام) بەشی یەکەمو (سوودی باوەڕ لە پێنج پایەکانی ئیسلام) دا بکە .

(٢) سەیری (احیا علوم الدین) باسی (حقوق) و (العدالة الاجتماعیة في الاسلام) بەشی (طبیعة العدالة) بکە .

مەکینەیەکی تەواو پارچەکانی بەجیا دانرابێت‌و فیتەرێکی شارەزا بیەوێت بیان خاتە یەك‌و بیان بەستێت ، بەبێ لێ‌تێك چوون ڕێکی دەخات‌و دەی خاتە ئیش ، بەو پێ‌یەیش مرۆڤ هەر کاتێ بیەوێت بە گوێرەی بیرو باوەڕی ئیسلام بە پێی یاساو دەستووری ئیسلام هەر کەسەو هەر شتە لە شوێنی خۆیا دابنێت ، و بەپێی سروشت‌و لە سنووری خۆیا بیبات بە ڕێوە ، سەرکەوتوو و بەختیار دەبێت و بە خۆشی‌و ئاسایشەوە دەژی ، دەتوانێ بە جوانی سەر زەوی‌و بوونەوەر ئاوەدان بکاتەوە ، بەهیچ کۆچێك خراپەو ئاڵۆزی و پشێوی‌و باری نالەبار نەیەتەڕێگای ، ئامێری گێتی بەرەوپێش دەبات‌و کلیلی بوونەوەر دەگرێتە دەست ، بەش‌و پارچە بە سوودەکانی دەخاتە ئیش‌و دەبێتە جێ‌نشینێکی ڕاستی خوا لە سەر زەویدا .

٣ ـ یەکێکی تر لە شتە تایبەتی‌یەکانی شارستانێتی ئیسلام ئەوەیە : ئیسلام بەڕێزەوە سەیری ئادەمی دەکات ، بەگەورەو سەرۆکی بوونەوەری دادەنێت ، وە خوای گەورە ئادەمی کردووە بەجێ نشینی خۆی لە سەر زەویداو پایەی بەرزی داوەتێ : ( وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الارض خليفة ) البقرة / ( ولقد كرمنابني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا ) الأسرار / .

وە سەرزەوی هەرچی تیایە بەتایبەتی‌و بوونەوەر بە گشتی هەمووی بۆ سوودو خۆشی‌و ژیانی مرۆڤەکان دروست کراون‌و ژێر بار خراون :

( خلق لكم مافي الارض جميعاً ) البقرة / . ( سخر لكم مافي السموات ومافي الارض ) الجاثية / ، ئادەمی ـ بەمەرجێ لەسەر

بەرنامەی خواو بە پێی دەستووری ئیسلام بحوولێنەوە - بۆی هەیە هەرچی ئەکات و هەرچۆن ئەجوولێتەوەو هەرچی تازە دابنێت کە کەڵك‌و سوودی هەبێت .

ئیسلام بەم جۆرە سەیری مرۆڤ دەکات‌و لەو پلە دا دای دەنێت ... مرۆڤ بەلای ئیسلامەوە هەر لە سەرەتاوە مرۆڤ بووە ، لە بنەڕەتا خوا بەمرۆڤ دروستی کردووە ، لە ڕەگەزێکی تر نەهاتووە ، یەکەم مرۆڤ کە خوا ڕاستەو خۆ دروستی کرد ( ئادەم ) بوو ، خوا هەموو جۆرە زانیاری‌یەکی دایەو هەموو شتی پێ ووت و نەزانین‌و نەفامێتی تیا نەهێشت ، بەمە بەرزی کردەوە بەسەر هەموو شتێکدا ، هەتا بەسەر فریشتەدا ، وە داوای لە فریشتە کرد کە بەڕێزەوە سەیری بکەن‌و بەگەورەی دابنێن‌و کڕنووشی بۆ بەرن : ( وإذ قال ربك للملائكة : إني جاعل في الارض خليفة ، قالوا : أتجعل فيها من يفسد فيها ويسفك دماء ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك ، قال : إني أعلم ما لا تعلمون ، وعلم آدم الأسماء كلها ثم عرضهم على الملائكة فقال : أنبؤني باسماء هؤلاء إن كنتم صادقين ، قالوا : سبحانك لاعلم لنا إلا ما علمتنا إنك أنت العزيز الحكيم ، قال : يا آدم أنبئهم باسماءهم فلما أنبأهم بأسماءهم ، قال : ألم أقل لكم إني أعلم غيب السموات والارض واعلم ماتبدون وما كنتم تكتمون ؟ وإذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا أبليس أبى واستكبر وكان من الكافرين ) البقرة / .

بەڵام شارستانێتی ماددی خۆر ئاوا بەچاوێکی سووك‌و بێ بایەخ سەیری مرۆڤ دەکات ، بەهیچ جۆرێك ڕێزی لێ ناگرێت‌و نرخ‌و بەهای بۆ دانانێت .

هەندێ لە فەلسەفەکانی ئەو شارستانێتیەیە مرۆڤ بە ئامێرێکی ئابووری دادەنێت ، وە بەلایەوە وایە تەنیا ئابووری نرخو بەهای هەیەو بەس ، ئیتر مرۆڤو بەشەکانی تری بوونەوەر هیچ جۆرە نرخو کێشێکیان نیە .

هەندێ تریان مرۆڤ لە ڕیزی کۆمەڵی ژووروو دادەگێڕنو ئەی هێننە ڕیزی گیان لەبەری چوار پێوە ، نەك گیان لەبەرێکی بەحورمەت ، بەڵکو پیس ترین جۆریان کە مەیموونە ، وە ڕای ئەم فەلسەفە گۆجە وایە کە مەیموون باپیرە گەورەی مرۆڤە ، مرۆڤ لە مەیموونەو بە یاسای ئاڵو گۆڕ بووە بە مرۆڤ !! ....

هەندێکی تر لەو فەلسەفانە مرۆڤ دەکات بەشتێکی جەستە پەرست و ڕای وایە هەموو جمو جووڵو ئیشو کاری مرۆڤ تەنیا بە پێی پاڵ پێوەنەری نەژادی ( الغريزة الجنسية ) یە ، واتە ئارەزووی نێر بۆ مێو مێ بۆ نێر یەکەم هۆیە بۆ جووڵاندنی مرۆڤ لە جیهاندا ...

وە گەلێکی تر لەم ڕا پڕوپووچو فەلسەفە بۆشانە ، وە بەڵگەکانی هەموویان شتێکی خەیاڵینو هەر کەسە لە خۆیەوە دەڕوانێت ، بۆیە لە گوێی خۆیان بەرزتر نابنەوە ، وە لەوڕاوەی مرۆڤی تادار دەچن .

مرۆڤ خاوەنی لاشەو گیانە ، ژیریو دڵو دەروونو سۆزو ئەندامی لەشو مێشکی هەیە ، چەند هێزو توانای پاڵ پێوەنەری نهێنی هەیە ، وە هەتا ئەو هەموو بەشو پارچەو هێزانەی بە دیاریو نهێنیانەوە پەروەردە نەکرێنو گەشەو نەشەیان پێ نەدرێتو ڕێك نەخرێنو هەر یەکەیان خۆراکی تایەتی خۆی نەدرێتێ ، مرۆڤ بەختیارو سەر فراز

نابێت‌و بەرز نابێتەوەو پێش ناکەوێت‌و کامەرانی بۆ پێك نایەت .

بۆیە هەر کاتێك ڕەوڕەوەی مرۆڤایەتی کەوتە دەستی کۆمەڵێك کەتەنیا مادە پەرست بوون‌و لە سنوری ماددەو ژیانی ئەم جیهانە تێ نەپەڕێن ، بڕو باوەڕیان تین ئەکانە سەر شارستانێتی‌یەکەو ڕەنگ‌و ڕووی ئەوان وەردەگرێت . لێرەدا مرۆڤ لە هەندێ ڕووەوە بەرز دەبێتەوەو لە گەلێك ڕوویەوە نزم دەبێتەوەو دا دەگەڕێت ، لە ڕووی پیشەسازی‌و کوتاڵ‌و شت‌و مەکی چەك‌و ئاگرو ئاسن‌و لە مەیدانی جەنگ‌و کوشتن‌و لەناوبردن‌و لە کۆشك‌و بارو تیاترۆ خانەو شوێنی ناڕەواو بێ‌ئابڕوویدا بەرز دەبێتەوە ، بەڵام لە ڕووی دڵ‌و گیان‌و سۆزو پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی‌و خزمایەتی‌و دۆستایەتی‌و لە پەیوەندی‌یەکانی تردا نزم دەبێتەوەو کۆمەڵ بەرەو ژیانی چوار پێی دەڕوات زیاتر لەوەی بەرەو مرۆڤایەتی بڕوات ، کۆمەڵ وەکو لاشەیەکی پفەڵی لێ دێت ، لە بەرچاوا وا دەردەکەوێت گۆشتی قەڵەو تەندروستە ، کەچی لە ڕاستی‌دا نەخۆش‌و دەردەدارە ، لە دەست ئێش‌و ژان پڕ بەدەم دەناڵێنێ‌و هاوار دەکات .

وە ئەگەر کۆمەڵێك سوار سەری مرۆڤ بوو ، کە ئەچوو بەگژ ماددەو ژیانی جیهانی‌دا ، تەنیا بە دەربەست گیان‌و میتا فیزیکەوە بوو و گوێی نەدەدا بە ژیانی جیهانی ، دووبارە کۆمەڵ ئەو هەوایە وەر دەگرێت‌و گوڵی شارستانێتی سیس دەبێت‌و هەڵ دەوەرێت ، هێزو توانایی‌یەکانی لەناو دەچن و بـا دەیان بات ، مرۆڤەکان لە ژیان ڕادەکەن‌و ڕوو دەکەنە دەشت‌و چۆڵی‌و ئەشکەوتەکان‌و بە چەندەها زەرەرو زیان لەگیان‌و ژیانی کۆمەڵـدا ڕوو دەدات و دنیا کاوول دەکات‌و سەر زەوی وێران دەبێت‌و مرۆڤایەتی دێتەوە یەك و بەرەو نەمان دەڕوات ، خۆ ئەمەیش پێچەوانەی خواهیشی خوایە لە دروست

کردنی مرۆڤ و بوونەوەردا ، یان کۆمەڵێك لە دژی ئەمانە ڕاست دەبێتەوەو یەکسەر دەکەوێتە سەر هێڵی پێچەوانەی ئەمانە و شۆڕش دەکات بەسەر گیانو ئاییندا ، پێش ئەوەی شۆڕش بەسەر ئەوانەدا بکات ، وە لێرەدا ئایینو خوا پەرستی لەناو دەچێت و ماددە پەرستی‌یەکەی بەشی پێشوو دێتە پێشەوە .

بەڵام ئیسلام ئەم دوو ڕووەی گیانو ماددە کۆ دەکاتەوەو هەر یەکە بە ئەندازەی پێویست خۆراکی دەداتێو پەروەردەی دەکات ، هەموو هێزو تواناو بەهرە و لێهاتنێکی دەخاتە ئیشەوەو هیچیان لێ کپ ناکاتو لە ناوی نابات ، بەڵکو لەبەر ڕەوشت و شەرما هەموویان دەخاتە ئیشەوەو لە سوودی کۆمەڵایەتی‌دا بەکاریان دێنێت ، بۆیە شارستانێتی‌یەکەی ئیسلام پڕ بەپڕی مرۆڤە .

ئیسلام لەگەڵ ئەو پلەو پایەیەدا کە داوێتی بە مرۆڤ هەر لەو کانەدا پەروەردەی دەکاتو لە هەموو ڕەزیلەو خراپەیەك پاکی دەکاتەوەو یەکیار دەخات ، دەیان کات بەیەك کۆمەڵو یەك نەژادو یەك بەرەباب ، وە یەکسانی دەخاتە ناویان لە هەموو ڕوویەکی ژیانیانەوە ، هیچ کەسێك لەوانی تر زیاترو گەورەتر نیە بەخوا ناسینو خۆ پاراستن لەشتی زیان بەخش نەبێ : ( یا أیها الناس إنا خلقناکم من ذکر وأنثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا إن اکرمکم عندالله أتقاکم ) الحجرات / .

( یا أیها الناس اتقوا ربکم الذي خلقکم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منها رجالاً کثیراً ونساء ) النساء / .

پێغەمبەری خوا ـ درودی لە سەربێت ـ دەی فەرموو : ( موسڵمانەکان هەمووتان لە ئادەمن وەئادەم لەخاك دروست کراوە ،

نـه عـەرەب له غەیری عەرەب‌و نەسپی لـە ڕەش ـ نە ئەوبارەکەیان ـ چاکترو گەورەتر نیە تەنیا بەتەقوای خواو کردەوەی چاکە نەبێت ، با ئەوانەی شانازی بە باو باپیریانەوە دەکەن با واز بێنن ، یان لـە لای خوا لە قالۆنچە بێ ڕێزتر ئەبن ) (١) .

( مرۆڤەکان خوا باری نەفامێتی‌و خۆ هەڵکێشانی بە باوباپیرەوە لە ناوتانا لابردوە ، مەردم دوو بەشە : مرۆڤێکی موسڵمانی پاك‌و خاوێنە ، خۆشەویستی خوایە ، یامرۆڤێکی نا موسـڵمانی پیس‌و بەدخووە لای خوا سووك‌و ڕسوایە )(٢) .

وە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان بە تەواوی لەم یەکیەتی‌و بەکسانی‌یە تێبگەن‌و یاسای چینایەتی گۆڕ بکەن پێغەمبەری خوا ـ درووودی لە سەربێت گەلێك دەرسی دادان ، چ بە فەرمووده‌و چ بە کردەوە ، بۆ نموولە : جارێکیان هات بۆ ناو یارەکانی‌و ئەوانیش ویستیان لەبەری هەڵسن ، بەلاّم نەی هێشت لە بەری هەڵسن‌و فەرمووی : ( لە بەرم هەڵ مەستن‌و دەستم ماچ مەکەن وەك عەجەم ئەی‌کەن لەگەڵ پاشاکانیانا ،من پاشانیم‌و پیاوێکم وەکو ئێوەم ) وە دەی فەرموو : ( هەر کەس پێی خۆش بێت خۆی دابنیشێت‌و مـەردم لە خزمەتیا بووەستن ، با شوێنی دانیشتنی خۆی لە ئاگری دۆزەخ دا خۆش بکات ) .

جارێکیان لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانیا لە سەفەرێك بوون ، حەیوانێکیان پێ بوو بیخۆن ، یەکێ لە یارەکانی وتی : من سەری دەبرم ، یەکێ وتی : من پاکی دەکەم ، یەکێ وتی من لێی دەنێم ،

---

(١) إبن کثیر لە تەفسیرەکە یا هێناویەتی .

(٢) إبن أبي حاتم ڕیوایەتی کردووە .

پێغەمبەر فەرمووی : منیش دارو چیلکە کۆدەکەمەوە ، وتیان : ئێمە لە جیاتی تۆ ئیش دەکەین ، فەرمووی : دەزانم ئێوە ڕێزم لێ دەگرن ، بەڵام خۆم نامەوێت خۆمنان لێ جیا بکەمەوە ، چونکە خوا پێی ناخۆشە بەندەکانی هەندێکیان خۆیان لەوانی تریان جیا بکەنەوە .

بەم پێیە ئیسلام موسڵمانەکانی ڕێك دەخست ، وەکو ددانی شانە ڕیزی کردنو یەکسانی خستە ناویانەوە ، وە بەرزیو نزمی کرد بەئیشی تاکانەو بەس .

دیسان ئیسان ئیسلام مرۆڤەکانی بۆ ئیش کردن ئاراستە کرد ، خۆماندوو کردنو هەوڵدانی کرد بە دروشمی ڕاستی ، وە تێی گەیاندن کە لە پاشەڕۆژیشا وەکو ئەم جیهانە هەر کەسە هەر لەبەری کردەوەی خۆی دەخوات ، وە تەنیا لەسەر کردەوەی خۆی سزای دەدرێتو تۆڵەی لێ دەسێنرێت ، چاکەو خراپەی کەس بۆ کەسی تر ناگەڕێنەوە : ( ليس للانسان إلا ماسعى ) النجم / .

واتە هیچ کەسێك بێجگە لەئیشو کارو تێکۆشانی خۆی هیچی تری دەست ناکەوێت . ( ولا تزر وازرە وزر أخرى ) فاطر/ .

( واتە کەس سزاو تاوانی کەس هەڵناگرێتو نادرێ بەسەریا ، پێغەمبەر دەی فەرموو : ئەوەی لە ئیشو کارو تێکۆشانا بەجێ‌ما نەژادو تیرە پێشی ناخات ) .

وە بۆ ئەوەی زیاتر لەم یاسای یەکیەتیو یەکسانی‌یەی ئیسلام تێ بگەین ، باسەرێك لە ڕووداوە مێژوویی‌یەکان بدەینو بۆ نموونە هەندێکیان باس بکەین :

ئافرەتێکی مەخزومی قورەیشی دزیی لەسەر ئیسپات بوو ، بە پێی یاسای ئیسلام پێغەمبەر فەرمانی دەست برینی دەرکرد ، قورەیشەکان بۆ ئەوەی ئەم شـــوورەیی‌یـە مێژوویی‌یـە لاپەڕەی مێژوویان چەپەڵ نەکات ، بڕیاریاندا گەورەترین تۆڵە لە جیاتی ئـەو دەستە بدەن و دەستەکە نەبڕرێت ، هاتن ( أسامة )ی کوڕی ( زەیـــد ) کە خۆشەویستی پێغەمبەر بوو ، ناردیانە لای‌و وتیان : سەد وشتر دەدەین ، کاتێ ( أسامة ) ئـەم مەبەستەی لە خزمەتا درکان ، ڕقی داهات و زۆری پێ ناخۆش بوو ، بۆیە لەکاتی کۆبوونەوەی موسڵمانانندا چووە سەر دوانگەو وتارێکی بەرزی داو فەرمووی : ( بەنی ئیســـرائیل ئەگەر بەندەو بێ دەسەڵاتیان تاوانی بکردایە تۆڵەیان لێ دەسەند ، بەڵام ئەگەر خاوەن دەسەڵات بوایە لێی ئەبووردن ، تا خوا گیرۆدەو داماوی کــردن ، ئایا ئەتانەوێت من لــە ناوتانابم‌و تۆڵەو حـــەد نەسێنرێت ؟!!! بەخوا ئەگەر ( فاطمە )ی کچی ( محمد ) دزی بکات دەستی ئەبڕم !!!

وە پێغەمبەری خوا ـ درورودی لە سەربێت ـ زەینەبی کچی (جحش)ی پوورزای خۆی کە لە هۆزی قورەیش بوو ، مارەی کرد لە زەیدی کوڕی ( حارثە ) کە کۆنە بەندە بوو .

وە لەکاتی برایەتی بەستندا ( حمزەی )ی مامی‌و زەیدی کرد بە برا وە ( أبوبکر ) و ( خارجة )ی کوڕی زەیدی کرد بە برا . وە لەجەنگی مۆتـــەدا زەیـــد فەرماندە بوو ، ( جعفر ) ی کوڕی ( أبوطالب ) و ( خالدی )ی کوڕی ( ولید ) و گەلێکی تر سەربازی بوون ، وە ( أسامە )ی کرد بە فەرماندەی ســـوپایەك کە ( أبوبکرو عمرو ... ) سەربازی بوون ، یان ( عمر ) کاتێ پێکراو زانی دەمرێت ،

ویستی جێنشین دابنێت ، وتی : ئەگەر ( سالم )ی کۆیلەبەندەی ( حذیفة ) بمایە ، دەم کرد بە جێنشین لەگەڵ ( عثمان و علی و سعدو ... ) دا ، یا ( بلال ) ی حەبەشی وەزیری بانگ‌و بڵاو کردنەوە بوو و سەلمانی فارسی لە خێزانی پێغەمبەر ئەژمێررا یا ... یا ... یا ... هتد .

شارستانێتی ئیسلام بەم پێیە لەسەر بناغەی یەکیەتی‌و دڵسۆزی‌و دۆستایەتی‌و دەستە بەرێتی‌و بۆ یەکتر بوونی کۆمەڵایەتی بەرپا بووە ، بۆیە موسڵمانە پێشینەکان هەمیشە بۆ ئیش‌و کارو خزمەتی کۆمەلایەتی نەبەردی‌یان دەکرد ، وە زیاتر لە خۆیان‌و خاوو خێزانیان بۆکۆمەڵ دەژیان ، وە لەم ڕووەوە شتی وایان کردوە کە مرۆڤ سەرسام دەکات .

ئەمە هەندێکی کەم‌و کورڕ بوو لە شارستانێتی ئیسلام کە لەگەڵ مرۆڤایەتی‌دا هەڵساوە ، وە ئەگەر سەیرێکی شارستانی‌یە ماددی‌یەکەی خۆرئاوا بکەیت ، ئایا بێجگە لە زوڵم‌و زۆرو ئاژاوەو ستەمکاری‌و داگیر کردنو خوێن‌و ناموس‌و ماڵ پێ شێل کردن‌و اووت بەرزی‌و چینایەتی‌و خۆ پەسەندی‌و هەوڵی سەرو مردان بۆ زاڵ بوون‌و .... هتد چی تر دەبینیت ؟!! لا بکەرەوە بەلای ڕەشەکانی ئەمەریکاوە ، کە لای خۆی سەرچاوەی ئەم شارستانێتی‌یە یە ، یان بەلای ڕەنگاو ڕەنگی ئەفەریقاوە ، یان بیرێك بکەرەوە لە فاشستی‌یەکانو نازی‌یەکان ، یا سەیری باری زەنجبارو ئەریتریاو سۆماڵ‌و لاووس‌و کەمبۆدیاو ڤێتنام یا ...هتد بکە ، ئەی ئەو قومبەلەیەی کە درا بە هێرۆشیمادا ، ئەی باری نالەباری ولاتە ژێردەستەکان !!

ئەمە هەندێکن لە خزمەتەکانی شارستانێتی خۆرئاوای ماددی کە

پزیشکەشیان دەکات بە مرۆڤ .

ئەنجا خوێنەری بەڕێز تۆیش سەرنج بدەرە هەردوو شارستانێتی‌یەکەو پاشان حوکمی خۆت بدەو بڵێ با بزانم ئیسلام کۆنەپەرستی‌و دواکەوتنە یان ئەمانەی ئێستە ئەیان بینیت ؟!

٤ ـ یەکێ تر لە شتە تایبەتی‌یەکانی شارستانێتی ئیسلام خوو ڕەوشتی جوانە . ئیسلام خوو ڕەوشتی جوان بە گرنگ دەگرێت ، و بە بەردی بنچینەی کۆمەڵ و شارستانێتی دادەنێت ، وە بە گەورەترین سیفەتی ئادەمی ئەزانێت ، خوای گەورە سەنای پێغەمبەر بەوە دەکات کە ڕەوشتی بەرزی هەیە : ( وإنك لعلى خلق عظيم ) ن / .

ڕەوشتی بەرزی بڕبڕەی پشتی کۆمەڵە ، وە بەپێی پێوەری ڕەوشت کۆمەڵ بەرزی‌و نزمی پلەی مرۆڤ دیاری دەکات ، هەر ڕەوشتە ئادەمی دەباتە ڕیزی فریشتەوەو لە خواو پێغەمبەری نزیك دەکاتەوەو دەی خاتە بەهەشتەوەو لە گیاندارو چوار پێکانی جیا دەکاتەوەو مرۆڤایەتی دەداتێ ، وە هەر ڕەوشتە متمانەو باوەڕ دەدات بە مرۆڤ ، وە دەبێتە هۆی پاراستنی خێزانو تیرەو نەژاد ....

بەڵام شارستانێتی ماددی خۆرئاوا ئەم ڕووەی فڕێداو لە نەخشەدا کوژاندوویەتی‌یەوە و گوێی ناداتێ ، بۆیە دەبینیت کۆمەڵەکەی لە زۆر ڕووەوە بەرگی شەرم‌و مرۆڤایەتی داکەندووە و چووەتە ڕیزی چوار پێوە ، و هەڵ دەسن بەکاری وا کە پێنووس شەرم دەکات لەوەی ڕووی تیانووسیان پێ ڕەش بکاتەوە .

مامۆستا ( أبوالحسن الندوي ) لە کتێبی ( ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ) دا دەڵێت :

( موسڵمانەکان کەوتنە ڕووو سەرۆکایەتی گێتی‌یان گرتە دەست‌و ئوممەتە نەخۆشەکانیان لە سەرۆکایەتی مرۆڤایەتی دوور خستەوە کە داگیریان کردبوون وخراپ جووڵاّبوونەوە لەگەڵیان ، وە وردە مرۆڤایەتی‌یان بەرەو پێش برد بەشێوەیەکی بێ‌هاوتایی‌و داد وەرانە ، وە ئەو سیفەت‌و ڕەوشتانەیان بە زۆری تێدا بوو کەوا پێویستن بۆ بەرێوە بردنی مرۆڤ و ئەبنە هۆی بەختەوەری و کامەرانی‌یان و لە سایەیا ئەحەوێنەوە :-

یەکەم : موسوڵمانەکان خاوەنی کتێبی ئاسمانی و شەریعەت و دەستووری خوایی بوون ، لە خۆیانەوە وە بە پێی ژیری و بیری خۆیان یاساو دەستووریان دادەنا ، چونکە هەر ئەوەیە دەبێتە هۆی نەفامی و نەزانی و هەڵەو جەورو ستەم ، وە کوێرانە و ماشەڕایی لە ئیش‌و کارا نەدەڕۆیشتن ، چونکە خوا نوورو ڕووناکی داونەتێ ، بە پێی ئەوە دەڕۆن‌و دەجووڵێنەوە ، وە شەریعەتێکی تێر و تەسەل‌و پڕ لە یاداو دەستوور و نەرێتی داونەتێ‌و بە گوێرەی ئەوحوکمڕانی ئادەمی دەکەن : ( أو من كان ميتا فاعييناه وجعلنا له نوراً يمشي به في الناس ، كمن مثله في الظلمات ليس بخارج منها ؟ ) الأنعام/.
( يا ايها الذين آمنوا كونوا قوامين لله شهداء بالقسط ، ولا يجرمنكم شنآن قوم على ألا تعدلوا إعدلوا هو أقرب للتقوى ، واتقوا الله ، إن الله خبير بما تعملون ) النساء/.

« دووەم : ئەوانە هەتا بە درێژی و بە تەواوی پەروەردەی ڕەوشتی‌و بالفتەیی دەروونی‌یان وەرنەگرت‌و وەکو مسی‌سپی کراوەو ئالتونی تێزابیان لێ نەهات ئەم سەرپەرشتی‌و سەرۆکایەتی‌یەیان وەرنەگرت ، بە پێچەوانەی زۆربەی ئوممەت و ئەندام و پیاوەکانی دەوڵەتەکانی تر لە کۆن و تازە دا ماوەیەکی درێژ مانەوە لە ژێر

پەروەرش‌و سەرپەرشتی‌و ئاگاداری‌و پاڵفتەکردنێکی ڕێك‌و پێکی پێغەمبەری خوادا ، خاوێنی دەکردن ، ڕامی دەهێنان لەسەر گوێ نەدان بەماڵ‌و پلەی دنیایی‌و لەسەر ئەمینی‌و خۆنەویستن‌و ترسی خوا ، سوور و هەنەر نەبوون بۆ سەرۆکایەتی‌و کاربەدەستی ، دەی‌فەرموو : ( ئیش‌و کاری مەردم نادەینە دەست یەکێ کە داوای بکات ، یا هەتەر بێت لە سەری ) وە زۆر جار بەم ئایەتە دەی ترساندن :

( تلك الدار الآخرة نجعلها للذين لا يريدون علواً في الأرض ولا فسادا والعاقبة للمتقين ) القصص / .

لەبەر ئەمە بوو کە نەك هەوڵ‌و تەقەلا بدەن بۆ دەست خستنی پلەو پایەو کاربەدەستێتی ، بەڵکو خۆیان دەگرت لە وەرگرتنی‌و بڕو بیانوویا دەهێنایەوە تانەیدەن بەسەریانا ، بەمە خۆیان دەپەڕانەوە ، یا هەوڵی پەڕانەوەیان دەدا ، وە ئەگەر پلەیەك بدرایە بەسەر هەرکامیانا بە دەستکەوت یا هەلی دانەدەنا ، بەڵکو بە ئەمانەتێکی گەردن‌و بە تاقی کردنەوەیەکی خوایی دادەناو دەیزانی لەبەر دەمی دادگای خوا ڕادەگیرێت‌و لە وردو درشت پرسیاری لێ دەکرێت‌و پاداشتی لەسەر چاکەو سزای لەسەر لادان دەدرێت ، وە هەمیشە فەرموودەی خوای گەورە لەبەر چاویا بوو : ( إن الله يأمركم أن تؤدوا الامانات الى أهلها وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل ) النساء / .
( وهو الذي جعلكم خلائف الأرض ورفع بعضكم فوق بعض درجات ليبلوكم فيما آتاكم ) .

سێیەم : موسڵمانەکان خزمەت کەری نەژادێك ، وە پێشەواو تێکۆشەری گەلێك یا نیشتمانێك نەبوون ، کە تێ بکۆشن لە ڕێی ژیانەوەو بەرژەوەندی تایبەتی‌دا ، وە بەرزی بکەنەوە بەسەر گەل‌و

نیشتمانەکانی تردا ، کەوا دابنێن ئەبێ هەمیشە ئەمان کار بەدەستو زاڵو ئەوان ژێر دەستەو بارە بەریان بن ، بۆ ئەوە نەهاتن ئیمپراتۆرێتێکی عەرەبی ڕاست بکەنەوەو لە سایەیا بژینو ڕابوێرن ، کەشرو فش لێ بدەنو لووت بەرزو بە دەعیەبن لە پاڵیا ، خەڵك لە ژێر چنگی ڕۆم و فارس دەربێنن بۆ ژێـر دەستی عەرەبو بۆ ژێـــر حوکمی خۆیان ، بەڵکو بـــۆ ئەوەی نێران مرۆڤ لـــە بەندایەتی بەندەکان دەربێنن بۆ بەندایەتی کردنی خـوای تاكو تەنها ، وە لە تەنگەڵانی ئەم جیهانەوە بیان بات بۆ فراوانی هەردوو جیهان ، وە لەژێر زۆر ستەمی ئاینەکان دەریان بێننو بیان بەن بۆ دادی ئیـسلام ، کەواتـە مرۆڤەکانو ئوممەتەکان لای ئەوان یەکسان بوون ، هەموو کەس لە ئادەمەو ئادەمیش لە خاکە ، عەرەب لە عەجەمو عەجەم لە عەرەب گەورەترو زیاتر نیە بە خوا ناسینو چاکە کردن نەبێت .... )(١)

٥ ـ یەکێکی تر لە بنکەکانی شارستانێتی ئیسلامی زانیاریە ...

ئیسلام پلەو پایەی دیاریو گەورەی بۆ زانیاریو زانایان داناوە ، فێربوونو فێرکردن بە گرنگترین کارو بە سوودترین ئیش دادەنێ ، وە شارستانێتی ئیسلام لەســـەر زانینو زانیاری دامەزراوە ئەوە بوو یەکەم ووشەو یەکەم ئایەتو یەکەم بەشی قورئانی پیرۆز ـ دەستووری ئیـسلامو بەرنامەی مرۆڤ ـ کە هاتە خوارەوە بۆ ســـەر پێغەمبەری مەزن محمد ـ درودی لە سەربێت ـ باسی خوێندنو خوێندنەوەو زانینو زانیاریو فێرکردنو قەڵەم دەکات ، بەمە تێمان دەگەیەنێت کـە ئیســـلام ئاینی پەروەردەکردنو زانیاریە ، ئیتـر دەوری نـەفامیو نەزانین ڕۆییو باوی نەما ( إقرأ باسم ربك الذي خلق ، خلق الانسان

(١) ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين .

من علق ، إقرأ وربك الاكرم ، الذي علم بالقلم علم الانسان مالم يعلم ) العلق / .

قورئانی پیرۆز له زۆر ئایەتیا هانی مرۆڤ دەدات بۆ خۆ فێرکردنو خوێندن ، دێت بە شانو باڵی زانیاریو زاناینداو پلەی زانایان بەرز دەکاتەوە : ( قل هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون ) الزمر / .

( یرفع الله الذین آمنوا منکم ، والذین أوتوا العلم الدرجات ) الـعمران / ( شـهد الله أنه لا إلـه إلاهو والملائکة وأولو العلم ) الـعمران / .

وە ئەو زانیارییەی ئیسلام داوای دەکات لە سنووری زانیاری ئایینی دا ( واتە : ئەو زانیارییانەی کە تەنیا لە پەرستن دەدوێن ) ناوەستێت ، بەڵکو هەموو جۆرە زانیارییەکە ( بە فیزیکیو میتافیزیکییەوە ) ، چونکە ئیسلام بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤ ، کە بۆ کاربەدەستێتیو بۆ ئاوەدان کردنەوەی سەر زەویو بوونەوەر لە سەری برۆن یاساو نەریتو رەچەو رێبازو رژێمی لێ وەربگرن ، کەواتە ئەو زانیارییەی مرۆڤ پێویستی پێی دەبێت زانیارییەکی بەر بڵاو و فراوانە ، بۆیە قورئان لە هەموو روو لایەکەوەو بۆ هەموو شتێك دارای زانیاری دەکات ، سەیریکە کاتێك هەندێك لە بەشو جۆرەکانی زەوی دێنێتو دەیان کات بە بەڵگە لە سەر بوونی دەسەڵاتی خوا ، دوا بە دوای ئەوانە دەفەرمووێت ( إینما یخشی الله من عباده العلماء ) الفاطر / .

یانی ئەوانەی بەڕاستی لە خـوا دەترسن تەنیا زانایانن ، دیارە مەبەست بەزانایان لێرەدا ئەوانەن کە زانیاری زەوی ناسینیان هەیە ( واتـە جیۆلۆجیەکان ) .

( طنطاوی ) له تەفسیرەکەیا دەڵێت : ( ئەو ئایەتانەی قورئان کە باسی زانیاری پەرستن دەکەن لە سەدو پەنجا تێ ناپەڕن ، بەڵام ئەو ئایەتانەی لە زانیاری برونەوەر ناسی دەدوێن لە حەوت سەدو پەنجا زیاترن ) (١) .

پێغەمبەری خوایش ـ دروودی لە سەربێت ـ لەم بابەتەدا گەنجینەیەکی تەواوی بۆ بەجێ هێشتووین ، زۆرو زەبەندە فەرموودەی فەرمووە ، لەوانە ( بخوێنن با لە ڕێگەیا بگەنە چین ) ( بخوێنن و هەوڵی فێربوونو زانیاری بدەن لە بێشکەوە تا گۆڕ ) ....

وە هەر وەها لە سەر ئەم بناغەیە جێنشینەکانی پێغەمبەر یەك لە دوای یەك بایەخیان بە خوێندنو زانیاری زۆر داوە ، بە ڕێزەوە سەیری زانایانیان دەکرد ، بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ بڵێسەی ئاگری زانیاری پەرەی دەسەند ، تاوای لێهات کونو قوژبن نەما کە زانیاری موسڵمانەکان نەی گرێتەوەو ڕووناکی نەکاتەوە ، وە بە درێژایی مێژووی حوکمڕانی و فەرمان ڕەوایی ئیسلام موسڵمانەکان دەستیان بە هەر شوێنێك گەیشتبێت زانیاری‌یان تێدا بڵاوکردۆتەوەو قوتابخانەو زانکۆیان تێدا دا مەزراندووە ، زانکۆی ( أزهر ) و ( نظامیة ) و ( مستنصریه ) و زانکۆکانی شام و حیجاز و بەسرە و کوفە و ئەندەلوس و .... هەندێکن لەوانە .

وە ئەگەر بڵێم لە زانکۆیەکا لە سێ هەزارەوە تا دوانزە هەزار قوتابی تیا بووە و بەزنجیرە وانەیان خوێندووە بە لانەوە سەیر دەبێت .

هەر لە سەردەمی فەرمان ڕەوایی ئیسلامدا بوو کە زانیاری پەلی

---

(١) جواهر التفسیر ج١ ص٣

بڵاو کردەوەو لێو پڕیی لێدا ، بێجگە لەو زانیاری‌یانەی پەیوەندی‌یان بەئایین‌و زمان‌و ڕێژەوە بوو گەلێك زانیاری تریان داهێنا ، یا هێنایانە سەر زمانی عەرەبی ـ کە زمانی ڕەسمی ئیسلام بوو ـ وە پەرەیان بە هەموویان دا .... وەکو فەلسەفە ـ بە فیزیکی‌و میتافیزیکی‌یەوە ـ و پزیشکایەتی و ماتماتیك ـ بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە ـ و (أحیاء) و (نبات)و ئاسمان‌و گەردون ناسی‌و فیزیاو جوغرافیاو مێژوو ... هتد

ڕاپەڕین‌و هۆشیار بوونەوەی ئەورووپا ( دوای ئەویش ئەمەریکا لەسەر دەستی زانایانی ئیسلامدا بوو ، هەر لەمانەوە تامی زانیاری‌و ئازادی‌و سەربەستی ڕاچەنین‌و شۆڕش‌و ماف خواستنیان چەشت و پێی هەڵسان‌و بەو پێیەی ئەبینیت ڕاپەڕین‌و سەرکەوتن‌و بوون بە پێشەنگی کاروانی مرۆڤایەتی لە گۆشەی داهێنان‌و پیشەسازی‌دا ، وە زانا بەرزەکانی خۆیان ددان بەمەدا دەنێن . جا ئێستە بۆ دڵنیاییت هەندێ لە کتێبی (من روائع حضارتنا) بە کوردی باس دەکەم :

* ئەورووپا بە دەنگی زاناو فەیلەسوفەکانی ئێمە خەبەریان بووەوە ، کە ئەو زانیاری‌یانەیان دەوتەوەو لێیان دەدوان‌و بانگەوازیان پێ دەکردن ، لە زانستگاو مزگەوتەکانی ( اشبیلیە و قرطبة وغرناطە و وێنەیانەوە ) خۆر ئاوایی‌یەکان دەهاتن بۆ قوتابخانەکانی ئێمە ، وە لەو هەموو زانیاری و سەربەستی و ئازادی‌یانەی دەیان‌بینی و لەلای خۆیان نەیشیان بیستبو سەرسام‌و شەیدا دەبوون ، کاتێك زانایانی ئێمە لە گەڕان‌و خڕۆکی زەوی‌و لە هاتوچۆی ئەستێرەو ئاسمان دەدوان ، دڵ‌و دەروون‌و مێشکی ئەورووپایی بەشتی پڕو پوچ و خەرافی ئاخنرابوو ، بۆیە هەر کە فێربوون ئیتر دەستیان کرد بە وەرگێرانی پەڕاوە زانیاری‌یەکان بۆ سەر زمانی خۆیان ( لە عەرەبی‌یەوە بۆ

لاتینی ) . وە پەڕاوەکانی زانایانی ئێمە لـە زانستگاکانی ئەوروپادا دەخوێنران . لەوانە پەڕاوی ( قانون ) ی ( إبن سینا ) لە پزیشکایەتی‌داو پەڕاوی ( حاوی ) ی ( ڕازی ) کە لەوەی ( إبن سینا ) فراوانتر بوو ، ئەم دوو پەڕاوە لە سەدەی دوانزەهەمەوە تا سەدەی شازەهەم لە ئەوروپا دەخوێنران . وە پەڕاوی فەلسـەفەی زانایانی ئێمە زیاتر لەمانە دەخوێنران . وە خۆرئاوا تەنیا لەڕێگەی پەڕاوەکانی ئێمـەوە فێری فەلسـەفەی یونانی بوون .

• لەبەر ئەمەیە زۆر لە زانا بەویژدانەکانی خۆرئاوا ددان بەوەدا دەنێن کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ئێمەی موسلّمان مامۆستاو پێشەوای ئەوروپا بووین زیاتر لە شەش سەد ساڵ ...

• ( غوستاف لوبۆن ) دەڵێت : بۆ ماوەی پێنج سەد یا شەش سەد ساڵ وەرگێڕاوی پەڕاوە عەرەبی ـ واتە ئیسلامی ـ یەکان تاقە سەرچاوەی خوێندن بوون لەزانستگاکانی ئەوروپادا ، وە دەتوانین بڵێین : تینی عەرەب ـ واتە موسلّمان ـ لە هەندێ زانیاری‌دا وەکو ( طب ) تا ئێستەیش ماوەتەوە ، چونکە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا پەڕاوەکانی ( إبن سینا ) لە مونبولی شەرح و ڕاڤە کران . وە هەر وەها دەڵێت ڕوجر بیکۆن و لیونارد البیزی و أرنـۆالغلوفي و ریمۆن لۆل و سـان سـۆما و البرت و الکبیر و أزفونش و ... و ... تەنیا پەڕاوە عەرەبی‌یەکان سەرچاوەو پشتیوانیان بوون .

• وە مسیۆ ڕینان دەڵێت : ( ألبرتي گەورە ) قەرزاری ( إبن سینا )یە و ( سانتۆما ) قەرزاری ( إبن رشد )ە .

وەزانای خۆرهەڵات ناس ( سیدیۆ ) دەڵێت : عەرەب ـ واتە

موسڵمان ـ بە تەنیا هەر ئەوان بوون هەڵگری ئاڵای شـــارسـتانێتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ، وە توانیان بەربەرێتی ئەورووپا لەناو بەرن ، وە عەرەب گەیشتنە سەرچاوەکانی فەلـەفەی یۆنانو لە سنوورەکانیا نەوەستانەوە ، بەڵکو گەشەیان پێ داو فراوانیان کردو چەند دەرگایەکی تریان کردەوە بۆ فێربوونو ناسینی سـروشتو بوونەوەر .

وە دیسان دەڵێت : عەرەب کە دەستیان دایە زانیاری ، گەردوونو ماتماتیکیان زۆر بەگرنگ گرتو لە هەموو بەشێکیا مەلەیان دەکرد .

وە لێرەدا پسپۆڕ بوونو مامۆستای ئێمەن .....(١)

بەم پێیە شارستانێتی ئیـسلام لەسەر بناغەیەکی زانیاری بەر بڵاو دامەزراوە ، زانیاریش لەژێر سێبەریا گەشەی کردو بەتەواوی سەر زەوی ڕووناك کردەوە .

٦ ـ پەرستن ( واتە بەندایەتی کردن بۆ خوای تاكو تەنیا ) یەکێکی ترە لەو شتە تایبەتی‌یانەی بنکەن بۆ شارستانێتی ئیسلام .

لەم سەردەمەی دوایدا وشـــەی بەندایەتی ( عبـادة ) بەرگێکی تەنگتو تار کرا بە بەریاو مانایەکی بچووکی درایە کە لە سنووری نوێژو ڕۆژوو هەندێ زیـکرو ویـرد تێنەپەڕێت بەڵام ئەوەی کە ڕاستیێو لەگەڵ قورئانو فەرموودە دا ڕێك بێت ، مانای ئەو وشەیە زۆر لەوە فراوانترو بەر بڵاوترە .

وە لەوە دەچێ کورت کردنەوەی مانای ئەم وشەیە لەوەوە ڕووی دابێت کە زانایانی ئیسلام ( فقهاء ) ـ ڕەحمەتی خوایان لەســەر

---

(١) من روائع حضارتنا ٣٨ – ٤٦ .

بێت ـ لەکتێبە فقهی یەکانا تەرتیبێکی هونەرییان داناوە بۆ ئاسان کردنی دۆزینەوەو شارەزا بوون لەباسی بابەتەکاندا ، هاتوون فقهی ئیسلامیان کردووە بە چوار بەشەوە : بەندایەتی ، سەوداو مامەڵە ، مارەو تەڵاق ، دادو تۆڵە سەندن . وە مەبەستیان ئەوە نەبووە کە تەنیا بەشی یەکەمیان بەندایەتی یەو بەس ، بەڵکو لەبەر ئەوەی دروشمی بەندایەتی زیاتر لەو بەشەدا دیارە ، ئەوەیان بە بەندایەتی ناو ناو ئەوانی تر ئەو ناوانەیان لێنان .

بەڵام دوای ئەوە خەڵکی بە چاوی خەواڵووەوە سەیریان کردو تێ گەیشتن کە بەندایەتی هەر ئەو مانایەی هەیەو ئیتر ئەبێ ئەوانی تریان بەندایەتی نەبن !! .

بەڵام چۆن وادەبێت ؟ خۆ خوای گەورە دەفەرموێت : من ئادەمیو جنۆکەم بەتەنیا بۆ بەندایەتی کردن درووست کردووە ( وما خلقت الجن والانس إلا ليعبدون ) الذاريات / .

کەواتە هەرکەسێ هەر بەندایەتی یەك بکات ئەوە مەبەستی خوای بەجێ هێناوە ، وە هەر کەس ملەجەڕە یاستی لە بەندایەتی دا کردو بەشێنێکی ترەوە خەریك بوو یاخیو گومڕایە .

بە سەیرکردنی قورئان دەبینین خوا بە چەند ڕوو و چەند شێوەو لە چەند لاوە فەرمانی داوە بەسەر ئادەمیدا وە چەندەها شتی پیشان داونو دەستیانی ڕاکێشاوە بۆ چەندەها شتی بە نرخ و بە کەڵك ، وە ئەمانەیشی بە کارو فەرمانی جێنشینی داناوە ، بە درێژی باسی پەیوەندی یەکان و حوکم و یاساو فەرمان و دروشمو کارگوزاریو خوو ڕەوشت .... هتد بۆ ڕوونکردوەوە .

ئەمە تێمان دەگەیەنێت کە وشەی بەندایەتی بەوچەند پەرستن و

دروشمە تەواو نابێت ، بەڵکو هەموو ئیش‌و کارو جم و جووڵێکی ئادەمی‌یەکان دەکرێتەوە ، وە ئەو ماناو مەبەستانە بە شێوەیەکی سەرۆکی لە دوو مەیداندا دەدرەوشێنێتەوە :

١ ـ جێ‌گیر بوونی مانای بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوای پەروەردگار لەناو دڵ‌و دەروون‌و مێشکی ئادەمی‌یەکاندا ، واتە ڕام هێنانی دڵی ئادەمی لەسەر ئەوە ئەم بوونەوەرە گەورەیە هەمووی بەندەو دروستکراوو پەروەردە کراوی خوای پەروەردگارە ، بەندە ئەبێ بەندایەتی بکات‌و ئەوە ئیش‌و کارو پیشەیی بێت ، وە خوایش دەبێ بەندایەتی بۆ بکرێت ، وە ئەبێ هەموو ئیش‌و کاری لە ژێر ناونیشانی گەردن کەچی بۆ خوا داو بە پێی بەرنامەی خوا بکرێن‌و بەس .

٢ ـ ئەبێ لە هەموو ڕاوێژو لێکدانەوەو بیرکردنەوەیەکی ناو دڵدا ، لە هەموو جووڵاندن‌و جم‌و جۆڵێکی مرۆڤ‌و ئەندامەکانی لاشەیدا ، لە هەموو ئیش‌و کارێکی سەر زەوی‌دا ، لەمانەداو لە هەموو شتێکی تریشدا ئەبێ تەنها ڕوو بۆ لای خوا بێت ، هەر سەیری فەرمان و ڕەزامەندی ئەو بکرێت ، لەبەر فەرمان‌و داواکردنی ئەو بکرێت ، لە سنووری ڕێگادانی ئەو دابێت ، مرۆڤ بێجگە لە گوێ‌ڕایەڵی خواو لە پەیڕەوی یاساو فەرمانی ئەو نابێ بەهیچ لایەکدا بڕوات یا شوێن شتێکی تر بکەوێت .

تا بەم پێ‌یە مانای بەندایەتی پێك دێت ، وە لەسەر ئەم بناغەیە هەموو بوونەوەر گەردن کەچی خوا دەبێت‌و بەندایەتی خوا دەکات‌و بە گەورەو خاوێنی دادەنێت ، وە بەم شێوە لە ئاسمان‌و زەویدا تەنها خوا دەپەرسترێت ، وە هەموو ئیش‌و کارو هەوڵ‌و جم‌و جوڵ‌و

تێکۆشانی . موسڵمان هەر بۆ خوا دەبێت‌و بەس ، چونکە هەموویان بـۆ ڕەزای خواو بـە پێی داوای خوا دەبێت ، کەواتە ئیش کردنت بۆ ژیانی خۆت‌و خێزانت ، بۆ ڕابواردنی ڕەوا ، بۆ داهێنان‌و بەرز کردنەوەی پلەی ژیان‌و باری کۆمەڵ .... هتد وەکو نوێژو ڕۆژو و ... هەموویان بەندایەتی‌و خواپەرستین‌و ئالێرەدا مانای ئایەتەکە ڕوون دەبێتەوە .

بەم ماناو باوەڕەوەو لەسەر ئەم بناغە ئادەمی هەمیشە لە بەندایەتی‌و خواپەرستیدا دەبێت ، وە هەر بەناوی خواوە بۆ خوا خەریك دەبێت ، وە لێرەدا دڵنیا دەبێت کەوا پەیڕەوی خوای خۆی کردووەو بەتەمای ئەوەیە خوای لە خۆی ڕازی کردبێت‌و جێگای ڕازاوەی بۆ خۆی ئامادە کردبێت ، چونکە ژیانی لە ژێر سایەی خوادا دەبینێت ، ئیتر ترس‌و بیم‌و دڵە ڕاوکەی نابێت‌و پشتی بەخوا قایمەو دڵی ئەستوورەو خوا بە پشتیوانی خۆی دادەنێت :

( ذلك بأن الله مولى الذين آمنوا وأن الكافرين لا مـولى لهم ) محمد / بۆیە لەو سنوورە دەرناچێت کە خوا بۆی داناوەو خراپەکاری ناکات و هەمیشە دەیەوێت لە پێشەنگی ئیش کەرانـا بێت و جێگای دەستی لەناو کۆمەڵدا دیار بێت ، وە بەتەمایە بەم شێوەیە بەشی باش بۆ ئەو جیهانی خۆی ئامادە بکـات .

شتێکی ئاشکرایە کە لەگەڵ ئەم دڵ‌و باوەڕەدا هەڵ ناسێت بەشتی زیان بەخش‌و کاری ناڕەوا ، چونکە دەترسێت بە شکاندنی سنوورو بە لادان لە ڕێگا خوا لێی برەنجێت‌و سەری لێ بشێوێ‌و دەربکرێ‌و توشیاری سزای سەختی پاشە ڕۆژ ببێت . (١)

(١) بۆ باری کۆمەڵایەتی و ئابووری‌و دادی کۆمەڵایەتی‌و مافی ئافرەتان ... هتـد سەرێك لە ( ئیسلام و بەرنامەی ژیان ) بدە .

ئەمانە هەندێکن لە شتە تایبەتی یەکانی شارستانێتی ئیسلام ، وە ئەگەر چاوپێچێك لەسەر چاو لابەرین و بەوردی سەیری بیرو ڕاو بەرنامەو دەستوور و دروشم و یاساکانی ئیسلام بکەین و سەرنجێك بدەینە شارستانێتی ئیسلامو لەگەڵ شارستانێتی ماددی خۆرئاوادا بەرابەری یان پێ بکەین ، سەرمان سوڕ دەمێنێت زیاتر لەو بارە نالەبارەی موسڵمانان ، کە لەگەڵ ئەم هەموو گەنجو خەزێنەدا چۆن دەتوانن یا چۆن ڕوویان دێت واز ـ لەم ئیسلامو شارستانێتی یە دێنن و لە دەوری بیرو ڕاو شارستانێتی پڕو پوچ کۆدەبنەوە ؟!

ئەمە جێی سەر سوڕمان نیە کە ئەم ئیسلامو شارستانێتی یەی ئەوەندە گەورەو جوانو ڕێكو پێك بێت ، چونکە ئەمە سروشتی یە بۆ ئیسلام ، خۆ ئیسلام دوایین بەرنامەی خوایە کە ناردی بۆ ئادەمی ، ناردی بۆ ئەوەی بەرنامەی ژیانی مرۆڤ بێتو هەتا هەتایەو تا مرۆڤێك بمێنێت لەسەر زەوی دا هەر ئیسلام بەرنامەی بێت ، کەوابێ ئەبێ بە شێوەیەك بێت لەگەڵ هەموو کاتو چەرخو دەمێکا بگرنجێت ، وە بۆ هەموو چینو بەرەیەك دەست بدات ، وە ئاتاجی بە دەست لێدانو ئاڵو گۆڕ نەبێت .

جێی سەر سوڕمان ئەوەیە مرۆڤەکانو زانا دڵسۆزەکانو ئەوانەی چاو ساغو چارە سەرکەری گیروگرفتەکانی کۆمەڵ دادەنێن ، ئەوانە بۆچی بەو پێیەی دەیبینن چاو لەم بەرنامەو شارستانێتی یە دەقونجێنن ، کەچی هەر دەمە پەلاماری ڕای مرۆڤێك دەدەن ؟ گوایە بە خەیاڵی ڕزگار کردنی مرۆڤو چارە سەرکردنی بارە نالەبارەکەی ؟!! لە کاتێکا کە ئەو ڕاو بیرو باوەڕانەی دەستکردی مرۆڤ ( بێجگە لەوەی بە هیچ کلۆجێك ناگەنە بەرنامەی ئیسلام ) ئەگەر لەلایەکەوە سوود بە مرۆڤ بگەیەنن لە چەند لای ترەوە زیانی لێ دەدەن و دەیخەنە

گێڕاوەوەو بەربادی دەکەن !!!

ئێستەیش لەم کاتەدا یەکێ لە دوو ڕێگا هەیە بۆ پاشـــە ڕۆژی مرۆڤ : یان ئەبێت مرۆڤ بە تێکڕایی لەناو بچێت‌و بەرباد بێت، یان ئەبێت بگەڕێتەوە ( ئێستەیش وەکو جاری پێشوو ) بۆ سـەر بەرنامەی ئیسلام تا سەر لە نوێ ڕزگاری بکاتەوە . چونکە هەر ئیسلامە ڕێی ڕزگاری ، هەر ئیسلامە کە بەرنامەیەکی وا بێت شیاوو شایانی ئادەمی بێت : ( صبغة الله ومن أحسن من الله صبغة ) البقره / ٠

وە لە پێشەوە زانیمان کە هەر ئیـســلام بوو یەکسەر ئادەمی لە ڕووخان و لەناو چـوون ڕزگار کرد ، وە هەر ئیسلام بوو کە ئەورووپای لە تاریکایی دەرهێناو سەری خست‌و لەچنگ پیاوانی کەنشتە ڕزگاری کرد . دیسان کاتێ ئیمپریالیزم دەستی چاوچنۆکیتی کێشا بەسەر خۆرهەڵاتدار کەوتە داگیر کردنی ناوچەکانی ، وە دەستی کێشا بەسەر بەرو بووم‌و سامانیداو کەوتە خوێن مژینیان ، هەر ئیسلام‌و زانایانی بوون خۆرهەڵاتی‌یە ژێر دەستەکانیان ئاگادار کردو ڕایان وەشاندن و خستنیانە جم و جوڵ و ڕاســـت بوونەوەو ڕاچەنین ( جمال الدين ) ی ئەفغانی بوو خۆرهەڵاتی هۆشیار کردوە ، چووە هیندستان ووتی بە هەندی لە ژێر دەست خراوەکان : ئەی حەوت سەد ملیۆنە مرۆڤەی هیند ئەگەر بێت‌و ئێوە هەر کیسەڵ‌و ڕەقەی ناو ئاوبن دەتوانن بچن دورگەکانی بەریتانیاو خاکەکەی داگیر بکەن ، ئیتر چۆن بەو شێوە سەری بۆ شۆڕ دەکەن ؟!!

وە ( مەولانا محمد علی جناح ) بوو کە بوو بە سـەرۆکی پارتی هیندنی خستی‌یە ڕاچەنین .

وە دکتۆر ( محمد إقبال ) ی هیندی بە فەلســـفەو هۆنراوەکانی

خۆرهەڵاتو خۆرئاوای لە خەو ڕاپەڕانو لە ڕاستی حاڵی کردن .

وە ( شێخ محمد عبده ) و شاگردو قوتابی‌یەکانی و هاوەڵەکانیان بوون کەوتنە نوسینو بڵاو کردنەوەو دواندنو هاوارو بانگەواز کردنو پێشەوایی جووڵانەوەی ئازادیو ڕزگاری وولاتە عەرەبیو ئیسلامی‌یەکانیان کرد ، بۆ خۆ دەرهێنان لە ژێر چنگی ئیمپریالیزمو شاگردو دەستو پێوەندەکانیان .

بەناوی ئیسلامەوەو لە دژی ئیمپریالیزمو دامو دەزگاو دەست و پێوەندی ئەوان هەڵسانو ڕاچەنینو بەربەرەکانیان کرد ، وە ئەو ئەندازەو هۆشیار بوونەوەو ڕزگاریو سەربەستی‌یە دەست کەوت لە سایەی ئەوانەوە بوو ، با خەڵکی تر سوودیان لێ دەبینێتو دوژمنانی خواو ئیسلام نایانەوێ ناوی ئیسلامیان لێ بنرێت ، وە بە ناوی ئەمو ئەوەوە دەدرێنە قەڵەمو بۆیەی فلان و فیساریان لێ دەدرێت .

ئیسلام کە بەرنامەی خوایە مرۆڤ و بونەوەر ڕزگار بکاتەوە ، سەر لەنوێ شاگردی ڕاستەقینەی ( محمد ) لە ژێر ئاڵا پیرۆزەکەی ( محمد )داو بەپێی هەنگاوە وردو ڕێکەکانی ( محمد ) - بە هەزاران درودی لە سەربێت - بە بەرنامەکەی ئیسلام مرۆڤو بوونەوەر لە دۆزەخی چەکی ئەتۆمو لە ژاری کوشندەیی شارستانێتی‌یە ماددی‌یەکەی خۆرئاوا ڕزگار بکەنەوەو ، بەرگی ٠رۆڤایەتی بکەنەوە بەرو ژیانێکی بەختیارانەی پڕ لە سوودو ئاسایشو حەوانەوەی بۆ بەرهەم بێنێتەوە : ( ویومئذ یفرح المؤمنون بنصرالله ..... ویقولون متى هو ؟ قل : عسى أن یکون قریباً ) الروم / .

ئەمەیش وەنەبێ هەر ڕای خۆم بێتو بە گۆترەو دەم بڕ بیڵێم ،

یا لایەنگرێتی پاڵی پێوە نابم ، نەء وا نیە ، بەڵکو ئەمە سروشتی ئیسلامە ، وەهەموو زاناو نووسەرە ئیسلامی‌یەکان لە سەر ئەم رایەن ، بەڵکو لە زانا بێگانەکانیش ئەوەیان کە لە ئیسلام تێ‌گەیشتبێ‌و تێ‌بینی تیا کردبێت ، بە مەرجێ خۆی لێ گێل نەکردبێت ، هەر لەسەر ئەم رایەیە .

بۆ بەڵگە لەسەر ئەم راستی‌یە باسی چەند نموونەیەك دەکەم :
یەکەم : لە کتێبێکا خوێندمەوە کە پێغەمبەری خوا - دروودی لە سەربێت - باسی بەسەر هاتی دوا رۆژی ئیسلام دەکا و دەفەرموێت :

( لە سەرە تاوە ئاینەکەمان پێغەمبەرێتی‌و رەحمەت دەبێت ، ئەوەندەی خوا بیەوێ لە ناوتانا ئەمێنێتەوە ، ئنجا خوا هەڵی ئەگرێ ، پاشان ئەبێتە پاشایەتێکی زۆر داری ، وە چەندە خوا بیەوێ لە ناوتانا درێژە دەکێشێ ، ئنجا خوا لای ئەبات‌و ئەبێتە زوڵم زۆرو جەورو ستەم ، ئەمیش ئەوەندەی خوا بیەوێت لە ناوتانا ئەمێنێتەوە ، پاشان خوای گەورە لای ئەبات ، ئنجا دەبێتە نیشتە جێ‌بی ( خلافەت ) لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرێتی ، وە بەپێی رێبازو رەوشت‌و شارێگەکەی پێغەمبەر لە ناوتانا کاربەدەسی دەکات ، ئیسلام شوێنی خۆی لەسەر زەوی‌دا ئەگرێتەوە ، دانیشتوانی ئاسمان‌و زەوی لێی رازی‌و خۆشنوود دەبن ، ئاسمان پەیتا پەیتا باران‌و بەرەکەتی خۆی دەرژێنێ‌و زەویش چ خێرو بێری هەیە ئەیخاتە دەر ) رواه البزاز سند حسن صحیح ، وەکو لە کتێبی ( الموافقات ) و ( الامامة ) دایە .

ئاشکرایە کە دەوری یەکەم‌و دووەم بەلاچوونی جێ‌نشینی راستەقینە ( الخلافة الراشدة ) تەواو بوو ، وە دەوری سێ‌یەم درێژەی کێشا

تا نەمانی دەوڵەتی عوسمانی ، وە دەوری چوارەم ئەمەیە ئێمەی تێدا ئەژین ، وە دەوری پێنجەم وا بەڕێوەو دێت بە یارمەتیو پشتیوانی خوای پەروەردگار (١).

## پەیامی ئیسـلام :

موسڵمانان ناتوانن سەر بەرز بکەنەوەو هەڵسنە سەرپێ تەنیا بەو پەیامە پیرۆزە نەبێ کە پێغەمبەری خوا (محمد) ـ درو‌ودی خوای لەسەربێت ـ بۆی هێنان لەلای خوای پەروەردگارەوە ، ئەبێ باوەڕی ڕاستەقینەیان بێت پێی و لە ڕێگەیا خۆبەخت بکەنو فیدایی بن بۆی ، پەیامی ئیسلام بەهێزو تواناو وە ڕووناکو ئاشکرایە ، تا ئێستە ئادەمی پەیامێکی نەدیوە و نەبیستووە کە لە ئیسلام بە دادتر و گەورەتر و پیرۆزتر و بەفەڕ تر بێت بۆ مرۆڤایەتیو بـۆ گێتی ، هەر ئەم پەیامە بوو کە موسڵمانەکان لـە جاری یەکەم دا ئاڵاکەیان بەرز کردەوەو سـەر زەویان پێ رووناك کردەوە . یەکێك لە نوێنەرەکان لە مەجلیسـی یەزدەجوردی پاشای ئێرانی دا وتی : ( خوا ئێمەی نارد تا ئەوەی مەیلی خوای لەسەرە لەژێر بەندایەتی بەندەکانا دەری بێنین بۆ بەندایەتی خوای پەروەردگار ، وە لە تەنگەڵانی جیهانەوە بۆ فراوانیی ، وە لە زۆرو ستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادی ئیسلام ) .

پەیامێکی ئەو تۆیە کە ئاتاجیو پێویستی بە گۆڕینی وشەیەك یـا کەمو زیاد کردنی پیتێك نیە ، بە چاکیو بەبێ کەمو کووڕی دەست ئەدات بـۆ سەدەی بیستەم ، هەر وەکو بـۆ سەدەی شـەشـەم دەسـتی دا .....

---

(١) الرسول ، بەرگی دووەم ، نووسینی سعید حوی ل ١٢٨ .

پەیامی ئیسلام بریتی‌یە لە بانگك کردن بۆ لای خوار بۆ لای پێغەمبەرەکەی و بۆ باوەڕکردن بە ڕۆژی دوایی ، بەخششی ئیسلام دەرهێنانە لە تاریکایی‌یەوە بۆ ڕووناکی ، لە بەندە پەرستی‌یەو بۆ خوا پەرستی‌و لە تەنگەلانی‌یەوە بۆ فراوانی‌و لە زۆر و ستەمی ئاینەکانەوە بۆ دادو ڕاستی ئیسلام ، وە لەم دەمەی ئێمەدا زیاتر لە دەمە پێشووەکان گەورەیی و بەرزی‌و سوودی ئیسلام دەرکەوتووەو مەردم باشتر لێی تێ ئەگات ، چونکە نەفامێتی ماددی تازە ئابڕوو چووەو بەنەواوی خراپەکانی دەرکەوتوون بۆ مەردم‌و خەلکی لێی بێزار بوون ، وە ئێستە کاتی گواستنەوەی پێشەوایەتی مرۆڤە لە نەفامێتی‌یەوە بۆ ئسلام ، ئەگەر موسلمانەکان هەلسنە سەرپێ و بە دلسۆزی و ڕاستی‌و بە پەرۆشەوە باوەش بە پەیامی ئیسلامدا بکەن و باوەڕیان پێی هەبێ‌و بە تاقانە بەرنامەو پەیامی سەیر بکەن‌و ، کە لێی دێت بۆ جارێکی تر - وەکو جاری پێشوو - مرۆڤایەتی‌و جیهان و گێتی ڕزگار بکات‌و نەهێلێت بروخێ‌و لەناو بچێت ، وە لەم پێناوەدا بەڕاستی خەبات بکەن‌و خۆ برەنجێنن . (١)

سێیەم : زانای باوەڕ پێ کراوی خۆرئاوایی ( بەرنادشۆ ) ئەلێت :

( من بە هەموو هۆش‌و زانایی خۆمەوە وا تێ دەگەم کە ئاینەکەی ( محمد ) لە هەموو ئەورووپادا پێشوازی لێ دەکرێت‌و وەردەگیرێت ، وە لە ئێستەوە خەریکە لە ناو دلیانا جێی خۆی دەکاتەوە ، پیاوانی کەنیشتە لە سەدەکانی ناوەڕاست‌دا هەولیاندا کەوا ئیسلام لە وێنەو نیگارێکی ڕەش‌و ناشیرینداپیشان بدەن ، ئەمەیشیان بەهۆی دەمارگیری‌یەکی ناڕەوا ، یان بەهۆی نەشارەزایی‌یەوە بوو ، لەڕاستی‌دا ئەوانە لەبەر

---

(١) ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين . ل ٢٥٨ - ٢٦٩ لەگەل کورت کردنەوە

ڕقیان لە ( محمد ) و لە ئایینەکەی لە سنوور دەرچوون و بە ڕێگایەکی ناڕاستا ڕۆیین و کاری نابەجێیان کرد ، ئەیان ویست ( محمد ) بە دوژمنی عیسا دابنێن ، بەڵام من بە پێویستی دەزانم کە ( محمد ) بە ڕزگاری کەری گرۆهی مرۆڤ دابنرێت بە تەواوی ، وە بەلامەوە وایە هەر کاتێ پێشەوایەتی بوونەوەری نوێ بدرێتە دەست پیاوێکی وەکو ( محمد ) ، دەتوانێ بە ئاسانی چارە سەری گیروگرفتەکانی بکات و بەختیاری و ئاسایش لە جیهانا بڵاو بکاتەوە ، لە کاتێکا کەوا بوونەوەر زۆر تینووە بۆ ئاسایش و بەختیاری .

وە هەروەها زۆر لەزانا ڕۆشنبیرە بە ویژدانەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەوە تێگەیشتوون کە ئایینەکەی ( محمد ) هێنای چ نرخ و بەهایەکی گەورەی هەیە .. لەوانە : کارلیل و جوتە و جیبون و ... هتد وە بەم بۆنەیەوە ئاڵ و گۆڕێکی گەورە و باش پەیدا بوو لە هەڵوێستی ئەوروپادا بەرابەری ئیسلام ، وە ئەوروپا لەم سەدەی بیستەمەدا لەم ڕووەوە گەلێك پێشکەوت ، وە بیرو باوەڕەکەی ( محمد ) خەریکە خۆشەویست دەبێت لە لایان ، من لام وایە زۆر لەمە زیاتر دەڕوات و تێدەگات کە ئیسلام چەندە بە سوودە بۆ ڕەهاکردنی گیروگرفتەکانی و بۆ چارەسەرکردنی دەردو نەخۆشییەکانی ، زۆر لەخزمەکانم و زۆر ئەوروپای تریش لەم کاتەدا باوەڕیان بە ئایینەکە ( محمد ) هێناوە ، وە لەمەوە دەتوانین بڵێین : ڕووکردنی ئەوروپا بۆ ئایینی ئیسلام دەستی پێ کردووە ) . (١)

ئەمە ڕای یەکێکە لە زانایانی خۆرئاوا ، وە هەر کامیان دەمارگیری یان ماددێتی یان شوێن کەوتن ڕێیان لێ نەگرێت هەر لە سەر ئەم ڕاو لەم باوەڕە دەبن . منیش پڕ بە دڵ و پڕ بەدەم دەڵێم : پاشە

---

(١) گۆڤاری ( نورالاسلام ) ژمارە ٤٣ ساڵی ١٣٥٢ کۆچی .

ڕۆژی ڕووناك هەر بۆ ئیسلام‌و بۆ ڕێگا ڕاستەکەی پێغەمبەری خوایە ، وە ئەمە ئاخر وتەو ئاخر نوسینمە لەم بابەتەوە .

ربنا تقبل من إنك أنت السميع العليم ، ربنا آمنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار ، ربنا هب لنا من أزواجنا وذرياتنا قرة أعين واجعلنا للمتقين إماما . وصلى الله وسلم وبارك على سيدنا ومقتدانا محمد وعلى آله وأصحابه وأتباعهم الصادقين ومن دعا بدعوتهم الى يوم الدين . آمين‌وآخرا دعوانا أن الحمدلله رب العالمين .

## سەرچاوە گرنگەکان



| کتێب | نووسـەر |
|---|---|
| ١ - قورئانی گەورە | |
| ٢ - فەرموودەی پێغەمبەر | |
| ٣ - في ظلال القرآن | سـيد قطب |
| ٤ - فقه السيرة | د . محمد سعيد رمضان البوطي |
| ٥ - فقه السيرة | محمد الغزالي |
| ٦ - حياة محمد | حسين هيكل |
| ٧ - الوحي المحمدي | محمد رشيد رضا |
| ٨ - ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين | ابوالحسن الندوی |
| ٩ - تەفسيری خاڵ | شێخ محمد ی خاڵ |
| ١٠ - نورالیقین | محمد خضری بگ |

وە گەلێ سـەرچاوەی تر .

## سەرنجێکی خەمناك

کیمان هەیە شـــەرابی ژاری مردن نەچێژێ و ڕەشەبای مەرگ وەکو قانگەلاشك بەرەو چالی گۆڕ بۆ هەتا هەتایی هەلی نەگرێتو کەسو کارو دۆستو دلســۆزان بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە مال ئاوایی یەکجاری لـــە تەرمەکەی نەکەن ، بەلام مردنی هـــەمرو ئادەمیزادان و یەك نین .... زۆر کەس هەیە کە ئەمرێت هەوالی مردنەکەی مژدەیەکە ، بەلام مردنی ئەوانەی کەژیانی خۆیان لەڕێی کارگوزاری گەلو نەتەوەو پێ گەیاندنی ـ ڕۆلە ـ دا بەسەر بردووە ، دیاری‌یە مردنی مانای هـــەتیو کەوتنی نەتەوەیەکەو نەمانی ، نەمانی پێشەوایەکە .

مامۆستای پارەزانی خوالێ خۆش بوو یەکێك بوو لەو مامۆستا کەم وێنانەی وەکو مرۆڤێکی ئاسایی نەئەژیا ، بەلکو مامۆستای پارەزانی مامۆســتاو رابـەرو ئامـۆژگارو دوانـدەرو پێ گەیەنەرو خێرخواهو موسلمان بوو ، بەمانای قوولی موسلمانەتی‌و مرۆڤ بوو بەمانای پانو پۆڕی مرۆڤایەتی .... بەڕاستی مامۆستا پارەزانی بۆ ئیسلام ئەژیا ، هەتا دلە پڕ لە باوەڕەکەی شەوی ٢٢ ـ ٢٣ / ١٢ / ١٩٧٦ لە لێدان کەوتو مەلی گیانی لە قەفەزی لاشەی بەرەو بارەگای خۆشـەویستەکەی ( خوا ) بالی گرتەوە ، درێغی نەکرد .

کاتێ کە پێنووس بەدەستە موســلمانەکانی ولاتی ئێمە بەناوی ئایینو کارگوزاری ئایینی‌یەوە خەریکی نووسینو هۆنینەوەی چیرۆکی پڕوپوچی رۆستەمو زۆرابو لەیلێو مەجنونو یوسفو زلێخاو .. هتد .... بوون ، مامۆستای پارەزانی ژیانی سەرکردەی گرۆی مرۆڤایەتی ( محمد المصطفی ) ( دروودی خوای لەسەربێ ) ئەنوسی ....

کاتێ زۆربەی مامۆستا ئایینی‌یەکانی ناوچەی ئێمە شەویان بە دامە کردنو گۆرەوی بازی‌و چەڵەمەشکێنەو رشتەی مرواری خوێندنەوە بەسەر ئەبرد ، مامۆستای پارەزانی بە نەخۆشی‌و پەژارەی قەرزاری‌و نەبوونی منالّ زۆری ، خەریکی نووسینی ( لە دەروازەی ئیسلام )و ( نموونەیەك لە ئیسلام ) و ( خێزانی بەختیار ) بوو ...

بەڵێ هەروایە و ژیان تا سەر بۆ کەس مۆر نەکراوە .

بەڵێ مامۆستا گیان ، تۆ رۆیشتی‌و بە جێگای ئاوات خواستەی خۆت گەیشتی‌و ئێمەی قوتابی و رێزەخۆری خۆت بەجێ هێشت ، بەڵام تەنیا لاشەکەت لامان نەماوە ، ئەگینا تابلۆی هەڵوێستە شیرینەکانت ، شێوەی وتە نەرمە پاراوە مەزەدارەکانت هەموویان لە دڵماندا ماون و لەیاد ناچێتەوە .

مامۆستا گیان / هیوا دارین ئیستە گیانت میوانی خاوەنی ژیان (ص) بێ‌و لە بەهەشتی بەرین گەشت‌و گوزارە بکات‌و هەزاران درودو رێزی قوتابیەکانت قوتابیە هەتیوەکانت لە گیانی پاکو پیرۆزت بێ‌و داواکارین بتوانین لەسەر نەخشە ئیسلامی‌یە پیرۆزەکانت بەردەوام بین‌و گیانی تۆش شاد بکەین .

قوتابیت
محمد ملا صالح شارەزووری
سیدصادق
٢٥ / ٤ / ١٩٧٩